






# شەرحی ئاسان

## بەسەر (جمع الجوامع)ەوە

مەلا موساى بیارە

١٤٢٦ك - ٢٠٠٥ز بەرگى دووەم

**دیاری بێت:**

*بۆ گیانی بەرزەفڕی گەورە مامۆستام (مەلا عبدالرحمن)ی خانەقای بیارە، ئەو مامۆستایەی کەبەبێ هیچ کرێو پاداشتێکی (من) فێری قورئانو ڕێگەی زانستە شەرعییەکانی کردم. لەگەڵ چەند گەنجێکی تری بیارەدا.

*ئەو مامۆستایەی کەژیانی دنیای لەچوار دیوارێکی تاریكو متوازیعدا گوزەراند، بەڵام هەمیشە چاوی بڕیبووە پلە بەرزەکانی بەهەشتو پشودانو حەسانەوەی بۆ ئەوێ هەڵگرتبوو.

*بۆ گیانی گەورە شێخی خاوەنی خانەقا، شێخ (ضیاء الدین)ی عەودالی زانستو پەناگەی مەلاو فەقێ. بۆ شێخ (نجم الدین)ی دنیا نەویستو شێخ (علاء الدین)ی موجاهید کەخانەقای بیارەیان کردبووە سەفارەتی بەهەشت. لەو سەردەمەداو مەلا (عبدالرحمن)ی گەورە مامۆستای منیش یەکێك بوو لەوەرگرانی جەواز لەو خانەقایەدا (خوایە بەگومانی منیان لەگەڵ بکە).

## سوپاسو پێزانین

لەبەپایان گەیشتنی ئەم بەرهەمەدا بەپێویستی دەزانم کەڕێزو سوپاسی زۆرم ئاراستەی ئەم مامۆستا ئازیزانە بکەم:

مامۆستا مەلا (عبدالرحمن)ی سجادی، مامۆستا (محەمەد نجم الدین)، مامۆستا مەلا (عبداللە) پێشنوێژی مزگەوتی ئەبوبەکری سدیق، مامۆستا مەلا (محەمەد) خەڵکی کوردستانی ئێران، مەلا (ئەبوبەکر) پێنجوێنی.

ئەم بەڕێزانە هەریەکەیان بەجۆرێك هاوکاریان کردووم لەخوای گەورە دەخوازم پاداشتی چاکەیان بداتەوەو ئەم بەرهەمەش لەمن قبوڵ بکات.

## پێشەکی:

کتێبی (جمع الجوامع) لەزانستی (أصول الفقه)دا کلیلی خەزێنەی راوبۆچوونی هەموو زانایانی ئەهلی فیکرو فیقهە لەبەرئەوە دارشتنەکەی رەنگاڵەی چەندەها خاوەن فیکرە زۆر گرانە، بۆیە بەباشم زانی بەگوێرەی توانای خۆم شەرحێکی ئاسانی لێبکرێتو دەستگیری قوتابی سەرەتایی بێت بۆ لەسەرپێی خۆوەستانی. داواکارم لەهەموو رێزدارو فێرخوازێکی ئازیز کە:

یەکەم: چاوپۆشی لەهەڵەی چاپ بکەن.

دووەم: چاوپۆشی بکەن لەجۆری وەرگێڕانەکەی چونکە زیاتر تەرجومەی حەرفیە لەبەرئەوەی بابەتێکی زانستی رووتە.

سێیەم: لایەنی تەندروستی مۆڵەتی نەدام لەپاش تەواوبوونی کۆمپیوتەر بەوردی پێداچونەوەی تێدا بکەم.

چوارەم: نزاو دوعای خێری زۆرم هەیە بۆ مامۆستا ئازیزەکانم هەموو ئەو برا خۆشەویستانەی یارمەتی دەرم بوون بۆ تەواو کردنی ئەم کتێبەو گەیشتنی بەدەستی ئێوەی رێزدار لەو بەرێزانە مامۆستا سجادی، کوڕانی حاجی ئەحمەد، کاك کامیل، ئەحمەدی کوڕم، کاك عەبدوڵلا، کاك عومەر، مامۆستا محەمەد سەید نەجمەدین. هەرکەسێکی تری بەرێز بەهەر شێوەیەك یارمەتی دەرم بوون سەربەرزو ئاسودەو کامەران بن لەهەردوو دنیادا.

موسا حبیب کریم

پێشنوێژ لەمزگەوتی محەمەدی حاجی رەشید

سلێمانی - شەهیدانی ئازادی

٥ شعبان ١٤٢٤ك - ٢٠٠٣/١٠/١

## پێشەکی چاپی دووەم:

کتێبی (جمع الجوامع) لەوە بەناوبانگترە کەقسە لەسەر ناساندنی بکرێت، بەتایبەتی لەچوارچێوەی حوجرەکانی کوردستان و لەلای (مەلا) باشی ئەم نیشتمانە پێوەرێکی بنەڕەتی بوو لەڕووی وتنەوەی بەفەقێ و خوێندن و لێتێگەیشتنی لەلایەن فەقێوە.. هەروەك لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی بەکتێبێکی دەگمەن سەیر کراوەو لەزۆربەی زانکۆکاندا بەشێك بووە لە (منهج) بەتایبەت لەئەزهەردا.

بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە شەرعی و یاساییەکان زانستی ئوسول هێندە گرنگە وتراوە (هەر کەس ئاشنای - اصول الفقه - نەبێ متمانە بەزانستەکەی ناکرێت) لەلایەکی ترەوە ئوسول گەورەترین دەروازەیە بۆ داخل بوونی عەقڵ بەزانستە ئیسلامیەکان و کرانەوەی لەگەڵیاندا، چونکە عەقڵ تەنها بنەمایەکە کەتەکلیفە خواییەکان دابەزنە سەری و لەوێوە بەرجەستە بکرێن لەژیانی رۆژانەدا.

کتێبی (جمع الجوامع) گەورەترین شاکاری بواری ئوصولە تا ئەمڕۆش بۆیە وادەبینم بەکوردی کردنی ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستای زۆر بەڕێزو ئازیزەوە (مەلا موسای بیارە) هەنگاوێکی بوێرانە بووەو شەونخونی و رەنج و ماندووبوونی زۆری ویستووە، لای هەموو زانست خوازێکی کورد زمان و مامۆستایان و فەقێی حوجرەکان، جێگەی پێزانین و دەست خۆشیە، خوای گەورە نمویان زیادو زیاتر بکات و بەرهەم و شاکاری باشتری بەدوادا بێت و جێگەی قبوڵی خوێنەرانی ئازیزو رەزامەندی خودای گەورە بێت.

مەلا ئەبوبەکر پێنجوێنی

٢٠٠٥/٣/١٠

{التخصيص}

مصدرُ خصّص بمعنى خصَّ {قصر العامّ على بعض افراده} بأن لا يرادَ منه البعضُ الآخر ويصدق هذا بالعام المراد به الخصوص كالعام المخصوص وعدل كما قال عن قول ابن الحاجب مسمياته لأن مسمّى العامّ واحدٌ وهو كلُ الأفراد [١].

{والقابل له} اي للتخصيصِ {حكم ثبت لمتعدد} لفظاً اومعنى كالمفهوم [٢] نبَّه بهذا على ان المخصوص في الحقيقة الحكم و انّ المراد بالعام هنا ما هو اعمّ من المحدود بما سبق فالمتعدد لفظاً نحو ﴿ فاقتلوا المشركين ﴾ وخصَّ منه الذمي ونحوه [٣].

---

{تەخصيص}

(١)ئەم بابەتە لەتايبەت كردن ئەدوێ ، تخصيص مصدری (خصص)ی بەمانای خص يە نەك بۆ تەكثير و زۆركردن بێ ، جا (تخصيص) بريتيە لە : تايبەتكردنی حوكمی لەفظيكی عام و برينی بەسەر هەندێ لەئەفرادی دا، بەم شێوە هەندەكەی‌تری مەبەست نەبێ‌و نەيگرێتەوە ئەم پێناسە ئەو عامەش دەگرێتەوە كە هەر لەسەرەتاوە تايبەت بەهەندێ لەئەفرادیەوە ، واتە وەك عامی تايبەتكراو بەهەندێكەوە، دانەر وەك خۆی وتويەتی لەشێوەی وتنەكەی ابن الحاجب لايداوە كە وتوويەتی : (علی بعض مسمياته) گۆڕيويەتی بەئەفراد چونكە ناوەڕۆكی عام تاكە نەك كۆ، كە بريتيە لە (كلّ الأفراد) واتە : ئەو دەستەی پێكهاتووە لەهەموو تاكەكانی ئەو عامە كە وابوو (مسميات) بەصيغەی كۆ بوترێت هەڵەيە.

(٢)ئەوە كە قەبوڵی تايبەت كردنەكە ئەكا ئەو حوكمەيە كەدراوە بەچەند كەسێك چ لەڕووی لەفظەوە زۆربن ،يا لەڕووی ماناو مەفهومەوە ، كەئەڵێيت: (جاءني القوم الا زيداً) لەفظەكە عامە كە قەومەكەيە ، ئەوەی قەبوڵی تايبەتمەندييەكەی كردووە حوكمەكەيەتی كە هاتنەكەيە .

(٣)دانەر بەم رستەی : (و القابل ...الخ) فێرخوازی ئاگاداركردەوە كە ئەو عامەی تايبەت ئەكرێ لەحەقيقەتدا حوكمەكەيەتی نەك ئەفرادەكانی ، وە ئاگاداريشی كە ئەم عامی ئێرە فراوانترو گشتگيرترە لەو عامەی لەپێشەوە باسكرا ، بەو شێوەی كەكرا چونكە پێشتر ئەبوايە هەر لەفظە بوايە بەلام لێرە غەيری لەفظيش ئەگرێتەوە، هی پێشوو ئەبوايە غير محصور بوايە بەلاّم لێرە محصوريش ئەگرێتەوە- جا ئەو عامەی لەڕووی لەفظەوە چەند جۆرێكی زۆر بگرێتەوە وەك:موشريكان بكوژن، ئەمەحەربی و معاهدوذمی دەگرێتەوە، بەلاّم تايبەت كراوە بەحەربيەوە ذمی و معاهدی لێ‌دەرچوون.

ومعنى كمفهوم ﴿ فلا تقل لهما افّ ﴾ من سائر انواع الايذاءِ وخص منه حبسُ الوالد بدَين الولد فإنَّهُ جائز على ماصحَّحهُ الغزاليُ وغيره (١) .

{والحق جوازهُ} اى التَخصيص {الى واحد ان لم يكن لفظ العامّ جمعاً} كمَن و المفرد المحلى بالألف واللام {والى اقلّ الجمع} ثلاثةً او اثنين {إن كان} جمعاً كالمسلمين والمسلمات {وَ قِيلَ } يَجوزُ الى واحدِ {مطلقاً} نظراً في الجمع الى ان افرادَه آحادٌ كغيره (٢) .{وشذّ المنع} الى واحدِ {مطلقاً} بأن لا يَجوزُ إلاّ الى اقلّ الجمع مطلقاً(٣) {وَ قِيلَ بالمنع إلاّ ان يبقى غيرُ محصورٍ} فيَجوزُ حينَئذٍ {وَ قِيلَ إلاّ ان يبقى قريبٌ منْ مدلوله} اى العامّ قبلَ التَخصيص فيَجوزُ حينَئذٍ والأخيران متقاربانِ(٤) .

---

(١) ياخود لەڕووی ماناوە زۆرێك بگرێتەوە وەك : نەكەی ئاخ و ئۆف بڵێیت پێیان، ئەمە هەموو جۆرە ئەزیەت و ئازارەكانیتریش ئەگرێتەوە ، بەڵام ئازارێك ناگرێتەوە كە بەندكردنی باوكە لەسەر قەرزی كوڕەكەی ، ئەو ئەزیەتە دروستە لەسەر ئەو بۆچوونەی كەغەزالی و غەیری غەزالیش بەصحیح و راستیان داناوە.

(٢) قسەی راست و دروست ئەوەیە كە دروستە عام هەموو فەردەكانی لێبكەنینەوە تا یەك فەردی تەنهای ئەمێنێتەوە، بەو مەرجەی لەفظی عامەكە جەمع و كۆ نەبێ وەك: من و موفرەدێك كە ئەلی بەسەرەوە بێت ، بەڵام ئەگەر جەمع و كۆبوو ئەتوانی فەردەكانی لێدابتەكێنی هەتا ئەگەیتە كەمترین ژمارەی جەمع كە سێیە یاخود دووە، وەك: مسلمین و مسلمات ، بەڵام لەوە كەمتربێت ئەوە ئەبێتە نەسخ و سڕینەوە ، هەندێك وتوویانە : دروستە عام جەمع بێ یاخود جەمع نەبێ تاك تاكی فەردەكانی لێبكەینەوە هەتا ئەگەیتە یەك فەرد(آحاد) لەبەر ئەوە لەجەمع دا سەیری ئەوە ئەكرێ كە فەردەكانی جەمع بریتیە لە تاكەكان نەك جەمعەكان.

(٣) وەك غەیری جەمع قەدەغەو مەنع كردنی لێكەندنەوەی ئەفرادەكانی عام تا یەك دانەیان ئەمێنێتەوە ئەو عامە چ جەمع بێ یا جەمع نەبێ ئەوە قسەیەكی شاذە و لەیاسا دەرچوونە چونكە هەر لەجەمعدا قەدەغەیە نەك لەغەیری جەمعدا بەم شێوەیە كە مەنعی تەخصیصی دروست نەبێ ، جگە بۆ ئەندازەی لای هەرە خواری جەمعەوە نەبێ چ جەمع بێ یا جەمع نەبێ.

(٤) هەندێك وتوویانە: تخصیص مەمنوعە مەگەر ئەوەی ئەمێنێتەوە مەحصور نەبێ، لەكاتێكدا مەحصور نەبێ دروستە، لەقەبیلی ئەوەی ئەڵێت: دزی لەماڵی دەوڵەمەند دروستەو لەماڵی فەقیر دروست نیە، هەندێكیتر وتوویانە: تەخصیص مەمنوعە مەگەر كاتێ ئەوەی نزیك بێ لە مەدلولی عامەكەوە پێش

{والعامُّ المخصوص عمومهُ مرادٌ تناولاً لا حكماً} لأنَّ بعض الأفرادَ لا يشملهُ الحكمُ نظراً للمخصِّص [1] .

{وَ} العامّ {المراد به الخصوصُ ليس} عمومهُ {مراداً} لا حكماً ولا تناولاً {بل} هو {كليٌّ} من حيثُ ان لهُ افراداً بحسبِ الأصل {استعمل في جزئيّ} اي فردٍ منها {ومن ثمَّ} اي منْ هنا و هو انّه كليٌّ استعمل في جزئي اي من اجْل ذلك {كان مجازاً قطعا} نظراً لحيثيةِ الجزئية [2] مثالهُ قوله تعالى: ﴿ الذين قال لهمُ النَّاسُ ﴾ اي نعيمُ بن مسعود الأشجعيّ لقيامهِ مقام كثيرٍ في تثبيطهِ المؤمنينَ عن ملاقاة ابي سفيان واصحابهِ ﴿ ام يحسدونَ النَّاس ﴾ اي رسول اللهﷺ لجمعهِ ما في النَّاس من الخِصال الجميلة [3].

---

تەخصيص – واتە: عامەكە صەد بیٚ و نۆی دەیی لیٚجیابكەیتەوە ئەوە ئەمێنێتەوە، دە ئەوە نزیكە لەصەدەكە– ئا لەو كاتەدا دروستە ، ئەم دوو قەولە دواییە لەیەكەوە نزیكن چونكە هەردوكیان وائەگەیەنن ئەوەندە مەدلولەكەی زۆر بیٚ خەڵك وانەزانیٚ مەدلولەكەی شتیٚ لیٚكنراوەتەوە .

(١) عامێك كە تایبەت كرابیٚ ئەوە لەڕووی لەفظەوە عمومیەتی گشتگیریەكەی مەبەستە ، نەك لەڕووی حوكمەوە، چونكە هەندیٚ ئەفرادی ئەو عامە حوكمەكە نایگرێتەوە لەبەر بوونی تخصصەكە كە ئەڵێت: (جاءني القوم الا زيداً) القوم ، زیدیش ئەگرێتەوە، بەلاٚم حوكمەكە كە هاتنەكەیە نایگرێتەوە .

(٢) عامێك كەمەبەست پێی خصوص بیٚ، ئەوە عمومەكەی مەبەست نیە، نە لەڕووی حوكمەوە نە لەڕووی لەفظەوە بەڵكوو ئەو عامە كوللیەكە –چونكە بەگوێرەی ئەصلەكەی چەندەها فەردی هەیە– لەجوزئێك دا بەكارهاتووە واتە لە یەكێك لەفەردەكانیدا ، لەبەر ئەوە كوللیەو لەجوزئییدا بەكارهاتووە ، ئەوە بێگومان مەجازە چونكە لەوێدا تەنها بۆ جوزئێك بەكارهاتووە لەمەدلولەكەی خۆی لایداوە ، نموونە بۆ عامێك مەبەست پێی خصوص بیٚ .

(٣) خوا دەفەرمویٚ: ئەوانەی كە (الناس) پێیان وتن ئەو (الناس)ە عامە و مەبەست پێی نەعیمی ئەشجەعیە ، چونكە ئەو ڕۆڵەی ئەو بۆی چو بوو لەجیٚی خەڵكێكی زۆردا بوو دەوری ئەوانی ئەبینی لەترساندان و شكاندنی موسوڵمانان لە ڕووبەڕووبوونەوەی (ابوسفیان) و هاوەڵانی، یاخو وەك دەفەرمویٚ: ئەوانەی حەسوودی بە (الناس) دەبەن، واتە بە پێغەمبەری خواﷺ بۆیە بەپێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: (الناس) چونكە هەرچی سیفەتی جوان هەیە لەناو خەڵكدا لە پێغەمبەردا كۆبوونەتەوە .

وَ قِيلَ النَّاس في الآيـة الاولى وفـدٌ مـن عبـد القيـس وفي الثانيـة العـربُ وتسـمَّحَ في قوله كليّ على خلاف ماقدمه من أن مدلولَ العامّ كليةٌ [(١)].

{والاول} اي العـامّ المخصـوصُ {الاشـبه} انـه {حقيقـة} في البعـض البـاقي بعـد التَخْصيص {وفاقا للشيخ الامـام} والـد المصنّـف {والفقـهاء} الحنابلـةِ وكثـيرٌ مـن الحنفية واكثرُ الشافعيَّة لأن تناول اللفظ للبعضِ الباقي في التَخْصِيص كتناولـه لَـهُ بلا تخصيصٍ وذلك التناولُ حقيقيٌّ اتفاقاً فليكن هـذا التنـاول حقيقيّاً ايضـاً [(٢)]. {وقـالَ} ابوبكر {الرازي} من الحنفيةِ حقيقةٌ {أن كان الباقي غيرَ منحصرٍ} لبقاء خاصَّة العموم و إلاّ فمجازٌ[(٣)]. {وقومٌ} حقيقية {أن خصَّ بما لا يستقلُ} كصفة اوشرط اواستثناء لأن ما لا يستقلُ جزء من المقيَّد بهِ فالعموم بالنظر إليه فقط [(٤)].

---

(١) هـەندێك وتوويانـە (النـاس) لەئايـەتی یەکـەمدا مەبەسـت پێـی وەفدێـك بـوو لەهـۆزی عبدالقيـس ، وە لەئايـەتی دووەمـدا مەبەسـت پێـی عەرەبـە، کـەوابوو هـەر لـەمانای حـەقیقی خـۆیدا بـەکارهاتووە، دانـەر لـەو قسـەدا کـەوتی (عـام کلـی) ئـەوە مەجازی بەکارهێناوە ، چونکە ئەم قسەیە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لەپێشەوە رابوورد وتـی : مـەدلولی عـام کلّیيە نـەك کلـیّ بـۆ ئـەفراد بـەکاردێ کلیـەش بـۆ قضايـا کليـات ، کەوابوو ئەم کلی ئێرە مەبەست پێی کلیەتە.

(٢) یەکـەمیان کـە عـامی تايبـەت کـراوە قـەولی ئەشـبەهو بەهـەق نزیکـترە ئەوەیـە کەبـەکارهێنانی عـامی تايبـەت کـراو دوای تخصيـص لـەو هـەندە فـەردەدا کـەماوە ئـەوە حەقیقەتـە ، بـاوکی دانـەرو شـەرع زانـانی حەنبـەلی و زۆرێـك لەحەنەفیەکان و زۆرتر لەزانایانی شافیعی موافیقی ئەم قەولەن چونکە لەفظی عامەکە دوای تخصيـص ئـەو هـەندە فەردانـەی ماونەتـەوە ئەیانگرێتـەوە وەك کـاتێك کـە تخصيص نەکرابوو بەرای گشتگیری بۆ ئەو فەردانەی ماونەتەوە حەقیقیە ، دەکەوابوو با ئەم گرتنەوەش بۆیان دوای تخصيص هەر حەقیقی بێت .

(٣) ئەبوبەکری رازی ئـەڵێ: عامی تايبـەت کراو بـۆ ئەوانـەی ماونـەتەوە حەقیقەتـە ئەگـەر ئەوانـەی کـە ئەمێننـەوە لـەژمارە نەیـەن ، چونکـە عمـوم و گشـتگیری و لەژمارە نەهاتووەکەی کە تايبـەتی لەفظی عامە هەر ماوەتـەوە بەڵام ئەگـەر ئەوانـەی ماونەتـەوە لـەژمارە بێـن ئـەوە مـەجازە . (٤) گـەلێکیتر دەڵێـن ئـەو بەکارهێنانـە حەقیقەتە ئەگـەر تايبـەت کرابـێ بـەهۆی شتێکەوە کەسـەربەخۆ نـەبێ ئـەبێ لەگـەڵ شتیتردا بەکاربێ، وەك صیفەت و شـەرط و اسـتثناء بۆیە حەقیقەتە چونکە ئەوەی سەربەخۆ نەبێ بەشێکە لەوەی پێی بەستراوە ، کەوابو بۆ عموم و گشتگیریـەکە تەنها

{وامامُ الحرمين حقيقةٌ ومجاز باعتبارين تناوله والاقتصار عليه} اي هو باعتبارِ تناولِ البعض حقيقة وباعتبار الاقتصار عليهِ مجازٌ وفي نسخة باعتباريْ بلا نون مضافاً وهو احسن [1]. {والأكثرُ مجازٌ مطلقا} لاستعماله في بعض ما وضعَ له اولاً والتناول لهذا البعض حيثُ لا تخصيص انما كان حقيقا لمصاحبتهِ للبعضِ الآخَرِ [2].

{وَ قِيلَ } مجازٌ {ان استثنى منه} لانه يتبين بالإستثناء الذي هو اخراجُ مادخل انه أُريد بالمستثنىمنه ماعدا المستثنى بخلاف غير الإستثناء من الصفة وغيرها فإنَّهُ يفهمُ ابتداءً انّ العموم بالنظر إليهِ فقط [3].

---

بەگــــوێرەی ئـــەوە –بۆ وێنـە ئـەڵێی: اكـرم الإنسـان العـالم– لەفظەكـە عامـە كـە (الإنسان)ە تايبـەت كـراوە بـەهۆی (العـالم) ەوە كـە سـيفەتيەتی ، واتـە لەپێشـەوە وتويەتی اكرم الإنسان مەبەست العالم بووە هـە لەئەوەڵەوە كەوابوو عموميەتیيەكەی بەگوێرەی (العالم)ەكەيە.

(١) امام الحرمين دەڵـێ: عـامێك كەتايبـەت كـرابێ دوو ڕووی هەيـە ، لەڕوويێكـەوە كەعامە و ئەو هەندەش ئەگرێتەوە ئەوە حەقيقەتە ، وە لەڕوويێكەوە كە تەنها هەر ئەو هەندەش ئەگرێتەوە مەجازە، بەڵام لەدەسنوسێكدا نوسراوە بە(اعتبـاريْ)، بـەبێ نونـی زيادە چونكە اضافە كراوە بـۆلای هـەردوو كەليمـەی دوای خـۆی ، نونيـش لـەكاتی اضافەدا ئەڕوا ئەمەشيان جوانترە.

(٢) زۆربەی زانايان دەڵێن: عام مـراد پێـی خصـوص بێ مـەجازە، عمومـی تايبـەت كراويـش هـەر مـەجازە ، چونكـە بـەكارهاتووە لەهـەندێ لەوانـەی كـە يەكـەم جـار لەبەرامبەريانـەوەدا دانـراوە ، ئێسـتە بـۆ هەندێكيانـە لەبـەر ئـەوە مـەجازە ، ئـەی لەئەوەڵيشـەوە ئـەم هـەندەی نەئەگرتـەوە ، ئيـتر بـۆ حـەقيقی نيـە؟ ئـاخر كـاتێ كـە تخصيص نەبوو ئەم هەندەی ئەگرتەوە ئەوە حـەقيقی بـوو چونكە هەندەكەی تريشـی لەگەڵدا بوو ، دەخۆ ئێستە لێی سەنراوەتەوە كەوابوو ئەويش نابێ بەحەقيقەت .

(٣) هـەندێك وتويانە: عـامی تايبـەت كـراو ئەگـەر استثنای لێبكرێ ، ئـەوە مـەجازە چونكە استثنا لێكراوەكە موستەثناكە نيە ، بەڵام جياوازە لەگەڵ دەركردن و لابردنێك كـە بـەهۆی صيفـەت و غـەيری صيفەتـەوە بـێ، چونكـە ئـەوە هـەر لەسـەرەتاوە وا حاڵی ئەبێ ئەو عموم و گشتگيريە تەنها بەگوێرەی ئەوە، واتـە: ئەگـە وتـت: (جـاء الرجل العالم) هەر لەئەوەڵەوە مەبەست بە (الرجل) (العالم) بـووە ، بـەڵام (جاءنـی القـوم الا زيداً) لەپێشدا كە ئەڵێيت : (القوم) زيديش ئەگرێتەوە، دوايـی بـەهۆی استثناكەوە لائەبرێ و ئەچێتە دەر .

{وَ قيلَ } مجاز {أن خصَّ بغير لفظ} كالعقلِ بخلاف اللفظِ فالعموم بالنظر إليهِ فقط[1] {و} العامّ {المخصَّص قال الأكثر حجةٌ} مطلقاً لأستدلال الصحابة بهِ من غير نكيرٍ[2].

{وَ قيلَ ان خصَّ بمعينٍ} نحو ان يقال: اقتلوا المشركين إلاّ اهل الذّمة بخلاف المبهَم نحو إلاّ بعضَهم اذ ما منْ فردٍ إلاّ ويَجوزُ ان يكون هو المخرَجُو أجيبَ بانه يعملُ بهِ الى انْ يبقى فردٌ[3] .

وما اقتضاه كلام الآمدي وغيره من الاتفاق على انه في المبهم غير حجة مدفوعٌ بنقل ابنِ برهان وغيرهِ الخلاف فيه مع ترجيحهِ انه حجةٌ فيه[4] .

(١) هەندێك وتويانە ئەگەر بەهۆی غەیری لەفظەوە تایبەت بکرێ ئەوە مەجازە، واتە بەعەقڵ بکرێ نەك بە لەفظ ، کەوابوو گشتگیریەکەی تەنها بەگوێرەی ئەو لەفظە ئەبێ.

(٢) عامێ کەتایبەت کراوبێ زۆربەی زانایان وتویانە: ئەو عامە بەهەر شێوەیەك تایبەت کرابێ حوجەیە و بەڵگەیە لەو هەندەیەدا که ماوەتەوە -بەمعین بێ یا بەمبهم بێ متصل بێ یا منفصل بێ- چونکە هەندێك لەیاوەرانی پێغەمبەرﷺ کردویانە بەبەڵگە و هەندەکەیتریشیان نارەزامەندییان لێدەرنەکەوتووە ، کەوابوو ئیجماعێکی سکوتی بووە .

(٣) هەندێك وتوویانە کاتێك ئەبێ بەحجە ئەگەر بەشێکی دیاریکراو تایبەت کرابێ بۆ نموونە: ئەگەر بوترایە هەمو موشریکان بکوژن جگە لەئەهلی ذیممە نەبێ، ئەهلی ذیممەش دیارن بەلاّم ئەگەر بەشێکی نادیاربێ، ئەوەنا بێ بە حجە بۆ نموونە: بیانکوژن جگە لە هەندێکیان نەبێ، چونگە کە ئەڵێیت: هەندێکیان هیچ فەردێکی موشریك نیە لەو هەندەدا جێی نەبێتە، وەلام دراوەتەوە: ئەو عامە عەمەلی پێ دەکرێ هەتا یەك دانەیان ئەمێنێتەوە .

(٤) ئەوە کەلامی ئامێدی و غەیری ئامێدی ئەگەیەنێ، ئەوەیە کەڕای هەموویان ئەوەیە : کە عامی تایبەت کراو بەشتی نادیار حجە نیە ، ئەم بۆچوون و حاڵی بوونە بەتاڵ ئەبێتەوەو لائەبرێ بەوەی کە ابن برهان و کەسانیتریش جیاوازی زانایان نەقڵ کراوە تیایدا، لەگەڵ ئەوەش تەرجیحیداوە کە عامی تایبەت کراو حجەیە لەو هەندەیەدا کە ماوەتەوە دوای تخصیص.

{وَ قيلَ } حجةٌ ان خصَّ {بمتصل} كالصفةِ لما تقدمَ في انهُ حينئذٍ حقيقة من أن العمومَ بالنظر إليهِ فقط بخلاف المنفصلِ فيَجوزُ أن يكون قد خصَّ به غير ماظهر فشكَّ في الباقي[1] .

{وَ قيلَ } هو حجةٌ في الباقي {ان انبأ عنهُ العموم} نحو: ﴿ فأقتلوا المشركين ﴾ فإنَّهُ ينبِئُ عن الحربيِّ لتبادر الذهن إليهِ كالذميِّ المخرج بخلاف ما لا ينبِئُ عنه العمومُ نحو: ﴿ والسارقُ والسارقةُ فاقطعوا أيديهما ﴾ [2] .

فإنَّهُ لا ينبِئُ عن السارقِ لقدر ربع دينارٍ فصاعداً من حرزِ مثله كما لا ينبِئُ عن السارقِ لغير ذلك المخرَج اذْ لا يعرف خصوصُ هذا التفصيلِ إلاّ مِنَ الشارع فالباقي في نحو ذلك يشك فيه باحتمال اعتبار قيدٍ آخر [3] .

---

(١) هەندێك وتويانە عامی تايبەتكراو ئەبێتە حوججە و بەڵگە بەهۆیمتصلێكەوە تايبەت كرابێ، وەك ئەوەی بەصيفەتێك تايبەت كرابێ، چونكە لەپێشەوە رابورد كە عامی تايبەت كراو لەو كاتەدا حەقيقەتە لەباقيەكەدا ، لەوبارەوە كە عموم و گشتگيريەكەی تەنها بەگوێرەی ئەو باقيەيە، بەپێچەوانەی منفصليەوە-اكرم الإنسان لكن الجاهل لاكرمە- ئەگونجێ ئەو عامە تايبەت كرابێ بەمنفصل جگە لەوەی بە ظاهر لێی دەرچووە هيتريش لە حوكمی زەواڵدان و ئەوەی كەماوەتەوە بەيەقين نەماوەتەوە بەڵكوو جێی گومانە.

(٢) كۆمەڵێك وتويانە: عامی تايبەت كراو بەڵگەيە لەوەدا كەماوەتەوە، ئەگەر خودی عامەكە ئەوە بگەيەنێ وەك: المشركون بكوژن ئەوە موشريكی جەنگاوەر ئەگەيەنێ، چونكە كەوترا يەكسەر ئينسان ئەوەی لێحاڵی ئەبێ وەك موشركێكی هاوپەيمان ئەگرێتەوەو بەبەڵگە لێی دەرچووە ، بەپێچەوانەی ئەوەی خودی عامەكە ئەوە نەگەيەنێ ، وەك پياوی دزو ژنی دز دەستيان ببڕن .

(٣)ئەو باسی ئەوە ناكا دزێك ئەندازەی چارەكە ميسقاڵێك يان زياتری دزيبێ لەجێی تايبەتی خۆيدا ،وەك باس لەو دزەش ناكا جگە لەوەش بدزێ و بە بەڵگەی تر لەم حوكمە دەرچووبێ و نەيگرێتەوە ، چونكە ئەوەی تايبەت بێ بەتنفيذ و جێبەجێ كردنەوە لە لايەن خاوەن شەرعەكەوە نەبێ نازانرێ ، كە وابوو ئەویتريش وەك ئەم جێی گومانە چونكە هەڵئەگرێ بەهۆی قەيدێكیترەوە دەرچووبێ.

{وَ قِيلَ } هو حجّة {في اقلّ الجمع} ثلاثةٍ او اثنين لأنه المتيقّنُ وما عداهُ مشكوكٌ فيه لإحتمالِ ان يكون قد خصً وهذا مبنيٌّ على قولٍ تقدَّم انه لايَجوزُ التخصيصُ الى اقلّ من اقلّ الجمع مطلقاً [1] . {وَ قِيلَ غير حجة مطلقا} لأنه لاحتمال ان يكون قد خص بغير ما ظهر يشك فيما يراد منه فلا يتبين الاّ بقرينةٍ قال المصنِّف والخلاف ان لم نقل انه حقيقة فان قُلْنا ذلك احتج به جزماً[2] .

{ويتمسك بالعام في حياةِ النبيِّ ﷺ قبل البحثِ عن المخصِّص} اتفاقاً كما قاله الاستاذ ابو اسحق الاسفرايني {وكذا بعد الوفاة[3] خلافاً لإبن سريج} ومن تبعهُ في قوله لا يتمسك به قبلَ البحث لإحتمال المخصّص و أُجيبَ بانّ الأصل عدمُهُ وهذا الإحتمال منتفٍ في حياةِ النبيِّ ﷺ لأنَّ التَّمسُّك بالعام إذْ ذاك بحسبِ الواقع فيما ورَد لأجله مِنَ الوقائع وهو قطعيُّ الدخولِ لكن عند عندَ الأكثرِ كما سيأتي[4] .

---

(١) هەندێکیتر وتویانە عامی تایبەت کراو بەڵگەیە لەکەمترین ژمارەی کۆی جەمعدا کە سێیە یاخود دوانە، چونکە ئەو ژمارەیە بێگومان ئەیگرێتەوە جگە لەو ژمارەیە بێگومانە، چونکە هەڵئەگرێ ئەو عامە تایبەت کرابێ، ئەم بۆچوونەش لەسەر قەولی رابوودوو دروست بوو کە ووتی: دروست نیە عام شتێ‌ێ کەم بکرێتەوەو فەردی لێدابڕێ، تا ئەگاتە کەمتر لە ئەندازەی ژمارەی جەمع، چ ئەو عامە جەمع بێ یاخود موفرەدی عام بێ.

(٢) هەندێك عامی تایبەت کراو لە هیچ شتێکدا بەڵگە نیە، چونکە هەڵئەگرێ تایبەت کرابێ بەشتێك جگە لەوەی دیارە، ئایا مەبەست لەو عامە کامەیە، بێگومانە، ئەو مەبەستەش دەرناکەوێ بەقەرینە نەبێ، دانەر فەرموویەتی: ئەم جیاوازیە لەنێوان زانایاندا لەبارەی عامی تایبەت کراوەوە کاتێ ئەبێ ئەڵێین: عامی تایبەت کراو حەقیقەتە لەباقیەکەدا خۆ ئەگەر ئەوە بڵێین بێگومان ئەوە ئەکرێ بەبەڵگە .

(٣) لەحاڵی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ عام ئەکرێ بەبەڵگەو عەمەلی پێ ئەکرێ پێش ئەوەی بگەڕێ بەشوێن ئەوەدا لەعامی خستوەو تایبەتی کردووە ئەمەش بەڕای هەموو زانایان ، وەك اسفراینی فەرموویەتی: هەروەها لەدوای مردنی پێغەمبەریش هەر عەمەلی پێ ئەکرێ هەتا گوێت لەتایبەت کەرەکەی ئەبێت .

(٤) ابن سریج و ئەوانەی شوێن ئەو کەوتوون جیاوازیان هەیە ، ئەڵێ عام ناکرێ بەبەڵگەو کاری پێ ناکرێ پێش باس و لێکۆڵینەوە ، چونکە ئەوە هەڵئەگرێ کە ئەو عامە تایبەت کەرێکی هەبێ، وەڵام دراوەتەوە بەوە کە ئەصل لەعامدا ئەوەیە کە تایبەتکەری نەبێ کرابێ، خۆ ئەم ئیحتیمالە لەسەردەمی پێغەمبەردا نیە ، چونکە

ومانقلَهُ الآمدي وغيره من الاتفاقِ على ماقالَهُ ابن سريج مدفُوعٌ بحكاية الأستاذ والشيخ أبي اسحق الشيرازي الخلافَ فيه وعليهِ جرى الامامُ الرَّازي وغيره ومالَ الى التَّمسُّك قبلَ البحثِ واختارهُ البيضاوي وغيرُه وتبعهم المصنِّف وهو قولُ الصَّيرفي كما نقله عنه الامام الرَّازي وغيرهُ [1] .

واقتصرَ الآمدي وغيرهُ في النقل عن الصَّيرفي على وجوب اعتقادِ العموم قبلَ البحث عن المخصِّص وعلى قول ابن سريج لو إقتضى العامّ عملاً مؤقتا وضاقَ الوَقت عن البحث هلْ يعمل بالعموم إحتياطاً أو لا خلافٌ حَكاهُ المصنِّف عنه حكاية ابن الصَّباغ وذكرهُ هنا أولا بقولهِ و ثالثُها إن ضاقَ الوقتُ ثُمَّ تركه لأنَّه ليسَ خلافاً في أصلِ المسئلةِ [2] .

---

کارکردن بەعام لەسەردەمی پێغەمبەردا بەگوێرەی ئەو روداوەیە کە بۆ چارەکردنی دابەزیووە –لەفظی عام بۆ سەبەبی خاص– ئەو روداوە تایبەتیە بێگومان دەچێتە ناو ئەو عامە ، بەڵام ئەمەش بەلای زۆربەی زانایانەوە وەك لەمەودوا باسەکەی دێ .

(١) ئەوەی کە ئامێدی و غەیری ئامێدی نەقڵیان کردووە کە گوایە هەموو زانایان یەکڕان لەسەر ئەوەی کە ابن سریج وتوویەتی ، بەتاڵ کراوەتەوە بەوەی کە اسفرایینی و شیرازی جیاوازی زانایانیان تێداگێڕاوەتەوە باس کردووە ، ئیمامی رازی و غەیری ئەویش لەسەر ئەم جیاوازیەی نێوان زانایانەدا رۆیشتوون ، تابگاتە ئەوەش امامی رازی ئارەزووی بەرەو ئەوە چووە کەعام عەمەلی پێبکرێ دوای فەوتی پێغەمبەرﷺ ، پێش باس و لێکۆڵینەوە لەبارەی مخصص و تایبەت کەرەکەیەوە بیضاوی و غەیری ئەمیش ئەم قەولەیان هەڵبژاردووە، دانەریش شوێنیان کەوتووە ، وەهەر ئەمەش رای صەیرەفی بووە وەك رازی و غەیری رازیش نەقڵیان کردووە لێیەوە .

(٢) بەڵام ئامێدیو غەیری ئامێدی کە نەقڵ لەصەیرەفیەوە ئەکەن تەنها لێوە نەقڵ کردووە کەپێش باس و لێکۆڵینەوە لە مخصص و تایبەت کەرەکەی واجبە بڕوابوون بەعمومیەت و گشتگیریەکەی جا لەسەر قەولی ابن سریج کەوتی: پێش باس و لێکۆڵینەوە عەمەلی پێناکرێ، ئەگەر عامەکە داوای ئەنجامدانی کارێکی کاتی کردو کاتەکەش تەنگ و کەم بوو بەشی ئەوەی نەئەکرد بگەڕێ بەشوێن مخصص و تایبەت کەردا ، ئایا لەبەر ئیحتیاط عەمەل بەو عامە ئەکرێ یاخود ناکرێ؟ ئەوە جیاوازی زانایانی تێدا هەیە، دانەر ئەو جیاوازیەی لە ابن (الصباغ)ەوە گێڕاندوەتەوە، دانەر لێرەدا یەکەمجار ئەم جیاوازیەی باس کردبوو، کە دوای ...(خلافا لإبن سريج)

{ثُمَّ يكفي في البحثِ} على قولِ إبن سريج {الظَنَّ} بأن لا مخصِّصَ {خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني في قولهِ لا بُدَّ من القطع قال و يحصل بتكرير النظر والبحث واشتهارِ كلام الأئمة من غيرِ ان يذكرَ احدٌ منهم مخصِّصاً [1].

{المخصِّص} اي المفيدُ للتخصيص {قسمان الاول المتَّصلُ} اي ما لا يستقلُّ بنفسه من اللفظ بأن يقارن العامَّ [2] {وهو خمسةٌ} احدها {الأستثناءُ} بمعنى الدالِّ عليهِ {وهوَ} اي الإستثناءُ نفسُه {الاخراجُ} منْ متعددٍ {بإلاّ او إحدى اخواتها} نحو خلا و عدا و سوى صادراً ذلك الاخراجُ مع المُخرجِ منه {منْ متكلمٍ واحدٍ وَ قيلَ مطلقاً} [3] فقولُ القائلِ إلاّ زيداً عقبَ قولِ غيرِه جاءَ الرّجال استثناء على الثاني لغوٌ على الاول ولو قالَ النبيُّ ﷺ إلاّ اهلَ الذّمة عقبَ نزولِ قوله تعالى: ﴿ فاقتلوا المشركينَ ﴾ كانَ استثناءً قطعاً لأنه مبلِّغٌ عن الله و إن لم يكنْ ذلك قرآناً [4].

---

وتبووی: (وثالثها ان ضاق الوقت) بەڵام پاشان سڕیەوەو لایبرد چونکە ئەم جیاوازیە لەئەصلی مەسئەلەکەدا نیە ، بەڵکوو لەلقێکی مەسئەلەکەدایە.

(١) پاشان لەسەر قەولی ابن سریج ئەوەندە باس و لێکۆڵینەوە بەسە کە گومان هەبێت هیچ مخصص و تایبەت کەرێك نیە، ئەمەش جیاوازە لەگەڵ قەولی باقلانیدا کە وتوویەتی: پێویستە بێگومان بێت لەوەی کە مخصص نیە، جا ئەو بێگومانیە بەعام پەیدا ئەبێ بەچەندەها تێڕوانین وبیرلێکردنەوە، وباس و لێکۆڵینەوە، وە بەبەتاوبوونی رای پێشەوایان کە یەکێکیان لەبەرامبەر ئەو عامەوە مخصصێك و تایبەت کەرێکیان باس نەکردووە.

(٢) مخصص واتە ئەوەی عام تایبەت ئەکاو تخصیص ئەگەیەنێ و دوو بەشە ، بەشی یەکەمیان متصلە، واتە: ئەو لەفظەی خودی خۆی سەربەخۆ مەبەست ناگەیەنێ تا هاوتای عامەکە ئەگرێ و لەگەڵیدا باس ئەکرێ.

(٣) مخصص متصل پێنجن: یەکەمیان: استثنایە، بەلام استثنای بەمانا ئەوەی دەلالەت لەسەر استثنا، جا خودی استثنا بریتیە لەدەرکردن و جیاکردنەوەی شتێك لەچەند شتێك بەهۆی (الا)و هاووێنەکانی ، و(خلا، و عدا، سوی) ، بەلام بەمەرجێك وتی: ئەو ئامێری جیاکردنەوە لەگەڵ جیاکراوەکە دەرهێنراوە کە لەلایەن یەك قسەکەرەوە وترابن . هەندێك وتویانە: ئەو بیڵێ یا یەکێکی‌تر هەر استثنایە .

(٤) کەوابوو کەسێك کە وتی: (الا زیداً) دوایی کە یەکێکی‌تر وتی:(جاء الرجال) لەسەر رای دووەم کە هی قیلەکە استثنایە، بەلام لەسەر قەولی یەکەم ئەوا زیداً لەغوە و هیچ حوکمێك نیە، بەلام ئەگەر پێغەمبەرﷺ بڵێ: (الا اهل الذمّة) دوای دابەزینی ئەم

{ويجبُ إتصاله} اي الإستثناءِ بمعنى الدَّالِ عليه بالمستثنى منه {عادةً} فلا يضرُّ إنفصالهُ بتنفُسٍ او سُعالٍ {وعن ابن عبّاس} يَجوزُ إنفصالهُ {إلى شهرٍ و قيلَ سنة وَ قِيلَ ابداً} رواياتٌ عنهُ[1] .

{وعنْ سعيدِ بن جُبير} يَجوزُ إنفصالهُ {إلى اربعةِ اشهر و عنْ عطاء والحسن} يَجوزُ إنفصاله {في المجلسِ[2] و } عن {مجاهدٍ} يَجوزُ إنفصاله إلى {سنتين و قيلَ} يَجوزُ إنفصالهُ {ما لمْ يأخذ في كلام آخر و قيل} يَجوزُ إنفصاله {بشرط ان ينوى في الكلام} لأنَّه مراد اولا[3] . {وَ قيلَ } يَجوزُ إنفصاله {في كلام الله فقط} لانَّه تعالى لا يغيبُ عنه شيء فهو مرادٌ له او لا بخلافِ غيره وقد ذكر المفسّرون ان قوله تعالى: ﴿ غيرِ اولي الضّررِ ﴾ نزلَ بعد ﴿ لايَستوي القاعدُون منَ المؤمنين ﴾ الخ في المجلس[4] .

---

ئايەتــە كــە دەفــەرموێ: ﴿فـاقتلوا المشـركين﴾ ئـەوە بێگومـان اسـتثنايە چونكـە پێغەمبەرﷺ پەیامی خوا ئەگەیەنێ، و بەناوی ئەویشەوە ئەیگەیەنێ هەرچەندە ئەو: (أهل الذمّة) نیەو قورئانیش نەبێ و بوێرێ مستثنیو مستثنیمنه یەك كەس نیە ،

(١) پێویستە لكاندنی استثنای بەمانا دال لەسەر استثنا، بە(مستثنیمنه)ەكەوە لكـاندنی بـەگوێرەی عـادەت ئـەڵێن لەیـەك جیابوونەتـەوە ، كـەوابوو ئەگـەر بـەهۆی هەناسەدانەوە یاخود بەهۆی كۆكینەوە لەیەك جیابنەوە ، زیان ناگەیەنێ لەعەبدوڵڵای كـوری عەبباسـەوە ریوایـەت كـراوە هـەتا مـانگێكیش هـەر دورسـتە لەیـەكیان جیابكەیتـەوە، كۆمـەڵێك وتوویانـە: هـەتا ساڵێك، هـەندێك وتوویانـە: هـەتا هەتایـە دروستە ، ئەم قیلانە هەموویان لەئیبن عەباسەوە ریوایەت كراون.

(٢) ریوایـەت كراوە لـە (ئیبن جبیـر)ەوە كـە دروسـت جیاكردنـەوەی (مسـتثنی)لـە مسـتثنیمنه تـا مـاوەی چـوار مـانگ ، لـەعطاء الحسینیشـەوە ریوایـەت كـراوە هـەر لەكۆڕەكەدا دروستە جیای بكەیتەوە.

(٣) لەمجاهدەوە ریوایەت كراوە كە هەتا ساڵێكیش هەر دروستە جیای بكاتەوە لە مسـتثنیمنه ، هـەندێك وتوویانـە: دروسـتە جیـای بكرێتـەوە مـادام دەسـت نـەكا بەباسكردنی بابەتێكیتر، كۆمەڵێك وتوویانە: دروستە جیابكرێتەوە بەمەرجی ئەوە لەنێوان گفتۆكەیدا نیەتی ئەوە بێنێ كە استثنای ئەكا ، چونكە هەر لەئەوەڵەوە ئەوەی مەبەست بووە ، پاشان دوای هەڵوێستەیەك باسی كردووە.

(٤) هەندێ وتوویانە: كە تەنها لەكەلامی خودا دروستە جیاكردنەوە (مستثنی)لە مستثنیمنه ، چونكە خودای گەورە هیچ شتێكی لێوون نابێو كەوابوو ئەو استثنایە هەر لەئەوەڵەوە مەبەست بووە ، بەڵام كەلامی غەیـری خوا وانیە ، زانایانی تەفسیر لە

وقرأه نافع وغيره بالنصب اى على الإستثناء كما قرأه أبو عمرو وغيره بالرفع اي على الصفة والأصلُ فيما و روى عن ابنِ عبّاس ونحوه كما روى عنه قوله تعالى: ﴿ ولا تقولَنَّ لشيءٍ انّي فاعل ذلك غداً إلاّ انْ يشاءَ الله و اذكر ربَّك اذا نسيت ﴾ اي اذا نسيت قول ان شاء الله ومثله الإستثناءُ وتذكّرتَ فاذكرهُ ولم يعين وقتاً فاختلفتِ الآراءُ فيه على ما تقدَّمَ من غير تقييدٍ بنسيانٍ توسُّعاً فقوله ﴿ واذكُرْ ربَّك ﴾ اي مشيئةَ ربِّك [1].

{اما} الإستثناء {المنقطعُ} بأن لا يكونَ المستثنى فيه بعض المستثنىمنهُ عكسَ المتصل السابق المنصرف إليه الإسمُ عند الإطلاقِ نحو: ما في الدار احَدٌ إلاّ الحمار [2] {فثالثها} اي الأقوال لفظ الإستثناءِ {متواطٍ} فيه وفي المتصل اي موضوعٌ للقدرِ المشترَك بينهما اى المخالفةُ بإلاّ او واحد اخواتها حَذراً من الاشتراك والمَجاز الآتيين[3].

---

لێكدانەوەی ئایەتی ﴿غير أولي الضرر﴾ دا وتوویانە: ئەم ئایەتە دوای ئایەتی: ﴿ لايستوي القاعدون ﴾ وە هاتووەتە خوارەوە هەر لەخودی ئەو مەجلیسەدا.

(١) نافیع و غەیری نافیعیش غەیریان بەنەصبە خوێندوەتەوە، واتە: بە استثنا خوێنراوەتەوە . وەك أبو عمرو هەندێكیتر بەرەفعەیان خوێندوەتەوە، واتە: صیفەت بێ بۆ القاعدون . بەڵگەی ابن عباس و زنایانانیتر وەك هەر لەخودی ابن عباسەوە ریوایەت كراوە ئەم فەرموودەیەی خوایە :﴿ وَلاَ تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا * إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ وتنی (انشاءالله)ت لەبیر بچێ ئەمجا بیرت كەوتەوە بیڵێ، جا خۆ ئەمە استثنای تێدا نیە؟ استثناش وەك (انشاءالله) وایە، ئەگەر لەبیرتی بچێ و بیرت هاتەوە(انشاءالله) بكە، خوای گەورە كاتی دیاری نەكردووە نەساڵ نەمانگ ؛ لەبەر ئەوە ئەو هەموو رایانەی زانایانی لێدروست بووە بێئەوەی لەبیرچوونەوەیان پێوەلكاندبێ لەبەر فراوان كردنی .

(٢) بەڵام ئەوەی باسكرا لەمستثنیی متصلدا بوو ، بەڵام مستثنیی منقطع كە بریتیە لەوەی مستثنیكە هەندێك بێ لە(مستثنیمنه)وەكە، بەپێچەوانەی متصل كە لە پێشەوە باسكرا، بۆیە لەپێشەوەش باسكرا چونكە لەكاتیوتنی استثناوناوبردنی دا هەربەسەر متصلدا ئەبڕێ، وەك لەم ماڵەدا كەسی تێدا نەبێ جگە لەم كەرە نەبێ.

(٣) ئەوە چەند قەولێكی تێدا هەیە، سێهەمیان ئەوەیە كە لەفظی استثناء متواطئ یە واتە: دانراوە بۆ ئەو ئەندازەیە كە موشتەرەكە لەنێوان مستثنیمتصل و منقطعدا ، قەدەری مشترك واتە حوكمی مستثناكە لە (مستثنیمنه)كە جیاوازبێ بەهۆی لەفظی (الاّ) وە ، یاخود یەكێكیتر لە هاووێنەكانی بۆیە وایە چونكە بەوە دەپارێزرێ لەوەی

والاوّلُ الأصَحّ انّـه مجـازٌ في المنقطـع لتبـادُرِ غـيره اي المتَّصـل الى الذّهـنِ والثّـاني انّـه حقيقـةٌ فيـه كـالمتَّصل لانّـها الأصـل في الإسـتعمال ويحـدّ بالمخالفـة المذكـورة من غير اخراج [1]. وهذا القول بمعنى قوله و الرابع مشترك بينهما فهوَ مكرَّرٌ إلاّ انْ يريدَ بالمطويِّ الثاني انه حقيقةٌ في المنقطع مجازٌ في المتّصل ولا قائلَ بذلك فيما علمت [2].

{والخامسُ الوقفُ} اي لا يدري اهو حقيقةٌ فيهما ام في احدهما أم في القدرِ المشتركِ بينهما[3] ولمّا كانَ في الكلام الإستثنائي شبَهُ التناقضِ حيثُ يثبت المستثنى في ضمن المستثنىمنه ثُمَّ ينفى صريحاً وكان ذلك اظهر في العددِ لنصوصيَّتهِ في آحادهِ دفع ذلك فيه بيان المراد به بقوله[4] .

---

مشترك بێ یاخود مەجاز بێ، کە ئەمانیش دوو قەولن لەمەوداو دێن .

(١) بەڵام قەولی یەکەم کە لەهەموویان صحیح ترە لەفظی (مستثنی)مەجازە ، لە منقطعدا، ، چونکە لەکاتی ورتنی استثنادا یەکسەر غەیری منقطع کە متصلە بەرەوە زیهنی ئینسان ئەڕوا؛ قەولی دووەمیش ئەوەیە لەفظی استثنا حەقیقەتە لە منقطعدا وەك هەم لە متصلیشدا هەر حەقیقەتە چونکە ئەصل لەبەکارهێنانی لەفظدا بۆ مانای ئەوەیە لەحەقیقەتدا بەکاربهێنرێ . پێناسەی (مستثنی)ی منقطع دەکرێ بەوە کە: ئەوەیە حوکمەکەی پێچەوانەی (مستثنیمنه) ەکە بێ ، بێ ئەوەی وشەی بێدەرکردنی لەپێشووی بلکێ بۆ ئەوەی لەپێشەوە جیابکرێتەوە .

(٢) ئەم قەولی یەکەمە هەر بەواتای قەولی چوارەمە کەئەڵێ: لەفظی استثنا مشترەکە لەنێوان هەردووکیاندا، کەوابوو دووبارە کراوەتەوە مەگەر بوترێ دانەر مەبەستی قەولی دووەمە ، کە لەفظی استثنا حەقیقەتە لەمنقطعدا و مەجازە لە متصلدا ، وەهیچ کەسێکیش وەك من بزانم ئەو هەڵەی نەکردووە.

(٣) قەولی پێنجەم ئەوەیە کە وەقفەو هەڵوێستەی کردووە، واتە نازانێ ئایالەفظی استثنا حەقیقەتە لە هەردووکیاندا، یاخود هەر لەیەکێکیاندا ، یاخود لەو ئەندازە هاوبەشەدا لەنێوان هەردوکیاندا.

(٤) لەبەر ئەوەی کاتێك تەلەفظ ئەکرێ بەکەلامیك کە استثنای تیادابێ وا دایارە کە کەلامەکە وێنەی دژایەتی تێدابێ –واتە سالبیش بێ موجبیش بێ– چونکە لە دووتوێ تەلەفظ کردن بە (مستثنیمنه)وەکەوە کە موستەثناکە موثبەتە، پاشان بەروونی و رەوانی نەفی ئەکرێ، جا لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە دژایەتی یە لەروونترو لەبەرچاوترە وێنەی بەژمارە هێنایەوەو، چونکە ژمارە ئەندازەکەی دیارە –ووتت عشرە دیارە بەڵام ووتت (قوم) دیار نیە– جا لەبەر ئەوە دانەر ئەو جۆرە دژایەتی یەی

{والأصَحُّ وفاقاً لإبن الحاجب انَّ المرادَ بعشرة في قولك} مثلاً لزيد على {عشرةٌ إلاّ ثلاثــة العشـرة باعتبـار الأفـرادِ} اي الآحـاد جميعـها {ثُـمَّ اخرجـت ثلاثـة} بقولــه إلاّ ثلاثة {ثُمَّ اسـندَ الى البـاقي} وهـو سبعةٌ {تقديـراً وان كـان} الاسـناد {قبلـه} اي قبـلَ اخراج الثلاثة {ذكراً فكانُه قال له عليَّ الباقي من عشرة اخرج منها ثلاثةً وليس في ذلك إلاّ الاثبات ولا نفيَ اصلاً فلاتناقضَ [1] {وقال الأكثرُ المرادُ} بعشـرة فمـا ذكـر {سبعةٌ وإلا} ثلاثة {قرينةٌ} لذلك بيَّنَت ارادةَ الجزءِ بإسم الكلِّ مجازاً [2] .

{وقال القاضي} ابوبكر الباقلاني {عشَرةٌ إلاّ ثلاثةً} اي معنـاه {بـازاء اسمين مفـردٌ} وهـوَ سبعةٌ {ومركبٌ}وهـو عشرةٌ إلاّ ثلاثـةٌ ولا نفي ايضـاً علـى القولـين فـلا تنـاقضَ ووجْهُ تصحيحِ الاول ان فيه توفيةً بما تقدَّمَ من ان الإستثناءَ إخراجٌ بخلافهما [3] .

---

رەوانـدەوەو لایـبر لـەژمارەدا بەهۆی رونکردنـەوەی مەبەسـت بـە(مستثنیمنه)وەکـەوە چییە؟ بەم شێوەیە دانەر ووتی:

(١) قـەولی راسـتتر لەهـەموان کەپەسـەندکراوی (ابن الحاجب)یشە ئەوەیە مەبەسـت عەشرەییَك کـە ئـەڵێت: زەیـد هەیـەتی بەسـەرمەوە دە دینـار جگـە لەسـیَ نـەبیَ، عەشـەرەییَکە کە هـەرە دەژمارە بگرێتـەوە، بـەڵام پاشـان یـیَی لیَفـرە درابـیَ، بـەهۆی وتنـی: (الاّ ثلاثـة)وە، ئەمجا اسنادی حوکمەکگە ئەدا بەسـەر ئـەوەدا کـە ماوەتـەوەو ددانی پیادەنیَ کە ژمارە حەوتە، بەڵام دان پیانانەکەی بەتەقدیرو پەنهانە ، هەرچەندە پێش فرەدانی سیَیەکە اسنادی حوکمەکە راستەوخۆیە ، وەك ئەوەیە وتبێتـت: زەیـد هەیەتی بەسەرمەوە ئەو ئەندازەیەی ئەمێنێتەوە لە دە، کە سیَی لیَلادەبریَ دەخۆ لـەم دان پیادانانـەدا جگـە لـەاثبات نـەبیَ هیـچ جـۆرە نەفیـەکی تێـدا نیـە، کـەوابوو هیـچ تناقض و دژایەتیەکی تێدا نیە.

(٢) بەڵام زۆربەی زانایان بۆ لابردنی ئەو دژایەتییە ووتویانـە: مەبەسـت بـەو دەیـە حەوتـە —واتـە: مـەجازە— (الاّ ثلاثـة)قەرینەیە لەسـەر ئەو مەبەستی روون کردوەتـەوە ئەو کلەکە دەکەیە مەبەست پێی جوزئو بەشێکیەتی کە حەوتە لەرووی مەجازەوە .

(٣) بـاقلانی ووتویـەتی: مانـای (عشـرة الاّ ثلاثـة) بـە دوو نـاو لەیـەك ئەدرێتــەوە یەکەمیان یـەك ووشەیە کەحەوتە، دووەمیـان لـەدوو ووشـە پێکهاتووە کە دەیە جگـە لەسـیَ نـەبیَ، لەسەر ئەم دوو قەولـەش دووبارە هـەم نـەفی تێـدا نیـە ، کـەوابوو هیـچ دژایەتیەك نیە بەڵام قەولی یەکەم کە وترا اصحە و ئەمانیترمان بەقیل باس کـرد لـەبەر ئەوەیە کەلەقەولی یەکەمدا وەفا ئەکا بەپێناسەکەی پێشوو کەوترا:استثنایە بـەواتــای اخراج و لابردن و دابرینی مستـثنییە لە (مستثنی منه)وەکەیە، بـەڵام ئەو دوو قـەولە

{ولا يجوزُ} الإستثناء {المستغرق} بان يستغرق المستثنى المستثنىمنه اي لااثرَ له في الحكم فلو قال: له عليَّ عشرةٌ إلاّ عشرةً لزمهُ عشرة [١] {خلافاً لشذوذٍ} اشار بذلك الى ما نقله القرافي عن المدخَلِ لإبن طلحة فيمن قال: لإمراته انت طالقٌ ثلاثاً إلاّ ثلاثاً انهُ لايقعُ عليهِ طلاقٌ في احدِ القولينِ ولم يظفر بذلكَ من نقلَ الإجماعَ على إمتناع المستغرقِ كالإمام الرازي والآمدي[٢] .

{قيل ولا} يَجوزُ {الأكثر} من الباقي نحو: لَهُ عليَّ عشرة إلاّ ستةً فلا يَجوزُ بخلاف المساوي والاقلّ[٣] {وَ قِيلَ } لا الاكثرِ {ولا المساوي} بخلاف الأقلّ[٤] . {وَ قِيلَ } لا الأكثر {ان كان العدد} في المستثنىو المستثنىمنه {صريحاً} نحو ما تقدَّمَ بخلاف غير الصريح نحو: خذْ الدراهم إلاّ الزيوفَ وهي اكثر كذا حَكَى هذا القولَ في شرحيه كغيره في الأكثر وان شملتِ العبارة هنا حكايَتَهُ في المساوي[٥] .

---

ئەو دوو پێناسەیان بەسەردا جێبەجێ ئەکرێ .

(١) دروست نیە (مستثنى)داگرندەبێ بۆ هەموو (مستثنىمنه) وەکە، واتە: لە حوکمدا هیچ شوێنەوارێکی نیە، وەك هەر نەوترابێ، کەوابوو ئەگەر وتی: زەید هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە لە دە دینار ، ئەوە ئیعترافی بە دە دینار کردوە.

(٢) بەپێچەوانەی چەندەها قەول کە لەقاعیدەی گشتی چوونەدەر ، دانەر بەم قسەیە ئامارەی کرد بۆ ئەوەی کە قەرافی نەقلی کردووە لە کتێبی: (المدخل) لەوە لە (ابن طلحە)وە لەبارەی کەسێکەوە بەژنەکەی بڵێ: تۆ سێبەسێ طەلاقت کەوتووە جگە لەسیان نەبێ، ئەوە لەیەکێك لەو دووقەولەدا هیچ طەلاقی ناکەوێ ، ئەوە نەقلی ئیجماعی کردوە لەسەر ئەوەی ئیجماعی داگرندە قەدەغەیە ئاگای لەم دوو قەولە نەبووە ، وەك ئیمامی رازیو ئامێدی.

(٣) ئەڵێن: دروستیش نیە ئەوەی ئەمێنێتەوە زیاتر بێت لەوەی ئەڕوا، وەك هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە لە شەش دینار نەبێ، بەڵام ئەگەر هەردوکیان یەکسان بن یاخود کەمتر بێت لە (مستثنىمنه) وەکەوەئەوە دروستە.

(٤)هەندێکیش ووتویانە: ئەگەر استثناکە زیاتر و یەکسان بێت دروست نیە، بەڵام ئەگەر کەمتر بێت دروستە.

(٥)هەندێکیتر دەڵێن ئەگەر(مستثنى) زۆرتر بێت دروست نیە، بەمەرجێ لە (مستثنى) و (مستثنىمنه)وەکەدا ژمارەکە صریح و دیاربێ، وەك ئەو نموونەی پێشەوە دە دیناری هەیە جگە لەشەش نەبێ ، بەڵام ئەگەر ژمارەکە صریح و دیار نەبێ ئەوە دروستە، وەك:(خذ الدراهم الا الزيوف)، ئەو دەرهەمانە هەڵگرە جگە لە

{وَ قيلَ لا يستثنى من العدد عقد صحيح} نحو له مائةٌ إلاّ عشرةً بخلاف إلاّ تسعةً[1].

{وَ قيلَ } لا يستثنى منه {مطلقاً} وقوله تعالى:﴿ فلبث فيهم الفَ سنةٍ إلاّ خمسين عاماً ﴾ اي زمناً طويلاً [2] كما تقول لمن يستعجلك: إصبر الفَ سنة وكلُ قائل بحسب استقرائه وفهمه والأصَحُ جوازُ الأكثر مطلقاً وعليه معظم الفقهاء اذ قالوا: لو قال: لَهُ على عشرةٌ إلاّ تسعةً لزمه واحدٌ [3].

{والإستثناءُ من النفي اثباتٌ وبالعكس خلافاً لأبي حنيفة} فيهما وَ قيلَ في الأول فقطْ فقال: إن المستثنى من حيثُ الحكم مسكوتٌ عنهُ [4].

---

زۆربەیان نەبێ، زیوف بەشی زۆرتریەتی . دانەر لەهەردوو شەرحەکەیدا ئەم قەولەی ئاوا گەڕاندوەتەوە هەر بۆ ئەوەیان ئەبێ (مستثنی)کە زیاتر بێ لە (مستثنیمنه)وەکە، هەرچەندە قسەی ئێرەی مساویش ئەگرێتەوە. بەڵام تەنها بۆ ئەکثەریانە.

(١) کۆمەڵێك وتوویانە دروست نیە عەقدی تەواو -وەك: دە بیست سی حەوت- لەژمارەدا استثنا بکرێت بۆ نموونە: بڵێیت: صەد دیناری هەیەبەسەرمەوە جگە لە دە دینار نەبێت دروست نیە، بەڵام بڵێت: جگە لە نۆ دینار نەبێ دروستە.

(٢) هەندێك وتویانە: عەقد صەحیح بێت یا شکاو بێت استثنای لێناکریت -چونکە هەموو ژمارەیك سەربەخۆی خۆیەتی- ئەی ئەوە نیە لەقورئاندا کراوە دەفەرموێ: هەزار ساڵ لەناو قەومەکەیدا مایەوە جگە لە پەنجا ساڵ نەبێ، ئەوە بەمانای ژمارە نیە بەڵکو بەمانای ماوەیەکی دوورو درێژ لەنێوانیاندا مایەوە .

(٣) وەك کەسێك پەلەت لێبکا و بڵێت هەزار ساڵ چاوەڕێم بکە، ئەم هەموو قەولانە کەهەن هەریەك بەگوێرەی خوێندنەوەی خۆی و حاڵی بوونی خۆی لێکی داوەتەوە ، قەولی ئەصەح ئەوەیە کە دروستە استثنا لە (مستثنیمنه)یەك بکرێت کە زیاتر بێت چ عەقدی صحیح بێت یا شکاو بێ ، زۆربەی شەرعزانەکان لەسەر ئەوەن ، چونکە وتویانە: ئەگەر کەسێ ووتی: زەید هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە لەنۆی نەبێ، ئەوە ددانی بەیەك دینار داناوەو واجبیەتی یەك دیناری بداتێ.

(٤) ئەگەر استثنا لە (مستثنی)منفی کرا ئەوە موثبەتە ، وەئەگەر (استثنا)لە (مستثنیمنه)ی موثبەت کرا ئەوە مەنفییە ، بەڵام ئەبو حەنیفە لەهەردوکیاندا جیاوازە وتراویشە : تەنها لەیەکەمیاندا جیاوازە ، ئەبوحەنیفە فەرموویەتی: (مستثنی) لەبارەی حوکمەکەیەوە بێدەنگی لێکراوە .

فنحو: ما قام احدٌ إلاّ زيداً وقام القومُ إلاّ زيداً يدَل الأول على اثبات القيام لزيد والثاني على نفيهُ عنه وقال: لا وزيدٌ مسكوتٌ عنه من حيثُ القيامِ وعدمِه [1].

ومبنى الخلافِ على ان المستثنى من حيثُ الحكم مُخرَجٌ من المحكوم بهِ فيدخل في نقيضه منْ قيامٍ اوعدمه مثلاً او مُخرَجٌ من الحكم فَيَدخلُ في نقيضهِ اي لا حكم إذْ القاعدة ان ماخرج من شيء دخَلَ في نقيضهِ وجعل الإثباتَ في كلمةِ التوحيد بعرف الشَّرع و في المفرَّغ نحو: ماقام إلاّ زيدٌ بالعرفِ العامّ[2] .

{و} الإستثناءات {المتعددةُ ان تعاطفت فالأوَّل} اي فهي عائدة للأوَّل نحو: لهُ على عشرةٌ إلاّ اربعةً و إلاّ ثلاثةً والاثنين فيلزمه واحدٌ فقط [3].

---

(١) کەوابوو بەلای ئێوەوە نموونەی (ماقام أحدٌ الا زيداً ، وماقام القوم الا زيداً)، يەکەميان اثباتی وەستان دەکات بۆ زەيد ، دووەميان نەفی دەکات ، ئەبو حەنيفە دەڵێت: نەخێر، زەيد بێدەنگی لێکراوە لەبارەی وەستان و نەوەستانيەوە .

(٢) جياوازی نێوان ئێمەو حەنەفيەکان لەمەوە دروست بووە، ئايا (مستثنى)کە لەبارەی حوکمەکەوە لەحوکمی (مستثنیمنه) دەرنەخراوە -وەك ئێمە ئەڵێين وەك: جاء القوم الاّ زيداً، زەيد لەو هاتنو مەجيئەی بۆ قەوم ثابت بووە وەدەرنراوە- ئەو کاتە دەچێتە ناو حوکمێکەوە کەدژی بەحوکمی قەومە، چ وەستان بێ ياخود نەوەستان، ياخود (مستثنى)ەکە لەهەموو حوکمێك وەدەرئەنرێ، ئەو کاتە ئەچێتە ناو دژی حوکمەکەوە ، واتە هيچ حوکمێك بۆ (مستثنى)کە ناکرێ و بێدەنگی لێدەکرێ، بۆيە ئەم جياوازيە دروست بووە چونکە قاعيدە ئەڵێ: ئەوەی دەرچوو لەشتێك، ئەچێتە ناو دژی ئەو شتەوە ، بەلام ئەبوحەنيفە إثباتی ئولوهيەتی (الله)ی لەووشەی يەکتاپەرستیدا بەهۆی عورفی شەرعەوە کردووە، نەك لۆغە وەلە (مستثنى)ی موفەرەغيشدا، وەك:(ماقام الاّ زيد) بەهۆی عورفی عامەوە کردوويەتی نەك لۆغە.

(٣) ئەگەر چەند استثنايەك بەشوێن يەکتردا هاتن ، ئەگەر بەعطف کرانەوە هاتن بەشوێن يەکتردا ، ئەوە هەموويان ئەگەڕێنەوە بۆ (مستثنیمنه)ی يەکەم -واتە هەموويان کۆئەکرێنەوە لە (مستثنیمنه)ی يەکەم لائەبرێن ، سەرەنجام چی مايەوە ئەوە باقيە-وەك: زەيد هەيەتی بەسەرمەوە دە دينار جگە لەچوارنەبێ وە جگە لە سێ نەبێ، وە جگە لەدوو نەبێ ئەوە تەنها ددانی بەيەك دينار داناوە ، چونکە دوو سێو چوار ئەکاتە نۆ، نۆ لە دە بڕوا يەکێکی ئەمێنێتەوە .

{والا} اي وان لم تتعاطف {فكلٌ} منها عائدٌ {لما يليه ما لم يستتغرِقْه} نحـو لَـهُ عليَّ عشرةٌ إلاّ خسمة إلاّ اربعة إلاّ ثلاثة فيلزمه ستة لأنّ الثلاثة تخرج من الأربعة يبقىَ واحدٌ يخرج من الخمسة يبقي اربعة تخرج من العشرةِ تبقى ستة[1] .

فإن استغرَقَ كلٌ ماليليه بطل الكلُ وان استغرق غير الاول نحو له عليَّ عشرةٌ إلاّ اثنين إلاّ ثلاثة إلاّ اربعة عاد الكلُ للمستثنىمنه فيلزمُهُ واحدٌ فقط وان استغرَقَ الأول نحو: له على عشرةٌ إلاّ عشرةٌ إلاّ اربعةً قيل يلزمه عشرةٌ لبطلانِ الأوَّل و الثاني تبعاً وَ قيلَ اربعة اعتباراً لإستثناء الثاني من الاولِ وَ قِيلَ ستة إعتبار الثاني دون الأوَّل[2] .

---

(١) بەڵام ئەگەر عەطف نەكرانەوە سەریەك ئەوا هەریەكەیان ئەوی پێش خۆی ئەبێ بە(مستثنىمنه)ی بەمەرجێ داگرندەی نەبێ، وەك: هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە لەپێنج نەبێ جگە لەچوار نەبێ جگە لەسێ نەبێ ئەوە ددانی بەشەش دیناردا ناوە، چونكە سێ لەچوار بڕوا یەك باقیە ، یەك لە پێنج بڕوا چوار باقیە ، چوار لەدە بڕوا شەش باقیە، یاخود بەگوێرەی ئەگەر مثبت بوو مەنفیە، وە ئەگەر منفی بوو ئەوە مثبتە، دە و چوار ئەكاتە چواردە، مەنفیەكانیش پێنج و سێ ئەكاتە هەشت، هەشت لە چواردە بڕوا شەش باقیە ، یاخود سێ لە چوار بڕوا یەك ئەمێنێ، یەكیش لە پێنج بڕوا چوار ئەمێنێ ، چواریش لە دە بڕوا شەش باقیە .

(٢) بەڵام ئەگەر هەموویان داگرندەی ئەوە بێ بەشوێنیا –هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە دە نەبێ جگە دە نەبێ ئەوە هەموویان بەتاڵ دەبنەوە ، وەئەگەر جگە لەیەكەمەكەیان داگرندە بوو ئەوە هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆ (مستثنىمنه)ی یەكەم ، وەك هەیەتی بەسەرمەوە دە دینار جگە دوان نەبێ، جگە سیان نەبێ، جگە چوار نەبێ، چوارو سێو دوو ئەكاتە نۆ، نۆ لە دە بڕوا یەك باقیە كەوابوو تەنها یەك دیناری لەسەرە، وەئەگەر یەكەمیان داگرندە بوو ، وەك: دە دیناری بەسەرمەوە هەیە جگە لە دە نەبێ، جگە چوار نەبێ ، ئەوە هەندێ وتویانە: دانی بەوەدا ناوە، چونكە (مستثنى)ی یەكەم بەتاڵ بوەتەوە، دووەمیش بەتەبەعی یەكەم بەتاڵ بووەتەوە، كۆمەڵێك ئەڵێن: دانی بەچواردا ناوە چونكە استثنای دووەم لەیەكەم كراوە واتە چوار لەدە بڕوا شەش باقیە شەشیش لە دە بڕوا چوار باقی ، وتراویشە: دانی بەشەش دا ناوە ، یەكەم اعتباری پێناكرێ، چواریش لە دە دەرئەكرێ شەش ئەمێنێتەوە.

{و} الإستثناء {الوارد بعد جُمَلٍ متعاطفه} عائدٌ {للكل} حيثُ صلح لأنه الظاهر مطلقاً[1] {وَ قيلَ ان سيق الكلُ لغرضٍ} واحدٍ عاد للكلّ نحو: حبستُ داري على أعمامي و وقفتُ بستاني على اخوالي وسبَّلتُ سقايتي لجيراني إلاّ ان يسافروا و إلاّ عادَ للاخيرة فقط نحو: اكرم العلماءَ وحبس ديارك على اقاربك واعتق عبيدكَ إلاّ الفسقةَ منهم[2].

{وَ قيلَ ان عطف بالواو} عاد للكُلّ بخلاف الفاء وثُمَّ مثلاً فللأخيرة وعلى هذا الآمدي حيثُ فرض المسئلة في العطف بالواو [3]. {وقال ابو حنيفة والإمام} الرَّازي {للاخيرة} فقط لانه المتيقّنُ [4] {وَ قيلَ مشترك} بين عوده للكُلّ وعوده للأخيرة لإستعماله في كلَ منهما والأصلُ في الإستعمال الحقيقةُ[5]. {وَ قيلَ بالواقف} اي لايدرى ما الحقيقةُ منهما ويتبيَّنُ المرادُ على الأخيرين بالقرينة وحيثُ وجدت انتفي الخلاف [6].

---

(١) استثنایەك كە هاتبێ لەدوای چەند رستەیەكەوە بەهۆی عەطفەوە هاتبن بەشوێن یەكدا ، ئەو استثنایە ئەگەڕێتەوە بۆ هەموو جوملەكان بەمەرجێ بگونجێ بۆ هەموویان چونكە هەروا دیارەو دەرئەكەوێ ، چ بە واو عەطف كرابێتەوە یان نا .

(٢) هەندێك ئەڵێن كاتێك استثناكە روو دەكاتە هەموویان ئەوانیش هەموویان ، بۆ یەك مەبەست هاتبن، وەك خانوەكەم وەقفیمامەكانم كرد، باخەكەم وەقفی خاڵوانم كرد ئاوەكەشم وەقفی دەراوسێكانم كرد،مەگەر كاتیْبچنەسەفەر،چونكە هەمووی‌مەبەست پێی خێرو چاكەو وەقفە، استثناكە روو لەهەموویان دەكات، بەڵام ئەگەر بۆ یەك مەبەست نەهاتبن تەنها بۆكۆتاییەكەیان ئەگەڕێتەوە، وەك:رێز لەزانایان بگرە، خانوەكەت وەقف بكە لەسەر خزمەكانت، بەندەكانیشت ئازاد بكە جگە لەفاسیقەكان نەبێت. (٣) هەندێك وتوویانە: كاتێك ئەگەڕێتەوە بۆ هەموویان كە بەحەرفی عەطف عەطف كرابێتەوە بەڵام ئەگەر بەفیّو بەثمّ عەطف كرابێتەوە ئەوە تەنها بۆ كۆتاییەكەیانە، ئامێدی لەسەر ئەم قەولەیە، چونكە ووتویەتی: ئەو جیازازیە لە عەطفیكایە كە بەولو بێ، ئەگەر بەغەیری واو بێ ئەوە هیچ جیاوازیەكی تێدا نیە.

(٤) ئەبو حەنیفەو رازی وتوویانە: استثناكە تەنها بۆ ئاخرەكەیان ئەگەڕێتەوە چونكە ئەوە بێگومانە. (٥) وترایشە : مشترەكە لەنێوان هەموویاندا گەڕاندنەوەیان بۆ ئاخرینەكەیان ، چونكە بەكارهاتووە بۆ هەردووكیان، قاعیدەش لەبەكارهێناندا ئەوەیە كە لەحەقیقەتدا بەكاربێ.

(٦) هەندێك وتویانە: هەڵوێستەی تێدا ئەكەین واتە نازانرێ كامیان حەقیقەتە، بۆ هەموویان بێ یا بۆ دواییینی هەموویان ئەگەڕێتەوە، بەڵام بەهۆی قەرینەوە مەبەست دەرئەكەوێ، لەسەر ئەم دووقیلە دواییینە، لەهەرشوێنێكدا قەرینە دەست كەوێ ئەوە

كما في قوله تعالى: ﴿ والذين لا يدعونَ مع الله إلهاً آخر ﴾ الى قوله ﴿ إلاّ مَنْ تابَ ﴾ فإنَّهُ عائدٌ الى جميع ماتقدَّمَه قال السُهَيلي: بلا خلاف[1]. وقوله تعالى ﴿ إنّما جزاءُ الذين يحاربونَ اللهَ ورسولَهُ ﴾ الى قوله ﴿ إلاّ الذين تابوا ﴾ فإنَّهُ عائدٌ الى الجميع قال ابن السمعاني إجماعاً[2].

وقوله تعالى: ﴿ ومَنْ قَتل مؤمناً خطأً ﴾ الى قوله: ﴿ إلاّ أن يصدَّقُوا ﴾ فإنَّهُ عائد الى الاخيرة اي الدِّية دونَ الكفارةِ قطعاً أمَّا قوله تعالى: ﴿ والذين يرمُونَ المحصَنات ثُمَّ لم يأتوا بأربعةِ شُهداءَ ﴾ الى قوله تعالى: ﴿ إلاّ الذينَ تابوا فإنَّهُ عائدٌ الى الاخيرة غيرُ عائدٍ الى الاولى اي الجلد قطعاً لأنَّه حق آدمى فلا يسقط بالتوبة وفي عوده الى الثانية اي عدم قبول الشهادة الخلافُ فعندَنا نعَم وعند ابي حنيفة لا[3].

ئیتر جیاوازی نامێنێ، چونكە قەرینە لابەری خیلاف و جیاوازی‌یە

(١) وەك ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ئەوانە لەگەڵ (الله)دا خوایەكی‌تر ناپەرستن و هاواری لێناكەن ، تا ئەگاتە ، جگە لەكەسێك نەبێ كە ئەگەڕێتەوە، ئەوە ئەم استثنایە ئەگەڕێتەوە بۆ هەمووئەوانەی كە لەپێش خۆیەوەن چونكە قەرینە هەیە كە ووشەی (ذلك) یە كەئەگەڕێتەوە بۆ هەموویان كەوابوو استثناكە ئەگەڕێتەوە، سهیلی وتویەتی: ئەوە بێ‌جیاوازی روو لەهەموویان ئەكاتەوە .

(٢) یاخود وەك خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئەجەنگێن لەگەڵ خواو پێغەمبەرداﷺ پاداشتەكەیان تەنها ..... تادەگاتە جگە لەوانەی ئەگەڕێنەوە، ئەم استثنایە ئەگەڕێتەوە چونكە ئەمیش بەقەرینەی (ذلك)ەكە ئاماژە بۆ هەرسێ تۆڵەكەیان دەكات ، ئەمیش ئەگەڕێتەوە بۆ هەرسێ تاوانەكە. ابن السمعانی وتوویەتی: بەڕای هەموویان وایە .

(٣) یاخود دەفەرموێ: كەسێ بەهەڵە باوەڕدارێ بكوژێ.... تا دەگاتە، مەگەر كەس و كاری كوژراوەكە صەدەقە بكەن، ئەم استثنایە هەر بۆ ئەخیرەكەیان ئەگەڕێتەوە، واتە بۆ خوێنەكەی نەك كەفارەتەكەی ، ئەمەش بێگومانە، بەلام ئایەتی: ئەوانەی بوختان بۆ ژنانی داوێن پاك ئەكەن، پاشان چوار شاهید ناهێنن .... تا ئەگاتە مەگەر ئەوانە نەبن كەتەوبە ئەكەن ، ئەم استثنایە بۆ ئەخیرەكەیان ئەگەڕێتەوە، -كە فسقەكەیە- ناگەڕێتەوە بۆ یەكەمەكەیان كە جەڵدەكەیە، چونكە ئەوەیان حەقی ئادەمیە بەهۆی تەوبەكردنەوە لەكۆڵ ناكەوێ بەلام لەگەڕاندنەوەیەیان بۆ دووەمەكەیان كە قەبوڵ نەكردنی شاهیدیە ئەو خیلافی تێدایە ، بەلای ئێمەوە دروستە بەلای ئەبوحەنیفەوە دروست نیە .

{و} الإستثناء {الوارد بعدَ مفرداتٍ} نحو: تصدَّق على الفقراء والمساكينَ وابناء السبيل إلاّ الفسَقَة منهم {اولى بالكل} اي بعوده لِلكُلّ من الوارد بعد جملٍ لعدم إستقلال المفرداتِ [١] {امّا القران بين الجملتين لفظاً} بأن تعطف احدهما على الاخرى {فلا يقتضي التسوية} بينهما {في غيرِ المذكورِ حكماً} اي فيما لم يذكر من الحكم المعلوم لإحداهما من خارجٍ {خلافاً لأبي يوسف} من الحنفية {والمزني} منا في قولهما يقتضي التسوية في ذلك [٢].

مثاله حديثُ ابي داود: (لا يبولَنَّ احدُكم في الماءِ الدَّائمِ ولا يغتسل فيه من الجنابة فالبول فيه ينجسه بشرطهِ كما هو معلومٌ وذلك حكمة النهي قال ابو يوسف وكذا الإغتسالُ فيه للقران بينهما وافقه أصحابه في الحكم لدليلِ غيرِ القرآن وخالفهُ المزني فيه لما ترجح على القرآن في ان الماء المستعمل في الحديث طاهرٌ لا نجس ويكفى في حكمة النَّهي ذهابُ الطهورية[٣]

---

(١) مستثنايەك كەهاتبێ بەشوێن چەند موفرەدێكدا ، وەك: خێر ببەخشەرەوە بەسەر مسكين و فەقیرو موسافیراندا ، جگە لەفاسیقەكانیان نەبێ و ئەوە شايستەترە بگەڕێتەوە بۆ هەموويان تا ئەو مستثنا يەكە لەدواى چەند جملەيەكەوە هاتبێ ، چونكە موفرەدەكان سەربەخۆنين .

(٢) بەڵام دوو جوملە پێكەوە باس بكرێن لەلفظدا بەم شێوەيە عەطفى يەكێكيان بكرێتەوە سەر ئەوى‌تريان، ئەوە داواى ئەوە ناكا نێوان ئەو دوو جوملە يەكسان بێ جگە لەو حوكمەى باسكراوە، واتە لەو حوكمەدا كە بەبەڵگەيەكى‌تر زانراوە بۆ يەكێكيان و لێرەدا باس نەكراوە ، بەپێچەوانەى ئەبويوسفەوە لەزانايانى حەنەفى مەزەنيش لەزانايانى خۆمان ، كە وتوويانە: لەوەشدا باس نەكراوە هەر داواى يەكسانى نێوانيان دەكا.

(٣) نموونەكەى ئەو فەرموودەيە ئەبوداواد ريوايەتى دەكاو دەفەرموێ: باكەسێك لەئێوە لەئاوى وەستاودا ميزنەكاو بۆ لابردنى لەش پيسى خۆيشى تێدا نەشوا، ميزكردنە ناو ئاوى وەستاو پيسى ئەكا، بەڵام بەمەرجى خۆى كە كەمتربێ لەقولەتێن ، وەك لەبەڵگەيەكى ترەوە زانراوە، هەر ئەوەش هۆى قەدەغە كردنيەتى، ابو يوسف وتوويەتى: هەروەها خۆشۆردنيش لەو ئاوەدا عەينى حوكمى هەيە ، چونكە هاووێنەيى لەنێوانياندا هەيە، يارانى ابو يوسف موافقەيان كردووە لەحوكمەكەيدا لەبەر بەڵگەيەك كە لەقورئاندا نيە، بەڵام مەزەنى لەو بابەتەدا پێچەوانەى ابو يوسفى كردووە لەبەر بەڵگەيەك كە بەلاى مەزەنيەوە تاى تەرازووى قورسترە

{الثاني} من المخصّصات المتصلة {الشَّرط} بمعنى صيغتهِ {وهو} اي الشَّرط نفسه {مايلزم من عدمهِ العدمُ ولا يلزم من وجوده وجودٌ ولا عدم لذاته}[١] .

إحترزَ بالقيد الاوَّل من المانع فإنَّهُ لا يلزم من عدمه شيءٌ وبالثاني من السَّببِ فإنَّهُ يلزم من وجوده الوجودُ وبالثالثِ من مقارنة الشرط للسبب فيلزم الوجود كوجود الحولِ الذي هو شرطٌ لوجوب الزكاة مع النِّصاب الذي هو سببٌ للوجوب[٢] ومن مقارنته للمانع كالدَّين على القول بأنه مانعٌ من وجوبِ الزكاة فيلزم العدم فلزومُ الوجود والعدم في ذلك لوجودِ السبب والمانع لا لذات الشرط[٣] ، ثُمَّ هو عقليٌّ كالحياةِ للعلم[٤] .

---

بەسەر بەڵگەی قیران یەکسانیان لەحوکمدا، لەوەدا کە ئاوێك بەکاربهێنرێ بۆ لابردنی بێدەستنوێژی پاکەو پیس نیە، -پاکەوەکەر نیە- ئەکرێ بەهۆی قەدەغە بوونیشی نەمانی پاکەوەکەربێ.

(١) دووەم لەو تایبەت کەرانەی عام کەلەبەشی متصلن (شەرط)ە ، (شەرط)ی بەواتای صیغەی (شەرط)کە ئەداتی (شەرط)ەو فیعلەکەی ، بەلأم خودی (شەرط) بریتیە لەوەی ئەگەر نەبێت لازم بێت نەبوونی مەشەرطوطەکەش ، بەلأم ئەگەر نەبێ لازم ئەبێ بوونی مەشروطەکەو نەبوونی ، جا ئەو بوون و نەبوونەش ئەبێ لەبەر خودی زاتی مەشروطەکەبێ.

(٢) دانەر بەقەیدی یەکەم ووتی: ئەگەر نەبێ مەشروطەکەش نابێ، خۆی لەمانع پاراست ، چونکە مانع ئەگەر نەبێ هیچ شتێك لەبوون و نەبوون لازم نایێنن، وەبەقەیدی دووم خۆی لەسەبەب پاراست چونکە سەبەبلازم ئەبێ بەبوونەکەی بوونی مسببەکە، وەبەقەیدی سێیەم کەووتی: لەبەر خودی (شەرط)ەکە ئەبێ خۆی پاراست لە (شەرط)ێك کە موقارینی سەبەب بێ، ئەوە بوونی مسببەکە لازم ئەبێ نەك لەبەر خودی (شەرط)ەکە بەڵکو لەبەر موقارەنەی بۆ سەبەب وەك: تەواو بوونی ساڵێك بڕوا بەسەر ماڵدا بڕوا ئەمە مەرجە بۆ واجب بوونی زەکات ، بەلأم لەگەڵ نیصابدا کەسەبەبی وجوبی زەکاتە .

(٣) وە هەم بەقەیدی سێهەم خۆی پاراست لە مقارەنەی (شەرط) بۆ (مانع) ، وەك: قەرزاری مانعەو نایەڵێ زەکات واجب بێ لەسەر قەولێك، وەلازم ئەکا لەو مقارەنەوە واجب نەبوونی زەکات، کەوا بوو بوون لەیەکەمدا و نەبوون لەدووەمدا لەبەر سەبەب و مانعەکە بوو، نەك لەبەر خودی (شەرط)ەکە.

(٤) ئەمجار مەرجی عەقڵی هەیە، وەك: ژیان بۆ عیلم، هەتا ژیان نەبێ عیلم نابێ.

وشرعيٍّ كالطهارة للصلاة وعادي كنصب السلم لصعود السطح ولغوي وهو المخصَّص كما في اكرمْ بني تميم ان جاءُوا اي الجائينَ منهم فينعدم الإكرام المامورُ به بإنعدام المجيئ ويوجدُ بوجوده إذا إمتثل الأمر[1].

{وهو} اي الشرط المخصِّص {كالإستثناء اتصالا} ففي وجوبه هنا الخلافُ المتقدم على الأصحِّ الآتي لما تقدَّمَ من أن أصله في ان شاء الله وهو صيغة شرط[2]. وَ قِيلَ يجب اتصال الشرط اتفاقاً وعليه اقتصر المصنِّف في شرح المنهاج حيثُ قالَ: لانَعلمُ في ذلك نزاعاً [3] {وَاولى} من الإستثناء {بالعود الى الكلِّ} اي كلِّ الجمل المتقدمة عليه نحو: اكرمْ بني تميم واحسن الى ربيعةَ واخلعْ على مضر ان جاءوك {على الأصَحِّ} وَ قِيلَ يعود الى الكل اتفاقاً والفرق ان الشرط له صدرُ الكلام فهو مقدَّمٌ تقديراً بخلاف الإستثناء وضُعفَ بانه إنَّما يتقدم على المقيَّدبه فقط[4].

---

(١) وەمەرجی شەرعی هەیە، وەك دەستنوێژ بۆ نوێژ،هەتا دەستنوێژ نەبێ نوێژ نابێ، وەمەرجی عادەتی هەیە وەك: دانانی پەیژە بۆ سەرکەوتن بۆ سەربان عادەتەن مرۆڤ خۆی ناتوانێ بفڕێ بۆ سەربان ، وە (شەرط)ی لوغەویش هەیە کەئەمەیە عام لەگشتگیری ئەخاو تایبەتی ئەکا، وەك: رێز لەهۆزی تەمیم بگرە ئەگەر هاتن، واتە ئەوانەیان کەیەن واتە: رێزلێنانەکە نابێ بەهۆی نەبوونی هاتنەکەیانەوە ، وە بە بوونی هاتنەکەیان ئەوییش ئەبێ، کاتێ گوێڕایەڵی فەرمانەکە بکرێ.

(٢) جا شەرطێك کە تایبەت کەربێ ، کە شەرطە لوغەویەکەیە وەك:استثنا وایە لەڕووی لکان و جیابوونەوەی لەگەڵ مەشروطەکەدا ، ئەو کێشەو جیاوازی‌یە هەبوو لەبارەی لکاندنی مستثناو مستثنامنە دا لێرەش دا هەیە لەسەر قەولی اصح، چونکە لە پێشەوە رابوورد کە ئەصلی خیلافەکە لە: (انشاءالله) ی ئایەتەکەدا یە، ئەویش صیغەی شەرطە.

(٣) کۆمەڵێك وتوویانە:بەڕای هەمووان واجبە لکاندنی شەرطەکە بەمەشروطەکەوە لەسەر ئەم قەولە دانەر لە (شرح المنهاج)دا وتوویەتی: ئاگام نیە لەهیچ کێشەیەك لەو مەسەلەیەدا.

(٤) شەرط باشترە لە استثنا ئەگەڕێتەوە بۆ هەموو ئەو جوملانەی پێشی کەوتوون ، وەك رێز لەهۆزی تەمیم بگرە چاکە لەگەڵ هۆزی رەبیعەدا بکە، وە خەلاتی هۆزی موضەر بکە، ئەگەر هاتنە لات ، ئەمەش لەسەر قەولی اصح، هەندێك وتوویانە: هەر بەڕای هەمووان ئەگەڕێتەوە بۆ هەموویان نەك لەسەر قەولێك، جا لەسەر ئەمن قیلە فەرقی نێوان (شەرط) و (استثنا) چی‌یە؟ (شەرط) پێشەوەی کەلامی بۆ هەیە

{ويَجوزُ إخراج الأكثر به وفاقا} نحو اكرم بني تميم ان كانوا علماء ويكونُ جهّالهم اكثر بخلاف الإستثناء ففي اخراجِ الأكثر به خلافٌ تقدَّمَ وفي حكاية الوفاق تسمُّح لما قدَّمه من القولِ بأنَّه لابُدَّ ان يبقي قريبٌ من مدلولِ العامّ إلاّ ان يريد وفاقُ من خالف في الإستثناء فقط [1].

{الثالثُ} من المخصّصات المتصلة {الصفةُ} نحو اكرم بنى تميم الفقهاء خرج بالفقهاء غيرُهم[2] وهي {كالإستثناءِ في العود} فتعود الى كل المتعدد على الأصَحّ {ولو تقدمت} نحو وقفتُ على اولادي واولادهم المحتاجينَ و وقفتُ على محتاجي اولادي واولادِهم فيعودُ الوصف في الاول الى الأولاد مع اولادهم وفي الثاني الاّ اولادَ الأولادِ مع الأولاد وَ قيلَ: لا [3].

---

هەرچەندە لەلەفظدا دواکەوتبێ، بەڵام لەمانادا لەپێشەوەیە بەڵام (استثنا) وانیە، ئەی بۆ بەقیل وتراوە کە نیشانەی لاوازی‌یە؟ چونکە (شەرط) تەنها بەسەر مەشروطەکەیدا پێش دەکەوێ.

(١) بەڕای هەموان دروستە بەهۆی شەرطەوە زۆرتریان لەحوکمی رستەدا دەربکەوێ، وەك هۆزی تەمیم ڕێزیان بگرە ئەگەر زانابن ، بەڵام نەخوێندەوارەکانیان زۆرترن ، بەلام استثنا وانیە، ئەو لەدەرکردنی زیاتر لە (مستثنی‌منە)ەکە جیاوازیەك هەیە لەنێوان زانایاندا ، کە لەوەوپێش رابوورد، ئەمەش دانەر ئەڵێ بەڕای هەموان،ئەمە تسامحی تێدایە ، چونکە لەپێشەوە رابوورد وتی: پێویستە ئەوەندەی بمێنێتەوە نزیك بێت لەمەدلولی عامەکەی، مەگەر بوترێ مەبەست پێی ویفاقی پەسەندی ئەوانەیە کە لەاستثنادا ملەجیرەیان ئەکرد.

(٢) سێهەم لەتایبەت کەرەکانی عام لەبەشی (متصل): صیفەتە وەك رێز لەهۆزی تەمیم بگرە ئەوانەیان شەرع زانن بەووشەی شەرع زان غەیری ئەوان دەرچوو.

(٣) صیفەت وەك استثنا وایە لەوەدا کە ئەگەڕێتەوە بۆ هەموو مەوصوفێکی پێش خۆی لەسەر قەولی اصح، هەرچەندە صیفەت پێشیشیان بکەوێ ، وەك: ئەم ئەرزەم کردە وەقفی منداڵەکان و منداڵی منداڵەکانم ، ئەوانەیان پێویستیان پێی هەیە یاخود کردمە وەقفی ئەوانەی پێویستیان پێی هەیە لەمنداڵەکانم و منداڵی ئەوانیش ، هەژاریەکە صیفەتەکە ئەگەڕێتەوە بۆ منداڵەکانی لەگەڵ منداڵەکانیدا، لەدووەمیشدا ئەگەڕێتەوە بۆ منداڵی منداڵەکانی لەگەڵ منداڵەکانیدا، هەندێکیش وتوویانە: صیفەت ناگەڕێتەوە بۆ هەموویان.

{اما المتوسطة} نحو وقفٌ على اولادي المحتاجين واولادهم قال المصنِّف بعد قوله لا نعلم فيها نقلا {فالمختارُ اختصاصُها بما وليَتْه} ويحتمل ان يُقالَ: تعود الى ماوليها ايضا [1].

{الرابع} من المخصِّصات المتَّصلة {الغايةُ} نحو اكرم بني تميمٍ الى ان يَعصُوا خرجَ حال عصيانهم فلا يكرمون فيه[2] وهي {كالإستثناءِ في العود} فتعود الى كل ماتقدمها على الأصَحِّ نحو اكرم بني تميم واحسن الى ربيعة وتعطَّفْ على مضر الى ان يرحَلُوا[3].

{والمرادُ} بالغاية {غاية تقدَّمها عمومٌ يشملها لو لم تأت مثلُ} ماتقدم ومثلُ قوله تعالى: ﴿ قاتلوا الذين لا يُؤْمنون بالله ﴾ الى قوله ﴿ حتَّى يعطوا الجزيَةَ ﴾ فإنَّها لو لم تأت لقاتلناهم اعْطوا الجزيَةَ ام لا [4].

---

(١) بەلاّم ئەگەر صیفەتەکە لەناوەراست دا بوو وەك: ئەم زەویەم وەقف کرد لەسەر منداڵە هەژارەکانم وە منداڵەکانیشیان، ئەوە دانەر وتوویەتی: دوای ئەوەی کە ئەڵێ: هیچ رایەکی زانایەکی لەبارەوە نازانم، کاری هەڵبژاردە بەلای منەوە ئەوەیە ئەو صیفەتە تایبەت ئەکرێ بەو موصوفەوە کە صیفەتەکەی بەشوێن دا هاتووە، هەڵیش ئەگرێ بووترێ وەك بۆ موصوفی پێش خۆی ئەگەرێتەوە، بۆ موصوفی پاش خۆشی ئەگەرێتەوە.

(٢) چوارەم لەتایبەت کەرەکانی عام کە لەبەشی متصلن بریتیە لە غایە . وەك: رێز لەهۆزی تەمیم بگرە هەتا سەرپێچی دەکەن لەکاتی سەرکەشیانا ئەو رێزەیان لێناگرێ.

(٣) غایەش وەك استثنا وایە لەوەدا کە ئەگەرێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی لەپێش خۆیەوە هەن، لەسەر قەولی اصح ، وەك: رێز لەهۆزی تەمیم بگرە چاکە لەگەڵ هۆزی رەبیعەدا بکە، چاوی میهرەبانیت لەسەر هۆزی مضر هەبێت، هەتا ئەو کاتەی بارئەکەن هەرکامیان باریان کرد ئیتر ئەو چاکە لەگەڵ کردنە نایانگرێتەوە.

(٤) مەبەست بەو غایەتە ئەوەیە کە عامێکی لەپێشەوە بێ غایەتەکەش بگرێتەوە ئەگەر باسیش نەکرێ، وەك ئەو نموونانەی لەپێشەوە یاخود وەك ئەم فەرموودەی خوایە: بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا باوەڕ بەخوا ناهێنن ... تا ئەگاتە .... هەتا سەرانە ئەدەن. ئەگەر ئەم غایەی نەهێنایە هەر شەڕمان لەگەڵ دەکردن سەرانەیان بدایە یان نەدایە.

{وامّا مثل} قوله تعالى : ﴿ سلامٌ هي {حتى مطع الفجر}﴾ من غاية لم يشملها عموم ماقبلها فإنّ طلوعَ الفجْر ليس من الليلة حتى تشمله {فلتحقيق العموم} فيما قبلها، كعُموم الليلة لأجزائها في الآية لا للتخصيص [١]،{وكذا} قولهم {قطعت اصابعه من الخِنْصر الى البنصر} بكسر اولهما وثالثهما فان الغاية فيه لتحقيق العموم اي اصابعَهُ جميعها بأن قطع ما عدا المذكورين بين قطعيهما واوضحُ من ذلك من الخِنصر الى الإبهام كما عبِّر به في شرحي المختصر والمنهاج وعدل عنه الى ما هنا لما فيه من السجع مع البلاغة المحوج الى التدقيق في فهم المراد و ذكَرَ مثالين لان الغاية في الثاني من المغيّا بخلافها في الأول [٢].

{الخامس} من المخصّصات المتصلة {بدل البعْضِ من الكلّ} كما ذكره ابن الحاجب نحو اكرمْ الناس العلماء [٣].

---

(١) بەلام غايەتێك وەك: ﴿ حتّى مطلع الفجر ﴾ ئەوە غايەتێكە عامی لەپێشەوە نیە، غايەكەش بگرێتەوە، چونكە ﴿ طلوع الفجر ﴾ بەشێك نیە لەشەو هەتا شەوەكە داگرندەی بێ، ئەم غايە بۆ تەحقيقی ئەو عامەیە كەلە پێشەوەیەتی ، واتای شەوی قەدر بۆ هەموو سات و كاتەكانیەتی هەر لەخۆرئاوایەوە هەتا بەیان، كەوابوو بۆ تخصیص و تایبەت كردن نیە ئەم غايەتە.

(٢) هەروەها وەك ئەڵێن: پەنجەكانم بڕی هەر پەنجە بچوكەوە تا ئەوەی پاڵی ، بۆیە ئەمەش وەك پێشەوە وایە، چونكە غايەكە تیایدا بۆ تەحقيقی گشتگیریەكەیە، واتە پەنجەكانی هەر هەموویانم بڕی ،. بەم شێوەیە لەپێشا یەكێ لەو دوانەی بڕیوە ئەنجا پەنجەی ناوەڕاست و شایەتومان و گەورەی بڕیوە، ئەمجا ئەویشیان ، لەم وێنەیە رونتر ئەوەیە بوترێ لەپەنجە بچوكەوە بۆ پەنجە گەورە لەهەردوو شەرحی (المختصر) و(المنهاج)دا ، بەم شێوەیەی دەربڕیوە بەلام لەو وێنەیە لایدا بۆ ئەم وێنەیەی ئێرە ، چونكە ئەمەی ئێرە ئاخرەكەی پیتی رێیە، لەگەڵ پێشەوەدا رێك ئەكەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەلاغەیەكی تێدایە زۆرت لێ‌ئەكا لێی وردبیتەوە، بۆ ئەوەی لەمەبەستەكەی تێبگەی -بۆ ئەوەی گوێگر بزانی بەهەرەمەكی پەنجەكانی نەبڕیووە بەڵكوو بەو شێوەی سەرەوە بووە- دانەر دوو نموونەی هێنایەوە چونكە غايەت لە نموونەی دووەمدا بەشێكە لە (اصابع)، واتە:واتە الفجر بەشێكە لە پەنجەكان ، بەلام لەنموونەی یەكەمدا جیاوازە ، غایەت بەشێكە لە (الليل).

(٣) پێنجەم لەو تایبەتكەرانەی كە متصلن بەدەلی بەعزە لەكول، وەك ابن الحاجب باسی كردووە، وەك: نموونەی رێز لەخەڵك بگرە ، مەبەستم زانایانە .

{ولم يذكرهُ الأكثرون وصوبَّهُم الشيخُ الامام} والد المصنِّف لأن المبدل منه في نية الطرح فلا تحقَّقَ فيه لمحلٍ يخرجُ منه فلا تخصيص به [١].

{القسمُ الثاني} من المخصَّص {المنفصل} اي ما يستقِلُ بنفسه من لفظٍ او غيره[٢] وبَدا بالغير لقلّتهِ فقال {يَجوزُ التّخصيص بالحسّ} كما في قوله تعالى في الريح المرسلة على عاد :﴿ تُدمِّر كلَّ شيءٍ ﴾ اي تهلكه فانا ندْرِك بالحسِّ اي المُشاهدةِ ما لاتدمير فيه كالسَّماء [٣].

{والعقلِ} كما في قوله تعالى: ﴿ اللهُ خالق كلِّ شيء ﴾ فانا ندرِكُ بالعقل ضرورة انه تعالى ليس خالقاً لنفسه {خلافاً لشذوذٍ} من النّاس في منعهم التّخْصيص بالعقل قائلين انَّ ما نفى العقلُ حُكمَ العامَ عنه لم يتناوله العامَ لأنه لا تصحُّ إرادَتُه [٤].

---

(١) ئەم پێنجەمە زۆربەی زانایانی ئوصول باسیان نەکردووە ، باوکی دانەریش ئەمانی بەڕاست زانیوە، چونکە کەبەدەل هات کوللەکە وەك نەبوو وایە لەبەر ئەوە تحققی ئەو جێ نیە تا شتی لێدەربچێ و لێداڕنرێ، بۆیە بەهۆی بەدەلەوە تخصیص و تایبەت کردنی عام نیە .

(٢) بەشی دووەم لەوەیکە عام تایبەت دەکات ، تایبەت کرەی منفصلە، واتە: ئەوەی سەربەخۆیە پێویستی بەوەنیە عامەکەی لەگەڵ باس بکرێ، جا ئەم مخصص مننفصلە دوو بەشە یاغەیرە لەفظیە .

(٣) دانەر سەرەتا دەستی کرد بەباسی غەیرە لەفظ لەبەر ئەوەی کەمە ئینجا ووتی: دروستە کەعام تایبەت بکرێ بەهۆی هەستەکانەوە ، وەك: خوا لەبارەی ئەو رەشەباوە کە نێرراوەتە سەر هۆزی عاد دەفەرموێ: هەموو شتێ لەناو دەبا ، دەخۆ ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین و دەزانین هەندێ شت بەهۆی باوە لەناو ناچن وەك ئاسمان .

(٤) وەدروستە تایبەت کردنی عام بەهۆی عەقڵەوە ، وەك: خوای گەورە دەفەرموێ: (الله) دروستکەری هەموو شتێکە ئێمە بێ ئەوەی بەڵگەی بوێ بەعەقڵ دەزانین خوا دروستکەری خۆی نیە، هەرچەندە وشەی (شێ) خۆیشی ئەگرێتەوە ، هەندێ کەس لە رێسای گشتی دەرچوون و جیاوازیان هەیە لەمەدا کە ئەڵێن عام تایبەت ناکرێ بەهۆی عەقڵەوە، چونکە ئەوەی کە عەقڵ قبوڵی ناکا و نەفی ئەکا عامەکە هەر لەپێشەوە ئەوەی نەگرتووەتەوە، چونکە هەر گونجاو نیە ئیرادە بکرێ.

{ومنع الشافعي} ﷺ {تسميته تخصيصاً} نَظراً الى ان ما تخصّص بالعقلِ لا تصحُ ارادتُهُ بالحكم {وهو} اي الخلافُ {لفظيّ} اي عائد الى اللفظ والتسمية للاتفاق على الرجوع الى العقل فيما نفى عنه حكمَ العامّ وهل يُسمَّى نفيه لذلك تخصيصاً فعندنا نعم و عندهُمْ لا ويأتي مثل ذلك كله في التَّخْصيص بالحس"[١].

{والأصَحّ جواز تخصيصِ الكتاب به} اي بالكتاب وَ قيلَ لا لقوله تعالى: وانزلنا اليكَ الذكرَ لتُبَيِّنَ للناس ماتُزِّلَ إليهم ﴾ فوّض البيانَ الى رسوله ﷺ والتَّخْصيص بيانٌ فلا يحصلُ إلاّ بقوله لنا الوقوع كتخصيص قوله تعالى: والمطلّقاتُ يتربَّصْنَ بانفسهنَّ ثلاثةَ قُرُوء ﴾ الشاملِ لأولاتِ الأحمالِ بقوله تعالى: واولاتُ الأحمالِ اجلهنَّ ان يضعْنَ حملَهُنَّ ﴾ [٢].

(١) پێشەوا شافیعی ناوبردنی ئەو تەخصیصەی بەعەقڵ دەکرێ قەدەغە کردووە ، چونکە ئەو بیری لەوەکردۆتەوە کە ئەوەی بەهۆی عەقڵەوە تایبەت دەکرێ گونجاو نیە ئیرادەی بکرێ لەڕووی حوکمەوە، نەك لەڕووی لەفظەوە –بەم شێوەی لەشاذ دەرئەچێ– ئەم جیاوازیەش لەنێوان شافیعیو ئەوانی پێشەوە جیاوازیەکی لەفظییە، واتە: روو لەلەفظ و ناو ئەکا ، چونکە هەموویان یەك دەنگن: ئەوەی کە عەقڵ نەفی حوکمی عامەکەی لێکردووە ئەگەڕێتەوە بۆ لای عەقڵ ئایا ئەو نەفی حوکمە لەلایەن عەقڵەوە ناوئەبرێ بە تخصیص و تایبەت کردن؟ بەلای ئێمەوە بەڵێ ناو ئەبرێ بەلای ئەوانیشەوە ناونابرێ، ئەم جیاوازیە لەنێوان هەموو تخصیص و عامێکدا دێتەدی ، ئەگەر بەهەست کرابێ.

(٢) قەولی اصح ئەوەیە کە دروستە بەهۆی قورئانەوە ئایەتی قورئان تایبەت بکرێ، هەندێ وتوویانە: دروست نیە چونکە خوا دەفەرموێ: قورئانمان بۆ ناردووی بۆ ئەوەی ئەو قورئانەی بۆیان دێتە خوار تۆ بۆ خەڵکی روون بکەیتەوە، ئەوەتە ئایەتەکە روونکردنەوەکە ئەداتە پاڵ پێغەمبەرﷺ تخصیص و تایبەت کردنیش روونکردنەوەیە، کەوابوو ئەو بەیانە ناکرێ بێ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بەقورئان ناکرێ، ئێمە بەڵگەمان هەیە کە شتێ روویداوە قورئان بە قورئان تایبەت کراوە، وەك: ئافرەتانی طەلاقدراو باماوەی سێ حەیز چاوەڕوانی بکەن،ئەمە تایبەت کراوە کەچی ئەو ئافرەتانەش دەگرێتەوەکە سك پڕن و بەم ئایەت ماوەی ئەمەیان دیاری کراوە ، دەفەرموێ: ئەو ئافرەتانەی سك پڕن ماوەی چاوەڕوانیان ئەوەی کە سکەکەیان دائەنێن، بەم ئایەتە تایبەت کراوە .

فان قال المانعُ يَجوزُ ان يكونَ التَخْصيص بغيرِ ذلكَ من السُنَة ، قُلْنا الأصلُ عدمُهُ وبيانُ الرَّسُول ﷺ يصدق بِالبَيان بما نُزِّل عليه من القُرآن وقدْ قالَ تعالى: ونزَّلْنا عليكَ الكتابَ تبياناً لِكُلِّ شيءٍ ﴾[1].

{والسُنَة بها} اي بالسُنَة وقيلَ : لا لقوله تعالى: وانزلْنا إليك الذِّكرَ لتبيِّنَ للنّاسِ ما نزِّلَ إليهم ﴾ فقصر بيانُهُ على القرآنِ لنا الوقوعُ كتخصيصِ حديثِ الصحيحين فيما سقتِ السَّماءُ العُشْر بحديثهما ليسَ فيما دونَ خَمسةِ اوسقٍ صدقة[2].

{و} السُنَة {بالكتاب} وَ قيلَ لا لقوله تعالى: لتبيِّنَ للنَّاس مانُزِّل إليهم ﴾ جعلَهُ مبيناً للقرآن فلا يكون القُرآن مبيناً لِلسَنة قُلْنا لا مانع من ذلك لأنَّهما من عند الله قال تعالى: وما ينطِقُ عن الهوى ﴾ ويدلُ على الجوازِ قولُه تعالى : ونزَّلنا عليكَ الكتابَ تبياناً لِكُلِّ شيءٍ ﴾ وان خُصَّ من عمومه ماخُصَّ بغير القُرآن[3].

(١) جا ئەگەر ئەوەی ئەڵێ: تخصیصی قورئان بەقورئان نابێ، ئەگونجێ ئەو ئایەتە لەپێشدا بەفەرموودەیەك تایبەت کرابێ ئەمجار ئایەت هاتبێ، ئێمەیش ئەڵێن: ئەصل ئەوەیە ئەوە نەبووبێ، جا چۆن ئەوترێ ئەصل ئەوەیە بەفەرموودە تایبەت نەکرابێ؟ کەچی خوا دەفەرموێ: لتبیّن للناس ﴾، ئەمیش ئەڵێ روونکردنەوی پێغەمبەرﷺ تەنها بەفەرموودە ناکرێ جاری واهەیە روونکردنەوەکە بەقورئان ئەبێ، ئەوەنیە قورئان دەفەرموێ: ئەم قورئانەمان دابەزاندوە بۆ سەرت روونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك (الکتاب) لەم ئایەتەدا (ام الکتاب)ە کە (لوح المحفوظ)ە نەك قورئان .

(٢) دروستە تایبەت کردنی فەرموودە بەهۆی فەرموودەوە ، هەندێ وتوویانە دروست نیە چونکە خوا دەفەرموێ: ئەم قورئانەمان بۆت دابەزاندوی بۆ ئەوەی بۆت دابەزیوە روونی بکەیتەوە بۆ خەڵك ، پێغەمبەرﷺ لەسەریەتی ئەو قورئانەی بۆی هاتووە روونی بکاتەوە، بەڵگەی ئێمە: ئەوەیە کەڕوویداوە وەك تایبەت کردنی ئەم فەرموودەیە کەبوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردووە، دەفەرموێ: کە زەکات لەوەدا کەبەباران ئاوئەدرێ دەیەکە ، بەفەرموودەیەك کە هەر ئەوان ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: ئەوەی کە کەمتربێ لەپێنج ویسق زەکاتی تێدا نیە.

(٣) فەرموودە بۆهۆی قورئانەوە تایبەت دەکرێ، هەندێك وتوویانە: نەخێر فەرموودە بەهۆی قورئانەوە تایبەت ناکرێ، چونکە خوا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی تۆ ئەوەی بۆیان دابەزیووە روونی بکەیتەوە بۆیان، پێغەمبەری کردووە بەرونکردنەوەی قورئان، کەواوبوو قورئان روونکەرەوەی فەرموودە نیە، ئێمەیش دەڵێن: هیچ رێگریەك

{والكتاب بالمتواترة} وَ قِيلَ لا يَجوزُ بالسُّنَّة المتواترة الفعلية بناء على القول الآتي ان فعل الرَّسُول لا يُخَصِّص [1] {وكذا} يَجوزُ تخصيصُ الكتاب {بخبر الواحد عند الجمهورِ} مطلقاً وَ قِيلَ: لا مطلقاً و إلاّ لترك القطعيُّ بالظنيِّ قُلْنا: محل التخصيص دلالةُ العامّ وهي ظنية والعمل بالظنين اولى من إلغاءِ احدهما [2].

{وثالثُها} قاله ابن ابان: يَجوزُ {ان خصَّ بقاطعٍ} كالعقل لضعفِ دلالتِه حينئذٍ بخلاف ما لَمْ يخص او خصّ بظنيّ وهذا مبنى على قولٍ تقدَّمَ ان ماخص باللفظ حقيقةٌ [3].

---

لەوەدا نیە چونکە هەردوکیان لەلایەن خواوەن، چونکە خوا دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ لەهەواو ئارەزووی خۆی نادوێ، ئەم فەرمودەی خوایە ئەم کیتابە دائەبەزێنن بۆ تۆ، بۆ ئەوەی روونکەرەوەبێ بۆ هەموو شتێ دەلالەت لەسەر ئەوە دەکا، ئەم قسەیە نەفی ئەوانە ناکا عام تایبەت ئەکەن بەعەقڵ ، هەرچەندە ئەوەی بەغەیری قورئان تایبەت کرابێ لەعمومی ئەم فەرموودەیە تایبەت کراوە.

(١) هەروەها دروستە قورئان بەفەرموودەی (متواتر) تایبەت بکرێ، هەندێك وتوویانە: دروست نیە قورئان بەفەرموودەیەکی (متواتر)ی رەفتاری پێغەمبەرﷺ تایبەت بکرێ، ئەم بۆچونەش لەسەر ئەوە دروست کراوە کە لەمەودوا دێ و ئەڵێ: رەفتاری پێغەمبەرﷺ عام تایبەت ناکا.

(٢) هەروەها دروستە قورئان تایبەت بکرێ بەهۆی تاکە فەردێکەوە، بەلای هەموو زانایانی ئوصولەوە ، چ لەپێشدا تایبەت کرابێ یا نەکرابێ، وتراویشە دروست نیە تایبەت کردنی قورئان بەتاکە فەرموودە چ لە پێشدا تایبەت کرابێ یانەکرابێ ، ئەگەر وانەبێ ئەبێ واز لەشتی بێگومان بهێنرێ بەهۆی بەڵگەی گوماناوییەوە، ئێمەیش ئەڵێین: شوێنی تایبەت کردنەکە دەلالەتی عامەکەیە -نەك لەفظەکەی- ئەو دەلالەتەش جێی گومانە، کارکردن بەهەردوو گومانەکە باشتر و نزیکترە لەدەست بەردان لەیەکێکیان .

(٣) قەولی سێهەم کە ابن ابان وتویەتی: دروستە تایبەت کردنی قورئان بەتاکە فەرموودەیێك، ئەگەر لەپێشدا بەهۆی بەڵگەیەکی بێگومانەوە تایبەت کرابێ، وەك عەقڵ ، چونکە لەم کاتەدا دەلالەتەکەی لاواز دەبێ. بەلام ئەگەر لەپێشدا تایبەت نەکرابێ یاخود کرابێ بەبەڵگەیەکی گوماناوی بێ، ئەوە ناتوانی، ئەم قەولەش لەسەر قەولی پێشوو دروست بووە کە ئەڵێ: ئەوەی بەهۆی لەفظەوە تایبەت کرابێ ئەوە حەقیقەتە لەباقیدا کەوابوو هەر بەهێزە .

قال المصنِّف {وعندي عكسهُ} اي ينبغي ان يقال حيثُ فرَّق بين القطعي والظني يَجوزُ إن خصّ بظنيّ لانَّ المخرج بالقطعي لما لم تصح ارادته كأن العامّ لم يتناوله فيلحَق بما لم يخصّ [1]. {وقال الكرخي} يَجوزُ ان خصَّ {بمنفصل} قطعي او ظني لضعف دلالته حينَئذٍ بخلاف مالم يخص او خصَّ بمتصلٍ فالعموم في المتصل بالنظرِ إليه فقط وهذا مَبنيٌّ على قولٍ تقدَّمَ ان المخصوصَ بما لا يستقلُّ حقيقة [2].

{وتوقف القاضي} ابو بكر الباقلاني عن القول بالجواز وعدمه. لنا الوقوعُ كتخصيص قوله تعالى: ﴿ يوصيكُمُ اللهُ في أولادكُم ﴾ الخ الشاملُ للولد الكافرِ بحديثِ الصحيحين: لا يرثُ المسلمُ الكافرَ ولاالكافرُ المُسلم [3].

---

(١) دانەریش ئەڵێ بەلای منەوە پێچەوانەی ئەو قسەیە ، واتە ئەبێ بوترێ: لەجێیەکدا جیاوازی بکرێ لەنێوان بەڵگەی بێگومان و بەڵگەی گوماندارا ، دروستە قورئان بەهۆی تاکە فەرموودەیەکەوە تایبەتمەند بکرێ، ئەگەر ئەو عامە لەپێشدا بەبەڵگەیەکی گوماناوی تایبەت کرابێ - واتە ئەگەر بەڵگەی گوماناوی پێی بوێرێ ئەو تاکە فەرموودەیەتش پێی دەوێرێ، بەلام ئەگەر بەبەڵگەی بێگومان تایبەت کرابێ بۆ ئەم مەرج نیە - چونکە ئەوەی بەهۆی بەڵگەی بێگومانەوە دەرچووە کاتێ کە دروست نەبووە ئیرادە بکرێ، وەك ئەوە وایە کە عامەکە هەرنەیگرتوەتەوە، کەوابوو ئەلکێ بەو عامانەوە کە تایبەت نەکراین.

(٢) کەرخی وتوویەتی: دروستە تایبەت کردنی عام بەتاکە فەرموودەیەك و ئەگەر لەپێشدا تایبەت کرا بەهۆی بەڵگەیێکی منفصلی بێگومانەوە، یاخود گوماناوییەوە، چونکە دەلالەتەکەی لەم کاتەدا لاوازە، ئەمە پێچەوانەی ئەو عامەیە هەر تایبەت نەکرابێ یاخودا کرابێ بەلام بە متصل کرابێ، چونکە عمومیەکەی تەنها بەگوێرەی ئەفرادی متصلەکەیە ، ئەم قەولی کەرخیە لەسەر ئەو قەولە دروست کراوە کە ئەڵێ: عامێك ئەگەر تایبەت کرابێ بەهۆی متصلێکەوە ئەوە حەقیقەتە لەباقیەکەدا، کەوابوو دەلالەتەکەی هەر بەهێزە، بەهۆی تاکە فەرموودیەك تایبەت ناکرێ.

(٣) بەلام پێشەوا باقلانی هەلوێستەی کردووە لەوەیدا کەبڵێ: دروستە یان دروست نیە، ئێمە بەڵگەمان هەیە، دروستە قورئان تایبەت بکرێ بەهۆی تاکە فەرمودەیەکەوە چونکە رویداوە، وەك ئەم ئایەتی کە دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێ دەکا لەبارەی بەشی منداڵەکانتانەوە بۆ نێرینە یان دوو بەشی مێینە یان، ئەمە گشتگیرە بۆ منداڵی کافریش ، بەلام بەم فەرموودە تایبەت کراوە موسوڵمان لەکافر میرات نابا و کافریش لە موسوڵمان میرات نابا.

**وياتي الخلاف في تخصيص المتواترة بخبر الواحد كما يُؤْخذ من كلام القاضي الباقلاني ثُمَّ البيضاوي زيادةً على إمامه[1] .**

**{و} يَجوزُ التَخْصيص لكتاب اوسنة {بالقياس} المستند الى نصٍ خاص ولو كان خبرَ واحدٍ[2] {خلافاً للأمام} الرَّازي في منعه ذلك {مطلقاً} بعد ان جوَّزه حذراً من تقديم القياس على النَّصِ الذي هو اصل له في الجملة [3] {وللجبائي} ابي علي في منعه ذلك {إن كان} القياس {خفياً} لضعفه بخلاف الجليّ وسيأتيان، وهذا التفصيلُ منقولٌ عن ابن سريج والمنقول عن الجبائي المنعَ مطلقاً وقد مشي المصنِّف على ذلك في شرحَيه[4] .**

(١) خودی ئەم جیاوازیە لەبارەی تایبەت کردنی فەرموودەی متواترەوە بەتاکە فەرموودەشەوە هاتووە ، وەك وەرئەگیرێ لە کتێبەکەی باقلانیەوە-کە پاڵفتەیەکی کتێبی (المحصول)ی رازیە – پاشان لەکتێبی (منهاج)ی بەیضاویش، جگە لە قەولی ماموٚستاکەی رازیە .

(٢) دروستە تایبەت کردنی قورئان و فەرموودە بەهۆی قیاسێکەوە بدرێتە پاڵ دەقێکی تایبەت -کە مقیس علیەیەکەیە- با ئەو دەقەش تاکە فەرموودەیەك بێ.

(٣) ئەم قسە جیاوازە بۆ رازی کە ئەو هەر قەدەغەی کردووە بەهۆی قیاسەوە قورئان و فەرموودە تایبەت بکرێ، چ قیاسی جەلی بێ یا جەلی نەبێ، ئەم بڕیاری قەدەغەبوونەی دوای ئەوە بوو کەڕێی پێدا بوو چۆنکە خۆی پاراست لەوەی قیاس بخرێتە پێش دەقەوە کە دەق ئەصڵی قیاسەو قیاس فەرعی نەصە، بۆیە ئەڵێ: (في الجملة) بۆ هەر قیاسێك یەك دەق نیە، بۆ هەر قیاسێك دەقێك هەیە.

(٤) وەهەم ئەم قسە جیاوازە بۆ جوبائی کە ئەم تایبەت کردنی قورئان و فەرموودەیەی بەقیاس قەدەغە کردووە ، ئەگەر قیاسەکە جۆری قیاسی خەفی بێ لەبەر لاوازی ئەم جۆرە قیاسە بەڵام جیاوازیلەگەڵ قیاسی جەلی دا، پێناسەی ئەم دوو جۆرە قیاسە لەمەودوا دێت، ئەم شێوەی درێژەپێدانە ، واتە: ئەگەر جەلی بێت دروستە و ئەگەر خەفی بێت دروست نیە لە (ابن سريج)ەوە وەرگێڕاوەتەوە،بەڵام ئەوەی لە جوبائی خۆیەوە گێڕراوەتەود ئەوەیە: کە قیاسەکە جەلی بێت یا خەفی بێت قەدەغەیە قورئان و فەرموودە تایبەتی بکات ، دانەریش لەهەردوو شەرحەکەیدا لەسەر ئەم مەنعی جوبائیە ڕۆیشتووە، نەك ئەوەی (ابن سريج) .

{ولإبن ابّان ان لم يخصّ مطلقاً} بخلاف ماخص فيَجوزُ لضعف دلالَته حينَئذٍ وقد اطلق الجوازَ هنا وقيَّدَه في خبر الواحدِ بالقاطع كما تقدَّمَ لأن القياس عنده اقوي من خبرِ الواحدِ ما لم يكن راويه فقيهاً [١] .

{و} خلافاً {لقوم} في منعهم {ان لم يكنْ اصلُهُ} اي اصلُ القياسِ وهو المقيسُ عليه {مخصصاً} بفتح الصّاد {من العموم} اي مخرجاً منه بنص بان لم يخصّ اوخصّ منه غير اصلِ القياسِ بخلاف اصللِه فكان التَخْصيص بنصه[٢] {وللكرخيّ} في منعه {ان لم يخص بمنفصلٍ} بأن لم يخص اوخصّ بمتَّصِل بخلاف المنفصل لضعف دلالة العامّ حينَئذٍ [٣] {وتوقّفَ إمامُ الحرمين} عن القولِ بالجواز وعدمه [٤] .

---

(١) وەهەم ئەم قسە جیاوازە بۆ (ابن ابان) کە وتوویەتی: قورئان و فەرموودە بەقیاس تایبەت ناکریْ ئەگەر لەپیْشدا بەبەڵگەییْك چ بیْگومان چ گوماناوی تایبەت نەکرابیْ، بەڵام ئەگەر لەپیْشدا تایبەت کرابیْ ئەوە دروستە بەقیاس تایبەت بکریْ، چونکە لەم کاتەدا دەلالەتەکەی لاواز ئەبیْ، لیْرەدا وتی: بەهەر بەڵگەیەك بەلام لەباسی تایبەت کردندا بەتاکە فەرموودە وتی: بەبەڵگەیەکی بیْگومان وشەی بیْگومانی پیْوەلکاند، وەك لەپیْشەوە رابوورد، چونکە قیاس بەلای (ابن ابان)ەوە بەهیْزترە لەتوانای تاکە فەرموودە ، بەو مەرجەی راویەکەی پلەی ئیجتهادی نەبیْ.

(٢) وەهەم جیاوازە بۆ کۆمەڵیْك کە قەدەغەیان کردووە قورئان و فەرموودە بەهۆی قیاسەوە تایبەت بکریْ، ئەگەر ئەصلی قیاسەکە ئەوەبیْ کە قیاسی لەسەر ئەکریْ بەهۆی دەقیْکەوە تایبەت نەکرابیْ لەعمومەکە ، واتە: لەعمومەکە دەرنەهیْنرابیْ، بەم شیْوە هەر ئەصلەن تایبەت نەکرابیْ، یاخود لەو عامە تایبەت کرابیْ بەلام ئەصلی قیاسەکە نەبیْ، بەلام بەپیْچەوانەوەیە ئەگەر مقیس علیەیەکە تایبەت کرابیْ چونکە ئەو کاتە تایبەت کردنەکە نەك بەهۆی دەقی قیاسەکەوە ئەبیْ، بەڵکوو بەهۆی ئەو مقیس علیەیەوە ئەبیْ.

(٣) جیاوازیشە بۆ کەرخی کە ئەو قەدەغەی کردووە ئەگەر ئەو عامە تایبەت نەکریْ بەهۆی منفصلەوە، بەم شیْوەیە هەر ئەصلەن تایبەت نەکرابیْ، یاخود کرابیْ بەلام بە متصل کرابیْ، ئەمە جیاوازە ئەگەر بەمنفصل کرابیْ، چونکە لەم کاتەدا دەلالەتی ئەم عامە لاوازە .

(٤)(امام الحرمين) هەڵویْستەی کردوە لەوەیدا بلیْ دروستە یا دروست نیە، تایبەت کردنی قورئان و فەرموودە بەهۆی قیاسەوە

لنا أن إعمال الدليلين أولى من إلغاء أحدهما وقدْ خصَّ من قوله تعالى: الزانيةُ والزاني فاجلدوا كلَّ واحدٍ منهُما مائةَ جلدة ﴾ الأمة فعليها نصف ذلك بقوله تعالى: فاذا احصنَّ فان اتين بفاحشةٍ فعليهنَّ نصفُ ما على المحصنات من العذاب ﴾ والعبدُ بالقياس على الأمة في النصف ايضا[1].

{و} يَجوزُ التَخْصيص {بالفحوى} اي مفهوم الموافقة وان قُلْنا الدَلالة عليه قياسيةٌ كأنْ يُقال: من اساء اليك فعاقِبْه ثُمَّ يقال: ان اساء اليك زيدٌ فلا تقل له اف[2] {وكذا دليل الخطاب} اي مفهوم الخالفة يَجوزُ التَخْصيص به {في الأرجح} وَ قيلَ: لا لأن دلالَةَ العامَ على مادلَّ عليه المفهومُ بالمنطوقِ وهو مقدَّم على المفهوم ويُجابُ بأن المقدَّم عليه منطوق خاص لا ماهو من افراد العامَ فالمفهوم مقدم عليه لان إعمالَ الدليلين اولى من إلغاء أحَدهما وقد خصَّ حديث ابن ماجة وغيره : الماءُ لاينجّسه شيء إلاّ ماغلب على ريحِهِ وطعمِهِ ولونه بمفهوم حديث ابن ماجه وغيره: اذا بلغَ الماءُ قلتين لم يحمِل الخَبث[3].

---

(١) ئێمە بەڵگەمان هەیە کە بەکارخستنی هەردوو بەڵگەکە باشترە لەپوچەڵ کردنەوەی یەکێکیان، لەم فەرموودەی قورئانەدا کە دەفەرموێ: ژنی زیناکەرو پیاوی زیناکەر هەریەکی سەد داریان لێبدەن، کەنیزەکی تێدا تایبەت کراوە چونکە ئەم نیوەی ئەو لێدانەی ئەکەوێتە سەر، هۆی تایبەت کردنی ئەم ئایەتە، جا کاتێ کەنیزەکەکان شوویان کردو فاحشەکەیان ئەنجام دا ئەوە ئەم ئەمەتانە نیوەی تۆڵەی ژنانی ئازادی شووکردوویان لەسەرە، عەبدیش بەقیاس لەسەر ئەمەتە نیوەی لێدانی پیاوانی ئازادیان لەسەرە.

(٢) دروستە تایبەت کردنی عام بەهەردوو بەشەکەی (فحوی)و (موافق)ەوە هەرچەندە وتمان دەلاڵەت کردن لەسەر مەفهومی موافقە قیاسیە، وەك ئەوە بوترێ: هەرکەس خراپەی لەگەڵ کردی تۆڵەی بدە،پاشان بوترێ: ئەگەرزەید خراپەی لەگەڵ کردیت ئەوە تۆ ئۆفیشی پێ نەڵێیت، کە ئۆفی پێنەوترێ ئەوە باشترە ئەزیەت نەدرێ.

(٣) هەروەها دروستە تایبەت کردنی عام بەهۆی مەفهومی مخالفەوە بەلای قەولی ئەرجەحەوە، کۆمەڵێك وتوویانە: نەخێر تایبەت ناکا چونکە دەلاڵەت کردنی عامەکە لەسەر فەردێك مەفهومە مەنطوقەکە ئەیگەیێنێ، منطوقیش لەپێش مەفهومەوەیە ، وەڵام ئەدرێتەوە کە ئەوەی لەپێش مەفهومەوەیە مەنطوقی خاصەو تایبەت ، واتە: مەنطوقێك لەفظەکە بەخصوص خۆی دەلاڵەتی لەسەر بکا ، نەك مەنطوقێك کە هەندێك بێت لەمەلولی لەفظەکە ، کەوا بوو مەفهوم ها لەپێش ئەم مەنطوقەوە

{و}يَجوزُ التَّخْصِيص {بفعله عليه} الصلاة و {السلام وتقريرِه في الأصَحّ} فيهما كما لو قال: الوصالُ حرامٌ على كل مسلمٍ ثُمَّ فعله اواقر من فعله وَ قِيلَ لا يُخَصّصان بل ينسخان حكم العامّ لأنّ الأصلُ تساوي النّاس في الحكم* و أُجيبَ بأن التّخْصِيص أولى من النسخ لما فيه من إعمال الدليلين [1].

{والأصَحّ عطفُ العامّ على الخاص} وعكسه المشهور {لا يُخَصّص} العامّ وَ قِيلَ يُخَصّصه اي يقصرهُ على ذلك الخاص لوجُوب الإشتراك بين المعطوفِ والمعطوفِ عليه في الحكمِ وصفته قُلْنا في الصفةِ ممنوعٌ مثال العكس حديث ابي داود وغيره: لا يُقتل مسلمٌ بكافر ولا ذوعهدٍ في عهده، الاشتراك بين المعطوفين في صفة الحكم فلا ينافي ماقال به من قتلَ المسلمَ بالذّمي [2].

---

چونکە بەگەڕخستنی هەردوو بەڵگەکە باشترە لە پوچەڵ کردنەوەی یەکێکیان ، ئەم فەرموودەیە: ئاو هیچ شتێ پیسی ناکا جگە ئەوە نەبێ زاڵ بێ بەسەر بۆن و تام و رەنگیدا نەبێ، تایبەت کراوە ئەم فەرموودەیە: کاتێ ئاو گەیشتە دوو قوللە پیسایی هەڵناگرێ.

(١) دروستە تایبەت کردنی عام بەکرداری پێغەمبەرﷺ و بێدەنگی بوونی لەسەر کارێك، لەسەر قەولی ئەصەح لەهەردووکیاندا، وەك ئەوە گریمان بڵێ: گرتنی رۆژووی چەند رۆژێ بێشکاندان ، حەرامە لەسەر هەر موسوڵمانێك ، جاپاشان خۆی کردی یاخود یەکێك کردیو پێغەمبەرﷺ لێی بێدەنگ بوو، هەندێك وتوویانە: کرداری پێغەمبەرﷺ و بێدەنگی پێغەمبەر ﷺ عام تایبەت ناکەن، بەڵکو هەر حوکمی عامەکە ئەسڕنەوە، چونکە ئەصڵ ئەوەیە هەموو خەڵك لەحوکمدا یەکسان بێ، وەلامی ئەم قیلە دراوەتەوە: عامێك تایبەت بکرێ باشترە لەوەی هەر بسڕێتەوە، چونکە لەتایبەت کردنەکەیدا هەردوو بەڵگەکە دەخرێتە کار.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە عەطفی عام بکرێتەوە سەرخاص ، یاخود خاص بکرێتەوە سەر عام ، عامەکە تایبەت ناکرێ، کۆمەڵێك وتوویانە: تایبەت ئەکا عەطفەکە عامەکە قصر ئەکا لەسەر ئەو خاصە، -تخصیص لە پێشەوە بریتیبوو لە قەصری عام لەسەر عامی دوای خاصەکە-چونکە واجبە ئیشتیراك هەبێ لەبەینی (مەعطوف) و (مەعطوف علیە)یەکەدا لەحوکم و لە صیغەتیشدا، ئێمە وتومانە: ئیشتیراکیان لە صیغەتدا قەدەغەیە، نموونەی عەطفی عام لەسەر خاص ئەو فەرموودەیە کە ئەبوداود و غەیری ئەبوداود ریوایەتیان کردووە ، موسوڵمان ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی هیچ کافرێکەوە، وەپەیمانداریش ناکوژرێتەوە لەکاتی

ومثال الأوَّل ان يُقال: لا يقتل الذّميّ بكافر ولا المسلم بكافرٍ فالمرادُ بالكافر الأول الحربي فيقول الخفي والمراد بالكافرِ الثاني الحربي ايضا لوجوب الإشتراكِ المذكورُ وقد تقدَّمَ التمثيل بالحديث لمسئلة ان العطفَ على العامّ لا يقتضي العموم في المعطوف على الأصَحّ [1].

{و} الأصَحّ إن {رجوعَ الضّمير الى البعض} اي بعض العامّ لايُخَصّصه وَ قِيلَ يُخَصّصه اي يقصرهُ على ذلك البعض حذراً من مُخالفةِ الضَمير لمرجعه و أُجيبَ بأنه لا محذورَ في المخالفة لقرينةٍ مثاله قوله تعالى: والمطلّقاتُ يتربَّصنَ بانفسهنَّ ﴾ مع قوله بعده وبُعولتهن احَقُّ بردِّهنَّ ﴾ فضمير بعولتهن للرَّجعيات ويشمل قوله: والمطلقات معهن البوائن وَ قِيلَ لا ويؤخذُ حكم البوائنِ من دليل آخر [2].

---

پەیمانەکەیدا بەهۆی کوشتنی کافرەوە، واتە: کافری جەنگاوەر، چونکە ئیجماع هەیە لەسەر کوشتنەوەی بەهۆی کوشتنی کافرێکی بیٚزیان ، حەنەفی ئەڵێت: صیفەتی (الحربی) تەقدیر ئەکریٚ لە (معطوف علیه)یەکەدا، بەم شێوەیە دژایەتی نابیٚ لەنێوان ئەم فەرموودەو ئەوەی ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: موسوڵمان ئەکوژرێتەوە بەهۆی ئەوەی کافرێکی پەیمان داری کوشتبیٚ،

(١) نموونەش بۆ عەطفی عام لەسەر خاص ئەوەیە بوتریٚ: کافری پەیماندار ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی کافرەوە، وەموسوڵمانیش ناکوژرێتەوە بەهۆی کوشتنی کافرەوە ، مەبەست بەکافری یەکەم جەنگاوەرە، لەبەر ئەوە ئەبوحەنیفە ئەڵیٚ: مەبەست بەکافری دووەمیش هەر جەنگاوەرە چونکە ئەو ئیشتراکە هەر ئەبیٚ، نموونە هێنانەوە لەپێشەوە بۆ ئەو مەسئەلەیە بوو کە عەطفی خاص لەسەر عام داخوازی عمومیەت نیە لە مەعطوفەکەدا -بەڵکوو لەسەر خصوصیەت و تایبەتەکەی ئەمێنێتەوە- لەسەر قەولی ئەصەح.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە: گەڕانەوەی ضەمیر بۆ هەندیٚ لەعامەکە عامەکە تایبەت ناکا، هەندێك وتوویانە: تایبەتی ئەکات و عامەکە کورت ئەکا بۆ سەر ئەو هەندە، لەترسی ئەوەی خۆی بپارێزیٚ لە جیاوازی ضەمیر بۆ سەرچاوەو بۆی ئەگەڕێتەوە، وەڵام دراوەتەوە کە هیچ جۆرە ترس و خۆپاراستنێکی ناویٚ لەوەدا کە جیاواز نەبیٚ، ئەگەر بەهۆی قەرینەیەکەوە جیاواز بیٚ قەیناکا، نموونەکەش وەك: ژنانی طەلاق دراو باچاوەڕوانی بکەن بۆ ماوەی سیٚ حەیزو دان بەخۆیاندا بگرن، لەگەڵ ئایەتی دوایی کە دەفەرمویٚ: مێردەکانیان ماف بەدەست ترن بۆ گەڕاندنەوەیان، دەخۆ ضەمیری (بعولتهنّ) ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژنانەی پیاوەکانیان ئەتوانن بیانگەڕێننەوە بۆ ژێر

**{و} الأصَحّ ان {مذهب الراوي} للعام بخلافه لا يُخَصّصه {ولو} كان {صحابياً} وَ قِيلَ يُخَصّصه مطلقاً وَ قِيلَ ان كان صحابياً وَ قِيلَ ان مذهب الصحابي غير الراوي للعام بخلافه يُخَصّصه ايضاً اي يَقصره على ما عدا محلّ المخالفةِ لأنّها انما تصدُر عن دليلٍ[1] ، قُلْنا في ظنِّ المخالف لا في نفسِ الأمر وليس لغيره اتباعه لأن المجتهد لايقلّدُ مجتهداً كما سياتي مثاله حديث البخاري من رواية ابن عباس: مَنْ بدَّل دينَهُ فاقتلوه ، مع قوله ان ثبت عنه ان المرتدة لا تُقتَلُ ويحتمل انه كان يرى ان من الشرطية لا تتناول المؤنّث كما هو قولٌ تقدَّمَ[2] {و} الأصَحّ ان {ذكرَ بعض افرادِ العام} بحكم العامّ {لا يُخَصّص} العامّ [3].**

---

حوكمی هاوسەرداری، هەندێك وتویانە بائنەكان ناگرێتەوە، حوكمی ئەوان لە بەڵگەیەكی ترەوە وەرئەگیرێ.

(١) قەولی ئەصەح ئەوەیە ئەگەر راوییەك عامێكی ریوایەتكرد بۆچوونی خۆی جیاواز بوو لەگەڵ عامەكە، ئەوە ئەو عامە تایبەت ناكا هەرچەندە ڕاوی‌یەكەش لە هاوەڵان بێ، كۆمەڵێك وتوویانە: تایبەت ئەكا ڕاوی‌یەكە هاوەڵ بێ یا هاوەڵ نەبێ، كۆمەڵێك ئەڵێن: ئەگەر هاوەڵ بێ تایبەت دەكاو هەندێكی‌تر دەڵێن: بۆچوونی هاوەڵێك هەرچەندە راویش نەبێ بۆ لەفظە عامەكە ئەگەر پێچەوانەی بوو هەر تایبەتی ئەكا وەك ئەگەر راوی بوو ئەیكا، واتە ئەیبڕێ بەسەر شتێكدا كەمێ جیاوازی نەبێ، چونكە ئەو جیاوازی‌یە پەیدا بووە

(٢) ئێمەیش ئەڵێن: ئەم جیاوازیە پەیدابووە لەڕووی دەلیلێكەوە ، كەبەگوێرەی گومانی بەرامبەرەكەیەوە كە جیاوازمانە نەك لەواقیعدا بەڵگەی هەیە، بۆ خۆی نەبێ بۆ كەسی‌تر نیە بەگوێی بكا، چونكە ئەوەی گەیشتە پلەی ئیجتهاد گەردن كەچی بۆ هاوپلەی خۆی ناكا، وەك لەمەودوا باسەكەی دێ ، نموونەكەش وەك ئەو فەرموودەیە بوخاری ریوایەتی ئەكا لە ئیبن عەبباسەوە ، دەفەرموێ: هەركەسێ دینی خۆی گۆڕی بیكوژن ، لەگەڵ ئەوەش بۆچوونی خۆی ریوایەتی كراوە ئەگەر بسەلمێنرێ، خۆی دەفەرموێ: ئافرەتی پاشگەزبووەوە لەئیسلام ناكوژرێ، لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەكە وتی: هەركەسێ وشەی (مَنْ) ژن و پیاو هەردوكیان ئەگرێتەوە، بەلام ئەگونجێ ابن عباس وای زانیبێ كە (مَنْ)ی شەرطیە مێینە نەگرێتەوە، وەك ئەو قەولە لەپێشەوە رابووررد.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە كەباسی هەندێ فەردی عام بكرێ و ببەسترێ بەحوكمی عامەكەوە ئەوە عامەكە تایبەت ناكا.

وَ قِيلَ يخَصّصه اي يقصره على ذلك البعض بمفهومه اذلا فائدة لذكره إلاّ ذلك[١].
قُلنا مفهوم اللَّقب ليس بحجةٍ وفائدة ذكر البعض نفيُ احتمال تخصيصه من العامّ مثاله حديث الترمذي وغيره: (ايما اهابٍ دُبِغَ فقد طهُرَ) مع حديث مسلم انه ﷺ مرَّ بشاة ميتةٍ فقال: (هلا اخذتم اهابها) فدبغْتموهُ فانتفعتُم به فقالوا: انَّها ميته فقال: انما حرُم اكلها وروي مسلم الأول بلفظ اذا دُبِغَ الاهابُ فقد طهر و البخاري الثاني بلفظ هلا استمتعتم بإهابها الخ ولمسلم نحوه[٢].

{و} الأصَحّ {ان العادة بترك بعض المأمورِ} به أو بفعل بعض المنهيّ عنه بصيغة العموم {تخصِّصُ} العامّ اي تقصره على ماعدا المتروكِ او المفعول {ان اقرها النبيّﷺ} بأن كانت في زمانه وعلم بها ولم ينكرها[٣].

---

(١) هەندیّ وتویانە: عامەکە تایبەتی ئەکا و کورتی ئەکاتەوەو ئەیبڕیّ بەسەر ئەو هەندەدا بەهۆی مەفهومی ئەو هەندە خۆیەوە، چونکە باس کردنی ئەو هەندە ئەوە نەبیّ هیچ سودێکی نیە.

(٢) ئێمەیش ئەڵێین ئەوە مەفهومی لەقەبە، مەفهومی لەقەبیش بەڵگە نیە، سودی باسکردنی هەندیّ فەردی عام بریتیە لەنەفی ئەوە ئەکا کە ئەوە هەڵئەگریّ بتوانیّ ئەو هەندە عامە کە تایبەت بکا، نموونەش ئەو فەرموودەیە کە تیرمذی و غەیری ئەویش ریوایەتی ئەکەن و دەفەرمویّ: هەر پێستەیەك دەبغ کرا ئەوە بێگومان پاك دەبێتەوە، لەگەڵ فەرموودەکەی ریوایەتی مسلمدا: کە پێغەمبەرﷺ تیّپەڕی کرد بەلای شەکێکی مردارەوە بوودا فەرمووی: ئەوە بۆ پێستەکەیتان نەگرتۆتەوەو دەباغتان نەکردووە و دیباغتان بکردایەو سوودتان لیّوەربگرتایە، وتیان: ئاخر مردارەوەبووە! ئەویش فەرمووی: تەنها خواردنی حەرام کراوە، مسلم فەرموودەی یەکەمی بەم شێوە ریوایەت کردووە، فەرموودەی دووەم بەم شێوە ریوایەت ئەکا:ئەوە بۆ؟ ئەبوایە سودتان لەپێستەکەی بگرتایە،...هتد ئیمام موسلیمیش وێنەی ئەم ریوایەتەی هەیە.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە عادەت و ئولفەت پێوەگرتن وابوو هەندیّ لە فەرمان پیّکراوەکە وازی لیّبهێنریّ، یاخود هەندیّ لەقەدەغەکراوەکە ئەنجام بدریّ، کەچی فەرمان پیّکراوەکەو قەدەغەکراوەکە بەلەفظی عام وترابیّ، ئەوە ئەو عامە تایبەت ئەکا وتو: کورتی ئەکاتەوەو دەری ئەبڕیّ بەسەر ئەوانەدا کەوازلێهێنراوەکان نین –لە مأثورات– یاخود کراوەکان نین –لە مەنفیەکاندا– ئەگەر پێغەمبەرﷺ ددانی پێدا بنیّ، بەم شێوەیە لەسەردەمی ئەودا بووبیّ یاخود پێی زانیبیّو ئینکاری نەکردبیّ.

{اوالاجماع} بان فعلها النّاس من غيرِ انكارٍ عليهم والمخصِّص في الحقيقة التقرير او الاجماعُ الفعليُّ بخلاف ماليست كذلك كان لم تكن في زمانه عليه الصلاة والسلام ولم يجمعوا عليها لأن فِعلَ النّاس ليس بحجةٍ في الشرع وهذا توسّطٌ للامام الرّازي ومن تبعه بين اطلاق بعضِهِم التّخْصيص نظراً الى انها اجماعٌ فعليٌّ وبعضهم عدمه نظراً الى ان فعل النّاس ليس بحجةٍ [1].

{و} الأصَحّ {ان العامّ لا يقصرُ على المعتادِ ولا على ماوراهُ} اي وراءَ المعتاد {بل تطرح له} اي للعام في الثاني {العادةُ السابقة} عليه فيجري على عمومه في القسمين وَ قِيلَ يقصر على ماذُكر الاول كما لوكان عادتهم تناول البرّ ثُمَّ نهي عن بيع الطعام بجنسه متفاضلاً [2].

(١) یاخود ئەو عادەتە ئیجماع دانی پێدا بنێ، بەم شێوەیە خەڵکی ئەو عادە بکەن و هیچ ئینکاریەکیان لەسەر نەبێ، بەڵام ئەبێ ئەوە بزانرێ تایبەتکەر لەم حەقیقەتەدا بریتیە ددان پێدانانەکەی پێغەمبەرﷺ ، یاخود ئیجماعێك کە لەئەرزی واقیعدا هەبووە، بەڵام ئەگەر عادەتێك بەم شێوە نەبێ ، واتە لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبووبێ ، یاخود دوای پێغەمبەر ئیجماع نەبووبێ لەسەر قەبووڵی بوونی ، ئەو عادەتە تایبەتکەری عام نیە، چونکە کرداری خەڵك لەشەرعدا بەبەڵگە لەقەڵەم نادرێ ، ئەمەش چونێکی مام ناوەندیە رازی لەبەری گرتوەتەوە ئەوانەش شوێن کەوتەی رێرەوی ئەو بوون، کەئەڵێن: مام ناوەندیە، لەنێوان هەندێکدا بەبێ پەروا ئەڵێن: عادەت تایبەت کرە چونکە لەوەوە سەرنجیان داوە کە عادەت ئیجماعێکە لەئەرزی واقعدا هەیە وە لەنێوان هەندێکیتردا کە دەڵێن: عادەت بەهیچ جۆرێك عام تایبەت ناکات چونکە لەو رووەوە سەیریان کردووە کەرەفتاری خەڵکی نابێتە بەڵگەو شتی پێناشەرعێنرێ.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە لەفظی عام نابڕێ و کورت ناکرێتەوە و بڕینی بەسەر مانایەکدا خوی پێوە گیراوە پێش هاتنی عامەکە بووە، وەناشبڕێ بەسەر مانایەکدا دوای ئەو ماناوە پەیدا بووە کە خوی پێوە گیراوە ، بەڵکوو ئەو عادەتەی پێش کەوتووە بەسەر عامەکە لائەبرێ لەعادەتی دوهەمدا کە پاش عامەکە پەیدا بووە کەوابوو عامەکە لەهەردوو بەشەکەدا لەسەر گشتگیریەکەی خۆی دەڕوا ، هەندێ وتویانە هەر ئەبڕێ بەسەر موعتادا لەیەکەمدا، وەبەسەر ماوەرای ئەویشدا لەدوەمدا، نموونە بۆ یەکەم وەك ئەگەر عادەتیان وابێ گەنم و جۆ بخۆن ، پاشان قەدەغەبکرێن لەوەی طەعام بفرۆشرێ و بگۆڕێتەوە هەر بەرەگەزی خۆی بەڵام بەزیادو کەم نەك سەر بەسەر .

فقيلَ: يقصُر الطعام على البرِّ المعتاد والثاني كما لوكان عادتهم بيعُ البرِّ بالبُرِّ متفاضلاً ثُمَّ نهي عن بيع الطعام بجنسه متفاضِلاً فقيل: يقصر الطعامُ على غير البر المعتاد والأصَحّ لا فيهما[1].

{و} الأصَحّ {ان نحو} قول الصحابي انه ﷺ {قضي بالشفعة للجار} قال المصنِّف: كغيره من المحدِّثين هو لفظٌ لا يعرف ويقرُبُ منه مارواهُ النسائي عن الحسن قال، قضي النبيُّ ﷺ بالجوار وهو مرسلٌ {لا يعمُّ} كل جارو نحوه {وفاقاً للأكثر}[2] وَ قِيلَ يعمُّ ذلك لأن قائله عدلٌ عارفٌ باللغة والمعنى فلولا ظهور عموم الحكم بما صَدَرَ عن النبيﷺ لم يات هو في الحكاية له بلفظٍ عامٍ كالجار[3].

---

(١) ئەوە هەندێك وتويانە ئەوە ئەو ئاڵوگۆڕەی قەدەغەكراوە بەطەعام بكرێ هەر ئەبرێ بەسەر گەنمێكدا كە خويان پێوە گرتووە، نموونەش بۆ دووەم: وەك ئەوە خويان وابێ گەنم وەربگرن هەر بەگەنم بیگۆڕنەوە بەلاّم بەزيادو كەم پاشان قەدەغە بكرێن لەئاڵوگۆڕ كردنی طەعام هەر بەڕەگەزی بەلاّم بەزيادو كەم ، نەك سەربەسەر ئەوە هەندێ وتويانە: لەفظی عامەكە هەر ئەبرێ بەسەر گەنمێكدا كە عادەتيان پێوە نەگرتووە . قەولی ئەصەح ئەوەيە نابرێ بەسەر هیچ كاميـاندا لەهەردوو شێوەكەدا هەر بەعامی ئەمێنێتەوە.

(٢) قـەولی ئەصـەح ئەوەيـە ئەگـەر صەحابيـەك يـا تـابيعی صەحابەيـەك وتـی: پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی داوە كـە شـوفعە مـافی دەروهاوسـێیە، دانـەر وەك زانايـانی فەرموودە وتويەتی: ئەو لەفظێكە بەفەرموودەی پێغەمبەر نازانرێ، بەلام شتێك نزيك بێت لـەم فەرموودەيـە ئەوەيـە: كـە نەسـائی ريوايـەتی كـردووە لـە(الحسـن)ەوە كـە وتوويـەتی: پێغەمبـەرﷺ بـەهۆی دەرهاوسـێیەتیيەوە مـافی شـوفعەی سـەلماندوە و فـەرمانی پێـداوە، ئەمـەش مورسـەلە چونكـە ئـەو كەسـەی ئەكەوێتـە نێـوان خـۆی و پێغەمبەرﷺ ناوی نەبردووە، جا ئەو وتەی هاوڕێی پێغەمبەرە هەموو دەرو هاوسێيەك ئەگرێتـەوە، واتـە شـەريك بێـت يـا شـەريك نـەبێت، ئەمـەش بـەڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانايانی .

(٣) هـەندێكيش وتوويانـە: هـەموو دەرو هاوسـێيەك ئەگرێتـەوە ، چونكـە بوێـژی ئـەم قسـەيەيەكە: زۆر عادلـەو دوەم لەلوغـەو واتـادا شـارەزايە، ئەگـەر لـەو رسـتەی بـەزاری پێغەمبـەرﷺ دا هـاتووە گشـتگيری وشـەكە نمايـان نەبوايـە ،ئـەو هاوەڵـە لەگێڕانەوەيدا بەلـەفظی عـام و گشـتگير نەيدەگێڕايـەوە ، وەبـە لـەفظی دەرو هاوسـێ نەيئەهێنا.

قُلْنـا: ظـهور عمـوم الحكـم بحسَـبِ ظنـه ولا يلزمنـا اتباعـه في ذلـك ونحـو قضـى الخ قـول ابـي هريـرة ان النبِـيَّ ﷺنـهي عـن بيـع الغـرَرِ رواهُ مسـلم فقيـلَ: يعـمُّ كل غرر[1].

{مسـئلةٌ جـواب السـائلِ غـير المسـتقل دونَـهُ} اي دون السـؤال {تـابعٌ للسـؤالِ في عمومـه} وخصوصـه العمـوم كحَديـثِ الـترمذي وغـيره ان النـبيﷺ سُـئِلَ عـن بيـعِ الرُّطب بالتمرِ فقـال: اينقُـصُ الرطـب اذا يبـس قـالوا: نعـم قـال: فـلا إذن فيعـمُّ كـلَّ بيعِ للرطـب بـالتمر والخصـوص كمـا لوقـال للنـبي ﷺ قـائلٌ: توضـأتُ مـن مـاء البحـرِ فقالَ: يجزيك فلا يعمُّ غيرَهُ[2].

{والمستقلُّ} دون السؤال {الأخصُّ} منه {جائزٌ اذا امكنت معرفة المسكوت} منه[3].

(١) ئێمـەیش دەڵێـن: نمایـانی گشـتگیری حوکمەکـەی بـەگوێرەی گومـانی خۆیـەتی، گومانی خۆیشی ئیلزاممان ناکا لەگومانیدا پاشکۆی بین، هەر وەك ئەم بابەتە وایە کە وتـی: (قضـی....) تـا کۆتـایی، وتەکـەی ابـو هريـرە کەئـەڵێ: پێغەمبـەرﷺ قەدەغـەی کـردوە لـەکڕین و فرۆشـتنێ زیـانی تێـدا بـێ، موسـلیم ریوایـەتی کـردووە، جاهـەندێ وتوویانە: ئەم قەدەغە بوونە هەموو زیانێك ئەگرێتەوە.

(٢) ئەمـەش مەسـئەلەیەکە وەڵامێـك کـە خـۆی تەنـها سـوود نەگەیـەنێ بێئـەوەی پرسیار کەرەکەی لەگەڵدا بێـت ، ئـەوە ئـەو وەڵامـە تـابیع و پاشـکۆی پرسـیارەکەیە لەگشتگیریدا ئەگەر گشتگیر بێ وەلە تایبەتمـەندیدا ئەگـەر تایبـەت بـوو، نموونـەی گشـتگیری وەك ئـەم فەرموودەیـەی تـیرمذی و غـەیری ئـەویش ریوایـەتی ئەکـەن دەفەرموێ: پێغەمبـەرﷺ پرسیاری لێکرا لـەبارەی کڕیـن و فرۆشـتنی خورمـای تـەڕ و وشك، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئایا خورما تەڕەکە وشك بویـەوە کـەم دەکا؟ وتیـان: بەڵێ، فـەرمووی: کـەوابوو دروسـت نیـە. وەئـەم حوکمـە گشـتگیرە بـۆ هـەموو کڕیـن و فرۆشتنێکی خورمـای تەڕ بەوشك، نموونـەی تایبـەتیش وەك: گریمـان ئـەگرە یـەکێ پرسـیاری لـە پێغەمبـەرﷺ بکردایە: ئـەی پێغەمبـەر مـن بەئـاوی سـوێر دەسـت نوێـژم گرتـووە؟ پێغەمبـەریش ﷺ بفـەرمووێ: دروسـتە بـۆ تـۆ دە ئـەم حوکمـە جگـە لـەم پرسیارکەرە نەبێ کەسیتر ناگرێتەوە.

(٣)بەڵام ئەگەر وەڵامەکە بێپرسیارکەرەکەش هەر سوودبەخش بێ وەتایبەت تریش بێت لەپرسیارەکە ئەوەش هەر دروستە بەمـەرجێ ئـەوەی بێدەنگی لێکراوە بگونجێ بزانرێ .

**كانْ يقول النبيّ ﷺ : منْ جامَعَ في نهار رمضان فعليه كفارة كالمظاهر في جواب من افطر في نهار رمضان ماذا عليه؟ فيفهم من قوله: جامع، أن الإفطار بغير الجماعْ لا كفارة فيه، فاذا لم تمكن معرفة المسكوت في الجواب فلا يجوز اتأخير البيان عن وقت الحاجة[1] والمساوي واضح كان يقال: من جامع في نهار رمضان فعليه كفارة كالمظاهر في جواب: ماذا على من جامع في نهار رمضان ؟ وكأنْ يقال: لمن قال: جامعْتُ في نهار رمضان ماذا عليّ؟ عليكَ كفارةٌ كالمظّهار [2] و إلاّ ذكرهُ في قوله {والعام} الوارد على {سبَبٍ خاص} في سؤالِ اوغيره {معتبرٌ عمومُهُ عندَ الاكثرِ} نظراً لظاهرِ اللفظ وَ قِيلَ: هوَ مقصورٌ على السَّبب لوروده فيه[3].**

---

(١) وەك ئەوە پێغەمبەرﷺ بفەرمووێ: هەركەس لەرۆژی رەمەزاندا لەگەڵ خێزانی جوت بیّ ئەو پێویستە کەفارەت بدات وەك کەسێك ظیهار بکا لەگەڵ خێزانیدا، ئەمەش وترابێت لەوەڵامی کەسێکدا وتبێتی: کەسێ بەعەمدی لەرۆژی رەمەزاندا بەعەمدی رۆژوو بشکێنێ، ئەوە چی پێویستە لەسەری؟ لە فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ کە فەرمووی: جووت بیّ لەگەڵ خێزانیدا ئەوە وەرئەگیرێ کە: رۆژوو شکاندن بەغەیری جووت بوون کەفارەتی تێدا نیە، -لای حەنەفی شکاندنی رۆژوو بەعەمدی هەر کەفارەتی ئەویّ-بەلام ئەگەر ئەوەی بێدەنگی لێکراوە زانینی نەئەگونجاو ئەوە دروست نیە، چونکە روون کردنەوەکە دواخراوە لەکاتی پێویست .

(٢) بەلاّم ئەگەر وەلاّمەکە سەربەخۆ سوودبەخش بیّ بۆ پرسیارەکە لەگشتگیری و تایبەتمەندیدا ئەوە شتێکی روونە ، نموونەی یەکسان لەگشتگیریدا وەك، بوتریّ: هەرکەس لەرۆژی رەمەزاندا لەگەڵ خێزانەکەی جووت بیّ ئەوە پێویستە کەفارەتێك بدات ، وەك ظیهار ئەمەش لەوەڵامی کەسێکدا بڵیّ: کەسیّ لەرۆژی رەمەزاندا لەگەڵ خێزانیدا جووت بیّ ئەوە پێویستە لەسەری بیدات؟ -پرسیارو وەڵام هەردوکیان وشەی (مَنْ) بۆ عومە - نموونە بۆ یەکسان لەتایبەتمەندیدا وەك ئەوە بوترێ بەکەسیّ کە بڵیّ: لەرۆژی رەمەزاندا لەگەڵ خێزانمدا جووت بووم ئەوە چی پێویستە لەسەرم؟ لەسەرتە کەفارەتێك بدەی وەك کەفارەتی ظیهار .

(٣)بەلاّم ئەگەر وەلاّمەکە گشتگیر نەبیّ ئەوە دانەر لەم وتەی خۆیدا باسی کردووە و ئەڵێ: وەلاّمێك گشتگیر بێت بەهۆی هۆکارێکی تایبەتی یەوە هاتبیّ چ ئەو هۆکارە پرسیاربیّ یاخود شتی تربیّ ئەوە گشتگیریەکەی بەلایزۆربەی زانایانەوە ئیعتباری پیّئەکریّ، چونکە تاماشای دیاردەی لەفظەکەی دەکریّ، کۆمەڵێك وتوویانە:ئەو هۆکارە عامە هەر کورت دەکرێتەوە دەبڕیّ بەسەر ئەو هۆکارەدا کە لەبەر ئەو هاتووە.

مثاله حديث الترمذي وغيره عن ابي سعيد الخدري قيل: يارسولَ الله اتتوضأُ من بئرِ بضاعة وهي بئرٌ يلقي فيها الحِيَض ولحوم الكلاب والنتن؟ فقال: إنّ الماء طهُورٌ لا ينجّسُه شيءٌ اي مما ذُكر وغيره وَ قِيلَ مما ذكر و هو ساكتٌ عن غيره[1] .

{فان كانتْ} اي وجدَتْ {قرينةُ التعميم فأجدرْ} اي اولى باعتبارِ العموم مما لو لم تكن مثاله قوله تعالى: والسَّارِقُ والسّارقةُ فاقطعوا ايديَهما ﴾ وسببُ نزوله على ما قِيل: رجلٌ سرق رداء صفوان فذكر السارقة قرينةً على انّه لم يرد بالسارق ذلك الرجل فقط[2] وقوله تعالى: ﴿ انَّ الله يأمركم ان تُؤَدُّوا الأمانات الى اهلها ﴾ نزل كما قال المفسرون في شان مفتاح الكعبة لمّا اخذه علي ﷺ من عثمان بن طلحة قهراً بأمر النبيِّ ﷺ يوم الفتحِ ليصليَ فيها فصلّى فيها ركعتينِ وخرجَ فسألَهُ العبَّاس المفتاحَ ليضم السدانة الى السقاية فنزلتِ الآية فردَّ عليٌّ لعثمان بلطفٍ بأمرِ النبيِّ ﷺ بذلك فتعجَّبَ عثمان من ذلك فقرأ له عليٌّ الايةَ فجاء الى النبيِّ ﷺ فذكر الاماناتِ بالجمع قرينةً على ارادة العموم[3].

(١) نموونەش ئەو فەرموودەیە تیرمذی و غەیری ئەویش ریوایەتی ئەکەن لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە کە وترا: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ چۆن دەستنوێژ دەگری بیری (بضاعە) لەکاتێکدا کە بیرێکە پەڕۆی ئافرەتی حەیزدارو کەلاکی سەگ و شتی بۆگەنداری تێ فڕێ دەدرێتە ناو؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئاو پاکەوەکەرە هیچ شتێك پیسی ناکا، واتە چ ئەوانەی ناوبران و چ شتیتریش هەر پیسی ناکات، کۆمەڵێك وتوویانە تەنها ئەوانەی ناوی بردون ئاو پیسی ناکەن ، لەشتی تر پێغەمبەرﷺ بێدەنگ بووە لێی.

(٢) جا ئەگەر بەڵگە یێك بوو لەسەر گشتگیر وەڵامەکە ، ئەوە چاکتر و شایستە ترە گشتگیری تێدا ئیعتبار بکرێ، لەوەی ئەگەر بەڵگەو قەرینە نەبێ، نموونەکەی وەك : خوا دەفەرموێ: و السارق و السارقة فاقطعوا أيديهما﴾ پیاوی دز و ژنی دز دەستیان ببڕن ، هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە وەك وتراوە : پیاوێك عەبای سەرەوەی صەفوانی دزی ، لەئایەتەکەدا باسی ئافرەتی دزیش هاتووە بەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئایەتەکە تەنها ئەو پیاوە دزەی مەبەست نەبووە.

(٣) یاوەك خوا دەفەرموێ: انّ الله يأمركم ان تؤدوا الأمانات إلى أهلها﴾ خوا فەرمانتان پێئەدات هەموو ئەمانەتەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەم ئایەتە کاتێ دابەزی –وەك زانایانی تەفسیر دەفەرموون– لەبارەی کلیلی کەعبەوە بوو، کاتێ کە عەلی بەزۆر لە عوسمانی کوڕی طەلحە وەرگرت، بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ لە رۆژی

{وصورة السَّبب} التي ورد عليها العامّ {قطعيةُ الدخولِ} فيه {عند الأكثرِ} من العلماء لورودهِ فيها {فلا تخصَّص} منه {بالاجتهادِ [١]} وقال الشيخُ الإمام} والد المصنِّف كغيره هي {ظنية} كغيرها فيَجوزُ اخراجها منه بالاجتهادِ كما لزم من قول ابي حنيفة ان ولد الأمةِ المستفرشَة لايلحق سيدُها ما لم يقرَّ به نظراً الى انَّ الأصل في اللَحاق الاقرارُ اخراجُهُ من حديث الصحيحينِ وغيرها الولدُ للفراشِ الوارد في ابن امةِ زمعَة المختصم فيه عبدُ بن زمعة وسعد بن ابي وقاص وقد قال ﷺ : هوَ لك ياعبدُ بن زمعة وفي رواية ابي داود: هوَ اخوك ياعبد[٢] .

---

ئازادکرنی مەککەدا بۆ ئەوەی نوێژی تێدا بکات، پێغەمبەریش ﷺ دوو رکات نوێژی تێدا کردوو هاتەدەر ، ئەمجا ابوعەباس داوای کلیلەکەی لێکرد بۆ ئەوەی ببێ بەکلیلەوانی کەعبە زیاد لەوەش ئاوی زەمزەمی بەدەست بووە، ئەمجا ئم ئایەتە دابەزیو عەلی کلیلەکەی گەڕاندەوە بۆ عوسمان زۆر بەنەرم ونیانی ئەوەش بەفەرمانی پێغەمبەرﷺ ،عوسمان زۆر سەری سوڕما لەوە! لەبەر ئەوە عەلی کە ئەم ئایەتەی بەسەر خوێندەوە، دوای ئەوە عوسمان هات بۆلای پێغەمبەرو موسوڵمان بوو .(الأمانات) کەبەشێوەی جەمع و کۆهاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەمەبەست پێی هەموو ئەمانە تێکە، نەك تەنها ئەو کلیلە.

(١) ئەونمونەی کەبەشێکە لەهۆیهاتنی عامەکە بێگومان دەچێتە ناو ئەوعامەوەو عامەکە ئەیگرێتەوە بەلای زۆربەی زانایانەوە ، چونکە عامەکە بەهۆی ئەو نموونەوە هاتووە کەوابوو ئەو نموونە بەشێکە لەعامەکە بەهۆی ئیجتیهادەوە تایبەت ناکرێ.

(٢) باوکی دانەر وتوویەتی ئەو نموونەی کەبەشێکە لەهۆکارەکە جێی گومانە، وەك نموونەکانیتر ، جا مادام جێی گومانن دروستە بەهۆی ئیجتیهادەوە لەعامەکە دەربکرێن –ئەو نەتیجە لازمە– وەك لەفەرموودەیەکی ئەبوحەنیفەوە کە ئەڵێ: منداڵی جاریەیەك ئاغاکەی بچێتەلای ئەو منداڵە نابێتە پاشکۆی ئاغاکەی دایکی هەتا ئەو ئاغا دانی پێدا نەنێ: کە ئەو منداڵە هی ئەوە چونکە ئەبوحەنیفە بیرلەوە دەکاتەوە قاعیدەی پاشکۆ بوون دان پێدانانە، لازم دێت منداڵی ئەو جاریە لەو فەرموودەی بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش ریوایەتایان کردووە دەربکرێ کە دەفەرموێ: منداڵ هی خاوەن جێیە ، ئەم فەرموودە لەبارەی جاریەیەکی زەمعەوە هاتووە کە عەبدی کوڕی زەمعە لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصدا کێشەیەکیان هەبوو لەبارەیەوە ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو منداڵەهی تۆیە ئەی عەبدی کوڕی زەمعە . لەریوایەتەکەی ئەبو داوددا دەفەرموێ: ئەو منالە براتە ئەی عەبد .

{قال} والدُ المصنِّف ايْضاً {ويقرب منها} اي من صورة السبَب حتَّى يكون قطعي الدخولِ او ظنية {خاصٌ في القُرآنِ تلاهُ في الرَّسم} اي رسم القُرآن بمعنى وضعه مواضعه وان لم يتله في النزول {عامٌ للمناسبة} بين التالي والمتلوّ[1] كما في قوله تعالى: ﴿ الم ترَ الى الذين أُوتوا نصيباً من الكتاب يؤمنونَ بالجبت والطَاغوت ﴾ الخ فإنَّهُ كما قال اهل التفسير: إشارةٌ الى كعب بن الاشرف ونحوه من علماء اليهود لما قدِمُوا مكة وشاهدوا قتلى بدرٍ حرَّضُوا المشركينَ على الأخذِ بثارِهِم و محاربة النبيِّ ﷺ فسألوهم من اهدى سبيلاً محمدٌ واصحابُه ام نحن فقالوا: انتم مع علمهم بما في كتابهم من نعتِ النبيِّ ﷺ المطبقِ عليه واخذ المواثيق عليهم ان لا يَكتُموه فكانَّ ذلك امانة لازمةٌ لهم ولم يؤدوها حيثُ قالوا: للكفار انتم اهدى سبيلاً ، حسداً للنبيِّ ﷺ[2] .

---

(١) دووباره باوکی دانەر ئەلێت نزیکە لەنموونەی سەبەب چ ئەو خاصە بێگومان عامەکە بیگرێتەوە یاخود بەگومان ئەچێتە عامەکەوە، خاصێك کە لەقورئاندا هاتبێ بەشوێن عامەکەدا ، بەلام هەر لەنووسینەوەی قورئاندا، هەرچەندە لەدابەزیندا بەوشێنیا نەهاتبێ،ئەوە نزیکە لە صورەتی سەبەبەکەوە چ (قطعي الدخول) بێت، یاخود (ظني الدخول) بێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە موناسەبەو خزمایەتی هەیە لەنێوان بەشوێنا هاتووەکەدا -کە عامەکەیە - وە لەنێوان بەشوێنا هێنراوەکەدا کە خاصەکەیە.

(٢) وەك خوا دەفەرموێ: ئەوە ئێوەسەیری ئەوانە ناکەن کە بەشێ لە (الکتاب)یان پێدراوە کەچی بڕوا بەبت ئەهێنن، ئەوە وەك زانایانی تەفسیر فەرموویانە ئاماژەیە بۆ کەعبی کوڕی الأشرف وە هاوکارەکانی لە زانایانی جولەکە کاتێ هاتن بۆ شاری مەککە کوژراوەکانی بەدریان بینی ئیتر کافرکانیالن هاندا بۆ تۆڵەسەندنەوەو جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەردا، کافرەکان دیسان پرسیانەوە کێ ڕێگەی ڕاستی گرتوەتە بەر محمد و هاوڕێیانی یاخود ئێمە؟ ئەوانیش وتیان: ئێوە لەگەڵ ئەوەش ئاگاداربوون بەو ناونیشانەی پێغەمبەرﷺ کە لەکتێبەکەیاندا هەبوو ، هەموویان لە پێغەمبەردا بەدی هاتبوو، وەلەگەڵ ئەوەش پەیمانییان لێوەرگیراو بوو کە ئەو ناونیشانە نەکەن بەژێرەوە. جا ئەوە ئەمانەتێك بوو بەسەریانەوە بەلام نەیانهێنایە دی،چونکە بەکافرەکانیان ووت: ڕێگەی ئێوە ڕاسترین ڕێگەیە، بۆیەش بە پێچەوانەبوو ئەم قسەیان چونکە لەبەر حەسودی بردنیان بوو بە پێغەمبەرﷺ .

وقد تضمنت الآية مع هذا القولِ التَّوعدَ عليه المفيدُ للأمرِ بمقابَلة المشتملِ على اداءِ الأمانَـةِ الـتي هـي بيـان صفـة النبـيِّ ﷺ بإفادَتـه انـه الموصـوفُ في كتابـهم وذلك مناسبٌ لقوله تعالى: ﴿ انَّ الله يأمركم انْ تؤدُّوا الأمانات الى اهلها ﴾ فهذا عامٌ في كل امانة وذلك خاصٌ بأمانة هي بيان صفة النبيِّ ﷺ بالطريق السابق والعامّ تال للخاص في الرسم متراخٍ عنه في النزولِ بست سنين مدَّة ما بين بدر في رمضان من السنة الثانية والفتح في رمضان من الثامنة وانما قال: ويقرُبُ منها كذا لأنه لم يرد العامّ بسببه بخلافها [1].

{مسئلة ان تأخر الخاصُ عن العملِ} بالعامِّ المُعارض له اي عن وقته {نسخ} الخاصُ {العام} بالنسبة لما تعارضا فيه [2].

---

(١) ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەم قەولەی کە ئەڵێ: موشریکان لە موسوڵمان ڕێگەیان باشترە ، هەڕەشە ئامێزیشە، کەئەو هەڕەشە ئەوە ئەگەیەنێ فەرمان بەپێچەوانەکەیەتی کە جێبەجێکردنی ئەو ئەمانەتە ئەگەیەنێ بریتیە لەدەرخستنی صیفەت و ناونیشانی پێغەمبەرﷺ، ئەوە ئەوە ئەگەیەنێ کە پێغەمبەر لە کتێبەکەیاندا وەصف کراوەو دیاری کراوە ، ئەو فەرمان دانە بەمقابلی ئەو هەڕەشەیە مناسب و خزمایەتیەکی هەیە بۆ ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ اللَّـهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ خوا فەرمانتان پێدەکا کە هەموو ئەمانەتەکان بدرێنەوە بەخاوەنەکانیان، ئەم ئایەتە عامە بۆ هەموو ئەمانەتێك بەڵام ئەو تایبەتە بە ئەمانەتێکەوە کە بریتیە لەروونکردنەوەو دەرخستنی صیفەتی پێغەمبەرﷺ بەو شێوە پێشوو – کە پێغەمبەرﷺ لە کتێبەکەیاندا وەصفدار کراوە– عامەکە هاتووە بەشوێن خاصەکەدا لەنووسینەوەی قورئاندا، بەڵام لە دابەزینیشدا بەشەش ساڵ لەدوای ئەوەوە هاتووە، کە بریتیە لەماوەی بەدر لەمانگی رەمەزاندا لەساڵی دووەمی کۆچیدا وە ئازادکردنی مەککە ساڵی هەشتەمی کۆچی ، بۆچی وتت:(ويقربُ منها) نەی وت: (ومنها) چونکە لێرەدا عامەکە بەهۆی خاصەکەو نەهاتووە، بەڵام لەصورەتی سەبەبەکەدا عامەکە بەهۆی خاصەکەوە هاتووە .

(٢) ئەمەش مەسئەلەیەکی ترە ئەگەر هاتنی خاصەکە دواکەوت و لەدوایکارکردنی بەعامەکەوە هات بەعەمەلیش پێی نەکارا بێ، معارض و نەیاریخاصەکەیە لەکاتی کارپێکردنەکەیدا، ئەوە ئەو خاصەی عامەکە ئەسڕێتەوە بەگوێرەی ئەو فەردانەی خاص و عام تێیدا نەیاری یەکن – تخصیص ئەوەیە هەر لەئەوەڵەوە بەری نەکەوێ نەسخ ئەوەیە هەیە و لای ئەبا – .

{والاّ} بان تأخر الخاصّ عن الخطاب بالعام دون العمل او تأخر العام عن الخاص مطلقاً اوتقارنا بأن عقبَ احدهما الآخر اوجهل تأريخهما {خصّص} الخاص العامّ [1] {وَ قيلَ ان تقارنا تعارضا في قدرِ الخاصّ كالنصين} اي كالمختلفين بالنصوصيَة بأن يكونا خاصين فيحْتاج العملُ بالخاصّ الى مرجِّحٍ له. قُلْنا: الخاص اقوي من العامّ في الدّلالة على ذلك البعضِ لأنَّه يَجوزُ ان لايُرادَ من العامّ بخلافِ الخاصّ فلا حاجة الى مرجِّحٍ له[2].

{وقالت: الحنفية وامام الحرمين العامّ المتأخرُ} عن الخاص {ناسخٌ} له كعكسه بجامع التَّأخر. قُلْنا: الفرق ان العملَ بالخاصّ المتأخر لايُلغي العامّ بِخلاف العكسِ والخاصّ اقوى من العامّ في الدلالة فوجبَ تقديمُهُ عليه قالوا {فانْ جهل} التاريخُ بينَهُما {فالوقفُ} عن العمل بواحدٍ منهما[3].

---

(١) ئەگەر وانەبێ بەم شێوەیە هاتنی خاصەکە دوای هاتنی عامەکە بێئەوەی کاری پێکرابێ یاخود عامەکە دوای خاصەکەوە هاتبێ، ئیتر لەکاتی کارپێکردنیدا یا لەکاتیدا نەبێ یاخود خاص و عامەکە بەرو دوای یەك هاتبن یاخود نەزانرێ کامیان لەپێشەوەیە و هاومێژوییان دیارنەبێ لەمانەهەموویاندا خاصەکە عامەکە تایبەت ئەکا.

(٢) کۆمەڵێك ئەڵێن: ئەگەر هەردووکیان یان هاوشانی یەکبن ئەوا ئەچن بەکڕیەکدا، لەئەندازەی تایبەتەکەدا وەك دوو دەق لەدەقەکەیاندا جیاوازبن بەم شێوە ئەگەر هەردوو تایبەت بێ بۆ ئەوە کار بە تایبەتەکەی بکرێ پێویست ئەبێ بەمەرج و ئێمەیش ئەڵێن: تایبەتەکە بەهێزترە لەعامەکە لە دەلالەت کردن لەسەر ئەو بەشەی جیاوازیان هەیە لەسەری چونکە ئەگونجێ هەر لەئەوەڵەوە بەشێك نەبێ لەعامەکە، عامەکە بوترێ ئەو بەشەی لێمەبەست نەگیرێ، بەڵام تایبەتەکە وانیە بۆیە ئەم پێویستی بەمەرج نیە بۆی.

(٣) حەنەفیەکان و ئیمام الحرمین وتوویانە: عامێك کەبەدوایخاصێکدا هاتبێ ئەوە ئەوخاصە ئەسڕێتەوە، وەك پێچەوانەکەش وایە، چونکە ئەوەی هەردوکیان کۆبکاتەوە بەدواداهاتن، کامیان لەدواداهتبێ پێش خۆی ئەسڕێتەوە، ئێمەیش ئەڵێن: کارکردن بە خاصێکی بەدوای هاتوو ئەو عامە پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵام پێچەوانەکەی وانیە، عامەکە تایبەتەکە بەتاڵ ئەکاتەوە، تایبەتیش بەهێزترە لەعام لەو دەلالەت کردنەدا، بۆیە پێویست پێش بخرێ بەسەر عامەکەدا، ئەوان وتوویانە: ئەگەر مێژووی پێش وپاشیان نەزانرا ئەوە هەندێ ئەڵێن: ئەوەستین کار بەهیچ کامیان ناکەین تادەرئەکەوێ .

{اوالتساقُطُ} لهما قولانِ لهم متقاربان لإحتمال كلّ منهما عندهم لأن يكون منسوخا بإحتمال تقدُّمه على الآخرِ مثالُ العامّ فاقتُلُوا المشركينَ ﴾ والخاصّ ان يقال: لاتقتُلوا اهلَ الذمة [1]{وانْ كان} كلٌ منهما {عاماً من وجهٍ} خاصاً من وجهٍ {فالترجيحُ} بينهما من خارجٍ واجبٌ لتعادلهما تقارنا او تأخَّرَ احدهما [2].

{وقالتِ الحنفيَّةُ المتأخرُ ناسخٌ} للمتقدِّم مثالُ ذلك حديث البخاري: منْ بدَّلَ دينَه فاقتُلوهُ ، وحديث الصحيحين: انَّه ﷺ نهى عن قتل النِّساء فالأول عامٌ في الرجال والنِّساء خاصٌ بأهل الرِّدة والثاني خاصٌ بالنِّساء عامٌ في الحربياتِ والمرتدات . [3].

{المطلق والمقيد}

اي هذا مبحثُهُما {المطلقُ الدالُ على الماهِيَّة بلاقيدٍ} من وحدة او غيرها[4]

---

(١) وە كۆمەڵێكیش ئەڵێن: یەكتر بەتاڵ ئەكەنەوە ، ئەمانە دوو قەولی ئەوانەو نزیكن لەیەكەوە، چونكە هەڵئەگرێ هەریەكەیان نەسڕاوەبێ بەهۆی پێشكەوتنی بەسەر ئەوانیتردا لەدابەزیندا، نمونەی عامەكە وەك: موشریكەكان بكوژن ، نموونەی خاصەكە وەك بوترێ: پەیمانداران نەكوژن.

(٢) بەڵام ئەگەر یەكێكیان لەلایێكەوە سەیر بكرێ كەعام بێو، لەلایەكیترەوە سەیر بكرێ كەخاص بێ، ئەوە واجبە لەدەرەوە لەجێیەكیتردا قەرینە بهێنرێ بۆ ئەوەی لایەكیان قورس بكا چونكە هەردووكیان یەك قورساییان هەیە، جائەوانە پێكەوە سەریان هەڵدابێ یاخود بەرودوا هاتبن.

(٣) زانایانی پێڕەوی حەنەفی وتویانە: ئەوەی لەدواەوە هاتبێ ئەوەی لەپێشەوە ئەسڕێتەوە ، بۆ نموونەی ئەوەش ئەو فەرموودەیە بوخاری ریوایەتی كردووە كە دەفەرموێ: هەركەسێ ئایینی خۆی گۆڕی بیكوژن ، وەئەو فەرموودەیە بوخاری و موسیلم ریوایەتیان كردووە كە پێغەمبەرﷺ كوشتن ژنانی قەدەغەكردووە، فەرموودەی یەكەم گشتگیرە بۆ پیاوان و ژنان و تایبەتە بەپاشگەزبووان ، فەرموودەی دووەم تایبەتە بەژنانەوە و گشتگیریشە بۆ هەموو ژنانی جەنگاوەر و پاشگەزبووەوە لە ئیسلام.

{المطلق والمقيد}

(٤) واتە ئەمە جێی باسی توێژینەوەی (مطلق) و (مقيد)ە ، (مطلق)بریتیە لەوەی دەلالەت بكا لەسەر ماهیەت و حەقیقەت و رەگەزێك بێ بۆ ئەوەی ئیعتبار بۆ هیچ قەیدێ بكرێ – بڵێت: ماهیەتێك كە محقق بێت لەضمنی یەك فەردا، یا لەضمنی چەند فەردێكدا– جا ئەو قەیدەش یەك بێ یاخود یەك نەبێت.

{وزعم الآمدي وابن الحاجب دلالَتَه} اي دلالة المسمَّى بالمطلقِ من الأمثلة الآتية ونحوها {على الوحدةِ الشائعة حيثُ} عرَّفاهُ بما يأتي عنهما {توهماه النَّكرة} اي وقعَ في وهمهما اي في ذهنهما انه هي لانَّها دالَّة على الوحدةِ الشائعة لم تخرج عن الأصل من الأفراد الى التثنية او الجمع و المطلق عندهما كذلك ايضاً إذ عرفهُ الأوَّل بالنكرة في سياق الاثبات والثاني بما دلَّ على شائعٍ في جنسه [1].

وخرج الدالُّ على شائعٍ في نوعه نحو: رقبة مؤمنة[2] قال المصنِّف: وعلى الفرق بين المطلق والنكرة أسلوبُ المنطقيين والاصوليين وكذا الفقهاء حيثُ اختلفوا فيمن قال لأمرأته: انْ كان حملكِ ذكراً فانتِ طالقٌ فكان ذكرينِ قيل لاتَطلقُ نظراً للتنكير المشعرِ بالتوحيد وَ قِيلَ: تَطلق حَملا على الجنسِ اهـ [3].

---

(١) ئامێدی و ابن الحاجب وتوویان: (مطلق) بریتیە لەدەلالەت کردنی ئەو فەردانەی ناو ئەبرێن بە (مطلق) –لەنموونەی ئەو وێنانەی کە لەمەوداوا دێن و غەیری ئەوانیش– لەسەر تاکێك کە بلاوە بەسەر هەمو ئەفرادی رەگەزەکەیدا، چونکە ئەو دووانە وەك لەمەودا لێیانەوە نەقڵ ئەکرێ وایان پێناسە کردووە، هەروایان زانیوە کە(مطلق) نەکیرەیە ، واتە واحاڵی بوون و کەوتۆتە ذیهنیانەوە کە (مطلق) هەر نەکیرەیە ، چونکە نەکیرەش دەلالەت ئەکا لەسەر تاکە فەردێکی بلاو لەناو هەموو فەردی رەگەزەکەدا، لەکاتێکدا کە نەکیرەکە لەئەصلەکەی خۆی دەرنەچووبێ، واتە لەموفرەدەوە دەرنەچووبێ بۆ دوو یاخود بۆ کۆو جەمع، (مطلق)یش دووبارە هەروایە بەلای هەردوکیانەوە، چونکە یەکەمیان کە ئامێدیە پێناسەی (مطلق)ی کردووە بەنەکیرە لەدارشتنێکدا کە بۆ ئەرێبێ واثبات بێ، دووەمیشیان (ابن الحاجب)ە پێناسەی کردووە بەشتێك کە دەلالەت بکا لەسەر شتێك کەبلاوبێ لەناو هەموو رەگەزەکەیدا – نەك جۆرەکەیدا – .

(٢) لەپێناسەی (ابن الحاجب) دەئەچێ ئەوەی دەلالەت ئەکا لەسەر فەردێکی کە بلاوبێ لەناو جۆرو نەوعەکەیدا ، وەك: (رقبةٍ مؤمنة).

(٣)بۆ ئەوەی کام پێناسەیان هەڵبژێرین دانەر وتوویەتی:شێوازی زانایانی منطق و أصول ئەوەیە کە (مطلق) و نەکیرە لەیەك جیان ، هەوەها زانایانی شەرعیش و چونکە وەلامیان جیاوازە بۆ کەسێك کەبەژنەکەی بڵێ: ئەگەر سکەکەت نێر بێ ئەوە طەلاقت کەوتبێ، بەلام کەڵێ ئەبێتەوە دوو کور دائەنێ، هەندێك وتوویانە: طەلاقی ناکەوێ و چونکە ئەو نەکیرەیەو ئەوە ئەگەیەنێ ئەگەر سکەکەی یەك نێر بێ ، بەلام هەندێکیتر وتوویانە:طەلاقی ئەکەوێ، چونکە بریویەتی بەسەررەگەزی نێردا ئیتر هەرچەند بن.

ومن هنا يعلم ان اللفظ في المطلق والنكرة واحدٌ و انَّ الفرق بينهما بالإعتبار ان اعتُبرَ في اللفظ دلالته على الماهيَّة بلا قيدٍ سمِّيَ مطلقاً و اسمَ جنسٍ ايضا كما تقدَّمَ او معَ قيدِ الوحدَةِ الشائعَةِ سمِّيَ نكرةً [١] .

والآمديُ وابن الحاجب يُنكران الاول في مسمَّى المُطلقِ من امثلتِه الآتية ونحوها ويجعلانِه الثاني فيدلُ عندَهُما على الوحدَةِ الشائعة وعند غيرهما على الماهيَّة بلا قيدِ الوحدة ضرورية اذ لاوجودَ للماهيَّة المطلوبة بأقلَّ من واحدٍ والاوَّل موافقٌ لكلامِ اهلِ العربيَّة والتسميةُ عليه بالمطلقِ لمقابلةِ المقيَّد وعدول المصنِّف في النقل عن الآمدي وابن الحاجب عما قالاه من التعريف الى لازمه السابق ليبنى عليهِ قوله وان لم يتعرضا للبناءِ [٢] {ومن ثَمَّ} اي من هنا وهو مازعماه من دلالَةِ المطلق على الوحدةِ الشائعةِ اي من اجلِ ذلك [٣].

---

(١) ئالێرەدا ئەزانرێ کە لەفظی موطلەق و نەکیرە یەك لەفظە ، بەڵام جیاوازی نێوانیان بە ئیعتبارە ، جا ئەگەر لە لەفظەکەیدا دەڵاڵەتەکەی لەسەر ماهیەت و جنسیش دووبارە ، وەك لەپێشەوە تێپەڕی کرد، بەڵام ئەگەر لەگەڵ قەیدی تاکە فەردێکی بڵاوی ناو رەگەزەکەیدا، دەڵاڵەتی ئەکرد ئەوە تەنها بەنەکیرە ناو ئەبرێ .

(٢) ئامێدیو (ابن الحاجب) هەردووکیان بڕوایان بەپێناسەی یەکەم نیە لەو ئەفرادانەی (مطلق) دا لەنموونەوی ئەوانەی کەدێن و وێنەی ئەوانیش ، بەڵام هەردووکیان پێناسەی دووەم بە (مطلق) دا ئەڵێن، لەبەر ئەوە (مطلق) بەلایانەوە دەڵاڵەت ئەکا لەسەر تاکێك کەبڵاوە لەناو رەگەزەکەیدا ، بەڵام بەلای غەیری ئەوانەوە دەڵاڵەت لەسەر ماهیەت ئەکا بێ هیچ قەیدو لکاندنی هیچ شتێك پێیەوە، بەکارهێنانی تاکە فەردێك پێویستە هبێت لەپێناسەکەیدا، چونکە ئەو ماهیەتەی کە پێویستی بەکەمتر لەیەك فەرد نیەو نابی، یەکەم موافقی گفتوگۆی شارەزایانی عەرەبیە، ناونیشانی بە (مطلق) لەسەر ئەو یەکەمەیە کە لەبەر مقابەلەکردنێ کەبەستراوە بە مقیدێکەوە ، دانەر لەنەقڵ کردنی ئەو پێناسەی ئامێدی و (ابن الحاجب) کردویانە لایداوە بۆ لازمی ئەو پێناسە کە تێپەڕی کرد، بۆ ئەوەی ئەو مەبەست و قەولەی خۆی لەسەر دروست بکا، -کە کەسێکیتر دێ- هەرچەندە ئەو دوو زانایانە تعرضیان نەکردووە بۆ زەمینەسازی ئەو مەبەستەی کە دانەر بۆی کردووە .

(٣) واتەلێرەدا لەوەوە دەرئەکەوێ کە ئەو دوو زانایە وتوویانە: کە (مطلق) دەڵاڵەت لەسەر تاکێکی ئەکا لەناو هەموو ئەفرادی رەگەزەکەیدا، واتە: لەبەر خاتری ئەوە.

{قالا الأمر بمطلقِ الماهيَّة} كالضرب من غير قيـدٍ {أمر بجزئـيٍ} مـن جزئياتـها كالضرب بسوطٍ اوعصاً اوغيرِ ذلك لأنَّ المقصودَ الوجود ولاوجودَ للماهيَّة وانَّما توجدُ جزئياتها فيكون الأمر بها امراً بجزئيٍ لها [1] {وليس} قولهما ذلك {بشيء} لوجود الماهيَّة بوجودِ جزئيها لانها جزؤه وجزء الموجود موجودٌ [2] {وَ قيـلَ } امـر {بكلِ جزئيٍ} لها لإشعارِ عدم التقيُّد بالتعميم[3] {وَ قيلَ اذنٌ فيه} اي في كلِ جزئيٍ ان يُفعلَ ويخرجُ عن العهدةِ بواحدٍ [4].

{مسئلةٌ: المطلق والمقيَّد كالعام والخاصّ}فما جاز تخصيصُ العامّ به يَجوزُ تقييد المطلقِ به وما لا فلا فيَجوزُ تقيد الكتاب بالكتابِ وبالسُّنَة والسُّنَة بالسُّنَة وبالكتابِ[5].

---

(١) هـەردووكيان وتوويانـە: فـەرمان كـردن بەماهيـەتى پـەتى رووت ، لەهـەموو قەيدێك وەك: لێدان بەبێ قەيدێك ، ئەوە فەرمانە بەئەنجامدانی جوزئێك لەجوزئیاتی ئەو ماهیەتەیە وەك: لێدان بەهۆی شەلاقەوە ، یاخود عەصاوە، یاشتێكیتر چونكە مەبەست لە ئەمرو فەرمانی بوون وجودی شتێكە ، خۆ ماهیەتیش وجودی نیە ، بەڵكو تەنها جوزئیاتەكانی هەن، بۆیە فەرمان دان بە ماهیەت فەرمان كردنە بەئەنجامدانی جوزئێك لەو ماهیەتەیە.

(٢) بـەڵام ئـەو بەڵگـەو بۆچونـە یـان شـتێك ئیعتبـاری پێبكـرێ، چونكـە ماهیـەت وجودی هەیە بەهۆی بوون و وجودی جوزئیەكەیەوە، خۆ بێگومان ماهیـەت و جودی هەیـە بـەهۆی بـوون و وجـودی جوزئیەكەیـەوە ، خـۆ بێگومـان ماهیـەتیش جوزئـی جوزئیە، كەوابوو جوزئێ لەمەوجوودەكە مەوجوودە و هەیە و هەست پێكراوە.

(٣) كۆمـەڵێكیش وتوویانـە: ئـەمر بەماهیـەت فەرماندانـە بەهـەموو جوزئێكـی ئـەو ماهیەتـە، چـون رووت كردنـی لەهـەموو قـەیدێك ئاگـاداركردنی خەڵكەكـە لـەوەی كەمەبەست پێی گشتگیری كردنی هەموو جوزئیاتەكانیەتی .

(٤) هـەندێكیش وتوویانـە: ئـەمر بەماهیـەت مۆڵەتدانـە بەهـەموو جوزئێكـی كە بكرێ، بەڵام ئەگەر یەكێكیان جێبەجێ بكا ئەوە لە لێپرسـراوێتی دەرئەچێ و گوێڕایەڵی كردوە .

(٥) ئەمەش بابەتێكە (مطلق)و (مقید) وەكو عام و خاص وان: كەوابوو ئەوەی دروست بێ تخصیصی عامی پێبكرێ، دروستە تقییدی مطلقیشی پێ بكرێ ئەوەش دروست نەبێ‌عامی پێ تخصیص بكرێ، دروست نیە (مطلق)ی پـێ تـەقیید بكرێ، كـەوابوو ئایـەتێك كـە (مطلـق) بـێ دروسـتە تـەقیید بكـرێ بەئایـەتێكیتر و بـە فـەرموودەش هەر ئەكرێ .

وتقيدهنا بالقياسِ والمفهومين وفعلِ النبيِّ عليه الصلاة والسلام وتقريرُهُ بخلاف مذهبِ الرَّاوي وذكر بعض جزئياتِ المطلق على الأصَحّ في الجميع[1]. {و} يزيد المطلقُ والمقيَّدُ {انهما ان إتَّحدَ حكمهما وموجبهما} بكسر الجيم اي سببُهُما {وكانا مثبتيْن} كان يُقال في كفارةِ الظِّهار: اعتقْ رقبةً مؤمنةً {وتاخرَ المقيَّد عن وقتِ العملِ بالمطلق فهو} اي المقيدُ {ناسخٌ} للمطلَقِ بالنسبة الى صدقه بغير المقيَّد[2] {والاّ} بانْ تأخَّرَ عن وقت الخطاب بالمطلقِ دون العمل او تأخَّرَ المطلق عن المقيَّد مطلقاً او تقارنا اوجهل تاريخهما {حُملَ المطلقُ عليه} اي على المقيَّد جمعاً بين الدَّليلين[3].

{وَ قيلَ المقيَّد ناسخٌ} للمطلقِ {ان تاخر} عن وقت الخطابِ به كما لو تأخَّرَ عن وقت العمل به بجامعِ التَّأخر[4].

---

(١) ئایەت و فەرموودە دروستە تەقییدبکرێن بەهۆی قیاسەوە وهەردوو مەفهومی رەفتارو بیٚدەنگی پێغەمبەریش لێی ، بەلاّم بۆچوونی راوی و باسکردنی هەندێ جوزئیاتی مطلەقەکە لەسەر قەولی ئەصەح لەهەموویاندا مطلەقەکەی پیٚتەقیید ناکرێ، وەك عامیانی پیٚتەخصیص ناکرێ.

(٢) (مطلق) و(مقید) شتێکیان لەعام و خاص زیاترە ئەویش کە ئەویش ئەوەیە: (مطلق) و(مقید) ئەگەر حوکم و هۆکاری هەردوکیان یەك بوو ، وەهەردوکیشیان مثبت بوو ، وەك ئەوەی بوترێ لەبارەی کەفارەت و گوناهی داپۆشینی ژن وەك شوبهاندنی بەدایك و خوشکەوە: بەندەیەك ئازاد بکە ، بەمەرجێ ئیماندار بێ قەیدی ئیمانداری بێگومان دواکەوتبیٚلەکاتی کارکردن بە (مطلق)ەکە ئەوە موقەیەد کراوە ناسخ و سڕینەوەی ئەو (مطلـق)ەقەیە ، بەگوێرەی ئەوە وشەی بەندە بیٚباوەڕو باوەڕدار ئەگرێتەوە، بەلاّم لێرەدا بەبیٚصیفەتی بیٚباوەڕ نابێ.

(٣) ئەگەر نابێ بەم شێوە (مطلق)ەکە دواکەوتبێ لەدابەزیندا نەك لەکارپێکردندا یاخود (مطلـق) ەکە دواکەوتبێ لە مقەیەدەکە چ کارپێکردن بێ یا دابەزین بێ، یاخود هەردووکیان هاوزەمان بن ، یاخود مێژووی هەردووکیان نەزانرێ ئا لەم کاتەدا (مطلق) ەکمە حەمل دەکرێتە سەر (مقید)ەکە ، بۆ ئەوەی هەردوو بەڵگەکە کۆبکرێنەوە.

(٤) هەندێك وتوویانە:مقیدەکە ئەبێتە سڕینەرەوەی (مطلـق)، ئەگەر مقیدەکە دابەزینەکەی دوای دابەزینی (مطلق)ەکە بووبێ، وەك چۆن ئەگەر مقیەکە دواکەوێ لەکاتی کارکردن بە (مطلـق) ەکە ئەبێتە هۆی سڕینەوەی، بەهۆی ئەوەوە کە لەهەردوکیاندا دواکەوتن هەیە.

{وَ قِيلَ يُحمل المقيَّد على المطلق} بأن يلغي القيد لأن ذكر المقيَّد ذكر لجزئيٍ منَ المطلق فلا يقيّده كما ان ذكرَ فردٍ من العامّ لايخصِّصُهُ ، قلنا الفرقُ بينهما أنَّ مفهومَ القيدِ حجَّةٌ بخلافِ مفهومِ اللّقبِ الذي ذكرُ فردٍ من العامّ منه كما تقدَّمَ [١].

{وان كانا منفيَيْنِ} يعني غير مثبتَين منفيين اومنهيَين نحو: لا يجزي عتقُ مكاتب لايجزي عتق مكاتب كافر لاتعق مكاتبا لا تعق مكاتبا كافرا {فقائل المفهوم} اي القائل بحجة مفهوم المخالفة وهو الراجح {يقده به} اي يقيد المطلق بالمقيد في ذلك[٢].

{وهي} اي المسئلة حينئذٍ {خاص وعام} لعموم المطلق في سياق النفي ونافي المفهوم يلغي القيد ويجزي الملطق على اطلاقه[٣]. {وان كان احدُهُما امراً والآخر نهياً} نحو: اعتق رقبة لا تعتق رقبةً كافرة، اعتق رقبة مؤمنة ولاتعتق رقبة[٤]..

(١) کۆمەڵێك وتوویانە: حەملی مقید ئەکرێتە سەر (مطلق) بەم شێوە کە هەر قەیدەکە پوچەڵ ئەکرێتەوە، چونکە زیکرکردنی مقید زیکرکردنە بۆ جوزئێکی (مطلق) کەوابوو زیکری مقیدەکە (مطلق)ەکە تقیید ناکا، وەك چۆن فەردێك لەعامێك زیکر بکرێت عامەکەی پێ تەخصیص ناکرێت، ئێمەیش ئەڵێین: جیاوازی هەیە لەنێوان فەردو قەید دا -بۆ عام قەید وتراوە ، فەردیش لەقەبە ، لەقەبیش مەفهومی مخالەفی بۆ نیە ، بۆ مطلقیش قەید واتراوە قەیدیش مەفهومی مخالفی بۆ هەیە- چونکە مەفهومی قەید حوججە و بەڵگەیە ، جیاوازە لەگەڵ مەفهومی لەقەبدا کە زیکری فەردێکی عامەکە بکرێ هەر جوزئێکە لە لەقەبەکە -زۆربەی کات- وەك کەمێ پێشتر تێپەڕی کرد.

(٢) بەڵام ئەگەر هاتوو هەردووکیان مەنفی بوون، یانی مثبت و رستەی ئەرێ نەبوون ، ئیتر چ مەنفی بن یاخود مەنهی بن ، وەك ئازاد کردنی (مکاتب) لە کەفارەتدا کافی نیە، وە ئازادکردنی مکاتبی بێباوەڕ کافی نیە، مکاتب ئازاد مەکە ، مکاتبی بێباوەڕ ئازاد مەکە، ئەوە ئەوە کە مەفهومی مخالفە بەحوجە و بەڵگە ئەزانێ، کە ئەوەش قەولی راجیحە ، مطلق مقید ئەکا بەمقیدەکەوە لەوانەدا کە هەردووکیان مەنفین.

(٣) ئالەم کاتەدا مەسئەلەکە ئەبێ بەخاص و عام ، چونکە مطلق لەسیاقی نەفیدا بۆ عمومە ، بەڵام کە ئەڵێ: مەفهومی مخالفە حجە نیە ئەوە هەر قەیدەکە پوچەڵ ئەکاتەوە، مطلەقەکە لەسەر مطلقی خۆی ئەڕوێنێ و ئەجوڵێنێ.

(٤) بەڵام ئەگەر هاتوو یەکێکیان ئەمر بوو ئەویتریان نەهی بوو وەك: بەندەیێك ئازادبکە بەندەی کافر ئازاد نەکەی، بەندەیێکی موسوڵمان ئازادبکە،بەندە ئازاد نەکەی.

..{فالمطلق مقيد بضدّ الصفة} في المقيد ليجتمعا فالمطلق في المثال الأوّل مقيَّد بالايمانِ وفي الثاني مقيَّد بالكُفر[١] {وان اختلف السبب} مع احاد الحكم كما في قوله تعالى في كفارة الظهار فتحرير رقبة وفي كفارة القتل فتحرير رقبة مؤمنة {فقال ابو حنيفة لا يحمل} المطلق على المفيد في ذلك لأختلاف السبب فيبقي المطلق على اطلاقه {وَ قيلَ يحمل} عليه {لفظا} اي بمجرد ورود اللفظ المقيد من غير حاجة الى جامع {وقال الشافعي} ﷺ يحمل عليه {قياسا} فلا بد من جامع يبنهما وهو في المثال المذكور حرمة سببهما اي الظهار والقتل[٢].

{وان اتحد الموجب} فيهما {واختلف حكمهما} كما في قوله تعالى في التيمم ﴿ فامسحوا ابو جوهكم وايديكم ﴾ وفي الوضوء ﴿ فاغسلوا وجوهكم وايديكم الى المرافق ﴾ والموجب لهما الحدث واختلاف الحكم من مسح المطلق وغسل المقيد بالمرافق واضح[٣].

(١)..لێرەدا مطلقەکە مقیدە بەصیفەتێکەوە دژی ئەو صیفەتەیە کە لەمقیدەکەدایە، بۆ ئەوەی هەردوو بەڵگەکە لەکارپێکردندا کۆببنەوە ، کەوابوو مطلقەکە لەیەکەمدا مقیدە بەئیمانەوە وەلە دوەمدا مقیدە بەکوفرەوە.

(٢) ئەگەر هۆکەیان جیاواز بوو بەڵام حوکمەکەیان هەر یەك حوکم بوو، وەك لەبارەی کەفارەتی ظیهارەوە خوا دەفەرموێ: ئازادکردنی بەندەیێك کەفارەتیەتی ، وەلەبارەی کەفارەتی کوشتنەوە دەفەرموێ: ئازادکردنی بەندەیێکی ئیماندار کەفارەتیەتی، ئەوە ئەبوحەنیفە فەرموویەتی: لەوەدا مطلقەکە حەمل ناکرێتە سەر مقیدەکە ، چونکە هۆکەیان لەیەك جیاوازن، کە وابوو مطلقەکە بە مطلقی خۆی ئەمێنێتەوە، هەندێکیش وتوویانە: لەڕووی لەفظەوە حەمل دەکرێتە سەری واتە: هەر تەنها بەهۆی لەفظە مقیدەکەوە دەلالەت ئەکا لەسەری هیچ پێویست بە علەو جامع و کۆکەرەوەیەك نیە لەنێوان هەردووکیاندا، شافیعی وتوویەتی: لەڕووی قیاسەوە مطلق حەمل ئەکرێتە سەر مقیدەکە، کەوابوو ئەبێت جامعێك شتێك هەبێت هەردووکیان کۆبکاتەوە، ئەو جامعەش لەو نموونەی باسکرا حەرامی سەبەبەکەیان کەظهار و قەتڵە.

(٣) بەڵام ئەگەر داخوازی کەر لەهەردووکیاندا یەك بوو حوکمیان جیاواز بوو، وەك لەم فەرموودەی خوایەدا:﴿ فَامسَحُوا بوُجُوهِكُمْ ﴾ مەسحی دەم و چاوو دەستتان بکەن، ئەمەیان لەبارەی تەیەمومەوە لەبارەی دەستنوێژەوە دەفەرموێ: ﴿ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ ﴾ دەم و چاوو دەستتان بشۆن لەگەڵ ئەنیشکەکان ، داخوازی کەر لەهەردوکیاندا بێدەستنوێژیە، بەڵام حوکمەکەیان جیاوازە لەمەسحدا

{فعلى الخلاف} من انه لا يحمل المطلق على المقيد او يحمل عليه لفظا او قياسا وهو الراجح والجامع بينهما في المثال المذكوراشتراكهما في سبب حكمهما[١].

{والمقيَّد} في موضعين {بمتنافيين} وقد اطلق في موضع كما في قوله تعالى في قضاء ايام:﴿ فعدَّةٌ من ايام أُخر ﴾ وفي كفارة الظهار:﴿ فصيام شهرين متتابعين ﴾ وفي صوم التمتع:﴿ فصيامُ ثلاثة ايامٍ في الحجِّ وسبعة إذا رجعتم ﴾ {يستغني} فيما اطلق فيه {عنهُما ان لم يكن اولى بأحدهما من الاخرِ قياساً} كما في المثال المذكور بأن يبقي على اطلاقه لإمتناع تقييده بهما لتنافيهما وبواحدٍ منهما لانتفاء مرَجحه فلا يجب في قضاء رمضان تتابعٌ ولا تفريقٌ[٢].

---

مطلقه ئەنیشکی پێوە نیە، لە شۆردندا مقید بەئەنیشکەوە،

(١) ئەمەش روون و دیارە ئەوە لەم بابەتە بۆچوونی زانایان جیاوازە تیایدا ، هەندێ لەسەر ئەوەن مطلقەکە حەمل دەکرێتە سەر مقیدەکە ، یاخود حەمل دەکرێتە سەری بەلاّم لەرووی لەفظەوە، یاخود لەرووی قیاسەوە ئەکرێ ئەوەشیان راجحو ترازووی قورسترە کۆکەرەوەی هەردووکیان و علەتیان لەم نموونەدا هەردوکیان لەهۆکاری حوکمەکەیاندا شەریکن کە بیٓدەستنویٓژیيە.

(٢) بەلاّم ئەگەر لەدوو جێگەدا مقید بوو هەرجارێ بەشتێك کە دژی ئەویتر بێ لەجێگەیێکیش بەمطلقی هاتبێ، وەك خوا دەفەرموێ: لەبارەی گێرانەوەی رۆژووی رەمەزاندا﴿ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ لەچەند رۆژێکیتردا قەزابکرێتەوە، وەلەبارەی کەفارەتی ظیهاردا دەفەرموێ: فصيام شهرينِ متتابعينِ﴾ئەگەر بەندەی دەست نەکەوت با دوومانگی لەسەر یەك رۆژو بگرێت، وەلەبارەی رۆژووی کەسێکەوە کە ئیحرامەی بەعەمرە پۆشیبێ و ئەمجا ئیحرامی شکاندبێ وە بۆ کاتی ئیحرامی حەج نەچووەتەوە بۆشوێنی ئیحرام بەستنەکەی لەکەفارەتی فەوتاندنی میقاتدا دەفەرموێ: ﴿ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ ئەگەر فیدیەی قۆچی نەبوو باسیٓرۆژ لەمەککەدا بەرۆژوو بێ وەکاتێکیش ئەگەرێتەوە حەوت رۆژیتر بەرۆژوو بێت، ئەوە لەوەیدا کە بەمطلقی وتراوە پێویستی بەهیچکامیان نیە، نەبەووشەی بەسەریەکەوە نەبەوشەی جیاجیا، ئەگەر لەرووی قیاسەوە یەکێکیان لەیەکێکیان چاکتر ونزیکتر نەبێ، وەك لەنموونەی پێشوودا بەم شێوەیە لەسەر مطلقی خۆی بمێنێتەوە، چونکە ناکرێ هەردوو قەیدەکەی پێوە بنرێ، چونکە دژ بەیەکن، وە ناشکرێ یەکێکیانی پێوە بلکێنرێ چونکە مرجح و لایێك قورس کەربێ نیە کەوابوو واجب نیە لەگەراندنەوەی رەمەزاندا بەسەریەکەوە بوون یاخود بەین خستنیان .

اما اذا كان اولى بالتقييد بأحدهما من الآخر من حيثُ القياس كأن وحد الجامع بينه وبين مقيده دون الآخرقيِّد به بناءًعلىالراجح من ان الحمل قياسي فان قيل لفظي فلا[1].

{الظَّاهِر والمُؤوَّل}

اي هذا مبحثهُما {الظاهر مادل} على المعنى {دلالة ظنية} اي راجدة فيحتمل غير ذلك المعنى مرجوحا كالا سد راجح في الحوان المفترس مرجوح في الرجل الشجاع والغائط رادح في الخارج المستقذر للعرف مرجوح في المكان المطمئن الموضوع له لغة اولا وخرج النص كزيد لان دلالته قطعية[2].

{والتأويل حمل الظاهر على المحتمل المرجوح فان حمل} عليه {لدليل فصحيح او لما يظن دليلا} وليس بدليل في الواقع {ففاسد اولا لشيء فلعب لا تأويل} هذا كله ظاهر[3].

(١) بەلام ئەگەر مطلەقەكە نزیكترو چاكتربوو بەهۆی پێوەلكاندنی یەكێكیان لەویتریان لەرووی قیاسەوە، وەك ئەوەی كەجامع وعلەت لەنێوان مطلق و مقیدەكەدا هەبێ لەویتردا نەبێ، ئەوە مطلەقەكە مقید ئەكرێ بەیەكێكانەوە ، ئەمەش لەسەر ئەوە دروست ئەبێ كە قەولی راجیح ئیەوەیە حەملەكە حەملێكی قیاسیە ، بەلام ئەگەر بوترێ حەملەكە لەفظیە ئەوە حەملەكە مطلقە كەیەكێك لەودوو قەیدەی پێوە نالكێنرێ

{الظَّاهِر والمُؤوَّل}

(٢) واتە ئەمە جیّی لێكۆڵینەوەی (ظاهیرو مؤوله) ظاهیر بریتیە لەلەفظێك دەلالەت لەسەر ماناكەی بكات ، بەلام دەلالەتەكە دەلالەتێكی ظنی و گوماناویيە، واتە گەیاندنی ئەو مانایە راجحو بەهێزە ، بۆیە هەڵئەگرێ جگە لەو مانایە مانایێكی تریشی هەبێ بەلام لەرووی مەرجوحیەتەوە لەتاكەكەی سوكترە، وەك: وشەی شێر راجح وایە، بۆ جانەوەرێكی درندەبێ ، مەرجوحیش ئەوەیە بۆ پیاوێكی لێهاتوو بێت، ئەمە راجیحە لەمانای‌حەقیقەتدا و مەجازە لەمەرجوحدا، یا وەك وشەی غائط بەمانای راجیحی ئەو شتە پیسەیە لەمرۆڤ دێتە دەر، ئەمەش لەبەر عورف راجیحە، بەلام لەرووی لوغەوە مەرجوحەكە بەواتای شوێنێكی نەوی و دوورە كەیەكەم جار بۆ ئەمەش دانراوە بەم پێناسە نص چووەدەر وەك: زەید ، چونكە دەلالەت كردنەكەی لەسەر ئەو شەخصە مەعلومە دەلالەتێكی قەطعی و بی‌گومانە.

(٣) تەئویل بریتیە لە حەمل كردنی ظاهیر بەسەر مانا مەرجوحەكەیدا، جا ئەگەر لەبەر بەڵگەو دەلیلێك بوو ظاهیرەكە برا بەسەر مانای مەجوحدا، ئەوە ناوئەبرێ بەتەئویلی صەحیح ، یاخود لەبەر ئەوەبوو وای ئەزانی بەڵگەیە بەلام لەواقیعدا بەڵگە

ثُمَّ التاويل قريب يترجح على الظاهر بأدنى دليل نحو اذا قتم الى الصلاة اي عزمت على القيام اليها وبعيد لا يترجح على الظاهر إلاّ بأقوى منه[1].

وذكر المصنّف منه كثيرا فقال {ومن البعيد تأويل امسك} اربعا {على ابتدى} اي تأويل الحنفية قوله ﷺ لغيلان بن سلمة الثقفي وقد اسلم على عشر نسوة اسمك اربعا وفارق سائرهن رواه الشافعي ﷺ وغيره على ابتديء نكاح أربع منهن فما اذا كان نكحهن معا لبطلانه كالمسلم بخلاف نكاحهن مرتبا فيمسك الاربع اوائل ووجه بعده ان المخاطب بمجله قريب عهد بالاسلام لم يسبق له بيان شروط النكاح مع حاجته الى ذلك ولم ينقل تجديد نكاحٍ منهُ ولا من غيره مع كثرتهم وتوفر دواعي حملة الشريعة على نقلة لو وقع[2].

---

نەبوو ئەوە ناو ئەبرێ بە تەئویلی فاسید ، یاخود نە بەڵگەیەکی واقیعی هەبوو نەبڕوایشی وابوو بەلام بێگوێدان و لەخۆیەوە ظاهیری بڕی بەسەر مانا مەرجوحەکەیدا، ئەوە گاڵتەکردنە نەك تەئویل، ئەمەی کەوتمان دیارو روون و بەڵگە نەویستە.

(۱) پاشان تەئویلیش نزیکی هەیە، کە بریتیە لەوەی بەهۆی لاوازترین بەڵگەوە تاباری ئەو بەهێز ئەکرێ بەسەر ظاهیردا، وەك کاتێ نیازی ئەوەتان کرد کە هەستن بۆ نوێژ ... بێگومان کاتێ کە نیازی نوێژ ئەکرێ دەستنوێژ ئەگیرێ ، نەك کاتێ هەڵئەستیتۆ بۆ نوێژ ، وەتەئویلی دووریش هەیە، بریتیە لەوەی تای تەرازووی بەهێز ناکرێ بەسەر ظاهیردا مەگەر بەبەڵگەیەك نەبێ لەبەڵگەی ظاهیرەکە بەهێزتربێ.

(۲) دانەر نموونەی زۆری بۆتەئویلی دوور باس کردووە، لەبەر ئەوە ئەڵێ: هەندێك لەتەئویلی دوور رستەی: (امسك اربعا) ئەبڕێ بەسەر تەئویلی حەنەفیدا ، ئەم رستیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەغەیلانی کوڕی سەلەمەی ثەقەفی لەکاتی موسوڵمان بونیدا دە ژنی هەبوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دەست بگرە بەچوریانەوە، چواریان بگرە و لەوانی‌تر جیابەرەوە ، شافیعی‌و غەیری شافیعیش ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە.، زانایانی حەنەفی ئەم فەرموودەیان واتەئویل کردووە: سەر لەنۆ چواریان مارەبکەرەوە ئەمە بێتو هەردەکەی بێگومان ئەمە بەتاڵە، وەك بۆ هەر موسوڵمانێك ، بەلام ئەگەر یەك لەدوای یەك مارەی کردبن ئەوە حوکمەکەی جیاوازە ، ئەوە ژنی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم لای خۆی ئەگرێتەوە بەژنی، ئەوانی‌تر بەریَلاَ ئەکات، بەڵگەی دووری ئەم تەئویلەش ئەوەیە کەفەرمان پێکراوەکە تازە موسوڵمانەو تائێستە مەرجی مارەبڕین و بەشودانی بۆ روون نەکراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەش پێویستی بەوە

{و} من البعيد تاويلهم {ستين مسكيناً} من قوله تعالى فاطعام ستين مسكينا {على ستين مداً} بأن يقدر مضاف اي طعام ستين مسكينا وهو ستون مدا فيَجوزُ اعطاؤه لمسكين واحد في ستين يوما كما يَجوزُ عطاءه لستين مسكينا في يوم واحد لان القصد باعطائه دفع الحاجة ودفع جاجة الواحد في ستين يوما كدفع حاجة الستين في يوم واحد. ووجه بعده انه اعتبر فيه مالم يذكر من المضاف والغي ما ذكر من عدد المساكين الظاهر قصده الفضل الجماعة وبركتهم وتظافر قلوبهم على الدعاء للمحسن[1] {و} من البعيد تأويلهم حديث ابي داود وغيره {ايما امراة نكحت نفسها} بغير إذن وليها فنكاحها باطل[2].

---

هەبووە، وەتازەکردنەوی مارەبڕین نەلەغەیلانەوە ونەلەغەیری ئەوەوە نەقڵ نەکراوە، لەگەڵ ئەوەش ئەوانەی کەموسوڵمان بوون، زۆربەیان چەندەها ژنیان هەبووە، لەگەڵ زۆری باعیسی هەڵگرانی شەرع لەنەسەر نەقڵ کردنی ئەگەر شتی وا هەبوایە یاروی بدایە .

(١) نموونەیەکی تر لەجۆری تەئویلی دوور بەلای زانایانی حەنەفیەوە ، (ستین مسكيناً) لەو فەرموودەی خوادا کە دەفەرموێ: ﴿فإطعامُ ستينَ مسكيناً﴾ بەشەست مود -جۆرە میزانێکە وەك کیلۆ- تەئویلیان کروەتەوە بەم شێوە مضافێکیان بۆ تەقدیر کردووە، کە بەم شێوەی لێدێتەوە ﴿فإطعامُ ستينَ مسكيناً﴾ کەشەست مودە، کەوابوو دروستە هەمووی بدرێ بەیەك هەژار لەشەست رۆژدا ، وەك چۆن دروستە بدرێت بەشەست هەژار لەیەك رۆژدا، چونکە مەبەست بەبەخشینی ئەو ژەمەخواردنەو لابردنی هەژاری و حاجەی خەڵك لابردنی هەژاری بەسەر یەك کەسەوە لەماوەی شەست رۆژدا، وەك لابردنی هەژاری بەسەر شەست کەسەوە لەماوەییەك رۆژدا. جا کەوابێ بۆچی دورە؟ ئەڵێ: هۆی دووری‌یەکەی ئەوەیە ئەوەی باس کراوە کەبریتیە لەمضافەکە ئیعتیباری پێکراوە و ئەوەی زیکر کراوە ئیلغاو پوچەڵ کراوەتەوەکە ژمارەی هەژارەکانە کە ظاهیر وادیارە ژمارەی هەژارەکان مەبەست بێ، چونکە جەماعەت و کۆمەڵ فەزڵ و بەرەکەتیان هەیە ،و دەڵ کانیان کۆمەکی یەك دەکەن و پێکەوە دۆعاو نزا ئەکەن بۆ چاکەکارەکە ، دەخۆ دۆعای شەست کەس لەدۆعای تاکە کەسێ باشترە.

(٢) نموونەیەکی تر لەجۆری تەئویلی دوور ئەوەیە زانا حەنەفیەکان ئەم فەرمودەی کە ئەبوداود و غەیری ئەبوداود ریوایەتیان کردووە ، هەر ژنێك خۆی لەمێرد مارەبکات بێ‌ئەوەی سەرپەرشتیاری مۆڵەت و ئیجازەی پێبدا ئەو مارەبڕینە پوچەڵ و بەتاڵە .

وفي رواية البيهقي فأن اصابها فلها مهر مثلها بما اصاب منها {على الصغيرة والامة والمكاتبة} اي حمله اولا بعضهم على الصغيرة لصحة نرويج الكبيرة نفسها عندهم كسائر تصرفتها فاعترض بان الصغيرة ليست امراة في حكم اللسان فحمله بعض اخرى على الامة فاعرض بقوله: فلها مهر مثلها فأن مهر الامة ليسرها فحمله بعض متأخريم على المكاتبة فان المهر لها ووجه بعده على كل انه قصر للعام المؤكد عمومه بما على صورة نادرة مع ظهور قصد الشارع عمومه بأن تمتع المراة مطلقاً من استقلالها بالنكاح الذي لايليق بمحاسن العادات استقلالها به [1]. {و} من البعيد تاويلهم حديث {لا صيام لمن لم يبيت} اي الصيام من الليل [2].

---

(١) لەگەڕانەوەکەی بەیهەقی‌دا دەفەرموێ: خۆ ئەگەر مێردەکەی لەگەڵی خەوت ئەوە ئەو ژنە هەر مارەیی‌یەکەی ئەکەی‌وێ بەهۆی ئەوەوە کە ئەو پیاوە کاری ژن و مێردایەتی لەگەڵ ئەنجام داوە، زانایانی حەنەفی ئتەئویلی ئەو ژنەیان کردوە بڕیویانە بەسەر: ١- کچۆڵەدا ٢- جاریەدا ٣- جاریەی مکاتەبەدا، واتە یەکەمجار هەندێکیان بڕیوینە بەسەر کچۆڵەدا، چونکە بەلای ئەوانەوە ئافرەتی گەورە خۆی مارەبکات صەحیح و دروستە، وەك چۆن مامەڵـەکانی‌تری وەك کڕین و فرۆشتن و.... هتد دروستە و دائەمەزرێ ، بەڵام دەست بەجێ ڕەخنەیان لێگیراوە کە وشەی (امراە) لەفەرهەنگی عەرەبیدا کچۆڵە ناگرێتەوە لەبەر ئەوە هەندێکی‌تریان بڕیویانە بەسەر جاریەدا ئەمانیش ڕەخنەیان لێگیراوە ڕستەیەك کە لە فەرموودەکەدایە دەفەرموێ: ئەو ئافرەتە ئەبێتە خاوەنی مارەییەك کەبەئەندازەی مارەیی کەسەکانی بێت، چونکە مارەیی جاریە بۆ ئاغاکەیەتی نەك بۆ خۆی، لەبەر ئەوەهەندێ زانایانی چەرخی دواییان بڕیویانە بەسەر جاریەیێکدا کە مکاتبە بێت، چونکە ئەم مارەییەکەی بۆ خۆی ئەبێت، هۆی دووری ئەم تەئویلە لەسەر بۆچوونی هەموویان واتە هەر سێ قەولەکە ئەوەیە کە: کورتکردنەوە کەمکردنەوە لێدارنینی لەفظی‌کی عام و گشتگیرە (أيّما امراةٍ) کەگشتگیریەکەی دووبارە کراوەتەوە بەهۆی لەفظی(ما) وە ئەمجا بڕاوە بەسەر دیمەنێکی کەم ئاوازەدا کە مکاتبە و ئەوانی‌تر بێ، لەگەڵ ئەوەش بەئاشکرا مەبەستی شارع دیارە کە عمومەکەی مەبەستە، بەم شێوە کەژن بەمطلقی قەدەغە بکرێ کەسەربەخۆ بێ لەشوکردندا.

(٢) هەروەها نموونەیەکی تر لە تەئویلی دوور ئەوەیە زانایانی حەنەفی ئەم فەرموودەیان تەئویل کردوە پاداشتی هیچ ڕۆژوێك نیە بۆ کەسێك کە لەشەودا نیەتی ڕۆژووی نەبووبێ.

رواه ابوداود وغيره بلفظ من لم يبيت الصيام من الليل فلا صيام له {على القضاء والنذر} لصحة غيرهما بنية من النهار عندهم ووجه بعده انه قصر للعام النص في العموم على نادر لندرة القضاء والنذر بالنسبة الى الصوم المكلف به في اصل الشرع[1] .

{و} من البعيد تأويل ابي حنيفة حديث ابن حبان وغيره {ذكاة الجنين ذكاة امه} بالرفع والنصب {على التشبيه} اي مثل ذكاتها اوكذكاتها فيكون المراد الجنين الحيّ لحرمة الميّت عندهُ و اصله صاحباه كالشافعي ووجه بعدهِ مافيه التقدير المستغنى عنه أما على رواية الرفع وهي المحفوظة كما قالهُ الخطابي وغيرهُ من صلَة الحديث فإن يُعرب ذكاة الجنين خبر لما بعده اى ذكاة أم الجنين ذكاة له يدل عليه رواية البيهقي ذكاة الجنين في ذكاة امه وفي رواية بذكاة أمة [2] .

---

(١) ئەبوداود و غەیری ئەویش بەم شێوە ریوایەتی دەکەن: کەسێك لەشەودا نیەتی رۆژوی نەهێنابێ، ئەوە پاداشتی هیچ رۆژوویەکی بۆنیە ئەمان حەملیان کردوەتە سەر رۆژوویەك کەبۆ قەزا یا بۆنەزر بێ، چونکە بەلای ئەوانەوە جگە لەو دوو روەوە نەبێ نیەتی هەموو رۆژوێك دروستە ، هۆی دوریەکەش ئەوەیە کورتکردنەوی عامێکە، - نەکیرە لەسیاقی نەفیدا بۆ عمومە-بەسەر شتێکی کەم و ناوازەدا ، چونکە قەزاو نەزر بەگوێرەی ئەوانی‌تر وەك لەشەرعدا مرۆڤیان پیٚ‌تەکلیف کراوە زۆرکەمن.

(٢) نموونەیەکی تر لە تەئویلی دوور ئەوەیە ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: ئەبوحەبان و غەیری ئەویش ریوایەتی ئەکەن کە دەفەرموێ: سەربڕینی بێچو سەربڕینی دایکەکەیەتی ، زەکاتی دووەم بەرەفعەو نەصبەش ریوایەت کراوە لەسەر شێوازی شێوەسازی واتە نموونەی نموونەی سەربڕینی دایکەکەیەتی، مەبەست پێی بێچوی زیندوە چونکە بێچو بەمردویی لەدایك دەربهێنرێ بەلای حەنەفیەوە حەرامە، بەلام هەردوو هاوەڵەکەی بەحەلاڵیان زانیوە وەك شافیعی ، هۆی دووری ئەم تەئویلەش ئەوەیە شتێك تەقدیر ئەکرێ کەوشەی (مثل)ە یاخود (ك)ەکەیە رستەکە پێویستی پیٚ نیە جا لەسەر شێوازی بەرەفعە خوێندنەوەی کە هەرواش لەبەرکراوە، وەك خەططابی و غەیری خەططابیش وتوویانە : کەزانایانی و هەڵگرانی فەرموودەن ئەوەیە کە (ذكاة الجنين) ئەکرێتە خەبەر بۆ ئەو موبتەدایەی ها بەدوایەوە، واتە سەربڕینی دایکی بێچوەکە سەربڕینە بۆ بێچوەکەی ، ئەم شێوازەش ریوایەتەکەی بەیهەقی ئەیگەیەنێ کە دەفەرموێ: سەربڕینی بێچو لە سەربڕینی خودی دایکەکەیایەتی لەریوایەتێکیشدا بەهۆی سەربڕینی‌دایکیەتی.

واما على رواية النصب ان ثبتت فبأن يجعل على الظرفية كما في جئتك طلوع الشمس أي وقت طلوعها المعنى ذكاة الجنين حاصلة وقت ذكاة امه وهو موافق لمعنى رواية الرفع الذي ذكرناه فيكون المراد الجنين الميت وان ذكاة امه التي احلها احلته تبعا لها [١].

يؤيد ذلك ما في بعض طريق الحديث من قول السائلين يا رسول الله انانتحر الإبل ونذبح البقر والشاة فنجد في بطنها الجنين افنلقيه اونأكله فقال رسول الله ﷺ كلوه ان شئتم فان زكاته ذكاة أمه فظاهر ان سؤالهم عن الميت لأنه محل الشك بخلاف الحي المكن الذبح فمن المعلوم انه لا يحل الا بالتذكية فيكون الدواب عن الميت ليطابق السؤال [٢]. {و} من البعيد تأويلهم كمالك قوله تعالى {انما الصدقات} للفقراء والمساكين الخ {على بيان المصرف} أي محل الصرف بدليل ماقبله ومنهم من يلمزك في الصدقات الخ [٣].

(١) بەلام لەسەر شێوازی ئەوەی بەنەصبە بخوێنرێتەوە، ئەگەر ئەم ریوایەتە ثابت بێ و بسەلمێ ، ئەوەئەبڕێ بەسەر ظرفیەتدا وەك دەڵێت: هاتم بۆلات طلوع الشمس ، واتە: کاتی هەڵهاتنی ڕۆژ ، بەم شێوە مانای فەرموودەکە وای لێ دێ، سەبڕینی بێچو دێتە دی کاتی سەربڕینی دایکەکەی ، ئەم مانایەش چون یەکە لەگەڵ ریوایەتی بەرەفعە خوێندنەوەیدا کە باسمان کرد کەوابوو ئەبێ مەبەست بێچوی مردوو بێت ، ئەو سەر برینەی دایکی حەڵاڵ ئەکا بێچوەکەش حەلاڵ ئەکا، بەپاشکۆکەی دایکەکەی.

(٢) پشتگیری ئەم فەرموودەیە ئەکا لەهەندێ ڕێگەوە ئەم فەرموودەیە ریوایەت کراوە کە: پرسیاری کردووە : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وشتر بەپێوە سەرئەبڕین و مانگاو شەکیش ئەدەین بەزەویدا سەریان ئەبڕین ، ئەبینین بێچوو لەسکیاندایە ئایا تووری بدەین یان بیخۆین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئارەزوتان لێی هەیە بیخۆن چونکە سەربڕینەکەی بەسەربڕینەکەی دایکەکەی ئەبێ، وادیارە پرسیارەکەیان لە بێچوی مردوو بووە، چونکە ئەو جێ گومانە نەك بێچوی زیندوو کەبگونجێ سەربڕینی، ئەوە شتێکی زانراوە کەئەگەر زیندوبێ بەسەربڕینی دایکەکەی حەلاڵ نابێ، کەوابوو وەڵامەکە لەبارەی مردووە بێ بۆ ئەوەی پڕ بەپڕی پرسیارەکەبێ.

(٣)نموونەیەکی‌تر لەتەئویلی دوور ئەوەیە زانایانی حەنەفی وەك ئیمام مالك کردویانە ئەم ئایەتەیە دەفەرموێ:﴿ إنَّما الصدقات للفقراءِ و المساكين...﴾ هەموو جۆری زەکات تەنها ئەدرێ بەفەقیرو مسکێن ....هتد، ئەبێ بدرێ بەهەموویان بەلای‌شافعیەوە

ذمهم الله تعالى تعرضهم لها لحلوهم عن اهليتها ثُمَّ بين اهلها بقوله ﴿ انما الصدقات للفقراء ﴾ الخ اي هي لهذه الأصناف دون غيرهم وليس المزاد دون بعضهم أيضاً فيكفي الصرف لاي صنف منهم ووجه بعده مافيه من صرف اللفظ عن ظاهره من استيعاب الاصناف لغير مناف له ادبيان المصرف لاينافيه فليكونا مرادين فلا يكفي الصرف لبعض الأصناف إلاّ اذا فقد الباقي للضرورة حينَئذٍ [1].

{و} من البعيد تأويل بعض اصحابنا حديث السنن الأربعة {من ملك ذا رحم} محرم فهو حرٌّ وفي رواية النسائي وابن ماجه عتق عليه {على الاصول والفروع} لما تقرر عندنا من انه انما يعتق بمحرد الملك ماذكر ووجه بعده مافيه من صرف العامّ عن العموم لغير صارف[2].

---

وەك ئەوان ئەیپرن بەسەر دیاری کردن و بەیان کردنی شوێنی خەرجی زەکاتەکەیە -واتە ئەگەر هەمووی بدرێ بەیەك کەس دروستە-بەبەڵگەی ئەو ئایەتە کەلەپێشەوە دەفەرموێ: هەندێ لەدووڕویان غەیبەت دەکەن لەبارەی دابەشکردنی زەکاتەوە ..هتد.

(١) بەم ئایەتە خوا ریسوایان ئەکات لەسەر ئەوەی خۆیان ئەنوێنن بۆ وەرگرتنی زەکات لەگەڵ ئەوەش ئەهلیەتی وەرگرتنی زەکاتیان تێدا نیە، پاشان خوا ئەوانە دیاری ئەکات کە ئەهلی زەکاتن و دەفەرموێ: هەموو جۆرێ زەکات تەنها دەدرێ بەفەقیرو مسکین.... هتد، واتە تەنها بۆ ئەم هەشت جۆرەیە بۆ غەیری ئەوان نابێ نەك مەبەستی ئەوەبێ بۆ هەندێکیان نابێ دووبارە، کە وابوو بەلای زانایانی حەنەفیەوە ئەگەر خەرج بکرێت بۆ هەریەکێك لەو هەشت جۆرە دروستە و کافیە بۆ ئەنجامدانی زەکاتەکەی. هۆی دووری ئەم تەئویلەش ئەوەیە ئەو خرابەیە کەتیایەتی کە گۆڕینی لەفظەکەیە لەمانای ظاهیرو دیاری خۆی کەگشتگیری هەموو جۆرەکانی ئەهلی زەکاتن ، بۆ شتێك کەدژی واتا ظاهیریەکەی نیە، چونکە بەیانی شوێنی خەرجی زەکات دژایەتی ظاهیری لەفظەکە ناکات کەوابوو باهەردووکیان مەبەست بێت – گشت جۆرەکان و شوێن خەرجی زەکاتیش–لەبەر ئەوە دروست نیە و زەکاتی لەکۆڵ ناکەوێ ئەگەر تەنها بۆ هەنێ لەوهەشت جۆرەی خەرج کردن مەگەر هەموویان دەست نەکەون، ئەو کاتە لەبەر زەرورەت دروستە، نەك لەبەر ئەوەی مانای ئایەتەکە وایە.

(٢) نموونەیەکیتر لە جۆری تەئویلی دوور ئەوەیە کە هەندێ لەهاوەڵانی خۆمان ئەم فەرموودەی کە لەهەر چوار سونەتدا هاتووە دەفەرموێ: کەسێ بو بەمالیکی خاون رەحم و خزمێکی مەحرەم ئەوە ئەو خزمە دەست بەجێ ئازادەبێ، لەریوایەتی نەسائی و ابن ماجە دا دەفەرموێ: ئەو خزمە ئازاد ئەبێ هەرچەندە بەزیان تەواو

وتوجيه ماتقرر ان بقي العتق عن غير الأصول والفروع للأصل المعقول وهو انه لا عتق بدون اعتاق خُولف هذا الأصل في الأصول لحديث مسلم لايجزي ولد والده إلاّ ان يجده مملوكا فيشتريه فيعتقه أي بالشراء من غير حاجة الى صيغة الإعتاق[1] وفي الفروع لقوله تعالى:﴿ وقالوا اتخذ الرحمن ولداً سبحانه بل عباد مكرمون ﴾ دل على نفي اجتماع الولدية والعبدية والحديث قال النسائي منكر والترمذي لايتابع ضمرة عليه وهو خطاء عند أهل الحديث نعم رواه الأربعة من غير طريق ضمرة أيضا وصححه الحاكم[2].

---

ئەبێ لەسەر بکرەکەی ، ئەم فەرموودەیان بڕیوە بەسەر باوك و دایك و منداڵدا، چونکە لای ئێمە سەلمێنراوەو هەموو لا دانیان پیادا ناوە کە تەنها باوك و دایك و منداڵ ئازاد دەبێ بەموڵکایەتی رووت بەبێ ئەوەی ئازادکردنی بوێ، هۆی دووری ئەم تەئویلەش ئەو رەخنەیە کەتیایەتی کە لەگشتگیری خستنی لەفظە عامەکەیە بە بێئەوەی بگۆڕێکی هەبێ.

(١) سەلماندنی ئەوەی بڕیاردرا کە فەرموودەکە هەر ئەصڵ و فەرع دەگرێتەوە، جگە لەوان لەبەر هۆی موڵکایەتیەوە ئازاد نابێ ئەوە لەبەر ئەصڵ و قاعیدەیێکی ماقووڵە ، کە بریتیە لە: بەبێئازادکردن هیچ جۆرە ئازادییەك نیە،پێچەوانەی ئەم قاعیدە کراوە لەباسکردنی ئازادی باوك و دایکدا لەبەر فەرموودەیەك کە موسلیم ریوایەتی دەکات و دەفەرموێت: منداڵ پاداشتی باوکی ناداتەوە مەگەر بەجۆرێك باوکی کرابێتە بەندەو ئەویش یەکسەر بیکڕێ و ئازا بەهۆی کڕینەوەکەیەو ئازادی بکات ، بێئەوەی پێویستی بەئازادکردن هەبێ.

(٢) هەروەها پێچەوانەی ئەم قاعیدە کراوە لەباسی منداڵ و فروعدا ، لەبەر ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ ﴾ وتویانە خوای میهرەبان منداڵی بۆ خۆی فەراهەم هێناوە پاکیو بێگەردی هەر بۆ خوایە، نەخێر ئەوانە چەند بەندەیێکی رێزلێنراون ، ئەم فەرموودەی خوا دەلاڵەت ئەکا لەسەر ئەوە کە کوڕایەتی و بەندایەتی لەیەك کەسدا کۆنابێتەوە، نەسائی وتوویەتی: ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ ناسراو نیە، ترمیذیش وتوویەتی: ضەمورە لەسەر ریوایەتی فەرموودە متابعە ناکرێچونکە هەڵەی زۆرە بەڕای زانایانی فەرموودەوە. بەڵێ هەر چوار زانای فەرموودە ریوایەتیان کردووە دووبارە جگە لە ڕێی ضەمورەشەوە نەبێ، حاکمیش تەصحیح و راستی کردوەتەوە .

وقال الترمذي العمل عليه عند أهل العلم فنحتاج نحن حينَئذٍ الى بيان مخصص له بخلاف الحفية وقد يقال يخَصّصه القياس على النفقةِ فانها لا تجبُ عندنا لغير الأصول و الفروع[1].

{والسارق يسرق البيضة} اى ومن البعيد تأويلُ يحى بن اكثَمً وغيره حديث الصحيحين لعن الله السارق يسرق البضة فتقطع يدُه ويسرق الحبلَ فتقطع يدهُ {على} بيضةِ {الحديد} اى التى فوق راسِ المقاتِل وعلى حبل السفينة ليوافق احاديث اعتبارالنصابِ في القطع ووجه بعده مافيه من صرفِ اللفظِ عما يتبادرمنه من بيضةِ الدجاجةِ والحبل المعهودِغالباً المؤيد إرادتهُ بالتوبيخ باللعن لجريانِ عرف النّاس بتوبيخ سارقِ القليلِ دونِ الكثير وترتيبُ القطع على سرقةِ ذلك لجرّها الى سرقةِ غيرِها مما يقطعُ فيه وهذا تأويلُ قريب[2].

---

(١) تيرمذى وتويەتى: بەلاى زانايانى پسپۆڕەوە كار بەو فەرمووده ئەكرێ، كەوابوو ئێمه لەم كاتەدا پێويستمان بەبەيان كردنى مخصص و تيبەتمەندكردنى ئەو ئەصلو قاعيده هەيه، بەلام بەلاى زانايانى حەنەفيەوە پێويست ناكا،ئەشوترێ قياس كردنى ئازادبوونى ئوصولْ و فروع لەسەر نەفەقە ئەو قاعيدەيه تايبەتمەند دەكا ؛ چونكه بەلاى ئێمەوە نان و بژێوى بۆ غەيرى باوك و دايك و منداڵ واجب نيه.

(٢) نموونەيەكى‌تر لە جۆى تەئويلى دوور ئەوەيه كه يەحياى كوڕى ئەكثەم و غەيرى ئەويش كردويانه ئەو فەرموودەيه كه بوخارى و موسليم ريوايەتيان كردوه دەفەرموێ: لەعنەتى خوا لەو دزەى هێلكەيەك دەدزێو دەستى ئەبڕێ، ياخود حەبلێك ئەدزێ دەستى ئەبڕێ، هێلكەكەيان حەمل كردوەتە سەر خوزەيەكى جەنگاوەر لەكاتى جەنگدا لەسەرى دەنێ، وە حەبلەكەشيان حەمل كردوەتە سەر ئەو حەبلەى پاپۆڕ بەستنەوە ، بۆيه ئەم تەئويلەشيان كردوە بۆ ئەوەى ئەم فەرموودە لەگەڵ ئەو فەرموودانه يەك بگرێتەوە لەدەست بڕيندا ئەبێ ماڵه دزراوەكه بگاتە نيصابى ديارى كراو ، هۆى دوورى ئەم تەئويلەش ئەو رەخنەيه كەتيايەتى كەلادانى لەفظەكەيه لەو مانايەى كەوتراوە يەكسەر بەرەو زيهنى مرۆڤ دەچێت كه هێلكەى مريشكە ياخود ئەو گوريسەيه كەلاى خەڵك ناسراوە، كەمەبست لەسەرزەنشت كردنەكەدا سەرەتا پشتگيرى ئەم مانايه دەكات،چونكه باوەڕ وايه لەناو خەڵكدا دزێ كەشتى هيچ و پوچ بدزێ سەرزەنشت بكرێ ، نەك دزێك كەشتى زۆر بدزێ ، هێنانى دەست بڕين بەشوێن ئەو شتەكەمەدا كەپيتى فێ ئەيگەيەنێ‌چونكه ئەوە ئەيكێشێ بۆ چەندەها شتى تر كه دەست تيايدا ئەبڕێ، ئەمەش تەئويلێكى زۆر نزيكه.

{و بلالُ يشفع الاذان} اى ومن البعيدِ تأويلُ بعضِ السلف حديث انس فى الصحيحين امرَ بلالُ اى امرهَ رسول الله ﷺ كمافى النسائى ان يشفَع الاذان ويوترَ الاقامة {على ان يجمله شفعاً لاذانِ ابنِ ام مكتومٍ} بان يؤذن قبله للصبح من الليل كما هو الواقعُ ولا يزيدَ على اقامتهِ حمله على ذلك ماقاله من افرادِ كلماتِ الاذانِ ووجه بعده ما فيه من صرف اللفظ عما يتبادر منه من تثنية كلمات الاذانِ وافرادِ كلمات الاقامة اى المعظم فيهما المؤيد ارادته بما في رواية لانس في الصحيحين ايضاً من زيادة إلاّ الأقامة اى كلماتِها فانها تثنى[1].

{المجمل}

{مالم تتضح دلالته} من قولٍ اوفعلٍ وخرج المهملُ اذلا دلالة له والمبين لاتضاح دلالته[2].

---

(١) نموونەیەکیتر لە جۆی تەئویلی دوور ئەوەیە کە هەندێ لە زانایانی پێشین ئەو فەرموودەی کەئەنەس لەبوخاری و موسیلم دا ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا بەبیلال وەك لەنەسائیشدا هاتووە، وشەکانی بنگ دودو بکاتەوە و وشەکانی قامەت تاك تاك ، بریویانە بەسەر ئەوەدا کە گوایە بیلال بانگەکەی خۆی بکا بەجوتی بانگی (ابن أم مکتوم) واتە پێش ئەو لەبەیاندا هەر بەشێکە لەشەو بانگ بڵێ، کە هەرواش بوو بەڵام بەسەر قامەتی (ابن مکتوم) دا قامەتی نەکا – یاخود لەئەندازەی قامەتی (ابن ام مکتوم) درێژەی پێنەدا – ئەوەی ئەو هەندە زانایەی وایْکردووە کە ئەو فەرموودە ئاوا تەئویل بکەن ، قسەیەکی خۆیانە کە ئەڵێ: وشەکانی بانگیش هەر تاك تاکن ، هۆی دووری ئەم تەئویلەش ئەو خراپەی لێگیراوە ،کەلادانی لەفظەکەیە لەوەی کەبوتری' یەکسەر مرۆڤ لێی حاڵی ئەبێ کە ووشەکانی بانگ دودون و وشەکانی قامەت تاك تاك، واتە زۆربەی زۆریان ، کە ئەو مەبەستەش بەهێز دەکرێت بەوەی لەریوایەتێکی ئەنەسدا هاتووە کەبوخاریو موسلیم هەردوکیان دوبارە ریوایەتی ئەکەن کەزیادبوونی وشەی الاّ قامەت واتە: وشەکانی قامەت تاك تاکن جگە رستەی (قد قامت الصلاة) نەبێ چونکە ئەو دووبارە ئەکرێتەوە.

{المجمل}

(٢) موجمەل شتێکە دەلالەتەکەی روون نەبوبێتەوە، موجمەل مەرج نیە لەفظ بێ گوفتار یان کردار موجمەلیان هەیە، موهمەل و بێماناش چوونەدەر چونکە ئەم هەر دەلالەتی نیە، موبەینیش چویەدەر چونکە دەلالەتەکەی روون کراوەتەوە.

{فلا إجمالَ في آية السرقة} وهي ﴿ والسارق والسارقة فاقطعوا أيديهما ﴾ لا في اليد ولا في القطع وخالف بعضُ الحنفية قال لأن اليدَ تطلق على العضو الى الكوع والى المرفق والى المنكِب والقطع يطلق على الابانة وعلى الجرح يُقالُ لمن جرح يدهُ بانسكين قطعها ولا ظهور لواحدٍ من ذلك وإبانة الشارع من الكوع مبيّن لذلك[1]، قلنا: لا نسلم عدم الظهور لوادٍ من ذلك فإنّ اليد ظاهر في العضو الى المنكب و القطع ظاهر في الإبانةِ و ابانة الشّارع من الكوع مبيّن انّ المراد من الكلّ ذلك البعض[2].

{ونحو حرمت عليكم امهاتكم} كحرمت عليك الميتة اي لا اجمال فيه وخالف الكرخي وبعض أصحابنا قالوا: اسناد التحريم الى العين لا يصح لأنه انما يتعلق بالفعل فلا بد من تقديره وهو محتمل لامور لا حاجة الى جميعها ولا مرجح لبعضها فكان مجملا[3].

---

(١) کەوابوو ئیجمال لەوئایەتەدا نیە کەلەدزی ئەدوێ، ئەویش ئەمەیە:﴿ والسّارقُ و السّارقةُ فاقطعوا ایدیهما﴾ نە دەست و نەبڕینەوە هیچ کامیان ئیجمالی تێدا نیە چونکە دەلالەتەکەیان روونە، بەلام هەندێ لەزانایانی حەنەفی رایان پێچەوانەی ئەمەیەو دەڵێن: دەست ئەبڕێ بەسەر پەنجەکاندا هەر لەجومگەوە هەتا سەر شان، کەوابوو بەسەر ئەم چوارەدا ئەبڕێ کامیان مەبەستە روون نیەکەوابوو موجمەلە، قطعیش ئەبڕێ بەسەر جیاکردنەوەو بڕینی ئەندامێکدا، کەسێ دەستی خۆی بەچەقۆ بریندار بکا ئەوترێ: (قطعها) لەئایەتەکەدا کامیان مەبەستە دیار نیە، کەوابوو قطعیش لەئایەتەکەدا مجملە، جیاکردنەوەی دەستی دز لەجومگەوە لەلایەن شارعەوە بەیان کراوە چونکە ئەو مانایە هەیە.

(٢) ئێمەیش دەڵێین: ئێمەیش نایسەلمێنین کەیەکێك لەو مانایانە دیار نیە کام مەبەستبێ، چونکە دەست دیارە بەپەنجە دەڵێن هەتا دەگاتە سەرشان قطعیش دیارە بۆ جیاکردنەوە بەکارهاتووە، کەئەشڵێن: جیاکردنەوەی لەلایەن شارعەوە دیاری کراوە کەلە جومگەوە ئەبێ، ئەوە مەبەست پێی ئەو کوڵلەکەیە دە مەبەست پێی هەندێکە لێی کە لەجومگەوەیە –مەجازی مورسەلە–

(٣) نموونەیەکی‌تر بۆ ئەوەی ئیجمالی تێدا نەبێ، وەکوو هەموو جۆرە دایکێکتان لەسەر حەرام کراوە، یاخود وەکوو هەموو جۆرە مردارەوەبویەکتان لەسەر حەرام کراوە، کەرخی و هەندێ لەهاوەڵانی خۆمان رای جیاوازیان گرتۆتەبەر وتوویانە: حەرام کردنی دانەپاڵی شتێك بەچاو ببینرێ راست و گونجاو نیە، چونکە حەرام کردن تەنها پەیوەندی بەکردارەوە ئەبەستێ بۆیە پێویستە ئەو ئایەتانەدا تەقدیری

قُلْنا المرجح موجود وهو العرف فإنَّهُ قاض بان المراد في الاول تحريم الإستمتاع بوطء ونحوه وفي الثاني تحريم الأكل ونحوه(١).

{وامسحوا برء وسكم} لا اجمال فيه وخاف بعض الخفية قال لتردده بين مسح الكل والبعض ومسح الشارع الناصية مبين لذلك.قُلْنا لا نسلم تردده يبين ذلك وانما هو لمطلق المسح الصادق بأقل مايطلق عليه الأسم وبغيره ومسح الشارع الناصية من ذلك(٢).

{لا نكاح إلى بولي} صححه الترمذي وغيره لا اجمال فيه وخالف القاضي أبو بكر الباقلاني فقال: لا يصح النفي لنكاح بدون ولي مع وجوده حتما فلا بد من تقدير شيء وهو متردد بين الصحة الكمال ولا مرجح لواحد منهما فكان مجملاً (٣).

---

ئەو کرداره بکرێ، لەکاتێکدا تەقدیری چەند شتێك هەڵئەگرێ کە هیچ پێویستی بەهەموویان نیە، وەهیچ شتێك نیە هەندێکیان لاسەنگ بکات بەسەر هەندێکیتریاندا، کەواوبوو موجمەلە.

(١) ئێمەیش دەڵێین: مورەجیح و لاسەنگ کەر هەیە ئەویش عورف و عادەت و باوە، عورف دەیبڕێتەوە لەئایەتی یەکەمدا مەبەست حەرامکردنی لەزەت وەرگرتنە چ بەهۆی جیماعەوە بێ یا خود نموونەی ئەو ، وە لەئایەتی دوەمیشدا حەرامکردنی خواردنیەتی و نموونەی خواردن.

(٢) وەئایەتی:﴿ وامسحُوا برؤوسكمْ﴾ سەرتان مەسح بکەن، هیچ ئیجمالێکی تێدا نیە، هەندێ لەزانایانی پەیڕەوی حەنەفی سەرپێچیان کردووە لەو بۆچوونەو وتویانە: مەسحی سەر موجمەلە چونکە جارێ بەکاردێ بۆ هەموو سەر وە جارێ بەکاردێ بۆ مەسحی هەندێکی ، شارعیش کە پێغەمبەرە ﷺ مەسحی پێشەسەری خۆی کردووە بەیان کەری ئەو ئیجمالەیە، ئێمەیش دەڵێین : ئەوە ناسەلمێنین هەرجارەی بۆ یەکێ لەو دووانە بەکاردێ، مەسح تەنها بۆ مەسحی رووت بەکاردێ کەبە کەمترین ئەندازەی مەسح ناوی مەسحی بەسەردا ئەبڕێ، وەبەغەیری ئەویش نیوەیچارەکێکی مەبەستی راستە بە سەریدا ئەبڕێ، شاریع کەپێشەسەری خۆی مەسح کردوە لەبەر ئەوەیە کە هەر مەسحی پێ ئەڵێن نەك هەر مەسحی روونکردنەوەتەوە گوایە موجمەلە.

(٣) نموونەیەکیتر کە ئیجمالی تێدانەبێ ئەم فەرموودەیە تیرمذی و غەیری ئەویش بەصەحیحیان داناوەو دەفەرموێ: هیچ جۆرە مارەبڕینێك نیە بەوەلی نەبێت، قازی باقلانی جیاوازە بۆچوونی و ئەڵێ: صەحیح نیە بڵێیت: نیکاحی بێوەلی نیە لەگەڵ ئەوەش هەیە و بەچاو ئەبینرێ ، لەبەر ئەوە ئەبێ شتێکی بۆ تەقدیر بکرێ کە

قُلنا: على تقدير تسليم ماذكر المرجح لنفي الصحة وجود هو قربه من نفي الذات فان ما انتفت صحته لا يعتدّبه فيكون كالمعدوم، بخلاف ما انتفي كماله فقد يعتد به[1].

{رفع عن امتي الخطا} والنسيان وما استكرهوا عليه لا اجمال فيه وخالف البصريان ابو لحسين وابو عبدالله وبعض الحنيفة قالوا لا يصح رفع المذكر كورات مع وجودها حسا فلا يدمن تقديرشي وهو مترددين امورلا حاجة الى جميعها ولا مرجح لبعضها فكان محملاً قُلْنا المرجح موجود وهو العرف فإنَّهُ يقضي بأن المراد منه رفع المؤاخذة والحديث بهذا اللفظ رواه الحافظ ابو القاسم التميمي المعروف بأخي عاصم في مسنده والبيهقي في الخلافيات ورواه ابن ماجه وغيره بلفظ ان الله وضع الى آخر ماتقدم[2].

---

ئەویش یاووشەی صحەتە، یاخود وشەی کەماڵە -بەم شێوەیە بڵێیت: نیکاحی صەحیح نیە یا کەماڵ نیە بێوەلی- هیچ مورەجح و لاسەنگ کەرێك نیە بۆ یەك لەو دوو وشە لەبەر ئەوە موجمەلە .

(١) ئێمەیش ئەڵێین: بەلای ئێمەوە تەرەدود نیە لەنێوان ئەو دوانەدا ئەگەر تەسلیمی ئەو قسەی ئێوە ببین کە تەقدیری یەکێ لەو دوو کەلیمانەیە ئەوە مورەجح و لاسەنگ کەری نەبونی صحەتی نیکاحی بێوەلی هەیە کە ئەویش نزیك بوونیەتی لەنەفی خودی نیکاحە، چونکە شتێك کە نەفی صحەتی بکرێ هیچ ئیعتبارێکی پێناکرێ، ئیتر وەکوو نەبوو وایە بەڵام شتێك نەفی کەماڵی بکرێ وانیە، ئەم کەمجارێ ئیعتباری پێئەکرێ.

(٢) نموونەیەکیتر ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێ: ئۆمەتی من غەڵەت و لەبیرچوونەوە و ئەویە زۆرپێیان ئەکرێ لەسەریان لابراوە، ئەمیش ئیجمالی تێدا نیە ، ئەبو حسین بەصری و ئەبو عبداللە بەصری وە هەندێ لە زانایانی پەیڕەوی حەنەفی پێچەوانەی ئێمەیان کردووە وتوویانە: ڕاست نیە بڵێت: ئەمانە هەڵگیراون لەگەڵ ئەوەش هەن و بەچاو ئەبینرێن بۆیە دەبێ شتێکیان بۆ تەقدیر بکێ کە ئەویش لەنێوان چەند شتێکدایە کە پێویستمان بەهەموویان نیە وە هیچ مەرجەع و لاسەنگ کەرێك نیە هەندێکیان تەقدیر بکەین، وئەوانیتر نەکەین. لەبەر ئەوە ئەمیش موجمەلە، ئێمەیش دەڵێین: مەرجع و لاسەنگ کەر هەیە کە ئەویش عورفە، عورف داخوازە کەمەبەست پێ لابردنی تۆڵەسەندنەوەیە بەهۆی ئەو سیانەوە، ئەم فەرموودە بەم لەفظە زاناو لەبەرکەری فەرموودە (ابو القاسم)ی

{لا صلاة إلاّ بفاتحة الكتاب} لا اجمال فيه وخالف القاضي ابو بكر الباقلاني والكلام فيه كما تقدَّمَ في لا نكاح الابولي والحديث في الصحيحين بلفظ لا صلاة لمن لم يقرا فيها بفاتحة الكتاب {لوضوح دلالة الكل} كما تقدمن بيانه {وخالف قوم} في الجميع كما تقدَّمَ بيانه[1].

{وانما الاجمال في مثل القرء} متردد بين الطهر والحيض لاشتراكه بينهما {والنور} صالح للعقل ونور الشمس لتشابهما بوجه {والجسم} صالح للسماء والأرض لتماثلهما[2] {ومثل المختار لتردده بين الفاعل والمفعول} بأعلاله بقلب ياءه المكسورة اوالمفتوحة الفا [3].

---

تەميمی كە ناسراوە بە(أخي قاسم) لەموسنەدەكەيدا ريوايەت، كردووە بەيەهەقيش لە باسی خيلافياتدا ريوايەتی كردووە، ابن ماجەو غەيری ئەويش بەم لەفظە ريوايەتيان كردووە ، بێگومان خوا لەئۆمەتی منی كەندۆتەوە...تا دوايی.

(١) وەئەم فەرموودەش كە ئەفەرمووێ: هيچ نوێژێكی پیێناڵێن ئەو نوێژەی فاتيحەی تێدا نەبێ، ئەمەش هيچ ئيجمالێكی تێدا نيە. باقلانی بەپێچەوانەی ئێمەی وتووە ، ئەو گفتوگۆيەی لەسەر فەرموودەی: (لا نكاح الا بولي)دا كرا خودی ئەو گفتوگۆيەش لێرەدا دەست ئەدات، ئەم فەرموودەيە لەبوخاریو موسليمدا بەم شێوەيە هاتووە: هيچ نوێژی بۆ حيساب ناكرێ كەسێ لەنوێژەكەدا فاتيحەی نەخوێندبێ، ئەم هەموو نموونانەی ووتمان ئيجماليان تێدانيە چونكە دەلالەتی هەموويان روونە وەك لەپێشەوە بەيان كرا، خەڵكانێكيش سەرپێچيان كردووە لەنموونەكاندا ئەويش بەيانەكەی هەر تێپەڕی كرد.

(٢) بێگومان ئيجمال لەم نموونانەدا هەيە وەك(قرء) دەمێ بۆ پاكی بەكاردێ و دەمێ بۆ حەيز بەكاردێ، چونكە (قرء)موشتەرەكە لەنێوان هەردووكياندا، ياخود وەك (نور)، روناكی ، دەست ئەدا بۆ ئەوەی روناكی ژيری بێت ياخود روناكی رۆژ بێت، چونكە لەيەك رووەو چون يەكن كەڕێی دەرك كردنە، ياخود وەك (جسم) دەست ئەدات بۆ ئاسمان و بۆ زەويش چونكە چون يەكن لەپێكهاتەدا ، لەدوو جۆر يازياتر پێك هاتووە.

(٣) وەك وشەی (المختار) دەست ئەدات بۆ ئيسمی فاعيليش و بۆ ئيسمی مەفعوليش، ئەگەر یێ مەكسورەت كردبێ بەئەلف ئەوە بۆ ئيسمی فاعيلە، وە ئەگەر یێ مەضمومت كردبێ بە ئەلف ئەوە بۆ ئيسمی مەفعولە.

{وقوله تعالى أو يعفو الذي بيده عقدة النكاح} لتردد بين الزوج والولي وقد حمله الشافعي على الزوج ومالك على الولي لما قام عندهما[1].

{الا ما يتلى عليكم} للجهل بمعناه قبل نزول مبينه اي حرمت عليكم الميتة الخ ويسرى الإجمال الى المستثنى منه اي أحلت لكم بهيمة الأنعام[2].

{وما يعلم تأويله إلاّ الله والراسخون} في العلم يقولون آمنا به لتردد لفظ الراسخون بين العطف والابتداء وحمله الجمهور على الابتداء لما قام عندهم وعليه ما قدمه المصنِّف في مسئلة حدوث الموضوعات اللغوية من ان المتشابه ما استأثر الله بعلمه[3].

---

(١) هەروەها ئیجمال هەیە لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: یاخود مەگەر ئەوەی گرێدانی نیکاحەکەی بەدەستە پۆزش بکا لەمارەییەکە، دەی ئەوەی گرێدانی نیکاحەکەی بەدەستە ژنەکەش ئەگرێتەوە و وەلیەکەش ئەگرێتەوە، شافیعی بڕیویەتی بەسەر ژنەکەدا و مالیك بڕیویەتی بەسەر وەلیەکەدا ؛ هەریەك لەبەر ئەو دەلیلەی لای پەسەندکراوە بەبەڵگە.

(٢) هەروەها ئیجمال هەیە لەئایەتی: جگە لەوەی نەبێ بەسەرتاندا ئەخوێنرێتەوە ، چونکە پێش دابەزاندنی روونکەرەوەکەی نازانرێ، ئەوەی ئەخوێنرێتەوە بەسەرماندا چیە، کە ئایەتی سێهەمی سوورەتی مائیدەیە دەفەرموێ: حەرامکراوە لەسەرتان خواردنی مردارەوەبوو و خوێن و هەتا کۆتایی، هەروەها ئیجمال سیرایەتیش ئەکا بۆ مستثنى منە وەکەوە ، کەپێش خۆیەتی و دەفەرموێ: هەرچی بۆزمان هەیە لە بزن و مەڕو گاو ووشتر حەلاڵ کراوە بۆتان، چونکە استثنا لەمعلوم ئەویش مەجهول ئەکا.

(٣) یەکێکی‌تر لەو ئایەتانەی ئیجمالیان تێدایە ئەم ئایەتەیە دەفەرموێ: تەئویل و حەقیقەتی قورئان کەس نایزانێ الله نەبێ، وە ئەوانەش کە لەعیلمداوە رۆچوون دەڵێن: ئێمە بڕوامان بە قورئان هەیە چونکە لەفظی (الراسخون) هەڵدەگرێ واوەکەی بۆ عەطف بێ، وەهەڵدەگرێ واوەکەی بۆ دەست پێکردنی تازە بێت، کۆی زانایان بڕیویانە بەسەر واوی سەرەتاییدا لەبەر ئەو هۆیانەی بەبەڵگەوە وەرگیراون لەلایان، لەسەر ئەم رای جمهورە بوو دانەر لەباسی پەیدابوونی ئەو زاراوانەی بۆ مانا دانرون لەپێشەوە ووتی: متشابە بریتیە لەوەی کە خوا زانینەکەی تایبەت کردووە بەخۆیەوە.

{وقوله عليه} الصلاة و {السلام} فيما رواه الشيخان وغيرهما {لا يمنع احدكم جاره ان يضع خشبة في جداره} لتردد ضمير جداره بين عوده إلى الجار وإلى الأحد وتردد الشافعي في المنع لذلك والجديد المنع لحديث خطبة حجة الوداع لا يحل لامرئ من مال أخيه إلا ما أعطاه عن طيب نفس رواه الحاكم بأسناد على شرط الشيخين في معظمه وكل منهما منفرداً في بعضه وخشبة في الأول روى بالافراد منونا والاكثر بالجمع مضافاً[1].

{وقولك زيد طبيب ماهرٌ} لتردد ماهر بين رجوعه إلى طبيب وإلى زيد ويختلف المعنى بإعتبارهما[2] {الثلاثة زوج فرد} لتردد الثلاثة فيه بين جميع اجزائها وجميع صفاتها وان تعين الأول نظراً الى صدق المتكلم به اذ حمله على الثانى يوجب كذبه[3].

---

(١) هەروەها ئیجمال هەیە لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: باکەس لەئێوە هاوسێکەی قەدەغە نەکا کە دارێك لەسەر دیوارەکەی دانێ ،بۆیە ئیضماری تێدایە چونکە ضمیری (في جداره)هەڵدەگرێ بۆ جار بگەڕێتەوە یا بۆ (احد) شافیعی لەبەر ئەو ضەمیرە لەقەدەغە کردنیدا کەوتۆتە گومانەوە، بەڵام رای تازەی شافیعی بێگومان قەدەغەی کردووە ، لەبەر ئەو فەرموودەی لەوتاری حەجی ماڵئاواییدا هاتووە و دەفەرموێ: بۆ هیچ کەسێك نیە ماڵی براکەی بەکاربێنێ مەگەر بەدڵ نەبێت یا بەڕەزامەندی خۆی پێی بدات، حاکم ئەم فەرموودەی ریوایەت کردووە بە پیشت ئەستووری لەسەر ریوایەتی بوخاریو موسلیم لە زۆربەی فەرموودەکەدا، بەڵام هەندێك لەو فەرموودەکە هەر یەك لەو پێشەوایانە خۆی تەنها هەندێکی ریوایەت کردووە ئەویتریان نەیکردووە، ووشەی (خشبة) لە فەرموودەی یەکەمدا بەتاك –واتە بەتیٚ خڕەوە– وەتەنوینەوە ریوایەتکراوە ، زۆربەشیان بەووشەی کۆو جەمعەوە لەگەڵ ئیضافەدا بۆ لای ضەمیری هێلکە –خُشُبَة–ریوایەتیان کردووە.

(٢) یاوەك ئەڵێیت: (زیدٌ طبیبٌ ماهرٌ) ئایا ماهر صیفەتە بۆ زەید، یاخود طبیب ، بۆهەردووکیان دەست ئەدات ، وەبکرێ بەصیفەت بۆ هەرکامیان ماناکەی جیاوازە لەگەڵ ئەویتردا. (٣) هەروەها ئەگەر بڵێیت: سێ بریتیە لە جوت و تاکێك، ئەمیش ئیجمالە چونکە ئەم ووتنە هەڵئەگرێ بڕێ بەسەر هەموو جوزئەکانی سێ تاك و جووتە٢– یائەبڕێ بەسەر هەموو صیفاتی خودی سێ تاك و جووتە –بەجوزئەکانی تاك وجوت ئەوترێ نەك خۆی–هەرچەندە مانایەکەم واجبە دیاری بکرێ، ئەگەر مەبەست ئەوەبێ قسەکەیراست دەرچێ ئەوەی ئەڵێ:سێ بریتیە لەتاك و جوت، چونکە ئەگەر بڕێ بەسەر مانایدووەمدا ئەوە درۆیە،چونکە خودیسێ تاك وجوت نیە.

{والأصَحّ وقوعَـه} اى المجـل {فـى الكتـاب والسـنة} للامثلـةِ السـابقةِ منـهما ونفاه داودُ ويكمن ان ينفصل عنها بـأن الأول ظـاهرُ فـى الـزوج لانـه الملـكُ للنكـاح، والثانى مقترن بمفسرِه والثالث هو ظاهر فى الإبتداءِ والرابع ظاهرُ فى عوده الى الاحد لانه محط الكلام[1].

{و} الأصَحّ {أن المسمى الشرعي} للفظ {اوضح من} المسمى {الغوى} له فى عرف الشرع لان النبى ﷺ بعث لبيان الشرعيات فيحمل على الشرعي وَ قِيلَ لافى النـهي فقال الغزالي هو مجمل والامدى يحمل على اللغوي[2]. {وقد تقدم} ذلك فى مسئلة اللفظ اما حقيقـة او مجـاز وذكـر هنـا توطئـة لقولـه {فـان تعـدر} المسـمى الشـرعي للفـظ {حقيقة فيرد اليـه بتجوز} محافظة علـى الشرعي ما امكن {او} هـو {مجمل} لـتردده بين المجاز الشرعي والمسمى اللغوى {او يحمل على اللغوى} تقديماً للحقيقة على المجاز {اقوال}[3].

---

(١) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە موجمەل لەقورئان و سوننەتدا هەیە، چونکە هەموو ئەو نموونانەی پێشوو لەواندا هێنامانن ، بەلأم داودی ظاهیری نەفی موجمەلی کردووە لەقوران و سوننەتدا ، جا داود چی ئەکات لەو هەموو نموونانە؟ بۆی ئەگونجێ خۆی رزگار بکات و بلێ: لەنموونەی یەکەمدا ئەوە ظاهیرە لەمێردەکەدا، چونکە ئەو نیکاحی بەدەستە، وەلە ئایەتی دوەمدا تەفسیرکەرەوەی بەدوادا دراوە —هەرچەندە یەك ئایەت کەوتۆتە نێوانیان— لەنموونەی سێیەمدا ظاهر وادیارە کەواوەکە بۆ سەرەتا و دەست پێکردنە نەك عەطف، لەچوارەمیشدا وا ظاهیرو دیارە ضمیرەکە بۆ احدەکە دەگەڕێتەوە، چونکە بنەو بارەگای گفتوگۆکە روو لەو دەکا ئەو مەبەستە چونکە فاعلە لە فەرموودەکەدا.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە ناوەڕۆك و مانای شەرعی لەفظ رونترو رەوانترە لەماناو ناوەڕۆکی لوغەوی ، بەلأم ئەمەش لەزاراوەی شەرعدا چونکە پێغەمبەرﷺ بۆ بەیان و گەیاندنی ماناو مەبەستە شەرعیەکان نێراوە، وتراویشە مانای مەبەست شەرعی بۆ لەفظ لێك دەدرێتەوە بەلأم لەنەهیدا نە، لەبەر ئەوە غەزالی وتوویەتی نەهی موجمەلە، ئامێدیش ئەیبرێ بەسەر مانای لوغەویدا.

(٣) ئەوەی ماناو مەبەست شەرعی رونترە لەباس و بابەتی:لەفظ یاحەقیقەتە یا لوغەویە رابوورد ، بۆیە لێرەدا باس کراوەتەوە چونکە پێشەکیەکەو جێ‌پێ خۆش کردنە بۆ ئەم قسەیە کە ئەلێ: کەوابوو ئەگەر ماناو مەبەستی شەرعی دەستی نەئەدا بۆ لەفظەکە بەگوێرەی حەقیقەت و واقیع ئەوە هەر دەگەڕێنرێتەوە بۆ مانا شەرعیە

إختار منها المصنِّف في شرح المختصر كفيرة الول مثالة حديث الترمذي وغيره الطواف بالبيت صلاة؟ ان الله احل فيه الكلام تعدرفيه مسمى لصلاة شرعاً فيرد إليه بتجو زبان يُقالُ كالصلاة في اعبتار الطاهارة والنبة ونحوهما او يحمل على المسمى اللغوي وهو الدعا بخير لا شمال الطواف عليه فلا يعبر فيه ما ذكرا و هو مجمل لتردد بين الامرين(١).

{والمختار ان اللفظ المستعمل لمعنى تارة ولمعنيين ليس ذلك المعنى احدهما} تارة اخرى على السواء وقد اطلق {مجمل} لتردده بين المعنى والمعنيين وَ قيلَ بترجح المعنينان لان اكثر فائدةً(٢).

---

بەلام مەجازیەکەی، بۆیە وای لێدەکرێ بۆ پاراستن و هێشتنەوەی مانا شەرعیەکەی هەتا بگونجێ یاخود ئەو لەفظە لەفظێکی موجمەلە، چونکە دەمێ ئەبرێ بەسەر مەجازی شەعیدا و جارێ ئەبرێ بەسەر مانای لوغەوی‌دا، یاخود ئەو لەفظە ئەبرێ بەسەر مانای لۆغەویدا، چونکە مانای لۆغەوی حەقیقەت ئەخرێتە پێش مانای مەجازی شەرعی، ئەمانەی کەباسکران چەند قەولێکن.

(١) دانەر لە (شرح المختصر) دا وەك غەیری خۆی قەولی یەکەمی هەڵبژاردووە، نموونەکەشی وەك ئەو فەرموودەی تیرمذی وغەیری ئەویش ریوایەتیان کردووە، و دەفەرموێ: سوڕانەوە بەدەوری ماڵی خوادا نوێژە بەلام ئەوەندە جیاوازیان هەیە، کەخوا قەسکردنی تێدا حەلاڵ کردووە، دەست نادات مانای شەرعی (صلاة)ی تێدا بگرێ، لەبەر ئەوە دەگێڕێنرێتەوە بۆ لای مانا شەرعیەکەی بەلام مانای مەجازی شەرعی، بەم شێوەیە بوترێ: طەواف وەك نوێژ وایە لەئەمەدا ئەبێ دەستنوێژو نیەت و غەیری ئەمانیشی تێدا بێ، ، یاخود ئەبرێ بەسەر مانای لۆغەوی‌دا کە ئەویش دوعای خێرە، چونکە طەواف دوعای خێریش ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی کەباسکراکە دەستنوێژو ئەوانی‌ترە بەمەرج نەگیراوە ، بۆیە ئەو نوێژ و (صلاة) موجمەلە چونکە هەر دەمێ دەنیشێ بەیەکێ لەو دوو ماناوە.

(٢) قسەی هەڵبژاردە ئەوەیە کە لەفظێك دەمێك بەکارهێنرابێ بۆ مانایەك و دەمێك بۆ دوو مانا بەکارهێنرابێ-وەك: (دابّة) دەمێ بۆ مرۆڤ بەکاردێ جارێ بۆ گیانلەبەرەکانی تریش- ئەو مانای یەکەمە لەم دووانە بەیەکسانی بۆ هەردوولا بەکارهاتبێ، لەکاتێکیشدا هیچ بەڵگەیەك نەبێ بۆ هیچ کامیان . جا ئەو لەفظە لەفظێکی موجمەلە چونکە هەر دەمێ بۆ یەکێکیان بەکاردێ‌یا یەك ماناکە یا دوو ماناکە، وتراویشە تای دوو ماناکە قورستر ئەبێ چونکە سوودی زیاترە.

{فإنْ كان} ذلك المعنى {احدهما فيعمل به} جزماً لوجوده فى الاستعمالين {ويوفق الآخر} للتردد فيه وَ قِيلَ يعمل به ايضاً لانه اكثر فائدة والتقييد بقوله ليس الخ مما ظهر له كما قال: والظاهر انه مرادهم ايضاً[1].

مثال الاول حديث مسلمٍ لا ينكحُ المحرم ولا ينكحُ بناء على ان النكاح مشترك بين العقدِ والوطء فإنَّهُ ان حمل على الوطء استفيدمنه معنىً واحدُ و هو ان المحرم لايطأ ولا يوطا اى لايمكن غيره من وطئة وان حمل على العقد استفيدمنه معنان بينهما قدر مشترك وهو ان الحرم لا يعقد لنفسه ولا يعقد لغيره[2]. ومثال الثاني حديث مسلمٍ الثيب احق بنفسها من وليها اى بأن تعقد لنفسها اوتادن لوليها فيعقدلها ولا يجبرها وقد قال بعقدها لنفسها ابو حنيفة و كذلك بعض اصحابنا لكن اذا كانت فى مكان لاولى فيه ولا حاكم ونقله يونس ابن عبدالا على عن الشافعي ﷺ [3].

---

(١) جا ئەگەر ئەو مانای مەبەستە یەكێك بێ لەو دوو مانایە ئەوە بێگومان بەو مانایە بەكاردەهێنرێ، چونكە لەهەردوو بەكارهێنانەكاندا ئەو مانایە هەر هەیە، ماناكەی‌تریش دەوەستێت ، چونكە گومان هەیە لەمیتریاندا بەكارهاتبێ، كۆمەڵێكیش وتوویانە: دووبارە هەم كاریش بەم دەكرێ، چونكە بەم شێوەیە سوودی زیاترە، (لیس لذلك لمعنى احدهما)ی پێوەلكاند ئەمە شتێكە خۆی وای بۆ دەركەوتووە، وەك لە(منع الموانع) دا وتویەتی: دوبارە واش دیارە هەر ئەوەش مەبەستە.

(٢) نموونە بۆ یەكەمیان ئەو فەرموودەیە موسلیم ریوایەتی كردووە و دەفەرموێ: ئەوەی ئیحرامی پۆشی نیكاح بۆ خۆی ناكاو بۆ غەیری خۆیشی ناكا، چونكە نیكاح بەمانا عەقد هاتووە و بەمانا(وطأ)یش هاتووە، ئەگەر ببرێ بەسەر(وطأ)دا یەك مانای لێوەردەگیرێ كە ئەوەیە: ئەوەی ئیحرامی پۆشی(وطأ) ناكاو ناشهێڵێ كەس (وطأ)ی بكا-ئەگەر ژن بێ- بەڵام ئەگەر ببرێ بەسەر عەقددا ئەوە دوو مانا ئەگەیەنێ كە ئەندازێك موشتەرەك هەیە لەنێوانیاندا ئەویش ئەویە كە: ئەوەی ئیحرامی پۆشی قەبوڵی نیكاح بۆ خۆی ناكاو بۆ غەیری خۆیشی ژن مارە ناپڕێ.

(٣)نموونە بۆ دوەمیش ئەو فەرموودەیە كە موسلیم ریوایەتی كردووەودەفەرموێ: بێوەژن خۆی شایستەترە لەوەلیەكەی ، واتە خۆی خۆی مارە ببڕێ یاخو مۆڵەت بدات بەوەلیەكەی مارەی ببڕێ، بەئارەزووی خۆی بۆی نیە مارەی ببڕێ، ئەبوحەنیفە بێگومان فەرمویەتی:بێوەژن خۆی‌خۆی مارە ئەبڕێ،هەروەك ئەبوحەنیفەییان فەرموە هەندێك لەهاوەڵانی ئیمامی شافیعیش بەڵام كاتێك دەبێ لەشوێنێكدا بێ نەوەلی تێدابێ وە نەحاكم یونسی كوڕی‌عبدالأعلى ئەم قەولەی لەشافعیەوە نەقڵ كردوە.

{البيان}

بمعنى التبيين {اخراج الشيء من حيز الإشكالِ الى حيز التجلي} اى الاتضاح فلإتيان بالظاهر من غير سبق اشكال لا يسمى بياناً وإنّما يوجبُ البيان {لمن اريد فهمُه} المشكل {اتفاقاً} حاجته إليه بأن يعمل به او يفتي به بخلاف غيره[1].

{والأصَحّ انه} اى البيان {قد يكون بالفعل} كالقولِ وَ قيلَ لا لطول زمن الفعل فيتاخر البيان به مع امكان تعجيله بالقوال وذلك ممتنع قُلْنا لانسلم امتناعه[2]

{و} الأصَحّ {أن الظنون يبين المعلوم} وَ قيلَ لا لانه دون فكيف يحمل فى محله حتى كانه المذكور بدله.. قُلْنا لوصوحه[3].

{البيان}

(١) (البيان) بەیانی بەمانا مزید فیه واتە رونکردنەوە بریتیە لە: دەرهێنانی شتێکی موجمەل بگوێزرێتەوەلە جیٚو صیفەتێکی تەمو مژاوی و ئیشکال بۆ جیٚو صیفەتێکی روون و ئاشکرا، کەواتە ئەگەر هەر لەسەرەتاوە گفتوگۆیەکی هێنابیٚ ئەوەی ئیشکال و لەفظیکی هەمە لایەنەی تێدابیٚ، بەرانبەری لیٚحالّی نەبیٚ ئەوە بەبەیان ناو نابریٚ، بەیان تەنها بۆ کەسیٚ پێویستە کە بیەویٚ لەو لەفظە هەمە لایەن و موشکیلەی حالّی بیٚ، ئەمەش بەڕای هەموان، چونکە ئەو کەسە پێویستی پێیەت بەم شێوە کاری پیٚبکا وەك نوێژ ، یاخود فەتوای پیٚبدریٚ وەك ئەحکامی حەیز، بەلاّم بەپێچەوانەی ئەو کەسەی نەیەویٚ لێی حالّی بیٚ.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە بەیان و روونکردنەوە وەك بەقسەدەکریٚ بە کرداریش ئەکریٚ جار جاریٚ، هەندیٚ وتوویانە روونکردنەوە بەکردار ناکریٚ ، چونکە ئەگەر بەکردار بکریٚ روونکردنەوە دوادەکەویٚ لەگەلٚ ئەوەش ئەگونجیٚپەلەی لیٚبکریٚ بەقسە روونبکرێتەوە، دەخۆ ئەوەش قەدەغەیە، شتیٚ بگونجیٚ بەپەلە بدریٚ بەدەستەوە نابیٚ دوابخریٚ، ئیٚمەیش دەلٚێن: قەدەغەبوونی ئەوەتان بۆ ناسەلمێنین چونکە روونکردنەوەیێك بەبینین بکریٚ بەهێزترە لەبیستن.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە شتی گوماناوی شتی بیٚگومان روون دەکاتەوە – فەرموودەی ئاحاد ئایەت تەفسیر دەکات– کۆمەلێك وتوویانە: روونی ناکاتەوە چونکە لەخوار ئەوەوەیە ، ئیتر چۆن ئەبیٚ لەجیٚی ئەو دابنریٚ تاوای لیٚبیٚ گوماناویەکە کە باسکراوەکەیە لەباتی بێگومانەکە بهێنریٚ، چونکە روونکەرەوەکە لەجیٚی روونکراوەکەیە، ئیٚمەیش دەلٚێن: چونکە هەرچەند دەقێکی گوماناویە بەلاّم لەبەر رونی دەلالّەتەکەیەی دەقی بێگومان تەفسیر ئەکات.

{و} الأصَحّ {أن المتقدم وان جهلنا عينه من القول أو الفعل} المتفقين فى البيان {هو البيان} اى المبين والاخر تأكيد له وان كان دونه في القوة وَ قِيلَ ان كان كذلك فهو البيان لان الشيء لايؤكد بما هو دونه قُلْنا هذا فى التأكيد بغير المستقل أما بالمستقل فلا. الا ترى أن الجملة تؤكد بجملةٍ دونها[1].

{وان لم يتفق البيانان} القول والفعل كان زاد الفعلُ على مقتضى القولِ {كما لو طاف} ﷺ {بعد} نزول آية {الحج} الشتملة على الطوافِ {طوافين وامر بواجدٍ فالقولُ} اى فالبيان القولُ {وفعله} ﷺ الزائدُ على مقتضى قوله {ندبُ اوواجب} فى حقه دون امتهِ {متقدما} كان القول على الفعل {أو متأخراً} عنه جمعاً بين الدليلين[2].

---

(١) قەولی ئەصەح ئەوەیە دوشت روونکەرەوەی موجمەلێك بوون گوفتاربێ یا رەفتار پێشوەکەیان روونکەرەوەیە، هەرچەند لێمان بشێوێ ونەزانین کامەیان پێشوەکەیانە، بەڵام بەو مەرجەی هەردوکیان لە روونکردنەوەکەدا چون یەك بێ و جیاوازی یەك نەبن، ئەویتریان دوپاتکەرەوەی پێشوەکەیە، هەر چەندە لەهێزو کێشدا کەمێك لەخوارووی ئەوەوەیە: وتراویشە ئەگەر ئەوەی دووەم بەهێزتربێ ئەوەیان روونکەرەوەیە، چونکە شت دوپات ناکرێتەوە بەشتێك لەخۆی کەمتر و بێهێزتر بێ، ئێمەیش دەڵێین: ئەمە لە تەئکیدێکدا ئەوترێ: کە سەربەخۆنەبێ (جاء القوم كلهم) بەڵام لەتەئکیدی سەربەخۆدا ناوترێ، سەرنج نادەی رستە بەرستەیێك لەخۆی کەمتر بێ دوپات دەکرێتەوە.

(٢) بەڵام ئەگەر گوفتارو کردار لەروونکردنەوەدا یەکێکیان نەگرتەوە، بەم شێوە کردارەکە زیاتربێ لەداخوازی گوفتارەکە، وەك ئەوەی پێغەمبەرﷺ * لە دوای دابەزینی ئەو ئایەتەی کەطەوافیش ئەگرێتەوە (وليطوّفوا بالبيت العتيق) دوو جار طەواف بکاو بەڵام فەرمانی بەیەك طەواف داوە، ئەوە روونکەرەوەکە بریتیە لەو گوفتارەکە ، کردارەکەش ، کەزیاترە لە داخوازی گوفتارەکە یا بە سوننەت حسێب ئەکرێ، یاخود ئەو زیادە تەنها بۆ پێغەمبەرﷺ واجب ووە نەك بۆ ئۆمەتەکەی، گوفتارەکە روونکەرەوەیە ئیتر لەپێش کردارەکەوە هاتبێ یاخود بەدوایدا هاتبێ، بۆیە گوفتارەکە بەروونکەرەوە دائەنێین و رەفتارەکە بۆ پێغەمبەر خۆی بێ؟ بۆ ئەوەی هەر دوو بەڵگە کە کار پێبکەین و هیچکامیان پوچەڵ نەکەینەوە.

{وقال ابو الحسين} البصريُ البيان هو {المتقدم} منهما كما في قسم اتفاقهما اى فان كان المتقدم القول فحكم الفعل كما سبق والفعل فالقول ناسخ للزائد منه قُلنا عدم النسخ بما قُلناه اولى ولو نقص الفعلُ عن مقتضى القولِ كأن طاف واحد وامر باثنين فقياسُ ما تقدَّمَ لنا أن البيان القوال ونقصُ الفعل عنه تخفيف في حقه ﷺ تأخر الفعل او تقدَّمَ وقياس ماتقدم لابى الحسين ان البيان المتقدم فان كان القول فحكم الفعل كما سَبَق او الفعل فما زاده القوال عليه مطلوب بالقول[1].

{مسئلة تأخيرُ البيان} لمجمل اوظاهر لم يرد ظاهره بقرينة ماسياتي {عن وقت الفعل غير واقع وان جاز} وقوعه عند امتنا المجوزين تكليف مالا يطاق[2].

(١) ئەبوحسێنی بەصری وتوویەتی: بەیان ئەوەیانە لەپێشەوەبێ، بەقیاس لەسەر ئەوەی هەردوکیان یەك جۆرو کردەوەیان هەبێ، واتە جا ئەگەر پێشوەکە گوفتارەکە بوو ئەوە حوکمی رەفتارەکە وەك ئەوەی پێشەوەیە -گوفتار روو لەئۆمەت دەکات و کرداریش روو لەپێغەمبەرﷺ- وەئەگەر کردارەکە پێش گوفتارەکە هاتبێ ئەوە ئەو زیادەی گوفتارەکە هاتبێ، ئەوە ئەو زیادەی کردارەکە داخوازیەتی گوفتارەکە ئەی سڕێتەوە، ئێمەیش ئەڵێین: نەسڕینەوەی بەڵگەیێك باشترە لەسڕینەوە، بەو شێوە هەردوکیان کۆبکرێتەوە کە ووتمان: کردارەکە بۆ پێغەمبەرﷺ و گوفتارەکەش بۆ ئۆمەتەکەی. بەڵام ئەگەر داخوازی گوفتارەکە زیاد بوو کردارەکە کەم بوو، وەك ئەوەی پێغەمبەرﷺ یەك طەواف بکا و فەرمان بدا خەڵکی دوو طەواف بکەن ئەوە ئەو کاتە قیاس پێشو هەر بەڵگەمانە کە روونکەرەوە گوفتارەکەیە و ئەوەش کە کردارەکە لە گوفتارەکە کەمتر ئەوە بارسوکیکردن لەسەر پێغەمبەرﷺ ، ئیتر کردارەکە لەدواوە هاتبێ یا پێش کەوتبێ، وەئەگەر ئەوەی پێشوو قیاس بکرێتەسەر راکەی ئەبوحسێن ئەوە ئەو کاتە: روونکەرەوەکە پێشووەکەیانە، جا ئەگەر پێشوەکە گوفتارەکە بێ ئەوە حوکمی کردارەکە وەك ئەوەی پێشەوە وایە، خۆ ئەگەر پێشوەکەش کردارەکە بوو ئەوە ئەو زیادە یە بەهۆی گوفتارەکەوە داواکراوە.

(٢) ئەمەش بابەتێکیترە: دواخستنی روونکردنەوە، چ بۆموجمەل بێ یا بۆ ظاهیرێك بێ، ظاهیرەکەی مەبەست نەبێ، بەقەرینەی ئەوەی لەمەودوا ئەڵێ: (سواءً کان للبيّن الظاهر) ئەزانم ئەم روونکردنەوەی ئێرە گشتگیرترە بۆ ظاهیریش وەك پێشوو نیەتەنها بۆ موجمەل دەبێ، جا ئەو دواکەوتنە لەکاتی ئەنجامدانی کارەکە بەهیچ جۆر رووی نەداوە، هەرچەند رودانەکە بەلای ئەو پێشەوایانەوە کەرایان وایە دروستە: دروستە تەکلیفی مرۆڤ بکرێ بەشتێ لەتوانایدا نەبێ.

وقوله الفعل احسن كما قال من قول غيره الحاجة لأنها كما قال الاستاذ ابو اسحاق لاسفرايني لا ثقة بالمعتزلة القائلين بأن بالمؤمنين حاجة الى التكليف ليستحقوا الثواب بالامتثال[١].

{و} تاخير البيان عن وقت الخطاب {الى وقته} اي الفعل جائز {واقه عند الجمهور سواء كان للمبين ظاهر} وهو غير المجمل كعام يبين تخصيصه ومطلق يبين تقييد هو دال على حكم يبين نسخه {ام لا} وهو المجمل كمشترك يبين احد معنيه مثلاً ومتواطئ يبين احد ماصدقاته مثلاً وَ قِيلَ يمتنع تاخيره مطلقاً لأخلاله بفهم المراد عنه الخطاب[٢]. {وثالثها} اي الأقوال {يمنع} التأخير {في غير المجمل وهو ماله ظاهر} لا بقاعه المخاطب في فهم غير المراد بخلافه في المجمل [٣].

(١) ئەمەش کەدانەر وتوویەتی : لەکاتی ئەنجامدانی کارەکە دواکەویٚ جوانترە وەك خۆی وتوویەتی: لەدارشتنی غەیری خۆی کەوتویانە: لەکاتی پێویست دواکەویٚ، چونکە وەك مامۆستا ئەسفەرایینی وتوویەتی: حاجەو پێویستی وتی: ئەوە شایستەی موعتەزیلەیە، کە ئەڵێن: موسوڵمان حاجەیان هەیە بەتەکلیف بۆ ئەوەی بەگوێڕایەڵیەکەیان شایستەی پاداشتی بەهەشتیان هەبێ -بەڵام ئێمە ئەڵێین: ئەگونجێ بیٚتەکلیفیش خوا مرۆڤ بخاتە بەهەشتەوە-.

(٢) بەدواخستنی روونکردنەوە لەکاتی گوتارو خیطابەکەیدا بۆ کات کردنەکەی دروستە و واقیعیشە بەلای جمهورەوە، کەیفی خۆیەتی ئەو روون نەکراوە ظاهیری بێ، ئەویش ئەوەیە موجمەل نەبێ، وەك عامێك تایبەتیەکەی روون بکرێتەوە یا لەفظێك تەقییدەکەی بەیان بکرێت یالەفظێك دەلالەت لەسەر حوکمێك بکات و نەسخ و سڕینەوەکەی روون کاتەوە ، یاخود ظاهیری نەبێ ئەویش موجمەلە، وەك موشتەرەکێك بۆ نموونە یەکێك لەدوو ماناکەی رون بکاتەوە، یا وەك متواطئێك یەکێك لەماصەدەقەکانی روون بکاتەوە،هەندێکیش وتوویانە دواخستنی رونکردنەوە لەموجمەل دابێ یالەغەیری موجمەل دابێ هەر قەدەغەیە، چونکە لەکاتی گوتارەکەدا نایەڵێ مەبەستەکەی حاڵی بێ و خەلەل ئەگەیەنێ.

(٣) قەولی سێهەم ئەوەیە کە قەدەغەیەو نابێ دواخستنی روون کردنەوە بکرێ ، لەشتێکدا موجمەل نەبێ ئەویش ئەوەیە ظاهیری هەبێ و مەبەست نەبێ چونکە بەرامبەرەکەی ئەخاتە غەڵەتەوە، بەشێوەیەك لێی حاڵی ئەبێ کەمەبەست نیە بەلاٚم بەپێچەوانەی دواکەوتنێك لەموجمەلدا چونکە لەمدا هەرفەهمی هیچ ناکا -ئەم جەهلی بەسیطە باشترە لەو جەهلی مرکبە-.

{ورابعها يمتنع تأخير البيان اوحمالي فيما له ظاهر} مثل هذا العامّ مخصوص وهذا المطلق مقتد وهذا الحكم منسوج ببدل لوجود المحذور قبله في تأخير الإجمالي دون التفصيلي لمقارنة الاجمالي[1] {بخلاف المشترك والمتواطيء} مما ليس له ظاهر فيَجوزُ تأخير بيانهما الاجمالي كالتفصيلي كأن يقال المراد احد المعنيين مثلاً في المشترك واحد المصدقات مثلا في المتواطيء لتفاء المحذور السابق[2].

{وخامسها} يمتنع التاخير {في غير النسخ} لا خيلاله بفهم املراد من اللفظ بخلاف النسخ لانه رفع للحكم او بيان لا نتهاء امده كما سيأتي[3] {وَ قِيلَ يَجوزُ تاخير} البيان في {النسخ اتفاقا} لأنتفاء الاخلال بالفهم عنه لما ذكر[4].

---

(١) پێی وایە دواخستنی شتی ئیجمالی لەشتێکدا ظاهیری هەبێ قەدەغەیە و نابێ، نموونە بۆ بەیانی ئیجمالی ئەم عامە تایبەت کراوە ئەم مطلەقە مقید کراوە، ئەم حوکمە سڕاوەتەوە حوکمێکی‌تر هاتوەتە جێ، چونکە شتێك هەیە ئەبێ لێی بترسی و ئاگامان لێی بێت پێش بەیانەکە لەدواخستنی بەیانی ئیجمالیدا روو ئەدات، ئەوەش بەرامبەر غەڵەت حاڵی کردنەت بەڵام ئەوە لەدواخستنی بەیانی تەفصیلیدا نابێ چونکە بەیانی ئیجمالیەکەی لەگەڵدایە.

(٢) بەڵام بەپێچەوانەی موشتەرەك و متواطئ کە ظاهیریان نیە، ئەوە دواخستنی بەیانی ئیجمالی بکرێ وەك بەیانی تەفصیلی دروستە، وەك بوترێ: مەبەست لەیەکێك لەو دوو مانایە لەموشتەرەکدا ، یاخود یەکێك لەماصەدەقەکانی مەبەستە، لەمتواطئدا ، بۆیە لەم دوانە دروستە چونکە ئەوەی لێ‌دەترساین لێرەدا نیە، کەلە پێشەوە رابوورد.

(٣) قەولی پێنجەمیان رای وایە: دواخستنی روونکردنەوە لەغەیری نەسخدا قەدەغەیە ، چونکە دواخستنەکە نوقصانیەك دروست دەکات و ئەبێتە هۆی خراپ حاڵی بوون لە مەبەستی لەفظەکە بەڵام لە نەسخ و سڕینەوەدا جیاوازە ، دروستە دواکەوێ چونکە سڕینەوە بە یەکجاری لابردنی حوکمەکەیە، یا خود سڕینەوە بریتیە لەبەیانی کۆتاهێنان بەکاتی ئەو حوکمە، وەك لەمەودوا دێت کەنەسخ ئاواش پێناسە کراوە.

(٤) وتراویشە: دروستە دواخستنی بەیان لەسڕینەوەدا بێ‌جیاوازی، چونکە ئەوەی نوقصانی دروست ئەکرد و ئەبویە هۆی خراپ حاڵی بوون لەلەفظەکە نەماوە، لەبەر ئەوەی کەباسکرا -کە ئەو دوو جۆرە پێناسەی نەسخ بوو- .

{وسادسها لايَجوزُ تاخير بعض} من البيان {دون بعض} لأن تاخير البعض يوقع المخاطب في فهم أن المقدم جميع البيان وهو غير المراد وهذا مفرع على الجواز في الكل، اي قيل عليه لا يَجوزُ في البعض لما ذكر والأصَحّ الجواز الوقوع[1].

ومما يدل في المسئلة على الوقوع قوله تعالى:﴿ واعلموا انما غنمتم من شيء فأن لله خسمه ﴾ الخ فإنَّهُ عام فما يغنم مخصوص بحديث الصحيحين من قتل قتيلا له عليه بيّنةٌ فله سلبه وهو متأخر عن نزول الاية لنقل اهل الحديث كما قال المصنِّف انه كان في غزوة حنين وان الآية قبله في غزوة بدر[2].

(١)قەولیشەشەمیان ئەوەیە دروست نیە دواخستنی رونکردنەوەکە لەهەندێکیتری چونکە دواخستنی بەشێك لەروونکردنەوەکە گوێگر ئەخاتە غەڵەت حاڵی بوونەوە، لەوەدا وائەزانێ ئەوبەشەی کەلەپێشەوە هاتووە هەموو روونکردنەوەکەیە، کەچی ئەوەش مەبەست نیە، ئەم قەولی شەشەمە لەسەر قەولی جمهور سەوز بووە کە ئەڵێ: لەهەموویاندا موجمەل و نەسخ و ئەوەی ظاهیر هەیە دروستە روونکردنەوەکەیان دواخرێ واتە لەسەر ئەو قەولی جمهورە وتراوە: دروست نیە تەنها لەهەندێکیاندا دواخرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەوترا گوێگر ئەخاتە غەڵەت حاڵی بوونەوە. قەولی راستتر و رەواتر ئەوەیە روونکردنەوەی هەمووی یاهەندێکی دروستە دوابخرێ ، وەك هەرواش بووە.

(٢) هەندێ لەوەی کە بەیان رونکردنەوەکە دواکەوتووەو رویداوە ئەوەیە: خوای گەورە دەفەرموێ: ئێوە بزانن هەر دەستکەوتێکتان دەست کەوتبێ ئیتر هەر شتێ بێ ئەوە پێنج یەکی بۆ خوایە، و بۆ خەزێنەی موسوڵمانان دەبێ، ئەم ئایەتە هەرشتێ دەستکەوێ دەیگرێتەوە ئیتر سەلەب و کەل و پەلی جەنگاوەر بێ[1]، دەفەرموێ: هەر کەس هەر کافرێ بکوژێ بیسەلمێنی کە ئەو کوشتویەتی ئەوە کەل و پەلەکەی بۆ ئەو دەبێ، ئەم فەرموودە دوای ئایەتێك وتراوە چونکە زانایانی فەرموودە وایان نەقڵ کردووە کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای حونەین دا فەرموویەتی ئایەتەکەش پێش ئەو لە غەزای بەدردا دابەزیوە ، دانەریش هەر وای وتووە.

١- یاشتی تر بێت هەر دەیگرێتەوە، بەڵام بەفەرموودەیێك کە بوخاری و موسلیم ریوایەتیان ئەکەن تایبەت کراوە بەشتێکەوە کەسەلەب وکەلوپەلی جەنگاوەر بێ.

وقوله تعالى:﴿ ان الله يأمركم ان تذبحوا بقرة ﴾ فانها مطلقة ثُمَّ بين تقييدها بما في اجوبة اسئلتهم وفيه تأخير بعض البيان عن بعض ايضا[1] وقوله تعالى حكاية عن الخليل عليه الصلاة والسلام:﴿ يا بني اني اري في المنام اني اذبحك ﴾ الخ فإِنَّهُ يدل على الأمر بذبح ابنه ثُمَّ بين نسخه بقوله تعالى : ﴿ وفديناه بذبح عظيم ﴾[2] {وعلى المنع} من التأخير {المختار انه يَجوزُ للرسول ﷺ تأخير التبليغ} لما اوحي إليه من قرآن او غيره {الى} وقت {الحاجة} اليه لإنتفاء المحذور السابق عنه[3] وَ قيلَ لا يَجوزُ لقوله تعالى:﴿ يا ايها الرَّسُول بلغ ما انزل اليك من ربك ﴾ اي على الفور لأن وجوب التبليغ معلوم بالعقل ضرورة فلا فائدة للامر به إلاّ الفور قُلنا: فائدته تأيد العقل بالنقل[4].

---

(١) یاخود وەك خوای گەورە دەفەرموێ: بێگومان خوای گەورە فەرمانتان پێئەدات مانگایێك سەربڕن، بۆ ئەوەی کوژراوەکەی پێزیندوو بکرێتەوە، کە دەفەرموێ: مانگایێك ئیتر هەر مانگایێك بێت چونکە مطلەقە بەڵام پاشان بەهۆی ئەو هەمو ناونیشانانەوە لەپرسیارکانیان دا دیاری کران مطلەقەکەیا بەستەوە و لەموطلەقی کەوت ، کەوابوو روونکردنەوەکە دواکەوتووە، هەروەها هەندێك لەروونکرنەوەکە دوادەخرێ لە هەندێکیتر.

(٢) یاوەك خوای گەورە دەفەرموێ: سەرگوزەشتەی خەلیل دەگەرێنێتەوە: کوڕە شیرینەکەم لەخەودا فەرمانم پێدراوە بەسەربڕینت، ئەم ئایەتە فەرمان بەسەربڕینی کوڕەکەی ئەگەیەنێ، بەڵام پاشان سڕینەوەی روونکراوەتەوە، کەخوای گەورە دەفەرموێ: ئێمەیش قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی لەباتی ئیسماعیل.

(٣) لەسەر ئەو بۆچونەی کەنابێ هەڵبژاردە دواکەوێ قسەی هەڵبژاردە ئەوەیە: کە دروستە بۆ پێغەمبەرﷺ دواخستنی نامەکەی و ئەوەی بۆی دێ چ قورئان بێ یاخود غەیری قورئان بێ هەتا ئەو کاتەی خەڵکی پێویستی پێی دەبێ، لەبەر نەبوونی ئەو ترسەی کە تێپەڕی کرد -کە بەغەڵەت حاڵی بوونە-.

(٤) هەندێکیش وتوویانە: دواخستنی گەیاندنی پەیام دروست نیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر ئەوەی لەلای پەروەردگارتەوە بۆت دائەبەزێ بیگەیەنە، واتە هەر یەکسەر گەیشت بیگەیێنە، چونکە گەیاندنی پەیام شتێکەوە بەهۆی ژیریەوە زانراوە و بەڵگە نەویستە، کەوابوو ئەم فەرمانە (بلغ) هیچ سودێکی نیە جگە لەوەنەبێ کە بەپەلە بگەیەنرێ. ئێمەیش دەڵێن: بەهێزکردن و پشتگیری کردنی ژیریە بەنەقڵ.

وكلام الامام الرَّازي والامدى يقضي المنع في القُرآن قطعا لأنه متعبَّد بتلاوته ولم يؤخر ﷺ تبليغه بخلاف غيره لما علم من انه كان يسئل عن الحكم فيجب تارة مما عنده ويقف اخرى الى أن ينزل الوحي[١].

{و} المختار على المنع ايضا {انه يَجوزُ ان لا يعلم} المكلف {الموجود} عند وجود مخصَّص {بالمخصَّص ولا بأنه مخصص} اي يَجوزُ ان لا يعلم بذات المخصَّص ولا بوصف انه مخصص مع علمه بذاته كأن يكون المخصَّص له العقل بأن لا يسبب الله له لعلم بذلك[٢]. وَ قِيلَ لايَجوزُ ذلك في المخصَّص سمعى لمافيه من تأخير اعلامه بالبيان قلنا المحذور تأخير البيان وهو منتف هنا وعدم علم المكلف بالمخصَّص بأن لم يبحث عنه تقصير منه[٣].

(١) وتەی پێشەوا رازی و ئامێدی ئەوە ئەخوازێ کە بێگومان دواخستنی گەیاندنی قورئان قەدەغەیەو نابێ چونکە قورئان خودی خوێندنەوەکەی عیبادەتە بۆ بەندایەتی کردن و دوەمیش لەواقیعو رودانی رۆژانی ژیانی پێغەمبەرداﷺ ، پێغەمبەرﷺ گەیاندنی قورئانی دوانەخستووە بەڵام غەیری قورئان وانیەو دوای خستووە چونکە لە پێغەمبەرەوە زانراوە کە پرسیاری لێئەکرا لەبارەی حوکمی شتێکەوە جاری واهەیە یەکسەر وەڵامی داوەتەوە –وادیارە نەیگەیاندوە بۆیە نایزانێ– جارێکی تریش وەستاوە وەڵاممان داوەتەوە هەتا وەحیو نیگا دابەزیوە.

(٢) دووبارە لەسەر ئەو بۆچوونەی کە دواخستنی بەیان نابێ رای هەڵبژێرراو ئەوەیە: کە دروستە نەزانینی ئەو موکەلەفەی لەکاتی دابەزینی تایبەت کەرەکەدا هەبوو بێو پێی نەزانیبێ یا نەیزانیبێ کە تایبەتکەرە، واتە دروستە خوی تایبەتکەرەکە نەزانێ یا نەزانێ کە ئەوە تایبەتکەرە لەگەڵ ئەوە بزانێ کە خودی ئەوە هەیە بەڵام نازانێ تایبەتکەرە یا روونکەرەوەیە ، بەم شێوە تایبەتکەری ئەو لەفظە گشتگیرترە ژیری بێت، خوا ژیریەکی نەخستبێتە کارو هۆ بۆ ئەوەی پێی بزانێ.

(٣) هەندێك وتوویانە: ئەوە لە تایبەتکەری بیستراودا دروست نیە ، چونکە دواخستنی ئاگادارکردنی موکەلەفی تێدایە بەروونکردنەوەکە، ئێمەیش دەڵێن: ئەوەی کەقەدەغەیەو لێی دەترسین دواخستنی روونکردنەوەکەیە نەك ئیعلام و ئاگادارکردنی ئەخۆ ئەوەش لێرەدا نیە، ئەوەش کە فلان مکلف نازانێ کە ئەوە تایبەتکەرە و هەوڵی بۆ نەداوە بیزانێ وەك خەڵکی تر ئەوە تەقصیرو کوێنەدانی خۆیەتی چونکە خەڵکی‌تر دەیزانێ.

اما العقلي فاتقوا على جواز ان يسمع الله المكلف العامّ من غير أن يعلمه أن في العقل ما يُخَصّصه وكولا الى نظرهِ وقد وقع ان بعض الصحابة لم يسمع المخصَّص السمعي إلاّ بعد حينٍ[1] منهم فاطمة بنت رسول الله ﷺ طلبت ميراثها مما تركه رسول الله ﷺ لعموم قوله تعالى يوصيكم الله في اولادكم فاحتج عليه ابو بكر ﷺ بما رواه لها من قوله ﷺ لانورث ماتركناه صدقة اخرجه الشيخان[2] ومنهم عمر ﷺ لم يسمع مخصص المحوس من قوله تعالى فاقتلوا المشركين حيثُ ذكرهم فقال ما ادري كيف اصنع اي فهم فروى له عبد الرحمن بن عوف قوله ﷺ سنوا بهم سنة اهل الكتاب رواه الشافعي ﷺ [3] وروى البخاري أن عمر لم يأخذ الجزية من المجوس حتى شهد عبدالرحمن بن عوف أن رسول الله ﷺ اخذها من مجوس هجر[4].

---

(١) بەڵام تایبەتکەری عەقڵی ئەوە هەموو زانایان یەکڕان کە دروستە خوا لەفظێکی گشتگیر بەموکەلەفێك ببیستێنێ بێ‌ئەوەی ئاگاداری بکا کە لەعەقڵیدا بورهان و بەڵگەیەك هەیە ئەوعامە تایبەت ئەکا، بۆیە ئایکا حەواڵەی بیرو سەرنجی موکەلەفەکەی دەکاتەوە. وە بێگومان رویشی‌داوە کە هەندێ لەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ تایبەتکەریان نەبیستووە مەگەر دوای تێپەڕبوونی چەند کاتێکی زۆر نەبێ.

(٢) هەندێ لەوانەی کە تایبەتکەریان نەبیستووە فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوایە داوای بەشی خۆی کرد لەو ماڵەی کەپێغەمبەرﷺ بەجێی هێشتوە ، چونکە ئەم فەرموودەی خوای گەورەیە بەشێوەیەکی گشتگیری دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێ‌ئەدا لەبارەی بەشی منداڵەکانتانەوە .... تاکۆتایی، لەبەر گشتگیریەکەی ئەم داوایەی کرد جا ئەبوبەکریش بەڵگەی دژ بەداواکەی هێنایەوە بەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، و دەفەرموێ: ئێمە میراتیمان لێ‌ناگیرێ ئەوەی لێمان بەجێ‌ئەمێنێ صەدەقەیە بۆ موسوڵمانان.

(٣) یەکێکی‌تریان عومەرە کەتایبەتکەری ئەم فەرموودەی خوای گەورەی نەبیستوە کە ئاگرپەرست ناگرێتەوە، دەفەرموێ: بتپەرستان بکوژن لەجێ‌یەکدا باسی کردن وتی: نازانم چیان لێ‌بکەم؟ عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ئەم فەرموودەیەی بۆ ریوایەت کرد کە دەفەرمووێ: مامەڵەیان لەگەڵ بکەن وەك مامەڵەی ئەهلی کیتاب، شافیعی ئەم فەرموودەیەی ریوایەت کردووە.

(٤) بوخاری ریوایەتی کردووە کە عومەر سەرانەی لە ئاگرپەرستان وەرنەگرت، تا عەبدورەحمانی کوڕی عەوف شاهیدی دا کە پێغەمبەرﷺ لە ئاگرپەرستانی شاری هەجەر وەری گرتووە.

## {النسخ}

{النسخ}{اختلف في انه رفع} للحكم {او بيان} لأنهاء امده {والمختار} الأول لشموله النسخ قبل التمكن وسيأتي جوازه على الصحيح[1].

والمراد من الأول انه {رفع الحكم الشرعي} اي من حيثُ تعلقه بالفعل {بخطاب} فخرج بألشرعي اي المأخوذ من الشرع رفع الإباحَة الاصلية اي المأخوذه من العقل [2] وبخطاب الرفع بالموت والجنون والغفلة وكذا بالعقل والاجماع وذكرهما لينبه على مافيهما قوله {فلا نسخ بالعقل[3]}.

---

### نەسخ

(١) نەسخ ئەم بابەتە باسی سڕینەوەیە ، جیاوازی هەیە لەوەدا ئایا سڕینەوە باسی هەڵگرتن و لابردنی حوکمەکەیە، یاخود سڕینەوە بەیانی کۆتاهێنانی حوکمەکەیە، قسەی هەڵبژاردە رای یەکەمیانە، چونکە رای یەکەم سڕینەوەیەکیش ئەگرێتەوە پێش هەبوونی توانا بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکە ، لەمەودوا دێت ئەم جۆرە سڕینەوەش دروستە لەسەر رای دروست و صەحیح.

(٢) جا حوکم خۆ کەلامی ئەزەلیە چۆن لائەچێ؟ ئاخر مەبەست بەرای یەکەم کە لابردنی حوکمەکەیە واتە لابردنی حوکمێك کە لەشەرع وەرگیراوە لەلایەنی کارپێکردنیەوە نەك لەلایەنی ئەوەی کە کەلامی ئەزەلی بیسڕێتەوە –بالقوە ماوە، بالفعل سڕاوەتەوە– لابراو لابەر ئەبێ هەردوکیان کەلامی ئەزەلی بن، بەهۆی وشەی الشرعي) واتە حوکمێك کە لەشەرع وەرگیراوە ، رەوای رەها ، کە ئەصل لەدروست بوونی هەموو شتێك حەلاڵبونیەتی بۆ مرۆڤ کەئەمەش لەعەقڵ وەرگیراوە، بەدابەزینی حوکم سڕینەوەی پێ ناوترێ و لەپێناسەکەی دەچێتەدەر چونکە لابرا حوکمی عەقڵە نەك کەلامی ئەزەلی .

(٣) وە بەووشەی (خطاب) کەسێك کە بەهۆی مردنەوە یا شێتی و یا بێئاگاهیەوە حوکمی بەسەرەوە نامێنێ، چونکە هۆکەی (خطاب) نیە هەروەها حوکمێك نەمێنێ بەهۆی عەقڵەوە یا ئیجماعەوە، لەبەر ئەوەی لابەرەکە (خطاب) نیە، سڕینەوەی پێناوترێ، دانەر تەنها ئیجماع و عەقڵی باس کردوە نەك مردن و شێتیو ئەوانیتر، بۆ ئەوەی قوتابی ئاگادار بکاتەوە لەسەر ئەوەی لەو دووانەدا هەیە ، نەك بۆ ئەوەی بەر پێناسەی سڕینەوە نەکەون، بەم شێوە وتی: هیچ جۆرە سڕینەوەیەك نیە بەهۆی عەقڵەوە.

وقول الامام} الرَّازي {من سقط رجلاه نسخ غسلهما} في طهارته {مدخول} اي فيه دخل اي عيب حيثُ جعل رفع وجوب الغسل بالعقل لسقوط محله نسخا فإنَّهُ مخالف للاصطلاح وكانه توسع فيه[١] .

{ولا} نسخ {بالاجماع} لانه انما ينعقد بعد وفاته ﷺ كما سيأتي اذ في حياته الحجة في قوله دونهم ولا نسخ بعد وفاته[٢] {و} لكن {مخالفتهم} اي المجمعين للنص فما دل عليه {تتضمن ناسخا} له وهو مستند اجماعهم[٣].

{ويَجوزُ على الصحيح نسخ بعض القُرآن تلاوة وحكما او احدهما فقط} وَ قِيلَ لايَجوزُ نسخ بعضه ككله المجمع عليه وَ قِيلَ لا يَجوزُ في البعض نسخ التلاوة دون الحكم و العكس لأنّ الحكم مدلول اللفظ فاذا قدر انتفاء احدهما لزم انتفاء الآخر[٤].

---

(١) پێشەوا رازی کەئەڵێ: کەسێ هەردوو پێی ئەمان شۆردنیان لەدەستنوێژدا دەسڕێتەوە، ئەم قسەیە عەیبدارەو عەیبی تێدایە، چونکە پێویستە کەبشۆرێ بەڵام ئەم بەهۆی عەقڵەوە ئەم حوکمەی کەوجوبە لابرد لەبەر نەمانی شوێنی شۆردنەکە، لەڕووی سڕینەوەوە نەماوەو کراوە بەنەسخ، بۆیە عەیبدارە چونکە ئەم قسەیە پێچەوانەو جیاوازە لەگەڵ زاراوەو ئیصطلاحی زانایان کە ئەو پێناسەیە بۆ کردیان بۆ نەسخ و سڕینەوە، رازی بۆیە وای وتوە: فراوانی مەبەست بووە، بەم شێوە دەبێتە مەجاز.

(٢) سڕینەوەی حوکمی شەرع بەئیجماع نابێ چونکە ئیجماع تەنها دوای مردنی پێغەمبەرﷺ دائەمەزرێ وەك لەمەودوا باسەکەی دێت، چونکە لەکاتی ژیانی پێغەمبەرداﷺ حوججەو بەڵگەکە لە فەرموودەی ئەودایە نەك ئەهلی ئیجماع، لەکاتێکیشدا هەموو جۆرە سڕینەوەیەك دوای مردنی پێغەمبەرﷺ نیە.

(٣) بەڵام جیاوازی ئەهلی ئیجماع بۆ ئەوەی دەفەرموێ: دەلالەت ئەکا لەسەری نیشانەیە بۆ ئەوە شتێك هەیە لابەرو سڕێنەر بێ بۆ ئەو دەقە، وەئەو شتەش پشت و بەڵگەی ئەهلی ئیجماعە.

(٤) لەسەر قەولی صەحیح دروستە سڕینەوەی هەندێ قورئان چ خوێندنەوەکەی چ حوکمەکەی، یاخود تەنها سڕینەوەی یەکێکیان هەندێکیش وتوویانە: دروست نیە هەندێکی قورئان بسڕێتەوە چونکە بەڕای هەمووموسوڵمانان دروست نیە سڕینەوەی هەمووی کەوابوو سڕینەوەی هەندێکیشی دروست نیە، هەندێکیتر وتوویانە: دروست نیە لەهەندێکی قورئاندا سڕینەوەی خوێندنەوەکەی بێ یا حوکمەکەی بێ، یاخود سڕینەوەی حوکمەکەی بێ سڕینەوەی حوکمەکەی –ئەمەش لەڕووی عەقڵەوە–

قلنا انّما يلزم اذا روعي وصف الدلالة وما نحن فيه لم يرع فيه ذلك فان بقاء الحكم دون اللفظ ليس بوصف كونه مدلولا له وانما هو مدلول لما دل على بقائه وانتفاء الحكم دون اللفظ ليس بوصف كونه مدلولا له فان دلالته عليه وضعيه لا تزول وانما يرفع الناسخ العمل به[1].

وقد وقع الأقسام الثلاثة روى مسلم عن عائشة رضي الله عنها كان فيما انزل عشر رضعات معلومات فنسخن بخمس معلومات فهذا منسوخ التلاوة والحكم[2]. وروى الشافعي وغيره عن عمر ﷺ لولا اي يقول النّاس زاد عمر في كتاب الله لكتبتها الشيخ والشيخة اذا زنيا فارجموهما البتة فاناقدر قرانها فهذا منسوخ التلاوة دون الحكم لامره ﷺ برجم المحصنين رواه الشيخان وهما المراد بالشيخ والشيخة[3].

---

چونکە حوکم مەدلولی لەفظی شەرعیە ئەگەر کاتێ وادابنرێ (دال) نەماوە بێگومان نەبێ مەلولیشی نەمێنێ، هەروەها پێچەوانەکەشی.

(١) ئێمەیش دەڵێین: تەنها کاتێ لازم ئەکات بەنەمانی یەکێکیان نەمانی ئەویان ، کاتێ کە وەصفی دەلاڵەتەکە هەر لەبەرچاو بگیرێ، کەمەدلول لەدەلیل جیانابێتەوە، بەلام ئەوەی ئێمە لەبارەیەوە دەدوێین: ئەو وەصفی دەلاڵەتەی تیا لەبەچاو نەگیراوە، چونکە مانەوەی حوکم بێ‌دەلاڵەتی لەفظەکەی لەبەر ئەوەیە کە ئەو حوکمە مەدلولی ئەو لەفظەیە کە دەلاڵەتی لەسەر مانەی کردووە، وەنەمانی حوکم بێ‌لەفظەکەی لەبەر ئەوەنیە کە مەدلولی ئەو لەفظەیە ، چونکە دەلاڵەتی ئەو لەفظەیە لەسەر ماناکەی بەهیچ شێوەیەك جیانابێتەوە ، حوکمەکەی نەفەوتاوە لەبەر ئەوەی مەدلولی ئەو لەفظەیە، لابەرەرکەی تەنا کارپێکردنی لائەبا نەك مانا سڕینەوەی .

(٢) بێگومان ئەم سێ جۆر سڕینەوە هەرسێکیان بوون: ١-موسلیم لەعائیشەوە ریوایەت ئەکا: لەو قورئانەی پێشتر دابەزی لەبارەی شیرەوە: دەجاری بێگومان بوایە، ئەمانە سڕانەوە بە پێنج جاری بێگومان، دەجارەکە لەفظ و حوکمەکەی سڕاوەتەوە، بەڵام پێنجەکە لەفظەکەی سڕاوەتەوە حوکمەکەی هەرماوە.

(٣) ٢-شافیعیو غەیری شافیعیش ریوایەتاین کردووە لەعومەرەوە کە فەرمویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خەڵك دەڵێ: عومەر شتی زیادکردوە لەقورئاندا ئەم ئایەتەم دەنوسی، کە دەفەرمووێ: پیاوی پیرو ژنی پیر لەکاتی زیناکردنیان ئێوە رەجمیان بکەن بێگومان، چونکە ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ ئەم ئایەتەمان لەقورئاندا خوێندوەتەوە، جا ئەم ئایەتە خوێندنەوەکەی سڕاوەتەوە بێ‌حوکمەکەی، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد بە بەردباران کردنی دووکەس کە محصن بوون -جیماعی

ومنسوخ الحكم دون التلاوة كثير منه قوله تعالى:﴿ والذين يتوفون منكم ويذرون ازواجا وصية لأزواجهم متاعا الى الحول ﴾ فنسخ بقوله تعالى:﴿ والذين يتوفون منكم ويذرون ازواجا يتربصن بانفسهن اربعة اشهر وعشرا ﴾ لتأخره في النزول عن الأول كما قال اهل التفسير وان تقدمه في التلاوة[1].

{و} يَجوزُ على الصحيح {نسخ الفعل قبل التمكن} منه بأن لم يدخل وقته أو دخل ولم يمض منه ما يسعه وَ قِيلَ لا يَجوزُ لعدم استقرار التكليف[2]. قُلْنا: يكفي للنسخ وجود أصل التكليف فينقطع به وقد وقع النسخ قبل التمكن في قصة الذبيح فإنَّ الجليل امر بذبح ابنه عليهما الصلاة والسلام [3].

---

حەلاڵیان کردوە پێشتر- و زینایان کردبوو، ئەم فەرموودەیە بوخاری و موسلیم ریوایەتایان کردووە ، هەر ئەم دوانەش مەبەستی ئایەتەکەیە کە فەرموی: پیاوی پیرو ژنی پیر ئەبێ جیماعی حەلاڵیان کردبێ پێشتر .

(١) ٣-ئەوەیە حوکمەکەی سڕاوەتەوە نەك خوێندنەوەی ئەمەشیان زۆرە لەقورئاندا لەم بەشی سێهەمەدا کە قورئان دەفەرمووێ: ئەوانەتان کەدەمرن و ژن بەجێدێڵن وەصیەت کراوە بۆ مێردەکانیان ئەبێ تا یەك ساڵ لەوماڵەدا بمێننەوە وشوو نەکا هەر لەتازیەباریدا بێ، بەم ئایەتە ئەمەیان سڕیەوە کە دەفەرمووێ: ئەوانەتان دەمرن وو ژن بەجێدێڵن با ئەو ژنانەتان تا چوار مانگ ودە رۆژ چاوەڕێ بن و لەتازیەدابن، بەمەدا ئەزانین ئەمەیان ئایەتی پێشوی سڕیوەتەوە چونکە، لەدابەزیندا یەکەمیان لەپێشەوە بووە، وەك ئەصڵی تەفسیر دەفەرمووێ هەرچەند لەخوێندنەوەدا ئەمیان لەپێشەوەیە لە قورئاندا.

(٢)لەسەر قەولیصەحیح دروستە سڕینەوەیکارێك پێش ئەوەی توانای ئەنجامدانی بۆ برەخسێ بەم شێوەیە کاتەکەی نەهاتبێ،یاخود هاتبێ بەلام ئەوەندە کات تێپەڕی نەکربێ، کە ئەو کارەی تیا ئەنجام بدرێ یەکسەر بسڕێتەوە، هەندێکیش دەڵێن دروست نیە،چونکە ئەو تەکلیفە ئیستیقراری نەگرتووە و یەکسەر سڕاوەتەوە.

(٣) ئێمەیش دەڵێین: مادەم ئەصڵی تەکلیفەکە هەیە ئەوە بەسە بۆ ئەوەی سڕینەوەی بەسەردا بێت، بەو سڕینەوە تەکلیفەکە دەبڕێت، لەسەر گوزەشتەکەی ئیسماعیلی سەربڕاودا سڕینەوەی کەلامی ئەزەلی بێگومان رویداوە پێش ئەوەی توانای ئەنجامدانی هەبێت، چونکە ئیبراهیمی خەلیل فەرمانی پێدراوە بەسەربڕینی کوڕەکەی چونکەخوای گەورە سەرگوزەشتەکەی نەگەڕێنێتەوە لێیەوەو.

لقوله تعالى حكاية عنه:﴿ يا بنيّ اني اري في المنام اني اذبحك ﴾ الخ ثُمَّ نسخ ذبحه قبل التمكن منه لقوله تعالى:﴿ وفديناه بذبح عظيم ﴾ واحتمال أن يكون النسخ فيه بعد التمكن خلاف الظاهِر من حال الأنبياء في امتثال الأمر من مبادرتهم الى فعل المأمور به وان كان موسعاً[1].

{و} يَجوزُ على الصحيح {النسخ بقرآنٍ لقرآن وسنةٍ} وقيل لايجوز نسخُ السّنةِ بالقرآن لقوله تعالى:﴿ وانزلنا اليك الذكر لتبين للناس ما نزل إليهم ﴾ جعله مبينا للقرآن فلا يكون القُرآن مبينا لِلسّنَةِ قُلْنا لا مانع من ذلك لأنهما من عند الله تعالى قال الله تعالى:﴿ وما ينطق عن الهوى ﴾ ويدل على الجواز قوله تعالى:﴿ ونزلنا عليك الكتاب تبينا لِكُلِّ شيء ﴾ وان خصَّ من عمومه ما نسخ بغير القُرآن[2].

---

(١) دەفەرموێ: كوڕە شیرینەكەم بێگومان وادەزانم خەو دەبینم لەخەودا فەرمانم پێكراوە بەسەربڕینت، تاكۆتایی. پاشان سەربڕینەكەی لابراو سڕایەوە پێش ئەوەی سەربڕینەكەی بۆ برەخسێ، سڕینەوەكەش لەم فەرموودەی خوا بوو كە دەفەرموێ: بەباتی سەربڕاوەكەقۆچێكی گەورەمان كرد، وەئەگەر بوترێ هەڵئەگرێ سڕینەوەو لابردنی سەربڕینەكەی دوای توانای ئەنجامدانی بووە ، ئەم قسەیە جیاوازو نەگونجاوە لەگەڵ رواڵەت و حاڵەتی پێغەمبەراندا لەئەنجامی فەمانی خودادا، كە ظاهیری حاڵی پێغەمبەران بریتیبوە لەپەلەكردن لەئەنجامدانی ئەو فەرمانەی كەدراوە بەسەریاندا هەرچەند كاتی فەرمانەكەش فراوانە.

(٢) لەسەر قەولی صەحیح دروستە سڕینەوەی قوران بەهۆی قورئانەوە، وە بەهۆی فەرموودەشەوە، وتراویشە دروست نیە سڕینەوەی فەرموودە بەهۆی قورئانەوە ، چونكە خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ئێمە قورئانمان دابەزاندوە بۆ ئەوەی بۆ ئەوەی بۆ خەڵكی دابەزیوە بۆیان روون بكەیتەوە، خوای گەورە فەرمانی كردووە بەروون كردنەوەی قورئان ئیتر نابێ قورئان روون كەرەوەی فەرموودە بێ، چونكە دەور روودەدات، ئێمەیش دەڵێین: هیچ جۆرە رێگرتنێك نیە لەوەی هەر یەكە روونكەرەوەی ئەوی‌تر بێ چونكەهەردوكیان سەرچاوەكەیان لەخواوەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: لەئارەزووی خۆیەوە قسەناكا، بەلام ئەم ئایەتەش كە دەفەرموێ: ئەم قورئانەمان دابەزاندوەتە سەر تۆ روونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، فەرموودەش شتە كەوابوو روونكەرەوەشە بۆ ئەو ، دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات كە قورئان دروستە روونكەرەوەبێ بۆ فەرموودە . هەرچەند ئەم ئایەتە لە گشتگیری خۆی كەوتووە ئەوەی بەغەیری قورئان سڕابێتەوە تایبەت كراوە.

{و} يَجوزُ على الصحيح النسخ {بالسنة} متواترة او آحادا {للقرآن} وَ قِيلَ لا يَجوزُ لقوله تعالى قل ما يكون لي ان ابدله من تلقاء نفسي والنسخ بالسُنَة تبديل منه قُلْنا ليس تبديلا من تلقاء نفسه وما ينطق عن الهوى ويدل على الجواز قوله تعالى التبين للناس مانزل اليهم[1] {وَ قِيلَ يمتنع} نسخ القُرآن {بالاحاد} لان القُرآن مقطوع والآحاد مظنون قُلْنا محل النسخ الحكم ودلالة القُرآن عليه ظنية[2].

{والحق لم يقع} نسخ القُرآن {الا بالمتواتره} وَ قِيلَ وقع بالآحاد كحديث الترمذي وغيره لا وصية لوارث فإنَّهُ ناسخ لقوله تعالى كتب عليكم اذا حضر احدكم الموت ان ترك خيرا الوصية للوالدين والأقربين قُلْنا لا نسلم عدم تواتر ذلك ونحوه للمجتهدين الحاكمين بالنسخ لقربهم من زمان النبيِّ ﷺ[3].

---

(١) لەسەر قەولی صەحیح دروستە سڕینەوەی قورئان بەهۆی فەرموودەوە چ فەرموودەی متواتر بێت یاخود ئاحاد بێ، وتراویشە دروست نیە سڕینەوەی قورئان بەهۆی فەرموودەوە ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: تۆ بڵێ محمد من بۆم نیە شتێ لەقورئان لابەم و شتێکیتری بنێمەجێ هەر لەلایەنی خودی خۆمەوە ، سڕینەوەی قورئان بەهۆی فەرموودەوە ئاڵوگۆڕکردنی قورئانە لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ ، ئێمەیش دەڵێین: ئەوە ئاڵوگۆڕکردنی قورئان نیە لەلایەن خودی پێغەمبەرەوەﷺ ، چونکە بەفەرمانی خوا دەبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: محمد لەئارەزووی خۆیەوە بەدەم خواوە قسەناکات. وەهەم ئەم ئایەتەش دەلاڵەت لەسەر دروستی ئەم سڕینەوە دەکات کە دەفەرموێ: بۆ ئەوەی ئەوەی دابەزیوە بۆ خەڵک تۆ بۆیان روون بکەیتەوە.

(٢) هەندێك وتوویانە: قەدەغەیە سڕینەوەی قورئان بە فەرموودەی ئاحاد ، چونکە قورئان گومان تێدا بڕاوە وە فەرموودەی ئاحادیش گوماناویە ، ئێمەیش دەڵێین: شوێنی سڕینەوەکە حوکم و مەدلولەکەیە نەك لەفظەکە ، دەلاڵەت کردنی قورئانیش لەسەر ئەو حوکمە دەلاڵەتێکی ظنیگوماناویە، نەك قطعیو بێگومان.

(٣) قەولی حەق ئەوەیە قورئان بە فەرموودەی متواتەر نەبێ نەسڕاوەتەوە، هەندێك وتوویانە بە فەرموودەی ئاحادیش سڕاوەتەوە ،وەك ئەو فەرموودەیە کەتیرمذی و غەیری ئەویش ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: هیچ جۆرە وەصیەتێك نابێ بکرێ بۆ میراتگر، ئەم فەرموودەیە لابەرو سڕێنەرەوەی حوکمی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: کاتێك مردن لەیەکێکیان نزیك بوویەوە ئەگەر ماڵ و سامانێکی بەجێهێشت با وەصیەت بکا بۆ باوك و دایك و خزمە نزیکەکانی. ئێمەیش دەڵێین: تەواتر نەبوونی ئەو فەرموودەیە ناسەلمێنین، بۆ ئەو موجتەهیدانە کە حوکمیان بە نەسخ و سڕینەوە

{قال الشافعي} ﷺ {وحيث وقع} نسخ القرآن {بالسُنَة فمعها قرآن} عاضدلها يبين توافق الكتاب والسُنَة {اتو} نسخ السُنَة {بالقرآن فمعه سنة عاضده} له {تبين توافق لكتاب والسنة} هذا فهمه المصنِّف من قول الشافعي ﷺ في الرسالة[1]:

لا ينسخ كتاب الله الا كتابه ثُمَّ قال: وهكذا سنة رسول الله ﷺ لا ينسخها الاسنته ولو احدث الله في امر غير ماسن فيه رسوله لسن رسوله ما احدث الله حتى يبين للناس ن له سنة ناسخة لسنته اي موافقة للكتاب الناسخ لها اذ لا شك في موافقة له كما في سخ التوجه في الصلاة الى بيث المقدس الثابت بفعله ﷺ بقوله تعالى قول وجهك شطر مسجد الحرام وقد فعله ﷺ[2].

کردووە، چونکە لەبەر نزیکیان بەسەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ بۆ ئەوان متواتر بووە، ەڵام بۆ دوای ئەوان لەوانەیە بوو بێ بەئاحاد.

١) شافیعی خوای -لێرازی بێت- فەرمویەتی: لەهەر جێیەك سڕینەوەی قورئان ەهۆی فەرموودەوە بێت ئەوە ئایەتێکی قورئان پشتگیری ئەو فەرموودە دەکات کە ەدوای فەرموودە سڕێنەرەوەکەوە دابەزیوە، ئەمەش هەر هەماهەنگی قورئان و ەرموودە دەرئەخات، یاخود لەهەر جێیەك بەهۆی قورئانەوە فەرموودە سڕایەوە ەوە لەگەڵ ئەو قورئانەدا فەرموودەیەك هەیە پشتی بگرێ و بەهێزی بکات و هەما ەنگی قورئان و فەرموودە دەربخات، دارشتنی ئەم مەبەستە بەم شێوەیە دانەر ە فەرموودەیەکی شافیعی وەریگرتووە و لێی حاڵی بووە لە کتێبی(الرسالة)دا کە تیایدا دەڵێ:

٢) نامەی خوا نەبێت هیچ شتێك نامەی خوا ناسڕێتەوە، پاشان وتوویەتی: ەروەها فەرموودەی پێغەمبەرﷺ تەنها فەرموودەی خۆی نەبێ نایسڕێتەوە، ئەگەر خوا لەکاروبارێکدا شتێك دابهێنێ و جیاوازبێ لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەرﷺ یمەزراندووە، ئەوە پێغەمبەرﷺ ئەوەی کە دایبەزاندوە ئەوە دائەمەزرێنێ، تا دەری خات بۆ خەڵکی کە پێغەمبەرﷺ فەرموودەیەکی هەیە سڕێنەرەوەی فەرموودەی تریەتی، واتە فەرموودەی پێغەمبەر هەر هەماهەنگە لەگەڵ ئەو قورئانەی کە سڕێنەرەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەرەﷺ ، چونك هیچ جۆرە گومانێك لەوەدا نیە کە پێغەمبەرﷺ هەماهەنگی قورئان دەکا، وەك سڕینەوەی رووکردنە (بیت المقدس) ەنوێژدا، ئەم رووکردنەش بەهۆی رووکردنی پێغەمبەرەوە بوو بەم ئایەتە سڕایەوە کە دەفەرمووێ: محمد روت وەربگێڕە بەرەو رووی (المسجد الحرام) یەکسەر پێغەمبەریشﷺ ئەنجامیدا.

وهذا القسم ظاهر في الفهم والوجود والأول محمول عليه في الفهم محتاج الى بيان وجوده ويكون المراد من صدر كلام الشافعي انه لم يقع نسخ الكتاب إلاّ بالكتاب وان كان ثُمَّ سنة ناسخة له ولا نسخ السُنَة إلاّ بالسُّنَة وان كان ثُمَّ كتاب ناسخ لها اي لم يقع النسخ لِكُلّ منهما بالآخر الاّ او معه مثل المنسوخ عاضد له[١]

ولم يبال المصنّف في هذا الذي فهمه وحاكه عنه يكونه خلاف ماحكاه غيره من الاصحاب عنه من انه لا تنسخ السنه بالكتاب في احد القولين و الكتاب بالسُنَة قيل جزماوَ قِيلَ في احد القولين[٢] ثُمَّ اختلفوا هل ذلك بالسمع فلم يقع بالعقل فلم يجز وقال بكلّ منهما بعض وبعض استعظم ذلك منه لوقوع نسخ كل منهما بالآخر كما تقدَّم[٣].

(١) ئەم بەشی دووەمە کە فەرموودەیەك هەبێ و قورئان بیسڕێتەوە، ئەنجا فەرموودەیەکیش پشتی بگرێ، ئەمە شتێکی ئاشکرایە لە وتەکەی شافعیەوە هەمو کەس لێی حاڵی ئەبێ و هەیە، بەڵام یەکەم کە ئایەتێك هەبێو فەرموودەیەك بیسڕێتەوەوە ئایەتێکیتریش پشتگیری بکات ئەمەیان قیاسی لەسەر ئەکرێت لەبارەی لێحاڵی بوونەوە –واتە: ئەمەیان بەقیاس فەهم ئەکرێ– بەلام پێویستی هەیە بەبەڵگە بۆ ئەوەی ئایا شتی وا هەبووە؟ مەبەست وتەکەی شافیعی لەسەر تاکەیەوە ئاوا دەبێ، سڕینەوەی قورئان بەقورئان نەبووبێ نەبووە، هەرچەندە لەو بابەتەشدا فەرموودەیەك هەبێ کەسڕێنەرەوەی ئەو ئایەتە بێ وە سڕینەوەی فەرموودە بە فەرموودە نابێت هەرچەند لەو بابەتەدا ئایەتێك هەبێت سڕێنەرەوەی ئەو فەرموودە بێت، واتە: سڕینەوە بۆ هیچ یەك لەو دووانە نەبووە جگە بەئەوی‌تریان نەبێ و لەگەڵیدا وێنەی سڕاوەکەو لابراوەکە هەبێو پشتگیری ئاخرەکەیان بکات.

(٢) دانەر ئەم شێوە حاڵی بوونەی لە وتەی شافیعی و گێڕاویەتەوە دەڵێ: گوێ نەداوە بەمەی کە ئەمە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی غەیری خۆی لەشافیعی گەڕاندوەتەوە ئەوە کە ئەوانیشی هاوەڵانی ئەون ، کە ئەڵێن شافیعی بەم شێوەیەی فەرمووە: فەرموودە بەئایەت ناسڕێتەوە ، ئەمەش لەیەکێ لەدوو بۆچوونەکەی شافیعی‌دا وایە، وە قورئانیش بە فەرموودە ناسڕێتەوە، هەندێ وتوویانە بێگومان، هەندێکیش وتوویانە: لەیەکێك لەدوو قەولەی شافیعی‌دا وایە.

(٣) پاشان ئەوانەش کە ئەڵێن: دروست نیە سڕینەوەی، فەرموودە بەهۆی قورئانەوە پێچەوانەکەشی بەش بەشبوون لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا، ئایا بەڵگەی دروست نەبوونەکەی بەڵگەی بیستراوە؟ کەئەمەش بەهیچ جۆرێك رووی‌نەداوە ، یاخود بەهۆی عەقڵەوەیە؟ ئەوەش دروست نیە ، جا هەندێ وتوویانە: بەڵگەی بیستراوەو

وما فهمه المصنِّفُ عنه دافعٌ لمحل الإستعظام[1] وسكتَ عن نسخ السّنة بالسّنةِ للعلم به من نسخ القرآنِ بالقرآن فيَجوزُ نسخ المتواترة بمثلها والآحاد بمثلها وبالمتواترة وكذا المتواترة بالآحاد على الصحيح كما تقدَّمَ في نسخ القُرآن بالآحاد[2].

ومن نسخ السُنّة بالسُنّة نسخ حديث مسلم انه ﷺ قيل له الرجل يعجل عن امراته ولم يمن ماذا يجب عليه فقال انما الماء من الماء بحديث الصحيحين اذا جلس بين شعبها الاربع ثُمَّ جهاده فقد وجب الغسل زاد مسلم في رواية وان لم ينزل لتأخر هذا عن الاول لما روى ابوداود وغيره عن ابي بن كعب ﷺ ان الفتايا التي كانوا يقولون الماء من الماء رخصة رخصها رسول اللهﷺ في اول الاسلام ثُمَّ أمر بالغسل بعدها[3].

---

هەندێکیتر وتویانە: بەڵگەی عەقڵیە، هەندێکیش ئەوەی لەشافعیەوە زۆر بەگەورەو غەریب زانیوە کە چۆن شافیعی شتی وا ئەڵێ چونکە هەریەکێ لە فەرموودەو قورئان یەکتریان سڕیوەتەوەو رووی‌داوەو بووە وەك لەپێشەوە تێپەڕی کرد.

(١) جا ئەو شێوە حاڵی بوونەی دانەر سەرسوڕمانی ئەو هێندە ناهێڵێ کە ئەڵێن: شافیعی چۆن وای وتووە؟ چونکە کەئەڵێت: فەرموودە ئایەت ئەسڕێتەوە ئەوە دوای ئەو فەرموودەیە ئایەتێك دابەزیووە کە پشتگیری فەرموودەکە بکا.

(٢) دانەر لەمەتنەکەدا باسی سڕینەوەی فەرموودەی بە فەرموودە نەکرد، چونکە قوتابی لێی حاڵی دەبێ لەوەوە کە وتی ئایەت ئایەت دەسڕێتەوە، وەمانای وایە فەرموودەش وایە،کەوابوو دروستە فەرموودەی متواتر بەهۆی متواترەوە ، وەسڕینەوەی فەرموودەی ئاحاد بەهۆی ئاحادو متواترەوە، هەروەها دروستە سڕینەوەی فەرموودەی متواتر بەهۆی فەرموودەی ئاحادەوە لەسەر قەولی صەحیح، وەك لەپێشەوە رابوورد کەسڕینەوەی قورئان دروستە بەهۆی فەرموودەی ئاحادەوە.

(٣) نموونە بۆ سڕینەوەی فەرموودە بەهۆی فەرموودەوە، لابردن و سڕینەوەی ئەو فەرموودەی موسلیم ریوایەتی کردووە و دەفەرمووێ: پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێ‌کرا پیاوێك پەلە بکا زوو لەسەر ژنەکەی هەڵبسێتەوەو ئاوی نەیەتەوە ئایا ئەو پیاوە چی لەسەر پێویست دەبێ؟ پێغەمبەریشﷺ فەرموی: خۆشۆردن تەنها لەهاتنەوەی ئاوەوە پێویست ئەبێ، ئەم فەرموودە بەهۆی فەرموودەیەکەوە کە بوخاری و موسلیم ریوایەتی ئەکەن سڕاوەتەوە کە دەفەرمووێ: کاتێ پیاو لەنێوان هەر چوارپەلی ژندا دانیشت و پاشان گوشی بەخۆیەوەو جیماعی لەگەڵ کرد، ئەوە بێگومان غوسڵی لەسەرپێویست ئەبێ،موسلیم لەریوایەتەکەی خۆیدا ئەمەی زیاترە فەرموی: هەرچەندە ئەو پیاوە ئاویشی نەیەتەوە ، لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودەیان دوای فەرموودەی

ومن نسخ القُرآن بالقرآن ما تقدَّمَ من نسخ قوله تعالى:﴿ متاعا الى الحول ﴾ بقوله تعالى ﴿ اربعة اشهر وعشرا ﴾[1].

{و} يَجوزُ على الصحيح النسخ للنص {بالقياس} لاستناده الى النص فكانه الناسخ وَ قيلَ لا يَجوزُ حَذرا من تقديم القياس على النص الذى هو اصل له في الجملة[2] {وثالثها} يَجوزُ {ان كان} القياس {جليا} بخلاف الخفى لضعفه[3] {والرابع} يَجوزُ {ان كان} القياس {في زمنه عليه} الصلاة و {السلام والعلة منصوصه} بخلاف ماعلته مستنبطة لضعفه وما وجد بعد زمن النبيِّ ﷺ لانتفاء النسخ حينَئذٍ قُلنا تبين به ان مخالفه كان منسوخا[4].

---

یەکەمەوە هاتووە. ، یەکەم سڕاوەتەوە چونکە ئەبوداود و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە کە ئەڵێ: ئەو فەتوایەی: کە دەیانوت: خۆشۆردن لەهاتنوەی ئاوەوە ئەبێت ئەوە یارمەتیەك و کارئاسانکردنێك بوو لەسەرەتای ئیسلامەوە پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی پێدابوون، پاشان فەرمانی دەرکرد بەخۆشۆردن پاش ئەو ڕوخصەتە.

(١) نموونەش بۆ سڕینەوەی قورئان هەر بەهۆی قورئانەوە سڕینەوەی ئایەتی: ﴿ متاعاً الى الحول ﴾ بەهۆی ئایەتی :اربعة اشهر و عشراً﴾وە.

(٢) لەسەر قەولی صەحیح دروستە سڕینەوەی حوکمی دەقی ئایەتێ یا فەرموودەیێك بەهۆی قیاسەوە، چونکە بەپشت ئەستوری دەقێکەوە دروست بووە وەك: ئەمە وایە هەر ئەو دەقە خۆی سڕینەرەوە نەك قیاسەکە، هەندێك وتوویانە: دروست نیە چونکە ترسی ئەوە ئەکرێ، قیاس پێش بخرێ بەسەر دەقدا کە بنەماو سەرچاوەی قیاسە لەزۆر مەسەلەدا.

(٣) قەولی سێهەم ئەوەیە کە دروستە سڕینەوەی دەق بەهۆی قیاسەوە ، بەلام بەمەرجێ قیاسەکە لەجۆری جەلی بێ، بەلام قیاسی خەفی جیاوازە و ناتوانێ ئەوە بکات چونکە لاوازە -ئەگونجێ عیلەتی فەرعەکە ئەو عیلەتە نەبێ لەئەصڵەکەدایە-.

(٤) قەولی چوارەم ئەوەیە قیاس لابەرو سڕێنەرەوە بێ بۆ دەق : ئەگەر قیاسەکە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ بووبێ و عیلەتەکەشی دەق دانی پێدا بنێو نرابێ، قیاسێك وانەبێ ناتوانێ ئەوەیان عیلەتەکەی دەرهێنرابێ و زادەی بیری لەبەر لاوازیەتی ، ئەوەشیان دوای سەردەمی پێغەمبەرﷺ بووبێ. سڕینەوەکە ئەم ئایەتەدا نابێ ئێمەیش دەڵێین: بەو قیاسە دەرکەوتووە کە موخالفی ئەو قیاسە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ مەنسوخ و سڕاوە بووە بەهۆی ئەو دەقەی قیاسەکە پشتی پێبەستووە.

{و} يَجوزُ على الصحيح {نسخ القياس} الموجود {في زمنه عليه} الصلاة و {السلام} بنص او قياس وَ قيلَ لا يَجوزُ نسخه لأنه مستند الى نص فيدوم بدوامه قُلْنا لا نسلم لزوم دوامه كما لا يلزم دوام حكم النص بأن ينسخ(١).

{وشرط ناسخه ان كان قياسا ان يكون اجلى} منه {وفاقا للامام} الرَّازي {وخلافاً للآمدى} في اكتفائه بالمساوي فلا يكفى الاذون حزما لانتفاء المقاومة ولا المساوي لانتفاء المرجح ويَجوزُ ان يقول الآمدي تأخر نصه مرجح اذ لابد من تأخر نص القياس النسٰخ عن نص القياس المنسوخ به وعن النص المنسوخ به كما لا يخفى(٢).

{و} يَجوزُ {نسخ الفحوى} اي مفهوم الموافقة بقسمه الأولى والمساوى {دون اصله} اى المنطوق {كعكسه} اى نسخ اصل الفحوى دونه {على الصحيح} فيهما(٣).

---

(١)لەسەر قەولی‌صەحیح دروستەسڕینەوەی قیاسێك کە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبوو بێ، بەهۆی دەقێکەوە یاخود قیاسێکەوە لابرێ و بسڕێتەوە، وتراویشە: دروست نیە ئەو قیاسە سڕینەوەی ، چونکە ئەو قیاسە پاڵپشتەکەی دەقێکە، کەوابوو هەتادەقەکە بمێنێ قیاسەکەش هەر دەمێنێ، ئێمەیش دەڵێین: ئێمە ئەوە ناسەلمێنین کە دەبێ ئەو قیاسە هەربمێنێتەوە، وەك چۆن پێویست ناکا حوکمی دەق هەر بمێنێتەوە، چونکە هەڵئەگرێ بەدەقێکی‌تر بسڕێتەوە.

(٢) بەمەرجێ ئەو قیاسەی کە سڕێنەرەوەی قیاسێکی‌تر بێ ئەبێ لەو روون و ئاشکراتر بێ، ئەم مەرجە هەماهەنگە لەگەڵ بۆ چوونی پێشەوا رازیدا، وە جیاوازە بۆ رای ئامێدی کە دەڵێ: ئەگەر پلەی یەکسانیش هەبێ هەر بەسەر بۆ ئەوەی لابەر بێ، کەوابوو ئەگەر پلەی لەو نزمتربێ، بێگومان توانای سڕینەوەی ئەوی‌تری نابێ بەلای هەردوکیانەوە، چونکە ناتوانێ بەرهەڵستی خۆی بەهێزتر بکات، بەلای دانەریش هاوپلەی خۆی ناتوانێ لابەری بێت چونکە ئەوەی کەلای قورس بکا نیە، ئەگونجێ بۆ ئامێدی بڵێ، دواکەوتنی دەقی قیاس یەکسانە کە مرجح و لاسەنگ کەریەتی ، چونکە پێویستە دەقی قیاسە سڕێنەرەوەکە دوای دەقی قیاسە سڕاوەکە بێ، وەدوای ئەو دەقەوە بێت کەبە قیاس دەسڕێتەوە –ئەمەیان بۆ سڕینەوەی دەقە بەقیاس– ئەمەش شتێکی شاراوە نیە لای کەس .

(٣) دروستە سڕینەوەی (فحوی) واتە: مەفهومی موافقە –مانای هەماهەنگ– بەهەردوو بەشەکەیەوە کە (اولی)و (مساوي)یە، بەبێ سڕینەوەی بنەمای فەحواکە، کە مەنطوقەکەیە، وەك بەپێچەوانەشەوە دروستە ، واتە: سڕینەوەی مەنطوق بێ سڕینەوەی فەحوا، ئەمەش لەسەر قەولی صەحیح دروستە لەهەردوکیاندا ..

لان الفحوى واصله مدلولان متغايران فجازنسخ كلٍ منهما وحده كنسخ تحريم ضرب الوالدين دون تحريم التأفيف والعكس[1] وَ قِيلَ لا فيهما لان الفحوى لازم لاصلِه فلا ينسخ واحد منهما بدون الآخر لمنافاة ذلك اللزوم بينهما[2].

وَ قِيلَ واختاره ابن الحاجب يمتنع الاول لامتناع بقاء الملزوم مع نفي اللازم بخلاف الثاني لجواز بقاء اللازم مع نفي الملزوم ولقوة جواز الثاني اتى به المصنِّف بكاف التشبيه دون واو العطف لكن يؤخذ مما سيأتي حكاية قول بعكس الثالث اما نسخ الفحوى مع اصله فيَجوزُ اتفاقاً[3] {و} يَجوزُ {النسخ به} اى بالفحوى قال الامام الرازى والآمدي اتفاقاً[4].

---

(١) ..چونكە فەحواو بنەماكەی دوو مانای جیاوازیان لەیەك، كەوابوو هەریەكیان خۆی تەنها دروستە سڕینەوەی، بۆ وێنە وەك: سڕینەوەی حەرامكردنی لێدانی باوك و دایك بێ حەرامكردنی ئۆف كردن لێیان، یاخود پێچەوانەكەی، وەك: سڕینەوەی حەرامكردنی ئۆف كردن لەباوك و دایك بێ‌ئەوەی لێدانیان حەرام بكرێ.

(٢) هەندێ وتوویانە:لەهەردوكیاندا دروست نیە، چونكە فەحوا لازمی بنەماكەیەتی و بنەماكەشی لازمی فەحواكەیەتی بەبێ یەك ناكرێن، كەوابوو یەكێكیان بێ‌ئەوی‌تریان ناسڕێتەوە، چونكە سڕینەوەی یەكێكیان بێ ئەویتریان دژایەتی هەیە بۆ ملازمەی نێوانیان ، ئەمە ملازمەی متساویە.

(٣) وتراویشە: قەدەغەیە سڕینەوەی فەحوا بەبێ ئەصڵ و بنەماكەی، چونكە نابێ مانەی مەلزوم كەئەصڵەكەیە لەگەڵ ئەوەش لازمەكەی نەفی كرابێ كە فەحواكەیە، (ابن حاجب) ئەم قیلەی پێ چاك بووەو هەڵبژاردووە -ئەم تێبینی لازمی ئەعەممی كردووە- بەڵام دووەم جیاوازە لەگەڵ یەكەم كە سڕینەوەی ئەصڵ وبنەمایەو مانەوەی فەحوایە، چونكە دروستە مانەوەی لازم لەگەڵ نەفی كردنی مەلزومەكەیدا - كە لازمی ئەعەم بێ - لەبەر بەهێزی دروستە سڕینەوەی ئەصڵ ومانەوەی فەحوایە دانەر بەكافی تەشبیهەوە پیتی لێكچواند داڕشتنەكەی هێنا، وتی: (كعكسە) نەك بەواوی عەطف چونكە مشبەبە هەموو كات بەهێزترە، بەڵام لەمەودوا لەگێڕانەوەی قەولی سێهەمدا شتێ وەردەگیرێ، كە پێچەوانەی قەولی سێهەمە، واتە دووەمەكە بەلایەوە قەدەغەیە ئەوەڵەكەی بەلاوە قەدەغەنیە،بەمە دەرئەكەوێ قەولی‌دووەم بەهێز نیە، بەڵام سڕینەوەی فەحوا لەگەڵ ئەصڵ و بنەماكەیدا ئەوەیە رای هەمووان دروستە.

(٤) سڕینەوە دروستە بەهۆی فەحواوە ، پێشەوا رازی‌و ئامێدی وتوویانە بەڕای هەموانە .

وحكى الشيخ ابو اسحاق الشيرازى كما قال المصنّف المنع به بناءً على انه قياس وان القياس لايكون ناسخاً[1]. {والأكثر ان نسخ احدهما} اى الفحوى واصله اياكان {يستلزم الاخر} اى نسخة لان الفحوى لازم لاصله وتابع له ورفع اللازم يستلزم رفع اللزوم ورفع المتبوع يستلزمُ رفع التابع[2]. قِيلَ لا يستلزم واحدُ الآخر لان رفع التابع لا يستلزم رفع المتبوع ورفع الملزوم لا يستلزم رفع اللازم[3].

وَ قِيلَ نسخ الفحوى لايستلزم نظراً الى انه تابعٌ بخلاف نسخ الأصل[4]. وَ قِيلَ نسخ الأصل لا يستلزم نظراً الى انه ملزوم بخلاف نسخ الفحوى[5] واعلم ان استلزام نسخ كل منهما للاخر ينافي ما صححه من جواز نسخ كل منهما دون الاخر فإنَّ الامتناع مبني على الاستلزام والجواز بمنى على عدمه[6].

---

(١) شێخی شیرازی گێراویەتەوە وەك دانەر وتوویەتی: کە سڕینەوە بەهۆی فەحواوە قەدەغەیەو نابێ، ئەم بۆچوونەش لەسەر ئەوە دروست بووە، کە فەحوا قیاسە و قیاسیش نابێ لابەرو سڕینەرەوە بێ.

(٢) زۆرتر لەزانایان رایان وایە سڕینەوەی یەکێکیان هەرکامیان بێ، چ فەحواو چ ئەصڵ و بنەماکەی، داوا راکێشانی ئەویتریان ئەکا بەشوێن خۆیدا، واتە: سڕینەوەی ئەویتریش، چونکە فەحوا لازمی ئەصڵەکەیەتی وو شوێن کەوتەیەتی، خۆ لابردنی لازمیش داوا ئەکا کە لازمە لابردنی مەلزومیش، وەلابردنی شوێن خراوەکەش داوا ئەکا کەلازمە لابردنی شوێن کەوتووەکەش.

(٣) کۆمەڵێکیتریان وتوویانە: سڕینەوەی هیچ کامیان داوای سڕینەوەی ئەویتریان ناکات، چونکە لابردنی شوێن کەوتەکە داوای ئەوە ناکات مەتبوعەکە لابرێت، وە لابردنی مەلزومیش داوای ئەوە ناکات لازمەکەش لابرێ.

(٤) ئەمە قەولی چوارەمە کەوتی: (لكن يؤخذ مما سيأتي) هەندێکیتر وتوویانە سڕینەوەی فەحوا داوای ئەوە ناکات لازمە ئەصڵەکەش بسڕێتەوە، چونکە ئەمانە بیریان لەوە روانیوە کە فەحوا شوێن کەوتەیە، وەك ئەصڵەکەی نیە، بەڵام جیاوازە لەگەڵ سڕینەوی ئەصڵەکەدا.

(٥) کۆمەڵێکیتر وتوویانە: سڕینەوەی ئەصڵ داوای سڕینەوەی فەحوا ناکات، چونکە سەیر و سەرنجی ئەوەیان داوە کە ئەصڵەکە مەلزوومە، بەڵام سڕینەوەی فەحوا جیاوازە. (٦) شارح رەخنەیەك لەخاوەنی مەتەنەکە ئەگرێ و ئەڵێ: قسەی سەرەتاو کۆتاییەکەی دژبەیەکن چونکە لەسەرەتاوە ئەڵێ: هەریەك دروستە بەبێ‌ئەو بسڕێتەوە لەکۆتاییدا دەڵێ: سڕینەوەی یەکێکیان داوای سڕینەوەی ئەویتریان دەکات، بەکورتی

وقد اقتصر ابن الحاجب على الجواز مع مقابله والبيضاوى على الأستلزام[1]. وجمع المصنف بينهما كأنه ماخوذ من قول الآمدي اختلفو في جواز نسخ الاصل دون الفحوى والفحوى دون الاصل غير ان الاكثر على ان نسخ الاصل يفيد نسخ الفحوى اخ المشمل على العكس ايضاً فكأنه سرى الى ذهن المصنّف من غير تأمل ان الخلاف الثاني مفرع على الجواز من الاول وليس كذلك بل هو بان لمأخذ الاول المفيد ان الأكثر على الامتناع فليتامل[2].

جاریْ لای جیابوونەوەیان قورس دەکات، وە جاریْ لای بەیەکا ئالاْویان قورس دەکا، بـۆ؟ جا ئەڵیْ: ئەی قوتاب ئازیز تۆ بزانە، سڕینەوەی هـەر یـەکێکیان سـڕینەوەی ئەویتر بێت، ئەوە دژایەتی ئەو بۆچوونەی دەکا کـە بەصـەحیحی نـاوزەد کـرد کـە: دروستە سڕینەوەی هەر یەکێك لـەو دووانـە بـیْ ئەویتریان ،چونکە ئـەوەی کـەدەڵیْ: سڕینەوەی یەکێکیان بیْ ئەویتریان نابیْ، ئەوە لەسەر مەسەلەی ئیستیلزام دروست بووە، وەئەوەش کەدەڵیْ: دروستە سڕینەوەی یەکێکیانە بیْ سـڕینەوەی ئـەویتریان ئـەوە لەسـەر مەسـەلەی نـەبوونی ئیستیلزامەوە دروسـت بـووە، واتـە: سـڕینەوەی یەکێکیان بیْئەویتریان دەبیْ و شوێن کەوتەی نابیْ.

(١) ئەم دوو قسـە دژبەیەکەی کـردووە بـەلاْم ئـەم زانایانـە هەریـەکێکیان لایێکیـان گرتووە ، بۆ وێنە (ابن الحاجب) تەنها کورتـی هەڵهێناوەو دەیبڕیْ بەسەر ئەوەی کە دروستە سڕینەوەی یەکێکیان بیْ ئەویتریان لەگەڵ موقابلی ئـەو جەوازەدا کە هـەندیْ وتوویانە شتی وا قەدەغەیە، بیضاویش تەنها دەیبڕیْ بەسەر ئیستیلزامدا ، بیْ ئەوەی باسی جەواز و غەیری جەواز بکات.

(٢) دانەر کە هەردوو قەولە دژ بەیەکەکەی کۆکردۆتـەوە وابزانم وای بۆ ئـەچم ئـەوە لەقەولی ئامێدی وەرگیراوە کە ئەڵیْ: جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا لەبارەی دروستی سڕینەوەی ئەصڵ بیْ فـەحوا، یـاخود سڕینەوەی فەحوا بیْسڕینەوەی ئەصڵەکـەی، بەلاْم زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە سڕینەوەی ئەصڵەکە فەحواکە دەگەیەنیْبەیاسـای ئیستیلزام، ئەم قسەیە داگرندەیە بۆ پێچەوانەکەشی دووبارە، کە سـڕینەوەی فـەحوا سـڕینەوەی ئەصڵیشـی ئەگەیـەنی، جـا مـن وابـزانم دانـەر شـەوڕەوی کـردوە بیْبیرلیْکردنەوە بۆیە ئەم هەڵەی کردووە[1] ، خیلافی دووەم کە ئامێدی باسکرد لەسەر جەوازی خیلافی یەکەم دروست بووەو فەرعـی ئـەوە، کەچی ئەوەش وانیـە -خیلافی

١- پیاو بەشەودا بڕوات هەر دەبیْ سەرسمێك بدات- هەڵەکەشی ئەمەیە وایزانیوە .

{و} يَجوزُ {نسخُ المخالفة وان تجردت عن اصلها} اى يَجوزُ نسخها مع اصلها وبدونه {لا} نسخُ {الاصل دونها} اى فلا يَجوزُ {في الاظهر} كما قاله الصفى الهندىُ من احتمالين له لأنها تابعة له فترتفع بارتفاعه ولا يرتفع هو بارتفاعها وَ قِيلَ يَجوزُ وتبعيتها له من حيثُ دلالة اللفظ عليها معه لامن حيثُ ذاته[1] مثال نسخها دونه ماتقدم من نسخ حديث اما الماء من الماء فان المنسوخ مفهومة وهو ان لاغسل عند عدم الانزال[2].

---

یەکەم واتە: ئایا دروستە سڕینەوەی فەحوا بێ ئەصڵ وەك پێچەوانەکەشی دروستە، یاخود قەدەغەیە؟- بەڵکو ئەو خیلافی دووەمە بەیان و روونکەرەوەیە بۆ سەرچاوەی خیلافی یەکەم کە ئەوە ئەگەیەنێ زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن قەدەغەیە سڕینەوەی یەکێکیان بێ ئەویتریان -با قوتابی بەووردی لێی وردبێتەوە- ئەگونجێ لە باتی دانەر وەڵامێك بدرێتەوە دوای لێ وردبوونەوە، کە دانەر لەسەر شێوازی تەفریع لەسەر جەواز خیلافی ئیستیلزامەکەی نەهێناوە، چونکە وا داخوازی تەفریع ناکا ، بەڵکو قەولی ئەکثەر و زۆربەی زانایانی دوای بەصەحیح زانینی جەوازەکەی هێناوە.

(١) دروستە سڕینەوەی(مفهوم مخالفة) باخۆی تەنهاش بێت و ئەصڵەکەی نەسڕابێتەوە، واتە دروستە سڕینەوەی (مفهوم مخالفة) لەگەڵ ئەصڵەکەیدا و بێ ئەویش هەر دروستە ، نەك سڕینەوەی ئەصڵەکەی بێ (مفهوم مخالفة)، واتە بەلای رونترین قەولەوە دروست نیە، وەك الصفی الهندی وتوویەتی: ئەو (لایجوز)وە یەکێکە لەو دوو ئیحتیماڵە ، چونکە (مفهوم مخالفة) شوێن کەوتەی ئەصڵەکەیە، بەنەمانی ئەصڵەکە یەکسەر ئەمیش نامێنێ ، بەڵام ئەصڵەکە نافەوتێ بەهۆی نەمانی (مفهوم مخالفة)ەکەوە، هەندێك وتوویانە: دروستە سڕینەوەی ئەصڵەکەو مانەوەی (مفهوم مخالفة)ەکەی، چونکە شوێن کەوتنی (مفهوم مخالفة) بۆ ئەصڵەکەی لە رووی ئەوەوەیە لەفظەکە دەلالەت دەکا لەسەری مەفهومی مەنطوقەکەدا ، نەك لە خودی ئەصڵەکەوە شوێن کەوتەی بێت، دەخۆ سڕینەوەکەش دەلالەتەکە دەسڕێتەوە نەك زاتەکەی.

(٢) نموونە بۆ ئەوەی (مفهوم مخالفة) سڕابێتەوە نەك ئەصڵ و مەنطوقەکەی لەپێشەوە رابوورد، کە سڕینەوەی فەرموودەی خۆشۆردن تەنها لەهاتنەوەی ئاوەوە واجب دەبێ، سڕاوەکە مەفهومی فەرموودەکەیە، کەبریتیە لە: خۆشۆدن واجب نابێ لەکاتی ئاونەهاتنەوەدا.

ومثال نسخهما معاً ان ينسَخ وجوبُ الزكاة في السائحة ونفيه في المعلوفة الدال عليهما الحديث السابق في المفهوم ويرجع الامرفي المعلوفة الى ما كان قبلُ مما دل عليه الدليلُ العامّ بعد الشرع من تحريم للفعل ان كان مضرة أوا باحة له ان كان منفعة كما يرجع في الساعة الى ماتقدم في مسئلة اذا نسخ الواجوب بقي الجواز الخ [١].

{ولا} يَجوزُ {النسخ بها} اى بالخالفة كما قال ابنُ السمعاني لضعفها عن مقاومة النص وقال الشيخ ابو اسحق الشيرازي الصحيح الجواز لانها في معنى النطق [٢].

{و} يَجوزُ {نسخ الانشاءِ ولو} كان {بلفظ القضاءِ} وخالف بعضهم فيه لقوله ان القضاء انما يستعمل فيما لا يتغير نحو وقضى ربك ان لا تعبدوا إلاّ اياه اى امر {او} بلفظِ {الخبر} نحو :﴿ والمطلقاتُ يتر بصن بأنفسهن ثلاثة قروء﴾ اى ليتربصن بأنفسهن وخالف الدقاق في ذلك نظراً الى اللفظ [٣].

---

(١) نموونه بۆ هەردوكيان پێكەوە بێسڕینەوەكەیان ، وەك سڕینەوە واجب بوونی زەكات لەئاژەڵێكدا بەدەم خۆی بلەوەڕێ، وەنەفی واجب بوونی زەكات لەئاژەڵێكدا كە دابەستەبێ، ئەو فەرموودەی لەبابەتی مەفهومدا تێپەڕی كرد دەلالەت لەسەر هەردوكیان دەكات، لەئاژەڵی دابەستەدا حوكمەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حوكمەی پێش ئەم فەرموودەیە كە هەبووە و بەڵگەی گشتی دەلالەتی لەسەر كردووە، وەك حەرامكردنی هەركارێك كەزیان بەخش بێ، -كە لێرەدا زەكات دەركردنە- یاخود وەك حەلالكردنی هەركارێك سوود بەخش بێ، وەك چۆن لەئاژەڵێكدا بەدەم خۆی بلەوەڕێ بۆ ئەو حوكمەی لەپێشەوە باسكرا لەمەسەلەی كاتێ وجوب سڕایەوە جەوازو دروستیەكەی هەر دەمێنێتەوە.

(٢) بە (مفهوم مخالفة) سڕینەوەی دەق دروست نیە، وەك ابن سمعانی وتوویەتی: لەبەر لاوازی (مفهوم مخالفة)و نەتوانینی لەخۆڕاگرتن لەبەردەم هێزی دەقدا، بەلام شیرازی وتوویەتی: قەولی صەحیح ئەوەیە كەدروستە، چونكە (مفهوم مخالفة)ش هەیە لەمانای نطقدایە.

(٣) دروستە سڕینەوەی ئینشا یا بەلەفظی قضایش بێ، بەلام هەندێكیان راجیاییان كردووە تیایدا وتوویانە:قضاء لەشتێكدا بەكاردێ گۆڕانكاریو سڕینەوەی قەبولْ نەكا، وە پەروەردگارت قضاوەتی كردووە جگە لەخوا كەسیتر نەپەرستن، ئەم (قضی)بەمانای ئەمەرەیە،یاخود باوەكو بەلەفظی خەبەرو هەواڵیش بێ هەر دروستە، وەك: ژنانی طەلاق دراو باسێ سوڕی مانگانە چاوەڕێ بكەن، (یتربصن) رستەی هەواڵیە لەفظەكەی بەلام بەمانا (لیتربصن) بەلام الدقاق رای جیاوازە لەمەسەلەی

{او قيد بالتابيد و غيره مثل صوموا ابد صوموا حتما} وَ قِيلَ لا المنا فاة النسخ لتأبيد والتحتيم. قُلنا لانسلم ذلك ويتبين بورود الناسح ان المراد افعلوا الى وجوده كما يُقالُ لازم غر يمك ابداً ابى الى ان يعطى الحق و اشرا المصنِّف بلوا الى الخلاف الذى ذكرناه [1]. {وكذا الصوم واجب مستمر ابداً اذا قاله انشاء} فإنَّهُ يَجوزُ نسخه {خلافاً لابن الحاجب} في منعه نسخه دون ماقبله من صوموا ابداً [2] والفرق بان التأبيد فيما قبله قيدُ للفعل وفيه قيد للوجوب والاستمرار لا اثر له ولم يصرح غيرة بما قاله وكانه فهم من كلامِهم انه ليس من محل الخلاف[3].

---

سڕینەوەی ئینشاییێك بەلەفظی هەوال هاتبێ، چونكە ئەم سەیرو سەرنجی لەفظەكەی داوە كەهەواڵە، هەواڵیش ئەگەر بیسڕێتەوە بەدرۆ دەرئەچێ.

(١)یاخود هەرچەند ئینشاكە وشەیەكی پێوەلكێنرابێ مانای هەتا هەتایی بگەیەنێ، وەك هەتا هەتایە بەڕۆژووبن، یا بێگومان بەڕۆژوو بن، هەندێك وتوویانە: ئەگەر وشەیەكی پێوەبێ هەتاهەتایی بگەیەنێ سڕینەوەی دروست نیە، چونكە سڕینەوەو هەتاهەتایی دووشتی دژبەیەكن، ئێمەیش دەڵێین: ئەو دژایەتی یە ناسەلمێنین چونكە كاتێ دژایەتی دەبێ هەتاهەتایی بەمانا قیامەت، لێرە ئەمە مەبەست نیە، چونكە بەهۆی هاتنی سڕێنەرەوە روون دەبێتەوە كەمەبەست بە (افعلوا ابداً) هەتاهەتایە ئەو كارە بكە، تاپەیدابوونی سڕێنەرەوەكە ئەمەش وەك دەوترێ: (لازم غريمك زيداً) هەتاهەتایە قەرزارەكەت بەرمەدە، واتە هەتا هەقەكەت دەداتەوە نەك مەبەست ئەوەبێ هەتا قیامەت لێی مەبەرەوە، دانەر كە لەفظی(لو)ی وتووە ئاماژەی كردووە بۆ ئەو جیاوازیەی كەباسمان كرد.

(٢)هەروەها رۆژو واجبێكی بەردەوامە هەتاهەتایە،ئەگەر كاتێ بەرستەی ئینشائی بیڵێ ئەوە دروستە سڕینەوەی ، بەڵام ابن الحاجب رای جیاوازە لەوەدا كە سڕینەوەی ئەمەیان قەدەغە دەكا، نەك ئەوانەی پێشوو كە (صوموا ابداً)یا (صوموا حتماً)نە.

(٣) ابن الحاجب بۆ ئەم راجیاوازیەی كردووە لەنێوانیاندا؟ وتوویەتی: فەرقەكەیان ئەوەیە هەتاهەتایی پێشوەكە پەیوەستە بەفیعل و كارەكەیەوە، بەڵام لێرەدا پەیوەستە بۆ وجوبو ئیستیمرارە، ئەم فەرق و جیاوازیەی ابن الحاجب هیچ بایەخ و شوێن پێیەكی بۆ نیە، جگە لە ابن الحاجب كەسیتر بەروونیو رەوانی ئەم جیاوازیەی نەوتووە، جاكەس نەیوتووە ئەی لەكوێ وەرگرتووە؟ وای بۆ ئەچم كە ابن الحاجب وای لێحاڵی بووە ئەو: (الصوم مستمرّ ابداً)جێ جیاوازی بۆچوونی زانایانە.

وتقييد المصنّف له بالانشاء هو مراده و إنْ لم يصرح به لذ كره منع نسخ الخبر بعد ذلك[1].

{و} يَجوزُ {نسخ} ايجاب {الاخبار} بشيء {بايجاب الاخبار بنقيضه}كان يوجب الاخبار بقيام زيدٍ ثم بعدم قيامه قبل الاخبار بقيامه لجواز اني يتغير حالُه من القيام الى عدمه فان كان المخبر به ممالا يتغير كحدوث العالم فمنعت المعتزلة ماذكر فيه لانه تكليف بالكذب فينزّه البارى عنه. قُلنا عد يدعو الى الكذب غرض صحيح فلا يكون التكليف فيه نقصاً وقد ذكر الفقهاء اما كن يجب فيها الكذب منها اذا طالَبه ظالم بالوديعة أو بمظلوم خباه وجب عليه انكاره ذلك وجاز له الحلفُ عليه واذا كرهَ على الكذب وجب[2].

(١) دانەر کە نموونەیەکی تایبەت کردووە بەئینشاوە هەر ئەوەش مەبەستی ابن الحاجبە ، هەر چەند بەروونی دەری نەبڕیوە چونکە دوای ئەوەی ابن الحاجب باسی ئەوە ئەکا کە سڕینەوەی هەواڵ قەدەغەیە.

(٢) دروستە سڕینەوەی هەواڵدان بەبەشێك کەواجب کرابێ، بسڕێتەوە بەهۆی واجب کردنی هەواڵدان بەدژی ئەو شتە، وەك ئەوە گریمان: شەرع واجب بکا کەهەواڵ بدرێ بەپێوە وەستانی زەید پاشان واجب بکرێت کە هەواڵ بدرێ کە نەوەستاوە پێش ئەوە هەواڵبدرێ بەوەستانی، چونکە ئەگونجێ حاڵی زەید بگۆڕێ لەوەستانەوە بۆ نەوەستان، بەڵام ئەگەر هەواڵەکە لەوانەبێ گۆڕانکاری بەسەردا نەیێ وەك تازە پەیدابوونی جیهان، ئەوە موعتەزیلە سڕینەوەیان لەو نەگۆڕەدا قەدەغە کردووە، چونکە ئەوە تەکلیف کردنە بەدرۆ ، دەخوای بەدیهێنەریش پاکەو دورە لەتەکلیف بە بەدرۆکردن، ئێمەیش دەڵێین: جاری واهەیە مەبەستێکی دروست و راست و رەوان داوای بوونی درۆ دەکات بۆ گەیشتن بەو مەبەستە -بەمەرجێ زیانی کەسی تێدا نەبێ و بێگومان ئەو مەبەستەش بێتە دی- کەوابوو ئەو تەکلیفە بەو مەرجانەوە نەنگیو خواریو کەمی نیە، زانایانی فقه چەند جێیەکیان باس کردووە کەواجبە درۆی تێدا بکرێ، یەکێك لەوانە ئەوەیە کاتێك ستەمکارێك داوای ماڵێکی بەئەمانەت لادانراوی لێکرد، یاخود داوای ستەم لێکراوێکی لێکرد شاردبویەوە، ئەوە واجبە ئینکاری لێبکا و دروستیشە سوێندی لەسەر بخوا، وەکاتێکیش هەرەشەیان لێکردو زۆری درۆیان لێکرد واجبە لەسەری درۆکە بکات.

{لا} نسخ {الخبر} اى مدلوله فلا يَجوزُ وان كان مما يتغير لانه يوهم الكذب اى بوقعه في الوهم اى الذهن حيثُ يخبر بالشيء ثُمَّ ينقصنه وذلك محالٌ على الله تعالى[1].

{وَ قِيلَ } فى التغير {يجوذ ان كان عن مستقبل} لجواز المحو لله فيما يقتدرهُ قال تعالى:﴿ يمحو الله مايشاء ويثبت ﴾ الاخبار يتبع بخلاف الخبر عن ماض وعلى هذا القولِ البيضاوي[2].

وَ قِيلَ يَجوزُ عن الماضي ايضاً لجواز ان يقول الله لبث نوح في قومه الف سنة ثُمَّ يقول لبث الف سنة الا خمسين عاماً وعلى هذا القولِ الامام الرازي و الآمدي وكانه سقط من مبيضة المصنِّف لفظة وَ قِيلَ بعد يَجوزُ المفيدُ ماقبلها حينئذٍ لحكايته[3].

---

(١) بەڵام سڕینەوەی مەدلولی هەواڵ نابێ و دروست نیە -بەڵام سڕینەوەی لەفظەکەی دروستە- هەرچەندە ئەو هەواڵە لەو هەواڵانە بێ گۆڕانکاری قەبووڵ بکا، چونکە ئەو سڕینەوەیە درۆ دەئاخنێتە ناخی مرۆڤەوە، چونکە لەشوێنێك هەواڵ لەبارەی شتێکەوە دەدا و پاشان هەر خودی خۆی بەدرۆی دەخاتەوە، ئەو درۆیەش ئەستەمەو مەحاڵە لەسەر خوای گەورە.

(٢) هەندێ وتوویانە سڕینەوەی هەواڵ لەوەدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، دروستە ئەگەر هەواڵەکە لەبارەی داهاتووەوە بێ، چونکە لەو ئەخشەدا خوا دەیکێشێ ڕەوایە بۆ کۆکرانەوەی هەر شتێك، ئەوەیە خوا دەفەرمووێ: ئەوەی خوا بیەوێ ئەیکوژێنێتەوەو ئەوەی بیەوێ ئەیهێڵێتەوە، هەواڵدانەکەشی شوێن کەوتەی سڕینەوەکەی خوا دەکەوێ، بەڵام هەواڵدان لەڕابووردوو جیاوازە، بیضاوی لەسەر ئەم بۆچوونەیە.

(٣) هەندێ وتوویانە: دووبارە سڕینەوەی هەواڵیش لەبارە ڕابووردووە دروستە، چونکە ئەگونجێ خوای گەورە بفەرمووێ: نوح هەزار ساڵ لەناو گەلەکەیدا مایەوە، پاشان بفەرمووێ: نوح هەزار ساڵ جگە لە پەنجای لەناو گەلەکەیدا مایەوە، پێشەوا ڕازیو ئامیدی لەسەر ئەم بۆچوونەن، وای بۆ دەچم لەپاك نوسەکەی دانەردا لەفظی (وقیل) لەدوای لەفظی(یجوز) وە کەوتبێ، ئەو کاتە پێش قیلەکە کە -مطلقی جەوازە- هەموو حیکایەتەکەی ئەگەیاند، واتە: حیکایەتی ئەو قەولەی کە ڕازی و ئامیدی پیشتگیریان کرد.

{ويَجوزُ النسخ ببدل اثقلَ}وقال بعض المعتزلة لا اذ لامصلحة في الانتقالِ من سهلٍ الى عسر قُلْنا: لا نسلم ذلك بعد تسلمِ رعاية المصلحة وقد وقع كنسخ التخيير بين صوم رمضانَ والفدية بتعين الصوم كما قال الله تعلى وعلى الذين يطيقونه فدية اخ [1].

{و} يَجوزُ النسخ {بلا بدلٍ} وقال بعضُ المعنرلة لا ادلا مصلحة فى ذلك قُلْنا: لانسلم ذلك {لكن لم يقع وفاقاً للشافعي} ﷺ[2] وَ قِيلَ وقع كنسخ وجوب تقدُّمَ الصدقة على مناجاة النبي ﷺ اذا ناجيتم الرَّسُول الخ اذ لابدل لوجوبه فرجع الامرُ الى ماكان قبله مما دل عليه الدليلُ العامّ من تحريم للفعل ان كان مضرة أو اباحة له ان كان منفعةً. قُلْنا لا نسلم ان لا بدلَ للوجوب بل بدلُه الجواز لصادق هنا بالاباحة والاستصحاب[3].

---

(١) دروستە سڕینەوەی حوکمی دەقێکو حوکمێکی گرانتر لەجێ‌دانرێ، هەندێ موعتەزیلە وتوویانە: ئەوە نابێ، چونکە هیچ بەرژەوەندیەك نیە لەگواستنەوەی حوکمێکی ئاسانەوە بەرەو حوکمێکی گران، ئێمەیش دەڵێن: داوای ئەوەی بۆتان بسەلمێنین کە دەبێ بەرژەوەندی لەبەرچاو بگیرێ دەبێ، بەلام ئەوە ناسەلمێنین کە ئەو ئالوگۆڕکردنە بەرژەوەندی تێدانیە، ، بێگومان ئەمە رووی‌داوە وەك سڕینەوەی خستنەدەست خۆ لەنێوان گرتنی رەمەزان و فیدیەکەیدا بەهۆی دیاریکردنی رۆژوەکەوە، بەئایەتی:﴿ فمن شهد منكم الشهرَ فليصمهُ ﴾ ئەم ئایەتە سڕایەوە کە دەفەرمووێ: لەسەر ئەوانەیە کە تواناى گرتنی رەمەزانیان هەیە فیدیەیەك .

(٢) دروستە سڕینەوەی شتێك هیچ شتێکی لەجێ دانەنرێ، هەندێ موعتەزیلە وتویانە ئەوەنابێ چونکە هیچ بەرژەوەندیەك لەوەدا نیە، ئێمە دەڵێن: ئەوە ناسەلمێنین کە هیچ بەرژەوەندێکی تێدا نەبێ، بەلام ئەوەندە هەیە ئەمە رووی نەداوە، پێشەوا شافیعیش هاوڕای ئەم بۆچوونەیە.

(٣) هەندێ وتوویانە: بێگومان کە ئەوە رویداوە، وەك: سڕینەوەی واجب بوونی پێش خستنی بەخشینی چاکەو صەدەقەیەك لەسەر گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ ، کە ئایەتەکە دەفەرمووێ: کاتێ ویستتان چپەو گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن...، دەی کەئەمە سڕاوەتەوە لەجێیدا هیچ شتێك دانەنراوە ، کەوابوو حوکمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ واجب بوونەکەی ئەچێتە ناو بازنەی حوکمی ئەوانەی بەڵگەی تایبەتیان نیە و ئەکەونە بەر بەڵگەی گشتی کە: ئەگەر زیانی بوو ئەو کارە حەرام دەکرێ و ئەگەر سودیشی بوو حەلاڵ دەکرێ، ئێمەیش دەڵێن: ئەوە ناسەلمێنین کە لەجێی ئەو وجوبەدا حوکمی‌تر دانەنراوە ، بەڵکو لەجێی ئەو واجبەدا حوکمی جەواز

{مسئلة النسخ واقعُ عند كل المسلمين} وخالفت اليهودُ غير العيسوية بعضهم في الجواز وبعضهم في الوقوع واعترف بهما العيسوية وهم اصحابُ ابى عيسى الاصفهاني المعترفون ببعثة نبينا عليه افضل الصلاة والسلام لكن الى بني اسميعل خاصة وهم العربُ[1]. {وسماه ابو مسلم} الاصفهاني من المعتزلة {تخصيصاً} لانه قصر للحكم على بعض الازمان فهو تخصيصٌ في الازمانِ كالتَخْصيص في الاشخاص[2] {فقيل خالف} في وجوده حيثُ لم يذكره باسمه المشهور {فالخلف} الذي حكاه الآمدي وغيره عنه من نفية وقوعه {لفظي}[3]..

---

دروست دانراوە –چونكە كە وجوب نەما جەواز دێتە جێ– ئەم جەوازی ئێردیەش ئیباحەو ئیستحباب ئەگرێتەوە، واتە لەكردنیدا سەرپشكی ، یاخود ئەگەر بیكەیت پاداشت هەیەو خۆشویستی دەهێنێ.

(١) ئەمەش بابەتێكە سڕینەوە بەڕای هەموو موسوڵمانان رویداوە، بەڵام جولەكە جگە لەتیمێكیان كە عیسەویە بڕوایان بە سڕینەوە نیە، هەندێكیان دەڵێن: ئەگونجێ سڕینەوە هەبێ، وەهەندێكیشیان ئەڵێن: هەر رویداوە، عیسەویەكانیان بڕوایان بەدروست سڕینەوە و رودانیشی هەیە، و ددانیشیان پێداناوەئەوانەش هاوڕێیانی ابی عیسای ئەصفەهانین كە بڕوایان كردووە بەناردن و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئێمە، بەڵام وتوویانە تەنها پێغەمبەرە بۆ وەچەكانی حەزرەتی ئیسماعیل، كە ئەوانیش بریتین لەعەرەب –قسەكەیان دژایەتی تێدایە، كەووتت پێغەمبەر پێغەمبەر نابێ درۆبكات ، ئەم ئەڵێ: من پێغەمبەرم بۆ هەموو جیهان نەك تەنها بۆ عەرەب– .

(٢) ابومسلمی ئەصفەهانی كە یەكێكە لە كەڵە زاناكانی موعتەزیلە سڕینەوەی ناوەناوە بەتەخصیص و تایبەت كردن، چونكە سڕینەوە دادورینی حوكمەكەیە بەسەر هەندێ كاتدا، كەوابوو سڕینەوە تایبەت كردنی حوكمێكە بەكاتێكەوە لەكاتەكاندا، وەك تەخصیص تایبەت كردنی حوكمەكەیە بەهەندێ كەسەوە لەناو خەڵكدا، سەرەنجام بەلای ئەصفەهانیەوە سڕینەوە هەیە، بەڵام ناوی ئەنێ بەتەخصیص و تایبەت كردن.

(٣) لەبەر ئەوەی كەبە تەخصیص ناوبردووە هەندێ وتوویانە: ئەصفەهانی سەرپێچی كردووە لەبوونی سڕینەوەدا بەناوە بەناوبانگەكەی خۆی ناوی نەبردووە، كەوابوو جیاوازیەك كە ئامێدی و غەیری ئەویش لێیان گەڕاندۆتەوە ئەوەیە كە گوایە ئەو هەر دەڵێ سڕینەوە نیە، ئەمە تەنها لەفظەكەیان لەیەك جیان و ماناكان و مەبەستەكەیان یەكێكە...

لما تقدَّمَ من تسمية تخصيصاً الذى فهمة المصنِّف عنه المتضمن لا عترافه به اذا لا يليق به انكاره كيف وشريعة نبيا ﷺ مخالفة في كثير لشريعة من قبله فهي عنده مغياة الى مجيء شريعته ﷺ وكذا كل منسوخٍ فيها مغيا عنده في علم الله تعالى الى ورود ناسخه كالمغيا في اللفظ فنشها من هنا تسمية النسخ تخصيصا وصح انه لم يخالف في وجوده أحد من المسلمين[1].

{والمختار ان نسخ حكم الاصل لا يبقي معه حكم الفرع} لانتفاء العلة التي ثبت بها بانتفاء حكم الاصل وقالت الحنفية يبقى لان القياس مظهر له لا مثبت وسلم في قوله: لا يبقى من التسمح في قول بعضهم نسخ لحكم الفرع[2].

(١) ..چونکە لەپێشەوە رابوورد کەئەو بەتەخصیص ناوزەدی کردبوو، کە دانەر ئاو لێ حاڵی بووبوو کەدان پیادانانی لەخۆگرتووە، چونکە شایستە ئەصفەهانی بڕوای بەسڕینەوە نەبێ، چۆن دەبێ خۆ ڕێبازو شەرعێك کە پێغەمبەری ئێمە هێناویەتی زۆربەی زۆر جیاوازە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەرانی پێش خۆی ، ئەو ڕێبازانە بەلای ئەصفەهانیەوە هەر مەبەستن و کاریان پێدەکرێ هەتا هاتنی ڕێبازی محمد پێغەمبەرﷺ، هەروەها هەموو سڕاوەیەکیتریش بەلای ئەوەوە هەر مەبەستە لەزانستی خوایە هەتا هاتنی ئەوەی کە سڕێنەرەوەیەتی وەك شتێك کە دەکرێ بەمەبەست لەشتێکدا هەر دەمێنێتەوە هەتا لەفظەکە دەوترێ، وەك: (سرتُ منَ البصرةِ الى الكوفة) هەر دەمێنێتەوە هەتا دەگا (الى البصرة) ، لێرەدا لەمەوە ناونانی سڕینەوە بەتەخصیص و تایبەت کردن سەری هەڵداوە، وەڕاستیش کراوە کە وتراوە: کەس سەرپێچی نەکردووە لەناو موسوڵمانان‌دا لەبارەی بوونی سڕینەوە.

(٢) رای هەڵبژاردە ئەوەیە کە سڕینەوەی حوکمی ئەصڵکە حوکمی فەرعەکەی لەگەڵدا نامێنێتەوە ، لەبەر نەمانی ئەو عیللەتە کە حوکمی ئەصڵەکەی پێ‌ثابت بوو، ئەویش کەنەماوە بەهۆی نەمانی حوکمی ئەصڵەوە، بەلام زانا حەنەفیەکان دەڵێن: حوکمی فەرعەکە هەر دەمێنێتەوە، چونکە قیاس حوکمی فەرعەکەی دەرخستووە و کەشف کردووە نەك اثباتکەری بێ، ئێستە تەنها مظهرەکەی فەوتاوە. دانەر کە (لایبقی معه)ی ووت رزگاری بوو لەو مەجازەی کە لە قەولی هەندێکیاندا هەیە و ئەڵێ: ( نسخُ الحكم الفرع ) چونکە سڕینەوەی حوکمی ئەصڵ سڕینەوە نیە بۆ حوکمی فەرع ، ئەگەر ئەمە بوترێ ئەوە مەجازە.

{و} المختار {أن كل حكم شرعي يقبل النسخ} فيَجوزُ نسخ كل الاحكام وبعضها اي بعض كان[1]. {ومنع الغزالي} كالمعتزلة {نسخ جميع التكاليف} لتوقف العلم بذلك المقصود منه بتقدير وقوعه على معرفة النسخ والناسخ وهي من التكاليف ولا يتأتي نسخها قُلْنا مسلم ذلك لكن بحصولها ينتهي التكليف بها فيصدق انه لم يبق تكليف وهو القصد بنسخ جميع التكاليف فلا نزاع في المعنى[2] {و} منعت {المعزلة نسخ وجوب المعرفة} اي معرفة الله لانها عندهم حسنة لذاتها لا تتغير بتغير الزمان فلا يقبل حكمها النسخ قُلْنا الحسن الذاتي باطل[3] {والاجماع على عدم الوقوع} لما ذكر من نسخ جميع التكاليف ووجوب المعرفة[4].

---

(١) قەولی هەڵبژادە ئەوەیە کە هەرچی حوکم هەیە لە شەرع وەرگیراوە قەبوڵی سڕینەوە دەکات، کەوابوو دروستە سڕینەوەی هەمو جۆرە حوکمێک ، وەدروستە هەندێکیشیان ئیتر هەرکامیان بێ.

(٢) بەڵام غەزالی وەك موعتەزیلەکان قەدەغەی سڕینەوەی هەموو تەکلیفەکانی کردووە، چونکە زانینی سڕینەوەی ئەو هەموو تەکلیفانە کە بەدیاری کردنی روودانی ئەو سڕینەوەیە قەصد دەکرێ، ئەم زانینە بەسراوە بەزانینی و ناسینی سڕاوەکەو سڕێنەرەوەکە، کەچی ئەو ناسینە خۆی یەکێکە لەتەکلیفەکان و سڕینەوەی نابێت، ئێمەیش دەڵێین: سڕینەوەی ئەو عیلم و زانینە سەلمێنراوە بەڵام هەر ئەوەندەی ئەو زانین و ناسینە پەیدا بوو ئیتر تەکلیف پێی کۆتایی دێت – هەر ئەدای نوێژی عەسرت کرد لەسەرت نامێنێو دەسڕێتەوە– کەوابوو راستە کە دەوترێ تەکلیف نەماوە، هەر ئەوەندەش مەبەستە کە دەوترێ: هەموو تەکلیفێك سڕینەوەی دروستە ، بەم شێوە هیچ کێشەیەك لەماناو مەبەستدا نیە.–هەمووی لەدارشتنەکەدایە–

(٣) موعتەزیلە واجبێك کە ناسینی خوایە سڕینەوەی ئەم واجبەیان قەدەغە کردووە، چونکە ناسینی خوا بەلای ئەوانەوە حسنێکی زاتی هەیە، شتێکیش جوانیەکی زاتی هەبێ بەهۆی گۆڕانی زەمانەوە گۆڕانکاری بەسەردا نایە کە وابوو حوکمەکەی قەبووڵ سڕینەوە ناکات. ئێمەیش دەڵێین: حسنی زاتی بەتاڵە، واتە شتێك نیە بێفەرمانی خوا تۆڵەو پاداشت بهێنێ بەشوێن خۆیدا، بەڵام حسنی طبیعیو سروشتی هەیە.

(٤) ئیجماع لەسەر ئەوەیە کەئەوەی باسکرا رووی نەداوە، واتە: سڕینەوەی هەموو تەکلیفەکان و واجب بوونی ناسینی خوا نەسڕاوەتەوەو نەبووە.

{والمختار ان الناسخ قبل تبليغه ﷺ الأمة لا يثبت في حقهم} لعدم علمهم به[1].

{وَ قِيلَ يثبت بمعنى الاستقرار في الذمة لا} بمعنى {الامتثال} كالنائم وقت الصلاة وبعد التبليغ يثبت في حق من بلغه ومن لم يبلغه ممن تكن من علمه فان لم يتمكن فعلى الخلاف[2]. {اما الزيادة على النص} كزيادة ركعة او ركوع اوصفة في رقبة الكفارة كالايمان اوجلدات في جلد حد {فليست بنسخ} للمزيد عليه {خلافاً للحنفية} في قولهم انها نسخ[3]. {ومثارة} اي المحل الذي ثار منه الخلاف ما يُقالُ {هل رفعتِ} الزيادة حكما شرعيا فعندنا لا فليست بنسخٍ وعندهم: نعم نظرا الى ان الامر بما دونها اقتضى تركها فهي رافعة لذلك المقتضى[4].

---

(١) قەولی هەڵبژاردە ئەوەیە کە دەقێکی سڕینەرەوە پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ بە ئوممەتەکەی بیگەیەنێ ثابت نابێ، لەحەقیاندا چونکەنایزانن و ئاشنا نین بەو سڕینەرەوە.

(٢) هەندێك وتوویانە ئەو سڕینەرەوە پێش گەیاندی ثابت ئەبێ لەسەریان ، بەم مانایە کەئەکەوێتە ئەستۆیان نەك بەم مانا جێبەجێ کردنی فەرمانەکە، بۆ وێنە کەسێك لەکاتی نوێژێکدا خەوتبێ، نوێژەکە ئەکەوێتە ئەستۆی بەڵام واجب نیە لەسەری ، بەڵکو واجبە لەسەری هەرکات بەخەبەر هاتوە قەزای بکاتەوە، دوای پێڕاگەیاندنی واجب ئەبێ لەسەر کەسێ بەیانەکەی پێگەیوە هەروەها کەسێکیش پێنەگەیبێ، بەڵام ئەبێ لەوانەبێ بگونجێ بۆیو توانای زانینی ئەو بەیانەی هەبێ، وەئەگەر توانای ئەوەی نەبێ فێری ئەو سڕینەرەوە بێ ئەوە ئەو جیاوازیەی تێدایە کە لەمەتنەکەدا باسکرا. (أن الناسخ قبل...).

(٣) بەڵام زیادکردنی شتێك لەسەر دەقەکە ، وەك زیادکردنی رکاتێ نوێژ یاخود زیادکردنی رکوعێك، یاخود وەك زیادکردنی صیفەتێك لەبەندەییەکدا بدرێت لەکەفارەتی سوێن، ئەو زیادەش وەك ئەوەبێ ئەو بەندە بڕوادار بێ، یاخود چەند جەڵدەییەك زیادبکرێ لەجەڵدەی کەسێکدا کەژمارەکانی دیاری کرابێت، ئەو زیادەیە نابێتە هۆی سڕینەوەی زیاد بەسەردا کراوەکەدا، زانا حەنەفیەکان جیاوازیان هەیە کە دەڵێن: ئەو زیادەیە سڕینەوەیە بۆ زیاد بەسەرکراوەکە.

(٤) ئەو شوێنەی ئەو جیاوازیەی نێوان زانایانی تێدا پەیدا بووە، ئەوە کەئەوترێ: ئایا زیادەکە حوکمە شەرعیەکەی لابردووە؟ بەلای ئێمەوە نەخێر ئەو زیادەیە سڕینەرەوەی خوار خۆی نیە، بەڵام بەلای حەنەفیەکانەوە: بەڵێ دەیسڕێتەوە، سەیرو سەرنجی ئەوە دراوە کە فەرمان بەئەنجامدانی خوارەوەی ئەو زیادە داخوازی تەرك

قُلنا: لا نسلم اقتضاءه تركها والمقتضى للترك غيره وبنوا على ذلك انه لا يعمل باخبار الآحاد في زيادتها على القُرآن كزيادة التغريب على الجلد الثابتة بحديث الصحيحين[1] البكر بالبكر جلد مائة وتغريب عام وزيادة اعتبار الشاهد واليمين على الرجلين والرجل والمرأتين الثابتة بحديث مسلم وابي داود وغيره انه ﷺ قضى بالشاهد واليمين بناء على أن المتواتر لا ينسخ بالآحاد[2].

{والى المأخذ} المذكور {عود الاقوال المفصلة والفروع المبينة} اي التي بينها العلماء حاكمين أن الزيادة فيها نسخ اولا[3].

---

کردنی ئەو زیادە دەکا، سەرئەنجام ئەو زیادەیە لابەری ئەوەیە ئەمرەکە داوای تەرکی کرد –کە فەرمووی هەشتا دار داوای تەرکی زیاد لەهەشتا دەکا و حەرامی ئەکا، بەڵام زیادە هاتەسەر هەشتاکە زیادە حەرامەکە لادەبا –.

(١) ئێمەیش دەڵێین: ئەوە ناسەلمێنین کە خودی ئەمر بەهەشتا دارەکە داوای تەرکی زیاد لەهەشتا بکات، ئەوەی داوای وازهێنان ئەکا لەهەشتا دار زیاتر نەبن، ئەوە شتێکی‌تر ئەوە دەخوازێ نەك خودی ئەو ئەمرە. زانایانی حەنەفی لەسەر ئەو بۆچوونە ئەمەیان دروست کردووە، کە ئەڵێ: کار بەو زیادەیە ناکرێ، کە لە فەرموودەی ئاحاد دا هاتووە، لەسەر ئەندازەی قورئانەکە زیاترە، وەك لە فەرموودەکەدا بۆ ماوی ساڵێك جەڵد لێدراوەکە ئەبێ نەفی بکرێ، ئەو فەرموودەیە ثابت بوو لەبوخاری‌و موسلیمدا کە دەفەرمووێ:

(٢) دەفەرمووێ: کوڕ ئەگەر زینای کرد لەگەڵ کچدا ئەوە سەد داری لێ‌ئەدرێ وە یەك ساڵێش نەفی دەکرێ، ساڵەکە زیادەیە لەقورئاندا شاهید یائەبێ دوو پیاو بن یاخود پیاو ژنێك ، کەچی لە فەرموودەکەدا ئیعتیباریش کراوە بەشاهیدێك و سوێنێك ، ئەم فەرموودەش ثابت بوو لای موسلیم و ئەبو داود و غەیری ئەویش کە پێغەمبەر ﷺ حوکمی کردووە بەشاهیدێك و سوێنێك، ئەمەیان زیادەیە بۆیە زانایانی حەنەفی ئیعتیباریان بەو زیادەیە نەکردووە ، کە لە ئەندازەی قورئانەکە چووەتەدەر، چونکە متواتر کە قورئانەکەیە بە فەرموودەی ئاحاد ناسڕێتەوە .

(٣) چەندەها قەول هەن کە بەدرێژی باسکراون وە چەندەها فەرعیش هەن کە زانایان روونیان کردۆتەوە، هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی پێشوو کەجێ جیاوازی نێو زانایان بوو، –واتە: هل رفعت الزيادة حكماً شرعياً– ئەو زانایانە رای خۆیان دەربڕیوە ئایا ئەو زیادەیە لەفەرمانەکەدا سڕاوەتەوە یاخود نەسڕاوەتەوە.

منها ماتقدم من زيادة التغريب والشاهد والميين ومن الاقوال المفصلة ان الزيادة ان غيرت المزيد عليه بحيث لواقصر عليه وجب ائتنافه كزيادة ركعة في المغرب مثلاً فهي نسخ و إلاّ كزيادة التغريب في حد الزنا فلا ومنها ان الزيادة ان اتصلت بالمزيد عليه اتصال اتحاد كزيادة ركعتين في الصبح فهي نسخ والا كزيادة عشرين جلدة في حد القذف فلا[1].

{وكذا الخلاف في} نقص {جزء العبادة او شرطها} كنقص ركعة او نقص الوضوء هل نسخ لها فقيل نعم الى ذلك الناقص لجوازه اووجوبه بعد تحرمه وقال الجمهور من الشافعية لا والنسخ للجز او الشرط فقط لانه الذي يترك[2].

---

(١) يەكێك لەو فەرمانە ئەوەی پێشەوەیە كە ساڵێك نەفی وەرگرتنی شاهێدو سوێنێك، هەندێكیش لەو قەولانەی كەدرێژەیان پێداوە و جیایان كردوەتەوە ، ئەوەیە كە ئەو زیادەی بەسەر دەقەكەوەیە، ئەگەر گۆڕانكاری بەسەر زیاد بەسەركراوەكەدا دەهێنا، بەم شێوە ئەگەر تەنها زید بۆكراوەكە بكرێ واجب ببێ هەر لە ئەوەڵەوە بكرێتەوە، وەك زیادبوونی ركاتێ بۆ مەغریب، ئەوە ئەو زیادەیە سڕاوەتەوە -نوێژی مەغریب بكرێ بەپێنج ركات ئەم تەنها سیانیان بكات- دوایی بیەوێ تەواوی بكات ، ئەوە ئەبێ لەئەوەڵەوە دەست پێ‌بكاتەوە. وەئەگەر ئەو زیادەیە گۆڕانكاری بەسەر زیاكراوەكەدا نەئەهێنا، وەك زیادركدنی ساڵێك لەنەفی لەتۆڵەی زینادا ، ئەو زیادەیە نەسخ نیە واجب نیە وەك پێشو لەئەوەڵەوە صەد دارەكەی لێ‌بداتەوە، یەكێكی‌تر لەو قەولانە ئەوەیە كە ئەو زیادەیە لەگەڵ بەسەر زیادكراوەكەدا وا بەیەكەوە نوسابن بووبن بەیەك، وەك زیادبوونی دوو ركات لەنوێژی بەیانی‌دا، ئەوە ئەو زیادەیە نەسخە وەئەگەر وانەبن وەك یەكیان لێ‌نەهاتبێ ئەوە نەسخ نیە، وەك زیادكرنی لەبیست دار لەتۆڵەی تاوانی شەرەف شكاندندا كە خۆی هەشتا دارە.

(٢) هەروەكوو ئەوەی پێشوو جیاوازی هەیە لەناو زانایاندا لەعیبادەتێكدا بەشێكی كەم یاخود مەرجێكی نەبێ، ، وەك ركاتێ لەنوێژەكەی كەم بێ یاخود دەستنوێژی نەبێ، ئایا ئەو كەمیە سڕینەوەی عیبادەتەكەیە؟ لەوەڵامدا: هەندێ دەڵێن: بەڵێن نەسخی عیبادەتەكەیە، ئەو عیبادەتە تا دەگاتە لای ئەو نوقصانە نەسخ، چونكە تا كو ئێستا واجب بووە هەر بەچوار ركاتی بیكا، یاخود بەسوننەتی بیكا،بەڵام دوای نەسخەكەی حەرامە كردنەكەی، جمهوری زانایانی شافیعی وتوویانە: ئەو عیبادەتە ناسڕێتەوە، سڕینەوەكە تەنها روو لەو بەشە دەكا یاخود لەو مەرجە، چونكە هەر ئەوە وازی لێ‌دەهێنرێ .

وَ قيلَ نقص الجـزء نسـخ بخـلاف نقـص الشـرط ولا فـرق بـين متصلـه ومنفصلـه كالاستقبال والوضوء وَ قيلَ نقص المنفصل ليس بنسخ اتفاقاً[1].

{خاتمة للنسخ} {يتعين الناسخ} للشيء {بتـأخره} عنـهُ {وطريـق العلـم بتـأخره الإجماع} بأن يجمعوا على انه متأخر لما قام عندهم على تـأخرّه {او قولـه ﷺ هـذا ناسخ} لذلك {او} هذا {بعـد ذلـك او كنـت نـهيت عـن كـذا فـافعلوه} كحديـث مسـلم كنت نـهيتكم عـن زيـارة القبـور فزوروهـا[2]. {اوالنـص علـى خـلاف الأول} اي ان يذكـر الشـيء علـى خـلاف مـاذكره فيـه اولا {او قـول الـراوي هـذا سـابق} علـى ذلـك فيكـون ذلك متأخرا[3].

(١) هـەندێکیش وتوویانـە: نوقصـانی بەشـێك لـەعیبادەت سـڕینەوەیەتی، بـەڵام نوقصانی مـەرجی عیبـادەت جیـاوازەو نەسـخی ناکاتـەوە، ئیتر چ مەرجەکـە مـەرجێك بێ لەعیبادەتەکە دا بکرێ، وەك روو لەقیبلە کردن، یاخودئەو مەرجە لـەدەرەوەی ئـەو عیبادەتەکە ئەنجام بدرێ، وەك دەستنوێژ ، هەندێکیش وتوویانە: نوقصانی مەرجێك لـەدەرەوەی عیبادەتەکـەوە ئـەنجام بـدرێ، ئەوەیـە بـەڕای هـەموویان ئـەو عیبادەتـە نەسخ نیە.

کۆتایی باسی سڕینەوە

(٢) سـڕینەوەی شـتێك دەزانـرێو دیـاری دەکـرێ بـەهۆی بـەدوادا هـاتنی ئـەو سـڕێنەرەوە بەشـوێن سـڕاوەکەدا، ڕێ و ڕێبـازی زانینـی پـاش و پێشـیان ئیجماعـە و رای کـۆی هـەموو زانایـان بـەم شـێوە هـەموویان کۆبـن و یـەك دەنـگ بـن کـە ئـەو سـڕێنەرەوە لـەپاش سڕاوەکەوە هـاتووە، لەبـەر ئـەو بەڵگـەی بـەلای هەموویانـەوە قـەبوولْ بـووە بەبەڵگـەی لەسـەر بـەدوادا هـاتنی سـڕێنەرەوەکە ، دووەم: یـاخود پێغەمبەرﷺ بفەرموێ: ئەمە سڕێنەرەوەی ئەوەیە، سێهەم: یاخود ئەمـە پـاش ئـەوە هـاتووە، چوارەم: یـاخود بفـەرموێ: مـن قەدەغـەم کردبـوون لـەو شـتە ئێسـتە بـڕۆن بیکەن وەك ئەم فەرموودەیە: من لەمـەوپێش قەدەغـەم کردبوون لە زیـارەتی گۆڕسـتان ئێستە بڕۆن زیارەتی بکەن.

(٣) پێنجەم: یاخود دەق هـەبێ دەلالـەت بکا لەسـەر حوکمێك جیاوازی لەیەکـەمدا، واتە: شارع شتێك باس بکا پێچەوانە ئەوەبێ، کە یەکەمجار باسیکردووە، شەشـەم: یـاخود ریوایـەت کـەری دەقەکە بڵـێ: ئەمـەیان پێش ئـەوەیان کـەوتووە، ئیتر ئـەوەیان بەپاشکۆ و دواکەوتووی ئەو دەژمێرێ.

{ولا اقر لموافقة احد النصين للاصل} اي البراءة الاصلية ي أن يكون متاخرا عن المخالف لها خلافاً لمن زعم ذلك نظرا الى ان الاصل مخالفة الشرع لها فيكون المخالف هو السابق على الموافق قُلنا لا يلزم ذلك الجواز العكس[1]. {وثبوت احدى الآيتين في المصحف} بعدَ الاخرى اي لا اثر له في تاخر نزولها خلافاً لمن زعمه نظرا الى ان الاصل موافقة الوضع للنزول قُلنا لكنه غير لازم لجواز المخالفة كما تقدَّمَ في آيتي عدة الوفاة[2]. {وتأخر اسلام الراوي} اي لا اثر له في تاخر مرويه عما رواه متقدم الاسلام عليه خلافاً لمن زعم ذلك نظرا الى انه الظاهر.قُلنا لكنه على تقدير تسلميه غير لازم لجواز العكس[3].

---

(١) هەماهەنگی یەکێك لەدەقەکان بۆ ئەصڵەکەی هیچ شوێنەوارو جێدەستێکی نیە بۆ ئەوەی بەهێزی بکا، واتە: ئەستۆ پاکی ئەصڵەکە لەهەموو شتێکدا، چونکە دەق دەبێ لەدواوە بێ و پێچەوانەی ئەصڵ بێ کە ئەستۆپاکیە، ئەم بۆچوونە پێچەوانەی ئەو کەسەیە وادەزانێ هەماهەنگی یەکێك لەدەقەکان بۆ ئەصڵەکە لای قورس و گرانتر دەکا، چونکە لەو سەیرو سەرنجی داوە کە: -ئەصڵ ئەوەیە هەموو کات شەرع پێچەوانەی ئەستۆپاکیە-واتە پێش دابەزینی دەقەکە حەرام بووە و ئێستە ئەبێ حەڵاڵ بێ، کەوابوو دەبێ مخالیف هەموو کات پێش موافق و هەماهەنگ بێ، ئێمەیش دەڵێن: ئەوە لازم ناکاو مەرج نیە وابێ چونکە پێچەوانەکەشی دروستە، پێش (کلوا واشربوا) خواردن و خواردنەوە مەباح بووە، ئێستەش هەر وایە.

(٢) بوونی ئایەتێك لەلاپەڕیەکدا و ئایەتەکەیتر لەلاپەڕەیەکیتردا بێ لەدواوە ئەوە نیشانەی ئەوە نیە ئەم ئایەتە لەدواوە دابەزیوە، پێچەوانەی بۆچوونی ئەوەی وای ووتوە، چونکە بیری لەوەکردۆتەوە ئەصڵ ئەوە نیە، حاڵ و ئایەت هەماهەنگی یەك بن، ئێمەیش دەڵێین: ئەوە ببێ چاکە بەڵام لازم ناکات ، چونکە دەبێ پێچەوانەی ئەو بۆچوونەش بێ، وەك لەپێشەوە رابوورد، لەو دوو ئایەتەدا کە باسی عیدەی ئافرەت دەکا بۆ مێردی مردووی -چوار مانگ و دەرۆژ کە لە دابەزیندا ها لەپێشووەو حوکمیش بەو دەکرێ-.

(٣) دواکەوتنی موسوڵمان بوونی ، ریواتکەرەکە هیچ نیشانەیەك نیە بۆ ئەوەی ئەوەش کەریوایەتی کردووە لەدوای ریوایەتی ئەو کەسەوە کە موسوڵمان بوونەکەی پێش ئەو کەوتووە، پێچەوانەی بۆچوونی ئەو کەسەی وای وتووە، چونکە سەیری ئەوەی کردووە بەرواڵەت وادەبێ، ئێمەیش دەڵێین: رواڵەتەکەی وانیە، بەڵام گریمان

{وقوله} اي الراوي {هذا ناسخ} اي لا اثر لقوله في ثبوت النسخ به خلافاً لمن زعمه نظرا الى انه لعدالته لا يقول ذلك إلاّ اذا ثبت عنده قُلنا ثبوته عنده يَجوزُ ان يكون باجتهاد لا يوافق عليه[1] {لا الناسخ} اي لا قول الراوي هذا الناسخ لما علم انه منسوخ ولم يعلم ناسخه فان له اثر في تعيين الناسخ[2] {خلافاً لزاعميها} اي زاعمي الآثار لما عدا الأخير وقد تقدَّمَ بيان ذلك[3].

{الكتاب الثاني في السنة}

{وهي اقوال محمد ﷺ وافعاله} ومنها تقريره لانه كف عن الانكار واكلف فعل كما تقدَّمَ وقد تقدَّمَ مباحث الاوقال التي تشرك السُّنَة فيها الكتاب من الامر والنهي وغيرهما والكلام هنا في غير ذلك[4].

---

ئەگەر وایش دانێین وایە هەر لازم ناکا مادەم موسوڵمان بوونەکەی دواکەوتووە دەبێ ریوایەتەکەشی لەدواوە بێ، چونکە دروستە پێچەوانەکەش بێ.

(١) ریوایەتکەر دەڵێ: ئەمە سڕینەرەوەی ئەوەیە ، ئەم قسە نیشانەی ئەوەنیە سڕینەوە بەو قسەی ئەوە دەبێ، پێچەوانەی ئەوەی وای وتووە، چونکە سەیری ئەوەی کردوە ریوایەتکرەرەکەی‌ی دەق دەبێ عادڵ بێ، عادڵیش ئەوە ناڵێ هەتا لای بێگومان و ثابت نەبێ، ئێمەیش دەڵێین: ثابت بوونی ئەو قسەیە بەلای ئەوەوە ئەگونجێ‌بەهۆی ئیجتیهادی خۆیەوە بووبێ نەك بەهۆی دەقێکەوە، وە ئیجتیهادیش موافقە ناکرێ لەسەری.

(٢) بەلام ئەوە جیایە ریوایەتکەر بڵێ: ئائەمەیە سڕینەرەوەکە بۆ ئەو شتەی کە زانراوە سڕاوەتەوە، بەلام سڕینەرەوەکەی نەزانراوە ، دەئەوە بۆ دیاری کردنی سڕینەرەوەکە جێ‌دەستێکی هەیە و نیشانەیەتی.

(٣)بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوانەی وادەزانن ئەمانەی باسکران نیشانەی دواکەوتنیەتی، جگە لەقسەی ئەخیر کە(لاالناسخ) بوو.لەپێشەوە ئەوەشمان روونکردەوە.

کیتابی دووەم لەبارەی فەرموودەوەیە

(٤) بەشی دووەم لە بارەی فەرموودەوەیە: فەرموودە بریتیە لە هەر گوفتار و رەفتارێکی محمد پێغەمبەرﷺ، هەر سەر بەرەفتاریەتی بێ‌دەنگی بوونی لە ئیشێك، چونکە ئەوەش وازهێنانە لە دەربڕینی نارەزایی ، خۆ لە پێشەوەش رابوورد کە وازهێنان لە رەفتارو کارە ، لە پێشەوە رابوورد ئەو باسانەی فەرموودە شەریکی وهاریکاری قورئان دەکا تیایاندا، وەك ئەمرو نەهی...، گفتوگۆی ئێرەمان شتێکی‌ترە

ولتوقف حجة السُنّة على عصمة النبيِّ ﷺ بدأ بها ذكراً جميع الأنبياء لزيادة الفائدة فقال[١]: {الأنبياء عليهم الصلاة والسلام معصومون لا يصدر عنهم ذنب ولو صغيرة سهوا} اي لا يصدر عنهم ذنب اصلا لاكبيرة ولا صغيرة لا عمدا ولا سهوا[٢].

{وفاقا للاستاذ} ابي اسحق الاسفرايني {و} ابي الفتح {الشهرستاني و} القاضي {عياض والشيخ الامام} والد المصنّف لكرامتهم على الله تعالى عن أن يصدر عنهم ذنب والأكثر على جواز صدور الصغيرة عنهم سهوا إلاّ الدالة على الحسنة كسرقة لقمة والتطفيف بتمرة واينبهون عليها وتفرع على عصمة نبينا ﷺ منهم ماذكره بقوله[٣].

---

وەك ئەو نیە وەك ئەوەی فەرمووده حجه و بەڵگەیە.

(١) لەبەر ئەوەی فەرمووده دەوەستێ نابێتە بەڵگە هەتا عیصمەت و پارێزراوی پێغەمبەرﷺ دەسەلمێنرێ، لەبەر ئەوە دانەر سەرەتای ئەم باسە دەست دەکا بەباسی عیصمەت و پارێزراوی پێغەمبەرﷺ ، نەك هەر باسی پێغەمبەری خۆمان بەڵکوو باسی هەموو پێغەمبەران دەکا بۆ ئەوەی سوود زیاتر بگەیەنێ لەبەر ئەوە دانەر ووتی:

(٢) پێغەمبەران درودی خوایان لەسەر بێ هەموویان لەلایەن خواوە پارێزراون و نایەڵێ گوناهیان لێوە دەرچێ، باگوناهی بچوکیش بێ و بەسەهوو بێ، واتە گوناه بەهیچ جۆرێك لێیان ناوەشێتەوە، نەگەورەو نەبچوك، وەنەبەدەست ئەنقەست و نەبەسەهوو،

(٣) مامۆستا ئەسفەرایینی و شەهرستانی و قاضی عیاض هام دەنگمانن لەگەڵ مامۆستا پێشەوا دا کە باوکی دانەرە ، چونکە رێزی پێغەمبەران لەسەر خوایە ، دەبێ دوریان بخاتەوە لەوە کە گوناهیان لێ بوەشێتەوە مرۆڤی گوناهکار رێزدار نیە ، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن: کە دروستە بەسەهوو گوناهی بچوکیان لێ بوەشێتەوە ، مەگەر گوناهێك نەبێ کە بەڵگە بێ لەسەر پەستی و نزمی خاوەنەکەی ، وەك دزیینی تیکە نانێك ، یا لە کێشانە و پێوانەی خورمادا خورمایەك بدزێ ، گریمان ئەگەر گوناهی بچوکیشیان کرد بێ یەکسەر ئاگادارکراون لەسەری، لەسەر باسی عیصمەتی پێغەمبەرمانﷺ دانەر باسێکیتری لەسەر کردوە کە پێغەمبەر یەکێکە لەو پێغەمبەرانەو باسەکەی بەم شێوەی خوارەوە باس کردوە:

{فاذن لا يقر محمد ﷺ احد على باطل وسكونته ولو غير مستبشر على الفعل} بان علم به {مطلق وَ قيلَ الافعل من يغرية الانكار} بناء على سقوط الانكار عليه[1].

{وَ قيلَ إلاّ الكافر} بناء على انه غير مكلف بالفروع {ولو} كان {منافقا} لانه كافر في الباطن[2] {وَ قيلَ إلاّ الكافر غير المنافق} لان المنافق يجرى عليه احكام المسلمين في الظاهر[3]

{دليل الجواز للفاعل} اي رفع الحرج عنه لان سكوته ﷺ على الفعل تقرير له {وكذاالغيره} اي غير الفاعل[4]. {خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني قال لانَّ السكوت ليس بخطاب حتى يعمَّ و أُجيبَ بانه كالخطاب فيعمُّ[5].

---

(١) کەوابوو پێغەمبەرﷺ هیچ کەسێ لەسەر بێفەرمانیو باطل مۆڵەت نادات و تەثبیت ناکات، بێدەنگی پێغەمبەر (بەڵگەی دروستی کارەکەیە) لەسەر کارێك بادڵیشی پێخۆش نەبێ، بەم شێوە پێی زانیبێ قسەی نەکردبێ، ئیتر کارەکە موسوڵمان کردبێتی یاخود ناموسوڵمان ، هەندێك ووتویانە مەگەر کاروکردەوەی کەسێك نەبێت ئەگەر نا رەزایی بۆ دەربڕی زیاتری دەبێتە هاندەریو گرئەگرێ لەسەر خراپەکەی ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەرﷺ نارەزایی دەربڕینی بۆ ئەو جۆرە کەسانە لەسەر نییە –قەولی راست پێچەوانەکەیەتی–

(٢) هەندێك ووتویانە: مەگەر کافر بێ بەڵگەش لەسەر بێدەنگی پێغەمبەر لەسەر کاری کافر ئەوەیە کافر تەکلیفی لەسەر واجباتی موسوڵمانی لێناکرێ، با ئەو کافرەش دووڕوو بێ چونکە دوو ڕوو لەناوەوەیدا کافرە.

(٣) هەندێك ووتویانە: کافرێك دووڕوو نەبێ بێدەنگی پێغەمبەرﷺ لەسەر رەفتاری دروستە، چونکە دووڕوو لەڕواڵەت دا یاسای موسوڵمانانی لەسەر جێبەجێ دەکرێ.

(٤) بێدەنگی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەمانەی کەوتمان بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەو کارە ، بۆ بکەرەکەو بۆ غەیری ئەویش، واتە: سەرزەنشت ناکرێن لەسەر ئەو رەفتارە ، چونکە بێدەنگی پێغەمبەرﷺ لەسەر هەر کارێك جێگیرکردنی ئەو کارەیەو مۆڵەتپێدانی مانەوەیەتی.

(٥) باقلانی جیاوازە بۆ ئەم بۆچونەیە ، چونکە دەڵێ بێدەنگی گوتارو خیطاب نیە، هەتا هەمە گیرو گشتگیر بێ –چونکە گشتگیری بۆ لەفظ ئەبێو تایبەتی ئەوە–وەڵام دراوەتەوە کە بێدەنگی وەکوو گوتارو خیطاب و لەفظ وایە، کەوابوو وەکو لەفظ گشتگیرە .

{وفعله} ﷺ {غير محرم للعصمة وغير مكروه للندرة} بضم النون بضبط المصنِّف اي لندرة وقوع المكروه من التقي من امته فكيف منه وخلاف الاولى مثل المكروه او مندرج فيه[١] {وما كان} من افعاله {جبليا} كالقيام والقعود والأكل والشرب {او بيانا} كقطعه السارق من الكوع بينا لمحل القطع في آية السرقة قال المصنِّف روى باسناد حسن انه ﷺ قطع سارقا من المفصل[٢] {او مخصصا به} كزيادته في النكاح على لربع نسوة {فواضح} أن البيان دليل في حقنا وغيره لسنا متعبِّدين به[٣].

{وفما تردد}من فعله {بين الجبِلي والشرعي كالحج راكباتردد} ناشئ من القوالين في تعارض الأصل والظاهر يحتمل ان يلحق بالجبلي لأن الأصل عدم التشريع فلا يستحب لنا ويحتمل ان يلحق بالشرعي لأن النبيٍّ ﷺ بعث لبيان الشرعيات فيستحب لنا [٤].

---

(١) کارو کردەوەی پێغەمبەرﷺ هیچێکی حەرام نیەو نەکراوە ، چونکە پێغەمبەرﷺ پارێزراوە لەلایەن خواوە، هیچ کارێکی پێغەمبەر مەکروهـ نیە واتە: لەهیچ کەسێکی تەقواداری ئۆمەتەکەوە زۆر بەکەمی مەکروهی لێدەوەشێتەوە، ئەی چۆن لە پێغەمبەرەوە روو دەدات ، خلاف الاولى یش (پێچەوانەی چاکتر) وەکوو مەکروهـ وایە یاخود مەکروهـ دەیگرێتەوە

(٢) ئەوەی لەکارە کردەوەی پێغەمبەرﷺ کەسروشتی بێ وەك وەستان و دانیشتن و خواردن و خواردنەوەی، یاخود ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ روونکەرەوەی دەقی قورئان بێ، وەك ئەوەی دەستی دزێك لەجومشك دا ببڕێتەوە ئەوە روونکەرەوەی شوێنی بڕینەکەیە لەو ئایەتەدا کەباسی حوکمی دز دەکا، -چونکە وشەی دەست لەسەری پەنجەوە دەیگرێتەوە هەتا سەرشان-دانەر وتویەتی: بەئیسنادێکی حەسەن ریوایەتکراوە کەپێغەمبەرﷺ دەستی دزێکی لەجومشك و شوێنی جیابوونەوەدا بڕی.

(٣) یاخود کارێك کە هەر تایبەت کراوە بە پێغەمبەرەوەﷺ وەك ئەوەی بۆی هەبووە زیاتر لە چوار ئافرەت مارە بکات، ئەمانە هەموویان شتێکی روونە حوکمەکەیان، ئەوەی بۆ بەیان بێ بەڵگەیە بۆ کاری ئێمە، بەڵام ئەوانیتر ئێمە لێیان بەرپرس نین و بەندایەتی ئێمە بەوانە ناکرێت.

(٤) بەڵام ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ کە ها لەنێوان کاری سروشتیو کاری شەرعیدا ، ئەشبێ بۆ هەردوکیان ، وەك حەجکردن بەسواری ووشتر، ئەوە تەرەدودی تێدایە، کە ئەم دوو قەولە پەیدا دەبێ، یەکێکیان دەڵێ: کار بەئەصڵ دەکرێ ئەویشیان دەڵێ: کار بەظاهیر دەکرێ، ئەم دوو قەولە نەیاری یەکتر دەکەن، هەڵدەگرێ ئەو تەرەدودە بەشوێنی کارە سروشتیەکاندا پاش کۆ بکرێ، چونکە ئەصڵ ئەوەیە نەبوونی

{وما سواه} اي سوى ماذكر في فعله {ان علمت صفته} من وجوب اوندب او اباحة {فامته مثله} في ذلك {في الأصَحّ} عبادة كان اولا وَ قِيلَ مثله في العبادة فقط وَ قِيلَ لا مطلقاً بل يكون كمجهول الصفة وسيأتي[1] {وتعلم} صفة فعله {بنص} عليها كقوله هذا واجب مثلاً {وتسوية بمعلوم الجهة} كقوله هذا الفعل مساو لكذا في حكمه المعلوم[2] {ووقوعه بيانا او امتثلا لا لدال على وجوب او ندب اواباحة} فيكون حكمه حكم المبين او المتثل ولا اشكال في ذكر البيان هنا مع ذكره قبل لانَّ الكلام هنا فما يعلم به صفة الفعل من حيثُ هو لايقيد كونه سوى ماتقدم[3].

---

دابەزاندنی ڕێبازە، کەوابوو بۆ ئێمە موستەحەبب و خۆشەویست نەکراوە، وەهەڵیش نەگرێ ببێتە پاشکۆی حوکمی شەرعی، چونکە پێغەمبەر کە نێرراوە بۆ ئەوە هاتووە کارو کردەوە شەرعیەکان روون و ئاشکرا بکات ، کەوابوو موستەحەبب و خۆشەویستە .

(١) جگە لەوەی کەباسکرا لەڕەفتاری پێغەمبەرﷺ لەکاری سروشتی و ئەوانی‌تر، ئەگەر صیفەت و ناوزەدی ئەو کارە زانرا کە واجب و سوننەت و موباحە، ئەوە بۆ ئومەتەکەشی هەروەکوو ئەو وایە، بەلای قەولی (اصح)و دروستترەوە، چ بەندایەتی بێت ئەو کارە یاخود عیبادەت نەبێ، هەندێك وتوویانە: ئومەتەکەی وەکوو ئەو وایە تەنها لەبەندایەتیدا ، هەندێکی‌تر وتوویانە: لەهیچیاندا ئومەتەکەی.وەك ئەو نیە، بەڵکوو وەکو کارێك وایە صیفەت و ناوزەدی نەزانرێ، ئەمەش جیاوازی زانایانی تێدایە لەمەودوا دێت .

(٢) ناوزەدکردنی کاری پێغەمبەرﷺ دەزانرێ بەهۆی دەقێکەوە ، وەك ئەوەی کە بفەرمووێ: ئەمە واجبە یاسوننەتەو وێنەی ئەمانە ، وەهەم دەزانرێ بەهۆی یەکسان کردنیەوە لەگەڵ شتێکدا حوکمەکەی زانراوبێ وەك ئەمەی بفەرمووێ ئەم کارە لەحوکمدا وەك فلانە شت وایە، ئەو شتەش حوکمەکەی بێگومان دیارە.

(٣) هەروەها دەزانرێ بەهۆی ئەوەوە ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ ببێتە هۆی روونکردنەوەی شتێکی‌تر ، یاخود کارەکەی شێوەی چۆنیەتی جێبەجێ‌کردنی دەقێك بێت کە وجوب یاخود نەدب یاخود ئیباحە بگەیەنێ ، ئەوکاتە حوکمەکەی وەك حوکمی روونکراوەکە وادەبێ یاخود وەك حوکمی جێبەجێ‌کراوەکە دەبێ، لەپێشەوە بەیان باسکرا بۆ لێرە وترایەوە؟ هیچ جۆرێك ئیشکال نییە کە لێرەش بەیان باسکراوەتەوە لەگەڵ ئەوەش لە پێغەمبەرەوەﷺ باسی لێوە کراوە، چونکە گفتوگۆی ئێرەمان لە بەیانێکە کەصیفەتی کارەکەی پێ‌بزانرێ لەڕووی ئەوەوە ئەو

{ويخص الوجوب} عن غيره {اماراته كالصلاة بالاذان} لانه ثبت باستقراء الشريعة ان ما يؤذن لها واجبة بخلاف مالا يؤذن لها كصلاة العيد والاستسقاء[1]

{وكونه} اي الفعل {ممنوعا} منه {لو لم يجب كالختان والحد لان كلا منهما عقوبة وقد يتخلف الوجوب عن هذه الامارة لدليل كما في سجود السهوو سجود التلاوة في الصلاة[2] .

{و} يخص {الندب} عن غيره {مجرد قصد القربه} عن قيد الوجوب {وهو} اي الفعل لمجرد قصد القربة {كثير} من صلاة وصوم وقراءة وذكر ونحو ذلك من التطوعات[3] {وان جهلت} صفته {فللوجوب} في حقه وحقنا لانه الأحوط[4].

---

کرداره حوکمی چی‌یه؟ ئەمەروونی دەکاتەوه، نەك بەیانێك بێ بۆ روونکردنەوەی کارێك بێ کەلەسەر شێوازی چوارەکەی پێشەوه وەك کرداریسروشتی پێغەمبەرﷺ و.

(١) واجب جیادەکرێتەوه لەغەیری خۆی بەهۆی ناوو نیشانەکانیانەوه وەك نوێژی واجب لەنوێژی سوننەت بەهۆی بانگدانەوه جیادەکرێتەوه، چونکە شتێك کەجێی خۆیگرتبێ بەهۆی خوێندنەوەو گەڕان بەناو رێبازی ئیسلام دا ئەوەیە کە: هەر نوێژێك بانگی بۆ بدرێ واجبه، بەڵام ئەوەی بانگی بۆ نەدرێ جیاوازە واجب نیه، وەك نوێژی جەژن و نوێژەبارانە داوای بارانکردن.

(٢) هەروەها واجب جیادەکرێتەوه لەغەیری خۆی بەوەی ئەگەر ئەو کارە واجب نەبوایە قەدەغەبوو کردنەکەی وەك: خەتەنەکردن و تۆڵەی حەدد، چونکە هەریەکێ لەمانە تۆڵەو ئازاردانی مرۆڤە، -بڕینی ئەندازێ لەلاشەی ئینسان و ئازاردانی حەرامە- کەم جارێك ناونیشانەکەش هەیەو وجوبیش نیه (یاسای پێشوو بۆ کات نیه) لەبەر بەڵگەیەك وەك سوجدەی سەهوو یا سوجدەی قورئان خوێندن لەنوێژدا ، بەڵگە هەیە لەسەر سوننەتی ئەم سوجدانە.

(٣) نەدبیش لەغەیری خۆی جیادەکرێتەوه بەهۆی ئەوەوه تەنها و تەنها بەکردنەکەی نیازی نزیك بوونەوه هەیە لەخوا نەك ترسی تۆڵەی ، وەهیچ بەڵگەیەك نەبێ لەسەر وجوبی، وەکارێکیش نیازی نزیکبوونەوەی رووتی تێدا هەبێ، هەر زۆر زۆرە وەك: نوێژی سوننەت و رۆژوو قورئان خوێندن و یادی خوا و وێنەی ئەمانە لەهەموو بابەتێکی سوننەت.

(٤) ئەگەر ناوزەدکردنی کرداری پێغەمبەرﷺ نەزانرا ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەو کارە بۆ پێغەمبەرو ئێمەش واجب بووه، چونکە شتێك بەواجب بزانرێ زیاتر ئیحتیاط کردنە.

{وَ قِيلَ للندب} لانه المتحقق بعد الطلب {وَ قِيلَ للاباحة} لان الصل عدم الطلب {وَ قِيلَ بالوقف في الكل} لتعارض اوجهه[1].

{و} قيل بالوقف {في الاولين} فقط {مطلقا} لانهما الغالب من فعل النبيّ ﷺ {و} قيل بالوقف {فهما} فقط {ان ظهر قصد القربه} و إلاّ فللاباحة وعلى غير هذا القول سواء ظهر قصد القربة اولا[2] ومجامعة القربة للاباحة بأن يقصد بفعل المباح بيان الجواز للامة فيثاب على هذا القصد كما قاله المصنِّف[3]، وقوله ان ظهر عدل إليه عن قوله ان لم يظهر الذي هو سهو كما رايتهما في خطه مشطوبا على الثاني منهما ملحقا بدله الاول[4].

---

(١) هەندێك وتوويانە: بۆ نەدبە چونكە نەدب دوای خوازتن شتێكی بێ گومانە ، لای كەمەكەيەتی ، هەندێكیتر وتويانە بۆ ئيباحەيە ، چونكە ئەصلْ ئەوەيە داواكردنی كار نەبێ، هەندێكیتر وتوويانە: واقمان ورماوە لەهەموويان دا، چونكە بەڵگەی هەموويان بەهێزەو دەچن بەگژيەكدا.

(٢) هەندێك وتوويانە: هەڵوێستە تەنها بۆ يەكەم و دووەم دەكەين، ئيتر نيازی نزيك بوونەوە دەربكەوێ ياخود دەرنەكەوێ، -ئەمەيان بۆ هەمو قيلەكان دەبێ- هەندێكیتر وتوويانە: هەڵوێستە تەنها لەيەكەم و دووەمدا دەكەين، ئەگەر نيازی نزيك بوونەوەی بەخوداوە دەركەوێ، ئەگەر دەرنوكەوێ ئەوە بۆ ئيباحەيە، ئەم مەرجە تەنها بۆ ئەم قيلە دەبێ و غەيری ئەميش كەيفی خۆيەتی نيازی نزيك بوونەوەی خوا دەركەوێ ياخود دەرنەكەوێ . پرسيار : چۆن ئەبێ نيازی نزيك بوونەوە لەگەڵ ئيباحەدا كۆببنەوە ، چونكە لە ئيباحەدا هەردولا يەكسانن؟

(٣) چونكە كۆبونەوەی نزيك بوونەوە بەخواوەو ئيباحە لەم كارەدا بەم شێوە دەبێ پێغەمبەرﷺ كە ئەو كارە موباحە دەكا مەبەست روونكردنەوەی دروستی ئەو كارەبێ بۆ ئۆمەتەكەی ، لەسەر ئەم نيازە پاداشت دەدرێتەوە وك دانەر وتوويەتی:

(٤) دانەر كە دەڵێ: ان ظهر ، واتە: ئەگەر دەركەوێ لەنوسراوەيەكیتریدا نوسيويەتی ان لم يظهر واتە: ئەگەر دەرنەكەوێ، كەئەمەيان نابەجێيەو لە كاتی بێئاگاييدا نوسراوە، دەچێتەوە سەر جۆری يەكەم كە راستەكەيەتی هەردوكيانم لەنوسراوی خۆيدا بينيوە كە خەت هێنراوە بەسەر دووەمياندا لە پاشيەوە شێوەی يەكەمی نوسيوە.

{واذا تعارض القول والفعل} اي تخالفا {ودل دليل على تكرر مقتضى القول فان كان} القول {خاصابه} ﷺ كأن قال يجب على صوم عاشوراء في كل سنة وافطر فيه في سنة بعد القول او قبله {فالمتاخر} من القول والفعل بأن علم {ناسخ} للمتقدم منهما في حقه وذلك ظاهر في تأخر الفعل وكذا ي تقدمه لدلالة الفعل على الجواز المستمر[1].

واحترز بقوله ودل الخ عما لم يدل فلا نسخ حينئذ لكن في تاخر الفعل دون تقدمه لما تقدَّمَ من دلالة الفعل على الجواز المستمر[2]. {فان جهل} المتأخر من القول والفعل {فثالثها} اي الأقوال {الأصَحّ الوقف} عن ان يرجح احدهما على الآخر في حقه الى تبين التأريخ لاستوائهما في احتمال تقدُّمَ كل منهما على الآخر[3].

---

(١) كاتێ گوفتارو رەفتاری پێغەمبەرﷺ لەیەك جیابوون، وە بەڵگەش هەبوو لەسەر ئەوە کە داخوازی فەرمودەکەی لەکاتی خۆیدا دووبارە دەبێتەوە ، جائەگەر ئەو فەموودەیە تایبەت بوو بەپێغەمبەرەوەﷺ وەك ئەوە بفەرمووێ: هەموو ساڵێك دەی محرم لەسەر واجبە –وشەی هەموو ساڵێك داوای دووبارەبوونەوەی دەکات– لەگەڵ ئەوەشدا دەی محرم بەرۆژوو نەدەبوو ، چ پێش ئەو فەرموودەیە یاخود لەدوایەوە بێت، کەوابوو کامیان لەدواوە هاتبێ ئیتر گوفتارەکەیان یاخود رەفتارەکەیان بەم شێوە بزانرێ کامیان بێگومان لەدواوە هاتووە، ئەوە سڕینەوەی پێشەکەیانە لەبارەی حەقی پێغەمبەرﷺ دا ، ئەوە دیارە کە ئەگەر کردارەکە کەوتبێتە دوای گوفتارەکە ، هەروەها ئەگەر پێشیش کەوێ چونکە کردارەکە دەڵاڵەت دەکا لەسەر ئەوە کەدروستی ئەو کارە هەر بەردوەوامە.

(٢) دانەر بەمەی کە ووتی: بەڵگەیێك دەڵاڵەت بکا....، خۆی دەربازکرد لەوەی کە بەڵگەیێك نەبێ، ئەوە لەم کاتەدا سڕینەوە نیە، بەڵام کاتێ کە کردارەکە دوای گوفتارەکەوە بێ، نەك پێش کەوتبێ چونکە لەپێشەوە رابوورد کە کردارەکە خۆی دەڵاڵەت دەکا لەسەر ئەوە کەبەردەوام ئەو کردارە دروستە.

(٣) جائەگەر نەزانرا کردارەکە کەوتوەتە دواوە یاخود گوفتارەکە، ئەوە سێ قەولی تێدایە: سێهەمیان کەلەهەموویان راستترە هەڵوێستەکردنە لەوەی یەکێکیان لاسەنگ و گرانتر بکرێ و بدرێ بەسەر ئەویتردا ، هەتا مێژویان دەردەکەوێ ئەمەش لەحەقی پێغەمبەرداﷺ وایە، چونکە هەردوکیان یەکسانی لەوەدا هەڵدەگرێ هەریەکەیان پێش ئەویتریان کەوتبێ

وبل يرجح القول لانه اقوى دلالة من الفعل لوضعه لها والفعل انما يدل بقرينة وَ قِيلَ يرجح الفعل لانه اقوى في البيان بدليل انه يبين به القول ولا تعارض في حقنا حيثُ دل دليل على تاسِّينا به في الفعل لعدم تناول القول لنا[1].

{وان كان} لا قول {خاصا بنا} كأن قال يجب عليكم صوم عاشوراء الى آخر ماتقدم {فلا معارضة فيه} اي في حقه ﷺ بين القول والفعل لعدم تناول القول له[2]. {وفي الامة المتاخر} منهما بان علم {ناسخ} للمتقدم {ان دل دليل على التاسي} به في الفعل {فان جهل التاريخ فثالثُها الأصَحَّ انه يعمل بالقول} وَ قِيلَ بالفعل وَ قِيلَ الوقف عن العمل بواحد منهما لمثل ما تقدَّمَ[3].

---

(١) هەندێکیشیان دەفەرموون: لای گوفتارەکە بەهێزترە چونکە لەروی دەلالەتەوە بەهێزترە لەرەفتار ، چونکە گوفتار بۆ ئەوە دانراوە دەلالەت بکا بەلام رەفتار بە هۆی ناونیشانەوە دەلالەت دەکات ، هەندێکی‌تر دەڵێن : لایەنی کردارەکە قورس دەکرێ ، چونکە کردار لەگوفتار بەهێزترە لەڕوی رونکردنەوەدا ، بەبەڵگەی ئەوە هەرکاتێك گوفتارێك خەڵك لێی حاڵی نەبێ بەرەفتارێك روون دەکرێتەوە، لەحەقی ئێمەدا گوفتارو کردار دژایەتی‌یەکتر ناکەن، لەو جێیەدا بەڵگەیەك هەبێ دەلالەت بکا لەسەر چاولێکردنمان لە پێغەمبەرﷺ لەکردارەکەدا، چونکە گوفتارەکەی کە فەرمووی: رۆژی عاشورام لەسەر واجب کراوە ، ئێمە ناگرێتەوە، چونکە دەفەرموێ: (علیّ).

(٢) وەئەگەر گوتارەکە تایبەتمەند بوو بەپێغەمبەرەوە ﷺ وەك ئەوەی گریمان پێغەمبەرﷺ بفەرموێ: هەموو ساڵێك لەسەرتان واجبە گرتنی رۆژی دەهەمی مانگی موحەرەم ، ئەوە لەنێوان گوفتارو کرداردا دژایەتی تێدا نیە لەحەقی پێغەمبەر ﷺدا ، چونکە گوفتارەکە پێغەمبەر ناگرێتەوە.

(٣) لەحەقی ئوممەتەکەیدا کامیان لەدواوە هاتبێ بەم شێوەیە کەبێگومان بزانرێ کامیان، ئەوەیان سڕینەرەوەی پێشینەکەیانە، ئەگەر بەڵگەیەك دەلالەت بکا لەسەر چاو لێکردنی پێغەمبەرﷺ وشوێن کەوتنی لەکردارەکەیدا، بەلام ئەگەر مێژوی گوفتارو رەفتار نەدەزانرا، ئەوە سێ قەولی تێدا هەیە ، سێهەمیان لەوانی‌تر راسترە، کە کار هەر بەگوفتارەکە دەکرێ ، و هەندێکی‌تر دەڵێن: رەفتارەکە جێبەجێ دەکرێ، هەندێکی‌تر دەڵێن: هەڵوێستە دەکەین و بەهیچ کامیان کار ناکەین تا بۆمان دەردەکەوێ ، لەبەر ئەوەی لەپێشەوە رابوورد.

وانما اختلف التصحيح في المسئلتين كما في المختصر لانامتعبدون فيما يتعلق بنا بالعلم بحكمه لنعمل به بخلاف ما يتعلق بالنبيِّ ﷺ اذ لا ضرورة الى الترجيح فيه وان رجح اتلآمدى تقدُّمَ القول في ايضا وان لم يدل دليل على التأسي به في الفعل فلا تعارض في حقنا لعدم ثبوت حكم الفعل في حقنا[1]. {وان كان} القول {عاما لناوله} كأن قال يجب على وعليكم صوم عاشوراء الى آخر ماتقدم {فتقدم الفعل او القول له وللامة كما مر} من ان المتأخر من القول والفعل بأن علم متقدم على الآخر بأن ينسخه في حقه ﷺ وكذا في حقنا ان دليل على تأسينا به في الفعل ولافلاتعارض في حقنا وان جهل المتأخر فالاقوال اصحها في حقه الوقف وفي حقنا تقدُّمَ القول[2].

---

(١) بۆچی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بەروارەکە نەزانرا أصح هەڵوێستە بوو، بۆ ئێمە أصح کارکردن بەقەولەکە بوو؟ بۆیە جیاوازی هەیە لەهەردوو مەسەلەکەدا لەهەریەکەیان دا شتێك بە أصح دانراوە، وەك لەمختصریشدا هەروا کراوە، چونکە ئێمە شتێك پەیوەندی هەبێ پێمانەوە مکلفین ئەبێ بزانین حوکمی چیە بۆ ئەوەی بزانین کاری پێ بکەین ، بەڵام شتێك پەیوەندی بە پێغەمبەرەوە بێ واجب نی یە ئێمە بیزانین، بۆیە لەمدا هەڵوێستە دەکەین چونکە هیچ زەرورەتێك داوامان لێ ناکات لەبارەی پێغەمبەرەوە لایەکیان بارسەنگ بکەین، هەرچەند دووبارە ئامێدی لەبارەی حەقی پێغەمبەرەوە گوفتاری پێش خستووەو بارسەنگ و قورستر کردوە، بەڵام ئەگەر بەڵگەیێك نەبوو دەلالەت بکا لەسەر چاولێکردن و شوێن کەوتنی پێغەمبەر لەرەفتارەکەدا ، ئەوە لەحەقی ئێمەدا هیچ دژایەتیەکمان نابێ، چونکە لەحەقی ئێمەدا حوکمی کارەکە ثابت نەبووە.

(٢) ئەگەر فەرمودەکە گشتگیر بوو پێغەمبەریشی دەگرتەوە، وەك ئەوەی گریمان بفەرمووێ : واجب بە لەسەر منیش و ئێوەیش ڕۆژوی دەهەمی موحەڕەم ، ئەوە لەکوێ گوفتارو لەکوێ ڕەفتاری پێش دەخرێ لەحەقی پێغەمبەر ﷺ یا بۆ ئۆمەتەکەی ئەوە لەپێشەوە رابووردی، کەئەوەیان لەدواوە هاتبێ کە بێگومان بزانرێ پێش و پاشیان کامەیە، ئەوە لەحەقی پێغەمبەر ﷺ دا پاشینەکە پێشینەکە دەسڕێتەوە، هەروەهایە لەحەقی ئێمەیشدا ئەگەر بەڵگەیەك دەلالەت بکا لەسەر شوێن کەوتنمان بۆ پێغەمبەر ﷺ لەرەفتارەکەیدا، بەڵام ئەگەر بەڵگە نەبوو ئەوە لەحەقی ئێمەدا هیچ دژایەتیەکیان نیە، وەئەگەر پێشین و پاشینیان نەدەزانرا ئەوە سێ قەولەکەی تێدایە، ڕاستتری هەموویان لەحەقی پێغەمبەردا ﷺ هەڵوێستەیە، لەحەقی ئێمەشدا گوفتار خستنە پێش ڕەفتار .

{الا ان يكون {القول {العام ظاهراً فيه} ﷺ لانصا كأن قال يجب على كل واحد صوم عاشوراء الى آخر ماتقدم {فالفعل تخصيص} للقول العامّ في حقه تقدَّمَ عليه او تـاخر عنه اوجهل ذلك ولا نسخ حينَئذٍ لأن التَخصيص اهون منه[1].

{الكلام في الأخبار}

اي بفتح الهمزة وافتتحه بتقسيم المركب الصادق بالخبر لينجر الكلام الـه زيـادة للفـائدة [2]، فقال {المركب} اي من اللفظ {اما مهمل} بان لا يكون لـه معنـى {وهـو موجود} كمدلول لفظ الهذيان {خلافاً للامام} الرَّازي في نفيه وجوده قائلا التركيب انما يصادر إليهِ للافادة فحيث انتفت انتفي فمرجع خلافه الى ان مثل ماذكر لايسمى مركبا {وليس موضوعا} اتفاقاً[3].

---

(١) هـەموو كـات وەك ئـەوەی پێشـەوە وادەبـێ مەگـەر ئـەوە نـەبێ لەفظـە عـام و گشـتگیرەكە ظاهیر بـێ لـە پێغەمبـەردا نـەك دەقـی پـیادا نـابێ، وەك ئـەوەی گریمـان بفەرموێ: واجبە لەسـەر هـەموو یـەكێك ڕۆژووی ڕۆژی دەهـەمی موحـەڕەم -كـە دەڵـێ لەسـەر هـەموو یـەكێك ظاهیر وایـە پێغەمبـەریش ﷺ دەگرێتـەوە- ئـەوە كارەكـە لەفظـە گشتگیرەكە تایبەت دەكا لەحەقی پێغەمبەر ﷺ پێش كەوتبێ یاخود دواكەوتبێ یاخود نەزانرابێ، وەهیچ جۆرە سڕینەوەیەكیش لەم كاتەدا نیە، چونكە تایبەت كردنـی شـت و هەندێكی لێلابەی ئاسانترە لەوەی كە بەجارێ هەموی بسڕیتەوە.

(٢) {الكـلام في الأخبـار} ئـەم گفتوگۆیـە لـەبارەی هـەموو جـۆرە هـەواڵ و فەرموودەیێكەوەیە جا كەباسی لەخەبەرە بـۆ باسـی شـتێكی گشـتگیری وەك مركـب دەكات؟ دەڵێ: دانـەر سـەرەتای باسـەكەی بە دابەشكردنی مورەكەبەوە كردەوە، كـە لەفظێكی گشتگیرە بۆ هەواڵ و خەبەریشی بۆ ئەوەی باسەكە ڕاكێشـێ و بیداتـەدەمی ئائەگاتە باسی هەواڵیش، بۆئەوەی سوودی زیاتری هەبێ،لەبەر ئەوە دانەر ووتی:

(٣) لەفظی مورەكـەب پێكهاتـە لەچـەند وشـەییێك، یا لەفظێكە مانای مەبست نیـە، لەبەر ئەوە بێ مانای پێدەوترێ، بۆ لەفظ هەیە وابێ؟ بەڵێ هەیـە وەك ئـەو مەدلولـەی لەفظی وڕێنە دەیگەیەنێ، ئەو مەدلولە پشت گوێ خراوە، بەڵام پێشـەوا ڕایجیـاوازە كەدەڵێ: لەفظی بێمانا هەر نیە، بەم شێوە دەڵێ: چەند لەفظێك بۆیە یەك لەدوای یەك ڕیزدەكرێن بۆ ئەوەیە سوود بگەیـەنن بە بەرامبـەر، جاهـەر كـاتێ سوودی نـەبوو ئـەوە لەفظێكی پێكهاتە نیە، سەرچاوەی جیاوازیەكە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوە كەباسـكرا بە مورەكەب و پێكهاتە ناوزەد ناكرێ و نابرێ، لەفظی مهمل لەو ڕووەوەیە كەماناكـەی مەبەست نیە بەڕای هەموان بۆ مانادانەنراوە، نەك لەو ڕەوەوە كەهەربۆ مانادانەنراوە.

{واما مستعمل} بلأن يكون له معنى {والمختار انه موضوع} اي بالنوع وَ قِيلَ لا والموضوع مفرداته وللتعبير عنه بالكلام قال[1] {والكلام ما تضمن من الكلم} اي كلمتان فصاعداً تضمنتا {اسنادا مفيداً مقصودا لذاته} فخرج غير المفيد نحو رجل يكلم بخلاف يتكلم رجل لان فيه بيانا بعد ابهام[2] ، وغير المقصود كالصادر من النائم والمقصود لغيره كصلة الموصول نحو جاء الذي قام ابوه فانها مقيدة بالضم إليه مقصودة لايضاح معناه ولا طلاق الكلام على النفساني كاللساني والاختلاف في انه حقيقة فماذا قال حاكيا له[3].

(١) یاخود مورەکەب ئەوەیە بەکارهاتبێ لەمانای مەبەست لە لەفظدا، رای هەڵبژاردە ئەوەیە کە مورەکەب وەضعی شخصی تێدا نیە بەڵکو وەضعی نەوعی تێدا هەیە –وەضعی نەوعی بریتیە لەوەی تێبینی موضوعەکە بکرێ بەیاسایەکی گشتی و ماناکەشی بەشێوەیەکی تایبەت بەخۆی بەم شێوە دانەرەکە بڵێ: هەر لەفظێك بەو شێوەیە بۆ ئەوە دەلاڵەت لە سەر ئەو مانایە دەکا– هەندێك وتویانە مورەکەبێك بۆ مانا دانرابێ وەضعی تێدا نی‌یە، ئەوەی کە وەضعی تێدا هەبێ بریتیە لەو موفرەدانەی کە مورەکەبەکەیان لێ‌پێك هاتووە، لەبەر ئەوەی مورەکەبێك کە پێك هاتبێ بۆ مانای مەبەستی خۆی کەم جار ناودەبرێ بە کەلام دانەر وتی:

(٢) کەلام بریتیە لەشتێك کە چەند کەلیمەو وشەیەکی گرتبێتە خۆی، ئیتر دوان بێ یان زیاتر ، ئیتر کە ئەو کەلیمانە درانە پاڵ یەك یەکیان لەخۆگرتبێ، ئەبێ ئەو درانە پاڵ یەکە سوود بەخش بێ، بەگوێگر، وەهەم دەبێت درانە پاڵێکی مەبەست بێ لەبەر خودی خۆی ، نەك لەبەر پاشکۆیی، لەبەر ئەوە رستەیەك سوود نەگەیەنێ بەگوێگر لەم پێناسەیە چویەدەر، وەك پیاوێ قسە دەکا، هەموو کەس دەزانێ کە پیاو قسە دەکا، ئەمە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی بڵێیت: قسەی کرد پیاوێك ، چونکە ئەمەیان روونکردنەوەی تێدایە دوای لەفظێکی گشتگیرو مەبەست نادیار، کەوتت: قسەدەکا هەمو کەس دەگرێتەوە، کەوتت: پیاوێك قسەکەرەکە دیاری‌کرا.

(٣) وەهەم ئەوەش مەبەست نەبێ چوەدەر ، وەك کەلامێك لەدەمی خەواڵویەکەوە دەرچێ ، وەئەوەش کەمەبەست بێ بەلام لەغەیری خۆی، پێ‌چووەدەر ، وەك ئەو رستەی هەموو کات لکاوە بەمەوصولەوە ، نموونەی: هات ئەوەی باوکی بەپێوە وەستابوو ، ئەو رستەی دوای (الذي)وە هاتووە کە پێوەی لکاوە و مەبەستیشە بۆ رونکردنەوەی ماناکەی . لەبەر ئەوەی کەلام ووشەییەکی گشتگیرە و دەبرێ بەسەر کەلامی نەفسیشدا، لای هەندێك وەك دەبرێ بەسەر لەفظیشدا . بەرای هەمووان

{وقالت المعتزله انه} اي الكلام {حقيقة في اللساني} وهو المحدود بما تقدَّمَ لتمادرة الى الاذهان دون النفساني الذي اثتته الاشاعرة دون المعتزلة[1] {وقال الاشعري مرة} انه حقيقة {في النفسائي} وهو المعنى القائم بالنفس المعبر عنه بما صدقات اللساني مجاز في اللساني {وهو المختار} قال الأخطل:

ان الكلام لفي الفؤاد وانما جعل اللسان على الفؤآد دليلاً [2].

{ومرة} انه {مشترك} بين اللساني والنفساني لأن الأصل في الأطلاق الحقيقة قال: الإمام الرَّازي وعليه المحققون منا ويجاب القولين عن تبادر اللساني بانه قد يكثر استعمال اللفظ في معناه المجازي او في أحد معنييه الحقيقيين فيتبادر الى الأذهان[3].

---

وەلەبەر ئەوەی جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان دا ، ئایا کەلام حەقیقەتە لەکامیان دا؟ دانەر بۆ ئەوەی ئەو جیاوازی‌یە بگەڕێنێتەوە بۆ گوێگر ووتی:

(١) موعتەزیلە وتویانە کەلام حەقیقەتە لە لەفظیدا کەلامی لەفظیش ئەوەیە کە پێناسەکرا بەوەی پێشەوە –چەند وشەیەکی گرتبنە خۆیو درابنە پاڵ یەك.... – چونکە کەوترا کەلام کەلامی لەفظی بەزوویی بەرەو مێشك دێت ، نەك ئەو کەلامە نەفسانیەی ئەشعەریەکان سەلماندویانە، نەك موعتەزیلە.

(٢) جارێك پێشەوای ئەشعەری خۆی وتویەتی: کەلام حەقیقەتە لەکەلامی نەفسانیدا ، کەبریتیە لەمانایەك لەذیهن و بیردا جێگیر بوو بێت بەهۆی ئەو وشانەوە کە زوبان دەریان دەبڕێ ئەدرێتەوەو گوێگر لێی‌حاڵی ئەبێ، مەجازیشە لەلەفظیەکاندا ئەوەش رای هەڵبژاردەیە، الأخطلی شاعر وتویەتی: بێگومان کەلام تەنها ئەوەیە کە لەدڵدا بێ ، زوبان تەنها کراوە بەڕێنوما بۆ ئەوەی بتگەیەنێتە سەر دڵ– بۆ زانیاری ئەم شیعرە لە دیوانەکەیدا نیەو شاعیرێکی تازەشە هۆنراوەی نابێتە بەڵگە – .

(٣) جارێکیش وتوویەتی کەلام موشتەرەکە لەنێوان کەلامی‌لەفظی‌و کەلامی نەفسانیدا، چونکە ئەصڵ لەدابڕینی لەفظ بەسەر مانایدا ئەوەیە ببڕێ بەسەر مانا حەقیقیەکەیدا ، دەخۆ ئەمیش دەبڕێ بەسەر هەدوو ماناکەیدا ، پێشەوا رازی وتویەتی: ئەو زانایانەی ئێمە کە هەوڵیان دۆزینەوەی بنج و بنەوانی راستی شتەکانە ، لەسەر ئەوەن کە موشتەرەکە، لەسەر ئەو دوو قەولەی پێشەوا ئەشعەری، وەڵامی موعتەزیلە ئەدرێتەوە کە ئەڵێن: کە وترا کەلام تبادری ذیهن بەپەلە بۆ کەلامی لەفظی دەچێ. بەم شێوە دەگوترێ بێگومان لەفظ هەیە زیاتر لەمانا مەجازیەکەیدا بەکار دەهێنرێ، هەر کات وترا تبادری ذیهن یەکسەر بۆ مانا مەجازیە دەڕوا ، ئەمە مانای

**والنفساني منسوب الى النفس بزيادة الف ونون للدلالة على العظمة كما في قولهم شعراني للعظيم الشعر[١].**

**{وانما يتكلم الأصولي في اللساني} لان بحثه فيه لا في المعنى النفسي {فان افاد} اي ماصدق اللساني {بالوضع طلبا فطلب ذكر الماهيَّة} اي اللفظ المفيد لطلب ذلك {استفهام} نحو ماهذا؟[٢] {و} طلب {تحصيلها او تحصيل الكف عنها} اي اللفظ المفيد لذلك {امر ونهي} نحو قم ولا تقعد[٣] {ولو} كان طلب تحصيل ماذكر {من ملتمس} اي مساو للمطلوب منه رتبة[٤]. {وسائل} اي دون المطلوب منه رتبة فان اللفظ المفيد لذلك منهما يسمى امرا ونهيا[٥].**

---

وانیە کە حەقیقەیە ، زۆر جار لەفظێك بەکاردێ لەیەکێك لەدوو مانا حەقیقیەکەیدا، یەکسەر ذیهنی تبادری بۆ لای ئەوەیانە کەزۆر بەکار دێ بۆی، دەی خۆ مانای وانیە ئەمەیان حەقیقیەو ئەویان حەقیقی نیە، کەوابوو تبادری ذیهن بەڵگە نیە.

(١) ووشەی نەفسانی نیسبەت دراوە بۆ لای نەفسی، دەبوایە کەلامی نەفسی بوترایە نەك نەفسانی بەئەلیف وتنی زیادەیە، بۆیە وای وتوە بۆ ئەوەی دەلالەت لەسەر گەورەیی کەلامەکە بکا، پیتی زۆر نیشانەی مانای زۆرە، وەك دەڵێن: شعرانیّ، بۆ کەسێك کە زۆر توکن و موو قەوی بێت .

(٢) زانای ئوصولی تەنها لەبارەی کەلامی نەفسیەوە دەدوێ، چونکە توێژینەوەی ئەو لەو بارەوەدایە، ئەحکام لەلەفظ وەردەگرین نەك لەکەلامی نەفسانیوە بدوێ، جا ئەگەر کەلامی لەفظی واتە ئەو لەفظانەی بەزوبان دەوترێن هەر لەسەرەتای دانانی ئەو لەفظەوە بۆ ماناکە داخوازی بگەیەنێ، ئەوە ئەو لەفظەی کەئەو داخوازیە بگەیەنێ ناودەبرێ بە (استفهام) واتە: داوای لێحاڵی بوون، وەك: ئەوە چیە؟ واتە نایزانم دوات لێدەکەم تێمبگەیەنە لەو شتە.

(٣) وەئەگەر ئەو لەفظە داخوازی جێبەجێکردن و پەیداکردنی ئەو ماهیەتە بێ، یاخود داواکردنی وەدەست خستنی بەهۆی وازهێنان لەو ماهیەتە، واتە: ئەو لەفظەی ئەوە بگەیەنێ ئەویان ئەمرو فەرمانە، ئەمیان نەهی و ڕێگرتنە، وەك: هەڵسە بۆ فەرمانە ، دانەنیشێ بۆ بۆ نەهیە . (٤) باداخوازی ئەوەی کە باسکرا لەلایەن ئەو کەسەوە بێ کە تکاکە لەو داواکەربێ واتەبا لەپلەوپایەدا یەکسان بێ بۆ داوا لێکراوەکە

(٥) یاخود با داخوازی پەیدابوونی ئەوەی ووترا با لەلایەن کەسێکەوە بێ کە پلەو پایەی کەمتر بێ لەداوا لێکراوەکە ، چونکە ئەو لەفظەی ئەوە دەگەیەنێ لەلایەن تکاکارو داواکارەوە دەکرێ ناودەبرێ بەفەرمان و قەدەغەکراو.

وَ قِيلَ لا بل يسمى من الاول التماسا ومن الثاني سؤالا واشار المصنف الى هذا الخلاف بقوله ولو[1]. {والا} اي وان لم يفد بالوضع طلباً {فما لا يحتمل} منه {الصدق والكذب} فيما دل عليه {تنبيه وإنشاء} اي يسمى بكل من هذين الاسمين سواء لم يفد طلبا نحو انت طالق أم افاد طلبا باللازم كالتمنّي والترجّي نحو: ليت الشباب يعود ، ولعل الله ان يعفو عني [2]

{ومحتملهما} اي الصدق والكذب من حيثُ هو {الخبر} وقد يقطع بصدقه او كذبه لا مور خارجة عنه كما سيأتي[3].

{وابي قوم تعريفه كالعلم والوجود والعدم} اي كما ابوا تعريف ماذكر قيل لأن كلا من الأربعة ضروري فلاحاجة الى تعريفه وَ قِيلَ لعسر تعريفه[4].

---

(١) هەندێك وتویانە نەخێر ناونابرێن بەئەمر و نەهی ، بەڵكو لەیەكەمدا ناودەبرێ بە ئیلتیماس و لەدوەمدا بە(سؤال) ناودەبرێ، دانەر بۆ ئەم جیاوازیە ئاماژەی كرد بە دوو وشەی: ولو.

(٢) ئەگەر ئەو كەلامە هەر لەسەرەتای دانراویدا داخوازی نەئەگەیاند، ئەو جۆرە كەلامەیان دەست نادا راست و درۆ هەڵگرێ لەو مانایەیدا كە دەلاڵەتی لەسەر دەكا، ئەو كەلامە ئاگاداركردنەوەو دامەزراندنی پێدەڵێن واتە: بەم دوو ناوە هەردوكیان ناودەبرێ، ئیتر ئەو كەلامە هەر داخوازی نەگەیەنێ ، وەك: تۆ طالق و هەڵوەشێنەرەوەی گرێ بەندو پارێزراوی خۆتی ، یاخود ئەو كەلامە داخوازیەك بگەیەنێ بەلاّم داخوازیەك لازمی ئەو كەلامە بێ، وەك خوازتنی ئاواتی مەحاڵ، وەك: خۆزگایە تەمەنی لاوی رۆژێك بگەڕایەتەوە دواوە ، یاوەك خوازتنی ئاواتی گونجاو وەك: ئومێد وایە خوا لێم ببورێ.

(٣) ئەو كەلامەی راست و درۆ هەڵدەگرێ و دەست ئەدات بۆ هەردوكیان هەر چاودێری و نیسبەت و تێبینی نیسبەت و خزمایەتی شتێك بۆ شتێك ئەكرێو ئەدرێ، ئەوە ئەو كەلامەیە خەبەرو هەواڵە –زۆر كەلام هەیە بۆ هەردوكیان دەست نادا لەبەر چەند هۆیەكی دەرەكی ، یاخود تێبینی موبتەداو خەبەر دەكرێ، وەك ئاسمان بەرزە، دەست نادا بۆ درۆ ، خوا دوانن، ئەمە دەست نادا بۆ راست– بۆیە بێگومان هەندێ كەلام هەیە راستیەكەی گومان برە ، وەهەندێكیش هەن ناڕاستیەكەی گومان برە ، لەبەر چەند شتێكی دەرەكی لەهەواڵەكە وەك لەمەودوا دێ.

(٤) كۆمەڵێكیتر پێناسەی هەواڵیان قەدەغە كردوە وەك زانست و بوون و نەبوون . واتە ئەمانە پێناسەی ئەمانەیان قەدەغە كردووە ، هەندێك وتویانە: لەبەر ئەوەی

{وقد يُقالُ الانشاء ما} اي كلام {يحصل مدلوله في الخارج بالكلام} نحو انت طالق وقم فان مدلوله من ايقاع الطلاق وطلب القيام يحصل به لا بغيره وقوله بالكلام من اقامة الظاهر مقام المضمر للايضاح فالانشاء بهذا المعنى اعمُّ منه بالمعنى الأول لشموله ماقبل الاول معه(١).

{والخبر خلافة} اي مايحصل مدلوله في الخارج بغيره {اي ماله خوارج صدق او كذب} نحو: قام زيد فان مدلوله اي مضمونه من قيام زيد يحصل بغيره وهو محتمل لأن يكون واقعا في الخارج فيكون هو صدقا وغير واقع فيكون هو كذبا(٢).

---

هەريەك لەم چوارە ضەرورى و بەڵگە نەويستن . لەبەر ڕونيان پێويستيان بەپێناسە نيەو جينس و فەصليان نيە هەندێكيش دەڵێن: بۆيە پێناسە ناكرێن لەبەر نارەحەتى پێناسە كردنيان شتێ جينس و فەصلى نەبێ زەحمەتە پێناسە كردنى.

(١) كەم جارانيش پێناسە دەكرێ و دەوترێ: انشاء ، دامەزراندن و دروستكردن بريتيە لەكەلامێك مەدلول و ماناو وێنەكەى لەدەرەوەى ذيهن و واقيعدا بەهۆى تەلەفوظ كردن بەو كەلامەوە پەيدا ببێ، پێش تەلەفوظەكە نەبووە، وەك: تۆ هەڵوەشێنەرەوەى گرێبەندى پارێزراوى خۆتى ، ياوەك: هەڵسە ، چونكەماناى كەلامەكە خستنى طەلاقە وە داواكردنى هەستانەوەيە بەهۆى ئەو كەلامەوە پەيدا دەبێ نەك بەشتێكىتر ، دانەر كەووتى: بالكلام ، ئەبوايە بيوتايە: بە، بەڵام ظاهيرى لەجىێ ضەمير دانا لەبەر زيادە روون كردنەوە، كەوابوو انشاء و دروست كردن بەم مانا و پێناسەيە گشتگيرترە لەيەكەميان چونكە ئەم پێناسەيە ئەوانەى باسكران پێش پێناسەى يەكەم دا دەگرێتەوەو داگرندەيانە .

(٢) بەڵام خەبەر و هەواڵ ئەوەيە پێچەوانەى انشاء و دروستكردن بێ ، واتە ئەوەيە كە ديمەنەكەى لەدەرەوەى ذيهن دا پەيدا ببێ، بێ ئەوەى كەلامەكەش بوترێ بەم مانايە ديمەنێكى دەرەكى هەبێ چ راست بێ ئەگەر پڕاوپڕى واقيع بێ ، يادرۆ بێ ئەگەر پڕاوپڕى واقع نەبێ، وەك: زەيد بەپێوە وەستا بوو ئەو ديمەنەى كە ئەم رستەيە دەيگرێتە خۆى كەوەستانى زەيدە بەهۆى غەيرى تەلەفوظ كردن بەم كەلامەوە پەيدا دەبێ ، ئەمجار هەڵدەگرێ ئەم ديمەنە لەدەرەوەى ذيهن دا واقيع بوو بێ ئەو كاتە هەواڵێكى راست دەبێ، وە هەڵيش دەگرێ لەدەروەى ذيهن دا واقيع نەبووبێ ئەو كاتە بەهەواڵێكى درۆ ناوزەد دەكرێ.

{ولا مخرج له} اي للخبر من حيثُ مضمونه {عنهما} اي عن الصدق والكذب {لأنه اما مطابق للخارج} فالصدق {اولا} فالكذب[1] .

{وَ قِيلَ بالواسطة} بين الصدق والكذب {فالجاحظ} قال الخبر {اما مطابق} للخارج {مع الاعتقاد} اي اعتقاد المخبر المطابقة {ونفيه} اي نفي اعتقادها بأن اعتقدَ عدَمها او لم يعتقدْ شيئاً {اولا مطابقٌ} للخارج {مع الإعتقادِ} اي اعتقاد المُخبِر عدمَ المطابقة {ونفيه} اي نفي اعتقاد عدمها بأن اعتقدها او لم يعتقد شيئا[2] {فالثاني} اي ما انتفي فيه الاعتقاد المذكور الصادق بصورتين {فيهما} اي في المطابق وغير المطابق وذلك اربع صور {واسطة} بين الصدق والكذب والاول وهو مامعه الاعتقاد المذكور في المطابق الصدق وفي غيرالمطابق الكذب[3].

---

(١) هەواڵ لەو ڕووەوە دەیگرێتە خۆی و پێی دەوترێ هەواڵ دەرچوونی نیە لەراست و درۆ چونکە ئەگەر پڕاوپڕی دیمەنی دەرەوە بوو ئەوە هەواڵێکی ڕاستە، یاخود ئەگەر پڕاوپڕی دیمەنی دەرەوە واقیع نەبوو ئەوە درۆیە.

(٢) هەندێ وتویانە: هەواڵ هەمووی ڕاست و درۆ نیە بەڵکوو جۆری سێهەمیشی هەیە کە لەنێوان ئەواندایە، بۆیە حافظ وتویەتی: خەبەرو هەواڵ:

١- یا پڕاوپڕی دیمەنی سەر زەوی‌و دەرەوەی ذیهن دایە لەگەڵ ئەوەش بڕوای هەواڵدەرەکەش وایە.

٢-یا خود بڕوای پێ‌نیە ، بەم شێوەیە بڕوای پێ هەبێ بەڵام بە نەبوونەکەی .

٣ -یاخود بڕوای بەهیچ شتێك نەبێ نە بەبوونی نەبە نەبوونی.

یاخود هەواڵ:

١- پڕاوپڕی دیمەنی‌دەرەوەی ذیهن نیە لەگەڵ ئەوەش هەواڵ دەرەکە بڕوای ئەوە بێ ئەو هەواڵە پڕاوپڕی واقیع و دیمەنی سەر زەوی نەبێ.

٢-یاخود بڕوای هەبێ کە پڕاوپڕیەتی ٣- یاخود بڕوای بەهیچ شتێك نەبێ.

(٣) جا دوهەمەکەیان واتە: ئەوەیان کەبڕوای هەواڵدەرەکەی تیا فەوتاوە، کە دوهەم و سێهەم دەگرێتەوە لەهەردوکیان دا واتە: لەهەردوو بەشی پڕاوپڕو غەیری پڕاوپڕدا -واتە لەهەربەشێکدا دوانیان - دوو لەبەشی یەکەم و دوو لەبەشی دووەم، دەکاتە چوار ئەمانە نەلەبەش ڕاستن و نە لەبەش درۆن ، بەڵکو هان لەنێوان هەردوکیان دا، بەڵام یەکەمەکەیان کەبریتیە لەوەی بڕوای هەواڵدەرەکەی لەگەڵ دابێ، ئەگەر پڕاوپڕی دیمەنی سەر زەوی بوو ئەوە ڕاستە، ئەگەر بڕواکەی پڕاوپڕی دیمەنی سەر زەوی نەبوو ئەوە درۆیە.

{وغيره} اي غير الجاحظ قال {الصدق المطابقة} اي صدق الخبر مطابقته {لاعتقاد المخبر طابق} اعتقاده {الخرج اولا وكذبه عدمها} اي عدم مطابقته لاعتقاد المخبر طابق اعتقاده الخارج اولا {فالساذج} بفتح الذال المعجمة وهو ماليس معه اعتقاد {واسطة} بين الصدق والكذب طابق الخارج اولا[1].

{والراغب} قال {الصدق المطابقة الخراجية مع الاعتقاد} لها كما قال الجاحظ {فان فقدا} اي المطابقة الخراجية واعتقادها اي مجموعهما بان فقد كل منهما او احدهما {فمنه كذب} وهو مافقد فيه كل منهما سواء صدق فقد اعتقاد المطابقة باعتقاد عدمها ام بعدم اعتقاد شيء[2]

{و} منه {موصوف بهما} اي بالصدق والكذب {بجهتين} وهو مافقد فيه واحد من المطابقة للخارج واعتقادها يوصف بالصدق من حيثُ مطابقته للاعتقاد او للخارج وبالكذب من حيثُ انتفت فيه المطابقة للخارج او اعتقادها فهو واسطة بين الصدق والكذب[3].

---

(١) غەیری جاحظ وتویەتی: راستی هەواڵ بریتیە لەوەی پڕاوپڕی بڕوای هەواڵدەرەکەبێ، ئیتر بڕواکەی پڕاوپڕی دیمەنی سەر زەوی بێت یان نە، هەواڵی درۆش بریتیە لەوەی پڕاوپڕی بڕوای هەواڵدەرەکەی نەبێت ، ئیتر بڕواکەی پڕاوپڕی دەرەوەی ذیهن و سەر زەوی بێ یاخود نە، کەوابوو هەواڵی سادەو ساویلکە کە بریتیە لەوەی بڕوای لەگەڵ دانەبێ جۆرە هەواڵێکە ها لەنێوان راست و درۆدا، ئیتر پڕاوپڕی دیمەنی دەرەوە بێ یاخود نە .

(٢) راغیبیش وتویەتی: راستی لەکەلامدا بریتیە لەوەی پڕاوپڕی دیمەنی دەرەوەی ذیهن بێ لەگەڵ ئەوەش هەواڵدەرەکەش بڕوای هەبێ بەو پڕاوپڕیە، ئەمە هەر وەکوو ئەوەی جاحظ وتی وایە، جا ئەگەر هاتوو پڕاوپڕی دیمەنی دەرەکی لەگەڵ باوەڕی هەواڵدەردا لەدەست دران، واتە کۆکراوەیی هەردوکیان ، بەم شێوە هەردوکیان لەدەست درابن یاخود یەکێکیان ، جا ئا ئەوە هەندێکی درۆیە ، ئەوەش بریتیە لەوەی کە هەردوکیانی تیادا لەدەست درابن، ئیتر چون یەکە لەدەستدانی باوەڕ بەپڕاوپڕی دیمەنی دەرەوەی ذیهن راستیەکە بەهۆی باوەڕ نەبوونی پڕاوپڕەکەیە یاخود بەهۆی نەبوونی بڕوا بەهیچ شتێکەوەیە.

(٣) هەندێکیش لەو کەلامە خەبەریە ناوزەد دەکرێ بەهەردوکیان، بەراستیش و بەدرۆیش بەدو دیوو، ئەوەش بریتیە لەوەی یەکێك لەو دوانەی تیا فەوتابێ، پڕاوپڕی دەرەوی ذیهن ، یابڕوای هەواڵدەرەکە بە پڕاوپڕیەکە، جا ئەم جۆرە کەلامە ناوزەد

{ومدلول الخبر} في الاثبات {الحكم بالنسبة} التي تضمنها كقيام زيد في قام زيد مثلاً {لاثبوتها} في الخارج {وفاقا للامام} الرَّازي في انه الحكم بها {وخلافاً للقرافي} في انه ثبوتها(١).

{والا} اي وان لم يكن مدلول الخبر الحكم بالنسبة بل كان ثبوتها {لم يكن شيء من الخبر كذبا} اي غير ثابت النسة في الخارج وقد اتفق العقلاء على ان من الخبر كذبا و أجيبَ بأن كذب الخبر بأن لم تثبت نسبته في الخراج ليس مدلوله حتى ينافي ماجعل مدلوله من ثبوت النسبة غاية الأمر أن الخبر الكذب تخلف فيه المدلول عن الدليل لان دلالته وضعية لا عقلية(٢).

دەکرێ بە راست لەو ڕووەوە کە پڕاوپڕی باوەڕی هەواڵدەرەکەیە، یاخود پڕاوپڕی دەرەوەی ذیهنە، وە دروستە ناوزەدیش بکرێ بەدرۆ لەو ڕووەوە کەپڕاوپڕی دەرەوەی ذیهن تیا فەوتاوە ، یا پڕاوپڕی باوەڕی هەواڵدەرەکەی تیا فەوتاوە ، جا ئا ئەوەیان مامناوەندیە لەنێوان راست و درۆدا.

(١) مەدلولی هەواڵ لەرستەی موثبەتدا بریتیە لەو حوکم بەنیسبەتەی کەلامەکە گرتویەتیە خۆی، بۆ وێنە وەك وەستانی زەید لەڕستەی (قامَ زيدٌ)نەك بریتیبێ لەثابت کردنی ئەو نیسبەتە لەسەر زەمین و دەرەوەی ذیهندا ، پێشەوا رازیش هامڕایە لەوەدا دەڵێ: مەدلولی خەبەر حوکم بەنیسبەتەکەیە ، بەڵام قەرافی جیاوازە لەوەدا دەڵێ: بریتیە لەثابت کردنی نیسبەتەکە .

(٢) واتە ئەگەر مەدلولی خەبەر حوکم بەنیسبەتەکە نەبێ بەڵکو ثبوتی نیسبەتەکە مەدلولی بێ ، ئەو کاتە هیچ خەبەرێك درۆ نابێ، واتە لەسەر زەمین و دەرەوەی ذیهندا ثابت نەبێ خۆ بێگومان هەموو خاوەن بیرەکان یەکڕان لەسەر ئەوەی کە هەندێ خەبەر هەن درۆن. واتە: وەڵام دراوەتەوە: هەواڵی درۆ کە نیسبەتە ثابت نەبووبێ لەدەرەوەی ذیهندا ئەوە مەدلولی هەواڵ نیە-هەرچەندە لەپێشەوە وترا هەندێ هەواڵ مەدلولەکەیان درۆیە- هەتا دژایەتی قسەی پێشو بکات کە مەلولەکەی کراوە بەثابت بوونی نیسبەتەکە -کەوابوو مەلولی هەموو خەبەرێك راستیە - ئەی هەواڵی درۆ چی‌یە؟ کورتەی کارەکە ئەمەیە هەواڵی درۆ بریتیە لەوەی دال هەیەو مەدلول نیە چونکە دەلالەتەکەی وەضعیە و دانراوە- لەدەلالەتی وەضعیدا ئەبێ و ئەگونجێ دال هەبێ و مەدلول نەبێ - بەلام لە دەلالەتی عەقلیدا نابێت دال هەبێ و مەدلول نەبێ.

وتقسم الخبر الى الصدق والكذب باعتبار وجود مدلوله معه وتخلفه عنه نعم الاول الموافق للامام الرّازي سالم من هذا التخلف وتقسيم الخبر عليه الى الصدق والكذب باعتبار ماتضمنه من النسبة كما سيأتي[1] ويقاس على الخبر في الاثبات الخبر في النفي فيُقالُ مدلوله الحكم بانتفاء النسبة وَ قِيلَ انتفاءها[2] و قوله و إلاّ لم يكن شيء من الخبر كذبا اوضح كما قال من عبارة المحصول لم يكن الكذب خبرا ومن عبارة التحصيل وغيره لم يكن الخبر كذبا[3] {ومورد الصدق والكذب} في الخبر {النسبة التي تضمنها ليس غير كقائم في زيد بن عمر وقائم لا بنُوة زيد} لعمرو ايضا فقائم المسند الى ضمير زيد مشتمل على نسبة هي قيام زيد وهي مورد الصدق والكذب في الخبر المذكور لا بنوة زيد لعمرو فيه ايضا اذ لم يقصد به الاخبار بها[4].

(١) دابەشکردنی هەواڵ بۆ ڕاست و درۆ ئەو بەاعتباری ئەوەی مەدلولەکەی لەگەڵ دابێ ئەوە ڕاستە وەئەگەر مەدلولەکەی نەیێ بەشوێن دالەکەیدا ئەوە درۆیە –کەوابوو خەبەر چ حوکمی نیسبەتەکە بێ هەردەبێ وەچ ثبوتەکەی بێ هەر دەبێ–بەڵام کامیان زۆر چاکە؟ بەڵێ پێناسەی یەکەم کە پێشەوا رازی هاوڕایەتی لەم بەجێمان و دواکەوتنی مەدلولە لە دالەکە بێگەردو بێخەوشە، دابەش کردنی هەواڵ لەسەر ئەوەی کە هەواڵ حوکمەکەیە ، بۆ ئەوەی کە هەندێکی ڕاستەو هەندێکی درۆیە ئەوە بەاعتباری ئەو نیسبەتەیە کە هەواڵەکە لەخۆی گرتووە. وەك لەمەودوا دێ.

(٢) هەواڵی مەنفی قیاس دەکرێتە سەر هەواڵی موثبەت ، لەبەر ئەوە دەوترێ: مەدلولی هەواڵی مەنفی بریتیە لەحوکم بە نەبوونی نیسبەتەکە، هەندێك ووتویانە: نەبوونی خودی نیسبەتەکەیە

(٣) دانەر کەووتی، ئەگەر وانەبێ هیچ شتێك لەجۆری هەواڵ درۆ نەدەبوو –وإلا لم یکن شیئاً کذباً– ئەم داڕشتنەی دانەر ڕوونترەو چاکتر مەبەستی پێکاوە، ئەو لەو داڕشتنەی کە لەکتێبی (المحصول)دا وتوویەتی: (لم یکن الکذب خبراً) ، درۆ نەدەبوو بەهەواڵ، چونکە وا دەگەیەنێت درۆ هەیە بەڵام ناوی هەواڵ نیە، کەچی واش نیە، وە ڕونتریشە لەداڕشتنەکەی کتێبی (التحصیل)ی، و غەیری ئەویش کە دەڵێ: ( لم یکن الخبر کذباً)، هەواڵ نەدەبوو بەدرۆ، چونکە وادەگەیەنێ هەرچی هەواڵ هەیە درۆیە، کە وایش نیە. (٤) ئەو جێیەی لە هەواڵدا کە ڕاستی و درۆی دەچێتە سەرو هاوردگەیەتی بریتیە لەو نیسبەتەی کە مەبەستەو هەواڵەکە لەخۆی گرتووە نەك شتی تر، وەك قائمٌ، لەنموونەی:(زید بن عمر قائم)، دا مەبەست نیسبەتدانی وەستانە بۆلای زەید،نەك مەبەست کوڕایەتی زەید بێ بۆعەمریش، کەوابوو: قائمێك کە ڕاست دراوەتە

{ومن ثم} اي من هنا وهو ان المورد النسبة اي من اجل ذلك {قال} الامام {مالك وبعض اصحابنا الشهادة بتوكيل فلا ابن فلان فلاناً شهادة بالوكالة} اي التوكيل {فقط} اي دون نسب الموكل . ووجه بنائه على ما ذكر ان متعلق الشهادة خبر كما سياتي[1] . {والمذهب} اي الراجح عندنا انها شهادة {بالنسب} للموكل {ضمنا الوكالة} اي التوكيل {اصلا} لتضمن ثبوت التوكيل المقصود لثبوت نسب الموكل لغيبته عن مجلس الحكم[2] .

{مسئلة الخبر} بالنظر الى امور خارجة عنه {اما مقطوع بكذبه كالمعدوم خلافه ضرورة} مثل قول القائل النقيضان يجتمعان او يرتفعان {او استدلالا} نحو قول الفلسفي العالم قديم[3] .

---

پاڵ ضمیرێك و دەگەڕێتەوە بۆ زەید داگرندەیە بەسەر نیسبەتێکدا کە وەستانی زەیدە، ئەو نیسبەتە هاوردگەی ڕاست و درۆیە لەهەواڵەکەدا، نەك کوڕایەتی زەید بۆ عەمریش مەبەستی سەرەکی بێ، چونکە مەبەست بەو هەواڵە هەواڵدان نەبووە بەکوڕایەتی زەید بۆ عەمر.

(١) لەبەر ئەوەی کە هاوردگەی ڕاست و درۆ نیسبەتەکەیە پێشەوا مالیك وهەندێ لەهاوڕێیانی ئێمە ووتوویانە: گەواهی دان بەوەی کە فلان کەس کوڕی فلان کەسی فلانیکردووە بەوەکیل خۆی ئەمە تەنها گەواهی دانە بەکردنە وەکیلە و بەس، واتە نەك دیاری کردنی باوکیەتی و کوڕایەتی وەکیل گرەکەیە، هۆی دروستبوونی ئەو گوتەی پێشەوا مالیك و هاوبیرانی لەسەر ئەوەی باس کرا ئەوەیە کە ئەوەی گەواهی لەسەر دراوە هەواڵەکەیە، نەك ڕەچەڵەکی کابرا، وەك لەمەدا دێ.

(٢) بەڵام ڕێڕەوی ئێمە کە راجیح ئەوەیە ئەو گەواهیە گەواهیشە بۆ ڕەچەڵەکی وەکیل گرەکەش، بەڵام لەخۆی گرتووەو لێوەردەگیرێ، وەگەواهیشە بەوەکیل گرتنەکەش، چونکە سەلماندنی بەوەکیل گرتنەکە کە مەبەستی سەرەکیە دەبێ بگرێتە خۆی سەلماندنی ڕەچەڵەکی وەکیل گرەکە، چونکە ئامادەی کۆڕی حوکمەکە نیە.

(٣) ئەمەش بابەتێکی تره، هەواڵ بەگوێرەی سەرنجدان بۆ چەندشتێکی دەرەکی خۆی: یا دڵ گومانی لێ براوە کە درۆیە، وەك ئەوەی پێچەوانەکەی زانراوەو بەڵگە نەویستە، نموونەی وەك بوێژێك بڵێ: دوو دژ بەیەك -لەیەك کاتدا- کۆ دەبنەوە -وەك ڕۆژو شەو- یاخود هەردوکیان نابن، ئەمە بێگومانە کات یا شەوە یا ڕۆژە، یاخود بەهۆی بەڵگەوە پێچەوانیەکەی زانراوە، وەك کەسێ لەسەر ڕێڕەوی فەلسەفەبێ دەڵێ: ئەم جیهانە هەر بووە.

{وكـل خـبر} عنـه ﷺ {او هـم بـاطلا} اي اوقعـه في الوهـم اي الذهـن {ولم يقبـل التاويل فمكذوب} عليه ﷺ لعصمته عن قول الباطل {او نقص منه} من جهة راوية {مايزل الوهم} الحاصل بالنقص منه [١] .

من الاول ماروى ان الله خلق نفسه فإنَّهُ يوهم حدوثه اي يوقع في الوهم اي الذهن ذلك وقد دل العقل القاطع على انه تعالى منزه عن الحدوث[٢] .

ومن الثاني مارواه الشيخان عن ابن عمر قال صلى بنا رسول الله ﷺ صلاة العشاء في آخر حياته فلما سلم قام فقال ارايتكم ليلتكم هذه فان على راس مائة سنة منها لايبقى ممن هو اليوم على ظهر الأرض احد قال ابن عمر فوهل النّاس في مقالته[٣] وانما قال لا يبقى ممن هو اليوم يريد ان ينخرم ذلك القرن [٤] .

---

(١) هەرچی فەرموودەو هەواڵ هەیە لەپێغەمبەرەوە دەوترێتەوە بەتاڵ و شتی بۆش دەخاتە مێشك و بیری مرۆڤەوە تەئویلیش قەبوڵ ناكا ئەوە درۆیەو بەدەم پێغەمبەرەوە كراوە، چونكە پێغەمبەر پارێزراوە لەووتەی بەتاڵ، یاخود هەندێ لە فەرموودەكە كەم كرابێتەوە و لابرابێ لەلایەن ڕیوایەت كەرەكەیەوە كە ئەوشتە غەڵەت و بەتاڵەی بەهۆی لابردنەكەوە پەیدا بووە هەر دەمێنێتەوە، چونكە ڕاویەكە وای زانیوە ئەوە غەڵەتەكەی لابردووە.

(٢) نموونەی یەكەم ئەوەیە ڕیوایەت كراوە گوایە پێغەمبەر فەرموویەتی: بێگومان خوا خۆی خودی خۆی دروست كردووە، ئەم هەواڵە ئەوە ئەخاتە ذیهنی مرۆڤەوە كە خوا دروست كراوە، كەچی بەڵگەی گومان بڕ دەلاڵەت دەكا لەسەر ئەوە كە خوا پاكەو دورە لەوەی تازەبێ و دروست كرابێ.

(٣) سەر بە بەشی دووەمیشە ئەو فەرموودەی بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان كردووە لەعبد الله كوڕی عومەرەوە دەڵێ: پێغەمبەر نوێژێكی خەوتنانی بۆ كردین لەساتە كۆتاییەكانی ژیانیدا، جا كاتێ كە سڵاوی دایەوە فەرمووی: ئایا دەزانن ئەم شەوەتان چ شەوێكە، بێگومان بن لەم شەوەوە هەتا شەوی صەدەهەم ساڵی ئایندە لەوانەی ئەمڕۆ لەژیاندان یەك كەسیان بەسەر زەوییەوە نامێنێتەوە. عبد الله كوڕی عمر ووتی: خەڵكی بەغەڵەت لەفەرموودەكەی حاڵی بوون.

(٤) بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: كەس نامێنێتەوە لەوانەی كە ئەمڕۆ هەن، مەبەستی ئەوەی كرد ئەو سەدە پێشووە دەبڕێتەوە، هەرچی خەڵكی سەدەی پێشوو هەن هەموویان لەسەدەی داهاتوودا دەمرن، نەك جیهان لەسەدەی داهاتوودا دەبڕێتەوە.

قوله فوهل النّاس بفتح الهاء أي غلطوا في فهم المراد حيثُ لم يسمعوا لفظة اليوم[1] ويوافقه فيها حديث ابي سعيد الخدري لا تأتي مائة سنة وعلى الارض نفس منفوسة اليوم وحديث جابر مان نفس منفوسة اليوم يأتي عليها مائة سنة وهي حية يومئذ رواها مسلم وروى مسلم أيضاً عن جابر ان ذلك كان قبل موته ﷺ بشهر وقوله منفوسة أي مولودة احترز به عن الملائكة[2].

{وسبب الوضع} للخبر بأن يكذب على النبيّ ﷺ {نسيان} من الراوي لما رواه فيذكر غيره ظانا انه المرويُّ[3] {او افتراء} عليه ﷺ كوضع الزنادقة احاديث تخالف المعقول تنفيرا للعقلاء عن شريعته المطهرة[4] {او غلط} من الراوي بأن يسبق لسانه الى غير مارواه او يضع مكانه مايظن انه يؤدي معناه[5].

---

(١) عومەر کە ووتی: (فوهل الناس)، واتە لەمەبەست فەرموودەکە حاڵی نەبوون و کەوتنە هەڵەوە، چونکە ئەوان وشەی: (الیوم)یان نەبیستبوو، ئەگەر ئەویشی تیادا نەبێ واتە لەسەدەکەی تردا جیهان دەبڕێتەوە.

(٢) هەماهەنگی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر دەکا لە لفظی: الیوم، دا فەرموودەێك کە ابو سیعدی الخدری ڕیوایەتی دەکا، دەفەرمووی: ئەوەی ئەمڕۆ لەدایك بووبێ سەد ساڵی تر نابێت ئەو بەسەر زەویەوە مابێتەوە، یا ئەو فەرموودەی جابر دەفەرمووی: هیچ کەسێك نیە ئەمڕۆ لەدایك بوبێ و صەد ساڵی تری بەسەردابێ ئەو زیندووبێ لەو ڕۆژەدا، هەردووکیان موسلم ڕیوایەتیان دەکات، هەروەها موسلم لەجابرەوە ڕیوایەت دەکات و دەڵێ: ئەو فەرموودەی بەمانگێ پێش مردن فەرمووی، ووشەی (منفوسة)، واتە لەدایك بووبێ، بەو ووشەش فریشتە چووە دەرو ئەو هەواڵە ئەوان ناگرێتەوە.

(٣) هۆی دانانی درۆ لەناو فەرموودەدا، بەم شێوە درۆ بکرێ بەدەم پێغەمبەرەوە: ١-لەبیر چوونەوەی ئەوەی ڕیوایەت کەرەکە ڕیوایەتی کردووە، شتێکی تر لەجێگەیدا باس دەکا، وا دەزانێ ئەمەیان ڕیوایەت کراوەکەیە.

(٤) ٢-یاخود درۆو هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە، وەك بێ بڕواکان چەندەها بەناو فەرموودەیان داناوە بەدەم پێغەمبەرەوە کە پێچەوانەی پەسەندکراوی ژیریە، بۆ ئەوەی ژیران و خاوەن بیران دوور بخرێنەوە لەڕێبازیپاکی پێغەمبەر، چونکە ڕێبازی خواو ژیری سەلیم هاوتەریبن.

(٥) ٣-یاخود غەڵەتێکە لەلایەن ڕیوایەت کەرەکەوە دەکرێ بەیەکێ لەم دوو شێوە: <u>یەکەم</u>: هەڵەی زبان، لەباتی ئەوەی ئەوەی بیستوویەتی بیڵێ کوتوپڕ زبانی پێش بیری دەکەوێ و شتێکی تر دەڵێ، <u>دووەم</u>: لەباتی ئەوەی لەپێغەمبەری بیستووە شتێکی تر

{او غيرها} كما في وضع بعضهم احاديث في الترغيب في الطاعة والترهيب عن المعصية[1] {ومن المقطوع بكذبه على الصحيح خبر مدعي الرسالة} اي قوله انه رسول الله الى الناس {بلا معجزة او} بلا {تصديق الصادق} له لان الرسالة عن الله على خلاف العهادة والعادة تقضي بكذب من يدعي مايخالفها بلا دليل وَ قِيل لا يقطع بكذبه لتجويز العقل صدقه اما مدعي النبوة اي الايحاء إليهِ فقط فلا يقطع بكذبه كما قاله امام الحرمين[2] {وما نقب} اي فتش {عنه} من الحديث {ولم يوجد عند اهله} من الرواة من المقطوع بكذبه لقضاء العادة بكذب ناقله [3] .

وَ قِيل: لا يقطع بكذبه لتجويز العقل صدق ناقله وهذا مفروض بعد استقرار الاخبار اما قبل استقرارها كما في عصر الصحابة فيَجوزُ أن يروي أحدهم ماليس عند غيره كما قاله الامام الرَّازي[4] .

---

لەجیٚدابنیٚ و وابزانیٚ ماناوەبەستیفەرمودەکەی پێغەمبەر دەگەیەنیٚو دەهێنێتەدی.

(١) ٤-یاخود غەیری ئەو سیانە، وەك هەندێکیان چەندەها فەرموودەیان داناوە بۆ ئەوەی هانیخەڵك بدەن بۆ گویٚ رایەڵی خواو پێغەمبەر، یا ترساندنیان و دورخستنەوەیان لەگوناه و بیٚ فەرمانی.

(٢) هەندێکیتر لەوەی کە گومان لەدرۆبونیدا نیە بەلای قەولی صحیح وە هەواڵی ئەو کەسەیە کە دەڵیٚ: من پێغەمبەری خوام و نێرراوم بۆ خەڵك، بیٚ ئەوەی معجزەو بەڵگەی دەستەوەسان کردنی خەڵك هەبیٚ، یاخود پێغەمبەرێك بڕوای پیٚ بکات، چونکە پەیام لەلایەن خواوەبیٚ شتێکە پێچەوانەی خوو عادەتە، خوو عادەتیش حوکم بەدرۆی کەسێك دەکات کە بیٚ بەڵگە شتێك بڵیٚ نەگونجیٚ لەگەڵ عادەتدا، هەندێك وتوویانە: بەدرۆ زانینەکەی گومان بڕینە، چونکە بەگوێرەی عەقڵ ئەگونجیٚ هەواڵەکە ڕاست بیٚ، بەڵام کەسیٚ داوای ئەوە بکا کە گوایە بەتەنها وەحیی بۆ دیٚ بیٚ پەیام، ئەوە ناوتریٚ بێگومان ئەو هەواڵەی درۆیە، وەك امام الحرمین وتوویەتی:

(٣) ئەو هەواڵەی کە زۆر بەشوێنیا گەڕاون لە جۆری فەرموودە، بەڵام هەواڵەکە لای ئەهلی خۆی دەست نەکەویٚ و نەبیٚ، واتە لای ئەوانەی فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە، ئەو هەواڵە درۆیێکی بێگومانە، چونکە عادەت حوکم ئەدا بەدرۆزنی ئەو نەقڵەی کردویە -چونکە لای کەس دەست نەکەوتووە-

(٤) هەندێکیش ووتوویانە: ناوتریٚ بیٚگومان درۆیە، چونکە عەقڵ ڕیٚ ئەدا بەڕاستگۆیی نەقڵ کەرەکەی، ئەمەش شتێکە گومان بڕ کراوە لیٚ بوینەتەوە دوای جیٚخۆگرتنی هەموو فەرموودەکان لەناو کتێبەکانی فەرموودەدا، دوای تحقیق کردنی،

{وبعض المنسوب الي النبيِّ ﷺ} من المقطوع بكذبه لأنه روى عنه انه قال سيكذب علي فان كان قال ذلك فلا بد من وقوعه والافيه كذب عليه وهو كما قال المصنِّف حديث لا يعرف[1] .

{والمنقول آحاد فما تتوفر الدواعي على نقله} تواتراً كسقوط الخطيب عن المنبر وقت الخطبة من المقطوع بكذبه لمخالفته للعادة[2] {خلافاً للرافضة} اي في قولهم لايقطع بكذبه لتجويزالعقل صدقه وقد قالوا بصدق ماروره منه في امامة علي ﷺ نحو انت الخليفة من بعدي مشبهين له بما لم يتواتر من المعجزات كحنين الجذع وتسلمي الحجر وتسبيح الحصى[3] .

---

ڕاستگۆیی ڕیوایەتکەرەکان دوای وەفاتی پێغەمبەر بە موددەیەك، بەلام پێش جێ گرتنی هەموو فەرموودەیەك لەجێ خۆیدا، وەك لەسەردەمی هاوڕێیانی پێغەمبەردا، ئەوە ئەگونجاوە یەکێکیان فەرموودەیەك ڕیوایەت بکا کە بەلای کەسی ترەوە نەبێ، وەك پێشەوا ڕازی فەرموویەتی:

(١) هەندێ فەرموودە هەن ئەدرێنە پاڵ پێغەمبەر بێگومان کە درۆن، چونکە ڕیوایەت کراوەکە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: لەمەودوا درۆ بەدەممەوە دەکرێ، جا ئەگەر پێغەمبەر ئەوەی فەرمووبێ ئەوە هەر دەبێ بێتە دی و درۆی بەدەمەوە بکرێ، بەلام ئەگەر پێغەمبەر ئەوەی نەفەرمووبێ ئەوەیە: سیکذب علی، درۆ بەدەمیەوە هەڵبەستراوە، وەك دانەر لە (منع الموانع) دا فەرموویەتی: ئەم فەرموودە ناناسرێ لای ئەهلی فەرموودە.

(٢) هەروەها درۆیەکی بێگومانە ئەو هەواڵەی تاکە کەسێ نەقڵی کردبێ،مەدلولی ئەو فەرموودەش لەبارەی شتێکەوەبێ دەواعی نەقڵی بەدەستە دەستەیی خەڵك زۆربێ و زۆر گرنگ بێ، وەك کەوتنە خوارەوەی وتاربێژێك بەسەردوانگەوە لەکاتیخوێندنەوەی وتاری هەینیدا ئەمە شتێکی بێگومانە کە درۆیە، چونکە پێچەوانەی عادەتە، ئەگەر شتی وا هەبێ تاکە کەسێ نایبینێ بەڵکو زۆربەی خەڵکەکە ئەوەی گەڕێنێتەوە.

(٣) ئەمەش پێچەوانەی ڕافضیەکانە کە دەڵێن: ئەو فەرموودەی کە باسی شتی زۆر گرنگیش بکات بێگومان نین لەدرۆ بونیدا، چونکە لەڕووی عەقڵەوە ئەگونجێ ڕاست بێ ئەوان ئەو هەواڵەی ڕیوایەتیان کردووە لەبارەی پێشەوایەتی پێشەوا عەلیەوە، وەك تۆ دوای خۆم جێنشینمی، بەڵگەشیان ئەوەیە دەڵێن: ئەم فەرموودەش وەك ئەو فەرموودانەی کەمتواتر نین لەبارەی موعجزەکانی پێغەمبەر دەدوێن وەك: ناڵینی کۆتەرەدارو بەرد سلاوی لێ کردووەو بەردە وورده لەدەستیا (سبحان الله) یان کردووە،

**قُلْنا: هذه كانت متواترة واستغني عن تواترها الى الآن بتواتر القُرآن[١] بخلاف مايذكر في امامة علي فإنَّهُ لايعرف ولو كان ماخفي على اهل بيعة السقيفة اي الصحابة الذين بايعوا ابا بكر في سقيفة بني ساعدة من الخزرج وهي صفة مظللة بمنزلة الدار لهم ثُمَّ بايعه علي وغيرهﷺ[٢] {وإما} مقطوع {بصدقه كخبر الصادق} اي الله تعالى لتنزهه عن الكذب ورسوله ﷺ لعصمته عن الكذب[٣] {وبعض المنسوب الى محمد ﷺ} وان كنا لانعلم عينه[٤].**

---

ئەمانەش موعجیزەن بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی محمدن.

(١) ئێمەیش دەڵێین: ئەمانە پێش جێگیر کردنی فەرموودەکان لەناو کتێبەکاندا، واتە لەسەردەمی هاوڕێیان و شوێنکەوتواندا متواتر بوون و هەموو کەس ئەم هەواڵانەی دەزانی، ئیتر بەهۆی تەواتری قورئانەوەو پێغەمبەرایەتی محمدی ئەسەلماند، کە ئەوەش مەبەستی ئەو موعجیزانە بووە، ئیتر لەوکاتەوە تا ئێستە خەڵك پێویستیان پێ نەبوون، بۆیە دوای جێگیرکردنی فەرموودە لەبەشی هەواڵی ئاحاد ریوایەت کراون.

(٢) بەڵام ئەوەی لەبارەی ئیمامەتی حەزرەتی عەلیەوە دەوترێ وانیە، چونکەلەپێش و پاش جێگیربوونی فەرموودەکانەوە هەر متواتر نەبووە، کەچی ئیمام شارەگی ژیانی موسوڵمانانە، بەلای ئەهلی فەرموودەوە نەناسراوەو نەزانراوە، خۆ ئەگەر شتی وا هەبوایە شتێکی شاراوە نەئەبو بەلای ئەهلی پەیمانی (السقیفة)وە، واتە ئەو هەموو هاوەڵانەی کە پەیمانی إمامەتیاندا بە ئەبوبەکر لەکەپرە بەناوبانگەکەی هۆزی ساعدەدا لەبنەماڵەی خەزرەج، (سقیفة) واتە کەپرێك سێبەرێکی کەری هەبێ لەباتی دیواخانی زستانانە، پاشان حەزرەتی عەلی و غەیری ئەویش پەیمانیدا بە ئەبو بەکر، ئا لەم کاتەدا لەبەر دڵگەرمی صحابەو خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەرو هێشتا لاشەی پیرۆزی نەنێژراوە عەلی زۆر بەهێزترە لە ئەبو بەکر، ئەگەر شتی وا هەبوایە ئەی ووت خەڵکینە پێغەمبەرﷺ منی لەجێ خۆی داناوە بێگومان بێ یەك و دوو کردن هەموویان ڕازی دەبوون.

(٣) یاخود هەواڵ ڕاستیەکەی لەگومان بڕاوە، وەك هەواڵی ڕاستگۆ چ خوابێ چونکە خوا پاکە لەدرۆ، وە چ پێغەمبەرەکەی بێ، چونکە پارێزراوە لە درۆ، کەسێ پەیامی خوا بەرێ بۆ خەڵك نابێ درۆ بکات.

(٤) یا هەواڵی ڕاست وەکو هەندێ فەرموودە نیسبەت بدایێ بۆلای پێغەمبەر هەرچەند خودی لەفزەکەی نەزانین .

{ولا تكفي الأربعة} في عدد الجمع المذكور {وفاقا للقاضي} ابي بكر الباقلاني {والشافعية} لاحتياجهم الى التزكية فما لوشهدوا بالزنا فلا يفيد قولهم العلم {ومازادَ عليها} اي الأربعة {صالح}لأن يكفي في عدد الجمع في المتواتر من غير ضبط بعددٍ معيّن[1] . {وتوقف القاضي في الخمسة} هل تكفي {وقال الإصطخري اقله} اي اقلّ عدد الجمع الذي يفيد خبره العلم {عشرة} لان مادونها آحاد[2] .

{وَ قيلَ } اقله {اثنا عشر} كعدد النقباء في قوله تعالى:﴿ وبعثنا منهم اثنى عشر نقيبا ﴾ [3] بعثوا كما قال اهل التفسير للكنعانيين بالشام طليعة لبني اسرائيل مأمورين بجهادهم ليخبروهم بحالهم الذي لا يرهب فكونهم على هذا العدد ليس إلاّ لأنه اقلّ مايفيد العلم المطلوب في مثل ذلك[4] .

---

(١) چوار کەس بەس نیە لەژمارەی دەستەی تواتردا، بەچوار کەس هەواڵ پلەی تواتری نادرێتێ، باقلانی و زانایانی شافیعیش هاوقسەن لەم باسەدا، چونکە چوار کەس ئەگەر گەواهیاندا بەزینا دەبێ تەزکیە بکرێن جا گەواهیەکەیان لێ وەر دەگیرێ، لەبەر ئەوە تەنها قسەکەیان عیلم ناگەیەنێ، ئەگەر ژمارەکەیان لەوچار زیاتر بوو ئەوە دەشێ بۆ ئەوەی ژمارەی دەستەی هەواڵی متواتر بێتەدی بێ ئەوەی ظبط بکرێ بەژمارەیەکی دیاری کراوەوە.

(٢) قازی لەژمارەی پێنجدا هەڵوێستەی کردووە، ئایا دەشێ پێنج کەس هەواڵەکەیان عیلم بگەیەنێ یا نە؟ إصطخریش وتویەتی: کەمترین ژمارە دەستەی متواتر پێك بێنێ و هەواڵەکەیان عیلم بگەیەنێ دە کەسە، چونکە کەمتر لەدە لەزانستی ماتماتێکدا تاکەکانیان پێ دەوترێ.

(٣) هەندێکیش وتوویانە: کەمترین ژمارەی هەواڵی متواتر دەبێ دووازدەبێ، وەك ژمارەیئەو پشکێنەرانەی خوا لەبارەیانەوە دەفەرمووی: دوازدە پشکێنەرمان – نقیب– لەهۆزی ئیسرائیل نارد.

(٤) وەك زانایانی تەفسیر دەفەرموون: نێردران بۆ سەر، کەنعانیەکانی شام بۆ ئەوەی قەرەووڵ و حکومیان بەسەرەوە بکەن و هەواڵەکە بدەنەوە بەهۆزی ئیسرائیل کە فەرمانیان پێ درابوو جیهادیان بکەن، بەلاّم هەواڵێکیان بۆ بگێڕنەوە هۆزی ئیسرائیل نەترسێنێ و نەیان هێنێتە لەرزە، کەوا بونی ئەم قەرەوولانە لەسەر ئەم ژمارەیە تەنها بۆ ئەوەیە کە کەمترین ژمارە کە عیلمی داواکراو بگەیێنێ لەو جۆرە بابەتانەدا ژمارە دوانزەیە.

{والمتواتر معنى اولفظا وهو خبر جمع يمتنع} عادة {تواطؤهم على الكذب عن محسوس} لامعقول لجواز الغلط فيه كخبر الفلاسفة بقدم العالم [1] فان اتفق الجمع المذكور في اللفظ والمعنى فهو اللفظي وان اختلفوا فيهما مع وجود معنى كلي فهو المعنوي كما اذا أخبر واحد عن حاتم انه أعطى دينارا وآخر انه أعطي فرسا وآخر انه أعطي بعير وكذاً فقد اتفقوا على معنى كلي وهو الاعطاء[2] .

{و حصول العلم} من خبر بمضمونه {اية} اي علامة {اجتماع شرائطه} اي المتواتر في ذلك الخبر اي الأمور المحققة له وهي كما يؤخذ مما تقدَّمَ كونه خبر جمع وكونهم بحيث يمتنع تواطؤهم على الكذب وكونه عن محسوس[3] .

(١) یا وەك هەواڵی متواتر چ لەڕووی ماناوە بێت یا لەڕووی لەفزەوە بێت، ئەویش بریتیە لەهەواڵێك لەكۆمەڵێك وە بڵاوبێتەوە عادەتەن یەككگرتنی ئەو هەمووە لەسەر ئەو درۆیە نەگونجێ و مەحاڵ بێ، دەبێ ئەو هەواڵەش لەڕووی شتێكەوە بێ كە هەست پێكراوبێ، نەك لەبارەی شتێكی نەبینراو عەقڵیەوەبێ، چونكە ئەگونجێ لەمەیاند عەقڵ غەڵەتی تیا بكات، وەك ئەو هەواڵەی فەیلەسوفەكان ئەیدەن و دەڵێن: جیهان هەر بووە.

(٢) جا ئەگەر ئەو ژمارە زۆرە هەموویان یەك ڕابوون لە لەفزو مانای ئەو هەواڵەدا. ئەوە پێی دەوترێ تواتری لەفزی، وە ئەگەر جیاوازیشیان هەبو لە لەفزو مانایدا، بەڵام مانایەكی كولی قسەی هەمویان بگرێتەوە، وە ئەوە پێی دەوترێ تواتری مەعنەوی، وەك ئەوەی كاتێ یەكێكیان بڵێ: حاتەم دینارێكی بەخشی. یەكێكی تریان بڵێ: ئەسپێكی بەخشی ، وە یەكێكی تر بڵێ: وشترێكی بەخشی. هەروەها تا كۆتایی، ئەوە هەر هەموویان یەك ڕاو یەك قسەو یەك مەبەست بوون لەسەر مانا كولیەكە كە بەخشینە.

(٣) كۆبوونەوەی هەموو مەرجەكانی تەواتور نیشانەی پەیدابوونی عیلمە لە تەواتورەوە، یاخود بڵێن: عیلم كە پەیدا دەبێ بەمەدلولی هەواڵەكە، نیشانەی كۆ بوونەوەی هەموو مەرجەكانی تواترە لەو هەواڵەدا، واتە ئەو جوزئانەی كە ماهیەتی هەواڵەكە دەهێننەدی، ئەو جوزئانەش وەك لەوەی پێشەوە وەردەگیرێن:

١-ئەبێ ئەو هەواڵە لەلایەن دەستەو پێرێكی زۆرەوەبێ.

٢- ئەوەندە زۆر بن نەگونجێ بڕیاری ڕێك كەوتنیان دابێ لەسەر درۆ كردن.

٣- ئەبێ ئەو هەواڵە لەبارەی شتێكی هەست پێكراوەوە بێ.

{و} قيل اقله {عشرون} لان الله تعالى قال ان يكن منكم عشرون صابرون يغلبوا مائتين فيتوقف بعث عشرين لمائتين على اخبارهم بصبرهم فكونهم على هذا العدد ليس إلاّ لأنه اقلُ مايفيد العلم المطلوب في مثل ذلك[1] .

{و} قيل اقله {اربعون} لان الله تعالى قال يا ايها النبيّ حسبك الله ومن اتبعك من المؤمنين وكانوا كما قال اهل التفسير اربعين رجلا كملهم عمر﷼ بدعوة النبيّ ﷺ فاخبار الله عنهم بأنهم كافؤا نبيه يستدعي اخبارهم عن انفسهم بذلك له ليطمئن قلبه فكونهم على هذا العدد ليس إلاّ لأنه اقلّ مايفيد العلم المطلوب في مثل ذلك[2] . {و} قيل اقله {سبعون} لأن الله تعالى قال:﴿ واختار موسى قومه سبعين رجلاً لميقاتنا ﴾[3] .

---

(١) گروپێکی تر وتویانە: کەمترین ژمارە هەواڵ بگەیێنێتە پلەی متواتر ژمارە بیستە، چونکە خوای گەورە دەفەرمووی: ئەگەر لەئێوە بیست کەس خۆڕاگر هەبێ، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دوسەد لەواندا، ناردنی بیست موسوڵمان بۆ سەر دوصەدی بێ باوەڕ بەسراوەو دەوەستێنرێت لەسەر ئەوەی خۆیان ڕای بگەیێنن کە دەتوانن خۆیان ڕاگرن، جا کەوابوو پەیوەست کردنیان بەم ژمارەوە هیچ ناگەیەنێ جگە ئەوە نەبێ کە کەمترین ژمارە ئەو عیلمە داوا کراوە بگەیێنێ لەو جۆرە بابەتانەدا ددبێ لە بیست کەمتر نەبێ.

(٢) کۆمەڵێکی تر ووتوویانە: کەمترین ژمارە بۆ تەواتر دەست بداتَ ژمارەی چلە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەرو هەواڵدەر بەدەم خواوە کافیەو بەسە بۆ تۆ خواو ئەوانەی شوێنکەوتەت بون لەبڕواداران، ئەو موسوڵمانانەش وەك زانایان تەفسیر فەرموویانە چل کەس بوون سێ و سێ پیاو شەش ئافرەت و عومەر بەهۆی پاڕانەوەکەی پێغەمبەرەوە ژمارەی چلی بۆ پڕکردنەوە، جا کە خوا لەبارەیانەوە هەواڵ بداو بفەرمووێ: ئەوانە بەسن بۆ پێغەمبەرەکەی ئەوە دەخوازێ ئەوانەش وتبێتیان ئێمە بەسین بۆ پێغەمبەر، بۆیە ئەو هەواڵەش دراوە بۆ ئەوەی دڵی پێغەمبەر چاکتر جەم بێ و پشگو بڵاوە نەبێ، جا کەوابوو بوونی ئەوان کە بەسرابێ بەم ژمارەوە هیچ ناگەیەنێ جگە ئەوە نەبێ کەمترین ژمارە کە ئەو عیلمەی داوا کراوە لەو جۆرە بابەتانەدا هەبێ و بیگەیێنێ ژمارە چلە.

(٣) کۆمەڵێکی تر وتوویانە: کەمترین ژمارە پلەی تواتر وەر دەگرێ ژمارەی حەفتایە، چونکە خوایگەورە فەرموویەتی:موسیحەفتا پیاوی هەڵبژارد لە خزمەکانی بێن بۆ ئەو شوێنەی وەعد درابوو و کاتمان بۆ دیاری کردبوو.

اي للاعتذار الى الله تعالى من عبادة العجل ولسماعهم كلامه من أمر ونهي ليخبروا قومهم بما يسمعونه فكونهم على هذا العدد ليس إلاّ لأنه اقلّ مايفيد العلم المطلوب في مثل ذلك[1].

{و} قيل اقله {ثلمائة وبضعة عشر} عدد اهل غزوة بدر والبضع بكسر الباء وقد تفتح مابين الثلاث الى التسع وعبارة امام الحرمين وغيره وثلاثة عشرو زاد أهل السير على القولين واربعة عشر وخمسة عشر وستة عشر وثمانية عشر وتسعة عشر وبعضهم قال ان ثمانية من الثلاثة عشر لم يحضروها وانما ضرب لهم سهمهم واجرهم فكانوا كمن حضرها وهي البطشة الكبرى التي اعز الله بها الاسلام[2] ولذلك قال ﷺ لعمر فيما ورواه الشيخان وما يدريك لعل الله اطلع على أهل بدر فقال اعملوا ماشئتم فقد غفرت لكم وهذا لاقتضائه زيادة احترامهم يستعدى التنقيب عنهم ليعرفوا وانما يعرفون باخبارهم[3].

---

(١).. واته بۆ ئەوەی بەڵگەو بەهانو بهێننەوەو گلەییشیان لەسەر نەمێنێ گوێرەکە پەرستیان کردووە، وە بۆ ئەوەش بەگوێ خۆیان گوتاری خوا ببیسن لەو شتانەی فەرمانی کردنیان دراوەو ئەو شتانەش کردنیان قەدەغە کراوە، جا ئەوانیش ئەوەی دەی بیسن بیکەنە هەواڵێك و بیدەنە خزمەکانیان، جا بونیان لەسەر ئەم ژمارەیە جگە بۆ ئەوە نەبێ کە کەمترین ژمارە ئەو عیلمەی داواکراوە لەو جۆرە شتانەدا بگەیەنێ، بۆ هیچ شتێکی تر نیە.

(٢) هەندێك وتویانە: کەمترین ژمارەی تواتر سێ صەدو ئەوەندەو دەیە، وانە ژمارەی هاوکارانی غەزای بەدر، ووشەی، بضع، بێکە بەژێرو کەم جارێکیش بەسەرە دەخوێنرێتەوە، بریتیە لەو ژمارە هەر لەسیانزەوە هەتا نۆزدە، ڕای إمام الحرمین و غەیری ئەو ووتویانە بریتیە لەسیانزەو بەس، زانایانی ژیان نامەکان ئەمەشیان لەسەر ئەو دوو قەولە زیاد کردووە: چواردەو پانزەو شانزەو هەژدەو نۆزدە، هەندێکیان وتوویانە: هەشت لەو سیانزەیە ئامادەی غەزا نەبوون، لەگەڵ ئەوەش هەر بەشیان بۆ دیاری کرا لەدەست کەوت و پاداشی خوایش ئیتر هەروەکو ئەوانەن کە بۆی ئامادە بوون، بەدر گەورەترین هەڵمەت بوو خوا ئیسلامی بەرز کردەوە.

(٣) هەر لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەعومەر لەو فەرموودەدا کە بوخاری و موسلم ڕیوایەتی دەکەن و فەرمووی: ئەی عومەر چ هەواڵی ئەوانی پێ داویت تۆ لەبارەیانەوە شت نازانی –ئەگونجێ و هیوا وایە خوا کە خۆی ئاگاداری ئەهلی بەدرە فەرمووبێتی بێگومان خۆشبووم لێتان چیتان ئارەزووە بیکەن– نەك گوناهیان بۆ

فكونهم على هذا العدد المذكور ليس إلاّ لأنه اقلّ عدد يفيد العلم المطلوب في مثل نلك و أُجيبَ بمنع الليسية في الجميع[1].

{والأصَحّ} انه {لا يشترط فيه} اي في المتواتر {اسلام} في رواته {ولا عدم احتواء بلد} عليهم فيَجوزُ ان يكونوا كفارا وان تحويهم بلد كأن يخبر اهل قسطنطينية بقتل ملكهم لان الكثرة مافعة من التواطىء على الكذب وَ قيلَ لا يَجوزُ ذلك لجواز تواطىء الكفار واهل بلد على الكذب فلا يفيد خبرهم العلم[2] {و} الأصَحّ {ان العلم فيه} اي في لمتواتر {ضروري} اي يحصل عند سماعه من غيره إحتياج الى نظر لحصوله لمن لا يتأتي منه النظر كالبله والصبيان[3] .

---

حەلاڵ بووە، بەڵكو ئەگەر توشیان بوو خوا لێیان دەبورێ- ئەم فەرموودەیە لەبەر ئەوەی داوای زیادە ڕێزیان دەكات دەخوازێ پشكنین لەبارەیانەوە بكرێ، بۆ ئەوەی بناسرێن، ئەوانیش كە دەناسرێن تەنها ئەبێ خۆیان هەواڵ بدەن كە فلانە كەسمان ئەگەڵ بو تاوای كرد.

(١) بوونیان لەسەر ئەو ژمارەیەی باس كرا تەنها بۆ ئەوە نەبێ كە كەمترین ژمارە عیلمی پێویست لەو جۆرە كارانەدا بگەیێنێ شتی تر نیە، وەڵامی ئەم قیلانە هەموویان دراونەتەوە كە: بووترێ: بوونی ئەو ژمارانە بۆ ئەوە نەبێ هیچ سودێكی تری نیە، لەهەموویاندا، ئەوە نابێ قەدەغەیە، ئەگونجێ ئەوەش بگەیێنێ و شتیتریش بگەیەنێ.

(٢) قەولی: اصح ئەوەیە موسوڵمانیەتی ڕیوایەت كەرەكە بە مەرج نەگیراوە، وە مەرجیش نیە ئەو ژمارە زۆرەی متواترە لەیەك شاردا نەبن و شارێك كۆیان نەكاتەوە لەبەر گومان، كەوابوو دروستە هەموویان كافر بن و یەك شاریش كۆیان بكاتەوە، وەك ئەوەی دانیشتوانی شاری قسطنطنیە هەواڵی كوشتنی پاشەكەیان ڕابگەیێنن -ئا لەو كاتەدا كافر بوون- زۆری دانیشتووانەكە ڕێگرە لەوەی ئەو هەموو خەڵكە زۆرە قسەی خۆیان یەك خەن لەسەر كردنی درۆێك ، هەندێك وتوویانە: ئەوە دروست نیە، چونكە ژمارەیێكی زۆر كافرو دانیشتوانی شارێك ئەگونجێ لەسەر كردنی درۆێك ڕێك بكەون، بۆیە هەواڵی ئەوان عیلم ناگەیێنێ.

(٣) قەولی: اصح و دیار ئەوەیە كە: پەیدابوونی عیلم بەهۆی هەواڵی متواترەوە شتێكی بەڵگە نەویستە، واتە هەر بەبیستنەكەی عیلمەكە پەیدا دەبێ بێ ئەوەی پێویستی هەبێ بەبەڵگەو تێڕوانین و بیركردنەوە، چونكە ئەوە نیە ئەو عیلمە پەیدا دەبێ بۆ كەسانێكیش كە خاوەنی بیرو تێڕوانین نین، وەك گێل و منداڵ.

{وقال الكعبي} من المعزلة {والامامان} اي امام الحرمين والامام الرَّازي {نظري وفسره امام الحرمين} اي فسَّر كونه نظريا كما افصح به الغزالي التابع له اخذاً من كلام الكعبي {بتوقفه على مقدمات حاصلة} عند السامع وهي المحققة لكون الخبر متواتراً من كونه خبر جميع وكونهم بحيث يمتنع تواطؤهم على الكذب وكونه عن محسوس {لا الإحتياج الى النظر عقيبه} اي عقيب سماع المتواتر فلا خلاف في المعنى في انه ضروري لأن توقفه على تلك المقدمات لاينافي كونه ضروريا وبالضروري عبر الامام الرَّازي خلاف ماعبر به المصنِّف عنه سهواً او نظرا الى ان المراد واحد[1] . وقوله عقيبه بالياء لغة قليلة جرت على الالسنة واكثير ترك اليا كما تقدَّم[2] .

(١) کەعبی کەیەکێکە لە زانایانی موعتەزیلە، و هەردوو پێشەوا ئیمام الحرمین و ڕازی وتوویانە: هەواڵی متەواتر پێویستی بەبەڵگەو تێڕامان هەیە، بەڵام إمام الحرمين ووشەی (نظري) بەصغراو کوبرا لێك نەداوەتەوە بەڵکو دەڵێ: مەبەست بەوەی کە متواتر نظریە، ئەم لێنك دانەوەش غەزالی کە شوێنکەوتەو قوتابی ئەو بووەو لەگوتەکەی کەعبی وەرگرتووە، ئەوەیە کە: بەرهەم و ئەنجامەکەی تا چەند پێشەیێك هەن بێنەدی کە ئەوان بەرهەمی هەواڵە متواترەکە لای گوێگر پەیدا دەکەن، ئەو پێشەکیانە سازکەری ئەوەن کە هەواڵەکە متواتربێ: ١-ئەو هەواڵە لەدەستەیێکی زۆرەوە بڵاوبێتەوە. ٢-ئەبێ ئەوەندە زۆربن عەقڵ ڕێ نەدا ئەوەندە خەڵك ڕێك کەوتبن لەسەر درۆیێك. ٣-ئەبێ ئەو هەواڵە لەبارەی شتێکی هەست پێ کراوەوەبێ، ئەوەیە مەبەستی إمام الحرمین بە: نظری کە ئەڵێ متواتر نظریە، نەك مەبەستی ئەوەبێ کە پێویستی بەتێڕامان و بیرکردنەوە هەبێ دوای بیستنی متواترەکە، کەوابوو هیچ جۆرە جیاوازیێك نیە لەمەبەست و مانادا لەوەدا کە هەواڵی متواتر ضروریی و بەڵگە نەویستە، چونکە توقف کردنی هەواڵی متواتر لەسەر ئەو پێشەکیانە دژایەتی ئەوە ناکەن کەوا هەواڵ بەڵگە نەویستە، پێشەوا ڕازی هەر بەبەڵگەی نەویست لێکی داوەتەوە، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی دانەر بەناوی ڕاڕایە وە تەعبیری کردووەتەوە، ئیتر یا سەهوی کردووە یاخود سەرنجی ئەوەی داوە کە هەردوو داڕشتنەکە یەك مەبەستیان هەیە .

(٢) دانەر کەوروتی: عقیبە ئەمە لەهجەیێکی زۆر کەمە، بەکەمی کەوتووەتە سەر زارەکان، شێوێك کە بەزۆری تەلەفظی پێچ بکرێ پیتی بێکەی لادەبەن و نای خوێننەوە هەر دەڵێن: عقبە، وەك لەپێشتەوە ڕابورد، لەڕستەی: ..هل العلم عقيبه مكتسب.

{وتوقف الآمدى} عن القول بواحد من الضروري والنظري اي لتعارض دليليهما السابقين من حصوله لمن لا يتأتي منه النظر وبوقفه على تلك المقدمات المحققة له من غير نظر الى عدم التنافي بينهما[1] .

{ثُمَّ ان اخبروا} اي اهل الخبر المتواتر {عن عيان} بان كانوا طبقة فقط {فذاك} واضح {والا} اي وان لم يخبر واعن عيان بان كانوا طبقات فلم يخبر عن عيان إلاّ الطبقة الاولى منهم {فيشترط ذلك} اي كونهم جميعا يمتنع تواطهم على الكذب {في كل الطبقات} اي في كل طبقة طبقة ليفيد خبرهم العلم بخلاف ما اذا لم يكونوا كذلك في غير الطبقة الاولى فلا يفيد خبرهم العلم ومن هذا ايتبين ان المتواتر في الطبقة الاولى قد يكون آحاداً فيما بعدها وهذا محمل القراءات الشاذة كما تقدَّم[2] .

(١) ئامێدی هەڵوێستەی کردووە لەوەی بڵێ بەڵگە نەویستە یا تێرامانی دەوێ، واتە لەبەر ئەوەی دو بەڵگە پێشینەکانیان دژ بەیەك و نەیاری یەکن، ئەو دو بەڵگەش یەکێکیان بۆ بەڵگە نەویست بووە، کە پەیدابونیەتی بۆ کەسێکیش تێرامانی لێ نەوەشێتەوە، بەڵگەی ئەویش توقفی بو لەسەر ئەو پێشەکیانەی کە ساز کونەندەی ئەون، ئیتر بێ ئەوەی سەیرو سەرنجی ئەوە بدرێ کە دژایەتیان لەنێواندا نیە، چونکە ئەم نظریە بەمانا زەروری بو.

(٢) پاش ئەوە ئەگەر ئەهلی هەواڵی متواتر هەمویان هەواڵیان دا کە بەچاوی خۆیان بینیویانە، بەم شێوە کە هەموویان تەنها یەك چین بوون، ئەمە ڕونە کە هەواڵی متواترە، چونکە هەر سێ مەرجەکەی تێدایە، بەڵام ئەگەر هەواڵەکە سەرچاوەکەی بینین نەبوو، بەم شێوە ئەوانە چەند چینێك بن جگە لەچینی یەکەمیان کە بەچاوی خۆیان بینیویانە، ئیتر چینەکانی تر بەچاوی خۆیان نەیان بینیووە لەوانەوەیان بیستووە، بۆیە بەمەرج گیراوە ئەوانە ئەبێ ژمارەیێکی زۆربن کە مەحاڵ بێ و نەگونجێ قسەیان یەك خستبێ لەسەر درۆ کردن، لەهەموو چینەکاندا، واتە لەهەموو چین و چینێکدا ئەو ژمارە مەرجە، بۆ ئەوەی هەواڵەکەیان عیلم بگەیێنێ، ئەمە جیاوازە بۆ هەواڵێك جگە لەچینی یەکەمیان نەبێ چینەکانی تر ئەو مەرجانەیان تێدا نەبێ، ئەوە هەواڵەکەیان عیلم ناگەیەنێ، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ هەواڵی وا هەیە لەچینی یەکەمدا متواترە لەچینی دووهەم و ئەوانی تردا دەبێتە هەواڵ و فەرموودەی پلە ئاحادو تاك، ئەمە ئەو جێگەیەکە چەند خوێندنەوەیێکی شازو لەیاسا دەچوو هەیە دەدرێ و دەبڕێ بەسەر ئەم بابەتەدا.

{والصحيح} من اقوال {ثالثها ان علمه} اي المتواتر اي العلم الحاصل منه {لكثرة العدد} في رواته {متفق} للسامعين فيحصل لِكُلٍّ منهم[1] {وللقرائن} الزائدة على اقل العدد الصالح له بأن تكون لازمة له من أحواله المتعلقة به أو بالمخبر عنه أو بالمخبر به {قد يختلف فيحصل لزيد دون عمرو} مثلاً من السامعين لان القرائن قد تقوم عند شخص دون آخر[2] .

اما الخبر المفيد للعلم بالقرائن المنفصلة عنه فليس بمتواتر والقول الاول يجب حصول العلم منه لِكُلٍّ من السامعين مطلقاً لان القرائن في مثل ذلك ظاهرة لا تخفى على احد منهم[3] .

---

(١) ئایا ئەو عیلمەی لەهەواڵی متواترە وە پەیدا دەبێ بۆ هەموو کەس پەیدا دەبێ؟ قەولی ڕاست و دروست لەناو سێ قەولدا سێ هەمیانە کە دەڵێ: بێگومان ئەو عیلمەی پەیدا دەبێ لە هەواڵی متواترەوە، ئەگەر لەبەر: ١-زۆری ژمارەی ڕیوایەت کەرەکانی بێ ئەوە پڕاوپڕە بۆ هەموو گوێگرەکان، بۆیە ئەو عیلمە بۆ هەموویان پەیدا دەبێ بێ زیادو کەم.

(٢) ٢-یاخود لەبەر چەند هێماییێك بێت کە زیاد لەوەش بن کە کەمترین ژمارە بێت دەست بدات بۆ هەواڵی متواتر، بەم شێوە ئەو هێمایانە لەهەواڵە متواترەکە جیا نەبنەوە لەبارودۆخی ئەوەوە بن، جا ئیتر ئەو هێمایانە پەیوەندبن بە تەواوی هەواڵە متواترەکەوە، یاخود بەموبتەداکەوە، یاخود هەر بەخەبەرەکەوە، جا ئەگەر عیلمەکەلەبەر ئەو هێمایانە پەیدا دەبوو ئەوە ئەوکاتە جیاواز دەبێ، چونکە جاری وا هەیە بۆ زەید پەیدا دەبێ، بەڵام بۆ عەمر پەیدا نابێ، هەردووکیشیان لەگوێ گران بوون، چونکە هێماکان جاری وا هەیە لای یەکێك دەبێ و لای ئەویتریان نابێ، ئەمە کاتێ قەرینەکان متصلە بن.

(٣) بەڵام ئەگەر ئەو هەواڵەی عیلم دەگەیێنی بەهۆی چەند هێماییێکەوە بێ کە لێجیادەبنەوە ئەو هەواڵە متواتر نیە، قەولی یەکەمیش دەڵێ: پێویستە عیلم لەهەواڵی متواترەوە پەیدا ببێ بۆ هەموو یەکێ لە گوێگران، ئیتر بەهۆی زۆری ژمارەوە بێ یاخود بەهۆی هێماوەبێ، چونکە ئەو هێمایانە لە نموونەی هەواڵی متواتردا دیارن و لەسەر کەس شاراوە نین، چونکە ئەو هێمایە بریتیە لەدوپات کردنەوەی موبتەداکە -زید زید- یا لەخەبەرەکە -قائم قائم- یاخود ڕستەکەت -زید قائم زید قائم- دەی ئەمەش کەس نیە لەگوێگران لێی حاڵی نەبێ .

**والثاني لا يجب ذلك بل قد يحصل العلم مطلقاً لكلٍ منهم ولبعضهم فقط لجواز ان لا يحصل العلم لبعض بكثرة العدد كالقرائن[1]**

**{و} الصحيح من اقوال {ان الاجماع على وفق خبر لايدل على صدقه} في نفس الامر مطلقاً {وثالثها يدل ان تلقوه} اي المجمعون {بالقبول} بان صرحوا بالاستناد إليه فان لم يتلقوه بالقبول بان لم يتعرضوا بالاستنادالیه فلا يدل لجواز استنادهم الى غيره مما ستنبطوه من القُرآن[2] وثانيها يدل مطلقاً لان الظاهر استنادهم إليه حيثُ لم يصرحوا بذلك لعدم ظهور مستند غيره ووجه دلالة استناد هم ايه على صدقه انه لو لم يكن حينئذٍ صدقا بان كان كذبا لكان استنادهم إليه خطا وهم معصومون منه[3]**

(١) قەولی دووەم دەڵێ: پێویست ناکات ئەو یەقینە بۆ هەموو گوێگران پەیدا ببێ، بەڵکو جاری وا هەیە ئەو عیلمە پەیدا دەبێ بۆ هەموویان چ بەهۆی ژمارەی زۆرەوە بێ یاخود بەهۆی هێماکانەوە بێ، جاری واش هەیە بۆ هەندێکیان پەیدا دەبێ، چونکە دەگونجێ ئەو یەقینە بۆ هەندێکیان بەهۆی ژمارەی زۆرەوە پەیدا نەبێ وەك بەهۆی هێماکانەوە بۆی پەیدا دەبێ.

(٢) قەولی صحیح و ڕاست و دروست لەناو سێ قەولدا ئەوەیە کە: ماناو مەدلولی جماعێك هەر عەینی ماناو مەدلولی هەواڵ و فەرموودەیێك بێ، ئەوە دەلالەت ناکات لەسەر ڕاستی نیسبەتدانی ئەو فەرموودە بۆلای پێغەمبەر لەواقعدا، چ ئەهلی اجماع مەدلولەکەیان قەبوڵ بێ وە چ قەبوڵیان نەبێ، چونکە ئەگونجێ سەرچاوەی اجماعەکە بەڵگەیێکی تربێ. قەولی سێهەمیان دەڵێ: ئەو اجماعە دەلالەت دەکات لەسەر ڕاستی فەرموودەکە ئەگەر ئەهلی إجماع بەقەبول وەری گرین، بەم شێوە خۆیان بە ڕەوانی بزانن پاڵپشتی ئێمە لەو حوکمەدا کە هەموومان کۆین لەسەری ئەو فەرموودەیە، بەڵام ئەگەر بەقەبوڵ وەریان نەگرت، بەم شێوە نەچوون بەلای ئەوەدا کە پاڵپشتیان ئەو فەرموودەیە، ئەوە ئەو إجماعە دەلالەت ناکات لەسەر ڕاستی فەرموودەکە، چونکە دەست ئەدات پشتی ئەوان درابێ بەبەڵگەیێکی ترەوە کە لەقورئانەوە دەر هێنرابێ.

(٣) قەولی دووهەمیان دەڵێ: بەقەبوڵ وەری گرێ یا وەری نەگرێ هەر دەلالەت دەکات لەسە ڕاستی نیسبەت دانی ئەو فەرموودەیە بۆ پێغەمبەر، چونکە ئەوەی کە دیارە پشتی ئەهلی إجماع لەو حوکمەدا ئەو فەرموودەیە، ئەمەش لەشوێنێکدا وایە خۆیان بەڕوونی ئەوەیان نەوتبێ، چونکە هیچ بەڵگێکی تر نیەو دیار نیە پشتی پێ ببەستن جگە لەو، هۆی پشت بەستنی ئەوان بەو فەرموودەیە نیشانەی ڕاستیەتی فەرموودەیە بۆ؟چونکە ئەگەر ڕاست نەبێ لەو کاتەدا، واتە: درۆ بێ، ئەوکاتە پشت

قُلْنا لانسلم الخطأ حينئذٍ لانهم ظنوا صدقه وهم انما أمروا بالاستناد الى ماظن فاستنادهم إليه انما يدل على ظنهم صدقه ولا يلزم من ظنهم صدقه صدقة في نفس الأمر و قيل ان ظنهم معصوم عن الخطأ[1] {وكذلك بقاء خبر تتوفوا الدواعي على ابطاله} بان لم يبطله ذو والدواعي مع سماعهم له آحاداً إلاّ يدل على صدقه {خلاف للزيدية} في قولهم يدل عليه قالوا اللاتفاق على قبوله حينئذٍ قُلْنا الاتفاق على قبول انما يدل على ظنهم صدقه ولا يلزم من ذلك صدقه في نفس الامر مثاله قوله ﷺ لعلي انت مني بمنزلة هرون من موسى إلاّ انه لانبي بعدي رواه الشيخان فان دواعي بني امية وقد سمعوه متوفرة على ابطاله لدلالته على خلافة علي ﷺ كما قيل كخلافة هرون عن موسى بقوله اخلفني في قومي وان مات قبله ولم يبطلوه[2]

---

بەستنەکەیان بەو فەرموودەیە غەلەت دەبوو لەکاتێکیشدا ئەهلی إجماع پارێزراو لەغەلەت

(١) ئێمەیش دەڵێین بەغەلەتا چوون لەو کاتەدا ناسەلمێنێت، چونکە ئەوان گومانی ڕاستیان بەفەرموودەکە بردبوو چونکە ئەوان فەرمانی ئەوەیان پێ دراوە پشت ببەستن بەشتێك گومانی ڕاستیان پێ هەبێ. بۆیە پشت دانیان بەو فەرموودەوە ئەوە دەگەیێنێ کە ئەوان وا گومانیان بردووە کە ڕاستە. لازمیش ناکات کە ئەوان وایان زانیوە ڕاستە ئیتر دەبێ ڕاست بێ. لەواقعدا. هەندێك وتوویانە: گومانی ئەهلی إجماع پارێزراوە لەغەلەت!

(٢) هەروەکو ئەوەی پێشوو وایە. مانەوەی فەرموودێیك کە هۆکاری پوچەڵ بوونەوەی زۆربێ: ئەم شێوە ئارەزو پەرستەکان پوچەڵی بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەش لە تاك تاك ئەو فەرموودەیان بیستووە. دەی ئەو مانەوە ڕاستی نیسبەتدانی ئەو فەرموودەیە ناگەیێنێ بۆلای پێغەمبەر. ئەمە جیاوازە بۆ بۆچونی زانایانی پێڕەوی زەید کە دەڵێن مانەوەکەی ڕاستی نیسبەتدانەکە دەگەیێنێ. ئەو زانایانە وتوویانە چونکە هەموویان قەبوڵیان کردووە لەو کاتەدا ئیتر وەك متواتری لێ دێ، ئێمەیش دەڵێین یەك ڕای هەموان لەسەر قەبوڵ کردنی فەرمودەیێك تەنها ئەوە دەگەیێنێ کەوایان زانیوە ئەو فەرموودەیە ڕاستە. ئەوەش وا ناگەیێنێ کە لەواقعدا ڕاست و دروستە. نمونەش ئەوەیە کە پێغەمبەر بەپێشەوا عەلی فەرموو پلەی تۆ بەلای منەوە وەك پلەو جێو ڕێی هارون وایە بەلای موساوە، بەلام ئەوەندە هەیە هارون پێغەمبەر بوو، من پێغەمبەرم لەدوواوە نابێ. بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە. دەخۆ ئارو بازی هۆزی ئومیە لەکاتێکدا کە بیستویانە زۆر بووە لەسەر پوچەڵ کردنەوەی،

{وافتراق العلماء} في الخبر {بين مؤول} له {ومحتج} به لا يدل على صدقه {خلافاً لقوم} في قولهم يدل عليه قالوا للاتفاق على قبوله حينئذٍ قُلْنا الاتفاق على قبول انما يدل على ظنهم صدقه ولا يلزم من ذلك صدقه في نفس الأمر(١).

{و} الصحيح {ان المخبر بحضرة قوم لم يكذبوه ولا حامل على سكوتهم} عن تكذيبه من خوف او طمع في شيء منه {صادق} فيما اخبر به لان سكوتهم تصديق له عادة فقد اتفقوا وهم عدد التواتر على خبر عن محسوس اذ فرض المسئلة كذلك كما صرح به الآمدي فيكون صدقا قطعا وَ قِيلَ لا يلزم من سكوتهم تصديقه لجواز ان يسكتوا عن تكذيبه لا لشيء(٢).

---

چونکە جێنشینیەتی عەلی دەگەیێنێ، خوای لێ ڕازی بێ، وەك ئەم قسەش کراوە لەلایەن شیعەوە، وەك جێنشینیەتی هارون وایە بۆ موسا بەهۆی ئەوەوە کە فەرمووی: تۆ جێنشینمبە لەناو قەومەکەما، هەرچەند هارون پێش موسا مرد، لەگەڵ ئەوەش هۆزی ئومیە ئەم فەرموودەیان پوچەڵ نەکردەوە، -ئەم جێنشینیەتیە تەنها بۆ کاتی ژیانی پێغەمبەر دێ، چونکە عەلاقە لە نێوان مشبە مشبەبە دا هەتا بەهێزتربێ چاکترە، دەخۆ هارون پێش موسا مرد کەوا بێ هەر بۆ کاتی ژیانی موسا بووە، بۆ ئەمیش دەبێ وابی-.

(١) بەش بەشبونی زانایان لەبارەی فەرموودەیێکەوە، هەندێکیان تەئویلی بکەن و هەندێکیان بیکەنە بەڵگە، ئەوە دەلالەت لەسەر ڕاستی نیسبەت دانیَ ئەو فەرموودە ناکات، بەپێچەوانەی گەلێکەوە کە دەڵێن: دەلالەت لەسەر ڕاستیەتی دەکات، وتویانە: چونکە هەموویان یەك قسەن لەسەر وەرگرتنی لەو کاتەدا، بەلام هەریەك ناوێکی لێ دەنێ، ئێمەیش دەڵێین: یەك قسەییان لەسەر وەر گرتنی تەنها ئەوە ئەگەیێنێ کە پێیان وایە ئەو فەرموودە ڕاستە، ئەوەش لازم ناکا لەواقیعدا ڕاستبێ.

(٢) قەولی صحیح و دروست ئەوەیە کە کەسێ بەئامادەیی گەلێکی زۆر هەواڵێك بگەڕێنێتەوە بێ ئەوەی ئەوان بەدرۆی بخەنەوە، وە هیچ شتێکیش نەبێ بێ دەنگیان بکات لەبەدرۆ خستنەوەیدا، وەك ترس یاخود بەتەمای شتێك بێ لێیەوە دەستکەوێ، ئەو هەواڵدەرە ڕاست گۆیە لەو هەواڵەدا کە داویەتی، چونکە بێ دەنگیان عادەتەن نیشانەی بەڕاست زانینی هەواڵەکەیە، چونکە هەموویان یەك دەنگ بوون و ژمارەی هەواڵی متواتریان هەیە و هەواڵێکە لەبارەی شتێکی هەست پێکراوەوەیە، چونکە برینەوەو بێگومانی لەهەموو بابەتێکدا بەهەست پێکراو دەبێ، وەك ئامێری بەڕوون و ڕەوانی ووتویەتی: کەوابو ئەو هەواڵە ڕاستێکی بێگومانە، هەندێك وتوویانە: لازم

{وكذا المخبر بمسمع من النبيِّ ﷺ} اي بمكان يسمعه منه النبيُّ ﷺ {ولا حامل على التقرير} للنبي ﷺ {و} على {الكذب} للمخبر صادق فيما اخبر به دينيا كان او دنيوياً لانَّ النبيَّ ﷺ لا يقرا احدا على كذب[1].

{خلافاً للمتاخرين} منهم الآمدي وابن الحاجب في قولهم لايدل سكوت النبيِّ ﷺ على صدق المخبر اما في الديني فلجواز ان يكون النبيُّ ﷺ بينه او اخر بيانه بخلاف ما اخبر به المخبر واما في الدنيوتي فلجواز ان لا يكون النبيُّ يعلم حاله كما في القاح النخل روى مسلم عن انس انه ﷺ مرَّ بقوم يلقحون النخل فقال: لو لم تفعلو الصلح قال فخرج شيصاً فمر بهم فقال مالنخلكم؟ قالوا: قلت كذا وكذا، فقال: انتم اعلم بأمر دنياكم[2] .

---

ناكات بێ دەنگیان نیشانەی بەڕاست زانینیان بێ، چونكە ئەگونجێ لەدرۆ خستنەوەی بێ دەنگیش بن و هیچ شتێك لەوانەش نەبێ.

(١) هەروەها هەواڵدەرێكیش لەجێیێكدا هەواڵەكە بدا پێغەمبەر گوێ پێوە بێ وە هیچێكیش نەبێ بێتە هۆی بێ دەنگی پێغەمبەر و بەدرۆ خستنەوەی هەواڵدەرەكە. ئەو هەواڵدەرە ڕاستگۆیە لەو هەواڵەداویەتی چ ئاینیشبێ یاخود دونیایی بێ، چونكە پێغەمبەرﷺ ددان بەوەدا نانێ كە كەس لەسەر درۆ بەردەوام بێ و بمێنێتەوە.

(٢) به پێچەوانەی زانایانی سەردەمی دوایی، كە ئامێدی و ابن الحاجب لەوانن. كە دەڵێن: بێ دەنگی پێغەمبەر ڕاستگۆیی هەواڵدەر ناگەیێنێ، جا هەر یەك لەبەر شتێ: لەو كاروباری ئاییندا چونكە ئەگونجێ پێغەمبەر ئەو شتەی ڕونكردبێتەوە، یاخود ڕونكردنەوەكەی دواخستووە بەپێچەوانەی هەواڵی هەواڵدەرەكەوە ڕای گەیاندبێ، بەڵام لەكاروباری دوونیاییدا ئەگونجێ پێغەمبەر شارەزای نەبێ و لە ئاڵوگۆڕی ئەو شتە نەزانێ، وەك مەسەلەكەی پێوەن كردنی خورما موسلم لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی كرد بەلای كۆمەڵێكدا خەریكی پێوەن كردنی خورما بوون، ئەویش فەرمووی: ئەگەر نەشیكەن هەر ساز دەبێ، ئەنەس ئەڵێ: ئەوانیش ئیتر نەیان كرد، خورماكە پوچەڵ دەرچوو پێغەمبەرﷺگوزەری كرد بەلایاندا و فەرمووی: ئەوە خورماكەتان بۆ وا پوچە؟ ووتیان: جەنابت ئەوەو ئەوەت فەرموو: ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی: ئێوە شارەزاترن بەكاروباری دوونیاتان، -واتە من ئەوەم مەبەست بوو ئەگەر خوا ئارەزووی لێ بێ ئەوەش هەر دەبێ، من نەم ووت: مەیكەن-.

{وَ قِيلَ يدل} على صدقه {ان كان} مخبرا {عن} امر {دنيوى} بخلاف الديني فلا يدل وفي شرح المختصر عكس هذا التفصيل بدله وتوجيههما يؤخذ مما تقدَّمَ و أُجِيبَ في الديني بأن سبق البيان او تأخيره لا يبيح السكوت عند وقوع المنكر لما فيه من افهام تغيير الحكم في الاول وتأخير البيان عن وقت الحاجة في الثاني [١] وفي الدنيوى بانه اذا كان كذبا ولم يعلم به النبيُّ ﷺ يعلمه الله به عصمة له عن ان يقر احداً على كذب كما اعلمه بكذب المنافقين في قولهم له نشهد انك لرسول الله من حيثُ تضمنه ان قلوبهم وافقت السنتهم ذلك وان كان دينيا اما اذا وجد حامل على الكذب والتقرير كما اذا كان المخبر ممن يعاند النبيَّ ﷺ ولا ينفع فيه الانكار فلايدل السكوت على الصدق قولا واحداً[٢].

---

(١) كۆمەڵێکی تر ووتوویانە:بێدەنگی پێغەمبەر ڕاستگۆیی هەواڵدەرەکە دەگەیێنێ ئەگەر هەواڵەکە لەبارەی کاروباری دوونیاییەوەبێ، بەڵام لەبارەی کاری ئاینییەوەبێ ئەوە ناگەیێنێ لەکتێبی: شرح المختصردا پێچەوانەی ئەمەیە بەسەرو بەریەوە لەباتی ئەمە نوسراوە، ئەگەر ئاینیبێ ئەی گەیێنێ، وە ئەگەر دوونیاییبێ نای گەیێنێ –وەك باسی خورماکە– بەڵگەی هەردوو لایان لەوەی پێشەوە وەر دەگیرێ کە ووتەی زانایانی سەردەمی دوایی بوو. وەڵام دراوەتەوە: لەکاروباری ئاینیدا پێغەمبەر لەپێشدا باسی کردبێ یاخود دوای بخات ئەمە بێ دەنگی بۆ پێغەمبەر حەڵاڵ ناکات لەکاتی بەرپا بوونی کارێکی نارەوادا، چونکە بێ دەنگیەکەی لەیەکەمیاندا خەڵك وا دەزانێ حکمەکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و سڕاوەتەوە، وە لەدوهەمیشدا ڕونکردنەوەی حوکم لەکاتی پێویستە دووا دەکەوێ.

(٢) لەکاروباری دونیاییدا ئەگەر هەواڵی کابرا درۆ بێ و پێغەمبەرﷺ پێ نەزانێ یەکسەر خوا ئاگاداری دەکاتەوە لێی، چونکە پێغەمبەر پارێزراوە لەوەی شتێك بکا هێما بۆ ئەوەی کە ڕازی بێ کەسێ لەسەر درۆ بیهێنێتەوە، وەك چۆن خوا ئاگاداری کردەوە بەدرۆی دووڕووەکانی دەورووبەری کەووتیان: ئێمە شاهیدی و گەواهی ئەدەین کە تۆ نێرراوی خوایت، ئەم ووتەیە ڕاستە، بەڵام لەو لایەنەوە درۆیە قسەکەیان وا دەگەیێنن دڵیشیان پڕاوپڕیژیانیانە لەوگەواهیەدا هەرچەندە نموونەکەش لەکاروباری ئاینیەوەیە. بەڵام کاتێ هۆیێك هەبێ بۆ بێدەنگی پێغەمبەر لەدرۆی کابرایێك و چاوپۆشی لەکارێکی نارەوا،وەك ئەوەی هەواڵدەرەکە لەوانەبێ ململانێ‌وسەرسەختی لەگەڵ پێغەمبەر بکات وبەرپەرچدانەوەی پێغەمبەریش سودیپێ نەگەیێنێ،ئەوە بێدەنگی پێغەمبەر ڕاستی ئەوکابرایە ناگەیێنێ،بەڕای هەمووان وجیاوازی تێدا نیە.

**{واما مظنون الصدق فخبر الواحد وهو مالم ينته الى التواتر} واحد كان روايه او اكثر افاد العلم بالقرائن المنفصله او لا[1] {ومنه} حينئذٍ {المستفيض وهو الشائع عن اصل} فخرج الشائع لا عن اصل {وقد يسمى} اي المستفيض {مشهوراً واقله} من حيثُ عدد رواية اي اقلّ عدد رواي المستفيض {اثنان وَ قيلَ ثلاثة} الاول ماخوذ من قول الشيخ في التنبية واقل مايثبت به الاستفاضة اثنان وعبارة ابن الحاجب المستفيض مازاد نقلته على ثلاثة[2].**

**{مسئلة خبر الواحد لا يفيد العلم الا بقرينة} كما في اخبار الرجل بموت ولده المشرف على الموت مع قرينة البكاء واحضار الكفن والنعش {وقال الأكثرلا} يفيد {مطلقا} وما ذكر من القرينة يوجد مع الاغماء[3].**

---

(١) بەڵام ئەوەی کە گومانی ڕاستی لێ ئەبرێ ئەوە هەواڵی واحدو تاکی پێ دەوترێ، کە بریتیە لەو هەواڵەی ڕیوایەت کەرانی نەگەنە پلەی تەواتر، ئیتر ڕیوایەت کەرەکەی یەکێك بێ یاخود زیاتربێ، ئیتر بەهۆی چەند هێمایێکی دەرەکیوە عیلم بگەیێنێ یاخود نەگەیێنێ.

(٢) لەو کاتەدا کە پێناسەی هەواڵی تاك بکرێ و بووترێ: ئەوەیە نەگاتە ژمارەی تواتر، هەواڵی بڵاوبووەوە بە شێکە لە هەواڵی تاك، ئەمیش بریتیە لە هەواڵێك کە بڵاوبوبێتەوەو نەقڵ کرابێ لەدەم یەکێك لەپێشەوایانی ڕیوایەت کردن و جێ اعتباربێ، بۆیە هەواڵێك کە لە ئەسڵ و پێشەوای موعتەبەرەوە نەقڵ کرابێ لەم پێناسەیە چویە دەر، کەم جارانێکیش هەواڵی بڵاو ناودەبرێ بە هەواڵی بەناوبانگ، کەمترین ژمارەی ڕیوایەت کەرانی ئەم فەرمودەیە دوکەسە، هەندێك ووتویانە: سێکەسە ڕای یەکەم وەگیراوە لەووتەیێکی ماموّستای کتێبی: (التنبیه)، دەڵێ: کەمترین ژمارە هەواڵی بڵاوی پێسابت بێ دوانن، دووهەمیان لە داڕشتێکی ابن الحاجب وەرگیراوە کە دەڵێ: هەواڵی بڵاو ئەوەیە نەقڵ کەرانی لەسێ زیاتر بن .

(٣) هەواڵی تاکە کەسێ عیلم ناگەیێنێ مەگەر بەهۆی هێمایێکەوە بێ، وەك لە هەوڵدانی پیاوێ بەمردنی ئەو کوڕەی کە چاوەڕێ مەرگی دەکرد لەگەڵ هێمای گریان و ئامادەکردنی کفن و تابوت، زۆربەی‌تر ووتویانە: هێما هەبێ یانەبێ هەر عیلم ناگەیێنێ، چونکە ئەوە باسکرا کە هێمای یەقینی هەواڵەکەیە ئەوە لەگەڵ کەسێکیشدا دەکرێ لە هۆش چوو بێ .

{و} قال الامام {احمد يفيد مطلقا} بشرط العدالة لانه حينئذٍ يجب العمل به كما سياتي وانما يجب العمل بما يفيد العلم لقوله تعالى ولا تقف ماليس لك به علم ان يتبعون إلاّ الظن نهي عن اتباع غير العلم وذم على اتباع الظن و أُجيبَ بأن ذلك فما المطلوب فيه العلم من اصول الذين كوحدانية عن الله تعالى وتنزيه عما لا يليق به لما ثبت من العمل بالظن في الفروع(١) .

{و} قال {الاستاذ} ابو اسحق الاسفراين {وابن فورك يفقيد المستفض} الذي هو منه عندنا {علما نظريا} جعلاه واسطة بين المتواتر المفيد للعلم الضروري والآحاد المفيد للظن وقد مثله الأستاذ بما يتفق عليه ائمة الحديث و انما لم يقيد الواحد بالعد كما قيده به ابن الحاجب وغيره(٢) .

---

(١) پێشەوا ئەحمەد وتویەتی: هەواڵی تاك یەقین دەگەیەنێ، چ هێما هەبێ یا نەبێ، بەڵام بەمەرجێ هەواڵدەرەکە عادل بێ، چونکە لەو کاتا پێویستە کاری پێ بکرێ، وەك لەمەو دوو دێ، تەنها هەواڵێکیش پێویستە کاری پێ بکرێ کە یەقین بگەیێنێ، چونکە خوا دەفەرموێ : شوێنی شتی نەکەوی کە یەقینت پێ نەبێ، بێ باوەڕان تەنها شوێنی گومان دەکەون ، ئەم ئایەتە قەدەغەکردنە لە شوێن کەوتنی شتێ کەیەقین نەبێ، قەدەغەش بۆ حەرام کردنە کەوابوو واجب نیە، هەروەها ئایەتەکە گلەیی و گازندەیشە لەسەر شوێنکەوتنی گومان، وەڵامی ئەو قەدەغەو گلەیە دراوە تەوە کەئەوانە لە شتێکدا دەبێ کەیەقینی تیادا داواکرابێ، ئەویش ینچینەکانی ئایینە، وەك یەك تایی و تاکو تەنهایی خواو پاك ڕاگرتنی لە شتێك شیاوی ئەو نەبێ، بەوەش دەزانرێ بۆ بابەتی عەقیدەیە، چونکە سابت بووە لەلقەکانی ئاییندا کار دەکرێ بە فەرمودەێك جێ گومان بێ .

(٢) مامۆستا (اسفراینی) و (ابنی فۆرەك) ووتویانە: هەواڵی تاك لە جۆری بڵاوەکەی بەلای ئێمەوە علمێکی نەزەری دەگەیێنێ، ئەو دووانە هەواڵی بڵاویان کردووە بە پلەیێکی مام ناوەندی لە نێوان متواتر کەیەقینی بەڵگە نەویست دەگەیێنێ، وە لەنێوان تاك و ئاحاددا کە گومان دەگەیێنێ، مامۆستا اسفراینی نمونەی بەفەرموودەێك هێناوەتەوە کە هەموو زانایان و پێشەوایانی فەرمودەیەك قسەن لەسەری ، ئەی بۆمەرجی عەدلی پێوە نەلکاند وەك (ابن الحاجب) و غەیری ئەویش ووتویانە ریوایەت کەری هەواڵی تاك دەبێ عەدل بێ .

لانه لاحاجة إليهِ على الأول حيثُ يفيد العلم لأن التعويل فيه على القرينة ولا عـ الثاني كما هو ظاهر وان احتيج إليهِ على الثالي كما تقدَّمَ وكذا على الرابع فيه يظهر كما يحتاج إليهِ حيثُ يُقالُ يفيد الظن[١] .

{مسئلة يجب العمل به} اي بخبر الواحد { في الفتوى و الشهادة} اي يجب العمـ بما يفتى به المفتي وبما يشهد به الشاهد بشرطه {اجماعا وكذا سائر الأمو الدينية} اي باقـها يجب العمل فيـها بخبر الواحد كالأخبار بدخول وقت الصلا او بتنجس الماء وغير ذلك[٢] {قيل سمعاً} لا عقلاً لانه ﷺ كان يبعث الآجاد لـ القبائل والنواحي لتبليغ الأحكام كما هو معروف فلو لا أنه يجب العمل بخبر لم يكـ لبعثَّم فائدةٌ[٣] .

---

(١) چونکە لەسەر قەولی یەکەم پێویستی پێ نیە لەبەر ئەوە بەلای ئەمەو هەواڵی تاك یەقین دەگەیێنێ چونکە پشتی بەهێمابەستووە نەك عەدالەتی ڕیوایەت کەرەکە، لەسەر قەولی دوهەمیش هەر نایەوێ چونکە ئەوە دیارە ئەم دەڵی هەرچی هەبێ یەقین ناگەیێنێ، هەرچەن پێویست بەووشەی عەدالەت دەبێ لەسەر قەو سێهەم کەووتی: بەمطلقی یەقین دەگەیێنێ، هەروەها لەسەر قەولی چوارمیش لەوەد کە دەردەکەوێ کەووتی: علمی نظری دەگەیێنێ، وەك چۆن پێویست بە عەدالەت هەیە لەهەر جێیکدا بووترێ: هەواڵی تاك گومان دەگەیێنێ، بۆیە عەدالەتم پێوەنەلکاند لە هیچ قەولێکی نیە .

(٢) ئەمەش بابەتێکە پێویستە کارکردن بە تاکە هەواڵ لەبابەتی فوتواو شاهیدیدا. واتە واجبە کاربکرێ بەوەی کەیەك موفتی فوتوای پێ ئەدا یا یەك شاهد شایەتی پێ‌ئەدا، بەڵام بەمەرجی خۆی، واتە لەو جێیەدا کە یەك شاهد بەسی بێ وەك بینینی مانگ، ئەمەش بەڕای هەموان دەبێ کاری پێ بکرێ. هەروەك ئەوە وایە کاروبارە ئاینیەکانی تریش ، هەروەها دونیایش، واتە ئەوانی تریش واجبە لە بارەیانەوە کەکار بکرێ بەتاکە هەواڵ، وەك هەواڵدانی تاکە کەسێ بە بانگ دان، یاخود بە پیسبونی ئاوێك، غەیری ئەوانەش

(٣) هەندێ وتویانە واجبە کار بکرێ بەتاکە هەواڵ چونکە بەڵگەمان هەڵقولاوی فەرمودەیە نەك هەڵقولاو و تاشراوی ژیریە، چونکە پێغەمبەر بۆ هەر هۆزێك کەسێ دۆکەسێکی ئەنارده هەروەرها بۆ ناوچەکان، بۆ گەیاندنی حوکمی شەرع، ئەم قسەش هەموو کەس دەیزانێ وبەڵگەی ناوێ، جا ئەگەر کار کردن بەهەواڵی ئەو تاك تاکانە واجب نەبێ ناردنەکەیان هیچ سودێکی نەئەبوو .

{وَ قيلَ عقلاً} وان دل السمع ايضا اي من جهة العقل وهو انه لو لم يجب العمل به لتعطلت وقائع الاحكام المروية بالاحاد وهي كثيرة جد اولا سبيل الى القول بذلك وانما لم يرجِّح الاول كما رجحه غيره على ماهو المعتمد عنه اهل السُنَة لانَّ الثاني منقول عن الامام احمد والقفال وابن سريح من ائمة السُنَة كبعض المعتزلة[1] .

{وقالت الظاهرية لايجب} العملَ به {مطلقا} اي عن التفصيل الآتي لانه على تقدير حجيته انما يفيدالظن وقد نهي عن اتباعه وذم عليه في قوله تعالى ولا تقف مالي لك بعه علم ان يتبعون إلاّ الظن قُلْنا تقدَّمَ جواب ذلك قريبا[2] {و} قال {الكرخي} لا يجب العمل به {في الحدود} لانها تدرا بالشبهة[3] .

---

(١) هەندێك ووتويانە لەڕوی عەقڵەوە واجبە كاربكرێ بەتاكە هەواڵ هەرچەند بەڵگەی بيسراويش دەی گەێنێ، چونكە ئەگەر واجب نەبوايە كار كردن بەتاك هەواڵ ئەوكاتە چەندەها ڕوداو بێحەل دەما و دەوەستا كەبەهۆی ڕيوايەتی تاكە هەواڵەوە حوكمەكەی زانراوە، خۆ بێگومان ڕوداوەكان بێحەل نەبون، ئەوانەش زۆرن و لە ژمارە نايێن، وە هيچ كەسی هيچ جۆرە ڕێگەيێكی نيە بۆ كردنی ئەوقەسە، بۆچی دانەر قەولی يەكەمی تەرجيح نەدا وەك غەيری خۆی وايان كردووە، وە ئەويش لای ئەهلی سنە مەبەستەو اعباری پیێ دەكریێ؟، حوكم بەشەرع سابت دەبیێ نەك بەعەقڵ چونكە دووەمەكە لە پێشەوا ئەحمەدو قەفال ابن سورەيحەوە نەقڵ كراوە ئەمانەش پێشەوايانی ئەهلی سونەن، شايستەی ئەوە نەبون ئاستی ئەوانە لاوازمَ كەم، هەندێك موعتەزيلەش ڕايان هەروەك ئەمان وايە

(٢) زانايانی دياريێن ووتويانە: واجب نيە كار كردن بەتاكە هەواڵ بەهيچ جۆرێ ئيتر پێويست بەو درێژەدانەی داهاتو ناكات، چونكە گريمان ئەگەر بەڵگە ديار بكرێ، هەرتەنها گومان دەگەێنێ، خۆ نەهيش كراوە لە شوێنكەوتنی گومان و ئەوەش شوێنی كەوتبێ سەرزەنشت كراوە لەسەری لەم ئايەتەدا كەدەفەرموێ: شوێن شتێ نەكەوی شارەزايی ويەقينت نەبێ پێی، وەئايەتی: تەنها شوێنی گومان دەكەون ئێمەيش دەڵێن كەمێك لەمەوپێش وەڵامی ئەوە درايەوە، كە ئەو ئايەتانە بۆ باسی عەقيدەو باوەڕن، ئێمەش دەڵێن: تاكە هەواڵ بۆ بەندەكانی عەقيدەنابن تەنها بۆ كردار دەبێ.

(٣) كەرخی ووتويەتی: واجب نيە كاركردن بەتاكە هەواڵ لە بابەتی ئەو تۆڵانەدا كە خوا دياری كردون، چونكە ئەوانە بەكەمترينی گومان لادەبرێن .

لحديث مسند ابي حنيفة: ( ادرؤا الحدود بالشبهات) واحتمال الكذب في الآحاد شبهة قُلْنا: لا نسلم انه شبهة على انه موجود في الشهادة ايضاً[١] . {و} قال {قوم} لا يجب العمل به {في ابتداء النصب} بخلاف ثوانيها حكاه ابن السمعاني عن بعض الحنفية قال فقبلوا خبر الواحد في النصاب الزائد على خمسة أو سق لانه فرع ولم يقبلوه في ابتداء نصاب الفصلان والعجاجيل لأنه اصل يعني فيما اذا ماتت الأمهات من الإبل والبقر في أثناء الحول بعد الولادة وتم حولها على الاولاد فلا زكاة عندهم في الأولاد مع شمول الحديث لها وهو قول أبي حنيفة الأخير قال لعدم اشتمالها على السن الواجب وقال اولا يجب تحصيله كقول مالك وثانيا يؤخذ منها كقول الشافعي[٢] .

(١) لەبەر فەرمودەیك موسنەدی ابو حەنیفەیەو دەفەرمێ: بەهۆی گومانەكانەوە تۆڵە دیاریكراوەكانی شەرع لابەن، خۆ تاكە هەواڵێكیش درۆ هەڵدەگرێ كەوابوو گومانی تێدایە، بۆیە كاری پێ ناكرێ ئێمەیش دەڵێن: ئەوە ناسەلمێنین كەهەڵدەگرێ درۆی تێدابێ بەگومان بژمێرێ، چونكە ئەو گومانی هەبونی درۆیەش لە گەواهی و شاهیدیش داهەیە، وەبێ گومان بەڕای هەموان تاكە هەواڵ لەگەواهیدا قەبوڵ بووە.

(٢) كۆمەڵێكیتر ووتایانە: واجب نیە كار بكرێ بەتاكە هەواڵێك كە لەبارەی دیاری كردنی سەرەتای یەكەمی ئەو ئەندازەی زەكاتی تیادا واجب دەبێ بدوێ، بەلام لەسەرەتای دووەمیاندا دروستە ئەمەش سەمعانی لە هەندێ زانای پێرەوی ابوحنیفەی گێراوەتەوە، ووتویەتی: ئەوزانیایانە كە هەواڵیان قەبوڵ كردووە لەو ئەندازەی زەكاتی تێدا واجب دەبێ و زیاتر بێ لە پێنج ویسق بەتەواتور دیاری كراوە چونكە ئەو زیادە فەرع و لقی یەكەمەكەیە، وە قەبوڵیان نەكردوو لە دیاری كردنی ئەندازەی زەكاتی بێچوی ووشترو مانگادا، چونكە دایكەكاینان مردون سەرەتای ساڵ بۆ خۆیان دیاری دەكرێ، ئەمەی خۆیان دەكرێ بە ئەسڵ، واتە دایكەكانیان مرداربوبنەوە لە ناو ساڵی زەكاتیانداو دوای لەدایك بونی بێچوەكانیان، ساڵی دایكەكانیان تەواو دەبێ، لەسەر بێچووەكانیان ، لە بێچوەكانیاندا بەلای ئەوانەوەو زەكات نیە لەگەڵ ئەوەش فەرموودەكە دەیان گرێتەوە، ئەوەش كۆتاقسەی ابو حەنیفەیە، فەرمویەتی بۆیە واجب نیە چونكە بێچوەكان یەكێكیان نیە ساڵێكی بەسەردا ڕویی بێ، چونكە ئەوەی بشێ بۆ زەكات ئەبێ ساڵێكی دیاری كراوی تەمەن هەبێ، بەلام قسەی یەكەمی ابو حەنیفە ئەوەیە ووتویەتی:واجبە پەیدا كردنی یەكێك تەمەنی دیاری كراوی هەبێ، قەولی مالێكیش هەر وایە، قەولی سێ هەمی ابو حەنیفە دەڵێ: زەكات هەرلە و بێچوانە وەردەگیرێ هەرچەند نەگەیشتون بەتەمەنی

{و} قال {قوم} لا يجب العمل به {فيما عمل الاكثر} فيه {بخلافه} لان عملهم بخلافه حجة مقدمة عليه كعمل الكل قُلْنا لانسلم انه حجة[1] .

{و} قالت {المالكية} لا يجب العلم به {فيما عمل اهل المدينة} فيه بخلافه لان عملهم كقولهم حجة مقدمة عليه قُلْنا لا نسلم حجية ذلك وقد نفت المالكية خيار المجلس الثابت بحديث الصحيحين اذاتبايع الرجلان فكل واحدمنهما بالخيار مالم يتفرقا لعمل اهل المدينة بخلافه[2] {و} قالت {الحنفية} لا يجب العمل به {فما تعتم به البلوى} بأن يحتاج النّاس لايه كحديث من مس ذكره فليتوضأصححه الامام احمد وغيره لان ماتعم به البلوى يكثر السؤال عنه فتقضي العادة بنقله تواتراً لتوفر الدواعي على نقله فلا يعمل بالآحادفيه قُلْنا لا نسلم قضاء العادة بذلك[3] .

---

زەكات، قەولی شافیعیش هەروایە.

(١) گەلێكی تر ووتویانە: واجب نیە كاربكرێ بەتاكە هەواڵێك لەبارەی شتێكەوە بێ كاری زۆر بەی موسڵمانان بە پێچەوانەیەوەبێ، چونكە كاری ئەو هەموو خەڵكە كە پێچەوانەی مەبەستی فەرمودەكەبێ بەڵگەیە و دەخرێتە پێش تاكە هەواڵ، چونكە لەجێ اجماع سەیری دەكرێ، ئیتر وەكو كاری هەموان وایە، ئێمەیش دەڵێن: ئێمە نایسەلمێنین كەكاری زۆربەی خەڵك بەڵگە بێ، چونكە اجماع بەڵگەیە و بەس.

(٢) زانایانی پەیڕەوی مالكی گوتویانە: واجب نیە كاربكرێ بەتاكە هەواڵێك شتێ بگەێنێ پێچەوانەی ڕای دانیشتوانی مەدینە بێ، چونكە كاری ئەهلێ مەدینە وەكو گوفتاریان وایە دەكرێتە بەڵگەو پێش دەخرێ بەسەرفەرمودەی تاكە هەواڵدا، ئێمەیش دەڵێن: بە بەڵگەبونی گوفتار و ڕەفتاری ئەهلی مەدینە ناسەلمێنن، زانایانی پەیڕەوی مالك هەڵبژاردنی پەشیمان بونەوە لە كوڕی مامەڵەدا نەفی كردووە، كەچی بە فەرمودەیەك سابت بووە بوخاری‌وموسلم ریوایەتیان كردووە و ئەفەرموێ: كاتێ دوپیاو كڕین و فرۆشتنیان ئەنجامدا ئەوە هەمویەكێكیان بۆی هەیە پەشمیانی هەڵبژێرێ مادەم لەیەك جیانەبونەوە . بۆ نەفیان كردووە؟ چونكە بە پێچەوانەی مامەڵەی دانیشتوانی شاری مەدینەیە

(٣) زانایانی پەیڕەوی: ابو حەنیفە ووتویانە: واجب نیە كاربەتاك هەواڵێك بكرێ لەشتی بدوێ زۆربەی خەڵك گیر خواردەی بێ، بەم شێوە هەمووخەڵك پێویستی پێ‌هەبێ بیزانێ، وەك فەرمودەی: كەسێ دەست بدات بە عەورەنیە وە ئەوە دەبێ دەست نوێژ بگرێتەوە، ئەم فەرمودەیە پێشەوا ئەحمەد و غەیری ئەویش بەفەرمودەی پلە صەحیحیان داناوە، چونكە ئەوەی گشت كەس گیری بەدەسینەوە خواردووە

{او خالفه رواية} فلا يجب العمل به لانه انما خالفه لدليل قُلْنا في ظنه وليس لغيره اتباعه لان المجتهد لا يقلد مجتهداً كما سيأتي مثاله حديث ابي هريرة في الصحيح اذا شرب الكلب في اناء احدكم فليغسله سبع مرات وقد روى الدار قطني عنه انه امر بالغسل من ولوغه ثلاث مرات قال والصحيح عنه سبع مرات ويؤخذ من قوله اوخالف روايه انه امر بالغسل من ولو غه ثلاث مرات قال والصحيح عنه سبع مرات ويؤخذ من قوله او خالفه رواية ماصرحوا به من ان الخلاف فيما اذا تقدمت الرواية فان تأخرت او لم يعلم الحال فيجب العمل به اتفاقاً[1] . {اوعارض القياس} يعني ولم يكن رواية فقه اخذا من قوله بعد ويقبل من ليس فقيها خلافاً للحنفية فيما يخالف القياس لان مخالفته ترجح احتمال الكذب قُلْنا لا نسلم ذلك[2] .

---

پرسیاری زۆر لەبارەوە دەکریٚ، لەبەر ئەوە عادەت دەخوازیٚ کەبەتەواتور نەقلٚ بکریٚ چونکە هۆکارو داخوازی نەقڵەکەی زۆرن، لەبەر ئەوە کاربە تاکە هەواڵ ناکریٚ لەوەشدا ئێمەیش دەڵێن: عادەت حوکم بەوە بکات ئێمەنایسەلمێنین.

(١) یاخود ئەگەر ریوایەتکەرەکەی کرداری خۆی پێچەوانەی ئەو فەرمودەبیٚ کە ریوایەتی دەکات ئەوە واجب نیە کاربەو تاکە هەواڵە بکریٚ چونکە ریوایەت کەرەکە بۆیە پێچەوانەی کاری کردووە لەبەر بەڵگەیێك بووە، ئێمەش دەڵێن: لەگومانی خۆیدا بەبەڵگەی زاینوە، ئیتر غەیری خۆی بۆیٚ نیە شوێنی کەویٚ، چونکە مجتهد شوێنی مجتهدێکی‌تر ناکەویٚ، وەك لەمەو دوا دیٚ باسە کەی، نمونەی ئەوە ئەوفەرموودەی ابو هریرەیە کە بوخاری موسلم ریواتیان کردووە: ئەگەر کاتیٚ سەگ لەقاپی یەکێکتانی خواردوەوە بەحەوت جار بیشۆریٚ، (دارقطن)ی هەر لە ابوهریرەوە ریوایەتی کردووە کە: ابوهریرە خۆی فەرمانی داوە بەسیٚ جار شۆردنی جیٚ دەمی سەگ، (دارقطن)ی وتویەتی: ریوایەتی صحیح و دروست لە ابوهریرەوە ئەوەیە کە: حەوت جار شۆردنیەتی، ئەمەی کە دانەر دەڵیٚ: او خالفه روایە، لێیە وە وەر دەگیریٚ ئەوەی کە بەڕونی زانیان وتویانە ئەو جیاوازی پێشەوایانە لە تاکە هەواڵێکدایە کاتیٚ کە ریوایەتە کە پێش پێچەوانەی ریوایەت کەرەکە کەوتبیٚ، چونکە ئەگەر ریوایەتەکە دوا کەویٚ، یاخود حاڵ و بارنەزانریٚ ئەوە واجبە بەڕای هەموان کار بەو تاکە هەواڵ بکریٚ

(٢) یاخود تاکە هەواڵ دژو نەیاری قیاس بێت، واتە ریوایەت کەرەکەی پلەی زانستی فقیهی نەبیٚ، ئەمەش وەر گیراوە لە دانەرخۆی کە لەمەودوا دەڵیٚ: ریوایەتی کەسیٚ قەبوڵ دەکریٚ کەفەقیە نەبیٚ، ئەمەجیاوازە بۆ زانایانی پەیڕەوی ابو حەنیفە دەڵێن: ئەگەر ریوایەت کەر فەقیە نەبیٚ و فەرمودەی پلەی تاکە هەواڵ ریوایەت بکاو

{وثالثها} اي الأقوال {في معارض القياس} انه {ان عرفت العلة} في الأصل {بنص راجح} في الدلالة {على الخبر} المعارض للقياس {ووجدت قطاعا في الفرع لم يقبل} اي الخبر المعارض لرجحان القياس عليه حينَئذٍ[1] {اوظنا فالوقف} عن القول بقبول الخبر او عدم قبوله لتساوي الخبر والقياس حينَئذٍ[2] {والا} اي وان لم تعرف العلة بنص راجح بأن عرفت باستنباط او نص مساو او مرجوح {قبل} اي الخبر مثال الخبر المعارض للقيسا حديث الصحيحين واللفظ للبخاري لا تصروا الابل ولا الغنم فمن ابتاعها بعد فإنَّهُ بخير النظرين بعد ان يحلبها ان شاء امسك وان شاء ردها وصاعا من تمر فرد التمر بدل اللبن مخالف للقياس فيما يضمن به التالف من مثله او قيمته وتصروا بضم الناس وفتح الصاد من صرى وَ قِيلَ بالعكس من صر[3] .

دژی پێچەوانەی قیاس بێئەوە قەبوڵ ناکرێ، چونکە دژایەتی کردنەکەی بۆ قیاس لای دیوی هەڵگرتنی درۆ قورس دەکا، ئێمەیش دەڵێن: ئەوە ناسەلمێنین.

(١) قەولی سێهەم لەبارەی تاکە هەواڵێکەوە کەدژی قیاس بێ ئەوەیەکە: ئەگەر عیلەتی حوکمەکە لە ئەسڵەکەدا بە دەقێکی راجح دیاری کرابێ کەدەلالەت لەسەر مەدلولی ئەو هەواڵە بکاکە دژی قیاسە کەیە، لەگەڵ ئەوەش بەبێگومان ئەوعیلەتە لە فەرعەکەشدا دەست کەوێ ئەو تاکە هەواڵە دژبە قیاسە قەبوڵ ناکرێ، چونکە لەم کاتە دا لای قیاسە کە قورسترە بەسەر تاکە هەواڵەکەدا.

(٢) یاخود ئەگەر بوونی عیلەتەکە لە فەرعەکەدا بێگومان بۆ ئەوە هەڵوێستە دەکرێ لەوەی بووترێ هەواڵەکە قەبوڵ دەکرێ یاخود ناکرێ، چونکە لەم کاتەدا هەر دوکیان یەکسانن .

(٣) وە ئەگەر عیلەتەکە بە هۆی دەقێکی ڕاجیحەوە نەدۆزرا بێتەوە بەم شێوە بە بیرکاری دۆزرابێتەوە، یاخود بە دەقێکی یەکسان بۆ تاکە هەاڵەکە، یاخود بەهۆی دەقێکی مەرجوح دۆزرابێتەوە، ئەوە لە وکاتە دا تاکە هەواڵەکە قەبوڵ دەکرێ، نمونە بۆ هەواڵێك دژبە قیاس بێ فەرموودەێیکە بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە، ئەوەی بوخاری ڕیوایەتی کردووە بەم شێوەیە: نەکەن فێڵ بکەن بەنەدوشنی ووشتر و بزن و مەڕدا وانیشانی بدەن کەشیری زۆر ئەدەن، لەبەر ئەوە هەر کەسێك لەمەودوا شتێدا بکا دوای دۆشینیان ئەم دۆحاڵە بەپیی خۆی کامیان بەچاك دەزانێ هەڵیبژێرێ:١- ئەگەر ویستی تازە کڕیویەتی هەڵی گرێ . ٢- وە ئەگەر ئارەزوی لێیەتی بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنی لەگەڵ ساعێ خورمادا، پێدانی خورماکە لەباتی ئەوشیرەیە کە دۆشیویەتی ئەمە پێچەوانەی قیاسە، چونکە ئەو کەسەی شتی

{و} قال ابو علي {الجبائي لا بدَّ} في قبول خبر الواحد {من اثنين} يرويانـ {اواتضاد} له فما اذا كان روايه واحد كأن يعمل به بعض الصحابة أو ينتشر فيهم ك. ابا بكر ﷺ لم يقبل خبر المغيرة بن شعبة انه ﷺ اعطي الجدة السدس وقال هل معك غيرك فوافقه محمد بن مسلمة الانصاري فانفذه ابو بكر لها رواه ابو داود وغيره[١].

وعمر ﷺ لم يقبل خبر ابي موسى الاشعري انه ﷺ قال اذا استأذن احدكم ثلاثـ فلا يؤذن له فليرجع وقال: اقم عليه البينة فوافقه ابو سعيد الخدري أي فقبل ذلك عمر رواه الشيخان ويقوم مقام التعدد الاعتضاد قُلْنا طلب التعدد ليس لعدم قبول الواحد بل للتثبت كما قال عمر في خبر الاستئذان انما سمعت شيئا فاحببت أن اتثبت رواه مسلم[٢].

---

بفەوتێنێ یا دەبێتە زامنی وێنەی ئەو شتە فەوتاوە یاخود بەهاکەی.

(١) (الجبائی) ووتویەتی: پێویستە لە قەبوڵ کردنی تاکە هواڵدا دووکەس ئەبێ ریوایەتی بکەن، یاخود پشت گیرێکی هەبێ بەهێزی بکات ئەگەر یەك کەس ریوایەتی بکا، پشت کردنەکەش وەك ئەوەی هەندێ لە هاورێیانی پێغەمبەر کاریانی پێ کردبێ یاخود لە ناویاندا بڵاوبێتەوە کەسیش رەخنەی لێ نەگرتبێ، چونکە ابوبکر تاکە هەواڵی موغەیرەی قەبوڵ نەکرد کەووتی پێغەمبەر شەش یەکی میراتی داوە بە نەنك. ابو بکر ووتی: جگەلە خۆت کەسیترت لەگەڵە بۆ ئەم هەواڵە؟ ئەمجار محمدی ئەنصاری هەروەك موغەیرە گەواهیەکەیدا بۆ ابوبکر، ئەویش لەبەر ئەوە هەواڵەکەی موغەیرەی جێبەجێ کرد، ابوداودو غەیری ئەویش ئەوفەرمودەیان ریوایەت کردووە.

(٢) عومەریش هەواڵی: ابو موسای ئەشعەری قەبوڵ نەکرد کە پێغەمبەر فەرموبێتی: کاتی یەکێکتان سێ جار مۆڵەتی خواست لە خاوەن ماڵ و مۆڵەتی نەدایە ئیتر بایەکسەر بگەرێتەوە، عومەر ووتی: دەبێ بەڵگەی تەواو بەر پابکەیز لەسەر ئەو فەرموودەیە، ئەمجا ابو سعیدی خودری هەروەك پێشو گەواهیەکەیدا. ئەمجار عومەر قەبوڵی کرد. بوخاری و موسلم ریوایەتیان کردووە پشت گیری و بەهێز کردنی یەکتر لەجێ چەند ژمارەیێك ریوایەت کەری زۆر دادەنیشن، ئێمەش دەبێت داواکردنی ابو بکرو عومەر کەبەڵگەی رون لەسەر هەواڵیان بێنن بۆ ئەوەنیە تاکە هەواڵ قەبوڵ ناکری و ئەبێ ریوایەتکەر زۆربن، بەڵکو بۆ ئەوە بووەدڵیان ئارام بێ و لەخەیاڵ بنیشێنەوە، وەك عومەر ووتی لەهەواڵی مۆڵەت خواستنەکەدا: من تەنها شتێك بیستبو بەڵام ویستم و پێم خۆشبو بێگومانی بکەم، دڵم ئارام بێ لێی. موسلم ریوایەتی کردووە.

{و} قال {عبد الجبار لا بد من اربعة في الزانا} فلا يقبل خبر مادونها فيه كالشهادة عليه وحكي هذا في المحصول عن حكاية عبد الجبار عن الجائي ومشي عليه المصنّف في شرح المنهاج فسقط منه هنا لفظة عنه وهو اما تقييد لا طلاق نقل الاثنين عنه كما مشي عليه ابن الحاجب او حكاية قول آخر عنه في خبر الزنا[1] .

{مسئلة المختار وفاقاً للسمعاني وخلافاً للمتـأخرين} كالا مام الرَّازي والآمدى وغيرهما {ان تكذيب الأصل الفرع} فيما رواه عنه كأن قال مارويت له هذا {لا يسقط لمروي} عن القبول لاحتمال نسيان الاصل له بعد روياته للفرع فلا يكون واحد منهما بتكذيبه للآخر مجروحاً[2] {ومن ثم} اي من هنا وهو ان تكذيب الاصل الفرع لايسقط المروي اي من اجل ذلك نقول {لواجتمعا في شهادة لم ترد}[3] .

(١) عبد الجبار ووتويەتی: ئەگەر تاکە هەواڵ لەبارەی زیناوەبێ ئەوە دەبێ ڕیوایەت کەرەکانی چوار کەس بن، کەوابو هەواڵێك لە چوار کەمتربن ڕێوایەت کەرەکانی لەبارەی زیناوە وە قەبوڵ نیە هەروەکو گەواهی دانە لەسەر زیناکە . دانەر لە کتێبی: (المحصول) دا ئەمەی وا گێڕاوەتە کە (عبدالجبار) لە (جبائیة) وە وەری گرتووە، وە لە کتێبی: (شرح المنهاج)دا دانەر هەربەو شێوەیە چوە و باس کردووە، کەوابو لێرەدا ووشەی: (عنە)ی لێ کەوتووە، ئەوەی لە کتێبی (المحصول) دا یە یاکۆت کردنە بۆ ئەو ڕەهایەی کە ئەو دووانە هەردوکیان لە (جبائیة)وە نەقڵیان کردووە لەغەیری بابەتی زینادا، یاخود ئەوە گێڕانەوە ڕەئیەکێتری جەبائیە لەبابەتی زینادا .

(٢) قەولی هەڵبژاردە بە موافقەی (سەمعانی) وجیاوازی زانایانی سەردەمی دووایی وەك پێشەوا ڕازی وئامێدی و غەیری ئەوانە ئەو کە بەدرۆخستنەوەی مامۆستا بۆ قوتابیەکەی لەوەیدا کە لەمامۆستاکەی بۆی گێڕاوەتەوە، بەم شێوە بڵێ: من ئەم بۆ نەگێراوەتەوە، ئەوەی کە ڕیوایەت کراوە لە قەبول بون ناکەوێ بەهۆی قسەکەی مامۆستا کەیەوە، چونکە هەڵئەگرێ مامۆستا کە لەبیری چوبێتەوە دوای ئەوەی کە بۆی گێڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە هیچ کامیان بەدرۆخستنەوەی ئەوێ تریان مەجروج نابێ و لەوەناکەوێ هەواڵی لێ قەبوڵ نەکرێ

(٣) لەبەر ئەوەی مامۆستا ئەگەر قوتابی بەدرۆخستەوە ڕیوایەت کراوەکە هەر لە قەبوڵ بون ناکەوێ، دەڵێن: ئەگەر مامۆستاو قوتابی دوای بەدرۆخستنەوەی هەردوکیان لەشایەتێکدا کۆبونەوە ئەو گەواهی و شەهادەتە ڕەد ناکرێتەوەو ناگەڕێنرێتەوە لە دادگادا.

ووجه الاسقاط الذي نفي الآمدي الخلاف فيه أن أحدهما كاذب ولا بد ويحتمل أن يكون هو الفرع فلا يثبت مرويه ولا ينافي هذا قول شهادتهما في قضية لان كلا منهما يظن انه صادق والكذب على النبيِّ ﷺ الذي يؤل إليهِ الأمر في ذلك على تقدير انه يسقط العدالة اذا كان عمدا [1] ولو استوضح المصنِّف على الاول بما بناه عليه لسلم من دعوى التنافي بين المبني والثاني التي افهمها بناؤه[2] {وان شك} الأصل في انه رواه للفرع {او ظن} انه مارواه له {الفرع} العدل {جازم} بروايته عنه {فاوْلى بالقبول} للخبر مما جزم فيه الاصل بالنفي[3].

(١) هۆی خستنی ڕیوایەت کراوەکە و قەبوڵ نەکردنی کە ئامێدی ووتی: ئەوە هیچ جیاوازێکی تێدانیەو ڕای هەموانە، ئەوەیەکە دەبێ یەکێکیان هەر دۆرزنبێ لەم گەواهیدانەدا، وەهەڵدە گریَ درۆزنەکە قوتابیەکەبیَ، کاتێکیش احتمال پەیدابوو استدلال پۆچەڵ دەبێتەوە، کەوا بو ئەوەی قوتابیەکە ڕیوایەتی کردووە سابت نابیَ، ئەی بۆ شاهید یان وەر ئەگێری؟ ئەمەی ئەبێ یەکێکیان درۆزن بێ دژایەتی شەهادەت وەر گرتنیان نیە لە شتێکی تردا لە دادگالێیان قەبوڵ بکریَ، چونکە هەریەکیَ لەو دوانە خۆی بەڕاست گۆ دەزانیَ، درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە کە لێرەد بابەتە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە کە قوتابیەکە درۆ بکابەدەم مامۆستاکەیەوە کە لێرەدا پێغەمبەرە، چونکە تەنها درۆێیك ڕیوایەت کەرەکە لە عەدالەت ئەخا کاتیَ کە بەعەمدی درۆکە بکات.

(٢) ئەگەر دانەر بەهۆی ئەوەوە کەبینای کرد لەسەر قەولی یەکەم مەبەستەکەی واڵا بکردایە ئەوکاتە ڕزگاری دەبوو لە دەعوای دژایەتی نێوان یەکەم و دووەم، یەکەم ڕەددنەکردنەوەی شەهادەتەکەیە ، دووەم اسقاطی ڕیوایەت کراوەکەیە، چونکە دانەر ڕەددنەکردنەوەی شەهادەتەکەی لەسەر اسقاط نەکردنی هەواڵە کەبیناکردووە، بۆیە ئەگەر اسقاط کرا شەهادەت کەش ڕەد دەکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش شەهادەتەکە کە قەبوڵ دەکریَ وەك ئامێدی ووتی لەگەڵ: اسقاطی ڕێوایەت کراوەکەدا، کە وابو دژایەتی نێوان إسقاطی مەرویەکە کەقەولی یەکەمە لەگەڵ قەبوڵ کردنی شەهادەندا نیە - ئەمەش جیاوازە بۆ ئەو شێوە حاڵی بونەی دانەر گەیاندیو بینای لەسەر کرد .

(٣) ئەگەر مامۆستاکە گومان بەمانا شەککی یاظنی هەبوو لەوەدا ئەو هەواڵەی ڕێوایەت کردووە بۆ قوتابیەکەی یانە؟ قوتابیە عادلەکەش یەقینی هەبو کە بۆی ڕێوایەت کردووە، ئەمە باشتر قەبوڵ دەکری، لەو هەواڵەی کەمامۆستاکەی بەیەقینەوە نەفی دەکرد.

{وعليه} اي على القبول {الأكثر} من العلماء لما تقدَّمَ من احتمال نسيان الاصل ووجه عدم القبول القياس على نظيره في شهادة الفرع على شهادة الاصل و أُجيبَ بالفرق بأن باب الشاهدة اضيق اذ اعتبر فيه الحرية والذكورة وغيرهما ولوظن الفرع الرواية وجزم الاصل بنفيها او ظنَّه قال في المحصول في الاول تعين الرد وفي الثاني تعارضا والاصل العدم والاشبه القبول[1].

{وزيادة العدل} فيما رواه على غيره من العدول {مقبولة ان لم يعلم اتحاد المجلس} بأن علم تعدده لجواز ان يكون النبيّ ﷺ ذكرها في مجلس وسكت عنها في آخر أولم يعلم تعدده ولا اتحاده لان الغالب في مثل ذلك التعدد[2].

---

(١) زۆرتری زانایان لەسەر ئەوەن کە قەبول بکرێ چونکە لەپێشەوە ڕابورد ووتمان هەڵدەگرێ کە مامۆستاکەی لەبیری چوبێتەوە، ئەی بۆهەندی ووتویانە قەبولْ ناکرێ؟ ووتویانە: هۆی قەبولْ نەبونەکەی قیاس ئێرەدەکرێتەسەر نمونەی ئەوە وەك شاهیدی دانی قوتابیێك لەسەر شاهادەتی مامۆستاکەی – بەم شێوە مامۆستایێك بەقوتابیەکەی بڵێ، شاهیدی بدە لەسەر ئەم شەهادەتی منە، ئەویش بیدا، بەلام بێ ئەی ناوەڕۆکی شەهادەتەکە بزانێ چیە؟ تەنها وەك شوێن کەوتەیێك شاهیدی داوە – وەلامی ئەو قیلە دراوەکەوەکە: ئەم قیاسە دروست نیە چونکە قیاس کراوو قسای لەسەر کراو جیاوازیان هەیە، کەبابەتی شەهادەت و گەواهی دان تەسکراو گراترە، چونکە لەمەسەلەی گەواهیداندا ئەبێ ئەوەی شاهیدی ئەدا نێرینە بێ و ئازاد بێ غەیری ئەمانەش، بەلام لەڕیوایەتی فەرمودەیێکدا جاریەو ئافرەتیش دروستە، ئەگەر قوتابیەکە وا گومانی دەبرد ئەو ڕیوایەتەی بۆ کراوە، مامۆستاکەش بێگومان بو کەنەی کردووە، یاخود مامۆستاکەش وەك خۆی هەر گومانی هەبوە، دانەر لەکتێبی (المحصول)دا وتویەتی: لە یەکەمیاندا بێگومان ڕیوایەت کراوەکە قەبولْ ناکرێ و دەگەڕێنرێتەوە، لەدوهەمیشدا هەردوکیان دەچن بەگژیەکدا، چونکە هەردوکیان لەگوماندان، ئەسڵیش ئەوەیە ڕیوایەت نەکرابێ و قەبولْ نەبێ، قسەیێك کە زۆر تر لە ڕاستی بچێ ئەوەیە کە قبولْ بێ

(٢) ئەگەر ڕیوایەت کەرێکی عادل شتێکی گەڕاندوە چەندەهای کەسی تریشی گەڕاندیانەوە بەلام ئەم بەتاق وتەنها زیادەی هەبو لە ڕیوایەتەکەیدا، ئەوە ئەو زیادەیە قەبوڵە و وەر دەگیرێ، بەمەرجێ ئەوەنەزانرێ کە هەموویان لەیەك کۆڕدا وەریان گرتووە، بەم شێوە بزانرێ کە لەچەند کۆڕی تردا ئەوە ووتراوەتەوە، چونکە ئەبێ کەپێغەمبەرﷺ لەکۆرێکدا باسی کردبێ و لەکۆرێکی تردا بێ دەنگ بو بێ لێ، یاخود

{والا} اي وان علم اتحاد المجلس {فثالثها} اي الاقوال {الوقف} عن قبولها وعدمه والأول القبول الجواز غفلة غير من زاد عنها والثاني عدمه لجواز خطا من زاد فيها[(١)].

{والرابع ان كان غيره} اي غير من زاد {لا يغفل} بضم الفاء {مثلهم عن مثلها عادة لم تقبل} اي الزيادة و إلاّ قبلت {والمختار وفاقا للسمعاني المنع} اي منع القبول {ان كان غيره} اي غير من زاد {لا يغفل} اي مثلهم عن مثلها عادة {او كانت تتوفر الدواعي على نقلها} وبهذا يزيد هذا القول على الرابع[(٢)]. وان لم يكن الأمر كذلك قبلت {فان كان الساكت عنها} اي غير الذاكر لها {اضبط} ممن ذكرها {او صرح نفي الزيادة على وجه يقبل}[(٣)].

---

نەشزانرێ لەچەند کۆڕێکدا دوبارە بوبێتەوە یانەزانرێ هەر لەیەك کۆڕدا ووتراوە هەرقەبولْ دەکرێ، چونکە خوی زاڵ لەو جۆرە شتانە دا ئەوەیە جارێ هەبێ و جارێ نەبێ و فرە ڕەنگی لەو شتانەدا زاڵە .

(١) ئەگەر زانرا کە هەریەك کۆڕ بووە ئەوەسێ قەولی تێدایە، سیەەمیان هەڵوێستە دەکا نەدەڵی قەبوڵی ئەو زیادە دەکەم، وە نەدەڵێ قەبوڵی ناکەم، لەبەر بەگڕایەکچونی بەڵگەی هەردولا، قەولی یەکەم دەڵیٚ: ئەوزیادە قەبولْ دەکرێ، چونکە ئەبێ هەمویان بیٚ ئاگابووبن جگە لەوەیان نەبێ زیادەکەی ڕیوایەت کردووە، قەولی دووەمیش دەڵێ: ئەوزیادە قەبولْ ناکرێ چونکە دەبێ ئەوەیان کە زیادەکەی ریوایەت کردووە غەڵەتی کردبێ .

(٢) قەولی چواردەم دەڵێ: ئەگەر ئەوانەی زیادەکەیان ڕیوایەت نەکردووە کەس وەك ئەوان نابێ عادەتەن لەشتی وەهابێ ئاگابن ئەوە ئەوکاتە زیادەکە قەبوڵناکرێ، ئەگەر وابن قەبولْ دەکرێ، قولی پێنجەم و هەڵبژاردەکە سەمعانیش موافق یەتی ئەوەیە کە قەدەغەیە قەبولْ کردنی، ئەگەر ئەوانەی زیادەکەیان ڕیوایەت نەکردووە عادەتەن کەس وەك ئەوان نابێ لەشتی وەهابێ ئاگابی یەك، دووەم یاخود هۆکارو داخوازی نەقلْ کردنی ئەو زیادە زۆربێ، ئەم قەولی پێنجەمە بەمەرجێ دووەمی قەولی چوارەم جیادەکرێتەوە چونکە ئەم مەرجەی زیادکردووە .

(٣) ئەگەر بەوشێوەی پێشەوە نەبو ئەوە ئەو زیادە قەبولْ دەکرێت، بەم شێوەی خوارەوە دەبێ: جا ئەگەر ئەوەی بی دەنگە لەو زیادە و باسی ناکات توندو تۆڵتر شتی دەپاراست لەوەی کە ئەو زیادەی باس کردووە، یاخود بە ڕێك و ڕەوانی بەشێوەێك کەقەبولْ بکرێ ئەوزیادەیە نەفی بکا.

كان قال ما سمعتها {تعارضا} اي الخبر ان فيها بخلاف ما اذا نفاها على وجه لايقبل بأن محص النفي فقال لم يقلها انلي ﷺ فإنَّهُ لا اثر لذلك[1] {ولو رواها} الراوي {مرة وترك خرى فكراويين} رواها احدهما دون الآخر فان اسندها وتركها الى مجلسين لوسكت قبلت اوالى مجلس فقيل تقل لجواز السهو في الترك وَ قِيلَ لا لجواز الخطأ في الزيادة وَ قِيلَ بالوقف عنهما[2]. {ولو غيرت أعرا الباقي تعارضا} اي خبر الزيادة وخبر عدمها لاختلاف المعنى حينَئِذٍ كما لوروى في حديث الصحصحين فرض رسول الله ﷺ زكاة الفطر صاعا من تمر الخ نصف صاع {خلافاً للبصري} ابي عبدالله في قوله تقبل الزيادة كما اذا لم يتغير الاعراب[3].

(١) بەم جۆرەكە بلّىٚ: من ئەو زیادەم نەبیستووە، ئەوە ئەو كاتە ئەو دو هەواڵە و ڕیوایەتە لەبارەی ئەو زیادەوە دەچن بەگژیەكدا، بەلاّم جیاوازە لەگەلّ ئەوەدا ئەگەر نەفی ئەو زیادەیە بەشێوەیێك بكات كەقەبولّ نەكرىٚ، بەم جۆرە نەفیەكە پاك و پۆخت بكات و بلّىٚ، هەرپێغەمبەر ﷺ نەی فەرمووەو كەس نەی بیستووە - چونكە من نەتوانم نەفی بیستنی خۆم بكەم بەلاّم بۆكەسیتر ناتوانم - ئەوە هیچ جۆرە شوێنەوارو ڕۆلّێك نیە بۆ ئەو ڕیوایەتە.

(٢) ئەگەر ئەو زیادەیە هەریەك ڕیوایەت كەر جارێك ڕیوایەتی دەكاو جارێكیتر نایكات، ئەوە وەكو دو ڕیوایەت كە وایە، یەكێكیان ڕیوایەتی بكابىٚ ئەوی تریان، جائەگەر ئەو تاكە ڕیوایەت كەرە زیاددكەی دایە پالّ كۆڕێك و باسی نەكرد ئەیشیدایە پالّ كۆڕێكی تر، یاخود بىٚ دەنگ بو لەوە ئەوە ئەو زیادەیە قەبولّ دەكرىٚ، یاخود هەر بیداتە پالّ یەك كۆڕ، ئەوە هەندێك ووتویانە: قەبولّ دەكرىٚ، چونكە دەبىٚ كەهۆی كردبىٚ لە باسی نەكردنی ئەو زیادەیە، هەندێكیتر ووتویانە قەبولّ ناكرىٚ، چونكەی دەگونجىٚ غەلّەتی كردبی ئەو زیادەیە ووتبىٚ، هەندێكی تر ووتویانە· لەبەر بەلّگەی قەبولّ و قەبولّ نەكردن هەلّویستە دەكەم تابۆم دەركەوىٚ.

(٣) ئەگەر ئەو زیادەیە اعرابی ووشەكانیتر بگۆڕىٚ، ئەو كاتە ئەوو ڕیوایەتەی زیادەكەی تێدایە لەگەلّ ئەوەی تێدانیە دەچن بە كژیەكدا – ئیتر هەردوكیان لەپلەی بونە بەلّگە دەكەون – چونكە كە اعراب كۆڕا ئەوكاتە ماناش دەگۆڕىٚ، وەك گریمان ئەگەر لەو فەرمودەدا كە بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان كردووە دەفەرموىٚ: پێغەمبەرﷺ سەرفیترەی بریەوە بە ساقێك خورما. ڕێوایەتێكیتر بكرىٚ بلّىٚ: (نصف صاع) نیو صاع، صاعەكە لەڕیوایەتە صەحیحەكەدا منصوبە بەلاّم بەم قسە مجرور دەبىٚ، وەك اعرابەكەی كۆڕا ماناكەش دەگۆڕىٚ. بەلاّم ابو عبدالله بەصری جیاوازە لەو

{ولو انفرد واحد عن واحد} فيما روياه عن شيخ بزيادة {قبل} المنفرد فيها {عند الاكثر} لان معه زيادة علم وَ قِيلَ لا لمخالفته لرفيقه[1]. {ولو اسند وارسلوا} اي اسند الخبر الى النبيِّ ﷺ واحد من رواته وارسله الباقون بأن لم يذكروا الصحابي كما يعلم مما يأتي {او وقف ورفعوا} كذا بخط المصنِّف سهوا وصوابه او رفع ووقفوا اي رفع الخبر الى النبيِّ ﷺ واحد من رواته ووقفه الباقون على الصحابي او من دونه {فكالزيادة} اي فالاسناد او الرفع كالزيادة فيما تقدَّمَ فيُقالُ ان علم تعدد مجلس السماع من الشيخ فيقبل الاسناد او الرفع لجواز أن يفعل الشيخ ذلك مرة دون اخرى[2].

---

بۆچونەیدا کەدەڵێ: ئەو زیادەیە قەبوڵ دەکرێ، وەك کاتێ ئەگەر اعرابەکەی نەگۆڕێ قەبوڵ دەبوو ئێستەش قەبوڵ دەبێ .

(١) باسی ئەوە تەواو بو ئەوەی کەزیادەکەی ڕیوایەت دەکرد یەك کەس بو بەڵام بەرانبەرەکەی چەند کەسێکی عادل بون، ئەی ئەگەر هەردولا هەریەك کەس بێ، واتە: ئەگەر کەسێ خۆی تەنها بویە وە لە ڕیوایەتی یەکێك تر کەئەویشی هەر تەنها بو. هەردوکیان لەشێخێکیان ڕیواتیان کرد، کە بەهۆی زیادەێیکە وە تەنها بویەوە، بەلای زۆرتری زانایانەوە هەواڵی ئەو تاکە کەسە لەو زیادەدا قەبوڵ دەکرێ، چونکە عیلمی خەڵك ئەزانێ و لەگەڵ زیادە عیلمێکیتریشدا، هەندێك دەڵێن: قەبوڵ ناکرێ، چونکە پێچەوانەو جیاوازە لە ڕیوایەتی ڕەفیقەکەی.

(٢) ئەگەر یەکێك لە ڕیوایەتەکەرەکان هەواڵەکەی بەزنجیرەی ڕیوایەت گەیاندەود پێغەمبەرو ئەوانی تر ارسالیان کردو ئەو هاواڵەی پێغەمبەر کە فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە گەڕاندووەتەوە باسی نەکرێ- بۆ واپێناسەی ارسالی دەکەیت؟ چونکە لەوەی کە لەمەودوا دێ وادەزانرێ- یاخود یەکێکیان زنجیرەی ڕیوایەتەکەی کرد تا لەسەر هاوەڵێکی پێغەمبەر وەستاو ئەوانیتر بەرزیان کردەوە تاگەیاندیانە پێغەمبەر. بەو شێوەیە، بەقەڵەمی دانەر نوسراوەتەوە بەلام بەسەهو وا نەنوسراوە، ڕاستیەکەی بەم شێوەیە: یاخود یەکێکیان ڕیوایەتەکە بە زنجیرەی خۆی بەرزی کات وەهەتا دەیباتەوە سەر پێغەمبەرﷺ، بەلام ئەوانی تر لەسەر هاوەڵەکەی پێغەمبەر دەوەستن یاخود لەسەر خواری هاوەڵانە دەوەستن، ئەوە ئەو ڕیوایەتە حوکمەکەی وەکو حوکمی ئەو ڕیوایەتە وایە کە زیادەی تێدا هەبوایە لە سەر ئەوشێوازەی پێشەوە، کەوابو دەووترێ: ئەگەر زانرا چەند جارێ ئەو ڕیوایەتە لە مامۆستاکە بیسراوە، ئەوە ئەو استادو ڕەفعە قەبوڵ دەکرێ، چونکە ئەشێ ئەو مامۆستایە جاری اسنادی کردبێ

وحكمه في ذلك القبول على الراجح وكذا إن لم يعلم تعدد المجلس ولا اتحاده لان الغالب في مثل ذلك التعدد وان علم اتحاده فثالث الاقوال الوقف عن القبول وعدمه والرابع ان كان مثل المرسلين اوالواقفين لا يغفل عادة عن ذكر الاسناد او الرفع لم يقبل والاقبل فان كانوا اضبط او سرحوا بنفي الاسناد اوالرفع على وجه يقبل كأن قالوا ماسمعنا الشيخ اسند الحديث اورفعه تعارض الصنيعان[(١)] .

{وحذف بعض الخبر جائزٌ عند الاكثر إلاّ ان يتعلق} اي يحصل التعلق للبعض الآخر {به} فلا يَجوزُ حذفه اتفاقاً لإخلالهِ بالمعنى المقصود كان يكون غاية مستثنى كما في حديث الصحيحين انه ﷺ نهي عن بيع الثمرة حتى تزهي وحديث مسلم لا تبيعوا الذهب بالذهب ولا الورق بالورق إلاّ وزنا بوزن مثلاً بمثل سواء بسواء[(٢)].

---

بیئەوەی جارێکتر کردبێتی .

(١) ئەو مامۆستایەش ئەوەی لێ قەبوڵ دەکرێ لەسەر قەولی راجح، هەروەکو ئەوە وایە ئەگەر ئەزانرا کە لە چ کۆڕێکدا ئەوەی ووتووە، یانەزانرا کە لەتاکە کۆڕێکدا وتویەتی، چونکە لەنمونەی شتیوادا زۆربەی فرە شێوەیی و فرەدیمەنییە، ئەگەر زانرا کەلەتاکە کۆڕێکدا ووتراوە ئەوە چەند قەولێکی تێدایە، سیٚهەمیان هەڵویستە کردنە لە قەبوڵ کردن و نەکردنیا، چوارمیان دەڵێ: ئەگەر إرسال کەرەکان و هەڵوێستەکەرەکان عادەتەن بێ ئاگانە ئەبون لەباس إسناد یاخود بەرزکردنەوەی هەواڵە ئەوە قەبوڵ ناکرێ، ئەگەر وانەبێ قەبوڵ دەکرێ، کەوابوَ ئەگەر زیاتر وەریدەگرت و دەیپاراست یاخود بەڕونی نەفی اسنادو ڕەفع بکەن بەشێوەیێك کە قەبوڵ بکرێ، بەم شێوە بڵێن: ئێمە لە شێخمان نەبیستووە ئەم فەرمودەیە اسناد بکا یاخود ڕەفعی بکا، ئەو کاتە ئەو ارسال و ڕەفعە دوو کاری دژ بەیەك ئەبن

(٢) لابردنی هەندێ لەفەرمودەو هەواڵ بەلای زۆربەی زۆری زانایانە وە دروستە، مەگەر ئەو لابراوە پەیوەندێیکی تەواوی هەبێ بەویترەوە، ئەوکاتە دروست نیە لابردنی بەڕای هەموان، چونکە نوقسانی ئەگەیێنێ بەو مانایە کە مەبەستە ، وەك ئەوەی لابراوەکە کۆتامەبەست ئەوەبێ کەماوەتەوە، یاخود لابراوەکە جیا کراوەو موستەثنا بێ و ئەوەی ماوە مستەثنامنە بێ، وەك ئەوفەرمودەیە بوخاری و موسلم ڕیوایەتی دەکەن کە فەرموی: پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی بەری قەدەغە کردووە هەتا دەر ئەکەوێ و بۆ خواردن دەشێ، حتی تزهق، غایەی فەرموودەکەیە، ئەگەر لای بەی نوقصانی دەگەیێنێ بەمەستەکە، یاوەك ئەو فەرمودەی موسلم ڕیوایەتی کردووەو دەفەرموێ: ئاڵتون بە ئاڵتون و زیو بەزیو نەفرۆشن مەگەر کێشراوێك بەرانبەر

**بخلاف ما لايتعلق به فيَجوزُ حذفه لانه كخبر مستقل وَ قِيلَ لا يَجوزُ لاحتمال ان يكون للضم فائدة تفوت بالتفريق وقرب هذا من منع الرواية بالمعنى وسيأتي مثاله حديث ابي داود وغيره انه ﷺ قال في البحر هو الطهور ماؤه الحل ميتته[1].**

**{واذا حمل الصحابي قيل اوالتابعي مرويه على} احد محمليه {المتنافيين} كالقرء يحمله على الطهر والحيض {فالظاهر حمله عليه} لأن الظاهر انه انما حمله عليه لقرينة[2]. {وتوقف} الشيخ {ابو اسحق الشيرازي} حيثُ قال فقد قيل يقبل وعندي فيه نظر اي لاحتمال ان يكون حمله لموافقة رايه لالقرينة وانما لم يساوالتابعي الصحابي على الراجح لان ظهور القرينة للصحابي اقرب[3].**

---

كێشراوێك نەبێ ، یا ئەندازەیێك بەرانبەر ئەندازەیێك ، یا یەكسانێك بەرانبەر یەكسانێك نەبێ.

(١) بەلام فەرمودەیەك بەلابردنی شتێك لێماناكەی نوقسان نەبێ ئەوە جیاوازە، ئەوە دورستە لابردنی، چونكە وەكو هەواڵێكی سەربەخۆ وایە، هەندێك ووتویانە: دروست نیە لابردنی چونكە هەڵدەگرێ ئەو ووشەی پێوەلكاوەو ئێستە تۆڵای دەبەیت سودێكی هەبێ بەجیاكردنەوە یان بفەوتێ، ئەمە نیزك خراوە تەوە لەو قەولی كەدەڵی نابێ ڕیوایەتی فەرمودە بەمانابكرێ، لەمەودوا ئەم بابەتە دێ، نمونەشی ئەو فەرمودەیە ابوداودو غەیری ابوداود ڕیوایەتی دەكەن دەفەرمێ: لەبارەی ئاوی سوێرو بەحرەوە: ئاوەكەی پاكەوە كەرە، مردارەوە بویش حەڵاڵە، ئەگەر ڕستەی: الحل متنه،ی لێ لابەی مانای مەبەست نوقسانی پێ ناگات.

(٢) كاتێ هاوەڵێك، هەندێك ووتویانە: یاخود شوین كەوتەی هاوەڵێك ڕیوایەت كراوەكەی خۆی ببڕێ بەسەر یەكێك لەدومانا دژبەیەكەكەیدا كە هەردوكیان هەڵدەگرێ، وەك ووشەی (قرء) هەڵدەگرێ ببڕێ بەسر پاكیشدا یاخود حەیزدا، قسەی دیار و روون ئەوەیە ئەبڕێ بەسەریدا، كە پاكیە چونكە وادیارە بۆ یە بڕیویەتی بەسەر ئەو مانایە یەندا لەبەر هێماو هۆكارێك.

(٣) شێخی شیرازی هەڵویستەیێكی كردووە، چونكە ووتویەتی: بێگومان هەندێ ووتویانە: قەبوڵ دەكرێ، لەو قەبوڵی قیلەدامی ڕەخنە و بۆچونێكی ترم هەیە، دواتە لەبەر ئەوەی ئەگونجێ بۆیە بڕیوەیەتی بەسەرئەومانایەدا، لە بەر ئەوەی ئەومانایە موفاقی ڕاكەیخۆی بووە، نەك لەبەر هێماو هۆیێك بێ، بۆیە شوێن كەوتەی هاوەڵانی یەكسان نەكردووە لەگەڵ هاوەڵدا لەسەرقەولی راجح چونكە دەركەوتنی هێماو هۆبۆ هاوەڵی پێغەمبەر نزیك ترە لە دەركەوتنی بۆ ئەو.

{وان لم يتنافيا} اي المحملان {فكالمشترك في حمله على معنييه} الذي هو الراجح ظهورا أو إحتياطاً كما تقدَّمَ فيحمل المروى على محمله كذالك ولايقصر على محمل الرواي إلاّ على القول بأن مذهبه يُخَصّص وعلى المنع من حمل المشترك على معنييه يكون الحكم كما لو تنافي المحملان كما قال صاحب البديع المعروف حمله على محمل الراوي قال ولا يبعد ان يقال: لايكون تأويله حجةً على غيره اهـ[1].

{فان حمل} اي حمل الصحابي مرويه {على غير ظاهره} كأن يحمل اللفظ على المعنى المجازي دون الحقيقي اوالامر على الندب دون الوجوب {فالأكثر على الظهور} ي على اعتبار ظاهر المروي وفيه قال الشافعي ﷺ كيف اترك الحديث بقول من لو عاصرته لحجته[2].

---

(١) ئەگەر ئەو دومانايەی هەڵدەگرت و دژی يەك نەبون، ئەوە وەكو مشترك وايە ئەبڕی بەسەر هەردوو ماناكانيدا، كەئەوەش قەولی ڕاجحە، لەبەر ئەوەی كەوا ديارە وەك شافعی ووتی، يالەبەر احتياط وەك قازی ووتی، لەپێشەوە تێپەڕی كرد، بۆ ڕيوايەتكراوەكەش دەبڕی بەسەر هەر دوماناكانيدا، ئەميش هەروەك هۆكانی ئەو، لەبەر ئەوەيە واديارە يالەبەر احتياط، ئەنجا نابڕی بەسەر ئەو مانايەدا كە ڕيوايەت كەرەكە بڕی بەسەريدا، مەگەر لەسەر ئەو قەولەی كە دەڵێ: بۆچونی ڕيوايەتكەر گشتگير تايبەت ئەكات، لەسەر ئەو قەولەی كە نايەڵێ موشتەرەك بڕێ بەسەرهەر دوماناكانيدا ئەو كاتە حوكمەكەی وەك ئەوی لێ دێ ئەگەر دوماناكەی دژبە يەكبون چۆن بوو ئەميش وەهای لێ دەكرێ، وەك خاوەنی كتێبی: (البديع)، ووتويەتی: هەر ئەوە بەناو بانگەكە موشتەرەك دەبڕێ بەسەر ئەو مانايەدا كەڕيوايەتكەرەكە بڕيويەتی بەسەريدا، هەروەها ووتويەتی: دوور نيە بووترێ: كە تەئويلی ڕيوايەتكەرەكە بەڵگەنيە لەسەر غەيری خۆی .

(٢) ئەگەر هاوەڵێك ڕيوايەتكراوەكەی خۆی بەسەرمانايێكدا بڕی ديارەكەيان ئەوە نەبو، وەك ئەوەی لفظيك بڕێ بەسەرمانا مەجزيەكەيدا نەك حەقيقی، ياخود ئەمر بڕی بەسەر نەدبا نەك وجوب، كەحەقيقیو وجوب شتێكی ديارن، ئەوە زۆرترين زانايان لەسەرمانا ديارەكەن، واتە گرنگی بەماناى ديارى ڕيوايەت كراوەكە ئەدەن ، لەمەدا شافعی فەرمووی: چۆن دەبێ واز لە فەرمودە بێنم بە هۆی قسەی كەسێكەوە ئەگەر هاوكات و لەسەردەمی ئەودا بومايە كێشەم لەگەڵ ئەكرد.

{وَ قِيلَ يحمل {على تأويله مطلقا} لأنه لا يفعل ذلك إلاّ لدليل قُلْنا في ظنه وليس لغيره اتباعه فيه {وَ قِيلَ } يحمل على تأويله {ان صار إليه لعلمه بقصد النبيّ ﷺ اليه من قرينة شاهدها قُلْنا علمه ذلك اي ظنه ليس لغيره اتباعه فيه لان المجتهد لا يقلد محتهدا فان ذكر دليلا عمل به[1].

{مسئلة لا يقبل} في الرواية {مجنون} لانه لا يمكنه الاحتراز عن الخلل وسواء أطبق جنونه ام تقطع واثر في زمن افاقته {وكافر} ولو علم منه لاتدين والتحرز عن الكذب لانه لا وثوقبه في الجملة مع شرف منصب الرواية عن الكافر[2]. {وكذا صبي} مميز {في الأصَحّ} لانه لعلمه بعدم تكليف قدلايحترز عن الكذب فلا يوثق به وَ قِيلَ يقبل ان علم منه التحر زعن الكذب ولم يصرح المصنّف بالتميز للعلم به فان غير الميزلا يمكنه الاحتراز عن الخلل فلا يقبل قطعا كالمجنون[3].

---

(١) هەندێك ووتویانە: دەبڕێ لەسەر تەئویلی ئەو هاوەڵەدا چ دیاربێ وە چ دیـﺎر نەبێ، چونکە ئەو هاوەڵە نایبڕێ بەسەر ئەو مانایەدا ئەگەر بەڵگەیێك نەبێ، ئێمەش دەڵێین: ئەوەبۆ چون و گومانی خۆی وابووە، ئیتر بۆ یەکێکیتر نیە لەوەدا شوێنی کەوێ، هەندێکی تر ووتویانە: دەبڕێ بەسەر تەئویلی ئەو هاوەڵەدا ئەگەر ئەو مانایەی ئەو بۆی چووە لەبەر ئەوەبێ بێگومان ئەیزانێ کە پێغەمبەر ئەو مانایەی مەبەست بووە، ئەمەش لە ڕوی هێماو هۆێیکە کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، ئێمەش دەڵێین گومان و واپێ زانینی ئەو هاوەڵەیە، ئیتر بۆ کەسیتر نیە شوێنی کەوێ لەو بۆ چونەیدا، چونکە مجتهد بێ بەڵگە شوێنی مجتهد ناکەوێ، بەڵام ئەگەر بەڵگەی باس کرد ئەو کاتە کاری پێ ئەکرێ

(٢) ئەمەش بابەتێکە لەبارەی گەڕانەوەی فەرمودەدا شیت لێ قەبوڵ ناکرێ، چونکە ناتوانێ خۆی بپارێزی لە نوقسانی،ئیتر یەکسانە شێتیەتەکەی یەکپارچەو هەمیشەیی بێ، یاخود پچڕ پچڕ و جارجار بێ و لەسەردەمی بەخۆدا هاتنەوەوەکەیدا شوێنەواری هەر دیاربێ، هەر وەها کافریش ڕیوایەتی قەبوڵ ناکرێ، بابشزانرێ کە ئاین پەروەری دەکاو خۆی لەدرۆ دەپارێزێ، چونکە بڕواکردن بەقەباڵەی کافر لە هەندێ شتدا دەبێ. لەگەڵ ئەوەش بەرزی پلەی فەرمودە گێرانەوە نادرێ بەکافر

(٣) هەروەها لەمنداڵێ کە توانای جیاکردنەوەی شتەکانی هەبێ، لەقەوڵی اصح و ڕەوانتردا قەبوڵ ناکرێ، چونکە لەبەر ئەوەی کە دەزانێ مکلف نیە جا جارێك خۆی لەدرۆ ناپارێزێت، لەبەر ئەوە بڕوای پێ ناکرێ، هەندێك وتوویانە: لێ قەبوڵ دەکرێ. ئەگەر بێگومان کە خۆی بپارێزێ لە درۆ، دانەر ووشەی: ممیزی بۆ نەوت؟ چونکە

{فان تحمل} الصبي {فبلغ فادى} ماتحمله {قبل عند الجمهور} لانتفاء المحذور السابق وَ قِيلَ لا يقبل لان الصغر مظنه عدم الضبط والتحرز ويستمر المحفوظ اذ ذاكِ ولو تحمل الكافر فاسلم فادي قبل قال المصنّف في شرح المنهاج على الصحيح و كذا الفاسق يتحمل فيتوب فيؤدي يقبل[1] .

{ويقبل مبتدع} لا كفر ببدعته {يحرم الكذب} لامنه فيه مع باويله في الابتداع سواء دعا النّاس إليهِ ام لا وَ قِيلَ لا يقبل مطلقاً لا بتداعاً لمفسق له[2] {وثالثا} اي الاقوال {قال} الامام {مالك} يقبل {الا الداعية} اي الذي يدعو النّاس الى بدعته لانه لا يؤمن فيه ان يضع الحديث على وفقها اما من يَجوزُ الكذب فلا يقبل كفر ببدعته ام لا [3].

---

هەموو كەس دەزانىٚ دەبىٚ پاك و خراپ لەيەك جيا بكاتەوە، چونكە ئەوەی ئەو توانايە نەبىٚ ناتوانىٚ خۆی بپارێزىٚ لە نوقصانی، لەبەر ئەوە بىٚگومان ڕيوايەتی لىٚقەبولٚ ناكرىٚ، وەك شێت.

(١) بەلاٚم ئەگەر منداڵێك هەر بەمنداڵی فەرموودەيێكی وەرگت ئەمجا گەييە پلەی پياوەتی و ئەمجا ئەوەی وەری گرتووە گێڕايەوە، ئەوە بەلای هەموزانايانەوە قەبولٚ دەكرىٚ، چونكە ئەوەی لىٚ دەترسـاين و لە پێشەوە باس كرانەماوە، هەندێكی تروو‌تويانە: قەبولٚ ناكرىٚ، چونكە قوناغی منداڵی جىٚ گومانە كە چاك وەری نەگرتبىٚ و نەی پارست بىٚ و خۆی نەپاراست بىٚ لەگەڵ ئەوەش ئەوەی ئەو كاتە لەبەر كراوەهەر پارێز راو دەبىٚ، ئەگەر كافرێك هەواڵێكی هەڵگرت پاشان موسڵمان بوو ئەمجا گێڕايەوە، ئەوە قەبولٚ دەكرىٚ، دانەر لەكتێبی: شرح المنهاج،دا ووتويەتی لەسەر قەولی صەحيح وەردەگێڕىٚ، هەروەهايە فاسقێكيش ڕيوايەتی هەڵگری و پاشان تەوبەبكاو بگەڕێتەوە، ئەمجا بيگێڕێتەوە ئەوەش قەبولٚ دەكرىٚ.

(٢) كەسێك شتێك دابهێنىٚ و پىٚكافر نەبىٚ درۆی بەلاوە حەرام بىٚ ئەوە گێڕانەوەی فەرمودەی لىٚ قەبولٚ دەكرىٚ، چونكە ئەمينی كەردۆ ناكا، لەگەڵ ئەوەش دەبىٚ ئەو بۆ چونە تازەی دای هێناوە تەئويلی قەبولٚ بكا، ئيتر يەكسانە خەڵك بانگ بكا بۆ ئەو بيدعەيە ياخود نا، هەندێكی تروو تويانە: لىٚ قبەولٚ ناكرىٚ ئەمينی بىٚ لەدرۆی يانە، چونكە شتێكی تازەی وای داهێناوە فاسق كەريەتی. (٣) قەولی سىٚهەميان ئەوەيە پێشەوا مالك ووتويەتی:ئەهلیبيدعە گێڕانەوەی هەواڵيان لىٚقەب ولٚ دەكرىٚمەگەر كەسىٚبىٚ خەڵك بانگەوازبكا بۆبيدعەتەكەی چونكە لە بانگەوازەكەيدا ئەمين نابێت لەوەی بەناو فەرمودەێيك دابنىٚ بەگوێرەی بيدعەتەكەی بەلاٚم كەسىٚ درۆ بەڕەوا بزانىٚ ئەوە لىٚ قبولٚ ناكرىٚ، ئيتر بەهۆی بيدعەتەكەيەوە كافر بكرىٚ ياخود نە .

وكذا من يحرمه وكفر ببدعته كالمجسم عند الاكثر لعظم بدعته والامام الرَّازي واتباعه على قبوله الاّ من الكذب فيه[1] {و} يقبل {من ليس فقيها خلافاً للحنفية فيما يخالف القياس} لما تقدَّمَ مع جوابه[2] {و} يقبل {المتساهل في غير الحديث} باز يتحرز في الحديث عن النبيِّ ﷺ لأمن الخلل فيه بخلاف المتساهل فيه فيرد[3].

{وَ قِيلَ يرد} المتساهل {مطلقا} اي في الحديث او غيره لان التساهل في غير الحديث يجر الى التساهل فيه {و} يقبل {المكثر} من الراوية {وان ندرت مخالطته للمحدثين} اي والحال كذلك لكن {اذا امكن تحصيل ذلك القدر} الكثير الذي رواه من الحديث {في ذلك الزمان} الذي خالط فيه المحدثين فان لم يمكن فلا يقبل في شيء مم رواه لظهور كذبه في بعض لا تعلم عينه[4].

---

(١) هەروەها كەسێكیش درۆ بە حەرام بزانێ و بەهۆی بیدعەتەكەیەوە حوكمی كوفری بەسەردا بدرێ، وەك ئەوەی جیسم بۆ خوا بڕیار بدات، ئەمەش بەلای زۆر ترینی زانای: اصولەوە وایە، بۆیە وایان ووتوە چونكە بیدعەتەكەی زۆر گەورەیە. بەڵام پێشەوا ڕازیو شوێن كەوتوانی لەسەر ئەوەن كە قەبوڵ دەكرێ چونكە ئەمینی لەوەی درۆی تێدابكات.

(٢) ڕیوایەتی كەسێ شەرع زان و وردبین نەبێ قەبوڵ دەكرێ، ئەمە جیاوازە بۆ بۆ چونی زانایانی پێڕەوی ابو حەنیفە لە فەرمودەێكدا پێچەوانەی قیاس بێ، ئەم بابەتە لە پێشەوە ڕابور لەگەڵ وەڵامەكەیشیدا.

(٣) كەسێ كەوا شل گیرێبێ لە هەموشتێكدا لەفەرمودە دانەبێ، بەم شێوە لە فەرمودەێك لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت بكرێ خۆی بپارێزێ، ئەوە ڕیوایەتی قەبوڵ دەكرێ، چونكە ئەمینی لەو جۆرە شل گێریەیەدا، بەڵام كەسێ شل گێرێبێ لەفەرمودەدا ئەو ڕیوایەتی دەبرێتە دوواوەو قەبوڵ ناكرێ، هەندێك ووتویانە كەسێ شل گێر بێ چ لەفەرمودەدا بێ یاخود غەیری فەرمودە ڕیوایەتی دەبرێتەدواوە و قەبوڵ ناكرێ، چونكە كەسێ شل گێرێبێ لە غەیری فەرمودەدا ووردەووردە ڕای دەكێشێ بۆ شل گێری كردن لەفەرمودەیشدا.

(٤) كەسێ كە ڕیوایەتی زۆری هەبێ لێقەبوڵ دەكرێ، هەرچەند كەمیش تێكەڵی ئەهلی حەدیثی كردبێ، واتە باحاڵیشی وابوبێ، بەڵام كاتێ لێ قەبوڵ دەكرێ بگونجێ ئەو ئەندازە زۆرەی فەرمودەی كە ڕیوایەتی كردووە پەیدا بكرێ لەو ئەندازە كاتەی كە تێكەڵی زانایانی فەرمودەی تیادا كردووە، خۆ ئەگەر نەگونجێ ئەوەی كەڕیوایەتی كردووە هیچ شتێكی لێ قەبوڵ ناكرێ، چونكە دیارە لە هەندێكیدا درۆی كردووە بەڵام

{وشرط الراوي العداله وهي ملكه} اي هيئة راسخة في النفس {تمنع عن اقتراف لكبائر وصغائر الخسة كسرقة لقمة} وتطفيف تمرة {والرذائل المباحه} اي الجائزة كالبول في الطريق} الذي هو مكروه و الأكل في السوق لغير سوقي[1] والمعنى عن قتراف كل فرد من افراد ماذكر في اقتراف الفرد من ذلك تنبفي العدالة اما صغائر غير خسة ككذبة لا يتعلق بها ضرورو نظرة الى اجنبية فلا يشترط المنع عن اقتراف كل فرده منها فباقتراف الفرد منها لا تنتفي العدالة[2].

وفي نسخة قبل الرذائل وهوي النفس اي اتباعه وهو مأخوذ من والد المصنّف فقال :بد منه فان المتقي للكبائر وصغائر الحسة مع الرذائل المباحة قد يتبع هواه عند جوده لشيء منها فيرتكبه ولا عدالة لمن هو بهذه الصفة وهذا صحيح في نفسه غير محتاج إليهِ مع ماذكره المصنّف لان من عنده ملكةٌ تمنعه عن اقتراف ماذكر ينتفي عنه تباع الهوى لشيء منه و إلاّ لوقع في المهوى فلا يكون عنده ملكةٌ تمنع منه[3].

---

خۆدیئەوهەندەیە نازانرێ لەبەرئەوە کەنازانرێ کامەیانە هیچ کامیانیلێقەبوڵ ناکرێ.

(١) مەرجی ڕیوایەتکەر ئەمەیە دەبێ عادل بێ، عەدالەتیش بریتیە لە شێوە هێزێکی چەسپاو لەدەرونی مرۆڤدا نەیەڵێ، گوناهی گەورە بکات و گوناهە بچوکەکانیش کەنیشانەی ڕسوایی و پیسکەیی نەیەڵی ئەنجام بدرێن، وەك دزینی تیکە نانێك و ـزینەوەی دنکە خورمایێك لە کێشانەو پێوانەدا، وەك ئەو ڕەوشتە نزمانەی کە کردنیان دروستە، وەك مێزکردن لە ڕێگەدا کە کەراهەتیهەیە، یاخواردن لەبازاڕ دا بۆ کەسێ کارو باری بازاڕ کاری نەبێ.

(٢) مەبەست ئەوەیە هەموو فەردێ لەو سیانە نەکا، نەك هەمویان نەکا، کەوابو بەکردنی یەکێك لەو سیانە عەدالەت نامێنێ، بەڵام ئەو گوناهە بچوکانەی کەنیشانەی ڕسوایی نین وەك تاکە درۆیێك زیان بەخش نەبێ، یایەکجار تێ ڕووانین لە ئافرەتێکی بێگانە، ئەوە بەمەرج نەگێراوە قەدەغە کردنی لەکردنی هەمویەکێ لەوانە، خۆ ئەگەر یەکێ لەوانەی کرد ئەوە عەدالەت نەفی ناکات.

(٣) لەدەست نوسێکیشدا پێش ووشەی: (الرذائل)ەوە نوسراوە: (وهوى النفس) واتە نەیەڵێ شوێنی بەرەو خوار بوونەوەی نەفس کەوێ، ئەوەش لەباوکی دانەر وەرگیراوە بۆیە ووتوویەتی: پێویستە ئەوەی هەبێ، چونکە کەسێ خۆی لەگوناهی گەورە و گوناهی بچوکی ڕسواکەر بپارێزێ لەگەڵ ئەو ڕەوشتە نزمانەی کە حەڵاڵن، جاری وا هەیە شوێن ئارەزووی خۆی دەکەوێ لەکاتی ئارەزوو بوونی لە شتێك لەوانەی وتمان نابێ هەبێ، کەسێ ئەم صیفەتەی هەبێ عەدالەتی نیە، ئەم قسەیە

وتفرع على شرط العدالة ماذكره بقوله {فلا يقبل المجهول باطنا وهو المستور لانتفاء تحقق الشرط {خلافاً لابي حنيفة وابن فورك وسليم} اي الرَّازي في قوله بقبوله اكتفاء بظن حصول الشرط فإنَّهُ يظن من عدالته في الظاهر عدالته في الباطن[١].

{وقال امام الحرمين يوقف} عن القبول والرد الى أن يظهرحاله بالبحث عنه قال {ويجب الانكفاف} عما ثبت حله بالاصل {اذا روى} هو {التحريم} فيه {الى الظهور} الحاله إحتياطاًواعترض ذلك المصنف مع قول الابياري بالموحدة ثُمَّ التحتانية في شرح البرهان انه مجمع عليه بأن اليقين لايرفع بالشك يعني فالحل الثابت بالاصل لايرفع بالتحريم المشكوك فيه كما لا يرفع اليقين اي استصحابه بالشك بجامع الثبوت[٢].

---

لەخودی خۆیدا ڕاستە، بەڵام پێویست ناکات لەووتنی، لەگەڵ ئەوەی کە دانەر ووتویەتی، چونکە کەسێ مەلەکەی هەبێ نایەڵێ ئەوانەی ووتران بیان کات، نەفی شوێنکەوتنی ئارەزوواتیشی لێ دەکات بۆ هەر شتێك لەوانە، ئەگەر وانەبێ ئەکەوێتە داوی هەواو ئارەزووەوە، دەی کەوابێ مەلەکەی نیە کە ڕێ لێ بگرێ.

(١) لەسەر بەمەرج گرتنی عەدالەت بۆ ڕیوایەت کەر ئەوەی کە دانەر باسی دەکا دروست بوو، کە دەڵێ: کەوابوو کەسێ ناوەڕۆکی نازانرێ و نەناسرێ ڕیوایەتی وەرگرتن قەبوڵ ناکرێ ئەویش بریتیە لەکەسێ عەداڵەتەکەی شارابێتەوەو داپۆشراو بێت بۆیە قەبوڵ ناکرێ، چونکە مەرجەکە بێگومان نەهاتووەتە دی، ئەمەش پێچەوانەی ئەبوحەنیفەو ابی فورك و سەلمێن ڕازیەکە دەڵێن: قەبوڵ دەکرێ، لەبەر ئەوەی ئەوان دەڵێن: هەر گومان هەبێ کەمەرج کە پەیدا بووە ئیتر بەسە، چونکە مادام وا دیارە لەکارو کردەوەیدا عادڵە گومانی ئەوەش دەبرێ ناوەڕۆکیشی هەر عادڵ بێ و لەو کارانەش خەڵك نایانبینێ هەر عادڵە .

(٢) امام الحرمين وتوویەتی: دەوەستێنرێ نە قەبوڵ دەکرێ وە نە دەبرێتە دواوە هەتا ئەو کاتەی حاڵی ناوەوەشی دەر دەکەوێ بەهۆی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی کاریەوە وە وتوویەتی: پێویستە واز هێنان و دەست هەڵگرتن لەو شتەی کە حەڵاڵیەکەی بەهۆی قاعدەی: ئەصل لەهەموو شتێکدا حەڵاڵە، سابت بوبێ، ئەمەش کاتێ ئەو ڕیوایەتکەرەی ناوەوەی نازانرێ ڕیوایەتی فەرموودەیێك بکات و حەڵاڵ حەرام بکات، ئەبێ وازی لێ بهێنرێ هەتا حاڵی ئەو ڕاویە دەردەکەوێ، هۆی ئەمەش تەنها ئیحتیات کردنە، دانەر ئەو ڕەخنەی لە امام الحرمين گرت (لەگەڵ ئەویش ڕەخنەی لە الأیباری گرتووە لە کتێبی: (شرح البرهان) دا کە: وازهێنان لەو حەڵاڵە شتێکە ڕای هەموولایێکی لەسەرە، ڕەخنەکە ئەمەیە کە: یەقین وەلا ناخرێ لەبەر

**{اما المجهول ظاهرا وباطنا فمردود اجماعا} لانتفاء تحقق العدالة وظنها[1] {وكذا مجهول العين} كأن يقال فيه عن رجل مردودا جماعا لا نظمام جهالة العين الى جهالة الحال وانما افرده عما قبله ليبني عليه قوله {فان وصفه نحو الشافعي} من ائمة الحديث الراوي عنه {بالثقة} كقول الشافعي كثيرا اخبرني الثقة وكذلك مالك قليلا {فلوجه قبوله وعليه امام الحرمين لان واصفه من ائمة لاحديث لا يصفه بالثقة إلاّ وهو كذلك[2] {خلافاً للصيرفي و والخطيب} البغدادي في قولهما لا يقبل لجواز ان يكون فيه جارح لم يطلع عليه الواصف [3].**

---

گومان، مەبەست ئەوەیە: کەوابو حەڵاڵ بوونی شتێك کەسابت بووبیچ بەهۆی قاعدەی: ئەصڵە لەهەموو شتێکدا حەڵاڵە، وەلا ناخرێ و حەرام ناکرێ بەهۆی ریوایەتی یەکێکەوە کە جێی گومانە، وەك چۆن یەقینێ بە (إستصحاب) پەیدا بوبێ وەلا ناخرێ بە هۆی گومانەوە، عیەلت و کۆکەرەوەی نێوان حەڵاڵ و یەقین و ئەو قیاسەی لێ دروست بوو بریتیە لە سبوت، کە سبوتی حەڵاڵ و یەقینەکەیە.

(١) بەڵام کەسێ دەرو ناوی نەزانرێ واتە ناسراو نەبێ، ئەوە بەڕای هەمووان ریوایەتەکەی وەرناگیرێ، چونکە عەدالەتی بێگومان و عەداڵی بە گومانی هیچکامیان تێدا نیە.

(٢) هەروەکو ئەوە وایە ریوایەتی کەسێ کە زاتەکەی نەناسراوبێ، وەك ئەوەی بووترێ: ئەمە ریوایەت کراوە لەپیاوێکەوە، ئەم ریوایەتە قەبوڵ نیە و دەدرێتە دوواوە بەڕای هەموان، چونکە کە حاڵی نەزانرێ ریوایەتی قەبوڵ ناکرێ خودی زاتەکەش نەزانرێ و بچێتە پاڵ حاڵەکەی باشتر قەبوڵ نیە، بۆیە زاتەکەی لەحاڵەکەی جیا کردەوە بۆ ئەوەی قسەی داهاتووی لەسەر دروست بکات، کە ئەڵێ: ئەگەر ئەو کەسەی زاتەکەی نەناسراوە کەسێکی وەك شافعی کە یەکێکە لە پێشەوایانی فەرموودە ریوایەتی لێوە بکاو وەصفداری بکا بە ثقە، وەك شافعی زۆر جار دەڵێ: کەسێ کە ثقەی پێ بکرێ پێ ڕاگەیاندم، ماڵێکیش کەمجارێك هەر وا دەڵێ. جا ئەو ریوایەتە قسەی بەجێ ئەوەیە کە قەبوڵ دەکرێ، إمام الحرمینیش لەسەر قەبوڵ بونیەتی، چونکە ئەوەی وەصفداری کردووە یەکێکە لە پێشەوایانی فەرموودە، ئەگەر جێ ثقە نەبێ وەصفداری ناکات بەثیقەدار.

(٣) قەولی صەیرەفی و بەغدادی جیاوازە بۆ ئەمەیە کە دەڵێن: با شافعیش بڕوای پێ بکات هەر قەبوڵ ناکرێ، چونکە دەشێ شتێکی تێدا هەبێ بریندار بکا ئیتر بۆ رێگەی ریوایەت نەشێ، کەمەدحکەرەکەی بەو شتە نەزانێ.

وأُجيبَ ببعد ذلك مع كون الواصف مثل الشافعي او مالك محتدا به على حكم في دين الله تعالى[1] {وان قال} نحو الشافعي في وصفه {لا اتهمه} كقول الشافعي اخبرني من لااتهمه {فكذلك} يقبل وخالف فيه الصَّيرفي وغيره لمثل ماتقدم فيكون هذا اللفظ توثيقا {وقال الذهب ليس توثيقا} وانما هو نفي للاتهام و أُجيبَ بأن ذلك اذا وقع من مثل الشافعي محتجابه على حكم في دين الله تعالى كان المراد به مايراد بالوصف بالثقة وان كان دونه في الرتبة[2] .

{ويقبل من اقدم جاهلا على} فعل {مفسق مظنون} كشرب النبيذ {او مقطوع} كشرب الخمر {في الأصَحّ} سواء اعتقد الاباحة ام لم يعتقد شيئا لعذره بالجهل وَ قِيلَ : يقبل لا رتكاب المفسق واناتقد الاباحة وَ قِيلَ يقبل في المظنون دون المقطوع اما المقدم على المفسق عالما بحرمته فلا يقبل قطعا[3].

---

(١) وەلاّم دراوەتەوە: کە شتی وا هەر زۆر دوورە لەگەڵ ئەوەش مەدحکەرەکەی بە یەکێکی وەك شافیعیشی بێ یاخود وەك مالیك بێ بیکاتە بەڵگە لەسەر حوکمێك لەئاییني خوادا.

(٢) ئەگەر یەکێکی وەك شافعی لەوەصفیدا ووتی: بەدگمان نیم لێ، وەك شافعی جار جارێ ئەفەرمووێ: پێ ڕاگەیاندم کەسێك کە بەدگومان نیم لێ، ئەمەش وەك ئەو هەر قەبوڵ دەکرێ، هەرچەندە صەیرەفی و غەیری ئەویش لەبەر هۆکەی پێشوو جیاوازیان کردووە، کەوابوو ئەم لەفزەش وەك پێشو خەڵك وا بکا کە بڕوای پێ بکەن و نیسبەتی ثقەو بڕوادانە بۆلای، بەلاّم الذهبی ووتویەتی: ئەم لەفزە وای لێ ناکات بیکاتە جێ بڕوای خەڵك، بەڵکو تەنها نەفی ئەوەی لێ دەکا گوناه نەدانە پاڵیەتی، وەلاّم دراوەتەوە کە: ئەو لەفزە کاتێ لەدەمی پیاوێکی وەك شافیعیەوە هاتە دەر، بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگە لەسەر حوکمێك لەدینی خوادا ئەوە بێگومان مەبەستی بەو لەفزەیە هەر ئەو مەبەستەیە کە کەسێ وەصفدار بکات بە لەفزی ثقە و بڕوا بوون و جێ متمانە. هەرچەندە ئەم لەفزە لە پلەدا لەخوار پلەی ثقەو متمانەوەیە.

(٣) کەسێ بەنەزانی لەسەر کارێك بڕواکە مرۆڤ فاسق بکات و بەلاّم جێ گومان بێ وەك خواردنەوەی مەی، یاخود بێگومان مرۆڤ فاسق بکات وەك خواردنەوەی عەرەق بەلای قەولی ئەصەحو ڕاست و دروست ترەوە ڕیوایەتی ئەوە قەبوڵ ناکرێ، چون یەکە بڕوای وابێ حەلاّڵە یا خود هیچ بڕواییکی نەبێ، چونکە نەزانینەکەی دەبێتە عوزرو بەهانە بۆی، هەندێك ووتوویانە قەبوڵ ناکرێ چونکە ڕەفتارێکی کردووە کە مرۆڤ فاسق ئەکات، هەرچەند وابزانی حەلاّڵیشە، هەندێکی تر ووتوویانە کارێك مرۆڤ فاسق

{وقد اضطرب في الكبيرة فقيل} هي {ماتوعد عليه بخصوصه} في الكتاب اوالسُنَة {وَ قِيلَ } هي {مافيه حد} قال الرافعي وهم الي ترجيح هذا أميل والاول مايوجد لأكثرهم وهو الأوفق لماذكروه عند تفصيل الكبائر(١).

{و} قال {الاستاذ} ابو اسحق الأسفراييني {والشيخ الامام} والذا لمصنف هي {كل ذنب ونفيا الصغائر} نظرا الى عظمة من عصي به عز وجل وشدة عقابه وعلى هذا يقال في تعريف العدالة بدل الكبائر وصغائر الخسَة اكبر الكبائر وكبائر الخسَة لان بعض الذنوب لا يقدح في العدالة اتفاقاً(٢) {والمختار وفاقا لامام الحرمين} انها {كل جريمة تؤذن بقلة اكتراث مرتكبها بالدين و رقة الديانة هذا بظاهره يتناول صغيرة الخسَة }(٣).

---

بكات بشزانیٚ كە حەرامە ئەوە بێگومان لیٚ قەبولٚ ناكریٚ.

(١) بێگومان لەبارەی پێناسەی گوناهی گەورەوە شپرزییێك هەیە، بۆیە هەندێك وتوویانە بریتیە لەو گوناهەی: هەڕەشەی لەسەر كراوە بەتایبەتی لەقورئان و فەرموودەدا، هەندێكی تر وتوویانە ئەوەیە كە تۆڵەی بۆ دیاری كراوە، رافعی وتوویەتی: زانایانی فیقە بۆ تەرجیح دانی ئەمەیان زیاتر مەیلیان هەیە، بەلاٌم پێناسەی یەكەم لای زۆربەیان هەیە و دەست ئەكەویٚ، هەر یەكەمیش هەماهەنگ ترە بۆ ئەو شێوە باسەی ئوصولیەكان كردوویانە لەكاتی درێژەدان و ژمارەی گوناهی گەورەدا، چونكە گوناهی وایان باس كردووە كە لەقوئاندا تۆڵەی بۆ دیاری نەكراوە.

(٢) ئەسفەراییني و باوكی دانەر وتوویانە: هەموو گوهانێك گوناهی گەورەیە، هەر دووكیان وتوویانە گوناهی بچوك نیە، چونكە سەیرو سەرنجی گەورەیی ئەو كەسەیان كردووە كە بیٚ فەرمانی ئەو بەو گوناهە كراوەو بۆ توندی تۆڵەیان ڕوانیوە، لەسەر ئەم قەولەیە ووتراوە: لەباتی ئەوەی پێناسەی عەدالەت بكریٚ بە نەكردنیگوناهی گەورەو نەكردنی گوناهی بچوكە ڕسواكەرەكان، ئەبیٚ بووتریٚ: نەكردنی گەورەترین گوناهە گەورەكان و گوناهە گەورە ڕسواكەران، چونكە هەندیٚ گوناهـ هەن بەڕای هەموان زیان بەعەدالەتی موسوڵمان ناگەیێنن.

(٣) قەولی هەڵبژاردە كە إمام الحرمين هەماهەنگی ئەكا ئەوەیە كە: هەموو گوناهێك كە كردنەكەی نیشانەو جاردانبیٚ بۆ بەكەم گرنگی دانی بكەرەكەیەتی بەئایینی خواو باریكیئایین پەروەردەیەتی، ئەم پێناسەیە ڕەواڵەتی وا دەردەكەویٚ كە گوناهی بچوكی ڕسواكەریش دەگرێتەوە .

والامام انما ضبط به مايبطل العدالة من المعاصي الشامل لتلك لا الكبيرة فقط كما نقله المصنِّف استرواحاً نعم هو اشم من التعريفين الأولين[1].

ولما كان ظاهر كل من التعاريف انه تعريف للكبيرة مع وجود الايمان بدأ المصنِّف في تعديد ها بما يلي الكفر الذي هو اعظم الذنوب فقال {كالقتل} اي عمداً كان اوشبه عمد بخلاف الخطأ كما صرح به شريح الروياني[2] {والزنا} بالزاي روي الشيخان عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رجل: يارسول الله اي الذنب اكبر عند الله؟ قال: أن تدعو لله ندا وهو خلقك. قال: ثُمَّ اي؟ قال: ان تقتل ولدك مخافة ان يطعم معك. قال: ثُمَّ اي؟ قال: ان تزاني حليلة جارك. فأنزل الله عزوجل تصديقها ﴿ والذين لا يدعون مع الله إلها آخر ولايقتلون النفس التي حرم الله إلاّ بالحق ولا يزنون ﴾ الآية[3].

---

(١) إمام الحرمين بەو پێناسەیە هەموو گوناهێك عەدالەت پوچەڵ بكاتەوە كۆی كردووەتەوە، كە گوناهە بچوكە ڕسواكەرەكانیش دەگرێتەوە، نەك تەنها گوناهی گەورەیە، وەك دانەر ئەو پێناسەیە نەقڵ كردووە لەكاتی پشوودانیدا بووبێ، بێ‌ئەوەی بیری خۆی بگوشێ بۆ ئەوەی بەووردی نەقڵی بكات، بەڵێ: ئەو پێناسەیە لەهەردوو پێناسە یەكەمینەكەدا گرندەترە.

(٢) ئەی بۆ گەورەترین گوناه باس نەكراوەكە كافر بوونە؟ كاتێ كە ئەوەی دیارە لەهەموو پێناسەكانەوە كە ئەوە پێناسەی گوناهی گەورەیە بەڵام لەگەڵ بوونی بڕوادا. بۆیە دانەر كەدەستی كرد بەژماردنیان یەكسەر ئەو گوناهەی باس كرد كە پلەی دێت بەشوێنی كافربوندا و كە گەورەترین گوناهە، بۆیە ووتی: وەك مرۆڤ كوشتن، واتە چ كوشتنەكە بەعەمدی بێ یاخود بەشبهە عەمد بێ، بەڵام ئەگەر بەبێ نیاز ئەو كوشتنە بكرێ ئەوە حوكمەكەی جیاوازە، وەك شورەحی ڕەویانی بەڕوونی دەری‌بڕیوە .

(٣)یەكێكی‌تریان زیناكردنە بوخاری‌وموسلم لە(عبدالله)ی‌كوڕی عومەرە ڕیوایەتیان كردووە، وتوویەتی: پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا چ گوناهێك گەورەترە بەلای خواوە؟ فەرمووی: ئەوەیە بانگەوازبكەی كەخوا هاوەڵی هەیە، كەچی هەر خوایش دروستی كردویت، ئەمجار ووتی پاش ئەوە چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە منداڵەكەت كام بكوژی لەترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات، ئەمجا ووتی: پاش ئەوچیە؟ فەرموی: ئەوەیە زینا لەگەڵ ژنی‌دەرهاوسێكەست بكەیت، یەكسەر خوا بۆ بەڕاست زانینی‌ئەو سێ گوناهە ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە فەرموی: ئەوانەش كە بانگەشە ناكەن بۆ خوانێكی‌تر لەگەڵ خوا داهەبێ، وەكە سێك ناكوژن كە خوا كوشتنی حەرام كردووە مەگر بەهۆی ئەو حەقە نەبێ كە خواسەلماندویەتی، وە زیناش ناكەن.

{واللواط} لانه مضيع لماء النسل كالزنا وقد اهلك الله قوم لوط وهم اول من فعله بسببه كما قصّه الله في كتابه العزيز[1]

{وشرب الخمر} وان لم تسكر لقلتها وهي المشتدة من ماء العنب [2]{ومطلق المسكر} الصادق بالخمر وبغيرها كالمشتد من نقيع الزبيب المسى بالنبيذ قال ﷺ ان على الله عهدا لمن يشرك المسكر ان يسقيه من طينة الخبال قالوا يارسول الله وماطينة الخبال قال عرق أهل النار رواه مسلم . اما شرب مالا يسكر لقلته من غير الخمر فصغيرة[3].

{والسرقة والغصب} قال تعالى: ﴿ والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما ﴾ وقال ﷺ من اقتطع شبرا من ارض ظلما طوقه الله اياه يوم القيامة من سبع أرضين رواه الشيخان ولفظه لمسلم [4] .

---

(١) یەكێكی‌تر گوناهی هەتیوبازیە، چونكە ئەویش ئەو ئاوەی دەبێتە هۆی وەچەو ڕەچەڵەك پاراستن بە فێرۆ دەریەتی، لەگەڵ ئەوەش خوای گەورە گەلەكەی لوطی لەناو برد بەهۆی ئەو گوناهەوە، ئەوانیش یەكەم كەسبون ئەو گوناهەیان كردووە وەك خوای گەورە لەنامە پیرۆزو نایابەكەی خۆیدا گێڕاویەتەوە.

(٢) یـەكێكی‌تر گونـاهی خواردنـەوەی عەرەقـە بـا لەبـەر ئـەوەی كـە كەمیشـە سەرخۆشكەر نەبێ، عەرەقیش بریتیە لە شلەیێكی توندوتیژ لەئاوی خورما دروست و ساز كرابێ.

(٣) هەموو سەر خۆش كەرێك ئیتر عەرەق بی یا غەیری عەرەق بێ وەك تو نوتیژیك كە لەئاوی مێوژ دروست كرابێ ناو دەبرێ بە نەبیذ، پێغەمبەر فەرمویەتی: بێگومان خواپەیمانێكی لەسەر خۆی واجب كردووە بەرانبەر ئەو كەسەی شتی سەرخۆش كەر بخواتەوە كە لە(طینة الخیال) دەرخوارد بدات، ووتیان ئەی پێغەمبەر خوا طینة الجنال چیە؟ فەرموی: عەرەقی دۆزخیەكانە، موسلم ڕیوایەتی كردووە، بەلام شتێ كەعەرەق نەبێ لەبەر كەمیەتی مرۆڤ سەرخۆش نەكا ئەوە گوناهی بچوكە.

(٤) دووانی‌تر لەگوناهی گەورە دزی و داگیركردنە، خوای گەورە ئەفەرموێ: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستی هەردوو كیان ببڕنەوە، پێغەمبەر فەرمویەتی: كەسێ بستێ زەوی بەستەم دابڕێ بۆ خۆی، ئەوە لە ڕۆژی زیندوبونەوەدا تاحەوت تەبەقەی زەوی هەڵدەكۆلرێ وەك میلوانكە ئەكرێتە ملی. بوخاری‌و موسلم ڕیوایەتیان كردووە، ئەو لەفزەهی موسلمە .

وقيد جماعة الغصب بما تبلغ قيمته ربع مثقال كما يقطع به في السرقة أما سرقة الشيء القليل فصغيرة قال الحلمي إلاّ ذا كان المسروق منه مسكينا لا غني به عن ذلك فيكون كبيرة[1] . {والقذف} قال الله تعالى:﴿ ان الذين يرمون المحصنات ﴾ الآية نعم قال الحليمي قذف الصغيرة والملوكة والحرة المتهتكة من الصغائر لان الايذاء في قذفهن دونه في الحرة الكبيرة المتسترة [2] وقال ابن عبد السلام قذف المحصن في خلوة بحيث لا يسمعه إلاّ الله والحفظة ليس بكبيرة موجبة للحد لانتفاء المفسدة اما قذف الرجل زوجته اذا أتت بولد يعلم انه ليس منه فماح وكذا جرح الراوي والشاهد بالزنا اذا علم بل هو واجب[3] . {والنميمة} وهي نقل كلام بعض النّاس الى بعض على وجه الافساد بينهم[4] .

---

(١) کۆمەڵێك لەزانایان داگیر کردنی یان بەستووە بە ئەندازەیەکەوە کە باهاکەی چارەکە میسقاڵێك بێ، وەك هەر بەو ئەندازەیە بۆ دزیش جادەستی دەبڕرێ، بەڵام دزینی شتێکی کەم ئەوە گوناهی بچوکە، حولێمی ووتویەتی: مەگەر کاتێ نەبێ ئەوەی دزی لێ کراوە هەژاربێ و بەوشتە کەمەش پەکی بکەوێ ئەو کاتە دەبێتە گوناهی گەورە.

(٢) یەکێکی‌تر گوناهی بوهتان و درۆ هەڵبەستنی داوێن پیسی، خوای گەورە دەفەرمێ: بێگومان ئەوانەی درۆی بێ رەوشتی بۆ ئافرەتە پاك و مێردارەکان هەڵدەبەستن...، بەڵێ حولیمن ووتویەتی: درۆی بێڕەوشتی هەڵبستن بۆ کچێکی مندالێ یا کەنیزکێك یائافرەتێکی ئازادی واقسەی وەها قەبوڵ بکا، ئەوە لەجۆری گوناهە بچوکەکانن، چونکە ئەزیەتدانی ئەوانە کەمترە لە ئەزیەتی ئافرەتێکی ئازادی گەورەی لەخوا ترسی داپۆشراو.

(٣) ابن عبدالسلام ووتویەتی: بوهتان کردن بۆ ئافرەتێکی پاك لە شوێنێکدا بێ جگە لەخواو ئەو فریشیتانە کەتیماری گوفتار دەکەن کەسی‌تر نەی بیسێ ئەوە گوناهی گەورە نیەو داخوازی ئەو تۆڵە دیاری کراوەش نیە، چونکە ئەزیەتی کەس تێدا نیە، بەڵام پیاو بوهتان بۆ ژنەکەی بکات، کاتێ ئەوژنە مندالی دابنێ و ئەمیش بێگومان دەزانێ کە لە خۆی نیە ئەو حەلاڵە. هەروەهایە بریندار کردنی ئەوەی ریوایەتکەرەو شاهیدو گەواهیدەرە بەزیناکردن، ئەمیش حەلاڵە کاتێ بێ‌گومان بزانێ وایە، نەك هەر ئەوەش بەڵکو واجبە بیڵێ.

(٤) یەکێکی‌تر گوناهی نەمیمەیە کە بریتیە لە گواستنەوەی گفتۆگۆی هەندێ خەڵك بۆ هەندێکی تر بۆ ئەوەی نێوانیان گەندەڵ و خراپ بکات .

**قال ﷺ لا يدخل الجنة نمام رواه الشيخان وروينا ايضا انه ﷺ مر بقبرين فقال انهما اليعذبان وما يعذبان في كبير يعني عند النّاس زاد البخاري في رواية بلى انه كبير يعني عند الله اما أحدهما فكان يمشي بالنميمة واما الآخر فكان لا يستبر من بوله أما نقل الكلام نصيحة للمنقول إليه فواجب كما قوله تعالى حكاية يا موسى ان املا يأتمرون بك ليقتلوك[١] ولم يذكر المصنّف الغيبة وهي ذكر الشخص أخاه بما يكره وان كان فيه والعادة قرنها بالنميمة لان صاحب العدة قال انها صغيرة وأقره الرافعي ومن تبعه لعموم البلوي بها فقل من يسلم منها[٢] نعم قال القرطبي في تفسيره انها كبيرة بلاخلاف ويشملها تعريف الاكثر الكبيرة بما توعد عليه بخصوصه[٣].**

---

**(١) پێغەمبەر فەرموی ﷺ ناچێتە بەهشت ئەوەی قەسەی خەڵك بێ‌نێ و بیابە نیازی تێکدانیان، بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە، هەروەها هەم ڕوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بەلای دوگۆڕداتێپەڕی فەرموی: خاوەنی ئەو دو گۆڕانە ئازار دەدرێن، بەهۆی گوناهێکەوە ئازار دەدرێن بەلای خەڵکەوە گوناهی گەورە نین، مەبەست ئەوەیە بەلای خەڵکەوە وایە، بوخاری لە ڕیوایەتێکیتردا ئەمەی بۆ زیاد کردووە فەرموی: نەخێر باخەڵك وانەزانێ، بێگومان ئەوە گوناهی گەورەیە، واتە بەلای خواوە گەورەیە، گوناهەکەشی ئەمە بوو، یەکێکیان ئاموشەی خەڵکی دەکرد بۆ کرمێ کردنی دڵیان، ئەوی تریشیان لە کاتی میز کردنیداخۆی دانە ئە پۆشی، خەڵك عەورەتیان دەبینی، بەڵام هێنان و بردنی قسەی حەڵك لە بەر دڵسۆزی بۆیان ئەوەیان واجبە، وەك خوای گەورە ئەم سەرگوزەشتەیە دەگێرێتەوەو ئەفەرموی: ئەی موسا بەڕاستی کاربە دەستانی دەوروبەری فیرعەون کۆنگرە دەبەستن لەبارەی تۆوە بۆ ئەوەی بتکوژن.**

**(٢) دانەر لە مەتنەکەدا باسی غەیبەتی نەکرد، کەبرتیە لەوەی کەسێ براکەی خۆی باس بکا لەبارەی شتێکەوە کەپێ ناخۆشبێ، با ئەو شتەشی تێدابێ، دانەر باسی نەکرد عادەتیش وایە، لەباس کردندا هاوشانی نەمیمەیە، چونکە خاوەنی کتێبی: (العدة) ووتویەتی: غەیبەت گوناهی بچوکە، رافعی و ئەوەی شوێنی کەوتووە ددانیان بەو قسەیە دا ناوە، چونکە لەبەر ئەوەی بەلایێکە گشت کەسەی گرتووەتەوەکەم کەس هەیە لێ‌رزگاربێ -ئەگەر بووترێ گوناهی گەورەیە زۆر بەی‌ئومەتی‌پێغەمبەر ناعادلە-**

**(٣) بەڵێ، قورطوبی لە تەفسیرەکەیدا ووتویەتی: غەیبەت بێ جیاوازی گوناهی گەورەیە، پێناسەی زۆر بەی زانایان کەووتیان گوناهی گەورە ئەوەیە هەڕەشەی تایبەتی لێ کرابێ، غەیبەتیش دەگرێتەوە.**

قال ﷺ لما عرج بي مررت بقوم لهم أظفار من نخاص يخمشون وجوههم وصدورهم فقلت: من هؤلاء ياجبريل؟ قال: هؤلاء الذين يأكلون لحوم النّاس ويقعون في اعراضهم ورواه ابو داود وفي التنزيل:﴿ ولا يغتب بعضكم بعضا ايجب احدكم ان يأكل لحم اخيه ميتاً ﴾ وتباح الغيبة في مواضع مذكورة في محلها[1] .

{وشهادة الزور} لانه ﷺ عدها في حديث من الكبائر وفي آخر من اكب الكبائر رواهما الشيخان وهل يتقيد المشهود به بقدر نصاب السرقة تردد فيه ابن عبدالسلام وجزم القرّافي بالنفي بل قال ولولم تثبت الا فلسا[2] .{واليمن الفاجرة} قال ﷺ من حلف على مال امريء مسلم بغير حق لقي الله وهو عليه غضبان رواه الشيخان وقال من اقتطع حق امريء مسلم بيمينه فقد اوجب الله له النار وحرم عليه الجنة فقال له رجل وان كان شيئا يسيرا يارسول الله قال وان كان قضيبا من أراك رواه مسلم[3] .

(١) پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: کاتێ بەرزکرامەوە تێ پەڕم کرد بەلای کۆمەڵێک نینۆکی مسینیان هەبو، دەموچاو و سنگی خۆیانیان دەڕنی، بۆیە منش ووتم ئەی جوبریل ئەمانە کێن؟ ووتی: ئا ئەوانە ئەوانەن کە گۆشتی خەڵکیان دەخواردو دەکەوتنە ناو باسی ناموسی خەڵکەوە، ابو داود ڕیوایەتی کردووە، لەقورئانیشدا هاتووە: باهەندێکتان غەیبەتی هەندێکیترتان نەکەن، کەستان پێ خۆش نیە گۆشتی براکەی بەمردویی بخوا. غەیبەت لە چەند شوێنێکدا حەڵاڵ کراوەکە لەشوێن خۆیاندا باس کراون - .

(٢) یەکێکیتر لە گوناهی گەورە شاهیدی درۆیە یاشاهیدی و گەواهی بۆ درۆ. چونکە پێغەمبەر ﷺ، لەفەرمودەیێکدا لەبارەی گوناهە گەورەکانەوەبو ئەمیشی بەیەکێك لەوان ژمارد، لەفەرمودەیێکی تردا: بەگەورەترین گوناهی ناو گوناهە گەورەکان حیسابی کردووەن ئەم دوو فەرمودەیە بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردون، ئایا ئەوشتەی کە شاهیدی درۆی بۆ ئەدرێ دەبێ بەئەندازەی ئەوەبێ کەدیاری کراوە بۆ دزیەتی ئەمجابە گوناهی گەورەحیساب بکرێ؟ ابن عبدالسلام ڕاڕابووە لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا، بەڵام قەڕافی بێگومان ووتویەتی: ئەو ئەندازەیە ناوێ، نەك ئەوەش بەڵکو ووتویەتی: باجگە لەیەك فلسیش ثبات نەکا هەر بەگوناهی گەورە حیساب دەکرێ.

(٣) یەکێکیتر سوێنی درۆیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ سوێنی ناحەق بخوا لەسەر ماڵی مەردێکیموسوڵمان ئەوە کاتێ بەخوا دەگاکە زۆر لەسەری توڕەیە. بوخاری موسلم ڕوایەتیان کردووە، هەم فەرمویەتی ﷺ:هەر کەس بەهۆی سوێنی

{وقطيعة الرحم} قال ﷺ لا يدخل الجنة قاطع رحم رواهُ الشيخان قال سفيان بن عيينة في رواية يعني قاطع رحمٍ والقطيعة فعلية من القطع ضد الوصل و لرحم القرابة[1].

{والعقوق} اي للوالدين لانه ﷺ عده في حديث من الكبائر وفي آخر من اكبر الكبائر رواهما الشيخان واما حديثهما الخالة بمنزله الام وحديث البخاري عم الرجل صنوا بيه فلا يدلان على انهما كالوالدين في العقوق[2]. {والفرار} من الزحف لانه ﷺ عده من لسبع الموبقات اي المهلكات رواه الشيخان نعم يجب اذا علم انه اذا ثبت يقتل من غير نكاية في العدو لانتفاء اعزاز الدين بثبوته[3].

---

ناحەقیە وە مافی مەردێکی موسڵمان دابڕی بۆ خۆی، ئەوەبێگومان خوا ئاگری بۆ واجب کردووەو بەهەشتی لەسەر حەرام کردووە، پیاوێك پێ ووت: ئەگەر شتێکی کەمیش بێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: باشولێکی هەڵپاچراوی داری ئەراکیش بێ، موسلم ڕیوایەتی کردووە.

(١) یەکێکیتر لەگوناهە گەورەکان پچراندنی خزمایەتیە، پێغەمبەر فەرمویەتی: ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی خزمایەتی دەپچڕێنێ، بوخاریو موسلم ڕیوایەتیان کردووە، سوفیانی کوڕی عویەینە ووتویەتی لە ڕیوایەتێکدا واتە: پچڕێنەری خزمایەتی.

(٢) یەکێکی تر لە گوناهە گەورەکان بێ فەرمانی باوك و دایکە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ، لەفەرمودەیێکدا بەیەکێك لە گوناهە گەورەکانی حسێبی کردووە، لە فەرمودەیێکی تردا بەیەکێك لەگەورەترین گوناهی ناو گوناهە گەورەکان ژماردویەتی، بوخاری و موسلم هەردوکیان ڕیوایەتیان کردووە، بەڵام ئەو فەرمودەی کە هەردوکیان ڕیوایەتی دەکەن و دەفەرموێ: خوشکی دایك لەجێ دایکە، و فەرمودەی: مامی پیاو لقی باوکیەتی، ئەو دوو فەرمودەیە ئەوە ناگەیێنن کە بێ فەرمانیان وەك بێ فەرمانی باو و دایك وایە.

(٣) یەکێکیتر هەڵاتنە لەبەرەی جەنگ لەکاتی هێرش دوژمندا، چونکە پێغەمبەر ﷺ، بەیەکێك لەو حەوت گوناهە لەناوبەرە حسێبی کردووە، بوخاری وموسلم ڕیواتیان کردووە، بەڵێ واجبە هەڵاتن کاتی کە بزانێ بێ گومان ئەگەر هەڵنەیێ دەکوژرێ بێ ئەوەی تۆ لەیێك لە دوژمن بسێنرێ، چونکە خۆڕاگری ئەو و کوژرانی دەبێتە هۆی نەمانی گەورەیی ئاین و شکاندنی ڕێزی موسڵمانان.

{ومال اليتيم} اي اكله مثلاً قال تعالى:﴿ ان الذين ياكلون اموال اليتامى ظلماً ﴾ الآية وقد عده ﷺ من السبع الموبقات في الحديث السابق وتردد ابن عبدالسلام في تقييد بنصاب السرقة[1] {وخيانه الكيل اوالوزن} في غير الشيء التافه قال الله تعالى ويل للمطففين الآية والكيل يشمل الذرع عرفا اما في التافه فصغيرة كما تقدم[2] .

{وتقديم الصلاه} على وقتها {وتاخيرها} عنه من غير عذر كالسفر قال ﷺ من جمع بين صلاتين من غير عذر فقد اتي بابا من ابواب الكبائر رواه الترمذي واولي بذلك تركها[3]. {والكذب على رسول الله ﷺ} قال ﷺ من ذكذب على متعمداً فليتبوا مقعده من النار رواه الشيخان اما الكذب على غيره فصغيرة[4].{وضرب المسلم} بلا حق قال ﷺ صنفان من امتي من اهل النار لم ارهما قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها النّاس ونساء كسيآت عاريات الخ رواه مسلم[5] .

---

(١) یەکێکی‌تریان خواردنی ماڵی هەتیوە یا لە ناو بردنیەتی، خوای گەورە فەرموی بێگومان ئەوانەی ماڵی هەتیوان دەخۆن لەڕوی ستەمەوە..، اکۆتایی ئایەتەکە پێغەمبەریش بێگومان بەیەکێك لەحەوت گوناهە لەناوبەرو ڕسواکەرەکان حسێبی کردووە، لەفەرمودەکەی پێشودا، ابن عبدالسلام ڕاڕابووە لەبارەی لکاندنی ئەندازەی دیاری کراو بۆ تۆڵەی دزیەتی ئەمجا خواردنی ماڵی هەتیو گوناهی گەورەبێ.

(٢) یەکێکی‌تر ناپاکی کردنە لەکێشانەو پێوانەدا نەك لەشتی کەم و هیچ و پوچدا. خوا دەفەرموێ: وەیل بۆ ئەوانەی تر زاوبازی دەکەن، کێشانە بە گوێرەی عورف باڵ پێویش دەگرێتەوە، بەلاَم لەشتی هیچ و پوچدا ئەوە گوناهی بچوکە، وەك لە پێشەوە ڕابورد. (٣) یەکێکی‌تریان پێشخستنی نوێژە بەسەر کاتەکەی خۆیدان یـ دواسختنیەتی لێ بێ ئەوەی بەهانەیێکی بێ وەك سەفەر پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی هەرکەسی دوو نوێژ کۆ بکاتەوە بێ ئەوەی بەهانەی هەبێ ئەمە بێگومان دەچێتە دەرگایێك لەدەرگاکانی گوناهە گەورەکان و دەیکاتەوە. تیرمزی ڕیوایەتی کردووە. بەلاَم وازهێنان لە نوێژ و نەکردنی لەوە خەتەرترە.

(٤) یەکێکی‌تریان درۆیە بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ،چونکە فەرمویەتی: هەرکەس بەهەوەستی خۆی درۆم بەدەمەوە بکا ئەوە باجێ فسنگی خۆی ئامادەبکا لە ئاگردا بوخاری وموسلم ڕیوایەتیان کردووە، بەلاَم درۆ بەدەم غەیری پێغەمبەرەوە ئەوە گوناهی بچوکە. (٥) یەکێکی‌تریان لێدانی موسڵمانە بەناحەق و بێ فەرمانی خوا. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: دوو دەستە هەن لە ئۆمەتی من دۆزەخین و تائێستە نەم بینیون: ١- کۆمەڵێکی گورزو قامچیان لە گەڵدایە وەك کلکی گاگەلێوان خەڵکیان

{وسبُ الصحابة} قال ﷺ لاتسبوا أصحابي فو الذي نفسي بيده لو ان احدكم انفق مثل احدذهبا ما ادرك مد احدهم ولا نصيفه رواه الشيخان[١] . وروى مسلم عن ابي سعيد الخدري انه كان بين خالد بن الوليد وعبد الرحمن بن عوف شيءً فسبه خالد فقال ﷺ: لا تسبوا احد من اصحابي فان أحدكم لو انفق الخ الخطاب للصحابة السابين نزلهم لسبهم الذي لا يليق بهم منزلة غيرهم حيثُ علل بماذكره وروى البخاري انه ﷺ قال: انه الله تعالى يقول من عادي لي وليا فقد آذنته بالحرب اي اعلمته بأني محارب له اي معاقب والصحابة من أوليائه تعالى وسبهم مشعر بمعاداتهم أماسب واحد من غير الصحابة فصغيرة وحديث الصحصحين سباب المسلم فسوق معناه تكرر السبب[٢] .

پێ فەلاقە ئەکەن. ٢- کۆمەڵە ژنێکن هەندێ لاشەیان داپۆشراوەو ئەویتری ڕوتە، بەجلێك لەبەر دەکەن ڕەنگی جوانی لاشەیان دەربخات، موسلم ڕیوایەتی کردووە.

(١) یەکێکیتریان درۆیە بەدەم پێغەمبەرو دژوێن دانە بەهاوەڵانی پێغەمبەر، چونکە فەرمویەتی: جوێن نەدەن بەهاوەڵاکانم، چونکە سوێن بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر گریمان یەکێك لە ئێوە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون خەرج بکا لەڕێ خوادا ناگاتە مشتێك لە خێری ئەوان و ناشگاتە نیوە مشتێکی ئەوان -(مودد) ناوە بۆ جۆرە پێوەرێکی کێشانە - بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە.،،،

(٢) موسلم ابو سەعیدی الخودریەوە ڕیوایەتی کردووە لەنێوان خالدی کوڕی وەلیدو عبدالرحمانی کوڕی عەوفدا شتێك هەبوو، لەبەر ئەوە خالد دژوێنی پێ دا، یەکسەر پێغەمبەریش فەرموی: دژوێن بەهیچ کەس لەهاوەڵانم نەدەن، چونکە ئەگەر گریمان یەکێ لە ئێوە بەئەندازەی کێوی ئوحود...، گوتارەکە ڕوبەڕوی ئەو هاوەڵانەیە کە دژوێنیان داوە،لەبەر ئەوەی کە دژوێندان شایستەی پلەی ئەوان نیە ئەوانەیان کە دژوێنیان داوە وەك غەیرە صەحابە گوفتو گۆیان لەگەڵ کراوە - یاپلەی عبدالرحمن لە پێشترە لەخالد- هۆیەکەی بەدریهێنایەوە کەباسی کرد. بوخاری ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەرﷺ ووتویەتی: خوا دەفەرموێ: هەرکەس لەبەرمن دوژمنایەتی دۆستێکم بکا ئەوەبی گومان جارنامەی جەنگم پێ گەیاندووە، من جەنگ لەگەڵ ئەو دەکەم، واتە سزای دەدەم، هەرچەندە باسەکەمان باسی هاوەڵانە، بەڵام دژوێن دان بەیەکێکیتر لە غەیری هاوەڵانی پێغەمبەر ئەوە گوناهی بچوکە، ئەو فەرمودەیەکی لەهەردوو صەحیەکە دا هاتووەو ئەفەرموێ: دژوێندانی زۆر لەلایەن موسڵمانەوە دەرچونێکی زۆرە لەگوێ ڕایەڵی خوا، مانای فەرمودەکە وایەکە: زۆر دوبارەکردنەوەکەی ئەیباتە ڕیزی گوناهی گەورەوە.

{وكتمان الشهادة} قال تعالى ومن يكتمها فإنَّهُ آثمٌ قلبه اي ممسوخ[1]. {والرشوة وهي ان يبذل ما لا ليحق باطلا او يبطل حقاً قال ﷺ لعنة الله على الراشي والمرتشي رواه ابن ماجه وغيره وزاد الترمذي في رواية في الحكم وحسنه والحاكم في رواية أيضـ والراش الذي يسعي بينهما وقال فيه بدون الزيادتين صحصح الاسناد وقال الترمذي فيه بدونهما حسن صحيح اما بذل مال للمتكلم في جائز مع السلطان مثلاً فجعالة جائزة[2]. {والدياثة} وهي استحسان الرجل على أهله وفي حديث ثلاثة لا يدخلو الجنة العاق والديه والديوث ورجلة النساء قال الذهبي اسناده صالح[3] . {والقيادة وهي استحسان الرجل على غير أهله وهي مقسة على الدياثة[4] .

---

(١) یەکێتریان شاردنەوەی گەواهی و شەهادەتە، خوای گەورە ئەفەرمێ هەرکەسێ شاهادەت بشارێتەوەو ئەوە بێگومان دڵی تاوابنارەو و مۆری ڕەشی پێوە نراوە لەسەر دیمەنی فیطرەت- گۆڕاوە بۆ ناشیرینترین دیمەن.

(٢) یەکێکی‌تر لەگوناهە گەورەکان بەرتیلە کە بریتیە لەوەی ماڵێك ببەخشێ بۆ ئەوەی بەتاڵێك بکا بە حەق یاحەقێك بکات بە بەتاڵ، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی نەفرینی خوا لەسەر ئەوەبێ بەرتیل ئەداو ئەوەش قەبوڵی دەکا. ابن ماجە و غەیری ئەویش ریوایەتیان کردووە. تیرمزی لەڕیوایەتێکی ترا ووشەی: (في الحكم)، تیادا زیا. کردووە، واتە: بەرتیلەکە لەبابەتی فەرمان ڕەواوەبێ، دوبارە لە ڕیوایەتێکی تردا حاکە ووشەی: (والريش)، ئەوەیەکە دبێتە دەڵاڵ لەنێوانیاندا هاتو چۆ دەکاو مامەڵەکەیا بۆ جێ بە جێ دەکا، حاکم ووتویەتی: بێ ئەو دوزیادەیە بەرزکردنەوەکە صەحیە. تیرمزیش فەرمویەتی: بێ ئەو دو زیادەیە فەرمودەێیکی حەسەن صەحیم، بەڵام ما بەخشین بۆ ئەوەی یەکێك لەگەڵ کاربەدەستێکی گەورەدا لەبارەی شتێکی حەڵاڵەوە قسەت بۆ بکا ئەوە دروستە چونکە ئەوە خەڵاتە نەك بەرتیل.

(٣) یەکێکی‌تریان گەوادیە ئەویش بریتیە لەوەی شتی ناشیرین بەسەر ژن و خیزانیدا بێ بەلایەوە جوان بێ دڵی پێخۆشبێ، لەفەرمودە دا هاتووە سێ‌کەس ناچنە بەهەشت: ١- ئەوەی بێ فەرمانی باوك و دایکی‌بکات. ٢- ئەوەی گەوادی قەبوڵ بکات. ٣-ئەو ئافرەتەی خۆی وەك پیاو لێ دەکا. زەهەبی ووتویەتی: اسنادی ئەم فەرمودەیە شیاوەو دەست ئەدا.

(٤) یەکێکی‌تریان دەڵاڵی بۆ بێناموسی، بریتیە لە وەی پیاو شتی ناشیرینی بەجوان نیشان بدا ئەگەر بەسەر خاوخێزانی خۆیدا نەبێ، ئەمەش قیاسی کراوە لەسەر گەوادی.

{والسعاية} وهي ان يذهب بشخص الى ظالم ليؤذيه بما يقوله في حقه وفي نهاية لغريب حدث الساعي مثلث اي مهلك بسعايته نفسه والمسعى به واليه(١) .

{ومنع الزكاة} قال ﷺ ما من صاحب ذهب ولا فضة لا يؤدي منها حقها إلاّ اذا كان يوم القيامة صفحت له صفائح من نار فأحمى عليها في نار جهنم نيكوى بها جنبه وجبينه وظهره الخ رواه الشيخان(٢) .

{ويأس الرحمة} قال تعالى انه لا ييأس من من روح الله إلاّ القوم الكافرون(٣) . {وامن لمكر} بالاسترسال في المعاصي والاتكال على العفو قال تعالى فلا يأمن مكر الله إلاّ لقوم الخاسرون(٤) . {والظهار} كقول الجرل لزوجته انت على كظهر امي قال الله تعالى فيه وانهم ليقولون منكرا من القول وزورا اي حيث شهوا الزوجة بالأم في التحريم(٥) .

---

(١) يەكێكی‌تريان ئەوەيە كەپيشەی جاسوسی بێ، بريتيە لەوەی كەسێ بەرێ بۆلای ستەمكارێك بۆ ئەوەی ئەزيەتی بدات بە هۆی ئەو قسانەوە ئەو لەباريەوە ـەيانكات، لەكتێبی: (نهاية القريب) دا ئەم فەرمودەيە هەيە كە ئەفەرمومێ: جاسوس سێ كەسە لەناو دەبا، واتە:١-خۆيەتی بەهۆی هەوڵ و تەقەلايەوە بۆ ئەزيەتی خەڵك ٢- ئەوەش جاسوسی لەسەركردووە، لەدونيادا ئەزيەتی‌دا. ٣-دەستەڵاتدارەكەيە بەهۆی ستەمەكەيەوە.

(٢) لە گوناهی‌گەورەكانە نەدانی زەكات، پێغەمبەرﷺ فەرمويەتی: هيچ خاوەن ئاڵتون و زيوێك نيە كە حەقی هەژارانی لێنەدات هەر دەبێ كاتی ڕۆژی زيندوبونەوە بەرپادەبێ چەند پارچە ئاگرێكی پانی بۆ سازدەدرێ، جائەو ئاڵتون و زيوەی كراوەتە پارچە پارچە لەناو ئاگری دۆزەخدا گەرم دەكرێن ئەمجا بەوانە تەنيشت و دەم چاوو پشتی پێ وروتو دەكرێ، بوخاری موسلم ڕيوايەتيان كردووە.

(٣) لەگوناهە گەورەكانە بێئومێد بون لە ميهرەبانی خوا، خوای گەورە فەرمويەتی: بێگومان هيوا بڕنابێ لەميهرەبانی خوا خەڵكانی بێ بڕوا نەبن. (٤) يەكێكی‌تريان ئەمين بونەوەيە لە سزای خوا، ئەوەش بەمە دەبێ خۆی بەرەڵا بكاتە ناو گوناهەكان و پشت ئەستوربێ بە لێبوردەيی خوا -بێ ئەوەی كاربكا بە ئەمای كرێيە-خوای‌گەورە فەرمويەتی:هيچ كەس ئەمين نابێ‌لەسزای خوا جگە گەلێكی لەناوچوو دۆڕاو نەبێ.

(٥) ظهاريش گوناهی گەورەيە، بەم شێوە پياوێك بەژنەكەی بڵێ تۆ لەسەرمن حەرامی وەك پشتی دايكم. خوای گەورە فەرمويەتی: بێگومان ئەوانەی ظهار دەكەن قسەيێكی نابەجێ و درۆ دەكەن، واتە چونكە ئەوانە ژنە كانيان شوبهاندووە بە دايكيانەوە لەحەرام كردنياندا نەك لە خۆشەويستيدا.

{ولحم الخنزير والميتة} اي تناوله لغير ضرورة قال تعالى: قل لا اجد فما أوحي الى محرما على طاعم يطعمه إلاّ ان يكون ميته اودما مسفوحا اولحم خنزير فإنَّهُ رجس.[1]

{وفطر رمضان} من غير عذر لان صومه من اركان الاسلام ففطره يؤذن بقلة اكتراث مرتكبه بالدين[2] . {والغلول} وهو الخيانة من الغنيمة كما قاله ابو عبيد قال تعالى ومن يغلل يات بما غل يوم القيامة[3] .{والمحاربة} وهي قطع الطريق على المارين بأخافتهم قال تعالى انما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الارض فساد الآية[4] {والسحر والربا} باموحدة لأنه ﷺ عدهما من السبع الموبقات في الحديث السابق[5] .

{وادمان الصغيرة} اي المواظبة عليها من نوع او انواع[6] .

(١) یەکێکی‌تریان خواردنی گۆشتی‌بەرازو مردارەوەبووە، واتە کاتێ بۆ زەروری و تەنگانە نەبێ، خوای گەورە فەرمویەتی: تۆبڵێ ئەی محمد لەناو ئەوەدایە بەوەحی بۆم هاتووە حەرام کراوم دەست ناکەوێ لەسەر کەسێ کە بیەوێ بیخوا جگەلەوەی کە مردارەبوبێ یاخود خوێنی ڕژاوبێت یاخود گۆشتی بەرازبێ،دەبێ‌گومان ئەوە پیسە.

(٢) گوناهێکی‌تریان شکاندنی ڕۆژوی ڕەمەزانە بێ ئەوەی بەهانوویکی هەبێ. چونکە ڕۆژوی ڕەمەزان یەکێکە لە ئەرکانی ئیسلام، کەوابو شکاندنی جاڕی ئەوە ئەدا ئەوەی کاری وابکا زۆر کەم گوێ بە ئاینی خوا ئەدا.

(٣) دزی ماڵی میلەت، بریتیە لە ناپاکی کردن لەماڵی کەدەست کەوتی میلەت بێ ج لە دوژمن یا لەسەر چاوە میللیەکان، وەك : ابوعوبیدە وتویەتی: خوای گەورە فەرمویەتی: هەرکەس دزی و ناپاکی کردبێ دەبێ بەوە وەکە دزیویەتی و ناپاکی کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا بێتە بەردەمی خوا.

(٤) یەکێکی‌تریان ڕێ لەخەڵگ گرتنە، بریتیە لەبڕینی ڕێ لەهاتوچۆکەران بەهۆی ئەوەوە بیانترسێنێ، خوای گەورە دەفەرموێ: تەنها پاداشتی بۆ ئەوانەی دەجەنگێن و ڕی خواو پێغەمبەر دەگرن و فەساد لەزەویدا بڵاودەکەنەوە کوشتنیان و هەڵواسینیانە.... تاکۆتایی ئایەتەکە.

(٥) دوانی‌تریان چاو بەسی و سووخواردنە - (ڕیبا) نەك ڕیا، بەبێ نەك بەیێ- چونکە پێغەمبەر ﷺ، هەر دوکیانی لەناو حەوت گوناهە لەناوبەرەکەدا ژماردن و حسێبی کردن، لەفەرمودە پێشووەکەدا.

(٦) یەکێکی‌تریان بەردەوام بوونە لەسەر کردنی گوناهی بچوك، ئیتر یەك جۆر بێ وەك ئەوەی هەرغەیبەت بکات، یاخود چەند جۆری بن وەك غەیبەت و ڕووانین بۆ نامەحرەم و ماڵی هەتیو خواردن .

وليست الكبائر منحصرة فيما عده كما اشار إليه بالكافي أو لها وماورد من حديث لصحيحين الكبائر منحصرة فيما عده كما اشار إليه بالكاف في اولها وما ورد من حديث الصحيحين الكبائر الاشراك بالله والسحر وعقوق الوالدين وقتل النفس زاد لبخاري واليمين الغموس ومسلم بدلها و قول الزور[1] .

وحديثهما: اجتنبوا السبع الموبقات الشرك بالله والسحر وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق واكل مال اليتيم وأكل الربا والتولي يوم الزحف وقذف المحصنات الغافلات لمؤمنات فمحمول على بيان المحتاج إليه منها وقت ذكره وقد قال ابن عباس هي الى لسبعين اقرب وسعيد بن جبير هي الى السبعمائة اقرب يعني باعتبار اصناف انواعها[2]

{مسئلة الاخبار عن} شيء {عام} للناس {لاترافع فيه} الى الحكام {الرواية [3]} .

---

(١) گوناهە گەورەكان تەنها ئەوانە نین كە دانەر حسێبی كردن، چونكە خۆیشی بە پیتی كاف هەر لەسەرتاوە ئاماژەی پێ كرد ووتی: وەكو مرۆڤ كوشتن، ئەی تۆچی ئەكەی لەم فەرمودانەی دا هاتو ژمارەی گوناهی گەورەیان دیاری كردووە؟ ئەوەی كە لە بوخاری و موسلم هاتووە ئەفەرموێ: گوناهی گەورە هاوەڵ دانا نەبۆ خواو چاوبەس و بێ فەرمانی كردنی باوك و دایك و كوشتنی مرۆڤە، بوخاری سوێنی ناحەقیشی بۆ زیاد كردووە، موسلیمیش لەباتی ئەو زیادەیە دەڵێ: كەسەێك پاڵپشتی درۆبێ.

(٢) وەفەرمودەێكی تری بوخاری وموسلم هەیە ئەفەرمومێ: خۆتان دور بگرن لەحەوت گوناهە عاقبەت شەڕ كەرەكە: هاوەڵ بۆ خواو چاو بەسی و كوشتنی گیانێك كە خوا حەرامی كردووە بەحەق نەبێ، وە خواردنی ماڵی هەتیو خواردنی سوو پشت هەڵكردنی لەڕۆژی هێرشی دوژمندا و بوهتان كردن بۆ ئافرەتی پاك و مێردداری بی ئاگاو باروەڕدار، ئەم فەرمودانە هەمویان حەمڵ دەكرێن لەسەر ڕونكردنەوەی ئەوەی لەكاتی باس كردنەكەیان پێویستی پێ هەیە. ابن عباسی ووتویەتی: گوناهی گەورە نزیكەی حەفتا گوناهن ، سەعیدی كوڕی جوبەیریش وتویەتی: نزیكەی حەوت صەد دانەن، واتە بە اعتباری پۆلێن كردنی جۆرەكانیان، ئەمەی كەووترا باسی ڕەگەزەكەیان بوو.

(٣) ئەمەش بابەتێكە جیاوازی نێوان ڕیوایەت و شەهادەت باس دەكا. ئەگەر هەواڵدانێك لەبارەی پەیدا بونی شتێكەوە بۆ كە گشت گیر بو بۆ هەموو خەڵك وەپێویستی نەئەكرد بگەڕێتەوە بۆ فەرمان ڕەوایانی دادگا بۆ كارپێ كردنەكەی، ئا ئەمە پێدەوترێ ڕیوایە.

وخلافه} وهو الاخبار عن خاص ببعض الناس يمكن الترافع فيه الى الحكام {الشهادة} وخرج بامكان الترافع الاخبار عن خواص النبيِّ ﷺ فينبغي أن يزاد في التعريف الاول غالبا حتى لا يخرج منه الحواص ونفي الترافع فيه لبيان الواقع وما في المروي من أمر ونهي ونحوهما يرجع الى الخبر بتأويل فتأويل اقيموا الصلاة ولاتقربو الزنا مثلاً الصلاة واجبةٌ والزنا حرام و على هذا القياس[1] .

{واشهد انشاء تضمن الاخبار} بالمشهود به {لامحض اخبار او انشاء على المختار} هو ناظر الى اللفظ لوجود مضمونه في الخارج به والى متعلقه [2] .

---

(١) پێچەوانەکەشی پێدەووترێ شەهادە، واتە هەواڵدان لەبارەی شتێکەوە کەتایبەتە بە هەندێ خەڵکەوە دەشکونجێ بۆ کارپێکردنەکەی دەبێ بگەڕێتەوە بۆ فەرمان ڕەوایانی دادگا. دەخۆ جاری واهەیە لە ڕیوایەتدا شتە تایبەتیەکانی پێغەمبەر باس دەکرێ ئەی ئەوە ڕیوایەت نیە؟ دەڵێ: بەوەی کە ووتمان دەست بدات بگەڕێتەوە بۆ دادگا هەوڵدان لەبارەی تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرەوە دەرچو، کەوابو شەهادەنیە بەلاّم پێویست بو لە پێناسەی یەکەمدا ووشەی: (غالبا)ی تێدا زیاد بکرایە، بەم شێوە بوترایە ئەغڵەب هەواڵدانە لە شتێکی عام، واتە جار جاریش دەبێ خاص بێ، بۆ ئەوەی تایبەتمەنیەکانی پێغەمبەر لەڕیوایەت دەرنەچن، ئەوەش کەووتمان گەڕانەوەی بۆ لای دادگای تێدا نەبێ ئەوە تەنها بۆ ڕونکردنەوەی واقعی عام وایە نەك بۆ احتراز بێ، چونکە شتی عام پێویستی بەگەڕانەوە بۆ داد گانیە. دەخۆ هەندێ ڕیوایەت هەیە ئەمرە یانە هیە، ئیتر چۆن تۆ دەڵێت: ڕیوایەت هەواڵدانە؟ دەڵێ: ئەو ئەمرو نەهیەی لەناو ڕیوایەتدا هەیە سەرئەنجامەکەی دەگەڕێتەوە هەر بۆ هەواڵ ، بۆ نمونە گریمان پێغەمبەرﷺ بفەرموێ: ئێوە نوێژ بکەن زینا مەکەن، ئەمە ئەنجامەکەی ئاوای بەسەردێ: نوێژ واجبە و زینا حەرامە، ئیتر جۆرەکانی تریش وەك استتفهام و ئەوانی تر قیاس لەسەر ئەمە دەکرێن.

(٢) چۆن دەبێ بوو ترێ شەهادەت هەواڵدانە خۆشەهادەتدان انشایە؟ دەڵێ: اشهد. من گەواهی ئەدەم لە لەفظدا انشایە هەواڵدان بە شاهیدی بۆ دراوەکەی لە خۆ گرتووە - زاتەکەی شەهادەتە متعلقەکەی هەوڵدانە - نەهەواڵدانی ڕوتە، وەك هەندێ ووتویانە وە نەانشای ڕوتیشە، وەك هەندێ تر ووتویانە، لە سەر قەولی هەڵبژاردە لە ناو هەموو قەولەکاندا، ئەم قەولەی کە لەفظی اشهد انشائێك بێ متضمن اخباربێ، سەیری لەفظی اشهد دەکا انشایە چونکە مانای ئەو لەفظە لە خارجدا بە هۆی ئەو لە لەفظەوە پەیدا دەبێ، انشایش ئەوەیە، وەسەیری متعلقی ئەو لەفظەش دەکا، کەشاهدی بۆ

والثاني الى المتعلق فقط و الثالث الى اللفظ فقط وهو التحقيق فلم تتوارد الثلاثة على محل واحد ولا منافاة بين كون أشهد انشاء وكون معنى لاشهادة اخبار لانه صيغة مؤدية لذلك المعني بمتعلقه[١] . {وصيغ العقود كبعت} واشتريت وزوجت وتزوجت {انشاء} لوجود مضمونها في الخارج بها {خلافاً لابي حنيفة} في قوله انها اخبار على صلها بان يقدر وجود مضمونها في الخراج قبيل التلفظ بها[٢] .

{قال القاضي} ابو بكر الباقلاني {يثبت الجرح والتعديل بواحد} في الرواية والشهادة نظرا الى ان ذلك خبر {وَ قِيلَ في الرواية فقط} اي بخلاف الشهادة رعاية لتناسب فيهما فإنَّ الواحد يقبل في الرواية دون الشهادة [٣] .

---

ـراوەکەیە، بەبێ ئەو لە فزەش لەخارجدا هەربووە.

(١) بەڵام قەولی دووەم کە ووتی: هەوڵدانی ڕووتە، ئەوە تەنها سەیری متعلقەکەی کردووە. قەولی سێهەمیش کە ووتی: انشای ڕوتە، ئەوە تەنها لە لەفظەکەی دەڕوانرێ نەك بۆ متعلقەکەی، کەوابو ئەوسێ قەولە نەچونەتەسەر یەك شوێن بەڵکو هەریەك لە دیوێکەوە تێ ڕامانی کردووە، جا کە اشهد انشا بێ ئیتر بۆ دەڵێت: شهادەت اخبارو هەوڵدانە؟ ئاخر دژایەتی نیە لە نێوان ئەوەی اشهد انشابێ و مانای شەهادەش هەوڵدان بێ، چونکە انشاء لەفظێکە ئەمانە دەگەیێنێ کە هەواڵدانە نەك بەلە فزکەی خۆی، بەڵکو بەهۆی متعلقەکەیەوە، بۆیە هیچ جۆرە دژایەتێك نیە.

(٢) ئەو لە فزانەی دیاری کراون بۆ بەڵێننامەو گرێ بەستوەك: فرۆشتم، کڕیم، مارەم بڕی، قەبوڵی مارە بڕێنە کەم کرد، ئەمانە هەمویان انشان، چونکە مضمون و ماناکەیان لەسەر زەمیندا بەهۆی ئەو لەفظانە پەیدا دەبێ بەڵام: ابو حەنیفە جیاوازی دەکاو دەفەرموێ: ئەمانە ئەصلێ لەفزەکەیان هەواڵدانە، چونکە فعلی (ماضی)ن، بەڵام وا دائەنرێ ماناکەیان پێشەوەی تەلەفظیان پێبکرێ لە خارجدا بووە - کە دەڵێت: کڕیم ، هەواڵ ئەدەی بەکڕینی ئەو شتەیە، مامەڵەو تەماشاکەی قەبوڵ کردووە.

(٣) باقلانی ووتویەتی: عەیبدار کردن و بەعەدل ناساندنی کەسێ بەهۆی یەك کەسەوە سابت دەبێ لە ڕیوایەتو لەشەهادەتدا، چونکە سەیری ئەوە دەکرێ کە ئەوە هەواڵە، هەواڵی یەك کەسیش قەبوڵە. هەندێك ووتویانە: تەنها لە ڕیوایەتدا قەبوڵە، لەشاهەدەتدا سابت نابێ، چونکە چاو لەو خزمایەتیە دەبڕێ لەنێوانیاندا هەیە، چونکە لە ڕیوایەتدا یەك کەس قەبوڵە دە عەیبدارکردن بە عەدل کردنیشی قەبوڵە، شاهیدیش دوکەسی قەبوڵن، کەوابوو جەرح و تەعدیلیش دوو کەسی دەوێ.

{وَ قِيلَ لا فيهما} نظرا الى ان ذلك شهادة فلا بد فيه من العدد[1] . {وقال القاضي أيضاً {يكفي الاطلاف فيهما} اي في الجرح والتعديل فلا يحتاج الى ذكر سببهما في الرواية والشهادة اكتفاء بعلم الجارح والمعدلّ به[2] {وَ قِيلَ بد كرسببهما} ولا يكفي اطلاقهما لاحتمال ان يخرج بما ليس بجارح وان يبادر الى التعديل عملاً بالظاهر[3] .

{وَ قِيلَ } يذكر {سبب التعديل فقط} اي دون سبب الجرح لأن مطلق الجرح يبطل الثقة ومطلق التديل لايجصلها لجواز الاعتماد فيه على الظاهر[4] . {وعكس الشافعي} ﷺ فقال يذكر سبب الجرح للاختلاف فيه دون سبب التديل {وهو} اي عكس الشافعي {المختار في الشهادة[5]} .

---

(١) هەندێك ووتویانە بەیەك كەسی سابت نابێ جەرح و تەعدیل نە لە ڕیوایەتدا وە نەلەشەهاتدا، چونكە سەیری ئەوە دەكرێ كە ئەوە شەهادەتدانە شەهادەتدانیش چەند كەسێكی دەوێ.

(٢) دوبارە قازی ووتویەتی: لە جەرجو تەعدیلدا تەنها ئەوەندە بەسە بڵێ ئەوە عەیبدارە یا ئەوەی عادڵە، ئیتر پێویستی بەوە نیە لەڕیوایەت و شەهادەتدا باسی هۆكاری عەیبدار بونەكەی یا عەداڵەتەكەی بكات، هەر ئەوەندە بەسە كە عەیبدار كەرەكەی دەیزانێ یاخود بە عادڵ حسێب كەرەكەی بەئاگایە لێی .

(٣) هەندێك وتوویانە دەبێ هۆی عەیبدار بوونەكەیان و عەداڵەتەكەیان باس بكرێ. تەنها ئەوەندە بڵێ: ئەوە عەیبدارە یاخود عادڵە، ئەوە بەس نیە، چونكە هەڵدەگرێ كە عەیبداری بكا بەشتێ كە عەیبداركەر نەبێ، یاخود دەسپێشخەری بكا بۆ بە عادڵ زانینی لەبەر ئەوەی كە دیارەو ئاشكرایە لێیەوە كاری چاكە.

(٤) هەندێك وتوویانە: هۆی بەعادڵ زانینەكەی باس دەكرێ و بەس، ئیتر بێ ئەوەی باسی هۆكاری عەیبداربونەكەی بكرێ، چونكە عەیبدار كردن بێ باسی هۆكەشی هەر ثقە پوچەڵ دەكاتەوە، بەڵام بەعادڵ حسێب كردنی بێ ئەوەی هۆكارەكەی باس بكات ئەوە ثقە پەیدا ناكات، چونكە ئەشێ لەو تەعدیلەدا پشتی تەنها بەحاڵی دیاری ئەو كابرا بەستبێ.

(٥) شافعی بەپێچەوانەوە فەرموویەتی هۆی عەیبدار بوونی دەبێ باس بكرێ. چونكە زانایان جیاوازن لەهۆی عەیبدار بوندا، بەڵام بێ ئەوەی هۆی بەعەدالەت ناسانی باس بكرێ، چونكە ئەم جیاوازی نیە لەهۆكانیدا، ئەو قەولی شافیعیە قەولێكی هە ڵبژاردەیە لەناو قەولەكاندا لەباسی شەهادەتدا.

وامـا الروايـة فيكفـي الأطـلاق} فيـها للجـرح فيـها للجـرج كـالتعديل {اذا عـرف مذهب الجارح} من انه لا يجرح إلاّ بقادح ولا يكتفي بمثل ذلك في الشهادة لتعلق الحق فيها بالمشهود له[1]

{وقــول الامــامين} اي امــام الحرمــين والامــام الــرَّازي {يكفــي اطلاقــهما} اي لجرح والتعديل {للعالم بسببهما} اي منه ولا يكفي من غـيره {وهـو راي القـاضي} لمتقدم {اذ لا تعديل وجرح الامن العالم} بسببهما فلا يُقال انه غيره وان ذكره معه بن الحاجب و غيره[2] . {والجرح مقدم} عند التعارض على التعديـل {ان كـان عـدد لجارح اكثر من} عدد {المعدل إجماعاً وكـذا ان تساويا} اي عـدد الجـارح و عـدد لمعـدل {او كـان الجـارح اقـل} عـددا مـن المعـدل لاطـلاع الجـارح علـى مـالم يطلـع عليه المعدل[3] .

(١) بەڵام لەڕيوايەتدا هەر ئـەوەندە بەسە بڵـێ عـەيبدارە، بـۆ شـەهادەتيش وايـە، وەك بەعـەدل ناسـاندنی كەسـێك هەر بڵێ عادڵـە بەسـە، عەيبدارەكـە كـە بزانـرێ، كـە هـەر بەخـەڵك ئـەڵێ عـەيبدارە، ئيـتر شـی ناكاتـەوە بـەچی عـەيبدارە، بـەڵام ئـەوە ەشەهاتەشدا بەس نيە ئەبێ هۆكەشـی بـاس بكـا، چونكـە لەشـەهادەتدا حەقـە كـە پـەيوەندە بـە غـەيری خۆيـەوە كـە شـەهادەت بـۆ دراوەكەيـە، ئـەبێ گرنگـی زيـاتری پـێ بدرێ.

(٢) قسـەی هـەردو پێشـەوا كە إمام الحرمين و ڕازيـەو ووتيـان هـەر ئـەوەندە بەسـە بڵێ عەيبدارە يا عادڵە، ئەمەش لە لايەن كەسێكەوە بووترێ كە زانابێ بەهۆكاری ئەو جەرح و تەعديلە، بەڵام لەلايەن غەيری ئەوەوە بووترێ بەس نيە، ڕەئی ئەم دووانە هەر خودی ڕەئيەكەی قازيە كە لەپێشەوە ڕابورد، چونكە بـەعادل و عـەيبدار ناسـاندنی خـەڵك لەلايـەن كەسـێكەوە نـەبێ هۆكانيـان بزانـێ نـابێ، بۆيـە نـابێ بووتـرێ قـەولی ئەو دووانە جيايە لەڕاكەی قازی، هەرچەند ابن الحاجب و غـەيری ابـن الحـاجبيش قەولی ئەو دوو ئيمامەيان لەگەڵ قەولی قازيدا باس كردووە.

(٣) بەعەيبدار ناساندنی كەسێ پێش دەخرێ بەسـەر بەعادل ناسـاندنيندا لـەكاتی بەگژيەكدا چونا، ئەمەش ئەگەر ژمارەی برينداركەرەكان زۆرتربێ لەژمارەی بە عـادڵ ناسەكانی، ئەم ياسايە ڕای هـەموانی لەسـەرە، هـەروەها ئەگـەر ژمارەی هـەردوولايان چونيەك و يەكسان بن، ياخود ژمارەی عـەيبدار كـەرەكان كـەمتربێ لەژمارەی ئەوانـەی بەعادڵ حسێبی بۆ ئەكەن، چونكـە دەبێ عەيبدارەكە شـتێكی لێ بزانـێ كـە بـەعادڵ ناسەكەی ئاگادار نەبێ بەسەريدا.

{وقال ابن شعبان} من المالكية {يطلب الترجيح} في القسمين كما هو حاصل في الاول تكثرة عدد الجارح وعلى وزانه قال بعضهم ان التعديل في الثالث مقدم[1] .

{ومن التعديل} لشخص {حكم مشترط العدالة} في الشاهد {بالشهادة} من ذلك الشخص اذلو لم يكن عدلا عنده لما حكم بشهادته {وكذا عمل العالم} المشترط للعدل في الراوي برواية شخص تعديل له {في الأصَحّ} و إلاّ لما عمل بروايته وَ قيلَ ليس تعديلاً له والعمل بروايته يَجوزُ ان يكون إحتياطاً[2] {ورواية من لايروى إلاّ للعدل} عنه بان صرح بذلك او عرف من عادته عن شخص تعديل له كما لو قال هو عدل و قِيلَ: لا لجواز اي يترك عادته[3] . {وليس من الجرح} لشخص {ترك العمل بمرويه و ترك {الحكم بمشهوده} لجواز أن يكون الترك لمعارض[4] .

---

(١) ابن شەعبان کە یەکێکە لە زانایانی پەیڕەوی پێشەوا مالك ووتویەتی: دەبێ دەکرێ لەدوو بەشەکەی تریشدا لایەکیان زیادە قورساییێکی پێ بدرێ، وەك لەبەشی یەکەمدا بەهۆی زۆری ژمارەی بریندار کەرەوە ئەو قورساییە پەیدا بووە، هەر لەسەر کێشەی یەکەمە هەندێکیان وتوویانە: بەعادڵ ناساندن لەقەولی سێهەمدا پێشخراوە بەسەر عەیبدار ناساندنیدا، چونکە ژمارەیان زیاترە.

(٢) هەندێکە لە بەعادڵ ناساندنی کەسێ حوکمی داوەرێك کەمەرج لای ئەو دەبێ شاهید عادڵ بێ کە حوکمی بەشاهیدی ئەوی کەسە کرد مانای وایە ئەو کەسەی بەعادڵ ناساندووە، چونکە ئەگەر عادڵ نەبووایە حوکمی نەئەکرد بەشەهادەتەکەی هەروەها ئەگەر زانایێك عەدالەتیبەمەرج گرتبێ لەڕیوایەت کردندا کار کردنی ئەو زانایەیە ڕیوایەتی هەر کەسێ ئەو بەعادڵ ناساندنی ئەو کەسەیە عادڵە بەلای قەوڵی ئەصەحەوە، چونکە ئەگەر وانەبووایە کاری بەڕیوایەتکەی نەئەکرد، هەندێکیش وتوویانە ئەوە نیشانەی بەعادڵ ناساندنی نیە، بەڵکو ئەگونجێ کاری کردبێ بەڕیوایەتەکەی لەبەر احتیاط بێ.

(٣) کەسێ لە عادڵەوە نەبێ ڕیوایەت نەکات، ئیتر بەزبانی خۆی ئەوەی ووتبێ یاخود لەعادەتیەوە زانرابێ، ڕیوایەتی ئەم جۆرە کەسانە لەهەر کەسێکە ڕیوایەتیان کرد ئەوە ئەو کەسەیان بەعادڵ ناساندووە، ڕیوایەتەکەی وەك ئەوە وایە بڵێ فلانەکەس عەدلە، هەندێك وتوویانە: بەعەدل ناساندنی بۆ حسێب ناکرێ، چونکە ئەشێ ئەو کەسە واز لەعادەتی خۆی بهێنێ.

(٤) کەسێك کە ئەگەر فەرموودەیێکی ڕیوایەت کرد کاری پێ نەکرا ئەوە نیشانەی بریندارکردن وعەیبدار کردنی نیە، یاوازهێنرا لەوەی حوکم بەشەهادەت بۆ دراوەکەی

{ولا الحد} له {في شهادة الزنا} بأن لم يكمل نصابها لأنه لانتفاء النصاب {و} لا في {نحو} شرب {النبيد} من المسائل الاجتهاديه المختلف فيها نكاح المتعة لجواز ان يعتقد إباحة ذلك[1].

{ولا التدليس} فيمن روى عنه {بتسمية غير مشهورة} له حتى لا يعرف اذ لا خلل في ذلك {قال ابن السمعاني إلاّ ان يكون بحيث لوسئل} عنه {لم يبينه} فإنّ صيعه حينئذٍ جرح له لظهور الكذب فيه و أُجيبَ بمنع ذلك فترك الإستثناء اظهر منه[2]

{ولا} التدليس {باعطاء شخص اسم آخر تشبيها كقولنا} اخبرنا {ابو عبدالله الحافظ يعني الذهبي تشبيها بالبيهقي} في قوله حدثنا ابو عبدالله الحافظ {يعني} به {الحاكم} لظهور المقصود[3].

---

بکرێ، چونکە ئەگونجێ واز هێنانەکە لەبەر شتێك بێ بەگژی ئەمدا چوبێ.

(١) وە کەسێ شەهادەتی زینا کردنی کەسێك بدا لەبەر ئەوەی ئەندازەی دیاری کراوی شەهادەتی زینا تەواو نەبووە داری لێ ئەدرێ، لێدانی ئەو جەڵدەیە عەیبدارو بریندراری ناکات، بۆیە شاهیدی قەبوڵ ناکرێ لەبەر ئەوەی ئەندازەی دیاری کراو فەوتاوە نەك لەبەر بوهتان کردنی، هەروەها جەڵدە لێدانی لە نموونەی خواردنەوەی نەبیزومەی و ئەو بابەتانەی زادەی ئیجتیهادن و رای زانایان تیایاندا جیاوازە، وەك نیکاحی صیغەو موتعە، چونکە لەوانەیە بۆیە ئەوەی کردبێ بڕوای وابوبێ ئەوە حەڵاڵ کراوە بۆی —ئەمە زەمانی کۆن، بەڵام ئێستە هیچ گومانی تێدا نیە.

(٢) شاردنەوەی ناوی ئەو کەسەی کە ڕیوایەتەکەی لێ وەرگرتووە ئەوەش بەهۆی ناوبردنی بەناوێك بەناوبانگ نەبێ بۆی، بۆیە وایش دەکا بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە، ئەوە عەیبداری نیە، چونکە زیان و نوقصانێك لەوەدا نیە.. ابن السمعانی وتوویەتی: ئەگەر کاتێ نەبێ ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ هەر ڕوونی نەکاتەوە، ئەوە ئەو کارەی لەم کاتەدا عەیبداریەو بریندرایە بۆی، چونکە لەو کارەیدا درۆی دەر دەکەوێ، وەڵامی سەمعانی دراوەتەوە کە ئەو عەیبدارکردنە هەر قەدەغەیەو نابێ، کەوابوو لابردنی إستثناکە ئاشکراترو دیارترە لەبوونی.

(٣) هەم بەعەیبداریو بریندداری حسێب نیە ڕوپۆشی و شاردنەوەی ناوی ڕیوایەتکەرەکە ئەوەش بەوە دەکرێ ناوی کەسێکیتر بدەی بەڕیوایەت کەرەکەی خۆت، بۆیە وایش دەکا چونکە ناوەکان لەیەك ئەچن، وەك خۆم جاری واهەیە دەڵێم: (ابوعبدالله)ی الحافظ ئاگاداری کردم مەبەستم مامۆستا (الزهبیة) بۆیەش وا دەکەم دەمەوێ وەك بەیهەقی بکەم کە ئەویش دەیووت: (ابوعبدالله) الحافظ قسەی بۆ کردین،

{ولا} التدليس {بايهام اللقي والرحلة} الاول كقول من عاصر الزهري مثلاً ولم يلقه قال الزهري موهما اي موقعا في الوهم اي الذهن انه سمعه والثاني نحو ان يقال حدثنـ وراء النهر موهما جيحون المراد نهر مصر كأن يكون بالجيزة لان ذلك من المعاريض لاكذب فيه[1] . {اما مدلس المتون} وهو من يدرج كلا مـه معها بحيث لا يتميزا {فمجروح} لا يقاعه غيره في الكذب على رسول الله ﷺ[2] .

{مسئلة الصحابي} اي الشخص الذي يسمى صحابياً اي صاحب النبيِّ ﷺ {من اجتمع} حال كونه {مؤمنا بمحمد ﷺ} ذكرا كان او انثى فخرج من اجتمع به كافرا فليس بصاحب له لعداوته وفصل بين الفعل ومتعلقه بالحال لتلي صاحبها وهو ضمير اجتمع[3] .

---

بەڵام مەبەستی ئەم مامۆستا الحاكم بووە، بۆیە لەكەداری ناكا چونكە مەبەست دیارە. هەریەك لەسەر دەمێكدا بوون .

(١) هەروەها مایەی عەیبداری نیە شاردنەوەی مەبەست و فێڵێك كە یەكێك لە دوانەبێ: ١- واگوێگر بدوێنێ و ڕیوایەتی بۆ بكا وابزانێ خۆی ڕوبەڕو لێ وەرگرتووە ٢- یا واقسەكە دابڕێژێ گوێگر واحاڵی بێ ئەو گەشتەی كردووە، یەكەیان وەك كەسێ كە لە سەردەمی زەهریدا بووە بەڵام ڕوبەڕو پێ نەگەیشتوە، بڵێ: الزهري ووتی. كە دەڵێ: ووتی، وا ئەخاتە مێشكی تۆوە كە خۆی لێی بیستووە، دوهەمیان وەك ئەوەی بووترێ: زانایانی ئەوبەری سیروان قسەیان بۆ كردین، لەوسەردەمەدا بووترایە ئەوبەر سیروان مەبەستی ئاوی جەیمون بوو، بەڵام ئەم مەبەستی ئاوی سیروانی وڵاتی مصرە، بەم شێوە خۆی لە ناوچەی جیزە بێ، بۆیە عەیبداری نیە چوكە ئەوە درۆی نێدانیە و جۆرێكە لە تەعریض، واتە: پانكردنەوە، ئیتر دیمەنی زۆر ڕێ دەبێتەوە تیایدا.

(٢) بەڵام كەسێ لەناومەتنەكاندا قسەیەك بشارێتەوە ئەوعەیبدارە،ئەوەش بریتیە لە كەسێك قسەی‌خۆی لەگەڵ ڕیوایەتەكەدا تێكەڵ بكا،بەشێوازێك لەیەك جیانەكرێتەوە كامیان فەرمودەی پێغەمبەرەو كامیان هی ئەمە، بۆیەش ڕیوایەتی لێ قەبوڵ ناكرێ چونكە غەبری خۆی خستووەتە ناوگوناهی: درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە كردن .

(٣) ئەمەش بابەتێكە، هاوڵ بەكەسێ دەووترێ هاوڕێیایەتی پێغەمبەری كردبێ. بریتیە لەكەسێ: لەگەڵ پێغەمبەرﷺ كۆبوبێتەوە لەحاڵێكدا بڕوای بە محمدﷺ بوو بێ نێربێ یاخود مێینە، بەم پێناسەیە كەسێ چووە دەر كە لەگەڵ پێغەمبەر كۆبوبێتەوەو باوەڕی پێ نەبوبێ، ئەوە هاوڕێ پێغەمبەر نیە، دانەر ووشەی (مؤمنا)، خستە نێوان

وعدل عن قول ابن الحاجب وغيره من راي النبيّ ﷺ ليشمل الأعمى من اول الصحبة كابن ام مكتوم {وان لم يرو} عنه شيئا {ولم يطل} بضم الياء اي اجتماعه به[1] . بخلاف التابعي مع الصحابي} وهو صاحبه فلا يكفي في صدق اسم التابعي على لشخص اجتماعه بالصحابي من غير اطالة للاجتماع به نظرا للعرف في الصحبة [2] ان قيل يكفي كالاول والفرق ان الاجتماع بالمصطفى ﷺ يؤثر من النور القلبي ضعاف مايؤثره الإجتماع الطويل بالصحابي وغيره من الاخيار فالاعرابي الجلف مجرد مايجتمع بالمصطفى ﷺ مؤمنا ينطق بالحكمة ببركة طلعته ﷺ[3] {وَ قيلَ يشترطان} اي المذكور ان من الرواية واطالة الاجتماع في صدق اسم الصحابي[4] .

---

جتمع وبمحمد) ، چونكە (مؤمنا) حاڵەو خاوەن حاڵەكە فاعلى (إجتمع) يە بۆئەوەی يەكسەر بێ بەشوێنيا.

(١) دانەر لەپێناسەكەی ابن الحاجب نەغەيری ئەويش دا، كە دەڵێ: صەحابی ئەكەسێ دەوترێ كەپێغەمبەری بينيبێ،چونكە پێناسەكەیدانەر كوێريش دەگرێتەوە هەر لەسەرەتای يەكەمیدروستبونی هاوڕێيەتيەوە، هەرچەند هيچ شتێكيشی ڕيوايەت نەكرد بێ ياخود دانيشتن و كۆبونەوەی درێژەپێنەدابێ لەگەڵيدا .

(٢) بەڵام شوێن كەوتە لەگەڵ هاوەڵدا ئەوەی ناوێ، شوێن كەوتەش ئەوەيە هاوڕێيەتی هاوەڵی پێغەمبەری كردبێ، لەبەر ئەوە دابڕينی ناوی: شوێن كەوتە بەسەر كەسێكدا لەگەڵ هاوەڵێكدا كۆبوبێتەوە بێ درێژەی پێ دان ئەوە بەس نيە، چونكە عورف و عادەت سەيری هاوڕێيەتی دەكات، هاوڕێش بەكەسێ دەوترێ زۆر لەگەڵ يەكدا بووبن.

(٣) هەرچەندە هەندێك ووتويانە: وەك يەكەم كەمترين كات بەسە بۆ ئەوەی ناوی شوێن كەوتەی بەسەردا بڕێ، جياوازيەكەشيان ئەوەيە يەك دانيشتن و كۆبونەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، ئەوەندە دڵ نورانی و ڕۆشن دەكاتەوە هەزار قاتی ئەوسودو نورەی كە دانيشتن و كۆبونەوەی درێژ لەگەڵ هاوڕێ و غەيری ئەو لە چاكان دەیگەيێنێ، چونكە عەرەب لادێييەكی گەمژەو گێل هەر ئەوەندە بەبڕواداری لەگەڵ پێغەمبەردا كۆبونەوەی بكردايێ يەكسەر قسەی پڕ لە دانايی و بەجێيی هەڵئەڕژاند بەهۆی بەرەكەتی نوری ڕوخسارو نێوچاوانی پێغەمبەرەوە ﷺ .

(٤) هەندێ: ووتويانە: ئەو دوانە هەردوكيان بەمەرج گيێراون، واتە ڕيوايەت كردن و درێژەدان بەخڕبونەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، ئەمجا ناوی هاوڕێيەتی بەسەردا دەبڕێ .

نظراً في الإطالة الى العرف وفي الرواية الى انها المقصود الأعظم من صحبة النبيِّ ﷺ لتبليغ الاحكام[1] .{وَ قِيلَ } يشترط {احدهما} فقط يعني قال بعضهم يشترط الإطالة وهذا امشهور وبعضهم يشترط الرواية ولو لحديث كما حكاه بعض المتأخرين[2] .

{وَ قِيلَ } يشترط في صدق اسم الصحابي {الغزو} مع النبيِّ ﷺ {او سنة} اي مضيه على الاجتماع به لان لصحبة النبيِّ ﷺ شرفا عظميا فلا ينال إلاّ باجتماع طويل يظهر فيه الخلق المطبوع عليه الشخص كالغزو المشتمل على السفر الذي هو قطعة من العذاب و السنة المشتملة على الفصول الاربعة التي يختلف فيها المزاج[3] واعترض على التعريف بأنه يصدق على من مات مرتدا كعبد الله بن خطل ولا يسمى صحابيا

(١) چونكە لەعورفدا ئەگەر هاوڕیەتی درێژەی پێ نەدرێ هاوەڵی پێ ناوترێ ڕیوایەت و فەرمودە گێڕانەوەش گەورەترین مەبەستە لەهاوڕیەتی پێغەمبەرد بۆگەیاندنی حوكمە شەرعیەكان.

(٢)هەندێكی‌تر وتویانە: یەكێكیان بەمەرج گیراوەو بەس، واتە هەندێكیان ووتویانە بەمەرج گیراوە زۆر درێژەی كێشابێ هاوەڵیەتیەكی ئەمەشیان بەناوبانگە، هەندێكی‌تر ووتویانە: بەمەرج و گراوە ڕیوایەتی فەرمودەی پێغەمبەر بافەرمودەیێكیش بێ، وەك هەندێ لەزانایانی سەردەمی دوای گێڕاویانەتەوە.

(٣) هەندێك وتویانە: بۆدابڕینی ناوی یارویاوەر بەسەر كەسێكدا بەمەرج گێڕاوە ئەبێ غەزای كردبێ لەگەڵ پێغەمبەردا،یاخودساڵێك تێپەڕی كردبێ بەسەر خڕبونەوەی لەگەڵ پێغەمبەردا، چونكە هاوڕێیەتی پیغەمبەرﷺ، پلەیەكی بەرزو گەورەیە، مرۆڤ پێ ناگا مەگەر بەخڕبونەوەیەكی درێژ خایەن نەبێ كەهەموڕەوشتێكی ئەوكەسەی لەسەر دروست كراوە دەردەكەوێ تیایدا بۆ پێغەمبەر، بۆچاكەكانیان بێ دەنگ بێ و بۆ خراپەكانیان پێ بڵێ. ئەو خڕبونەوە درێژ خایەنە یا ئەبێ غەزای كردبێ لەگەڵیا، كەغەزایش بریتیە لەسەفەر، سەفەریش بریتیە لەپارچە تاڵاو هەڵمژینێك ووشەی سەفەر بەواتای دەركەوتنە یان هەموو ڕەوشتێكی دەرئەكەوێ - یاوەك ساڵێك بردنەسەر ، ساڵیش چوار وەرز دەگرێتەوە - كەخو ئارەزوی مرۆڤی تیادا دەگۆڕێ ئەوەی چاك بێ پیغەمبەرﷺ لێ بێ دەنگ دەبێ،ئەوەش خراپ بێ‌بۆی ڕاست دەكاتەوە.

(٤) ڕەخنەیێك بەخراپە هێنراوەتە سەر ئەو پێناسەیە كە ئەو پێناسە دەبڕێ بەسەر كەسێكیشدا كە بە پاشگەزبویەوە مرد بێ وەك (ابن خەطەل) كەچی بە هاوەڵیش ناونابرێ.

بخلاف من مات بعد ردته مسلما كعبد الله بن ابي سرح ويجاب بأنه كأن يسمى قبل لردة ويكفي ذلك في صحة التعريف اذ لا يشترط فيه الاحتراز عن المنافي العارض ولذلك م يحترزا في تعريف المؤمن عن الردة العارضة لبعض أفراده[1]

ومن زاد من متأخرى المحدثين كالعراقي في التعريف ومات مؤمنا للاحتراز عمن ذكر راد تعريف من يسمى صحابيا بعد بإنقراض الصحابة لا مطلق والالزمه أن لا يسمى لشخص صحابيا حال حياته ولا يقول بذلك أحد وان كان ما اراده ليس من شان لتعريف[2] {ولوا دعى المعاصر} للنبي ﷺ {العدل الصحبة} له {قبل وفاقا للقاضي} بي بكر الباقلاني لأن عدالته تمنعه من الكذب في ذلك وَ قِيلَ لا يقبل لادعائه لنفسه رتبة هو فيها متهم كما لوقال انا عدل[3] .

---

(١) بەڵام کەسیٚ دوای پاش گەڕبونەوەی‌کەی موسوڵمان بوبێـەوە، وەك ابـن ابـی سەرح ئەوە جیاوازە هەر هاوەڵە ، وەڵام دراوەتەوەکە ئەوە پێش پاشگەز بونەوەکەی بەهاوەڵ ناودەبرا، هەر ئەو ئەندازەش بۆ دروست پێناسەکە بەسە، چونکە مەرج نیە گێراوە لەپێناسەدا خۆ پاراستن لە دژێك کەلابەلا بۆی پەیدا بیٚ، هەر لەبەر ئەوەیە نەپێناسەی باوەڕداردا ووتویانە: ئەوەیە باوەڕیٚ بەخوا هەبیٚ ئیتر خۆیان نەپاراستووە نەپاشگەزبونەوەیێك کە بۆهەندیٚ کەسیٚ باوڕدار پەیدا دەبیٚ .

(٢) ئەوانەی لەزانایانی سەردەمی دوای لەمامۆستایانی فەرمودە، وەك (القرافی) فەرمودەزان، لەپێناسەی هاوەڵدا ڕستەی: بەباوەڕداری مردبیٚ، بۆ زیاد کردووە، ئەوە بۆ ئەوە یە خۆی بپارێزیٚ لە (ابن خطل) کە باسکرا ئەوە بۆیە زیاری کردووە ویستویەتی پێناسەی کەسیٚ بکات کە ناو دەبریٚ بەهاوەڵ دوای برانەوەو تەواوبونی هەموو جیلی صەحابەو هاوەڵان، نەك مەبەستی پێناسەی هاوەڵە وەك لەفظێکی گشتگیر، ئەگەر وانەبیٚ دەبیٚ کەس بەهاوەڵ ناو نەبریٚ لەژیانی خۆیدا، چونکە پێناسەی کە ئەواو نەهاتووەتە دی (ومن مات مؤمناً)، بێگومان کەسیش شتی وای نەوتووە، هەرچەند ئەوەی ئەو ویستویەتی لەزیاد کردنی ڕەشەی: (ومات مؤمناً)، داکە بۆخۆپاراستن بو لە (ابن خطل)، ئەوە لەکاروباری پێناسەدا نیە، چونکە دژی لابەلای بۆپەیدا بو حسێبی بۆ ناکریٚ

(٣) ئەگەر کەسیٚ عەدڵ بیٚ و هاوزەمانی پێغەمبەربیٚ دەڵی: پێغەمبەرم دیوە ئەوە ئەوداوایەی لیٚ قەبوڵ دەکریٚ، ڕای باقلانیش هەماهەنگی ئەم قەولەیە بۆیە لیٚ‌قەبوڵ دەکریٚ چونکە عەدالەتەکەی نایەڵیٚ بەتایبەت لەوبابەتەدا درۆ بکات، هەندیٚ وتویانە: لیٚ‌قەبوڵ ناکریٚ، چونکە داوای پلەیێکی زۆر گەورە بۆ خۆی دەکا کە تیایدا موتەهەمە و

{والأكثر} من العلماء السلف والخلف {على عدالة الصحابة} فلا يبحث عنها في رواية ولا شهادة لأنهم خير الامة قال ﷺ خير امتي قرني رواه الشيخان ومن طرا له منهم قادح كسرقة او زنا عمل بمقتصاه[١] {وَ قِيل } هم {كفيرهم} فيبحث عن العدالة فيهم في الرواية والشهادة الأمن يكون ظاهر العادلة او مقطوعها كالشيخين رضي الله عنهما[٢] .

{وَ قِيلَ } هم عدول {الى} حين {قتل عثمان} ﷺ ويبحث عن عدالتهم من حين قتله الوقوع الفتن بينهم من حينئذٍ وفيهم الممسك عن خوضها[٣] {وَ قِيلَ } هم عدول {الامن قاتل عليا} ﷺ فهم فساق لخروجهم على الامام لحق ورد بانهم مجتهدون في قتالهم له فلايأثمون وان اخطؤا بل يؤجرون كما سيأتي في العقائد[٤] .

---

گومان هەیە لەڕاستیەتیدا، وەك ئەوەی ئەگەر بڵێ: من عادڵم .

(١) زۆرترین لەزانایانی سەردەمی پێشوو سەردەمی دوای لەسەرئەوەن کە هاوەڵان هەموویان عادڵن، لەبەر ئەوە لەهەر ڕیوایەت و شەهادەکێکیاندا توێژینەوە ناکرێ لەبارەی عەدالەتیانەوە، چونکە هاوەڵان چاکترین کەسی ئوممەتی پێغەمبەرن. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: باشترین کەسی ئوممەتی من خەڵکی سەردەمی منە، بوخاریو موسلم، ڕیوایەتیان کردوە، بەڵام کەسێکیان لەخشتە بردنێکی عەیبدار کەری بەسەر داهاتبێ وەك دزی یاخود زینا ئەوەکار کراوە بەداخوازی ئەوگوناهە، واتە ئەگەر زینای کردبێ داری حەدی لێ دراوەو پاك بووەتەوە، چونکە زیناحەد دەکات .

(٢) هەندێ: ووتویانە: ئەوانیش وەکو غەیری خۆیان وان، کەوا بو توێژینەوەو گەڕان دەکرێ لەوانەیشدا لەبارەی هەموو ڕیوایەت و شەهادەتێکیانەوە، مەگەر کەسێك بێ کە عەدالەتەکەی دیاربێ یاخود گومان لێ بڕاوبێ، وەك ابو بکر و عومەر ﷺ .

(٣) هەندێکی تر ووتویانە: هاوەڵان هەمویان عادڵن هەتا کاتی کوشتنی عوثمان. لەکاتی کوشتنی عوسمانەوە توێژینەوەو گەڕان دەکرێ دەربارەی عەدالەتیان چونکە لەکاتی کوشتنی عوسمانەوە فیتنەیان کەوتە نێوانیان، بۆیە دەگەڕێن بەشوێنی عەدالەتدا چونکە لەناو هاوەڵاندا هەندێکیان دەستیان گرتەوەو نەچونە ناو فیتنەکە .

(٤) هەندێکیتر وتویانە: هاوەڵان هەمویان عادڵن جگە ئەوەیان نەبێ جەنگاوە لەگەڵ عەلیدا، ئەوانە یان فاسقن، چونکە لەفەرمانی پێشەوای حەق و دروست دەرچون، ئەم قەولەش وەڵام دراوەتەوە، ئەوانە مجتهدبون لەجەنگدنیاندا لەگەڵ عەلیدا، کەوابوو بە گوناهبار حسێب ناکرێن با ئیجتهادەکەیان غەڵەت بوبێ، نەك هەرئەوەش بەڵکو لەسەر اجتهادەکەشیان یەك پاداشت وەرئەگرێ، وەك لەمەودوادێ باسەکەیلەبابەتی عقائددا

ـنـا: قـوله عن كل فرد مما تصدق عليه العلة ممنوع، بل يكفي عن كل فرد مما يصدق ـيه المعلل[1].

ـوركانــه} اي القيــاس {اربعــة} مقيــس عليــه ومقيــس ومعنـــى مشــترك بينــهما ـحكم للمقيس عليه يتعدى بواسطة المشترك الى المقيس ولما كان يعبر عن الاولين ـنها بـالاصل والفـرع علـى خـلاف في ذلـك ذكـره في ضمـن تعديدهـا فقـال[2] الاول لاصل وهـو محل الحكم المشبه به} بالرفع صفة المحل اي المقيس عليه {وَ قِيلَ ـيله} اي دليل الحكم {وَ قِيلَ حكمه} اي حكم المحل المذكـور و سيأتي ان الفـرع ـمحل المشبه[3].

ـێـدا نـاكرێ، چونكـه هـۆ و عيلـەتی حـەرام و وازهێنـان خراپـەو گەندەڵيـە، دەخـۆ ـمبەست كەنەمانی گەندەڵيە تەنها بەيەك شت پەيدا دەبێ ئەويش دوركەوتنەوەيە لـە ـمموو شتێك كە ئەو عيلەتە بيگرێتەوە و تێدا هەبێ، وەهۆو عيلەتی كارو ئەنجامدانی ـتەنها بەرژەوەنديە .

(١) ئێمـەيش ووتومانــە: ئـەوەی كـە ووتــی: دوركەوتنــەوە لـە هـەموو فــەردێك كە عيلەتەكەی تێدابـێ، ئـەم قسـەيە قەدەغەيـەو نـابێ، بـەڵكو ئـەوە بەسـە كـە دوور ـبكەوێتــەوە لــە هــەموو شــتێك عيلــەت بــۆ هێنراوەكـە بيگرێتــەوە . واتــە ئــەوەی ـووشـــەی خـــەمر دەيگرێتـــەوە، نـــەك ئـــەوەی اســـكارو ســـەرخۆش كردنەكـــەی تێدابێ.

(٢) ئـەركانی قيـاس چـوارن:١- قيـاس لەسـەر كراوكەيـە. ٢- قيـاس كراوەكەيـە. ٣- ئـەو مانايەيـە لـە نێـوان هـەردوكياندا هەيـە، واتـە ئـەو عيلەتـەی هـەردوكيانی كۆكردوەتەوە. ٤- حوكمی قياس لەسەر كراوەكەيە بەهۆی عيلەتەكەوە دەگوێزرێتەوە بۆ قياس كراوەكە. باس: كاتێ لەباتی يەكـەم دووەم دەوتـرێ ئـەصڵ فـەرع لەسـەر بنـەڕەتی ئەو جياوازيـەی هەيە لە ناوەكـەياندا، بۆيـە دانەريش لـە دو تـۆی ژمـاردنی چوار ڕوكنەكەدا باسی كردن و ووتی:

(٣) يەكـەميان: ئەصڵـە، كـە بريتيـە لـە شـوێنی حوكمەكـە - خـەمر، حوكمەكـەی حورمەتـە - ئـەو شـوێنەی كـە شـتی پێـوە ئەشـوبهێنرێ ، واتـە: قيـاس لەسـەر كراوەكەيـە ، هـەندێكی تـر ووتويانـە : ئەصڵەكـە بريتيـە لـە بەڵگـەی حوكمەكـە ، گروپێكی‌تر ووتويانە: بريتيە لە حوكمی شوێنی حوكمەكەيـە - ضمـرت لەمـەودواش دێت - كە ئەڵێ: فەرع و لق بريتيە لەو شوێنە كە ئەشوبهێنرێ بەشتی‌ترەوە-نەبيذ-.

وَ قِيلَ: حكمه ولا يتأتي في قول بانه دليل الحكم كيف ودليله القياس فالاول مبني على الأول والثاني مبني على الثالث وكذا على الثاني لانه اذا صح تفرع الحكم عن الحكم صح تفرعه عن دليله لاستناد الحكم إليه[1].

وكل من هذه الأقوال التي في التسمية لا تخرج عما في اللغة من أن الاصل ما ينبني عليه غيره والفرع ما ينبني على غيره والاول من الاقوال فيهما اقرب كما لا يخفى ولكون حكم الفرع غير حكم الاصل باعتبار المحل وان كان عينه بالحقيقة صح تفرع الاول على الاثني باعتبار مايدل عليهما وعلم المجهد به لا باعبتار مافي نفس الامر فان الاحكام قديمة ولا تفرع في القديم[2].

---

(١) هەندێك وتويانە: بريتيە لە حوكمەكەی ئەو قەولەی تێدا نەهاتوە كە بڵێ بريتيە لە دەليلی حوكمەكە، چۆن دەبێ وا بڵێ خۆ دەليلی حوكمی فەرعەكە كە هەر خودی قياسەكەيە، قەولی يەكەمی فەرعەكە لەسەر قەولی يەكەمی ئەصڵەكە دروست بووە، قەولی دووهەمی فەرعەكەش لەسەر قەولی سێ هەمی ئەصڵەكە سەوز بووە. وەهەروەها دروستيشە لەسەر قەولی دوهەمەكە دروست بوبێ، چونكە كاتێ سەوزبونی پەيدابونی حوكمی فەرعەكە ڕاست بێ لە حوكمی ئەصڵەكەوە پەيدا بو بێ باشتر دروستە پەيدابوون و سەوزبوونی حوكمی فەرعەكە لە دەليلی حوكمەكەوە، چونكە لە ئەصڵەكەشدا حوكم ئەدرێتە پاڵ دەليلەكەی.

(٢) هەريەكێ لەم قەولانەی لەبارەی ناونانی ئەم دوو ڕوكنەوە هەبوو دەرناچێ لەوەی مانا لۆغەويەكەی ئاماژەی پێ دەكا، كە ئەويش ئەوەيە لەسەر غەيری خۆی دروست بكرێ، لەسەر بنەڕەتەكە نرابێ. قەولی يەكەم لە هەردوكياندا لەناو هەموو قەولەكاندا نزيكترە لەمانا لۆغەويەكەوە، ئەمەش شتێكی شاراوە نيە لەسەر كەس پرسيار دەكرێ: حوكمی هەردوكيان يەك حوكمە كە حورمەتە ئيتر بۆ هەريەكێ شتێكی پێ دەوترێ ؟ لەبەر ئەوەی حوكمی فەرعەكە لە حوكمی ئەصڵەكە جيايە بە گوێرەی شوێن، هەرچەند يەكيشن لە حەقيقەتدا دروست بووترێ حوكمی فەرعەكە لە حوكمی ئەصڵەكەوە پەيدا دەبێ، بەگوێرەی ئەوەی دەلالەت دەكا لە سەر حوكمی ئەصڵ و فەرعەكە نەك بە گوێرەی واقع و نەفسول ئەمر، چونكە لە شتی قەديميدا تەفەروع نيە، وە بە گوێرەی عيلمی موجتەهيدەكە، لەيەكەمدا وەك ئەو ئايەتەی خەمر، بۆ دوو هەميش وەك قياس، چونكە بە گوێرەی نەفسول ئەمرو ئەحكامەكان هەمويان قەديمن، شتی قەديميش پێش و پاشيان نابێ تێدابێ .

{ولا يشترط} في الاصل الذي يقاس عليه {دال على جواز القياس عليه بنوعه او شخصه ولا اتفاق على وجود العلة فيه خلافاً لزاعميهما} بالتثنية اي زاعم اشتراط الاول وهو عثمان البتّي وزاعم اشتراط الثاني وهو بشر المريسي فعند الاول لا يقاس في مسائل البيع مثلاً إلاّ اذا قام دليل على جواز القياس فيه وعند الثاني لا يقاس فيما اختلف في وجود العلة فيه بل لا بد بعد الاتفاق على ان حكم الاصل معلل من الاتفاق على ان علته كذا وما اشترطاه مردود بانه لا دليل عليه[1].

{الثاني} من اركان القياس {حكم الأصل ومن شرطه ثبوته بغير القياس قيل والاجماع} اذ لوثبت بالقياس كان القياس الثاني عند اتحاد العلة لغوا للاستغناء عنه بقياس الفرع فيه على الاصل في الاول وعند اختلافها غير منعقد لعدم اشتراك الاصل والفرع فيه في علة الحكم[2].

(١) ئەصڵێك كە قیاسی لەسەردەكرێ بەمەرج نەگیراوە شتێك هەبێ دەلالەت بكا لەسەر ئەوەی دروستە قیاسی لەسەر بكەی، چ جۆری ئەو ئەصڵە یاخود شەخص و خودی ئەو ئەصڵە، وەبەمەرجیش نەگیراوە ڕای هەمووان لەسەر ئەوەبێ فلانە عیلەتی تێدا هەبێ، واتە ئەوەیان بۆ ئەو دوزانایەی كەوایان زانیوە ئەم دوشتە بە مەرج گیراون، واتە ئەوەیان وای زانیوە یەكەمیان بەمەرج گیراوە ئەوە عوسمانی بەتتیە، دوەمیشیان وای زانیوە دوهەمیان بەمەرج گیراوە ئەوە بشری مریسی‌یە، جابەلای یەكەمیانەوە بۆ نمونە لەبابەتەكانی كڕین و فرۆشتن دا قیاس ناكرێ، مەگەر بەڵگەیێك هەربابێ و دەلالەت بكا لەسەر ئەوەی كە قیاس دروستە تێدا. بەلای دوهەمیشیانەوە قیاس ناكرێ لە شتێكدا كە ڕای زانایان جیاوازبێ لەبونی عیلەتِ تێدا، بەڵكو پێویستە دوای یەككگرتنی ڕای هەموان لەسەر ئەوە كە حوكمی ئەصڵەكە عیلەتی بۆ هێنراوەتەوە، تعبدی نیە، وە یەككگرتنێكی تریش هەبێ كە عیلەتی حوكمی ئەو ئەصڵە فلانە شتە. ئەوەی ئەو زانایانە بەمەرجیان گرت بەرپەرچ دراوەتەوە بەوە كەبەڵگەی لەسەر نیە.

(٢) ڕوكنی دوهەمی قیاس بریتیە لە حوكمی ئەصڵەكە، یەكێ لەمەرجی حوكمی ئەصڵ ئەوەیە ئەوحوكمە بەقیاس ثابت بوبێ، هەندێكی‌تر وتویانە :هەم بەاجماعیش ثابت نەبوبێ، چونكە ئەگەر بەقیاس ثابت بوبێ ئەوە قیاسی دووەم لەغوزیادە دەچێ لەكاتی بەیەكبونی عیلەتەكەیاندا،چونكە بەهۆی قیاسی فەرعەكەوە لەسەر ئەصڵەكە لەقیاسی یەكەمدا پێویست بە قیاسی دووەم نابێ، وەكاتێ عیلەتەكانیان جیاوازبن لە یەك قیاسەدا نامەزرێ،چونكەئەصڵ وفەرعەكە لەعیلەتی حوكمەكەدا هاوبەش نین.

مثال الاول قياس الغسل على الصلاة في اشتراط النية بجامع العبادة ثُمَّ قياس الوضوء على الغسل فماذكر وهو لغو للاستغناء عنه بقياس الوضوء على الصلاة ومثال الثاني قياس الرتق وهو انسداد محل الجماع على جب الذكر في فسخ النكاح بجامع فوات الاستمتاع ثُمَّ قياس الجذام على الرتق فيما ذكر وهو غير منعقد لان فوت الاستمتاع غير موجود فيه(٢) والقول بأنه لا يثبت حكم الأصل بالاجماع إلاّ أن يعرف مستنده النص ليستند القياس إليه مردود بأنه لادليل عليه نعم يحتمل ان يكون الاجماع عن قياس و يدفع بأن كون حكم الاصل حينئذٍ عن قياس مانع في القياس والاصل عدم المانع(٣){وكونه غير متعبَّد فيه بالقطع} كما ذكره الغزالي لأن ماتعبد فيه بالقطع انما يقاس على محله مايطلب فيه القطع أي اليقين العقائد والقياس لايفيد اليقين، واعترض بأنه يفيده اذا علم حكم الاصل وما هوالعلة فيه ووجودها في الفرع(٤)

---

(١) نمونه بۆ یەکەمیان : قیاسی خۆشۆردن بکرێتە سەر نوێژ لە بەمەرج گرتنی نیەتدا، بەهۆی عیلەتێکەوە کە لە هەردوکیاندا هەیە کە عیبادەت و پەرستنە پاشانیش قیاسی دەست نوێژ بکرێتە سەر خۆشۆردن لەوەی پێشوودا کەمەرجی نیەتە بەهۆی عیبادەتەوە ، ئەو قیاسی دەست نوێژە لەسەر خۆشۆردنە بەتاڵە چونکە پێویستمان پێ نیە ، بەهۆی ئەوەوە ئەتوانین هەر لە ئەوەڵەوە قیاسی دەست نوێژ بکەینە سەر نوێژ.

(٢) نمونەی دوهەم قیاسی ئافرەتێك کە جێ جماعی گیرابێ بکرێتە سەر پیاوێك هینەکەی براب لە هەڵوەشاندنەوەی نیکاحدا ، بەهۆی عیلەتێکەوە کۆکەرەوەی هەردودیان بێ، کەلەدەست دانی لەزەت وەرگتبێ لەیەکتر، پاشانیش قیاسی گوێ بکرێتە سەر ئافرەتە پێشوەکە لە پوچەڵ کردنەوەی نیکاحدا ، ئەو قیاسە دانامەزرێ چونکە لە دەست دانی لەزەت وەرگرتنی تێدا نیە.

(٣) ئەو قسەی کە دەڵێ: حوکمی ئەصڵ ثابت نابێ بە اجماع مەگەر بزانرێ سەنەدەکەی دەقێکە بۆ ئەوەی قیاسەکەی بدرێتە پاڵ ، ئەم قسەش بەرپەرچ دراوەتەوە، بەوە کە ئەمیش بەڵگەی لەسەر نیە ، بەڵێ، هەڵدەگرێ کە اجماع بەڵگەکەی قیاس بێ، ئەمیش دەبرێتە دواوە بەوە کەلەم کاتەدا سەرچاوەی حوکمی ئەصڵەکە قیاس بێ رێگرە لە قیاس ، ئەصڵیش وایە مانع و رێگر نەبێ

(٤) مەرجێکی تر ئەوەیە حوکمی ئەصڵەکە مرۆڤ تەکلیف نەکرابێ بێ گومان باوڕی پێ هەبێ. وەك غەزالی باسی کردووە ، چونکە ئەوەی تەکلیف کرابێ بە یەقین بڕوای پێ هەبێ ئەوە قیاس لەسەر شوێنەکە دەکرێ، کەداوای یەقینی و بێ گومانی

{و} كونه {شرعيا ان استلحق} حكما {شرعيا} بأن كان المطلوب اثباته ذلك فإن لم يستلحقه بأن كان المطلوب اثباته غير ذلك بناء على جواز القياس في العقليات واللغويات فلا يشترط ان يكون حكم الأصل شرعيا بمعنى انه يكون غير شرعي و لا بد فإنَّهُ غير الشرعي لا يستلحقه إلاّ غير شرعي كما ان الشرعي لا يستلحقه إلاّ شرعي[1].

ولما ذكر الآمدي وغيره هذا الشرط بناء على امتناع القياس في العقليات واللغويات كما صرحوا به زاد المنصف فيه القيد المذكور ليبقى على شرطيته مع جواز القياس فيها المرجح عنده[2].

---

. دەكرێ ، وەك عەقیدەو بڕوا ، قیاسیش یەقین ناگەیێنێ. ڕەخنە گیراوە لەم قسەیە ، كە قیاس یەقین دەگەیێنێ ، بەم سێ مەرجە:١- كاتێ حوكمی ئەصڵەكە بێ گومان بزانرێ. ٢- عیلەتی حوكمی ئەصڵەكەش بزانرێ. ٣- خودی ئەو عیلەتە لە فەرعەكەشدا هەبێ

(١) مەرجێكی تر ئەوەیە حوكمی ئەصڵەكە ئەبێ شەرعی بێ ، واتە كاتێ دەبێ شەرعی بێ كە داوای ئەوە بكا حوكمێكی تری شەرعی بەشوێن خۆیدا بێنێ ، بەم شێوەیە ئەوە مەبەست بێ كە ئیسباتی ئەو حوكمە شەرعیە بكرێ بۆ فەرعەكەش ، جا ئەگەر حوكمی فەرعەكەشی بەدوای خۆیدا نە ئەهێنا ، بەم شێوە مەبەست سەلماندنی غەیری حوكمی شەرعی بوو لەسەر ئەو ئەساسە كە گوایە قیاس دروستە لە كاروباری عەقڵی و لۆغەویدا ئەوە بە مەرج نەگیراوە حوكمی ئەصڵەكە شەرعی بێ ، بەم مانایە كە حوكمەكە حوكمێكی غەیرە شەرعیە ، واتە عەقڵی و لۆغەویە ، چونكە حوكمی غەیرە شەرعی هەر حوكمی غەیرە شەرعی شوێنی دەكەوێ، وەك ئەگەر حوكمی ئەصڵەكە شەرعی بێ حوكمی فەرعەكەش هەر شەرعی دەبێ، چونكە فەرعەكە شوێن كەوتەی ئەصڵەكەیە ، ئەو حوكمەكەی چۆن بێ ئەمیش وادەبێ.

(٢) كاتێ كە ئامیدی و غەیری ئامیدیش ئەم مەرجەیان باس كردووە لەسەر ئەو ئەساسەی كە قیاس لەكاروباری عەقڵی و لۆغەویدا نابێ ، وەك خۆیان بەڕونی ئەم دروست نەبونەیان دەربڕیوە لەبەر ئەوە دانەر ئەو قەیدە پێشووەی زیاد كردووە ، بۆ ئەوەی هەر لەسەر ئەوە بمێنێتەوە كەبەمەرج گیراوە حوكمی فەرعیش بۆ فەرعەكە بە شوێن خۆیدا بێنێ ، لەگەڵ ئەوەش دروستە قیاس لە كاروباری عەقڵی و لۆغەویدا كە راجح ئەوەیە بەلای دانەرەوە .

{و} كونه {غير فرع اذا لم يظهر للوسط} على تقدير كونه فرعا {فائدة} فان ظهر جاز كونه فرعا {وَ قِيلَ } يشترط كونه غير فرع {مطلقا}[١] و إلاّ فالعلة في القياس اتحدت كان الثاني فلغوا اواختلفت كان الثاني غير منعقد كما تقدَّمَ ودفع المصنِّف بانه قد يظهر للوسط الذي هو الفرع في الاول والاصل في الثاني مثلاً فائدة كما يق التفاح ربويٌ قياسا على الزبيب بجامع الطعم والزبيب ر بوى قياسا على التمر بجامع الطعم مع الكيل والتمر ر بوى قياسا على الأرز بجامع الطعم والكيل مع القوت و ربوى قياسا على البر بجامع الطعم والكيل والقوت الغالب ثُمَّ يسقط الكيل والقوت عن الاعتبار بطريقه فيثبت ان لاعلة الطعم وحده وان التفاح ر بوى كالبر ولو قيس ابتداء عليه بجامع الطعم لم يسلم ممن يمنع علته فقد ظهر للوسط بالتدريج فائدة وهي السلامة من منع عليه الطعم فماذكر فتكون تلك القياسات صحيحة بخلاف ما لو قيس التفاح على السفرجل والسفرجل على البطيخ والبطيخ على القثاء والقثاء على البر فإنَّهُ لا فائدة للوسط فيها لأن نسبة ماعد البر إليه بالطعم دون الكيل والقوت[٢].

(١) مەرجێكى تر ئەوەیە حوكمی ئەصڵەكە فەرع نەبێ بۆ شتێكی تر ، ئەمە كاتێ وایە كە ئەگەر كەوتە ناوەڕاستەوە با بە شێوەیەكی تر بڵێین : بوو بە فەرع هیچ سودێكی لێ دەرنەكەوێ ، بەڵام ئەگەر هاتوو سودێكی هەبوو ئەوە دروستە ببێ بە فەرع بۆ پێشی خۆیو خۆیشی ببێ بە ئەصڵ بۆ دوای خۆی، هەندێك ووتویانە: سود بەخش بێ یانە هەر بەمەرج گیراوە دەبێ فەرع نەبێ .

(٢) ئەگەر بە مەرج نەگیرێ كەئەصڵەكە فەرعی شتێكی تر نەبێ ئەوە عیلەتەكە لەم دو قیاسەدا ئەگەر یەك بێ ئەوە قیاسی دوهەم لەغوپوچەڵە، ئەگەر عیلەتەكەی جیاوازبن ئەوە قیاسی دوهەم دانامەزرێ وەك لە پێشەوە ڕابورد، دانەریش ئەو قسەی بردوەتە دواوە بەم شێوە كە دەڵێ: جاری وا هەیە ئەو قیاسە ناوەڕاستەی دەبێتە فەرع لە قیاسی یەكەمدا وەلە دوهەمیشدا دەبێتە ئەصڵ سودی دەبێ، وەك دەووترێ سێو شتێكە سوی تێدایە، چونكە قیاس دەكرێتە سەر مێوژ ، بەهۆی عیلەتێكەوە لە هەردوكیاندا هەیە ، كەتام و كێشانەیە لەگەڵ بژێویدا ، برنجیش شتێكە سوی تێدایە ، چونكە قیاس دەكرێتە سەر گەنم، بەهۆی عیلەتێكەوە كە لەهەردوكیاندا هەیە كەتام و كێشانەو بژێویكی زاڵەو زۆربەی بژێوی خەڵك ئەوە، پاشان بە گوێرەی ڕێبازی كامیان كەڵكی زۆرە لە پێشترە كێشانەو بژێویەكە لادەبرێ ، ئەمجا دەسەلمێنرێ كە عیلەتەكە تەنها تامەكەیە ، وە سێوەكەش شتێكەسوی تێدایە وەك گەنم وایە بەڵام ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بووترایە سێو وەك گەنم وایە بە هۆی ئەوەوە یەك

نعم اعترض على المصنِّف بأن في قوله هنا مع قوله قبيل ومن شرطه ثبوته بغير
قياس تكرارا واجاب بقوله لا يلزم من اشتراط كونه غير فرع ثبوته بغير القياس لأنه
د يثبت بالقياس ولا يكون فرعا للقياس المراد ثبوت الحك فيه وان كان فرعا لأصل
حر وكذلك يلزم من كونه غير فرع أن لا يكون ثابتا ابالقياس لجواز أن يكون ثابتا
ـقياس ولكنه ليس فرعا في هذا القياس لاذي يراد اثبات الحكم فيه اهـ[1]. ولا يخفى
ـ هذا الكلام المشتمل على التكرار لا يدفع الاعتراض وكيف يندفع والمدرك واحد
ـما تقدَّمَ[2].

ـيـەتیان هەیە کە تامە نەدەسەلمێنرا لەلایەن ئەوانەوە کە قەبوڵ ناکەن طعم و
ـم بە عیلەت حسێب بکرێ ، لەبەر بێ گومان بۆ قیاسی ناوەڕاست وردە وردە
ـودەکەی دەرکەوت ، کە بریتیە لە ڕزگاربوون لەوەی قەبوڵی عیلیەتی طعم نەکرێ لە
ـیابونی ئەوانەدا کەباس کران ، کەوابو ئەو هەموو قیاسانە دروست و بەجێن . بەلاّم
ـە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر قیاسی سێو بکرێتە سەر بەهێ ، بەهێش لەسەر کاڵەك ،
ـکاڵەکیش لەسەر خیار، خیاریش لەسەر گەنم ، ئەوە هیچ سودێك لە ناوەڕاستەکاندا
ـیە نیسبەت دانی غەیری گەنم بۆ لای گەنم بەهۆی ئەوەوە کەوەك گەنم تامو کێشانە
ـ ژیواریان تێدایە .

(١) بەڵێ ڕەخنەیێك لەسەر قسەکەی دانەر گیراوە کە: ئەم قسەی ئێوەیە لەگەڵ قسەکەی پێشتر کە وتی : مەرجێکی تری حوکمی ئەصلْ ئەوەیە بە قیاس ثابت نەبوبێ ، ئەمە دوبارە بونەوەیە . دانەریش وەلاّمی داوەتەوە و ئەڵێ : لازم ناکا کە وتت حوکمی ئەصلْ دەبێ فەرعی شتێکی تر نەبێ دەبێ ثابت بونەکەش بە غەیری قیاس بێ ، چونکە جاری وا هەیە بە قیاس ثابت دەبێ و فەعی ئەو قیاسەش نیە کەدەتەوێ حوکمەکەی بۆ ثابت کەی، هەرچەند فەرعیش بێ. هەروەها لازم ناکا کە وتت فەرع نەبێ واتە بە قیاس ثابت نەبوبێ ، چونکە ئەگونجێ بەقیاس ثابت بوبێ ، بەلاّم فەرع نیە بۆ ئەم قیاسەی دەتەوێت حوکمەکەی بۆ بسەلمێنی .

(٢) شاراوە نیە لەسەر کەس کە ئەم وەلاّمی دانەرە کە وتی : لایلزم،وکذلك لایلزم، کە دوو جار دوبارەی کردەوە ڕەخنەکەی نەبردە دواوە، چونیشی بەرێتە دوواوە کە هەریەك عیلەتیان هەیە ، وەك لەپێشەوە ڕابورد- وتی: عیلەتی هەردوو قیاسەکە ئەگەر یەکبن ئەوە قیاسی دووەم لەغوە ، وەئەگەر جیاش بن ئەوە قیاسی دووەم دامەزراو نیە-.

وقد اقتصر الامام الرَّازي تبعه على المقول أولا والامدي ومن تبعه على المقول ثانيـ اعني كونه غير فرع فجمع المصنِّف بينهما من غير ـامل واستروح بما أجاب بـه وتقييده للثاني بما اذا لم يظهر للوسط فائدة أخذاً من كلام الجويني في السلسلة كمـ بينه في شرح المختصر لاطائل تحته وعلى تقدير اعتباره فكان ينبغي حمل اطلاقهـ عليه لا ان يحكي بقيل ويصرح فيه بمطلقا وهم لم يصرحوا به[٢] {وان لا يعدل عـ سنن القياس} فما عدل عن سننه اي خرج عن منهاجه لالمعنى لايقاس على محـ لتعدر التعيدية حينَئذٍ كشهادة خزيمة قال ﷺ: من شهد له خزيمة فحسبه فلا يثبت هذا الحكم لغيره وان كان أعلى منه رتبة في المعنى المناسب لذلك من التدين والصدق كالصديق ﷺ وقصه شهادة خزيمة ﷺ رواها أبوداود وابن خزيمة[٣]..

---

(١) پێشەوا ڕازی و شوێن کەوتوانی تەنها مەرجی یەکەمیان وتووە ، ئامێدی و قوتابیانی تەنها مەرجی دوهەمیان وتووە کەئەوەیە فەرع نەبێ بۆ ئەصڵێکی‌تر بەڵام دانەر هەردو کۆکردوەتەوە بۆ ئەوەی بە قوڵی بیری لێ بکاتەوە کە هەردوکیـ هەریەکن، کە پێیان وتوە ئەمە تیکراره ، دڵی خۆی بەو وەڵامەی پێشەوە ڕازی کردووە .

(٢) دانەر ئەم ڕستەیە لکاند بە مەرجی دووەمەوە کە ئەڵێ : کاتێ بۆ قیاسی ناوەڕاست سودێك دەرنەکەوێ ، ئەمەش لە قسەکانی جوێنیەوە وەرگرتووە لە کتێبی (السلسلة الذهبیة) دا، وەك دانەر خۆی لە کتێبی : (شرح المختصر)دا وتوویەتی ئا ئەم مەرجەش هیچ سودێکی نیە ، ئەگەر وا دابنێین سودیشی هەبێ دەبوایە قسەی زانایانی تریش هەر بڕیاییێ بەسەر ئەم مەرجەدا ، نەك ئەوەی بە قیل بووترێ و بڵێ (وقیل مطلقاً) بە ڕون و ڕەوانی دەڵێن : مطلقاً، لەگەڵ ئەوەش ئەو زانایانە نەیاز وتوە مطلقاً ، وەك ئامێدی وتویەتی، تەنها دانر وتویەتی بەدەم ئەوانەوە مطلقاً .

(٣) مەرجێکی تر ئەوەیە حوکمی ئەصڵەکە لە یاساو پەیڕەوی قیاس دەرنەچێ . هەر حوکمێك لە یاساکانی قیاس دەرچێ نەك لەبەر عیلەت و مانایەکی مەبەست ئەوە قیاس لەسەر شوێنی ئەو حوکمە ناکرێ ، چونکە ڕێگرێك هەیە لەم کاتەدا نایەڵێ حوکمەکە بگوێزرێتەوە ، – نەزانینی عیلەتەکەیە – وەك گەواهی دانی خوزەیمە. پێغەمبەر فەرمووی : هەرکەس خوزەیمە گەواهی بۆ بدا ئەوە ئیتر بەسیەتی ، کەسی تری ناوێ لەباتی دوان حسیبە ، لەبەرئەوە ئەم حوکمە ناسەلمێنرێ بۆ غەیری خوزەیمە، هەر چەند غەیرەکەش پلەی لە خوزەیمە بەرزتربێ لەو مانایەدا کە موناسەبەی هەیە بەو وەرگرتنی گەواهی دانەی تەنها خوزەیمە خۆی ، کە ئاین

وحاصلها ان النبيَّ ﷺ ابتاع فرسا من اعرابي فجحده البيع وقال هلم شهيدا يشهد عى فشهد عليه خزيمة بن ثابت اي دون غيره فقال له النبيﷺ ما حملك على هذا ولم كن حاضرا معنا فقال صدقتك فما جئت به وعلمت انك لا تقول إلاّ حقا فقالﷺ: ـحملك على هذا ولم تكن حاضرا معنا فقال صدقتك فما جئت به وعلمت انك لا تقول ‌ حقا فقال ﷺ من شهد له خزيمة او شهد عليه فحسبه هذا الفظ ابن خزيمة ولفظ ابي ـود فجعل النبيَّ ﷺ شهادته شهادة رجلين وذكر أهل السير ان ذلك الفرس هو المسمى ‌ خيل النبيِّ ﷺ بالمرتجز لحسن صهيله[1] {و} ان {لا يكون دليل حكمه} اي الاصل ‌ـاملا لحكم الفرع} للاستغناء حينَئِذٍ عن القياس بذلك الدليل على انه ليس جعل ‌عض الصور المشمولة اصلا لبعضها بأولى من العكس[2].

‌ـەروەریـە و ڕاسـت گۆییـە، وەك ابـو بکـری صدیـق ، خـوای لێ ڕازی بـێ ، ئـەم ‌ـەرگوزەشتەی گەواهی دانـی خوزەیمەیە خـوای لێ ڕازی بـێ ابـوداود ابـن خوزەیمـە ‌ڕیوایەتی دەکەن .

(١) پاڵفتـەی گوزەشتە ئەمەیە : پێغەمبـەرﷺ، ئەسپێکی لە گونـد نشـینێك کـڕی ، ‌ئەمجا انکاری فرۆشتنەکەی کرد ووتی : شاهیدێکم بۆ بێنە باشاهیدی بدات لەسەر من و بەزیانی من ، یەکسەر خوزەیمەی کوڕی ثابت تەنها خۆی شاهیدی لەسەر دا بێ ‌ـەوەی شاهیدی بدات ، ئەمجا یەکسەر پێغەمبەر فەرموی پـێ‌ی:چـی هـەڵینای ئـەم شاهیدیە بدەیت خۆتۆ لەگەڵمان نەبویت بۆ مامەڵەکە ، خوزەیمە ووتی: من بڕوام پـێ کردوی لەهەموو ئەو پەیامەدا پێ هاتویت، وە زانیومـەو بڕوام هێناوە جگە لە حـەق نەبێ شت ناڵێیت و هـەواڵ نـادەیت ، ئەمجا پێغەمبـەر فـەرمووی: هەرکـەس خوزەیمـە شاهیدی بۆ بدات یاخود شاهیدی لەسەر بدات ئەوە بەسیەتی و کەسـیتری ناوێ، ئەمە لەفظی ریوایەتەکەی خوزەیمە بوو لەفظەکەی ابو داودیش ئەمەیە : پێغەمبەر گەواهی دانـی خوزەیمـەی کردووە بە گەواهی دانـی دوو پیـاو. زانایانی ژیاننامـەکان باسیان کردووە کەئەو ئەسپە لەناو ئەسپەکانی پێغەمبەرداﷺ ، ناودەبرابە : (مرتجز)، سرودبێژ لەبەر خۆشی حەیلاندنەکەی .

(٢) مـەرجێکی تـر ئەوەیە بەڵگەی حوکمـی ئەصڵەکە گشت گیر نـەبێ بـۆ حوکمـی فەرعەکەش ، چونکە لـەو کاتـەدا بەهۆی ئەو بەڵگەوە پێویسـتمان بـە قیـاس نـابێ ، وەهـەندێ لـەو دیمەنانـەش ئـەو بەڵگەیـە دەیـان گرێتـەوە ناکرێنـە ئەصڵ بـۆ هـەندێکی تریان چونکە هـەموو وەك یـەك وان ئـەمیان لـەوی تریـان چاکتر نیە تا ئـەم بکـرێ بـە ئەصڵ و ئەو بەپاشکۆ .

مثاله ما لو استدل على ربوية البر بحديث مسلم الطعام بالطعام مثلاً بمثل ثُمَّ قيس عليه الذرة بجامع الطعم فان الطعام يتناول الذرة كالبر سواء و سيأتي من شروط العلة أن لا يتناول دليلها حكم الفرع بعمومه أو خصوصه على المختار[٢] .

فمقابله المبني على جواز دليلين على مدلول واحد كما سيأتي لا يتأتي هنا كما يفهم من العلاوة السابقة في التوجيه واتى المصنّف بالظاهر بدل الضمير الراجع الى حكم الاصل المحدث عنه في قوله دليل حكمه وفي قوله[٣].

---

(١) نمونەکەش ئەوەیە ئەگەر گریمان بەڵگە هێنرایەوە بۆ ئەوەی بسەلمێنرێ کە گەنم سووی تێدایە بەو فەرموودەیە کە موسلم ڕیوایەتی دەکاو دەفەرموێ: طەعام بفرۆشرێ بە طەعام دەبێ وەکو یەك وابن ، جا پاشان قیاسی گەنمەشامیش بکرێتەسەری بەهۆی ئەو عیلەتەوە کە گوایە هەردوکیان طەعامن ، چونکە طەعام گەنمە شامیش دەگرێتەوە وەك گەنم چۆن یەکن فەرموودەکە دەیان گرێتەوە ، ئیتر قیاسی بۆچیە کە فەرمودەکە بیگرێتەوە.

(٢) لەمەو دوا دێ کەدەڵێ : یەکێك لەمەرجەکانی عیلەت ئەوەیە بەڵگەکەی دەبێ حوکمی فەرعەکە نەگرێتەوە ، چ بەهۆی ئەوەوە بێ کە بەڵگەکە گشت گیرە ئەمانیش و غەیری ئەمانیش دەگرێتەوە ، یاخود هەر تایبەتە بەم ئەصڵ و فەرعەوە ئەمەش لەسەر قەولی هەڵبژاردەی ناو قەولەکان، واتە ئەو باسەی ئەوێ لەگەڵ ئێرە جیاوازن ، لەوێ جیاوازی هەیە لەسەری ، بەڵام لێرە وای باس دەکا کە جیاوازی تێدا نیە .

(٣) کە ووترا قەولی هەڵبژاردە مانای وایە بەرانبەریشی هەیە ، جابەرانبەرەکەش لەسەرئەو شێوە بۆچونە دروست کراوە کە دەڵێ : دروستە دو بەڵگە لەسەر یەك شت بهێنرێتەوە ، وەك لەمەودوادێ، ئەوە بۆ ئێرە دەست ناداو بۆ ئێرە نابێ، ئەم دەست نەدانەش لە عەلاوە پێشینەکەوە وەردەگیرێ ، کە ووتی: (على انه ليس جعل الصور الثمولة) ... لەکاتی بەڵگە هێنانەوەکە لەسەر ئەوەی دەلیلی حوکمی ئەصڵەکە نابێ حوکمی فەرعەکەش بگرێتەوە دانەر لەباتی ضەمیر اسمی ظاهری هێناوە، لەوەدا کەدەڵێ: (دليل حكمه) لەگەڵ: (وكون المكر) دەبوایە بیوتایە : دليلە، ياكونە. ضەمیرەکە بگرێتەوە بۆ حوکمە ئەصڵەکە، چونکە باس باسی ئەوە، لەو دەدوێین و گفتوگۆ ئەکەین هەر بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە .

{وكون الحكم} اي في الاصل {متفقا عليه} والافيحتاج عند منعه الى اثباته فينقل في مسئلة اخرى وينتشر الكلام ويفوت المقصود[1]{قيل بين الأمة} حتى لا يتأتي منع بوجه {والأصَحُّ بين الخصمين} فقط لان البحث لا يعدوهما[2].

{و} الأصَحّ {انه لا يشترط} مع اشتراط اتفاق الخصمين فقط {اختلاف الأمة} غير الخصمين في الحكم بل يَجوزُ اتفاقهم فيه كالحمين وَ قِيلَ يشترط اختلافهم فيه ليتأتي للخصم الباحث منعه فإنَّهُ لا مذهب له[3] {فان كان الحكم متفقا} عليه {بينهما ولكن لعلتين مختلفتين}[4].

(١) وەهەم دەبێ بونی حوکمی ئەصڵەکە هەموو لایێك لەسەری کۆبن ، چونکە ئەگەر هەموویان ڕایان لەسەر نەبێ کاتێ یەکێکیان قەدەغەی دەکا پێویست دەکا بۆی بسەلمێنی ، یەکسەر بابەتەکە دەگۆڕی بۆ شتێکی تر، کە سەلماندنی حوکمی ئەصڵەکەیە ، گوفتوگۆ کەبلاۆە دەکا و مەبەستەکە لەدەست دەچێ، کەسەلماندی حوکمی فەرعەکە بوو.

(٢) هەندێ ووتویانە: دەبێ هەموو ئۆمەت لەسەری کۆبن ، بۆئەوەی لە هیچ لایێکەوە ڕێ گری ڕوی تێ نەکا. قەولی اصح و ڕاست تر ئەوەیە : هەردولایەنە ناکۆکەکە لە نێوان خۆیاندا یەك ڕابن لەسەری و بەس ، چونکە باس و لێکۆڵینەوەکە لەنێوان ئەواندایە و لەوانەوە زیاتر ناڕوا .

(٣) قەولی اصح و ڕاست تر ئەوەیە بەمەرج نەگیراوە ئۆمەت ڕایان جیاوازبێ لە حوکمەکەدا لەگەڵ ئەوەش بەمەرج گیراوە دو لایەنە ناکۆکەکە یەك دەنگ بن لەسەری و بەس، نەك ئەوەش بەڵکو دەست ئەدا لە حوکمی ئەصڵەکەدا هەموو ئۆمەت یەك دەنگ بن وەك دو لایەنە ناکۆکەکە ، هەندێکی تر ووتویانە: بەمەرج نەگیراوە هەموو ئۆمەت لە حوکمی ئەصڵەکەدا ڕای جۆراو جۆریان هەبێ ، بۆ ئەوە ئەو لایەنە ناکۆکە کە باس و لێکۆڵینەوە دەکا بۆی دەست بدا کە مەنعی حوکمی ئەصڵەکە بکا، چونکە مادەم باس و لێکۆڵینەوە دەکا ئەوە مەذهەب و پەیڕەوێکی تایبەتی نیە لەسەری بڕوا [1].

(٤) جا ئەگەر حوکمەکە یەك حوکم بوو بەڕای هەردولا ، بەڵام عیلەتی هەر یەکێکیان لەوی‌تر جیاواز بوو.

---

(١) لەکاتی باس و لێکۆڵینەوەدا ، بەڵام لە ڕوی کارەوە پەیڕەوێکی هەیە کارو پەیڕەوی بکا .

كما في قياس حليّ البالغة على حليّ الصبية في عدم وجوب الزكاة فان عدمه في الاصل متفق عليه بيننا وبين الحنفية والعلة فيه عندنا كونه حليا مباحا وعندهم كونه مال صبية[1] {فهو} اي القياس المشتمل على الحكم المذكور {مركب الاصل} سمي بذلك لتركيب الحكم {فيه} اي بنائه على العلتين بالنظر الى الخصمين[2] .

{او} كان لحكم متفقا عليه بينهما {لعلة يمنع الخصم وجودها في الاصل} كما في قياس ان تزوجت فلانه فهي طالق على فلانه التي اتزوجها طالق في عدم وجوب الطلاق بعد التزوج فان عدمه في الاصل متفق عليه بيننا وبين الحنفية والعلة تعليق الطلاق قبل ملكه والخفي يمنع وجودها في الاصل ويقول هو تنجيز[3] {فمركب الوصف} سمي القياس المشتمل على الحكم المذكور بذلك لتركيب الحكم فيه اي بنائه على الوصف الذي منع الخصم وجوده في الاصل[4].

---

(١) وەك قياسی خشڵی كچێكی پێگەیشتو بكرێتە سەر خشڵی كچۆڵەیێك لە واجب نەبونی زەكاتدا، واجب نەبونی زەكاتەكە اتفاقی لەسەرە لە نێوان ئێمەو زانایانی حەنەفیدا ، بەڵام هەر یەكەمان عیلەتێكی هەیە، بەلای ئێمەوە عیلەتی واجب نەبونەكە ئەوەیە كە خشڵی حەلاڵە ، بەلای زانایانی حەنیفیشەوە بۆیە واجب نیە مالی كچۆڵەیێكی تەكلیف لێ نەكراوە .

(٢) جا ئەو قیاسەی كە ئەو حوكمەی باسكرا تێدابێ ئەوە پێ دەوترێ مركب الاصل، بۆئەوەش پێ دەوترێ چونكە حوكمەكەی لەسەر دو عیلەت دروست كراوە بەڵام هەر عیلەتێ بەگوێرەی هەر یەك لەو دو لایەنەیە كەنەیاری یەك بن .

(٣) یاخود لە نێوان هەردوكیاندا اتفاق هەبێ لەسەر حوكمی ئەصڵەكە ، بەڵام لەبەر عیلەتێ بێ هەر نەیارێك قەبوڵ نەكاو نەیەڵێ كەئەو عیلەتە هەیە لە ئەصڵەكەدا، وەك لە قیاس : ئەگەر قەبوڵی نیكاحی فلانە ژنم كرد ئەوە طلاقی كەوتبێ ، بكرێتە سەر فلانێك كە قەبوڵی نیكاحی لەمەودوا دەكەم طەلاقی كەوتبێ، لەنەبوونی طەلاقدا دوای مارەبڕین ، چونكە نەبوونی طلاق هەر لە ئەصڵەكەدا شتێكە اتفاقی لەسەرە لەنێوان ئێمەو زانایانی حەنەفیدا ، بەلای ئێمەوە عیلەتەكە كە لە فەرعەكە دا هەیە بریتیە لە هەڵپەساندنی طەلاقەكە پێش ئەوەی ببێ بە خاوەنی ، حەنەفی بونی ئەو عیلەتە لە ئەصڵەكەدا قەدەغە دەكاو قەبوڵ ناكا، بەڵكو دەڵێ : ئەصڵەكە تەنجیز و توند بوونەوەیە و جێبەجێكردنە، نەك تعلیق و هەڵپەساندن

(٤) جا ئەو قیاسەی ئەو حوكمەی تێدا بێ كە باس كرا ناودەبرێ بە : (مركب الوصف) چونكە دروست بونی حوكمەكە لە قیاسەكەدا لەسەر ئەو وەصفەیە كە

{ولا يقبلان} اي القياسان المذكور ان لمنع الخصم وجود العلة في الفرع في الاول في الاصل في الثاني[1] {خلافاً للخلافيين} في قولهم يقبلان نظرا لاتفاق الخصمين على حكم الاصل[2].

{ولوسلم} الخصم {العلة} للمستدل اي سلم انها ماذكره {فاثبت المستدل وجودها} حيثُ اختلفا فيه {او سلمه} اي سلم وجودها {المناظر اتهض الدليل} عليه تسليمه في الثاني وقيام الدليل عليه في الاول[3]. {فان لم يتفقا} اي الخصمان {على اصل} من حيثُ الحكم والعلة {ولكن رام المستدل اثبات حكمه} بدليل {ثُمَّ اثبات علة} بطريق {فالأصَحّ قبوله} في ذلك لان اثباته بمنزلة اعتراف الخصم به وَ قيلَ يقبل بل لا بدمن اتفاقهما على الأصل صونا للكلام عن الانتشار[4].

ناریەکە لە ئەصڵەکەدا قەدەغەی کردووە ، کە عیلەتەکەیە، بریتی بوو لە تەعلیقی علاقە کە پێش ئەوەی ببێ بە خاوەنی.

(١) ئەو دو قیاسە هەردوکیان قەبوڵ نین نە مرکب الاصل وەنە مرکب الوصف ، چونکە نەیارەکە نایسەلمێنێ کە عیلەتەکە کە ماڵی کچۆڵەکەیە لەفەعی قیاسی یەکەمدا هەیە ، وەك نایسەلمێنێ کە عیلەتەکە کە تەعلیقەکەیە لە ئەصڵی قیاسی دوهەم دا هەیە

(٢) بە پێچەوانەی شوێن کەوتوانی سەر مەزهەبەکان کە دەڵێن : هەردوکیان قەبوڵ دەکرێن ، لەبەر ئەوە سەیری ئەوە دەکەن هەردو نەیارەکە یەك قسەو یەك دەنگن لەسەر حوکمی ئەصڵەکە

(٣) ئەگەر نەیارەکە قەبوڵی بونی عیلەتەکەی کرد لە فەرعەکەدا بێ ئەوەی بۆی ثبات بکرێ، واتە ووتی ئەوەیە کە تۆ ووتت، ئەمجا تۆیش ، واتە مستدل سەلماندنی عیلەتەکە لە فەعەکەدا هەیە ، ئەمە لە شوێنێکدا کە نەیارو مستدل ڕایان جیاواز بێ لە بونی عیلەتەکەدا ، یاخود مناظرەکە بێ بەڵگە قەبوڵ ی بونی عیلەتەکەی کرد ئەو کاتە بەڵگەکە دژی ئەو دەبێتەوە ، چونکە لە قیاسی دوهەمدا قەبوڵی کردووە، وە لە یەکەمیشدا بەڵگەی لەسەر هێنراوەتەوە

(٤) جا ئەگەر هەردوو نەیارەکە یەك دەنگ نەبون لەسەر ئەصڵەکە نەلەڕوی حوکمەکەیەوە وەنەلەڕوی عیلەتەکەیەوە ، بەڵام بەرەی نەیاری ئەرێی و بەڵگەخواز دەیەوێ حوکمی ئەصڵەکە بسەلمێنێ بە بەڵگەیێك ، پاشانیش بە گرتنە بەری ڕێگایەك لەو ڕێبازانە بگرێتەبەر کە عیلەتیان پێ دەدۆزرێتەوە، عیلەتەکە بسەلمێنێ، ئەوە قەولی ئەصەح ئەوەیە ئەو قیاسە قەبوڵ دەکرێ لەو شێوە سەلماندنیەی دا، چونکە

{والصحيح} انه {لا يشترط} في القياس {الا تفاق} اي الاجماع {على تعليل حـ الأصل} اي على انه معلل {او النص على العلة} المستلزم لتعليله لانه لا دليل عـ اشتراط ذلك بل يكفي اثبات التعليل بدليل[1] وقد تقدَّمَ انه لا يشترط الاتفاق على وجـ العلة خلافاً لمن زعمه وانما فرق بين المسئلتين لمناسبة المحلين[2].

{الثالث} من اركان القياس {الفرع وهو المحل المشبه} بالاصل {وَ قِيلَ حكمه} وقد تقدَّمَ انه لا يتأتي قول اكالاصل بأنه دليل الحكم[3].

اثبات كردنی حوكمی ئەصڵەكە وەك ئەوە وایە ئەیارەكە اعترافی پێ كرسـ گروپێكیش ووتویانە: قەبوڵ ناكرێ، دەبێ بەڵكو هەردو لایەن یەك دەنگ بن لەـ حوكمی ئەصڵەكە ، بۆ ئەوەی گوفتوگۆ كە لەپشكو بڵاوی پارێزراو بێ .

(١) قەولی صەحیح ئەوەیە لە قیاسدا بەمەرج نەگیراوە یەك دەنگی و خڕبونەوەـ هەردوو ئەیارەكە لەسەر ئەوە كە حوكمی ئەصڵەكە تعبدی نیە و عیلەت بۆ هێنراوەـ یاخود بەمەرج نەگیراه بونی دەقێك لەسەر عیلەتەكە - بووترێ: عەرەق حەرامە سـ سەرخۆش كردنەكەی - كەدەق بوو ئیتر حوكمی ئەصڵەكە كە معلل و عیلەتـ هێنراوە دەبێ ، ئەوەش بە مەرج نەگیراوە چونكە هیچ بەڵگەیێك نیە لەسەر بەمەـ گیراوی ئەوە ، نەك ئەوەش بەڵكو یەك بەڵگە بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەكە حوكمـ معلل و بەڵگە بۆ هێنراوەیە .

(٢) لە پێشەوە ڕابورد كەیەك دەنگی هەموان بەمەرج نەگیراوە لەسەر بونی عیلەتـ حوكمی ئەصڵەكە ئەم قسەش جیاوازە بۆ ئەوەی وایزانیوە بەمەرج گیراوە . ئەگەـ بوترێ : لە پێشەوە دانەر ووتی : بەمەرج نەگیراوە یەك دەنگی هەموان لەسەر عیلەتـ بۆ هێناوەی حوكمەكە، لێرەش ووتی: بەمەرج نەگیراوە دەقێك لەسەر عیلەتەكە ئەم دوانە جیاوازیان نیە، ئیتر بۆ ووتیەوە؟ بۆیە دانەر ئەم دوو قسەیە لەیەـ جیاكردەوە ، چونكە لەوێ بابەتەكە باسی عیلەتی حوكم بووە بەلاّم لێرە بابەتەكـ باسی حوكمی ئەصڵە .

(٣) سێ هەم لە ئەركانی قیاس بریتیە لە فەرع ، كە بریتیە لەو شوێن و شتەـ كە بشوبهێنرێ بەئەصڵەكەوە - وەك نەبیذ ئەشوبهێنرێ بە خەمرەوە - هەندێـ ووتویانە: فەرع بریتیە لە حوكمەكەی . لە پێشەوە ڕابورد كە دروست نیە بووترێ وەك لە ئەصڵەكەدا هاتوە ووتراوە كە قەولێكی تر هەیە دەڵێ بریتیە لە دەلیلی حوكمەكە.

{ومن شرطه} اي الفرع {وجود تمام العلة} التي في الاصل {فيه} من غير زيادة او حها كالاسكار في قياس النبيذ على الخمرو والايذاء في قياس الضرب على التافيف يتعدى الحكم الى الفرع وعدل كما قال عن قول ابن الحاجب ان يساوى في العلة علة لاصل لايامه أن الزيادة تضر[1] .

{فان كانت} اي العلة {قطعية} بان قطع بعلية الشيء في الاصل وبوجود في الفرع كالاسكار والايذاء فيما تقدَّمَ {فقطعي} قياسها حتى كان الفرع فيه تناوله دليل الاصل فن كان دليله ظنيا كان حكم الفرع كذلك {او} كانت {ظنية} بان ظن عليَّة الشيء في الأصل وان قطع بوجوده في الفرع {فقياس الأدون} اي فذلك القياس ظني وهو قياس الأدون[2] {كالتفاح} اي كقياسه {على البر} في باب الربا {بجامع الطعم} فإنَّهُ لعلة عندنا في الأصل [3]..

---

(١) مەرجی فەرعەکە ئەوەیە ئەو عیلەتەی کە لە ئەصڵەکەدا هەیە بەتەواوی لە فەرعەکەشدا هەبێ، ئیتر بونەکەی یەکسان بێ بۆ بونەکەی لە ئەصڵەکەدا، یاخود بونەکەی لە فەرعەکە زیاتر بێ ، وەك سەرخۆش کردن لە قیاسی نەبیذدا بۆ سەر عەرەق، ئەمە یەکسانە، یاوەك ئازاردان لە قیاسی لێداندا بۆ سەر ئۆف کردن، بۆیە هەبێ عیلەتەکەش تێدابێ بۆئەوەی حوکمەکە بگوێزرێتەوە بۆ فەرعەکەش، دانەر لە پێناسەکەی ابن الحاجب لایدا، وەك خۆی لە منع الموانع دا ووتویەتی ، کە ووتویەتی: ئەوەیە فەرعەکە لە عیلەتدا یەکسان بێ بۆ عیلەتی ئەصڵەکە بۆیە لایداوە چونکە ئەم پێناسەی ابن الحاجبە وا دەگەیێنێ بەژهنی مرۆڤ کە ئەگەر عیلەتی فەرعەکە فەرعەکە زیاترە و بەهێز تربوو زیان دەگەیێنێ

(٢) جائەگەر عیلەتی ئەصڵەکە بێگومان بوین لەبونەکەی ، واتە هیچ گومانێ نەبێ لە بونی بە عیلەت بونی ئەو شتەدا لە ئەصڵەکەو فەرعەکەدا ، وەك سەرخۆش کردن و ئازاردان لە نمونەکانی ڕابوردودا ئەوە قیاسەکەی بێ گومانە ، ئەوەندە بێ گومانە ، هەر دەڵێت فەرعی ئەو قیاسە بەڵگەی ئەصڵەکە دەی گرێتەوە، وەگەر بەڵگەکە گوماناوی بێ‌ئەوە حوکمی فەرعەکەش هەر گوماناویە . یاخود ئەگەر هاتوو عیلەتی ئەصڵەکە گوماناوی بوو ، بەم شێوە گومان برێ کە ئەو شتە عیلەتە لە ئەصڵەکەدا هەرچەند لە فەرعەکەشدا بێ گومان هەبێ ، ئەوە نزمترین قیاسە ، واتە ئەو قیاسە قیاسێکی گوماناویەو نزمترین قیاسیشە.

(٣) وەك قیاسی سێو بکرێتە سەر گەنم لەباسی ڕیبادا بەهۆی ئەوەوە کەهەردوکیان طعمن ،چونکە بەلای ئێمەوە عیلەتەکە طعمە لەئەصڵەکەدا هەیە..

ويحتمل ما قيل انها القوت أوالكيل وليس في التفاح إلاّ الطعم فثبوت الحكم فيه أدون من ثبوته في البر المشتمل على الاوصاف الثلاثة فأدونية القياس من حيثُ الحكم لامن حيثُ العلة ادلا بد من تمامها كما تقدَّمَ[1] و الأول أي القطعي يشمل قياس الأولى و المساوي أي مايكون ثبوت الحكم فيه في الفرع أولى منه في الأصل أومساوي كقياس الضرب للوالدين على التأفيف لهما وقياس احراق مال اليتيم على أكله في التحريم فيها[2]{وتقبل المعارضة فيه} أي في الفرع {بمقتض نقيض أو ضد لاخلاف الحكم على المختار} وَ قِيلَ لا تقبل و إلاّ لانقلب من صب المناظرة اذ يصبح المعترض مستدلا وبالعكس وذلك خروج عما قصد من معرفة صحة نظرا لمستدل في دليله الى غيره[3].

(١) بەلاَم ئەو قیاسەش هەڵدەگرێ کەووتراوە: عیلەتەکە بژێویە،یاخود: کێشانەیە لە سێویشدا تەنها طعم هەیە ئەوانی تر نین، کەوابوو سابت کردنی حوکمی سوو لە سێودا نزمترە لە سابت بوونی حوکمی سوو لە گەنمدا کە هەرسێ وەصفەکەی تێدایە، پلەنزی قیاسەکە لەڕوی حوکمەوەیەتی نەك لە ڕوی عیلەتەکەوەیەتی چونکە عیلەتەکە بەتەواوی وەك لە ئەصڵەکەدا هەیە دەبێ لە فەرعەکەشدا هەبێ، وەك کەبەی لەمەوپێش ڕابورد.

(٢) یەکەم کە قیاس بێ گومانە ئەولاو موساوی دەگرێتەوە، واتە ئەوەی سابت بوونی حوکمەکەی لە فەرعەکەدا باشتر و ڕونترە لە سابت بوونی حوکمەکە لە ئەصڵەکەدا ئەوە قیاس الاولیە ، یاخود ئەگەر هاتوو یەکسان بوو بۆ ئەصڵەکە ئەوە یەکسان و قیاسی مساوی پێ دەوترێ، وەك قیاس کردنی لێ دانی باوك و دایك لەسەر ئازاردانیان ، یا قیاس کردنی سوتاندنی ماڵی هەتیو لەسەر خواردنی لەوەد هەردوکیان حەرامن

(٣) قەبوڵی نەیاری دەکرێ لە شتێکی فەرعی و لاوەکی بەهۆی داخوازی قیاسەکەوە هەڵوەشێنەرەوەی حوکمی فەرعەکەیە یاخود دژیەتی‌نەك جیاوازی حوکمەکە ، ئەمەش لەسەر قەولی هەڵبژاردەیە ،- نەیاری لە شتی فەعی دا وەك بڵێن: نەبن قیاس دەکەم لەسەر دۆشاوی طەماطە لە سورایەتیدا وەك قیاس دەکرێتە سەر خەمر لەسەر خۆشکردندا لەمیاندا حەلاڵی دەگەینێ و لەویاندا حەرامی - نقیض و ضدیەوە دەوترێن خڕبونەوەیان مەحاڵ بێ، بەلاَم مخالف ئەوەیە مەحاڵ نەبێ، وەك سوراوی و ترشی لە دۆشاودا، هەندێکی تر ووتویانە: ئەو نەیاریە لە فەرع و شتی لاوەکید قەبوڵ ناکرێ ، چونکە ئەگەر قەبوڵ بکرێ پلەو پایەو کاری گوفتوگۆکە سەرو خوار

و أُجيبَ بأن القصد من المعارضة هدم دليل المستدل لا اثبات مقتضاها المؤدى الى ماتقدم وصورتـها في الفـرع ان يقـول المعـترض للمسـتدل مـاذكرت مـن الوصـف وان قتضى ثبوت الحكم في الفرع فعندي وصف آخر يقتضي نقيضه او ضده[1] .

مثـال النقيـض المسـح ركـن في الوضـوء فيسـن تثليثـه كالوجـه فيقـول المعـارض مسح في الوضـوء فـلا يسـن تثليثـه كمسـح الخـف ومثـال الضـد الوتـر واظـب عليـه لنبيﷺ فيجب كالتشهد فيقـول المعـارض مؤقـت بوقـت بوقـت صـلاة مـن الخمـس نيسحب كالفجر[2]. وامـا المعارضـة بمقتـض خـلاف الحكـم فـلا تقـدح قفطعـا لعـدم منافاتها الدليل المستدل كما يُقالُ اليمين الغموس قول يـأثم قائلـه فلا بوجـب الكفارة كشهادة الزور[3].

---

ـەبێتەوە ، چونكە ڕەخنەگر دەبێتە بەڵگە بەدەستەوە، بەڵگە داریش دەبێتە ڕەخنەگر، ئەوەش دەرچونە لەمەبەستەوە بۆ غەیری مەبەست ، كە مەبەستیش زانینی دروستی ـیری بەڵگەدارەلە لەبەڵگەكەیدا

(١) وەلاّم دراوەتەوە كەمەبەست لەنەیاریو ڕەخنە سازی ڕوخاندنی بەڵگەی ئەوەیە بەڵگەی هێناوەتەوە نەك سەلماندنی داخوازی ڕەخنە سازیەكە كە ئەگەر بسەلمێنرێ ناوە ژووەكەی پێشو دێنێتەوە كایە . دیمەنی ڕەخنەسازی لە فەرعدا ئەوەیە ڕەخنە گرەكە بڵێ بە بەڵكە دارەكە: ئەو وەصفەی كە تۆ وتت هەرچەند داوای سابت بوونی حوكمەكە دەكا لە فەرعەكەدا، بەلاّم بەلای منەوە وەصفێكی تری هەیە كە سورایی ئاوە تەماتەكەیە داخوازی هەڵوەشێنەرەوەی ئەوحوكمە یاخود دژەكەی دەكات .

(٢) نمونە بۆ وەصفێكی پوچەڵ كەرەوە ، بەڵگەدار دەڵێ: مەسح ڕوكنی دەست نوێژە بۆیە سێ جار دوبارەكردنەوەی سوننەتە،وەك دەموچاو وایە، ئەمجا نەیاریش دەڵێ: ئەو مەسحی دەست نوێژە سێ بارە كردنەوەی سوننەت نیە وەك مەسحی خوف وایە . نمونەش بۆ دژەكە كە ئەوە بوترێ: سونەتی وەتر مادەم پێغەمبەر بەردەوام بووە لەسەر كردنی كەوابو واجبە وەك تەحیاتی یەكەم وایە ، نەیاریش دەڵێ: سوننەتی وەترە كاتی بۆ دیاری كراوە بەسراوە بەكاتی لەك نوێژەوە لەناو پێنج نوێژەكەدا ، كەوابو سوننەتێكە وەك نوێژی سوننەتی بەیانی

(٣) بەلاّم نەیارێك بەهۆی داخوازییەكەوە بێت كە پێچەوانەی حوكمەكە بێت ئەوە بێ گومان هیچ زیانێك نابەخشێ، چونكە ئەو نەیاریە دژایەتی بەڵگەی بەڵگەدارەكە نیە، وەك بووترێ: سوێنی ناحەق بریتیە لە قسەیێك بوێژەكەی گوناهبار دەبێ ، لەبەر ئەوە ئیتر كەفارەتی ناوێ، وەك گەواهی دان بۆ ناحەقی كەفارەتی ناوێ هەر گوناهبار دەبێ.

فيقول المعارض قول مؤكد للباطل يظن به حقيته فيوجب التعزير كشهادة الزور {والمختار} في دفع المعارضة المذكورة زيادة على دفعها بكل ما يعترض به على المستدل ابتداء {قبول الترجيح} لوصف المستدل على وصف المعارض بمرجح مما ياتي في محله لتعين العمل بالراجح وَ قِيلَ لا يقبل لان المعتبر في المعارضة حصول أصل الظن لامساواته لظن الاصل لانتفاء العلم بها وأصل الظن لا يندفع بالترجيح[٢].

{و} المختار بناء على قبول الترجيح {انه لا يجب الايماء إليه في الدليل} ابتداء؛ قِيلَ يجب لان الدليل لا يتم بدون دفع المعارض و أُجِيبَ بانه لا معارض حينئذ فلاحاجة الى دفعه قبل وجوده وهذه المسئلة ذكرها الآمدي ومن تبعه في الاعتراضات وذكرها هنا انسب لانها تؤول الى شرط في الفرع وهو ان لا يعارض كما عده الآمدي هنا ووجهه أن الدليل لا يثبت المدعىّ إلاّ اذا سلم عن المعارض[٣].

---

(١) نەياريش دەڵێ : سوێنی ناحەق گوتەیێکە کاری پوچەڵ بەهێز دەکا ، ئیتر و گومان دەبرێ ئەو کارە چەوتە حەق و ڕاستە ، لەبەر ئەوە داوای ئەوە دەکە خاوەنەکەی ئازار بدرێ، وەك گەواهی دان بۆ ناحەقی داوای ئەوە دەکا خاوەنەکەی ئازار بدرێ .

(٢) قەولی هەڵبژاردە لەناو قەولاندا ئەوەیە لەبردنە دواوەی ئەو ڕەخنە سازیەی باسکرا ، جگە لەو بەرپەرچ دانەوەی کە دەترێتەوە هەر لەسەرەتاوە بە ڕەخنە دێت سەر بەڵگەکانی بەڵگەدار، ئەوەیەکە تەرجیح قەبوڵ دەکرێ لە وەرگرتنی وەصفی بەڵگەدارەکە بەسەر وەصفی نەیاردا ، بەهۆی مورەجحێکەوە کە لە شوێنی خۆی باس دەکرێ، ، چونکە هەر دەبێ کار بە قەول و لای راجح بکرێ. گروپێکی تر ووتویانە ئەو تەرجیحەیە قەبوڵ ناکرێ، چونکە گرنگ ئەوەیە لەنەیاریدا کەمێك گومان پەیدا بێ، کەمەرج نەگیراوە ئەو گومانە یەکسان بێ بۆ گومانی ئەصڵەکە، چونکە ئەو یەکسانی بوونەیان نازانرێ ، بێ گومانیش کە گومان بە تەرجیح بەرپەرچ نادرێتەوە . کە وەصفی بەڵگەدارەکەیە .

(٣) قەولی هەڵبژاردە ئەوەیە کەلەسەر ، قەبوڵبونی تەرجیح دروست بووە پێویست ناکا هەر لە سەرەتاوە ئامارژە بۆ ئەو تەرجیحە بکا لە بەڵگە هێنانەوەکەیدا . گروپێك ووتویانە : پێویستە ئامارژەی پێ بکا ، چونکە بەڵگە کاتێ بەبەڵگەی تەواو حسێب دەکرێ نەیارو ڕەخنە لێگرەکانی بەرپەرچدابنەوە ،وەڵام دراوەتەوە کە لەکاتی بەڵگە هێنانەوەکەیدا نەیارو ڕەخنەگر نیە ، کەنەبێ ئیتر پێویست ناکا بەرپەرچ بدرێتەوە پێش پەیدا بوونی ، ئەم مەسئەلەیە ئامێدی و قوتابیانی لەباسی

{ولا يقوم القاطع على خلافه} اي خلاف الفرع في الحكم {وفاقا} اذ لا صحة للقياس في شيء مع قيام الدليل القاطع على خلافه[1] {ولا} يقوم {خبر الواحد} على خلافه عند الاكثر} فيقدم عندهم القياس كما تقدَّمَ في مبحثه[2] {وليساو} الفرع {الاصل حكمه الاصل فيما يقصد من عين او جنس} اي عين العلة اوجنسها بالنسبة الى الاول وعين الحكم او جنسه بالنسبة الى الثاني[3].

مثال المساواة في عين العلة قياس النبيذ على الخمر في الحرمة بجامع الشدة المطربة فانها موجودة في النبيذ بعينها نوعا لا شخصا[4].

---

عتراضاتدا باسيان كردووه ، بەڵام باس كردنى لێرەدا كە ڕوكنى سێهەمدا گونجاو ترە ، چونكە دەگەڕێتەوە بۆ باسى مەرجێك لە فەرعدا، ئەو خۆيشى لەم بەسەدا مەرجێكى ژماردوە و داينـاوە ، بەڵگەى ئەم مەرجەش ئەوەيەكە : بەڵگە ناتوانێ داواكەى بسەلمێنێ هەتا كاتێ نەبێ ڕزگارى بێ لە نەيارو ڕەخنە و ڕەخنەسازى .

(١) هەم بە مەرج گيراوە دەبێ بەڵگەيێكى بێ گومان نەبێ لەسەر پێچەوانەى حوكمى فەرعەكە لەگەڵ ئەصڵەكەدا ، ئەم مەرجەش پڕاو پڕيەتى ، چونكە هيچ جۆرە دروستييێك بۆ قياس نابێ ئەگەر بەڵگەيێكى بێ گومان هەبێ لەسەر پێچەوانەى فەرعەكە بۆ ئەصڵەكەى.

(٢) وەهەم دەبێ تاكە هەواڵ بەڵگە نەبێ لەسەر پێچەوانەى فەرعەكە بۆ ئەصڵەكە ، بەلاى زۆربەى زانايانەوە ، چونكە بەلاى ئەوانەوە تاكە هەواڵ پلەى لە پێش پلەى قياسەوەيە، وەك لەجێ باسى تاكە هەواڵدا لە پێشەوە باس كرا .

(٣) وەدەبێ فەعەكە يەكسان بێ بۆ ئەصڵەكەو حوكمەكەش بۆ حوكمەكەى لەوەدا كە مەبەستەكە جۆرى عيلەتەكەيە ياخود ڕەگەزيەتى بەگوێرەى يەكەميان كە يەكسانى فەرعەكەيە بۆ ئەصڵەكە لەوەى مەبەست دەكرێ، دجۆر بێ يا ڕەگەزبێ، ياخود جۆرى حوكمەكەيە يا خود ڕەگەزيەتى بە گوێرەى دوهەميانەوە ، كە يەكسانى حوكمى فەرعەكەيە بۆ حوكمى ئەصڵەكە .

(٤) نمونەى يەكسانى لەسەر جۆرى عيلەتدا قياسى شەڕاب بكرێتە سەر عەرەق لە حەراميدا بەهۆى عيلەتێكەوە كە لە هەردوكياندا هەيە كە توندو تيژىيێكە دەيهێنێتە هەلەكە سەما ئەمە وەك لە عەرەقدا هەيە لەشەرابەكەشدا هەيە ، بەڵام مەبەست جۆرەكەيەتى نەك خودى ئەو تيژيە لە هەردوكياندا هەيە مەحاڵە .

ومثال المساواة في جنس العلة قياس الطرف علىالنفس في ثبوت القصاص بجمع الجناية فانهاجنس لا تلافهما[1] ومثال المساواة في عين الحكم قياس القتل بمثقل عمـ القتل بمحدد في ثبوت القصاص فإنَّهُ فيهما واحد والجامع كون القتل عمدا عدوانا

ومثال المساواة في جنس الحكم قياس بضع الصغيرة على مالها في ثبوت الو‌ـ بلاب اوالجد بجامع الصغر فان الولاية جنس لولايتى النكاح والمال[2]. {فان خالف المذكور ماذكر اي لم يساوه فيما ذكر {فسد القياس} لانتفاء العلة عن الفرع في الا‌ـ وانتفاء حكم الاصل عن الفرع في الثاني على أن اشتراط المساواة في العلة مستغـ عنه بما تقدَّمَ من اشتراط وجود تمام العلة في الفرع[4].

---

(١) نمونەش بۆیەکسانی لەڕەگەزی عیلەتدا ئەوەیە قیاسی دەست بڕینێ یا قـ‌ـ بڕینێ بکرێتە سەر کوشتنی مرۆڤێك لە سابت بونی حەقی تۆڵە سەندنەوەدا ، بەهۆ‌ـ عیلەتێکە لە هەردوکیاندا هەیە کە دەست درێژیە بۆ غەیر ، جۆرەکەیان جیـ‌ـ یەکێکیان جوزئیە و یەکێکیان کوللیـیە، بەڵام ڕەگەزەکەیان یەکێکە کە دەست دەێ‌ـ بۆ لەناو بردنیان ، دەست بڕی لەناوبردنە، بێ کوژێ هەر لەناوبردنە

(٢) نمونەی یەکسانی لە جۆری حوکمەکەدا قیاس کردنی کەسێ بکوژرێ بە تێـ لەسەر کوشتنی کەسێ بکوژرێ بەچەقۆ ، لە سابت بوونی حەقی تۆڵە سەندنەوەد حوکمەکە لە هەردوکیاندا یەکە، عیلەتەکەش کوشتنەکە یەکە مەبەستی کوشتـ کراوە، دەست درێژیە بۆ غەیر.

(٣) نمونەش بۆ یەکسانی لە ڕەگەزی حوکمەکەدا، وەك قیاس کردنی مارەکرد‌ـ و لەزەت وەرگرتن بەلای کچۆڵەوە بکرێتە سەر ماڵەکەی، لەسابت بوونی بەڕێوەبردنی و سەرپەشتی کردنی بۆ باوك و باپیرەیە ، عیلەتەکەشیان بچوکی کچەکەیە ، چونک ووشەی وویلایە و سەرپەرشتیار ڕەگەزێکە هەردوو سەرپەرشتیەکە شوودان و ماڵەکەی دەگرێتەوە .

(٤) جا ئەگەر حوکمی فەرعەکە جیاواز بوو لەگەڵ ئەصڵەکە یاخود حوکمەکەیدا واتە یەکسانی نەبوو لە جۆری عیلەت یاخود ڕەگەزیدا، ئەوە ئەو قیاسە فاسید و بێ ئەنجام دەبێ، چونکە عیلەتی ئەصڵەکە لە فەرعی یەکەمدا، کەجیاوازی فەرعەکەیە بۆ ئەصڵەکە لە جۆری عیلەتدا یاخود ڕەگەزیدا فەوتاوە، وە حوکمی ئەصڵەکەش لە فەرعی دوهەمەکەدا، کەجیاوازی حوکمی فەرعەکەیە بۆ ئەصڵەکەیە ، دانەر لێرەد بەمەرجی گرت فەرعەکە یەکسان بێ بۆ ئەصڵەکە لە عیلەتەکەیدا بەهۆی ووتنی مەرجی پێشەوە ئەم مەرجەی ئێرەی نەئەویست، کە ووتی : بەمەرج گیراوە تەواوی

ولو قال هناك من عينها أو جنسها المقصود بالذكر هنا لو في به مع السلامة من لتكرار ومن الوقوع فيما عدل عنه هناك من لفظ المساوة وبعبارة ابن الحاجب أن يساوي في العلة علة الأصل فيما يقصد من عين أو جنس وان يساوي حكمه حكم لاصل فيما يقصد من عين أو جنس(1) {وجواب المعترض بالمخالفة} فيما ذكر {بيان لاتحاد} فيه مثاله ان يقيس الشافعي ظهار الذمي على ظهار المسلم في حرمة وطء لمراة فيقول الحنفي الحرمة في المسلم تنتهي بالكفارة والكافر ليس من أهل الكفارة اذ : يمكنه الصوم منها لفساد نيته فلا تنتهي الحرمة في حقّه فاختلف الحكم فلايصحّ لقياس فيقول الشافعي علته الصوم بانّه يسلم ويأتي بهِ و يصحّ اعتاقة واطعامه مع لكفر اتفاقاً فهو من أهل الكفارة فالحكم متحد والقياس صحيح(2).

---

عیلەتی ئەصڵەکە لە فەرعەکەدا هەبێ.

(١) ئەگەر دانەر هەر لەوێ بی ووتایە : لە جۆری عیلەتەکە یاخود لە ڕەگەزی عیلەتەکە ، کە مەبەست لە باس کردنی ئەم مەرجە لێرەدا ئەم دوو وشەیە ، ئەگەر ڕای بکردایە دانەر بەتەواوی مەبەستی دەگەیاند ، لەگەڵ ئەوەش ڕزگاری دەبو لە دوبارە بوونەوەو لە کەوتنەوە ناوی ئەو شتانەی لەوێ لەبەریان هەڵهات ، کە لەفظی مساواة بوو- ووتی بەڵگەی لادانی لە پێناسەکەی ابن الحاجِب...- دەستەواژەکەی بن الحاجب ئاوایە : دەبێ فەرعەکە یەکسان بێ بۆ عیلەتیئەصڵەکە لە عیلەتەکەیدا ، ئەوەیدا، مەبەستە چ جۆری عیلەتەکەبێ یاخود ڕەگەزی عیلەتەکەبێ، وەهەم دەبێ حوکمەکەشی یەکسان بێ بۆ حوکمی ئەصڵەکە ، لەوەیدا مەبەستەکە جۆری عیلەتەکەیە یاخود ڕەگەزیەتی

(٢) کەسێ ئەگەر ڕەخنە بگرێ بڵێ : عیلەتی فەرعەکە عیلەتی ئەصڵەکە نیە یاخود حوکمەکەی حوکمی ئەصڵەکە نیە ، لەوەلأمیدا دەوترێ : وەرە بابۆت ڕوون کەمەوە ئەو قیاسەدا عیلەت و حوکمەکەیان هەریەکن، نمونەکەش وەك ئەوەی : شافعی ظهاری ئەهلی ذیمەی قیاس دەکاتە سەر ظهاری موسڵمان لە حەرام بونی جوت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا، جا حەنەفی دەڵێ: بۆ موسڵمان بەهۆی کەفارەتەوە حەرامیەتیەکەی کۆتایی دێ، کافریش ئەهلی کەفارەت نیە، چونکە ڕۆژوگرتنی بۆ دەست نادا کە یەکێکە لە کەفارەتەکان، لەبەر خراپی نیەتەکەی، لەبەر ئەوە بۆ ئەو حەرامیەتەکەی هەر بۆ ئەو بەردەوامەو کۆتایی نابێ، بەم شێوە حوکمی فەرعەکە لە ئەصڵەکە جیاواز بوو، کەوابو قیاسەکەش دروستە.

{ولا يكون} الفرع {منصوصا} عليه {بموافق} للقياس للاستغناء حينئذٍ بالنص عن القياس[1] {خلافاً لمجوز دليلين} مثلاً على مدلول واحد في عدم اشتراطه ماذكر جوزه ويفيد القياس عنده معرفة العلة[2].

{ولا بمخالف} للقياس لتقدم النص على القياس {الا لتجربة النظر} فان القياس المخالف صحيح في نفسه ولم يعمل به لمعارضة النص له[3]. {ولا} يكون حكم الفرع {متقدم ماعلى حكم الاصل} في الظهور كقياس الوضوء على التيمم في وجوب النية فان الوضوء تعبد به قبلل الهجرة والتيمم انما تعبد به بعدها اذ لوجاز تقدمه لنزم ثبوت حكم الفرع حال تقدمه من غير دليل وهو ممتنع لانه تكليف بما لايعلم نعم ان ذكر ذلك الزاما للخصم جاز كما قال الشافعي للحنفية طهارتان انى تفترقان لتساويهما في المعنى[4].

---

(١) وەهەم مەرجێكی تر ئەوەیە حوكمی فەرعەكە كە دەقێكی لەسەر نەبێ كە موافقی بێ بۆ قیاسەكە، چونكە لەم كاتەدا كە دەق هەبێ پێویست بە قیاس نابێ .

(٢) جیاوازە بۆ ئەوەی بۆ وێنە دو بەڵگەی هەبێ لەسەر یەك مەدلول، ئەم ئەم مەرجەی باسكرا بەمەرج حسێب نەكردوە، چونكە دەڵێ: هیچ ڕێگرێك نیە یەك شت چەندەها بەڵگەی هەبێ، وەهەم بەلاشیەوە وایە كە قیاسەكە سودی ئەوەی دەگەیێنێ، كە عیلەتەكە دەزانرێ، بەڵام لە دەقە وەرناگیرێ.

(٣) وەهەم دەبێ دەقێك نەبێ حوكمێك بگەیێنێ كە پێچەوانەی حوكمی قیاسەكە بێ، چونكە هەموكات دەق لەپێش قیاسەوەیە، هەموكات كە دەق هەبێ اعتبار بە قیاس ناكرێ، مەگەر كاتێ نەبێ كە قیاسەكە بۆ تەجریبەكردنی بیرو حاڵی بون و زانینی یاسای قیاس بێ، ئەم قیاسەش هەرچەند جیاوازە حوكمەكەی لەگەڵ دەقەكە بەڵام لە خودی خۆیدا دروستە، بەڵام كاری پێ ناكرێ چونكە دەقەكە دژیەتی و دەچێتەوە بە گژیا .

(٤) وەهەم دەبێ حوكمی فەرعەكە پێش حوكمی ئەصڵەكە دەرنەكەوتبێ، وەك قیاسی دەست نوێژ بكرێتە سەر تەیەموم لە واجب بوونی نیەتدا، چونكە دەستنوێژ تەكلیفی پێ كراوەو بەئەرك دانراوە پێش كۆچی پێغەمبەر، بەڵام تەیەموم دوای دوو ساڵ پاش كۆچ كردن ئەمجا تەكلیفی پێ كراوە وەبەئەرك دانراوە، چونكە ئەگەر دروست بێ پێش كەوێ لازم دەكا حوكمی فەرعەكە ثابت بوبێ پێش ثابت بوونی حوكمی ئەصڵەكە بێ بەڵگەش، ئەوەش نابێ، چونكە ئەوە شتێكە نازانرێ و تەكلیفیشی پێ كراوە بەڵێ ئەگەر ئەوە بووترێ تەنها بۆ تێك شكانی بەرانبەرەكەیە

{وجوزه} اي جوز تقدمه {الامام} الرَّازي {عند دليل آخر} يستند إليه حالة التقدم دفعا للمحذور المذكور وبناء على جواز دليلين أو ادلة على مدلول واحد وان تأخر بعها عن بعض كمعجزات النبيِّ ﷺ المتأخره عن المعجزة المقارنة لإبتداء الدعوة[1].

{ولايشترط} في الفرع {ثبوت حكمه بالنص جملة خلافاً لقوم} في قولهم يشترط ذلك ويطلب بالقياس تفصيله قالوا فلولا العلم بورود ميراث الجد جملة لما جاز القياس في توريثه مع الاخوة ورد اشتراطهم ذلك بأن العلماء من الصحابة وغيرهم قاسوا انت على حرام على الطلاق والظهار والإيلاء بحسب اختلافهم فيه ولم يوجد فيه نص لا جملة ولا تفصيلا[2].

---

ئەوە دروستە، وەك شافعی بە حەنەفیەکان دەڵێ: دەست نوێـژ و تەیەموم فەرقیان چیە؟ ئێوە دەڵێن: نیەت لە دەست نوێژدا واجب نیەو لەتەیەمومدا واجبە، چونکە ئەم دووانە لەماناو مەبەستدا یەکسانن، کە طهارەتێکە تەکلیفی پێ کراوە، چونکە ئەگەر لە مانادا یەکسان بن دەبێ لە حوکمیشدا یەکسان بن .

(١) پێشەوا رازی بە دروستی زانیوە پێش کەوتنی حوکمی فەرعەکە بەسەر حوکمی ئەصڵەکەدا، بەمەرجێ جگە لە قیاسەکە بەڵگەیێکی تر هەبێ پشتی بگرێ لەکاتی پێش کەوتنی حوکمی فەرعەکەدا، بۆیە دەڵێن بەڵگەیێکی تر هەبێ بۆ ئەوەی ئەو رەخنەی باس کرا نەمێنێ بەسەرمانەوە، وەهەم بۆیە وا دەڵێن: چونکە یەك مەدلول دروستە دو بەڵگە یاخود چەندەها بەڵگەی هەبێ، هەرچەند هەندێکیان لە هەندێکی تریان دواکەون ، وەك موعجیزەکانی پێغەمبەرﷺ، هەموویان لەدوای ئەو موعجیزەوە هاتوون کەلەسەرەتای بانەگەوازی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەوە بووە.

(٢) بەمەرج نەگیراوە لە فەرعەکەدا ثبوتی حوکمەکەی بگرێ بە دەقێکی موجمەل کورت و گشت گیر، ئەمجا قیاس تەفصیلەکەی بدات، ئەمەش جیاوازە بۆ گەلێك زانا کە ووتویانە: ئەگەر دەقێك بە موجمەلی لەبارەی میراتی باپیرەوە نەهاتبایێ دروست نەئەبوو بە قیاس میراتی بدرێتێ کاتێ لەگەڵ چەند برایێکی مردوەکەدابێ. بەرپەرچی ئەو زانایە دراوەتەوە کە ئەو مەرجەیان گرتووە بەوە: زانایانی صەحابەو غەیری ئەوانیش: قیاسی: تۆم لەسەر حەرامبێ، کراوەتە سەر: طەلاق، هەندێ تر کردویانەتە سەر ظیهار، هەندێکیش لەسەر: إیلاء، هەریەك بە گوێرەی جیاوازی خۆیان تیایدا، لەگەڵ ئەوەش دەقێکی تێدا نیەو دەست نەکەوتوە نە موجمەل، نەمفصل .

{ولا} يشترط في الفرع {انتفاء نص اواجماع يوافقه} في حكمه اي لا يشترط انتفاء واحد منهما بل يَجوزُ القياس مع موافقتهما او احدهما له {خلافاً للغزالي والامدى} في اشترطهما انتفاءهما مع تجويزهما دليلين على مدلول واد نظرا الى ان الحاجة الى القياس انما تدعو عند فقد النص والاجماع وان لم تقع مسئلة بعد بخلاف قول ابن عبد ان السابق[1] و أُجيبَ بان ادلة القياس مطلقة عن اشتراط ذلك نعم في نفي المصنِّف اشتراط انتفاء النص مخالفة لقوله اولا ولا يكون منصوصا[2].

{الرابع} من اركان القياس {العلة} وفي معناها حيثما اطلقت على شيء في كلام ائمة الشرع اقوال ينبنى عليها مسائل تأتي {قال اهل الحق} هي {المعرف} للحكم فمعنى كون الاسكار علة انه معرف اي علامة على حرمة المسكر كالخمر والنبيذ[3].

---

(١) وەهەم بە مەرج نەگیراوە لە فەرعەکەدا دەبیٚ دەقیٚك یاخود اجماعیٚك نەبیٚ کە موافەقەی حوکمی ئەو قیاسە بکات، واتە بەمەرج نە گیراوە نەبونی یەکیٚ لەو دوانە. نەك ئەوەش بەڵکو دروستە قیاس بکریٚ و هەردوکیشیان موافقەی بکەن، یاخود یەکیٚکیان موافقەی بکات، بەلاٚم ئەم قسەیە جیاوازە بۆ غەزالی و ئامیٚدی کە بەمەرجیان گرتووە دەبیٚ ئەو دووانە نەبن ئەمجا قیاسە کە دروستە، لەگەڵ ئەوەش بەلای ئەوانەوە یەك شت دەست ئەدات کەدو بەڵگەیشی هەبیٚ، ئەوەش بەلای ئەوانەوە چونکە سەیری ئەوانەیان کردووە: کاتیٚ پیٚویست بە قیاس دەبیٚ، کە دەق و اجماع نەبن، هەرچەند ڕوداوەکەش ڕوی نەدابیٚ هیٚشتا کە پیٚویستی بە چارەسەر هەبیٚ، ئەمەش بە پیٚچەوانەی ابن عەبدانەوە کە کە لە پیٚشەوە ووتی: هەتا ڕوداوەکە ڕونەدا نابیٚ چارەی بۆ دابنیٚی.

(٢) وەلاٚم دراوەتەوە کە: بەڵگەکانی قیاس ڕوتن لەوەی کە ئەو مەرجە لە قیاسدا بەمەرج گیرابیٚ هیچ بەڵگەییٚك لەسەر ئەوە نیە، لەم ڕووە باشە بەلاٚم دانەر کە لیٚرەدا دەڵیٚ: بەمەرج نەگیراوە نەبونی دەقیٚك، ئەمە جیاوازە لەگەڵ قسەکەی پیٚشووی کەووتی: ولا يكون منصوصاً، دەبیٚ دەقی لەسەر نەبیٚ. -بەلاٚم ئەتوانین پارمەتی بدەین و بڵیٚین: ئەو قسەی لەویٚ کردی لەسەر ڕای ئەوانەیە دو بەڵگە لەسەر یەك شت دروست نیە، لیٚرەش لە سەر ڕای ئەوانەیە کەدەڵیٚن: دروستە

(٣) چوارەم ڕوکن لە ئەرکانی قیاس عیلەتە، لەهەر جییٚکدا لە گفتوگۆی پیٚشەوایانی شەرعدا عیلەت بڕا بەسەر هەر شتیٚکدا مانای ئەو عیلەتە چوار قەوڵی تیٚدایە، چەند مەسئەلەو بابەتیٚك هەیە لەمەودوا دیٚن لەسەر ئەوچوار قەولەیە دروست بوون.(١) ئەهلی حەق ووتویانە: عیلەت بریتیە لەو شتەی حوکمەکە دەناسیٚنیٚ بە

{وحكم الاصل} على هذا {ثابت بها لا بالنص خلافاً للحنيفة} في قولهم بالنص لانه
مفيد للحكم قُلْنا لم يفده بقيد كون محله اصلا يقاس عليه والكلام في ذلك والمفيد له
هو العلة اذهي منشأ التعديدية المحققة للقياس[1] {وَ قِيلَ } العلة {المؤثر بذاته} في
حكم بناء على انه يتبع المصلحة والمفسدة وهو قول المعتزلة [2] .

{وقال الغزالي} هي المؤثرة فيه {باذن الله} اي بجعله لا بالذات[3]. {وقال الآمدى}
هي {الباعث} عليه وقال انه مراد الشافعية في قولهم حكم الاصل ثابت بها اي انها
باعث عليه وان مراد الحنفية ان النص معرف له وان كلالا يخاف الآخر في مراده وتبعه
ابن الحاجب في ذلك[4].

---

حەلك، كەوابو كە دەووترێ: سەرخۆش كردن عيلەتە، واتە نيشانەيە لەسەر حەرامی
هەمو سەرخۆش كەرێك، وەك عەرەق و شەراب، نەك ئەوحەرامیەكەی پەیداكردووە.

(١) لەسەر ئەم پێناسەی عیلەتە حوكمی ئەصڵەكە بەهۆی عیلەتەكەوە پەیدابووە
نەك بەهۆی دەقەكەوە، بە پێچەوانەی زانایانی پەیرەوی حەنەفیەوە وەكو دەڵێن:
بەهۆی دەقەكەیەوە پەیدا بووە، چونكە دەقەكەیە حوكمەكە ئەگەیێنێ. ئێمەیش
وتومانە: دەقەكە حوكمەكە ناگەیێنێ بەهۆی ئەوەوەكە شوێنی حوكمی ئەصڵەكە و
قیاسی ئەكرێتە سەر، ئەم گوفتوگۆیەش لەبارەی ئەوەوەیە، ئەوەی ئەوە بگەیێنێ
عیلەتەكەیە، واتە حوكمەكەیەو جێگەیو كە ئەصڵێكە قیاسی لەسەر دەكرێ، چونكە
عیلەتەكە سەرچاوەی گواستنەوەی حوكمەكەیەو پابت كەری قیاسەكەیە

(٢) گروپێكی تر دەڵێن: خودی عیلەتەكە تەئسیر لە حوكمەكە دەكاو پەیدای دەكا،
ئەم بۆچونەش لەسەر ئەم رێبازەیان سەوز بووە كە دەڵێ: حوكمەكە شوێن كەوتەی
قازانج و بەرژەوەندی و مەفسەدەو زیانە، ئەوەش بۆچونی موعتەزیلەیە

(٣) غەزالیش دەڵێ: عیلەتەكە حوكمەكە پەیدای دەكاو دەیهێنێتەبوون بەڵام
بەفەرمانی خوا نەك بە خودی عیلەتەكە خۆی، بەڵكو خوا ئەو هێزەی پێداوە ئەو
ئەنجامە بدات

(٤) ئامیدی ووتویەتی: عیلەتەكە هاندەرو تەشویق كەری خەڵكە لەسەر حوكمەكە.
هەروەها ئامیدی ووتویەتی: زانایانی پەیرەوی شافعی كەوتویانە: حوكمی ئەصڵەكە
بەهۆی عیلەتەكەوە سابت بووە . مەبەستیان ئەوەیەكە: عیلەتكە هاندەرو تەشویق
كەری خەڵكە لەسەر حوكمەكە. وەهەم ووتویەتی: مەبەستی زانایانی حەنەفی بەو
قسەیە كە دەڵێن: حوكمی ئەصڵەكە بەهۆی دەقەكەوە پەیدا بووە، واتە: دەقەكە
پێناسەكەرو نیشانەی حوكمەكەیە، وەهیچیان لە زانایانی هەردو پەیرەوەكە لە

قال المصنّف ونحن معاشر الشافعية انما تفسر العلة بالمعرف ولا نفسرها بالباعث ابدا ونشدد النكير على من فسرها بذلك لان الرب تعالى لا يبعثه شيء على شيء ومن عبر من الفقهاء عنها بالباعث أراد انها باعثه للمكلف على الامتثال نبه عليه أبي رحمه الله تعالى وسيأتي بيانه[1] .

{وقد تكون} العلة {دافعه} للحكم {او رافعة} له {او فاعلة الامرين} أي الدفع والرفع[2] مثال الاول العدة فانها تدفع حل النكاح من غير الزوج ولا ترفعه كما لو كانت عن شبهة[3] ومثال الثاني الطلاق فإنَّهُ يرفع حل الاستمتاع ولا يدفعه لجواز النكاح بعده[4].

---

مەبەستا جیاوازی یەك نین و دژایەتی یەك ناكەن، لەو شێوە بۆ چونەدا ابن الحاجب شوێنی ئامێدی كەووتوە .

(١) دانەر ووتویەتی: ئێمەی كۆڕو كۆمەڵێ زانایانی پەیڕەوی شافعی عیلەت تەنها پێناسەی بەعەلامەو نیشانە دەكەین، بە باعث و هاندەر لێكی نادەینەوە هیچ كات شتی واناكەین، وە بەتوندی بەرپەرچی ئەو كەسە ئەدەینەوە كە وامانای بكات چونكە ئەگەر باعث بەمانا هاندەری خوا بێ بۆ كردنی شتێ ئەوە ناكرێ كەس ناتوانێ هانی خوا بدات لەسەر ئەوە، بەلاّم ئەو شەرع زانانەی بەباعث لێكیان داوەتەوە مەبەستیان ئەوە بووە كە: هاندەری خەڵك بێ، لەمەو دواتر ڕونكردنەوەكەی دێ.

(٢) جاری واهەیە عیلەت دافع دەبێ بۆ حوكمەكە واتە حوكمەكە دەباتە دوواوە وەجاری واش هەیە رافعی حوكمەكە دەبێ، واتە حوكمەكە دەباتە دواوە،وەجاری واش هەیە رافیعی حوكمەكە دەبێ، واتە هەر هەڵی دەكەنێ و پوچەڵی دەكاتەوە جاری واش هەیە هەردوكیان دەكات واتە رافیع و دافیعیش دەبێ، واتە: لە ڕوێكەوە مانعی حوكمەكەیە، بەم مانایە دەبێتە عیلەتی عەدەمی حوكمەكە، لە ڕوێكەوە مانعە وە لە ڕوێكەوە عیلەتە.

(٣) نمونە بۆ یەكەمیان كە دافع بێ، وەكو عیدە، نایەڵێ ئەو ژنە حەلاڵ بێ بۆ هیچ كەسێك جگە لە مێردەكەی خۆی نەبێ، ئەمە دافعە، بەلاّم عیدە جاری واهەیە ئەو حەلاّلیە بنبڕناكاو بۆ هەمیشە حەرامیكا، وەك ئەوە عیدەكە لەبەر شوبهەبێ .

(٤) نمونە بۆ دوهەمیش كە عیلەتەكە ڕافع بێ، وەك طلاق كە حەلاّلی لەزەت وەرگرتن لەو ژنە بنبڕدەكا بەلاّم پالّی پێوە نانێ بۆ دوواوە، چونكە دوای ئەو پیاوە دروستە مارەی بكاتەوە .

ومثال الثالث الرضاع فإِنَّهُ يدفع حل النكاح ويرفعه اذا طرا عليه[1]. {و} تكون العلة وصفا حقيقيا} وهو ما يتعقل في نفسه من غير توقف على عرف او غيره {ظاهراً منضطا} كالطعم في باب الربا[2]. {او} وصفا {عرفيا مطردا} لا يختلف باختلاف الاوقات كالشرف والجسة في الكفاءة[3].

{وكذا} تكون {في الأصَحِّ} وصفا {لغويا} كتعليل حرمة النبيذ بانه يسمى خمرا كالمشتد من ماء العنب بناء على ثبوت اللغة بالقياس ومقابل الأصَحِّ يقول لا يعلل الحكم الشرعي بالأمر اللغوي[4]. {او حكما شرعيا} سواء كان العلوم حكما شرعيا ايضا كتعليل جواز رهن المشارع بجواز بيعه[5].

(١) نمونه بۆ سێ هەمیش کە عیلەتەکە دافع و ڕافعیش بێ، وەك شیر، کە حەلاڵی کچێك بۆتۆ دەباتە دوواوە، بەردەوامی حەلاڵی کچێك بۆ تۆ دەپچڕێنێ ئەگەر شیردانی لەسەر ئەو نیکاحەدا بێ، لەو کاتەوە دایکت شیر دەدا بەو کچەی بۆت مارەبڕاوە بەردەوامی حەلاڵی ئەو کچەت دەپچڕێنێ

(٢) عیلەت دەبێ صیفەتێکی حەقیقی بێ، کە بریتیە لەوەی بەهۆی خودیخۆیەوە ئاحاڵی دەبێ بێئەوەی بوەستێتەسەر زانینی عورف وحاڵی بوونی لۆغەت وشەرع وە هەم دەبێ وەصفێکی دیاری وابێ ضە بط بکرێ،وەك طەعم وخواردن لەبابەتی دیاری کردنی شتێك کەسوو ڕێبابێ، طەعم وڕۆزی وەصفێکی دیارەو هەموو کەس ضەبطی ئەکاو پێویستیشی بەوەنیە کەعورف وغەیری عورف بزانێ ئەمجا لێحاڵیبێ.

(٣) یاخود عیلەت دەبێ صیفەتێکی عورفی بێ، بەعورف بزانرێ، عورفێکی وا کەمەرد بێ، واتە هەرچەند کات و زەمان بگۆڕێ ئەو هەر نەگۆڕێ، وەك بڵوند ڕێزی و پەستی و خواری لەباسی هاوشانیدا،وەك عیلم و لۆتی گەری .

(٤) هەروەها بەلای قەلی ئەصەحەوە عیلەت جاری وا هەیە وەصفێکی لۆغەوی دەبێت، وەك بەڵگە هێنانەوە بۆ حەرامی نەبیذ دەڵێت لەبەرئەوی ناودەبرێ بەخەمر، وەك ئاوێك وایە کە تیژەو لە ئاوی ترێ گیراوە، ئەمە پێی دەوترێ خەمر، ئەویش پێی دەترێ خەمر، ئەمەش لەسەر ئەو قەولێ دروست بووە کە دەڵێ: لۆغە بە قیاس سابت دەبێت. قەولی بەرامبەر ئەصحەکە دەڵێ:حوکمێك کە شەرع وەریگرێ عیلەتی بۆ ناهێنرێتەوە بە شتێك لە لەغوە وەرگیرابێ .

(٥) یاخود عیلەتەکەحوکمێك بێ لەشەرعەوە وەرگیرابێ، ئیتر کەیفی خۆیەتی عیلەت بۆهێنراوەکەش حوکمەکەی لەشەرعەوە وەرگیرابێ ،وەك عیلەت هێنانەوە بۆ دروستی بارمتەی ماڵێك کە هی شەراکەت بێ بەهۆی دروستی فرۆشتنەکەوە، مادەم

ام كان أمرا حقيقيا كتعليل حياة الشعر بحرمته بالطلاق وحله بالنكاح كاليد و قيـ لا تكون حكما لان شأن الحكم أن يكون معلولالا علة ورد بان العلة بمعنى المعرف ولا يمتنع ان يعرف حكم حكما أو غيره[1] {وثالثها} تكون حكما شرعيا {ان كـ المعلول حقيقا} هذا مقتضى سياق المصنّف وفيه سهو وصوابه أن يراد لفظة لا بعـ قوله وثالثها وذلك أن في تعليل الحكم الشرعي بالحكم الشرعي خلافاً وعلى الجو الرجح هل يَجوزُ تعليل الأمر الحقيقي بالحكم الشرعي قال في المحصول الحق الجو فمقابله المانع من ذلك مع تجويزه تعليل الحكم الشرعي بالحكم الشرعي هو التفصيـ في المسئلة[2].

---

فرۆشتنەکەی دروستە بارمتەشی دروستە.

(١) یاخود عیلەت بۆ هێنراوەکە شتێکی حەقیقی بێ،وەك بەڵگە هێنانەوە بـ ئەوەی کە موو زیندوە، بەهۆی حەرامبونیەوە بە طلاقدانی خاوەنەکی وحەلاڵبونێـ بەهۆی مارە بڕینیەوە، هەروەك حوکمی دەستی ئافرەت وایە، گروپێك ووتویەتی عیلەت نابێ بە حوکم، چونکە کاری حوکم ئەوەیە عیلەتی بۆ بهێنرێتەوە نەك عیلەتـ بێ، وەڵامی ئەم قیلە دراوەتەوە کە: عیلەت بەمانا پێناسەکەرو نیشانەیە، نەك بەمانـ تەئسیرکەربێ، هیچ ڕێگرێکیش نیە کە حوکمێك نیشانەی حوکمێکی تربێ یاخو نیشانەی شتێکی‌تر بێ.

(٢) قەولی سێ هەم ئەوەیە: عیلەت دەبێت کە حوکمی شەرعی بێ ئەگەر عیلەتـ بۆ هێنراوەکە حەقیقی و عەقڵی بێ. ئەم نەقڵ کردنی قەولی سێ‌هەمە بەم شێوەیە دارشتنی دانەردا سەهوی تێدایە، ڕاستیەکەی ئەوەیە دوای لەفظی وثالثهـ وە لەفظی: (لا) زیاد بکرایە، واتە عیلەت نابێ ببێ بە حوکمی شەرعی بۆیە ئەوەش ڕاستیەکەیەتی چونکە: عیلەت هێنانەوە بۆ حوکمی شەرعی هەر بەحوکمی شەرعی جیاوازی تێدایە، هەندێك ووتویانە دروست نیە لەسەر ئەو قەولەی کە راجح و دروستە، ئایا دروستە عیلەت هێنانەوە بۆ شتێکی حەقیقی و عەقڵی بە حوکمی شەرعی ؟ دانەر لە کتێبی: المحصول، دا ووتویەتی: قەولی حەق ئەوەیە کە دروستە، قەولێك کە دژی ئەم قەولە بێ ئەوەیەکە ئەوە دروست نیە لەگەڵ ئەوەش بەڕەوای دەزانێ عیلەت هێنانەوە بۆ حوکمی شەرعی بە حوکمی شەرعی. ئەوەش درێژە پێدان و ڕونکردنەوەی تەواوی بابەتەکەیە، هەرچەند مەتنەکە پێچەوانەی ئەم ڕونکردنەوەیە .

{أو} وصفا {مركبا} وَ قِيلَ لا لان التعليل بالمركب يؤدى الى محال فإنَّهُ بانتفاء جزء منه تنتفى عليته فبإنتفاء آخر يلزم تحصيل الحاصل لان انتفاء الجزء علة لعدم العلية[1]. قُلنا لا نسلم انه علة وانما هو عدم شرط فان كل جزء شرط للعلية ولو سلم انه علة فحيث لم سيسبقه غيره أي انتفاء جزء آخر كما في نواقض الوضوء ومن التعليل بالمركب تعليل وجوب القصاص بالقتل العمد العدوان لمكافئ غير ولد قال المصنف وهو كثير وما ارى للمانع منه مخلصا إلاّ ان يتعلق بوصف منه ويجعل الباقي شروطا فيه ويؤول الخلاف حينَئذٍ الى اللفظ[2].

(١)دروستە عیلەت صیفەتێکی مرکب وپێکهاتەبێ لەچەند شتێ،هەندێك وتویانە: دروست نیە عیلەت پێك هاتەبێ لە چەند شتێ، چونکە عیلەت هێنانەوە بە شتێك کە پێك هاتەبێ سەرئەکێشی بۆمەحاڵ وسەرئەنجامەکەی نەگونجانە،چونکە بەلەدەستدانی شتێك لەوپێکهاتەیە بەعیلەت بونەکەی دەفەوتێ، دوهەمیش بەلەدەستدانی شتێکیتر ئەوپێکهاتەیە تحصیلی حاصل دەبێ-گەڕان بەشوێن شتێکدا کە لەبەردەم دایە-کە بریتیە لەوەی شتێ کەنەبێ خەریکی بەنەبوکردنیبی، چونکە بەلەدەستدانی بەشێك لە پێکهاتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەست نادات بۆئەوەی عیلەت بێ.

(٢)ئێمەیش ووتومانە: ئەوە ناسەلمێنین کەلەدەستدانی بەشێکی عیلەتبێ بۆعیلەت نەبونی، بەڵکە تەنها ئەوە نەبونی مەرجێکی عیلەتەکەیە، چونکە هەموو بەشێك لە بەشەکانی صیفەتێك پێکهاتبێ مەرجێکە بۆ ئەوەی ببێ بە عیلەت، گریمان ئەگەر بۆیشی بسەلمێنرێ کە ئەوە عیلەتە ئەوە کاتێ دەبێ عیلەتێکی تری پێش نەکەوتبێ، واتە بەشێکی تری پێش ئەو نەفەوتابێ، وەك ئەوانەی دەست نوێژ دەشکێنن، کەسێ بەهۆی خەوەوە دەست نوێژی شکا، پاشان چووە سەر ئاو، ئەم چوونە سەر ئاوەی پێناوتری شکێنەری دەست نوێژ، نمونە بۆ عیلەت هێنانەوە بە صیفەتێك لەچەند شتێك پێك هاتبێ، وەك عیلەت هێنانەوە بۆئەوەی کە کوشتنەوە واجبە، بەهۆی کوشتنێکەوە کەدەبێ نیازکراوبێ و ستەم بێ و هاوشانی بکوژەکە بێ و منداڵی بکوژەکەش نەبێ. دانەر ووتویەتی: نمونە بۆ صیفەتێکی پێك هاتە زۆر زۆرن، ئەوەی کە دەڵێ ئەو صیفەتە نیە بە هیچ شێوەیێك ڕزگاربونی نیە لەو نمونە زۆرانە، مەگەر بڵێ: یەکێکیان صیفەتەکە بەو ئەوانی تر مەرجی ئەو صیفەتەن، نەك بەهەموویانەوە صیفەتێکیان پێك هێناوە، بۆ نمونە بووترێ: عیلەتەکە کوشتنەکەیە وئەوانیتر مەرجی کوشتنەکەن. لەم کاتەدا سەرئەنجامی ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی سەر زارەکی، نەك کێشەی ناوەڕۆکی.

{وثالثها} يَجوزُ لكن {لا يزيد على خمس} من الأجزاء حكاه الشيخ أبو اسحق الشيرازي كالماوردي عن بعضهم في (شرح اللمع) وحكاه عن احكايته الامام في المحصول بلفظ سبعة وكانها تصحفت في نسخته كما قال المصنّف قال أي الامام ولا أعرف لهذا الحصر وجهً وقد يُقالُ حجته الاستقراء من قائله وتانيث العدد عند حذف المعدود المذكر كما هنا جائز عدل إليه المصنّف عن الاصل اختصارا[1].

{ومن شروط الالحاق بها} اي بسبب العلة {اشتمالها على حكمة تبعث} المكلف {على الامتثال وتصلح شاهد الإناطة الحكم} بالعلة كخفظ النفوس فإنَّهُ حكمة ترتب وجوب القصاص على علته من القتل العمد الى آخره فان من علم انه اذا قتل اقتص منه انكف عن القتل[2]..

(١) قەولی سێهەم ئەوەیە کە دروستە عیلەت صیفەتێکی پێك هاتەبێ بەلأم لە پێنج بەش زیاترنەبێ، شیرازی ئەم قەولەی گێراوەتەوە، وەك ماوەردی لە هەندێ زانایانە وە گێراویەتەوە لە کتێبی (شرح المنهج)دا. إماميش لە گێرانەوەکەی شیرازیەوە گێراویەوە لە کتێبی (المحصول) دابە لەفظی: سبعە، بەلأم وابزانم ئەو گۆرانکاریە لەلایەن ئەو کەسەوە بووە کەنوسیویەتەوە،هەر ئەو لەفزەی پێشەوە راستە کەووتی: علی خمس، وەك دانەر ووتویەتی: امام ووتویەتی: من نازانم بەڵگە چیە بۆ ئەم حەصرو کورت هەڵهێنانە لەسەر ئەوە لە پێنج بەش زیاتر نەبێ لەوانەشە بووترێ: بەڵگەی ئەم حەصرە ئەوەیە: ئەو کەسەی دەڵێ دەبێ لە پێنج زیاترنەبێ هەرچی خوێندوەتەوە لەوە زیاتری دەست نەکەوتوە. بۆیە لەفظی ژمارەی خمس بە شێوەی مۆنث ووتوەو نەی ووتوە: خمسە، کە دەبوایە بەم شێوە بوایە. چونکە لەفظی ژمارەکان بەبێ تێ مۆنثة، بە تێوە بۆ مذکرە، لێرەش بۆ: (أجزاء) کە مذکرە، چونکە ئەگەر ژمێرراوەکە مذکربێ و لابرابێ دروستە ژمارەکە بەبێ‌تێ‌بێ، وەك ئەمەی ئێرە، بۆیە دانەر لە یاسا گشتیەکە لای دا و رێگەی بەهەزار حاڵ دروستی هەڵبژار لەبەر کورتکاری،

(٢) یەکێکی‌تر لەمەرجەکانی پاشکۆکردنی فەرعەکە بۆ ئەصڵەکە بەهۆی عیلەتەکەوە دەبێ لەڕوی حوکمەکەوە بەرژەوەندیێکی لێوە پەیدا ببێ و تێدا هەبێ - دوجۆر حیکمەت هەیە: ١- بەمانا مناسب و گونجاو. ٢- بەمانا بەرژەوەندیە، لێرەدا مانای دووەم مەبەستە. - بەرژەوەندیێکی وا کە هانی مەکەلەفەکە دەدا بۆجێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانە، وەهەم ئەو بەرژەوەندیە دەبێ بگونجێ بکرێتە بەڵگە بۆ ئەوەی حوکمەکە ببەستێتەوە بە عیلەتەکەوە، وەك پاراستنی سەر و گیانی خەڵك، ئەوە ئەو

**وقد يقدم عليه توطينا لنفسه على تلفها وهذه الحكمة تبعث المكلف من القاتل وولي الأمر على امتثال الأمر الذي هو ايجاب القصاص بأن يمكن كل منهما وارث القتيل من الاقتصاص وتصلح شاهد الإناطة وجوب القصاص بعلته فيلحق حينئذ القتل بمثقل بالقتل بمحدد في وجوب القصاص لاشتراطهما في العلة المشتملة على الحكمة المذكورة وقوله تبعث على الامتثال اي حيثُ يطلع عيها وسياتي انه يَجوزُ التعليل بما لا يطلع على حكمته[1] {ومن ثم} اي من هنا وهو اشتراط اشتمال العلة على الحكمة المذكورة اي من اجل ذلك {كان مانعها وصفا وجوديا يخل بحكمتها}[2].**

---

حیکمەت و بەرژەوەندیەیەکە دێتەدی بەهۆی پەیدا بوونی عیلەتی واجب بوونی کوشتنەوەدا، کە کوشتنی بەعەمد و بەستەم و تادوایی، بێ گومان هەرکەسێ بێ گومان بێ لەوەی هەرکات یەکێکی کوشت دەکوژرێتەوە ئەوە واز لە تاوانی کوشتن دێنێ .

(١) جاری واش هەیە ئەو تاوانە ئەنجام ئەدا بەلأم لە ناخی دەرونی خۆیشیەوە دەزانێ کە خۆیشی لەناو دەچێ. ئەم حیکمەت و بەرژەوەندیە هانی خەڵك ئەدا بەتایبەت بکوژو کاربەدەستی وولأت لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانەی کە بریتیە لە زیندو ڕاگرتنی کوشتنەوە، بەم شێوە ئەو دووانە مەناخێك بسازێنن بۆ کەس و کاری کوژراوەکە بۆ ئەوەی کوژراوەکە بکوژنەوە، جا ئەم بەرژەوەندیە دەست ئەدا بۆئەوەی بەڵگەبێ بۆ بەستنی واجب بوونی کوشتنەوە بەعیلەتی واجبِ بونەکەوە، کە پاراستنی گیانی خەڵکە کەوابو لەم کاتەدا کوشتنێك کە بە تێلأ بوبێ هەروەکو کوشتنێك وایە بەخەنجەر بوبێ لەواجب بوونی کوشتنەوەی بکوژەکەدا، چونکە هەردوکیان شەریکن لەو عیلەتەدا ئەو بەرژەوەندیەی تیایە کە باسکرا . کەدانەر دەڵێ: (تبعث على الامتثال) واتە هانی خەڵك دەداو هیواریان دەکات بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانە، واتە کاتێ کە خەڵك لەو بەرژەوەندیە حاڵێ ببێو بیزانێ- لەهەندێ وولأت کوشتنەوە نیە لەبەر ئەو حاڵی نەبونەیە - لەمەودوایش دێ کەدەڵێ: دروستە بەڵگەهێنانەوە بە شتێك کە بێ گومان نەبێ لە بەرژەوەندیەکەی، واتە ئەم دو قسەیە دژ بەیەك نین، کاتێ کە دەڵێت، ئەو عیلەتە بەرژەوەندییەکی تێدا هەبێ، هەرچەند گومانیش بەری کە هەیە، هەربەسە.

(٢) لەبەر ئەوی کە لەوێ ووتمان بەمەرج گیراوە کە عیلەتەکە دەبێ بەرژەوەندییەکی تێدابێ، دەبێ شتێك ڕێگربێ لەو عیلەتە کە صیفەتێکی وجودی بێ نەك عەدەمی نوقصانی پەیدا بکات لە حیکمەت و بەرژەوەندی عیلەتدا .

کالدين على القول بانه مانع من وجوب الزكاة على المدين فإنَّهُ وصف وجودي يخل بحكمة العلة لوجوب الزكاة المعلل بملك النصاب وهي الاستغناء بملكه فان المدين ليس مستغنيا بملكه لإحتياجة الى وفاء دينه به ولا يضر خلو المثال عن اللالحاق الذي الكلام فيه[1]. {و} من شروط الالحاق بها في السفر لعدم انضباطها {و قِيلَ يَجوزُ كونها نفس الحكمة} لانها المشروع لها الحكم {وَ قِيلَ } يَجوزُ {ان انضبطت} لانتفاء المحذور[2]. {و} من شروط الالحاق بها {ان لا تكون عدما في الثبوتي وفاقا للامام} الرازي {وخلافاً للآمدي} هذا انقلب على المصنِّف سهوا[3]..

(١) وەك قەرز، لەسەر قەولێك كە دەڵێ: قەرزاری نایەڵێ زەكات واجب ببێ لەسەر قەرزارەكە، چونكە قەرز صیفەتێكی وجودیەو حیكمەت و بەرژەوەندی عیلەتەكە نوقصان دەكا، واتە عیلەتی واجب بوونی زەكاتەكە، كە واجب بوونەكەش بەهۆی ئەوەوەیە كە خاوەنی نیصابە، حیكمەتەكەش دەوڵەمەند بونیەتی بەهۆی ئەوەی كە خاوەنی نیصابە، هۆی نوقصانی حیكمەتی عیلەتەكەش ئەوەیە قەرزارەكە دەوڵەمەند نیە بەهۆی ئەوەوە كە خاوەنی نیصابە، چونكە پێویستی پێیەتی بۆ جێ بەجێ كردنی قەرزەكەی و بژاردنەوەی بەهۆی نیصابەكەوە. هەرچەند ئێمە گوفتوگۆمان لەسەر قیاسەو ئەم نمونەش قیاسی تێدانیە زیان ناگەیێنێ، چونكە ڕونكردنەوەی مانعێكە كە زیان بە ڕژەوەندیەكە بدات .

(٢) وە هەر مەرجێكی تری قیاس كردنی فەرعەكە لەسەر ئەسڵەكە بەهۆی عیلەتەكەوە ئەوەیە ئەو عیلەتە دەبێ صیفەتێك بێ خڕ كەرەوەی شتێك بێ كە موناسب بێ بۆ دروستی حوكمەكە، بۆ نمونە عیلەتی دروستی كورت كردنەوەی نوێژ سەفەرە، نەك خودی حیكمەتەكەی كە لابردنی سەختی و گرانی سەفەرە، چونكە مەشەقەت و گرانی زەبت و خڕ ناكرێتەوە، وا دەبێ بۆ تۆ ئاسانەو بۆ من گران دەبێ. كەوابوو بۆ عیلەت ناشێ، هەندێك وتوویانە: دروستە خودی حیكمەتەكەی عیلەت بێ، چونكە لەڕاستیدا حوكمەكە لەبەر ئەو حیكمەتە دانراوە، هەندێك وتوویانە: دروستە حیكمەتەكە عیلەت بێ، بەڵام بەمەرجێ حیكمەتەكە زەبت بكرێ و كۆ بكرێتەوە، چونكە كە خڕ بوویەوە ئەوەی لێی دەترساین نامێنێ.

(٣) وەهەم یەكێكی‌تر لەمەرجەكانی قیاس كردنی فەرعەكە لەسەر ئەصڵەكە بەهۆی عیلەتەكەیەوە، ئەوەیە ئەو عیلەتە عەدەمی نەبێ بۆ سەلماندنی حوكمێكی سبوتی. ئەمەش پێشەوا ڕازی هام دەنگیەتی، بەڵام ئامێدی ڕای جیاوازە، ئەمەش دووبارە لەسەر دانەر ئاوەژوو كراوەتەوەو سەهوی تێدا كردووە .

وصوابه ماقال في شرح المختصر وفاقا للآمدى وخلافاً للامام الرَّازي اي في تجويزه تعليل الثبوتي بالعدمي لصحة أن يقال ضرب فلان عبده لعدم امتثاله امره[1]. وأجيبَ بمنع صحة التعليل بذلك وانما يصح بالكف عن الامتثال وهو امر ثبوتي والخلاف في لعدم الضاف كما يؤخذ من الدليل وجوابه لكن الآمدي انما منع العدم المحض اي المطلق وأجاز المضاف الصادق بالوجود كالامام والاكثر ويجزى الخلاف فيما جزءه عدمي لانه عدمي ويَجوزُ وفاقا تعليل العدمي بمثله او بالثبوتي كتعليل عدم صحة التصرف بعدم العقل او بالاسراف كما يَجوزُ قطعا تعليل الوجودي بمثله كتعليل حرمة الخمر بالاسكار[2]. ومن امثلة تعليل الثبوتي بالعدمي مايقال يجب قتل المرتد لعدم اسلامه وان صح أن يقال لكفره كما يصح أن يعبر عن عدم العقل بالجنون لان المعنى الواحد قديعبر عنه بعبارتين منفيّة و مثبتة ولا مشاحة في التعبير[3].

---

(١) ڕاستیەکەی ئەوەیە لەکتێبی: شرح المجتمع، دا ووتوویەتی: ئامێدی هاوڕاو هەنگیەتی و پێشەوا ڕازی ڕای جیاوازە، واتە ڕازی بەدروستی زانیوە عیلەت هێنانەوە بەعەدەمی بۆ سەلماندنی کارێکی سبوتی، چونکە دروستە بووترێ: فلانەکەس دای لەبەندەکەی خۆی، لەبەر ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکەی نەکردووە،

(٢) وەلام دراوەتەوە نابێ عیلەت هێنانەوە بەو شێوەیە دروست بێ، تەنها عیلەت هێنانەوەیەك دروستە کە بەمەنعو قەدەغە کردنی لەشبێ بەجێ کردنی فەرمان، ئەو مەنعەش شتێکی ثبوتیە، جیاوازی زانایانیش لە عەدەمێکدایە کە ئیزافە کراوبێ، وەك لعدم إمتثاله، کە لەبەڵگەکەو وەلامی بەڵگەکە وەردەگرێ، بەلام ئامێدی تەنها عەدەمێکی مەنع کردووە کەڕوتوپەتی بێ،عەدەمێك کە ئیزافە کراوبێ ملتزمی وجودی بێ بەڕەوای زانیوە، وەك ڕای ئیمام و زۆربەی زانایان، ئەو جیازیە وەك لەوەدابو لەوەشدا کە بەشێکی عەدەمیە هەر دەبێ، چونکە عەدەمیە، بەڕای هەموان دروستە عیلەت هێنانەوە بۆ عەدەمی بەعەدەمی یاخود بەثبوتی، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ نادروستی کاروبارێك بەهۆی نەبونی عەقڵەوە یاخود بەهۆی زیادەڕەویەوە، وەك چۆن دروستەبێ گومان عیلەت هێنانەوە بۆ وجودی بەوجودی، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ حەرامی عەرەق بەهۆی سەرخۆش کردنەوە.

(٣) یەکێك لە نمونەکانی عیلەت هێنانەوە بۆ ثبوتێك بەعەدەمێکی ئیزافە کراو، ئەوەیە پبووترێ: پێویستە کوشتنی پاشگەزبووەی ئیسلام لەبەر ئیسلام نەبوونی، هەرچەند دروستیشە بووترێ: لەبەر بێ باوەڕیەکەی، وەك چۆن دروستە لەباتی نەبوونی عەقڵ بووترێ: شێتی، چونکە یەك مەبەست دەکرێ هدوو دەستەواژەی

{والإضافي} كالأبوّة {عدميٌّ} كما هو قول المتكلمين. وسيأتي تصحيحه في أواخر الكتاب ففي جواز تعليل الثبوتي به الخلاف كذا قال الامام الرَّازي والآمدي لكن تقدّم في مبحث المانع التمثيل للوجودي بالابوة وهو صحيح عند الفقهاء نظرا الى انها ليست عدم شيء و مرجع القياس اليهم فلا يناسبهم أن يقال فيه والاضاف عدمي[1].

{ويجوز التعليل بما لا يطلع على حكمته} كما في تعليل الربويات بالطعم أو غيره ويفهم من ذلك انه لا تخلو علة عن جكمة لكن في الجلة لقوله {فان قطع بانتفائها في صورة فقال الغزالي و} صاحبه محمد {بابن يحي يثبت الحكم} فيها {للمظنة وقال الجدليون لا} يثبت اذ عبرة بالمظنة عند تحقيق الئنة مثاله من مسكنه على البحر وزل منه في سفينة قطعت به مسافة القصر في لحظة من غير مشقة يَجوزُ له القصر في سفره هذا[2].

---

جيا لێك بدرێتەوە، یەکێکیان مەنفی بێ و ئەویش موسبەت بێ، بێ گومان هیچ جۆرە لۆمەیەك و عارێك نیە لەشێوەی دەربڕینی مەبەستدا.

(١) ئیضافی وەك باوکایەتی لەبەشی عەدەمیەوە، کە ئەوەش ڕای متکلمینە. لەکۆتایی ئەم بەشەدا باسی بەدروستی زانینی دەکرێ، لەبەر ئەوە ئایا عیلەت هێنانەوە بۆ سبوتی بەئیزافی دروستە؟ ئەوە خیلاف و جیاوازی زانایانی تێدایە. پێشەوا ڕازی و ئامێدی و وەهایان وتووە، بەڵام لەباسی (المانع)دا لەپێشەوە کە باسکرا نموونەمان بۆ وجودی بەباوکایەتی هێنایەوە، ئەوەشی کە باوکایەتی وجودی بێ بەلای زانایانی شەرع زانەوە دروست و ڕاستە، چونکە سەیری ئەوەیان کردووە کە باوکایەتی نەبوونی شتێك نیە، واتە نەبون لە مەفهومەکەیدا نەبێ، بابەتی قاسیش بابەتێکە پەیوەندە و دەگەڕێتەوە بۆ کاروباری زانایانی شەرع، لەبەر ئەوە شیاوی ئەوان نیە لەباسی قیاسدا بووترێ: ئیزافی عەدەمیە.

(٢) دروستە عیلەت هێنانەوە بەشتێك ئاگادار نەبی لەحیکمەتەکەی وەك لە عیلەت هێنانەوە بۆ ئەو شتانەی کە سوویان تێدایە جاری بە تەعم و جاریّ بە قوت و... ئەمە لەو قسەیە وەردەگیرێ کە عیلەتی بێ حیکمەت نیە، بەڵام لەزۆربەی داوا وایە. چونکە دانەر خۆی دەڵێ: ئەگەر لەدیمەنێکدا کەسێ بەعەقڵی خۆی بێ گومان بو کە حیکمەتی تێدا نیە، ئەوە غەزالی و ابن یحیای هاوڕێ وتوویانە: حوکم لەو دیمەنەدا سابت دەبێ، چونکە بێ گومانە کە هەبێ، بەڵام ئەهلی جەدەل و مەنتیق وتوویانە: سابت بێ، چونکە هیچ ئەرزشێك نیە بۆ گومان لەکاتێکدا بێ گومان دروست بێ بووترێ: بێ گومان نمونەکەش: کەسێ ماڵەکەی بەسەر لێواری دەریایەکەوەبێ، لەو

{و} العلة {القاصرة} وهي التي لا تتعدي محل النص {منها قوم} عن ان يعلل بها {مطلقا والحنفية} منعوها {عن لم تكن} ثابتة {بنص او اجماع} قالوا جميعا عدم فائدتها[1].

وحكاية القاضي ابي بكر الباقلاني الاتفاق على جواز الثابتة بالنص معترضة بحكاية القاضي عبد الوهاب الخلاف فيه كما اشار الى ذلك المصنِّف بحكاية الخلاف[2]. {والصحيح جوازها} مطلقاً {وفائدتها معرفة المناسبة} بين الحكم ومحله فيكون ادعي للقبول[3]. {ومنع الالحاق} بمحل معلولها حيثُ يشتمل على وصف متعد معارضتها له ما لم يثبت استقلاله بالعلية[4].

---

جیٚ و ڕیٚی خۆیە دابەزیٚ بۆ ناو پاپۆڕێك، ئەو ماوەی دیاری کراوە بۆ کورت کردنەوەی نوێژ لەماوەی یەك چرکە دابڕیٚ بیٚ ئەوەی هیچ زەحمەتێکی توش بووبیٚ، هەر دروستە بۆی لەم سەفەرەیدا نوێژەکەی کورت بکاتەوە.

(١) عیلەتێك کە تایبەت بیٚ و بۆی نەبیٚ بگوێزرێتەوە لەئەسڵەکەوە بۆ فەرعێك، ئەوە گەلێك لە زانایان عیلەت هێنانەوەیان بەو جۆرە عیلەت قەدەغە کردووە، ئیتر بەدەق یا إجماع یا هەر شتێکی تر سابت بوبیٚ، بەڵام زانایانی پەیڕەوی حەنەفی قەدەغەیان کردووە ئەگەر بەدەق یا بە إجماع سابت نەبووبیٚ، بەڵگەی هەموویان ئەوەیە دەڵێن: چونکە ئەو عیلەتە بیٚ سوودەو فەرعی لیٚ دروست نابیٚ.

(٢) ئەوەش کە قازی باقلانی گێڕاویەتەوە کە ڕای هەموان لەسەر ئەوەیە ئەگەر بەدەق سابت بووبیٚ دروستە بکرێتە عیللەت، ڕەخنەی لیٚ گیراوە بەگێڕانەوەی قازی عبد الوهاب کە جیاوازی زانایانی تێدایە، وەك دانەر ئاماژەی کرد بۆ ئەوە بەگێڕانەوەی ئەو ڕا جیاوازانە هەر لەمەتنەکەدا.

(٣) قەولی صەحیح و دروست ئەوە کە عیلەت هێنانەوە بەو جۆرە عیلەتانە دروستە، ئیتر بەدەق سابت بووبیٚ یا بەشتێکی تر، سودەکەش بۆ ئەوەیە موناسەبەی نێوان حوکم و شوێنەکەی بزانریٚ، کە ئەوەش زانا چاکتر قەبولٚ دەکریٚ و وەردەگیریٚ.

(٤) یەکێکی تر لە سودەکانی ئەو جۆرە عیلەتانە ئەوەیە: نایەڵیٚ قیاسی شتیٚ بکرێتە سەر ئەو ئەسڵەی کە ئەم عیلەتیەتی، ئەمەش لەجێیەکدا دەبیٚ کە جگە لەو عیلەتە عیلەتێکی تریشی تێدابیٚ کە بۆی هەبیٚ بگوێزرێتەوە، چونکە ئەو عیلەتە قاصرە دەچیٚ بەگژ ئەم سیفەتەدا کە بۆی هەیە بگوێزرێتەوە، بەڵام بەو مەرجەی مەنعی إلحاف دەکا سەربەخۆیی بەعیلەت بوونی ئەو سیفەتە متعدیە سابت نەبیٚ، ئەگەر سابت بیٚ ئەو ناتوانیٚ بەرهەڵستی بکات.

{وتقويه النص} الدال على معلولها بأن يكون ظاهراً[1] {قال الشيخ الامام} والد المصنِّف {وزيادة الأجر عند قصد الامتثال لاجلها} لزيادة النشاط فيه حينئذٍ بقوة الإذعان لقبول معلولها[2].

ومن صورها ماضبطه بقوله {ولا تعدى لها} اي للعلة {عند كونها محمل الحكم أو جزاه الخاص} با، لا يوجد في غيره {أو صفه اللازم} بأن لا يتصف به غيره لاستحالة التعدى حينئذ[3]. مثال الأول تعليل حرمة الربا في الذهب يكونه ذهبا وفي الفضة كذلك ومثال الثاني تعليل نقص الوضوء في الخارج من السبيلين بالخروج منهما ومثال الثالث تعليل حرمة الربا في النقدين بكونهما قيم الاشياء[4].

(١) سودێکی تری هەیە کە بەهێزکردنی دەقەکەیە کە دەلالەت دەکا لەسەر مەعلولی عیلەتە قاصرەکە، جا ئەگەر دەقە بەهێزکردنی بۆ چییە؟ ئاخر ئەگەر دەقەکە ظاهربێ شتێتر هەڵگرێ.

(٢) باوکی دانەر سوودێکیتری وتووە و دەڵێ: لەکاتی نیازی جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە پاداشتی زیاتر دەبێ لەبەر عیلەتەکە،چونکە چالاکی زیاتر دەبێ لەجێبەجێ کردنەکەیدا لەبەر بەهێزبوونی باوەڕی بۆ قەبوڵ کردنی مەعلولی عیلەتەکە.

(٣) یەکێك لە دیمەنەکانی عیلەتی قاصرە ئەوەیە دانەر کۆی کردووە ئەو دەڵێ: عیلەت ناگوێزرێتەوە کاتێ کە عیلەتەکە هەر جێ حوکمەکە بێ وەك بڵێت: عەرەق لەبەر عەرەقیەتی حەرامە، یاخود بەشێکی تایبەتی شوێنی حوکمەکە بێ، بەم شێوە ئەو بەشەیە جگە لەجێگەدا نەبێ لەشوێنی تردا دەست نەکەوێ، یاخود عیلەتە سیفەتێکی لازم بێ، بەم شێوە نەکرێ بەسیفەت بۆ شتێکی تر، چونکە لەم کاتەدا مەحاڵە گواستنەوەی.

(٤) نمونە بۆ یەکەمیان: عیلەت هێنانەوە بۆ حەرامی سوو لەئاڵتوندایە دەیڵێت: چونکە ئاڵتونە، لەزیودا چونکە زیوە، ئەمە هەربێ حوکمەکەیە، نمونەی دووەمیان: عیلەت هێنانەوە بۆ شکاندنی دەستنوێژ بەهۆی دەرچوونی شتێ لەپێشوو پاشەوە. بووترێ: چونکە دەرچوونەکە لەو دوانەوە بووە، کە دەرچوون بەشێکە لەشوێنەکە. واتە دەرچوون لەو دووانەوە بەشێکە لەوەی کە دەرچوونی بۆ سابت دەبێ. نموونەی سێ هەمیش، عیلەت هێنانەوە بۆ حەرامی سوو لە ئاڵتون و زیودا بەمەی بووترێ: چونکە ئەو دوانە نرخو بەهای هەموو شتەکانە، ئەمەش سیفەتێکە لازمی ئەصڵ و شوێنەکەیە.

وخرج بالخاص واللازم غيرهما فلا ينتفي التعدي عنه كتعليل الحنفية النقض مما ذكر بخروج النجس من البدن الشامل لما ينض عندهم من الفصد ونحوه وتعليل ربوية البر بالطعم[1].

{ويصح التعليل بمجرد الاسم اللقب} كتعليل الشافعي ﷺ نجاسة بول ما يؤكل لحمه بانه بول كبول الادمي { وفاقا لابي اسحق الشيرازي و خلافاً للامام} الرازي في نفيه ذلك حاكيا فيه الاتفاق موجها له بانا نعلم بالضرورة انه لا اثر في حرمة الخمر لتسميته خمراً بخلاف مسماه من كونه مخامراً للعقل فهو تعليل بالوصف[2].

(١) بەشێکی تایبەت یاخود سیفەتێکی لازم غەیری ئەم دوانە چویە دەر، چونکە گواستنەوەی حوکمەکە لەغەیری ئەودوانەدا نافەوتێ، وەك عیلەت هێنانەوەی ئایانی حەنەفی بۆ شکاندنی دەستنویژ لەوەیدا کەووترا، دەڵێن: بەهۆی دەرچوونی شتی پیس لەلاشەوە، لاشە هەموو ئەندامەکان دەگرێتەوە، ئیتر خوێن لەپەنجەی یا سەری بێ بەلای ئەوانەوە هەر دەشکێ، ئەمە عیلەتێکی گشتگیرە بۆ هەموو ئەوانەی بەلای ئەوانەوە کە دەست نوێژ دەشکێنێ، وەك کەڵەشاخ و خوێن بەردان، قیاسی دەکرێنە سەر ئەوەی لەپێشوو پاشەوە دەردەچێ، لەعیلەتێکدا کە هەردووکیاندا هەیە، کە دەرچوونی پیسیە لەلاشەوە، یاخود وەك عیلەت هێنانەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە گەنم شتێکە سووی تێدایە، چونکە خواردنە، دەخۆ مەناریش هەر خواردنە.

(٢) دروستە عیلەت هێنانەوە تەنها بەناوێکەوە کە لەقەب بێ -مەبەست بە لەقەب ئەوەیە کە جامدبێ و لەشتی تر دروست نەبووبێ- وەك عیلەت هێنانەوەی شافعی خوای لێ ڕازی بێ بۆ پیسی میزی ئاژەڵێك گۆشتی بخورێ، دەڵێ لەبەر ئەوەیە کە: میزە، وەك میزی ئادەمیزاد وایە، شیرازیش هام دەنگیەتی، بەڵام پێشەوا ڕازی ڕای جیاوازە کە نەفی ئەو جۆرە عیلەت هێنانەوە دەکات، ئەوەندە سوورە لەسەر قسەکەی دەڵێ: ئەمە شتێکە ڕای هەموو کەسێکی لەسەرە، بەڵگە سازێشی بۆ کردووە و دەڵێ: ئێمە بێ گومان دەزانین کە شتێکی بەڵگە نەویستە هیچ جۆرە شوێنەوارێکی عەرەق نازانین لەحەرام بوونی عەرەقدا هەبێ لەبەر ئەوەی کە ناوی عەرەقە،بەڵام سیفەتی ناوەڕۆکەکەی جیاوازە کە بریتیە لەتێکدان و عەقڵ داپۆشین، ئەوەش عیلەت بۆ هێنانەوەیە بەصیفەت نەك بەلەقەب.

{اما المشتق} المأخوذ من الفعل كالسارق والقاتل {فوفاق} صحه التعليل به {واما نحو الابيض} من المأخوذ من الصفة كالبياض {فشبه صوري} وسياتي الخلاف فيه(1).

{وجوز الجمهور التعليل} للحكم الواحد {بعلتين} فاكثر مطلقاً لان العلل الشرعية علامات ولا مانع من اجتماع علاماتٍ على شيءٍ واحد {واذ عواو قوعه} كما في اللمس والمس والبول المانع كل منها من الصلاة مثلاً(2). {و} جوزه {ابن فورك والامام} الرَّازي {في} العلة {المنصوصة دون المستنبطة} لان الاوصاف المستنبطة الصالح كلّ منها للعلية يَجوزُ ان يكون مجموعها العلة عند الشارع فلا يتعين استقلال كل منها بخلاف ما نص على استقلاله بالعلية(3).

(١) بەڵام بەڵگە هێنانەوە بەشتێك كە لەفیعل و ڕووداو وەرگیراو بێ، وەك: سارق، و قاتڵ، كە لە: سرقەو قەتڵ وەرگیراون، ئەوە بەڕای هەموان ئەو عیلەت هێنانەوە دروستە و دەنگی هەموانی لەگەڵدایە، وە ئەوەش كە وەك: ئەبیەز وایە لە سیفەت وەرگیراوە، وەك بیاز، ئەوە شیبهە صوری پێ دەووترێ، واتە فەرعو ئەصڵەكە لەصورەتدا وەك یەكن، ئایا ئەگەر ئەصڵ و فەرع لە صورەتدا وەك یەك وابن حوكمەكە نەقڵ دەكرێ؟ ئەوە جیاوازی زانایانی تێدایە، لەمەودواش ئەو كێشەی نێوان زانایانە باسەكەی دێ.

(٢) جەماوەری زانایان بەدروستیان زانیوە عیلەت هێنانەوە بۆ یەك حوكم بەدوو عیلەت یا زیاتر، ئیتر عیلەتەكە دەقی لەسەربێ یا لەدەقەكان دەرهێنرابێ. چونكە ئەو عیلەتانەی لەشەرع وەرگیراون هەموویان نیشانەن، نەك تأشیركەر،هیچ ڕێگرێكیش نیە یەك شت چەندەها ناوونیشانی هەبێ، هەر ئەو جەماوەری زانایانە ووتوویانە شتی وا ڕوی داوە، وەك پێوەتلان و بەردەست پێوەدان و مێز، كە هەریەك لەمانە بەتاڵ كەرەوەی دەست نوێژن و ڕێگرن لەوەی نوێژ بەدروست ئەنجام بدرێ .

(٣) ابن فەورەك و ڕازی بەڕەوایان زانیوە عیلەت هێنانەوە بۆ حوكمێك بە دوو عیلەت، بەڵام لەعیلەتێكدا كە دەقی لەسەربێ، نەك لەدەقەكان دەرهێنرابێ، چونكە ئەو سیفەتانەی لەدەقەكان دەرئەهێنرێ و دەگونجێ هەریەكێكیان سەربەخۆ بكرێ بەعیلەت ئەوە دەست ئەدا بەلای شارعە وەكۆی هەموویان عیلەت بێ، ئیتر دیار نیە سەربەخۆیی هەریەك لەو سیفەتانە هەتا بووترێ: دوو عیلەتی سەربەخۆ زیاتر هەن لەسەر یەك مەعلول، بەڵام ئەوە جیایە كە دەق هەبێ لەسەربەخۆیی لە بەعیلەت بونیدا .

و أُجيبَ بانه يتعين الاستقال بالاستنباط ايضاً وحكي ابن الحاجب عكس هذا ايضاً في الجواز في المستنبطة دون المنصوصة لأن المنصوصة قطعية فلو تعدد لزم المحال الذي بخلاف المستنبطة لجواز أن تكون العلة فيها عند الشارع مجموع لاوصاف وسقط المصنِّف هذا القول لقوله لم أره لغيره[1]. {ومنعه امام الحرمين شرعاً مطلقاً} مع تجويزه عقلا قال لانه لوجاز شرعا لوقع ولو نادرا لكنه لم يقع و أُجيبَ على تقدير تسليم اللزوم بمنع عدم الوقوع وأسند بما تقدَّمَ من أسباب الحدث ولامام يجعل الحكم فيها متعدداً أي الحكم المستند الى واحد منها غير المستند الى آخر وان اتفقا نوعاً[2]. و قيلَ يَجوزُ في التعاقب} دون المعية للزوم المحال الآني لها بخلاف التعاقب لان الذي وجد في الثانية مثلاً مثل الاول لاعينه[3].

(١) وەلام دراوەتەوە ئەوە کەسەر بەخۆیەتیش بەعیلەتێکی دوور هێنراویش دەبێ، ابن الحاجب پێچەوانەی ئەمەشی گێڕاوەتەوە، واتە لە عیلەتی دەرهێنراودا دروستە، چونکە عیلەتی پشت ئەستور بەدەق بێ گومانە، جا ئەگەر چەند بەڵگەیەکی بێ گومان لازم دەکا ئەو مەحاڵەی لەمەودوا باس دەکرێ بەیەکێکیان حوکمەکە دەسەلمێ، تر دووهەمیان تحصیلی حاصل و پەیداکردنی شتێکە کەیدا کراوە، بەلام عیلەتی دەرهێنراو وانیە، چونکە ئەگونجێ عیلەتەکە بەلای شارعەوە کۆی هەمو سیفەتەکان بێ. دانەر ئەم قەولەی کە ابن الحاجب گێڕایەوە باس نەکرد لەبەر ئەوەی کە خۆی دەڵێ: چونکە جگە لە ابن الحاجب نەبێ لە کەسیترم نەبیستووە.

(٢) ئیمام الحرمین لەڕووی شەرعەوە قەدەغەی کردووە یەك حوکم دوو عیلەتی بۆ بهێنرێتەوە چ دەقی لەسەربێ یاخود لەدەق دەرهێنرابێ، لەگەڵ ئەوەش لەڕووی عەقڵیشەوە بەڕەوای زانیوە، دەڵێ: چونکە ئەگەر لەڕووی شەرعەوە دروست بوایە با کەمێکیش بوایە ڕویدەداو بەکردار دەسەلمێنرا، بەلام کەڕووی نەداوە مانای وایە دروست نیە، وەلام دراوەتەوە کە نابێ بووترێ نەبووە و ڕووی نەداوە، هەرچەندە ئەوەش بسەلمێنین بلێن: ئەگەر دروست بوایە ڕووی دەدا، بەلام نابێ بلێت: ڕووی نەداتوە، ئەوە نیە لەپێشەوە سێ هۆکاری دەست نوێژ شکاندنمان باس کرد، کەوابوو ڕووی‌داوە، بەس ئیمام الحرمین حوکم لەوانەدا بەچ چەند حوکمێك دادەنێ، واتە ئەو حوکمەی دەدرێتە پاڵ یەکێکیان غەیری ئەو حوکمەیە دەدرێتە پاڵ ئەویتریان هەرچەند هەردوو حوکمەکان لەڕووی جۆرەوە یەك جۆر بن.

هەندێك ووتوویانە: ئەگەر ئەو عیلەتە یەك لەدوای یەك بن دروستە، بەلام پێکەوە بن دروست نیە، چونکە مەحاڵە کە لازم دێ نەك بۆ یەك لەدوای یەکەکە، چونکە ئەو

{والصحيح القطع بامتناعه عقلا مطلقاً للزوم المحال من وقعه بجمع النقيضين فان الشيء باستثناده الى كل واحدة من علتين يستغني عن الاخرى فليزم ان يكون مستغنياً عن كل منهما وغير مستغن عنه وذلك جمع بين النقيضين ويلزم ايضاً تحصيل الحاصل في التعاقب حيثُ يوجد بالثانية مثلا نية مثلاً نفس الموجود بالاولى ومنهم من قصر المحال الاول على المعية و أُجيبَ من جهة الجمهور بان المحال المذكور انما يلزم في العلل العقلية المفيدة لوجود بالاولى ومنهم من قصر المحال الاول على المعية[1].

و أُجيبَ من جهة الجمهور بأن المحال المذكور انما يلزم العلل العقلية المفيدة لوجود المعلول فاما الشرعية التي هي معرفات مفيدة للعلم به فلا وعلى المنع حيث قيل به فما يذكره المجيز من التعدد اما ان يُقال فيه العلة مجموع الامرين مثلاً او احدهما لا بعينه كما قيل بذلك او يقال فيه بتعدد الحكم كما تقدَّمَ عن امام الحرمين ومال إليه المصنِّف[2].

---

حوکمەی لەدووهەمەکەدا هەیە وەك یەکەمەکەیە نەك خودی ئەوە.

(١) قەولی صەحیح ئەوەیە کە بێ گومان لەڕووی عەقڵەوە نابێ حوکمێك دو عیلەتی بۆ بهێنرێتەوە، چ پێکەوە بێ وە چ یەك لەدوای یەك بن، چونکە شتێکی مەحاڵ ڕوو دەدات، وەك خڕ بوونەوەی دوو شتی دژ بەیەك، چونکە ئەو حوکمی دوو عیلەتی بۆ هێنراوەتەوە ئەگەر پاڵی بدەینەوە بەیەکێکیانەوە ئیتر پێویستی بەوی تریان نابێ. دەی کەوابوو دەبێ ئەو حوکمە پێویست بەهیچ کام لەو دوو عیلەتە نەبێ و پێویستیشی پێ هەبێ، ئەوەش خڕبوونەوەی دوو دژە، وە هەم دووبارە لازم دەکا تحصیلی حاصل لە هێنانیاندا بەیەك لەدوای یەك چونکە ئەوەی بەهۆی عیلەتی دووهەمەوە پەیدا بووە هەر خودی ئەوەیە کەبەعیلەتی یەکەم پەیدا بووە، هەندێکیان مەحالوشوێنە یەکەمەکان، کە خڕبوونەوەی دوو دژە، کورت هەڵهێناوەتە سەر ئەو دوو عیلەتەی پێکەوە داباریونەتە سەر حوکمەکە.

(٢) لەلایەن جەماوەری زانایانەوە وەڵام دراوەتەوە کە ئەو مەحالوشوێنی باسکرا لەعیلەتە عەقڵیەکاندا دەبێ کە دەبنە هۆی پەیدابوونی مەعلول و عیلەت بۆ هێنراوەکە، بەڵام عیلەتە شەرعیەکان کە تەنها چەند نیشانەیەکن عیلم بەبوونی معلولەکە دەگەیەنن ئەو مەحاڵە لازم ناکات، لەسەر قەولی ئەوەش کە دەڵێ نابێ یەك حوکم دوو عیلەتی هەبێ لە هەر جێیەك ئەمە ووترا، ئەوەش کە جەماوەری زانایان وتیان فرەیی لەعیلەتدا دروستە، بەم شێوە وەڵامیان دەداتەوە: یا دەووترێ عیلەتەکە

**{والمختار وقوع حكمين بعلة اثباتا كالسرقة للقطع والغرم} حين يتلف المسروق أي وجوبهما[1] {ونفيا كالحيض للصوم والصلاة وغيرهما} كالطواف وقراءة القرآن ي لحرمتها وَ قِيلَ يمتنع تعليل حكمين بعلة بناء على اشتراط المناسبة فيها لأن ـاسبتها لحكم تحصل المقصود منها بترتيب الحكم عليها فلو ناسبت آخر لزم تحصيل الحاصل و أُجيبَ بمنع ذلك وسنده جواز تعدد المقصود كما في السرقة لمرتب عليها القطع زجرا عنها والغرم جبرا لما تلف من المال[2].**

ـۆی هەردووکیانە، ئەگەر پێکەوە بن، یاخود یەکێکیانەبێ دیاری کردنی، ئەگەر ـەردوابن، وەك هەندێك ئەوەیان ووت، یاخود دەووترێ: ئەوە حوکمێك نیە بەڵکو ـەند حوکمێکن و چەند شەخسێکن و جۆرەکەیان یەکە، وەك لەپێشەوە لە ئیمام ـحرمین گێڕایەوەو دانەریش حەزی لەو ڕایە بوو، بۆیە ووتی قەولی صەحیح .

(١) قەولی هەڵبژاردە ئەوەیە دەبێ دوو حوکم بەیەك عیلەت پەیدا بن، چ ئەو دوو حوکمە هەردووکیان موسبەت بن، وەك دزیەتی عیلەتە بۆ دەست بڕینیش و بۆ ـگردنەوەش، کاتێ دزراوەکە نەمابێ، واتە عیلەتە بۆ واجب بوونی بڕینەکەش و ـگردنەوەکەش.

(٢) وە چ ئەو دوو حکمە هەردووکیان مەنفی بن ، وەك ئەوەی حەیز عیلەتە ـۆ نەگرتنی ڕۆژوو نەکردنی نوێژو غەیری ئەمانەش وەك دروست نەبوونی سوڕانەوە ـەدەوری کەعبەداو خوێندنی قورئان، واتە ئەو حەیزە عیلەتە بۆ حەرامی ئەمانە، ـەندێك وتوویانە: دوو حکم عیلەتێکیان بۆ بهێنرێتەوە قەدەغە، ئەم قەولەش ـەسەر ئەوە دروست بووە کە بەمەرج گیراوە موناسبەو خزمایەتی هەبێ لەنێوان حوکم و عیلەکەدا قەولەش لەسەر ئەوە دروست بووە کە بە مەرج گیراوە موناسبەو خزمایەتی بێ لەنێوان حوکم و عیلەتەکدا چونکە موناسبەی عیلەتەکە بۆ حوکمەکە مەبەستی عیلەتەکە پەیدا دەکا، بەم شێوە کە حوکمەکە لەسەر عیلەتەکە ـەرتیب دەبێ، جا ئەگەر عیلەتەکە موناسەبەی هەبێ لەگەڵ حوکمێکی تردا لازم دەکا پەیداکردنی شتێ کە پەیدا بووە، وەڵام دراوەتەوە کە ئەو تحصیلی حاصلە لازم ناکا ، بۆیە لازم ناکا چونکە دروستە چەند مەبەست و حیکمەتی زۆر هەبێ ، وەك لە دزیدا دەبێتە هۆی دەست بڕینی دزەکە ، کە دەبێتە هۆی ئەوە جارێکی‌تر دزی نەکرێ، وە پێشی دەبیژێرێ بۆ ئەوەی ئەو ماڵەی کە فەوتاوە جەبر بکرێتەوە و بدرێتەوە .

{وثالثها} يَجوزُ تعليل حكمين بعلة {ان لم يتضادا} بخلاف ماذا تضادا كالتأبيد لصحة البيع وبطلان الاجارة لان الشيء الواحد لا يناسب المتضادين[1] {ومنها} اي من شروط الالحاق بالعلة {ان لا يكون ثبوتها متاخرا عن ثبوت حكم الاصل} سواء فسرت بالباعث أم المعرف لان الباعث على الشيء او المعرف له لا يتأخر عنه {خلافا لقوم} في تجويزهم تأخر ثبوتها بناء على تفسيرها بالمعرف كما يقال عرق الكلب نجس كلعا به لانه مستقذر فان السقذاره انما ثبت بعد ثبوت نجاسته[2] {ومنها ان لا تعود على الاصل} الذي استبطت منه {بالابطال} لانه منشؤها فابطالها له ابطال لها كتعليل الحنفيه وجوب الشاة في الزكاة بدفع حاجة الفقير فإنَّهُ مجوز لاخراج قيمة الشاة مفض الى عدم وجوبها على التعيين بالتخير بينها وبين قيمتها[3].

(١) قەولی سێهەم دەڵێ: دروستە عیلەت هێنانەوە بۆ حوکم بەیەك عیلەت ئەگەر ئەو دوو حکمە دژ بەیەك نەبن، بەلأم ئەگەر دژ بەیەك بن دروست نیە، وەك مەرجی بەهەتا هەتایی گرتن چ بۆ دروستی کڕین و فرۆشتنی بێ و یا بۆ نادروستی و پووچەڵی بەکرێ دان بێ، دروست و نادروست دوو شت دژ بەیەکن نابێ یەك عیلەتیا بۆ بهێنرێتەوە، چونکە یەك شتی تەنها نابێ موناسب بێ بۆ دوو شتی دژ بەیەك.

(٢) یەکێکی تر لەمەرجەکانی قیاس کردنی فەرعە کە بۆ سەر ئەصڵەکە بەهۆی عیلەتەوە، دەبێ سابت بوونی ئەو عیلەتە لەدوای سابت بوونی حوکمی ئەصڵەکەوە نەبووبێو دوا نەکەوتبێ، ئیتر یەکسانی ئەو عیلەتە بەباعس و هانەدەرو زیندوکەرەوە وهۆ لێك بدرێتەوە یاخود بەنیشانە، چونکە هۆی شتێك و نیشانەی شتێك لەو شتە دواناکەوێ، ئەم قسەش جیاوازە بۆ گەڵێ زانایان کە دەڵێن: دروستە دواکەوتنی ئەو عیلەتە، بۆیە وا دەڵێن: چونکە عیلەتیان بەنیشانە لێك داوەتەوە، وەك دەوترێ، عەرەقی سەگ پیسە وەك لیکەکەی وایە، چونکە قێزەونە، قێزەونیەکەش دوای سابت بونی پیسیەکەی پەیدا بووە.

(٣) مەرجێکی تری ئەو عیلەتە ئەوەیە ئەو عیلەتە دەگەڕێتەوە سەر حوکمی ئەو ئەصڵەی کەڵی دەرهێنراوە و پووچەڵی کاتەوە، چونکە ئەو ئەصڵە سەرچاوەی عیلەتەکەیە، کەوابوو پوچەڵ کردنەوەی ئەصڵەکە پوچەڵ کردنەوەی خۆیەتی، وەك عیلەت هێنانەوەی زانایانی حەنەفی لەواجب بوونی ساتێکدا لە زەکات، بەلابردنی پێویستی هەژار، ئەو عیلەتە خۆی ڕێدەدا لەباتی شەکەکە قیمە تەکەی بدات و دەرکات، وە خودی ئەو عیلەتە کە چارەی هەژاریە سەرئەکێشێ بۆ ئەوەی کەخودی شەکەکە واجب نەبێ، بەڵکو بخرێتە بەر ویستی ئارەزووەوە لەنێوان شەکەکەو

{وفي عودها}على الاصل {بالتخصيص} له {لا التعميم قولان} قيل يَجوزُ فلايشترط عمه وَ قيلَ لا فيشترط مثاله تعليل الحكم في آية او لامستم النساء بان اللمس مظنة لاستمتاع فإنَّهُ يخرج من النساء المحارم فلا ينقض لمسهن الوضوء كما هو أظهر قولي الشافعي والثاني ينقض عملا بالعموم[1] وتعليل الحكم في حديث ابي داود وغيره نه ﷺ نهي عن بيع اللحم بالحيوان بانه بيع الربوي المنع نظرا للعموم ولاختلاف لترجيح في الفروع أطلق المصنّف القولين[2].

---

ێمەتەکەیدا، عیلەتەکە بریتیە لـە لابردنـی هەژاریەکـە، ئەصڵەکـەش شـەکەکەیە، حوکمەکەش وجوبە، لێرەدا عیلەتەکە بووە هۆی واجب نەبوونی خودی شـەکەکە، بەم شێوەیە بووە هۆی پوچەڵ کردنەوەی ئەصڵەکە.

(١) بەڵام ئەگەر عیلەتەکە بگەڕێتەوە بۆ سەر حوکمی ئەصڵەکە تایبەتی بکات،نەك گشتگیری بکات، ئەوە دووقەولی تێدا هەیە ئەگەر گشتگیری بکـات بـەڕای هـەمووان دروسـتە، قـەولێکیان دەڵـێ: ئـەو گەڕانـەوە دروسـتە، کـەوابوو بەمـەرج نـەگیراوە گەڕاندنەوەکـەی، قـەولێکی تریـان دەڵـێ: دروسـت نیـە کـەوابوو بەمـەرج گـیراوە گەڕانەوەکەی، نمونەی گەڕانەوەی عیلەتەکە بۆ سەر حوکمی ئەصڵەکە، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ ئەم حوکمە لەم ئایەتەدا کە ئەفەرمووێ: یاخود تلان بەژنانـەوە، چونکە لمس و تلان بەژنانەوە جێ گومانی لەزەت وەرگرتنە، ئەم عیلەتە ژنانی مـەحرەم لە حوکمی دەستنوێژ شکاندن دەباتە دەر، کەوابوو تلان بەژنانی مەحرەمە دەستنوێژ ناشکێنێ، کە ئەمەش دیارترینی قەولی شافیعیە لەدوو قەولەکەیدا، دووهەمیشـیان دەڵێ: دەی شکێنێ چونکە ئایەتەکە ژنان دەفەرمێ، مەحرەمیش دەگرێتەوە،

(٢) یاخود وەك عیلـەت هێنانـەوە بۆ ئـەم حوکمـە لـەم فـەرموودەدا کـە ئـەبو داودو غەیری ئەویش ڕوایەتیان کردووە، دەفەرمووی: پێغەمبەر قەدەغەی کردووە گۆشتت بفرۆشرێ بەحەیوان، واتە پێنج کیلۆ گۆشت بەکاورێك، چونکە کڕیـن و فرۆشـتنی گۆشـت یەکێکـە لـەو مادانـەی کەسـووی تێدایـە، دەی فـرۆش بەئەصڵەکـە کـە حەیوانەکەیە، ئەو عیلەت هێنانەوە بەم شێوەیەش ئەوە دەگەیێنێ دروستە فرۆشتی گۆشت بەغەیری خۆی ئیتر بخورێ یان نەخورێ، کە ئەوەش یەکێکە لەو دووقەولـەی شافعیە، بەڵام قەولی زۆر دیاریان ئەوەیە کە نابێ کڕین و فرۆشتنی گۆشت بەغـەیری ڕەگەزی خۆیشی، چونکە سـەرنجی گشت گیری لەفظەکانی کردووە، ئەی دانـەر بـۆ یـەکێ لـەو دوو قەولـەی تـەرجیح نـەدا؟ بۆیـە بـە موتڵـەقی هێشـتنیەوە، چونکـە لەتەرجیحی فروعدا جیاوازی هەیە.

وقولــه لا التعميــم اي فإنَّــهُ يَجــوزُ العــود بــه قــولا واحــد كتعليــل الحكــم في حديث صحيحين (لا يحكم احد بين اثنين وهو غضبان) بتشويش الفكر فإنَّهُ يشمل غير الغضب ايضاً[1].

{و} من شروط الالحاق {أن لا تكون المستنبطة} منها {معارضه بمعارض مناف لمقتضاها {موجود في الاصل} اذ لاعمل لها مع وجوده إلاّ بمرجح قال المصنِّف:مثاله قول الحنفي في نفي التبيت في صوم رمضان صوم عين فيتأدى بالنبية قبل الزوال كالنفل فيعارضه الشافعي فيقول صوم فرض فيحتاطفيه و لايبني على السهولة اهـ وهذا مثال للمعارض في الجملة وليس منافيا ولاموجوداً في الاصل[2]. {قيل ولا} في {الفرع} اي ويشترط ان لا تكون معارضة بمناف موجود في الفرع ايضا[3].

---

(١) دانەر كەووتی: نەك گشتگیری بكا، واتە دروستە عیلەتەكە بگەڕێتەوە بۆ حوكمی سەر ئەصڵەكەو گشتگیری بكا ئەوە یەك قەولی تێدا هەیە كە ڕای هەموانەو دروستە، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ ئەم حوكمە لەم فەرموودەدا كە بوخاری و موسلیم ڕوایەتیان كردووە و دەفەرمووی: كەس حوكم نەكا لەنێوان دوو كەسدا، لەكاتێكدا كە تەواو تووڕە بێ، چونكە فكری ئارام نیە، دەی ئارام نەبوونی فكر تووڕەیی‌وغەیری تووڕەییش دەگرێتەوە.

(٢) یەكێكی تر لەمەرجەكانی قیاس كردنی فەرع لەسەر حوكمی ئەصڵەكە بەهۆی عیلەتەكەوە دەبێ ئەو عیلەتەی كە لەدەقەكەوە دەرهێنراوە ڕەخنەو ڕێ لێ نەگیری بەهۆی نەیارێكەوە كە دژی ئەو حوكمی عیلەتەبێ كە لە ئەصڵەكەدا هەیە، چونكە عیلەتەكە هیچ كارو دەورێكی نیە لەگەڵ هەبوونی نەیارو ڕێگردا مەگەر شتێ هەبێ تەرجیحی بدا ئەوكاتە نەیارەكە كارناكا. دانەر دەڵێ: نموونەكەش ئەو قسەی حەنەفیە كە دەڵێ: لەبەر ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان هەمووكەس دەبێ بیگرێ، لەشەودا نیەت هێنان واجب نیە، كەوابوو ڕۆژووەكە بەهۆی نیەتهێنانەوە پێش ئەوەی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان لابدا هەر ئەدا دەكرێ وەك ڕۆژووی سوننەت وایە، شافعی نەیاری دەكاو دەڵێ: ڕۆژووی ڕەمەزان ڕۆژووی فەرزە، بۆیە دەبێ ئیحتیاتی تێدابكرێ و نابێ لەسەر ئاسانكاری دروست بكرێ، كۆتایی بە قسەكە هات، ئەم نموونەیە كەمەكێك نەیارە نەك تەواو وە ڕۆژووی فەرزیش لەگەڵ حوكمە ئەصڵەكەدا دژ نیەو لەئەصڵەكەشدا كە نەفلەكەیە نیە.

(٣) هەندێك ووتوویانە: هەم بەمەرج گیراوە ئەو عیلەتە دەرهێنراوە نەیاری نەكرێ بەدژێك و وە دەبێ دووبارە لەفەرعەكەشدا هەبێ .

..ن المقصود من ثبوتها ثبوت الحكم في الفرع ومع وجود المنافي فيه المستند الى قيس آخر لا يثبت قال المصنّف مثاله قولنا في مسح الراس ركن في الوضوء فيسنّ تثليثه كغسل الوجه فيعارضه الخصم فيقول مسح فلا يسن تثليثه كالمسح على الخفين اهـ و هو مثال للمعارض في الجملة وليس منافيا[1] وانما ضعفوا هذا الشرط ..ن لم يثبت الحكم في الفرع عند انتفائه لان الكلام في شروط العلة وهذا الشرط لثبوت الحكم في الفرع كما تقدَّمَ اخذه من قوله وتقبل المعارضة فيه الخ ..لايقدح في صحة العلة في نفسها وانما قيد المعارض بالمنافي لانه قد لا ينافي كما سيأتي فلا يشترط انتفاؤه ويَجوزُ أن يكون هو علة ايضا بناء على جواز التعليل ..علتين[2]. {و} من شروط الإلحاق بالعلة {أن لا تخالف نصا او اجماعا} لانهما مقدمان على القياس[3].

(١) چونکە مەبەست لەسابت بوونی ئەو عیلەتە سابت بوونی حوکمەکەشە ..لەفەرعەکەداو لەگەڵ هەبوونی دژێك لە فەرعەکەدا ئەگەر هەبوون دژێك لەفەرعەکەدا کەپشت ئەستورە بەقیاسێکی‌تر ئەو حوکمە سابت نابێ، دانەر ووتوویەتی نمونەکەی ..ەوەیە ئێمە دەڵێین: مەسحی سەر ڕووکنی دەستنوێژە، کەوابوو وەك شۆردنی دەم و چاو سێ‌بارە کردنەوەی سوننەتە، نەیاریش ڕەخنەی لێ دەگرێ و دەڵێ: مەسحە مەسحە وەك مەسیحی هەردوو خوف، کەوابو سێ بارەکردنەوەی سوننەت نیە، ئەوە نموونەی نەیارێکی تەواو نیە و کەمەکێك نەیارە و ڕوکن و مەسحیش دژی یەك نین.

(٢) بۆ ئەم مەرجەیان بەلاواز باس کردووە هەرچەند حوکم فەرعە سابت نابێ کاتێ ئەو مەرجەیە نەبێ؟ چونکە ئەم گوفتوگۆیە لەبارەی مەرجی عیلەتەوەیە، ئەمەش مەرجی سابت بوونی حوکمی فەرعەکەیە وەك لەپێشەوە ڕابورد و وەرگیرا لەو قسەی ..انەرەکە وتوویەتی: نەیار لەفەرعەکەدا قەبوڵ دەکرێ، بەلام نەبوونی ئەم مەرجە ..زیان لەدروستی خودی عیلەتەکە نادا، بۆیە نەیاریان لکاندووە بەوە کە دژایەتی یەك نەکەن، چونکە لە مەودوا دێ کە جاری وا هەیە دژایەتی یەك ناکەن، بۆیە بەمەرج نەگیراوە نەبوونی نەیارێکی نەدژ، دەستیش ئەدا ئەو نەیارە نەدژەش عیلەت بێ وەك عیلەتەکەی تر، لەسەر ئەو قاعدە کە دەڵێ: دروستە عیلەت هێنانەوە بۆ حوکم بەدوو عیلەت.

(٣) یەکێکی‌تر لەمەرجەکانی‌قیاس کردنی فەرعێك لەسەر ئەصڵێك بەهۆی عیلەتەوە دەبێ ئەو عیلەتە جیاواز نەبێ بۆ حوکمی دەقێك یاخود ڕای بەکۆمەڵی موسڵمانان و زانایان، چونکە ئەم دوانە لەحوکمدانیدا لەپێشەوەی قیاسەوەن .

مثال مخالفة النص قول الحنفي المرأة مالكة لبعضعها فيصح نكاحها بغير اذن وليها قياسا على بيع سلعتها فإنَّهُ مخالف لحديث ابي داود وغيره أيما امرة نكحت نفسها بغير اذن وليها فنكاحها باطل ومثال مخالفة الاجماع قياس صلاة المسافر على صومه في عدم الوجوب بجامع السفر المشق فإنَّهُ مخالف للاجماع على وجوب ادائها عليه[1].

{و} ان {لا تتضمن اي على النص {ان نافت الزيادة مقتضاه} بأن يدل النص على عليه وصف ويزد الاستنباط قيداً فيه منافياً للنص فلا يعمل الاستنباط لان النص مقدم عليه[2]. {وفاقا للامدى} في هذا الشرط بقيده وغيره اطلقه عن هذا القيد قال المصنّف كالهندي وانما يتجه بناء على ان الزيادة علىالنص نسخ للنص وهو قول الحنفية كما تقدَّم[3].

---

(١) نمونە بۆ ئەوەی جیاوازبێ بۆ دەقێك، ئەمە قسەی حەنەفیە كە دەڵێ: ژن خاوەنی هەموو شتێكی خۆیەتی، كەوابوو دروستە مارە برینی بێ ئەوەی خاوەن و كەسوكاری مۆڵەت بدەن، ئەمەش بەقیاس كردنی لەسەر ئەوەی كە خاوەن كڕین و فرۆشتنی شت و مەكی خۆیەتی. ئەم قسەیە جیاوازە بۆ ئەو فەرموودەیە: ئەبو داودو غەیری ئەویش ڕیوایەتی دەكەن و دەفەرمووێ: هەر ژنێك خۆی مارە ببڕێ بێ ئەوەی كەسوكاری مۆڵەتی بدەن ئەوە ئەو مارە بڕینەی بەتاڵە، نمونەش بۆ ئەوەی پێچەوانەو جیاوازی كۆی ڕای زانایانی بێ وەك قیاس كردنی نوێژی موسافر لەسەر ڕۆژووەكەی: لەوەدا كەوەك واجب نیە لەسەری ڕۆژوو بگرێ واجبیش نیە نوێژ بكا، بەهۆی عیلەتێكەوە كەسەفەری زەحمەت دەرو سەختكارە، ئەوە جیاوازە بۆ ئیجماع و كۆی ڕای زانایان كە دەڵێ: واجبە موسافر نوێژ بكاو جێبەجێی بكا.

(٢) وە هەم دەبێ ئەو عیلەتە زیادەیەك نەگرێتە خۆ لەسەر دەقەكە، ئەگەر ئەو زیادەیە دژایەتی حوكمی دەقەكە بكا، بەم شێوەیە كە دەقەكە دەلاڵەت بكا لەسەر ئەوە كە تەنها ئەو سیفەتە عیلەتە، بەلام إستنبات و دەرهێنانەكەی شتێكی تری پێوە بلكێنێ كە دژ بەدەقەكەبێ، ئا لەو كاتەدا كار ناكرێ بەوەی دەرهێنراوە، چونكە دەق لەپێشەوەی ئەو عیلەتەوە دۆزراوەتەوە و هەڵگۆزراوە لە دەقەكە.

(٣) ئامێدیش هام دەنگە لەم مەرجەدا، بەلام بەمەرجەكەیەوە كەووتی: ئەگەر زیادەكە دژی حوكمی دەقەكە نەبێ، غەیری ئامێدیش دەڵێن: ئەو مەرجە هیچ شتێكی پێوە نالكێنرێ، دانەریش وەك زانای هیندی وتوویەتی: بۆیە ئەو قسەی غەیرە بەجێیە، چونكە شتی زیادە لەسەر دەقەكە سڕینەوەی دەقەكەیە، ئەم قسەش قسەی

{و} من شروط الالحاق بالعلة {أن تتعين خلافاً لمن اكتفى بعلية مبهم} من امرين مثلا {مشترك} بين المقيس والمقيس عليه لان العلة منشأ التعدية المحققه للقياس الذي هو الدليل ومن شأن الدليل أن يكون معينا فكذا منشا المحقق له والمخالف قال المبهم المشترك يحصل المقصود[1].

{و} من شروط الالحاق بالعلة {أن لا تكون وصاف مقدراً وفاقا للامام} الرازي قال: لايَجوزُ التعليل به خلافاً لبعض الفقهاء مثاله قولهم الملك معنى مقدر شرعي في محل أثره اطلاق التصرفات اه وكانه ينازع في كون الملك مقدرا ويجعله مخففا شرعا يرجع كلامه الى انه لا مقدر يعلل به كما فيهّمه عنه التبريزي فينتفي الالحاق به كما قصده المصنّف[2].

---

ـتيانی پەیڕەوی حەنەفیە، وەك لەپێشەوە ڕابورد.

(١) یەکێکیتر لەمەرجەکانی قیاس کردنی فەرع لەسەر ئەصڵ بەهۆی عیلەتەکەوە، دەبێ ئەو عیلەتە دیاری کراوبێ و بزانرێ ئا ئەوەیە عیلەتەکە بەجیاوازی بۆ ئەوەی دەڵێ: ئەگەر عیلەتێکی نادیاربێ هەر ئەو دەست دەدا بۆ بەعیلەت بوون، بووترێ یەکێك لەو دوانە عیلەتە، بەڵام دەبێ قیاس کراوو لەسەر قیاس کراو هاوبەش بن لەو عیلەتەدا، بۆیە دەبێ دیاری کراوبێ؟ چونکە سەرچاوەی گواستنەوەی حوکمەکە عیلەتەکەیە، کە ئەو گواستنەوەش قیاسەکە پەیدا دەکا لەواقعدا، قیاسیش بریتیە لە بەڵگەکە، بەڵگەش دەبێ دیاری کراوبێ، هەروەها سەرچاوەی ئەمەش کە بەڵگەکە دەی سەلمێنێ، کە عیلەتەکەیە گواستنەوەکە دەسەلمێنێ، قەولی جیاوازیش دەڵێ: عیلەتێکی نادیار کە قیاس کراوو قیاس لەسەر کراوی تێدا هاوبەش بن مەبەستەکە دێنێتە دێ، مادەم مەبەست بێتەدی دروستە.

(٢) مەرجێکی تری قیاسی فەرع لەسەر ئەصڵ بەهۆی عیلەتە وە ئەوەیە ئەو عیلەتە سیفەتێکی خەیاڵی نەبێ و واقیعی بێ، پێشەوا ڕازیش هاودەنگە بۆ ئەم مەرجەو دەڵێ: دروست نیە عیلەت هێنانەوە بەشتێ گریمانی بۆ بکرێ، بەپێچەوانەی هەندێ شەرع زان، نمونەکەش وەك دەڵێن: خاوەنیەتی مانایێکە شەرع بوونەکەی بۆ دەبینێتەوە –نەك واقعەن– لەشوێنێکا کە هی ئەو خاوەنیە، نیشانەو شوێنەواری ئەو خاوەنیەتیە بەر بۆ بەرەڵاکردنیەتی لەهەموو ئاڵوگۆڕێکدا بێ ئەوەی مۆڵەت لەکەس بخوازێ، کۆتایی پێ هات پێشەوا ڕازی وا دەرئەکەوێ دەکەوێتە کێشەوە لەگەڵیاندا کە خاوەنیەتی شتێکی خەیاڵی بێ، بەڵکو ئەم دای دەنێ بەشتێکی واقعی و بوونێکی بێ گومان لەلایەن شەرعەوە، سەرئەنجامی قسەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە

{و} من شروط الالحاق بالعلة {أن لا يتناول دليلها حكم الفرع بعمومه أو خصوصه على المختار} للاستغناء حينئذٍ عن القياس بذلك الدليل مثاله في العموم حديث مسلم الطعام بالطعام مثلاً بمثل فإنَّهُ دال على عليه الطعم فلا حاجة في اثبات ربوية التفاح مثلاً الى قياسه على البر بجامع الطعم للاستغناء عنه بعوم الحديث[1].

ومثاله في الخصوص حديث من قاء اورعف فليتوضأ فان دال على علية الخارج النجس في نقض الوضوء فلا حاجة للحنفي الى قياس الي أوالرعاف على الخارج من السبيلين في نقض الوضوء بجامع الخارج النجس للاستغناء عنه بخصوص الحديث والمخالف يقول الاستغناء عن القياس بالنص لا يوجب الغاء لوجواز دليلين على مدلول واحد والحديث رواه ابن مجاه وغيره وهو ضعيف[2].

---

کە شتێکی خەیاڵی فەرەزی نیە بکرێتە عیلەت، وەك تەبرێزی وهای لێ حاڵی بووە. بەهۆی شتی خەیاڵی و فەرزەیەوە قیاسی فەرع ناکرێتە سەر ئەصلْ، وەك ویستی دانەر وەهایە لەدەستەواژەکەیەوە وا دەر دەخا.

(١) یەکێکی تر لەمەرجەکانی قیاس کردنی فەرع لەسەر ئەصلْ بەهۆی عیلەتەوە ئەوەیە ئەو عیلەتە بەڵگەکەی گشتگیر نەبێ حوکمی فەرعەکەش بگێرێتەوە، چ بەهۆی گشتگیری بەڵگەکەوە بێ یاخود بەهۆی تایبەت مەندی بەڵگەکەوە بێ، ئەمەش قەوڵی هەڵبژاردەیە، چونکە بەهۆی ئەو بەڵگەوە لەم کاتەدا پێویستمان بەقیاسەکە نیە. چونکە فەرعەکەش دەگەرێتەوە، نمونەش لەگشتگیریەکەیدا ئەو فەرموودەیە کە موسلیم ڕوایەتی دەکاو ئەفەرمووی: فرۆشتنی پێخۆر بەپێخۆر دەبێ نمونەی یەك بن. ئەم فەرموودەیە دەلاڵەت دەکا لەسەر ئەوە کە عیلەتەکە پێخۆریەتیە، ئێمە پێویست ناکا لەسەلماندنی بەڕێبابوونی سیودا بۆ نموونە کە قیاس بکرێتە سەر گەنم بەهۆی عیلەتێکە کە کۆکەرەوەی هەردووکیانە، کەتەعم و پێخۆریە، چونکە لەبەر گشتگیری فەرموودەکە پێویست بەقیاس ناکا.

(٢) نموونەش لەتایبەتدا، ئەو فەرموودەیە کە دەفەرمووی: هەرکەس برشێتەوە یاخود خوێن لەلوتی بێ یا دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەم فەرموودەیە دەلالەت دەکا لەسەر بەعیلەت بوونی ئەوەی لەلاشە بێتە دەرەوەو پیس بێ لەشکاندنی دەستنوێژدا، ئیتر پێویست ناکا حەنەفی قیاسی ڕشانەوەو لوت پژان بکاتە سەر ئەوەی لەپێشوو پاشەوەی موسڵمان دێتە دەر بۆ شکاندنی دەستنوێژ، بەهۆی عیلەتێکە کە کۆکەرەوەی هەردووکیانە، کە هاتنە دەرەوەی شتی پیس بێ، چونکە پێویست بەو قیاسە ناکات، بە هۆی تایبەتی فەرموودەکەوە، نەیاریش دەڵێ: ئەمەی بەهۆی

{والصحيح} انه {لا يشترط } في العلة المستنبطة {القطع بحكم الصل} بأن يكون
ـيله قطعيا من كتاب او سنة متواترة {لا انتفاء مخالفة مذهب الصحابي {اي
ـخالفتها له {ولا القطع بوجدها في الفرع} بل يكفي الظن بذلك وبحكم الاصل لانه
ـية الاجتهاد فيما يقصد به العلمل والمخالف كانه يقول الظن يضعف بكثرة
ـقدمات فربما يضمحل فلا يكفي(١) .

واما مذهب الصحابي فليس بحجة وعلى تقدير حجيته فمذهبه الذي خالفته العلة
ـستنبطة من النص في الاصل بأن علل هو بغيرها يَجوزُ أن يستند فيه الى دليل آخر
ـلخصم يقول الظاهر استناده الى النص المذكور(٢).

---

ـقەکەوە پێویستیمان بەقیاسەکە نیە ئەوە ناگەیەنێ قیاسەکە پوچەڵ کراوەتەوە
چونکە دەست ئەدا یەك شت دوو بەڵگەی هەبێ، ئەو فەرموودەش إبن ماجه ریوایەتی
ـردووە و غەیری ئەویش، بەڵام لەفەرمووەی پلە لاوازەکانە.

(١) قەولی صەحیح ئەوەیە بەمەرج نەگیراوە لە عیلەتێکدا لەدەقەکان دەرهاتبێ کە
ـێ گومانبێ لەحوکمی ئەصڵەکە، بەم شێوەیە کە بەڵگەکەی بێ گمان چ قورئانبێ
ـخود فەرمودەیەکی متواتر، و هەم بەمەرجیش نەگیراوە دەبێ جیاواز نەبێ لەگەڵ
ـۆچوونی هاوەڵانی پێغەمبەردا، واتە عیلەتەکە جیاوازبێ بۆ بۆچوونی هاوەڵەکەی
ـێغەمبەر، و هەم بەمەرج نەگیراوە بێ گومان دەبێ ئەو عیلەتە لەفەرعەکەدا هەبێ،
ـەڵکو هەر ئەوەندە گومان هەبێ بەبوونەکەی ئیتر بەسە، وە بەحوکمی ئەصڵەکەش،
چونکە گومان ئەم پەڕوئەوپەڕی إجتهادە لەو فەرعانەی ئیسلامدا کە مەبەست
کارپێکدرنیان بێ، نەك عەقیدە، ڕەخنەگری بەرانبەریش دەڵێ و وای بۆ دەچێ: پلەی
گومان لاواز دەبێ بەهۆی چەند پێشەکیەکی گومانایەوە، واتە حوکمی ئەصڵ
بەگومانبێ، عیلەت هەر بەگومانبێ، بونیش لەفەرعەکەدا هەر بەگومانبێ، ئەم هەمو
گومانە ببنە پێشەکی، کەوابوو ئەو گومانە بەرەو نزمترو لاوازتر دەڕوا، بۆیە ئەو
گومانە بەسیە بۆ ئەنجامدان.

(٢) بەڵام لەبەر ئەوەی کە بۆچوونی هاوڕێ پێغەمبەر حوجەو بەڵگە نیە بەمەرج
نەگیراوە دەبێ جیاواز نەبێ بۆی، لەسەر ئەوەش ئەگەر گریمان بەڵگەش بێ، ئەوە ئەو
بۆچوونی صەحابەیە کە عیلەتە دەرهێنراوەکە جیاوازە لێی، بەم شێوە دەبێ و
دەگونجێ غەیری ئەو عیلەتە سەرچاوەی بێ، دەست ئەدا ئەو هاوڕێیە پشتی
بەبەڵگەیەکی تر بەستبێ، جگە لەدەقی ئەصڵەکە، نەیاری ڕەخنەگریش دەڵێ: ئەوەی
لێیەوە دەرکەوێ و دیاربێ ئەوەیە هەر بەڵگەی دەقەکەی پێشووە.

{اما انتفاء المعارض} للعلة بالمعنى الآنتي له {فمبني على التعليل بعلتين} .
قُلْنا: يَجوزُ وهو اي الجموهور كما تقدَّمَ فلا يشترط انتفاؤه و إلاّ فيشترط[1].

{والمعارض هنا} بخلافه فيما تقدَّمَ حيثُ وصف بالمنافي {وصف صالح للعلية كصلاحية المعارض} بفتح الراء لها وان لم يكن مثله من كل وجه {غير مناف بالنسبة الى الاصل {ولكن يؤل} الامر {الى الاختلاف} بين المتناظرين في الفرع {كالطعم مع الكيل في البر} فكل منهما صالح لعلية الربا فيه {لا ناف} الآخر بالنسبة إليه {و} لكن {يل} الامر {الى الاختلاف} بين المتناظرين {في التفاح} مثلاً فعندها هو ربوي كالبر بعلة الطعم وعند الخصم المعارض بان العلة الكيل ليس بربوي لانتفاء الكيل فيه وكل منهما يحتاج في ثبوت مدعاه من أحد الوصفين تو ترجيحه على الآخر[2].

(١) بەڵام نەبوونی نەیار بۆ عیلەتەکە، نەیاری بەو مانایە کە لەمەودوا دێ، واتە دژی ئەویان نەبێ، ئەوە لەسەر ئەو قەولە بنیات نراوە کە دەڵێ: دروستە عیلەت هێنانەوە بەدو عیلەت، ئەگەر وتمان دروستە، ئەوە بەمەرج نەگیراوە نەبوونی نەیار ئەمەش ڕای جەماوەری زانایانە کە لەپێشەوە ڕابورد، وە ئەگەر وتمان دروست نیە ئەوە بەمەرج گیراوە.

(٢) نەیاری ئێرە لەگەڵ نەیاری پێشوودا جیاوازە، چونکە لەوێ لەگەڵ ئەوەش نەیارە دژیشە، بەڵام نەیاری ئێرە بریتیە لە سیفەتێك ئەگونجێ بۆ ئەوەی عیلەت بێ وەك بەرانبەرەکەش دەگونجێ کە عیلەت بێ، بەڵام لە هەموو ڕویەکەوە وەك ئەو نیە وەك دەشێ بۆ ئەوەی عیلەت بێ هەم دژی حوکمی ئەصڵەکەش نیە، بەڵام سەرئەنجام کارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشەیە لەنێوان هەردوو خاوەن بیرەکەدایە لەبارەی فەرعەکەوە، وەك پێخوری لەگەڵ پێوانەدا لەگەنمدا هەردووکیان دەگونجێن بۆ بەعیلەت بوونیان لەگەنمدا، هیچ کامیان دژایەتی ئەویتریان ناکات بەرانبەر حوکمی ئەصڵەکە، بەڵام کارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشەیە لەنێوان هەردوو خاوەن بیرەکەدایە لەسێودا، بۆ وێنە دەڵێم سێو، بەلای ئێمەوە سێو وەك گەنم شتێکە سووی تێدا بەهۆی عیلەتێکەوە کە خواردن و پێخوریە، بەڵام بەلای نەیارەی ڕەخنەگرەوە عیلەتەکە بریتیە لەپێوانە، لەبەر ئەوە سێو مادەیەکی ڕیبەوی نیە، چونکە پێوانەی تێدا نیە، هەریەك لەم دوانە بۆ سەلماندنی داواکەیان پێویستە دەبێ بەتەرجیحدانی یەکێك لەو دوو سیفەتە بەسەر ئەویتردا.

{ولا يلزم المعترض نفي الوصف} الذي عارض به اي بيان انتفائه {عن الفرع} ـطلقاً لحصول مقصوده من هدم ما جعله المستدل العلة بمجرد المعارضة وَ قِيلَ ـزمه ذلك مطلقاً ليفيد انتفاء الحكم عن الفرع الذي هو المقصود[١].

{وثالثها} يلزمه ذلك {ان صرح بالفرق} بين الاصل والفرع في الحكم فقال مثلاً ـربا في التفاح بخلاف البر وعارض علية الطعم فيه لانه بتصريحه بالفرق الزمه وان لم ـزمه ابتداء بخلاف ما ذا لم يصرح به[٢] {ولا} يلزمه ايضا {ابداء اصل} يشهد ـاعارض به بالاعتبار {على المختار} وَ قِيلَ يلزمه ذلك حتى تقبل معرضته كان ـقول العلة في البر الطعم دون القوت بدليل الملح فالتفاح مثلاً ربوي ورد هذا القول ـن مجرد المعارضة بالوصف الصالح للعلية كاف في حصول المقصود من الهدم[٣].

---

(١) پێویست نیە لەسەر ڕەخنەگر نەفی ئەو سیفەتە بکات و بڵێ ئەم سیفەتە ـفەرعەکەدا نیە، چ ڕەخنەگرەکە بەڕوونی حوکمی ئەصڵ و فەرعەکەی دەربڕیبێ، ـاخود نا، چونکە ئەو ڕەخنەگرە مەبەستەکەی هاتووەتەدی کە ڕووخاندنی ئەو عیلەتەیە بەرانبەرەکەی کردی بەعیلەت -وەك تەعم و پێخوریە- هەر بەتەنها ـەخنەگرتنەکە مەبەست هاتووەتە دی . هەندێکیان وتوویانە: ئەو ڕەخنەگرە پێویستە ـەوە ڕون کاتەوە چ حوکمی ئەصڵ و فەرعەکەی وتبێ یا نە، بۆ ئەوەی نەبوونی حوکمی فەرعەکە کە کرۆکی مەبەستەکەیە بگەیێنێ.

(٢) قەولی سێهەم وتوویەتی: دەبێ ڕەخنەگر نەفی ئەو سیفەتە بکا، ئەگەر بێ پێچ ـپەناووتبێتی جیاوازی هەیە لەنێوان حوکمی ئەصڵ و فەرعدا، بۆ نموونە بڵێ: سوو ـسێودا نیە، بەڵام لەگەنمدا هەیە، وە بچێتەوە بەگژ بەعیلەتبوونی تەعم و پێخوریدا ـسێودا، چونکە ئەو ڕەخنەگرە بەهۆی ئەوەوە بەڕوونی ئەو جیاوازیەی باسکرد -پێوانە لەیەکێکداو تەعم لەودا- خۆی بەپێویستی گێڕاوە هەرچەند لەسەرەتاوە پێویستی نەبوو، بەڵام ئەگەر بەڕوونی ئەو جیاوازیەی باس نەکرد ئەوە پێویست نیە لەسەری.

(٣) دووبارە پێویست نیە ڕەخنەگر بەڵگو ڕێبازێك دەربڕێ گەواهی بدا کە ئەوەی دەی گرێ بەدەستیەوە ڕەخنەی پێ دەگرێ! إعتبارو قورسایەتی هەیە، ئەمەش لەسەر قەولی هەڵبژاردە، هەندێك وتوویانە: پێویستە لەسەری ئەوە دەبڕێ بۆ ئەوەی بەگژچوونەکەی قەبوڵ بێ، بەم شێوەیە بڵێ: عیلەتی بەڕێبابوونی گەنم تەعم و پێشخوریە نەك قووت و ژیواریە، بەڵگەش خوێیە پێخورەو قوت نیە، سەرئەنجام سێویش ڕێبەویە، هەروەها، چونکە تەعم و پێخورە نەك قوت، ئەم قەولە بەرپەرچ

{وللمستدل الدفع} اي دفع المعارضة بأوجه {بالمنع} اي منع وجود الوصف المعارض به في الاصل كأن يقول في دفع معارضة القوت بالكيل في شيء كالجوز لانسلم انه مكيل لان العبرة بعادة زمن النبيِّ ﷺ وكان اذ ذاك موزوناً او معدودا [1] {والقدح في عليةِ الوصف المعارض به بيان خفائه او عدم انضباطه[2]. {وبالمطابة} للمعترض {بالتاثير او الشبه} لما عارض به {ان لم يكن} دليل المستدل على العلة {سبراً} بان كان مناسبا او شبها لتحصل معارضة الشيء بمثله بخلاف السبر فمجرد الاحتمال قادح فيه وأعاد المصنِّف الباء لدفع ايها عود الشرط الى ماقبل مدخولها معه ومن امثلته ان يقال من عارض القوت بالكيل لم قلت ان الكيل مؤثر[3].

---

دراوەتەوە کە: تەنها بەگڕاچوونەوەکەی بەهۆی سیفەتێکەوە کە ئەشێ بۆ بەعیلەت بوون بەسە بۆ بەمەبەست گەیشتن کە ڕووخاندنی بەڵگەی بەرانبەرەکەیەتی.

(١) ئەگەر ڕەخنەگر بەو شێوەیە ڕەخنەی گرت مستدل و بەڵگە بەدەستیش بۆی هەیە لەچەند ڕووەوە ڕەخنەکە بەرێتە دواوە، (١)بەقەدەغەکردنی بوونی ئەو سیفەتە لەئەصڵەکەیدا، وەك ئەوەی بڵێ: بۆ بەرپەرچدانەوەی بەقوت و ژیواربونی شتێك وەك گوێز بەپێوانە کردن، بووترێ: ئێمە نایسەلمێنین کە گوێز پێوانە دەکرێ، چونکە عورف و عادەتی سەردەمی پێغەمبەر پێشەنگە، گوێزیش لەو سەردەمەدا یە بەکێشانەبووە یاخود بەژماردن، کەوابوو ناتوانی معارزەی بەقوتبوونی گوێز بکەیت بەهۆی پێوانەوە.

(٢)عەیبدارکردنی بەعیلەت کردنی ئەو سیفەتەی بەرانبەر ڕەخنەی پێ دەگرێ (ا)شاراوەیە، دەبێ عیلەت دیاربێ، (ب)ئەو سیفەتەی تۆ باسی دەکەی زەبت ناکرێ عیلەتیش دەبێ زەبت بکرێ و لەژێر ڕێبازێکدا کۆ بکرێتەوە.

(٣) بەوە کە داوا لەڕەخنەگرەکە بکرێ، ئەوەی تۆ گرتووەتە بەدەستەوە چ تەئسیرو شبهە تەئسیرێکی هەیە؟ ئەمەش کاتێ دەووترێ، ئەگەر بەڵگەی بەڵگە بەدەستەکە لەسەر بەعیلەتبونی سیفەتەکە سیبر نەبێ بەم شێوە کە بەڵگەکەی یا مناسب بێ یاخود شبهە مناسبەبێ، ئەگەر وابێ شتێك دەچێ بەگژ شتێکی تردا کەهاووێنەیەتی بەلام ئەگەر سیبر بێ بەڵگەکەی ئەوە بەڵگەکەی عەیبدار دەکاو لەسیبریەتی ئەخا،بۆیە دانەر وتی(وبالمطالبة) پیتی یێکەی ووتەوە؟ بۆئەوەی وانەزانرێ:(إن لم یکن سبرا مەرجە بۆ ئەمیش و بۆ دوانەکەی پێشیش کە مەنع و قرصەکەیە، نمونەش بۆ ئەو داواکردنە ئەوەیە بوترێ بەوەی نەیاری ئەوەیە کەعیلەتەکە قووتبێ بەبەڵگەی پێوانە. بوترێ:بۆچی تۆ وتت:پێوانەیی بۆتەئسیر دەکا لەوەدا گەنم دەکاتەمادەی ڕێبەوی؟

{وببيان استقلال ماعداه} اي ماعدا الوصف المعترض به {في صورة ولو} كان لبيان {بظاهر عام} كما يكون بالاجماع {اذا لم يتعرض} المستدل {للتعميم} كان بين استقلال الطعم المعارض بالكيل في صورة بحديث مسلم الطعام بالطعام مثلاً مثل والستقل مقدم على غيره فان تعرض للتعميم فقال فتثبت ربوية كل مطعوم خرج عما نحن فيه من القياس الذي هو بصدد الدفع عنه الى النص واعاد المنف الباء لطول الفصل[1]. {ولوقال} المستدل للمعترض {ثبت الحكم} في هذه الصورة {مع انتفاء وصفك} الذي عارضت به وصفي عنها {لم يكف} في الدفع {ان لم يكن} اي يوجد معه} اي مع انتفاء وصف المعترض عنها {وصف المستدل} فيها لاستوائهما في انتفاء وصفيهما بخلاف ما اذا وجد وصف المستدل فيها فيكفي في الدفع بناء على امتناع تعليل الحكم بعلتين الذي صححه المصنف كما تقدم[2].

(١) وەڵامی ڕەخنەگر دەدرێتەوە، بەبەیان کردنی سەربەخۆیی ئەو سیفەتەی بەدەست بەڵگە بەدەستەوەیە، بێ ئەو سیفەتەی کە ڕەخنەگر گرتویەتی بەدەستیەوە هەر سەربەخۆیە، با ئەو بەیان و دەرخستنەش بەهۆی دەقێکی ظاهرەوەبێ و گشت گیریش الطعام وەك جاری واش هەیە بەیانەکە بە ئیجماع و بەڵگەی بێگومان دەکرێ، کاتێ ئەتوانێ وەها وەڵامی بداتەوە کە: بەڵگە بەدستەکە لەبەیانی سەربەخۆی سیفەتەکەدا باسی گشتگیر نەکردبێ، چونکە ئەگەر وابێ لە قیاس دەکەوێ، وەك ئەوەی بەیانی سەر بەخۆی سیفەتی تەعم و پێخوری بکا، کە ڕەخنەی لێ گیراوەو وتراوە سیفەتە پێوانەی تێدایە، بۆ وێنە لە سێوا، بەیانەکەی بەم فەرمودەیە کە فەرموێ: ئاڵوگۆڕ کردنی پێنخۆربە پێنخۆر دەبێ بەئەندازەو نمونەی یەك بن، کەوابو پێخۆری سیفەتێکی سەربەخۆیە، سەر بەخۆیش لە پێش سیفەتێکەوەیە کەسەر بەخۆنەبێ، بەڵام ئەگەر بەڵگە بەدەست لە بەیانی سیفەتی سەر بەخۆدا بەگشتی دای ڕشتێ کە بڵێ: بە ڕێبابونی هەم ڕپێخورێك ثابت دەبێ، ئەوە لەقیاس دەر ئەچێ کە بەڵگەبەدەست خەریکی ئەوەی بە دیفاعی لێ بکا دەچێتە خانەی دەقەکانەوە. لە بەر درێژی و دوری جێگە کە دانەر پێتی بێکەی دوپات کردەوە

(٢) ئەگەر بەڵگە بەدەست بە ڕەخنە گر بڵێ: حوکمەکە لەم سێوەدا سابت بووە لەگەڵ ئەوەش ئەو سیفەتەی تۆ دژایەتی سیفەتەکەی منت پێ کرد لەم سێو دانیە سیفەتی تۆ وەك پێوانە، سیفەتی منیش وەك تەعم ئەوە بۆ پاراستن و دیفاع لێ کردن دەست نادا، ئەگەر لەگەڵ نەبونی سیفەتی ڕەخنەگرەکە سیفەتی بەڵگە بەدەستەکەشی تێدا نەبێ، چونکە هەر دوکیان یەکسانن لە نەبونیاندا، بەڵام ئەگەر سیفەتی بەڵگە

ـ جيلَ } لم يكف {مطلقا} بناء على جواز التعليل بعلتين وقال المصنِّف في انتف
وصف المستدل زيادة على عدم الكفاية الذي اقتصروا عليه {وعندي انه} ي
المستدل {ينقطع} بما قاله {لاعترافه ي فيه بالغاء وصفه حيثُ ساوي وصف
المعترض فيما قدحَ هو به فيه[1] {ولعدم الانعكاس} لوصفه حيثُ لم ينتف الحكم مع
انتفائه والانعكاس شرط بناء على امتناع التليل بعلتين على أن عدم الانعكياس
لايترتب عليه الإنقطاع وكأنه ذكره تقوية للاول[2].

بەدەستەی تێدا هەبێ ئەوە بەسە بۆ دیفاع کردن، ئەم ئەنجامەش لە سەر ئەوە دروست دەکرێ کە عیلەت هێنا نەوە بۆ حوکم بە دوعیلەت نابێ و دانەریش لە پێشەوە ئەوەی بەڕاست دەزانێ.

(١) هەندێك ووتویانە: سیفەتی بەڵگە بەدەستە کە هەبێ یا نەبێ هەر دەست نا بۆ دیفاع کردن، ئەم بۆچەنەش لەسەر ئەو قەولەیە دروست بووەکە دەڵێ: دروست عیلەت هێنانەوە بۆ حوکم بە دوو عیلەت دانەریش لە بارەی نەبوونی سیفەتی بەڵگە بەدەسەتە کەوەزیاد لەوەش کە هەر بەس نیە بۆ دیفاع کردن ئەو سیفەتەی کە اقتصاریان لەسەر کردووە ووتویەتی: بەلای منەوە: بەڵگە بەدستەکە هەر بەوەی خۆی ووتی بەڵگەکەی لە دەست چوو پچڕپچڕ بوو ، چونکە دانی ناوە بە پوچەڵ کردنەوەی سیفەتەکەی خۆی، لەبەر ئەمە کە سیفەتی ڕەخنەگرەکەی یەکسان کردووە بۆ سیفەتەکەی خۆی لەوەدا کە عەییداری کردنیادا، کە نەبوونی سیفەتەکەیە .

(٢) بەڵگە بەدەستەکە وەك لە بە ئیعترافی خۆی بەڵگەکەی لەدەست دا هەم لەبەر انعکاس نەبونی عیلەتەکەی بۆ سیفەتەکەی - انعکاس ئەوەیە هەر کات عیلەتەک نەبوو مەعلولەکەش نەبێ، اترادیش ئەوەیە هەر کات عیلەتەکە هەبو معلولەکەش هەبێ، انعکاس بۆ سەلبە، إطرادیش بۆ ایجابە چونکە لە گەڵ فەوتانی سیفەتەکەی حوکمەکەی نەفەوتاوە، بێ گومان خۆ انعکاسیش مەرجە، دەبێ ئەگەر سیفەتەکەی فەوتا دەبێ حوکمەکەش بفەوتێ، ئەمەش لەسەر ئەو قەولە یەکە نابێ دو عیلەت بو یەك حوکم بهێنرێتەوە، زیاد لەوەش انعکاس نەبون لازم ناکا انقطاع بوون، چونکە ئەگونجێ بەڵگە بەدەستەکە لەوانەبێ کە بڕوای هەبێ بەعیلەت هێنانەوە بۆ حوکم بە دوعیلەت، ئەی بۆ دانەر باسی کرد؟ بۆیە باس کرد بۆ بەهێز کردنی یەکەمەکەیان کە ئیعتراف کردنەکە بوو .

ولو ابدي المعترض} في الصورة التي الغي وصفه فيها المستدل {ما} اي وصفا خلف الملغي سمى} ما ابداه {تعدد الوضع} لتعدد ما وضع اي بني عليه الحكم ـه من وصف بعد آخر[1]. {وزالت} بما ابداهُ {فائدة الالغاء} وهي سلامة وصف ستدل عن القدح فيه وهذا اوضح من قول ابن الحاجب فسدَ الإلغ {مالم يلغ} ستدل {الخلف بغير دعوى قصوره او دعوي من سلم وجود المظنة} المعلل بها جوده {ضعف المعنى} فيه الذي اعتبرت المظنة له بان لم يتعرض الستدل للخلف ـلا او تعرض له بدعوى قصوره او بدعوى ضعف معنى المظنة فيه[2]. {خلافاً لمن ـعهما} اي الدعويين {الغاء} للخلف[3]..

(١) ئەگەر ڕەخنەگرە کە لەو نمونەدا بەڵگە بەدەستەکە سیفەتەکەی تێدا پوچەڵ ـووەتەوە سیفەتێکی تر ئاشکرا بکا لە جێ سیفەتە پوچەڵ کراوەکەدا دای بنێ، ـەی ئاشکرای دەکاو لەجێ ئەویکەدای دەنێ پێ دەووترێ: (تعدد الوضع) چونکە ـەی حوکمەکەی لەسەر دورست بووە چەند سیفەت و عیلەتێکە بەلای ڕەخنەگرەوە ـە سیفەت و ئەو سیفەت .

(٢) بەوەش کە ڕەخنەگرەکە پەیدای کردو دەری خست سودی پوچەڵ کردنەوەکەی سیفەتی ڕەخنەگرەکە نەما، ئەوسودەش بریتیبوو لەوەی سیفەتی بەڵگە بەدەستەکە ـگار بێ لە عەیبدارکردن، ئەم داڕشتنەی دانەر ڕونزە لە دەستەواژەکەی ابن الحاجب ـە دەڵێ: (مسد الالغاء) پوچەڵ کردنەوەکە هەرنامێنێ، وانیە تەنها سودەکەی نامێنێ ـت پوچەڵ کردنەوەکە. کاتێ سودی پوچەڵ کردنەکە نامێنێ بەڵگە بەدەستەکە بێ ـنگی بکا لە سیفەتێکیتر لە جێیدا دابنرێ، سیفەتێکیتر لە جێیدا دابنرێ پوچەڵی ـکاتەوە، بێ ئەوەی دەعوای ئەوە بکا ئەم حوکمە ناگوێزرێتەوە بۆ شتێکی تر، یاخود بێ ئەوەی دەعوای ئەو کەسە بکا کە بەڵگە بەدستەکە بێ سەلمێنێ گومانی ـونی حیکمەتەکە هەیە کە بەڵگەبەو بوونەیدەهێنرێتەوە، چونکە ئەو جێنیشینە هەیە،حیکمەتەکەی تێدا لاوازە کە اعتباری مزنەکەی بۆ کراوە بەکورتی کاتێ سودی پوچەڵ کردنەکەی نامێنێ:

١-بەڵگە بەدست هەربێ دەنگ بێ لە پوچەڵ کردنەوەی سیفەتە جێنیشینەکە.

٢-یاخود پوچەڵی کردبێتەوە بەڵام دەبێ بڵێ ئەم حوکمە تایبەتە بەم شوێنەوە

٣-یاخود بڵێ: حیکمەتەکەی تێدا لاوازە

(٣) بەڵام ئەمە جیاوازە بۆ ئەوانەی وادەزانن ئەگەر داوای ئەو دوانەی کرد کە تایبەتی حوکمەکەو لاوازی حیکمەتەکەیە لە صیغە هاوردەکەدا ئەوە هەر پوچەڵ

بناء في الاولى على امتناع القاصرة وفي الثانية على تأثير ضعف المعنى في المظنة فلا تزول عند هذا الزعم فيهما فائدة الإلغاء الأول أما اذا ألغي المستدل الخلف بغير الدعويين فتبقي فالئدة الغائه الاول[١].

مثال تعدد الوضع مايأتي فيما يقول يصح امان العبد للحربي كالحر بجامع الاسلام والعقل فانهما مظنتان لاظهار مصلحة الايمان من بذل الامان فيعترض الحنفي باعتبار الحرية معهما فانها مظنة فرلاغ القلب للنظر بخلاف الرقية لاشتغال الرقيق بخدمة سيده فيلغى المستدل الحرية بثبوت الامان بدونها في العبد الماذون له في القتال اتفاقا فيجيب المعترض بان الاذن له خلف الحرية لانه مظنة لبذل وسعه في النظر في مصلحة القتال والايمان[٢].

---

کردنەوەی خەلەف و سیفەتە هاوردوکەیە..

(١) بۆیە وایش دەڵێن، چونکە لەیەکەمیاندا قاصریەت و تایبەتمەندی بۆ عیلەت نابێ، لە دوهەمیشیاندا چونکە لاوازی حیکمەت تەئسیر لە مظنە دەکا، کە وابو بەلای ئەو کەسەوە کە وابزانێ، لەو دوانەدا سودی پوچەڵ کردنەوەی سیفەتی یەکەم نامێنێ، بەڵام ئەگەر بەڵگە بەدەست سیفەتە هاوردەکەی پوچەڵ کردەوە بەشتێك جگە لەم دووانە ئەوە سودی پوچەڵ کردنەوەی سیفەتی یەکەمی دەمێنێتەوە.

(٢) نمونە بۆ فرە وەضعیو دادان ئەوەیە کە دێ لەوەی دادەووترێ: دروستە بەندەێکی موسڵمان ئەمان بدا بەکافرێکی جەنگاوەر وەك موسڵمانێکی ئازاد بۆی هەیە، بەهۆی عیلەتێکەوە کە هەردوکیان کۆدەکاتەوە، کە اسلام و عەقڵە، چونکە ئەم دو سیفەتە بێ گومانن بۆ ئاشکرا کردنی بەرژەوەندی ایمان وباوەڕ بهێنێ لەو ئەمان بێ بەخشینەدا، ئەمجا حەنەفی ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ دەبێ ئەو دوسیفەتە ئازادیشیان لە گەڵدا بێ، چونکە ئازادی گومانی ئەوەی لێ دەبرێ کە دڵی مرۆڤ ئامادەبێ بۆ بیرکردنەوە لەوەی ئایا ئەگەر ئەمان بەوکافرە بدایێ بەرژەوەندی موسڵمانانە یا نە بەڵام مرۆڤێك کە ئازاد نەبێ وانیە چونکە هەموکات سەر گەرمی خزمەتکاری ئاغەکەیەتی، ئەبێ بەڵگە بەدەست ئازاد یەکە پوچەڵ دەکاتەوە بەوەی کە ئەگەر بەندەێك مۆڵەتە پێ درابێ بچێتە مەیدانی نەبەردەوە بۆی هەیە بەڕای هەموان کە ئەمان ببەخشێ، ڕەخنەگریش کە حەنەفیە وەڵام دەداتەوە مۆڵەتە دانەکەی لە جێی ئازادی بونەکەیدا دادەنیشێ، چونکە ئەو مۆڵەتە لە جێ ئازاد بونەکەی دادەنیشێ،چونکە ئەو مۆڵەتە جێ گومانە بۆ ئەوەی بیری فراوانتر بێ بۆ ئەوەی زیاتر بیر بکاتەوە لەبەرژەوەندی باوەڕو ئەنجامی مەیدانی نەبەرد.

{ويكفى} في دفع المعارضة {رجحان وصف المستدل} على وصفها بمرجح ككونه انسب من وصفها او اشبه{بناء على منع التعدد} للعلة الذي صححه المصنّف وقول ابن الحاجب لا يكفى مبنى على مار جحه من جواز التعدد فيَجوزُ ان يكون كلٌ من الوصفين علة[1].

{وقد يعترض} على المستدل {باختلاف جنس المصلحة} في الأصل والفرع {وان تحد ضابط الاصل والفرع} كما يأتي فما يقال يحد اللائط كالزاني بجامع ايلاج فرج في فرج مشتهى طبعاً محرم شرعاً فيعترض بأن الحكمة في حرمة اللواط الصيانة عن رذيلته وفي حرمة الزنا المرتب عليها الحد دفع اختلاط الإنساب المؤدى هو إليه وهما مختلفان فيَجوزُ ا، يختلف حكما بأن يقصر الشارع الحد على الزنا فيكون خصوصه معتبراً في علة الحد[2].

---

(١) بەسە بۆ لابردن و بردنەوە دواوەی دژایەتی و ڕەخنەگرتنەکە پەسەند کردنی سیفەتی بەڵگە بەدەستەکە، نەك سیفەتی ڕەخنەگرەکە بەهۆی شتێکی لایەنگرەوە، وەك ئەوەی بووترێ: ئەمە گونجاو ترو خزمایەتی نزیکترە لە سیفەتی نەیارەکە، نابێ چەند عیلەتێك بۆ یەك هۆکە بهێنرێ کە دانەریش ئەم قەولەی بەڕاست زانیو (ابن لحاجب) کە دەڵێ: پەسەند کردنی بەس نیە بۆ دیفاع کردنەکە، ئەوە لەسەر ئەو قەولەیە کە خۆی پەسەند کردووەو دەڵێ: دروستە چەند عیلەتی بۆ یەك حوکم، بۆ یە ئەشێ هەریەك لەو دو سیفەتە عیلەتی حوکمەکەبێ.

(٢) جاری واهەیە ڕەخنە لە بەڵگە بەدەست دەگیرێ کە ڕەگەزی بەرژەوەندیە کە جیاوازن لەیەك لە ئەسڵ و فەرع دا هەرچەند قەدەری موشتەرەکی نێوانیان یەك بێ، وەك ئەوەی کە ئێستە دێ: دەووترێ: نێر باز وەك زیانەکەر وایە، بەهۆی عیلەتێکەوە هەر دوکیان کۆدەکاتەوەکە:چونە ناوی عەورەتێکە بە عەورەتێکدا لە ڕوی سروشتی نەفسەوە حەزی لێ دەکرێ و لەڕوی شەرعەوە حەرام کراوە . ئەمجا ڕەخنەی لێ دەگرێ لە حیکمەت و بەرژەوەنەی لە حەرامبونی نێربازیدا پاراستنی مرۆڤە لە پەستی و ناکەسی، وە لە حەرامبونی زینایەکدا کە تۆڵەیٔ دیاری کراوی بەشوێندا دێ، بریتیە لە: نەهێشتنی تێکەڵبونی خزم و خوێش بەیەك کە هەر زیناش ئەوە دەکا خەڵك نەزانێ کوڕی خۆی کامەیە، ئەو دوو بەرژەوەندیە لەیەك جیان، بۆیە دەگونجێ حوکمەکە شیان جیابێ، بەچ شێوە کە شارعی مقدس حەددو تۆڵەی دیاری کراو تایبەت بکا بەزیناوە، کە وابۆ خودی زینا لە عیلەتی تۆڵە دیاری کراوەکەدا موعتەبەر دەبێ .

{فيجاب} عن هذا الاعتراض {بحذف خصوص الأصل عن الاعتبار} في العلة بطريق فيسلم أن العلة هي القدر المشترك فقط كما تقدَّمَ في المثال لا مع خصوص الزنا فيه[1]

{وأما العلة إذا كانت وجود مانع او انتفاء شرط} بإن كانت علة لا نتف الحكم {فلا يلزم} من كونها كذلك {وجود المقتضي} للحكم {وفاقا للامام الرَّازي {وخلا فاللجمهور} في قولهم يلزم وجوده والابان جاز انتفاءه كان انتف الحكم حينَئِذٍ لا نتفائه لا لما فرض من وجود مانع او انتفاء شرط[2]. و أُجيبَ بِنه يَجوزُ أن يكون لما فرض ايضاً لجواز دليلين مثلاً على مدلول واحد والمانع كأبوة القاتل للمقتول فلايجب عليه القصاص وانتفاء الشرط كعدم احصان الزاني فلايجب عليه الرجم[3].

(١) وەڵامی ئەم ڕەخنە دەدرێـەوە تایبەت مەندێك لە ئەسڵەكەدا یە لە اعتبار عیلەتەکەدا دەبرێ بەڕێ و ڕێبازێك كە دەمان گەیەنێتە عیلەتەكە، ئەمجا دێ سەلمێنێ كە عیلەتەكە تەنها قەدەرە مشترەكەكەیە، كە چونە ناوی عەورەتێکە... وەك لە نمونەكەدا ڕابورد، نەك لەگەڵ زینادا لەو نمونەدا، واتە ووشەی زینا لە و نمونانە عیلەتی حوكمەكە نیەو بەشێك نیە لە عیلەتەكە.

(٢) بەلأم ئەگەر عیلەتەكە بوونی ڕێگرێك بێ یاخود فەوتانی مەرجێكی بێ، بەم شێوە ئەو ڕێگرەو نەبونی مەرجی عیلەتی نەبونی حوكمەكە بن، ئیتر پێویست ناك داخوازی كەری حوكمەكە هەبێ، چونكە عیلەتەكە نایەڵێ و مەرجەكەش فەوتاوە پێشەوا ڕازیش هەماهەنگی ئەم بۆچوونەیە ، بەلأم جەماوەری زانایان ڕایان جیاوازە كە ئەڵێن: پێویست دەكا داخوازی كەری حوكمەكە هەر هەبێ، گەر وانەبێ كە داخوازی كەری حوكمەكە نەبێ ئەوە نەبونەكەی لەبەر نەبونی ئەو داخوازی كەرەك دەبێ نەك لەبەر بونی شتێ كە نایەڵێ یاخود نەبونی مەرجێك.

(٣) وەلأم دەدرێتەوە كە ئەو ملازمەیە پێویست نیە، چونكە دروستە لەبەر نەبونی داخوازی حوكمەكەش بێ و لەبەر ڕێگریكیش بێ یاخود فەوتانی مەرجێك بێ چونكە دروستە دو بەڵگە هەبن لەسەر یەك شت نمونەش بۆ شتێ كە ڕێگر بێ و نەیەڵێ حوكمەكە بێتە جێ، وەك باوكایەتی بكوژ بۆ كوژراوەكە،نا یەڵێ باوكەكەی بكوژرێتەوە، داخوازی كەری حوكمەكە هەبێ یانەبێ عیلەتەكە هەر مانع. نمونەش بۆ فەوتانی مەرجەكە وەك ژن نەهێنانی پیری زیناكەر، بۆیە پێویست نابێ لەسەری بەرد باران بكرێ.

{مسالك العلة}

اي هذا مبحث الطرق الدالة على علية الشئ {الاول} منها {الاجماع} كالإجماع على ن العلة في حديث الصحيحين لا يحكم احد بين اثنين وهو غضبان تشويش الغضب ـفكر وقدم الاجماع على النص كابن الحاجب لتقدمه عليه عند التعارض على الأصَحّ لآتي وعكس البيضاوي لان النص أصل للاجماع[1].

{الثاني} من مسالك العلة {النص الصريح} بأن لا يحتمل غير العلية {مثل لعلة كذا لسبب} كذا {فمن اجل} كذا {فنحو: كي وإذن} نحو قوله تعالى:﴿ من اجل ذلك كتبنا على بني اسرائيل ﴾ ﴿ كي لا يكون دولة بين الأغنياء منكم ﴾﴿ إذن لأذقناك ضعف لحياة وضعف الممات ﴾ وفيما عطفه المصنّف بالفاء هنا وفيما بعد اشارة الى انه ـون ماقبله في الرتبة بخلاف ما عطفه بالواو[2].

---

{مسالك العلة}

١) ئەمە جێی باسی ئەو ڕێ و ڕێبازانەیە کە دەستمان دەگرن و دەمانبەن بۆ سەر بەعیلەتبونی شتێك و دۆزینەوەی عیلەتی شتەکان. یەکەم شتێ لەو ڕێگایانە جماعە، وەك خڕبونەوەی زانایان لەسەر ئەوەیە کەعیلەتی ئەم فەرموودەیە کە ـبوخاری‌ومو‌سلیمدا ریوایەتکراوە دەفەرموێ: کەس داوەری نەکا لە نێوان دوکەسدا ـکاتێکدا تەواو تۆڕە بێ، تورەیی بیری مرۆڤ بێئارام دەکات ولەسەر حاڵەتی ڕێك و ێك نایهێڵێ، دانەر وەك(ابن الحاجب)ی‌کردوە اجماعی‌پێش دەق خستووە،چونکە ـکاتی بەرەنگاربونەوەی یەکتردا اجماع پێش دەق دەکەوێ، لەسەر قەولی اصح کە لە ـەودوای دێ. بەلآم بەیضاوی پێچەوانەی کردووە چونکە دەق بناغەی اجماعە بێ ـەو نابەسرێ‌و خڕنابنەوە.

(٢) دوهەم لەو ڕێگایانەی دەمانبەن بۆ دۆزینەوەی عیلەت دەقی ڕونە، واتە ـەووشە جگە لە بەعیلەتبون شتێکی تر هەڵناگرێ و دەست نادا بکرێ بەشتێکی تر، بۆ نمونە دەوترێ: لە بەر عیلەتی ئەوە، ئەمجا بەهۆی ئەوەوە، ئەمجا لەبەر ئەوەوە، ـەمجا وەك کەمی و ئیزن، نمونەش خوا دەفەرموێ: لەبەر ئەوە پێویستمان کرد لەسەر ـەوەکانی اسرائیل، یاوەك: بۆ ئەوەی ماڵ و سامان دەساو دەس نەکەوێ لە نێوان ـەندێ دەوڵەمەندانداـ یاوەك: لەبەر ئەوە ئەو کاتە تالآوی ژیانمان چەند قات پێ ـەچەشتی هەروەها تالآوی مەرگیش، ئەوەیان کەدانەر بەهۆی پیتی (ڤ)وە عەتفی کردووەتەوە ئەوانەش لەمەودوا هەروەها ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەکە ئەوەیان فێکەی مابەسەرەوە پلەی نزمترە لەوەیان کە لەپێشیەوەیە، جیاوازە لە گەڵ ئەوەی بەهۆی پیتی‌واوەوە عەتفی کراوەتەوە، ئەمە یان نیشانەی کۆی پێش وپاشیەتی‌ویەکسانن.

{والظاهر} بان يحتمل غير العلية احتمالا مرجوحاً {كاللام ظاهرة} نحو كتاب انزلناه اليك لتخرج النّاس من الظلمات الى النور {فمقدرة نحو ان كان كذا} كقوله تعالى:﴿ ولا تطع كل حلاف مهين ﴾ الى قوله ان كان ذامال وبنين اي لان[1].

{فالباء} نحو: ﴿ فبظلم من الذين هادوا حرّمنا عليهم طيبات احلت لهم ﴾ اي منعنهم منها لظلمهم[2]. {فالفاء في كلام الشارع} وتكون فيه في الحكم نحو قوله تعالى والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما[3]. وفي الوصف نحو حديث الصحيحين في المحرم الذي وقصه ناقته لا تمسوه طيباً ولا تخمروا راسه فإنَّهُ يبعث يوم القيامة ملبياً[4] {فالراوي الفقيه فغيره} وتكون في ذلك في الحكم فقط كقول عمر ان بن حصين سهى رسول الله ﷺ فسجد رواه ابوداود وغيره[5].

(١) یاخود دەقەکە ظاهر بێ واتە دەست ئەدا عیلەتیش نەبێ بەلام دەست دانیگر لاواز، وەك پیتی لام، چ دیاربێ بخوێنرێتەوە، وەك: ئەم قورئانە مان دابەزاندووە بو لات لەبەر ئەوەی خەلك لە ناو هەموو تاریکیەکاندا دەربهێنی و بەرەو ئەم ڕوناکیەی ببەیت، لامی (لتخرج) یاخود مقدەرو شاراوە نەخوێنرێـەوە، وەك ان كان كذا،لەبەر ئەوە ئاوەهایە، وەك خوای گەورە ئەفەرمێ: گوێ ڕایەلی هیچ سوێن خۆرێکی سوك نەکەی... لەبەر ئەوەی خاوەن ماڵ و چەندەها کوڕە .

(٢) ئەمجا دوای ئەوە پیتی بێسیە، وەك: ئەمجا بەهۆی ستەمی ئەوانەوە بوبو نەجولەکە حەرامامان کرد لەسەر یان چەندەها شتی خاوێن و پاك کە بۆیان حەلال کرابو، واتە قەدەغەمان کردن لەو شتە پاکانە لەبەر ستەمەکەیان

(٣) ئەمجا فێ دێ لەکەلامی شارعدا، جاری واهەیە ئەڕواتە سەر حوکمەکە، واتە پێشەکەی ئەبێـە هۆی حوکمەکە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: پیاوی دز و ئافرەت دز لە بەر دزیەکەیان دەستیان ببڕن، واتە دزیەکە بووەتە هۆی بڕینی دەستیان.

(٤) جاری وایش هەیە ئەڕواتە سەر عیلەتەکە واتە دوای فێکە دەبێتە عیلەتی پێشەکەی، دەڕواتە سەر سیفەتەکەی، وەك ئەو فەرمودەیە کە بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە لە بارەی ئەو پیاوەی کە لە ئیحرامدا بو ووشترەکەی لەقەی لێدا و کوشتی، پێغەمبەر فەرموی: بۆن خۆشی پێوە مەدەن و سەری دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا کەزینو دەکرێتەوە لەحالێ ئیحرامدا دەبێ و لبیك اللهم لبیك دەلێ لێرەدا عیلەتەکە دواکەوتووە.

(٥) ئەمجا دوای ئەوە (فێ) لەکەلامی ڕیوایەت کەرێکی شەرعی زاندا دێ، لەمەدا تەنها دەڕواتە سەر کەلامێك کە حوکم بێ، واتە پێشەکەی عیلەت بێ بۆ پاشەکەی.

ومن قال من المتأخرين انها في ذلك في الوصف فقط لان الراوي يحكي ما كان في
وجود لم يرد بالوصف فيه الوصف الذي يترتب عليه الحكم كما في الاول فالفاء فيما
كره للسببية التي هي بمعنتى العلية وانما لم تكن المذكورات من الصريح لمجيئها
غير التعليل كالعاقبه في اللام والتعدية في الباء ومجرد العطف في الفاء كما تقدَّمَ في
بحث الحروف[١]. {ومنه} اي من الظاهر {ان} المكسورة المشددة نحو ﴿ ربِّ لاتذر
على الارض من الكافرين دياراً انك ان تذرهم ﴾ الاية[٢]. {واذ} نحو ضربت العبدا اذ
ساء اي لاساءته {ومامضى في الحروف} اي في مبحثها مما يرد للتعليل غير المذكور
نا وهو بيد و حتًى وعلى وفي ومن فلتراجع[٣].

---

ت عمرانی کوڕی حسین دەڵێ: پێغەمبەری خوا، د.خ، سەهوی کر لە بەرئەوەو
سوجدەی سوهی برد، ابوداود غەیری أبوداودیش ابو داودیش بەیانیان کردووە

(١) ئەوانەی لە زانایانی سەر دەمی پاشین ووتویانە: فێ لە کەلامی ڕاوی شەرعزاندا
تەنها لە سیفەتدا دەبێ ئەوە لەبەر ئەوەیە: چونکە ڕیوایەتکەرەکە ڕوبەڕوی گێڕانەوەی
شتێك بووەتەوە کە بەچاو دەبینرێ و لە پێغەمبەر ڕوی داوە، بەڵام حوکمەکە کە نەدبە
بەچاو نابینرێ و هەستی پێ ناکرێ، بۆیە دەڵێن: ڕیوایەتکەرەکە ئەوەی لەبەر چاوە
ەی گەڕێنێتەوە، مەبەستیان بەو سیفەتە ئەو سیفەتە نیە کە دەبێتە عیلەتی
حوکمەکە، وەك لە نمونەی یەکەمدا وابوو، بریتی بوو لە دزیەتی عیلەتی دەست
بڕینەکە بوو، سەر ئەنجام فێ لەو نمونانەی پێشەوەدا بۆ بەهۆ بونەکە بەمانا عیلەتە.
ئەی بۆ ئەوانەی هەموویان بۆ دەقی صەریح و ڕون نین؟ چونکە وەك بۆ عیلەت دەست
ئەدەن بۆ غەیری عیلەتیش دەست ئەدەن، وەك لام دەست ئەدا بۆسەر ئەنجامیش بێ،
وەك: (لدوا للموت و وابنوا للخراب) واتە سەر ئەنجام بۆ مەرگ دەبن و خانووەکانیش
ئاخرەکەیان هەر ڕوخان دەبێ. یاخود بێ هانووە بۆ ئەوەی لازم بکا بە متعدی، یاخود
فێ تەنها بۆ عتف هانبێ، ئەم جۆرەبا سانە لەجێ باسی پیتەکاندا تێپەڕی کرد.

(٢) یەکێکی‌تر لەدەقی ظاهرو دەست بدا بۆ غەیری عیلەتیش (إنّ)یە، وەك:
پەروەردگار بەسەرزەویەوە هیچ کەسێ لە کافران نەهێڵێتەوە، چونکە تۆ ئەگەر بیان
هێڵێتەوە بەندە چاکەکانیش گومڕا دەکەن .

(٣) یەکێکی‌تر (إذ)ە وەك: دام لەم بەندەیە لە بەرئەوەی کاری خراپی ئەنجام دابوو،
ئەوانەش کە تێپەڕیان کرد لەباسی پیتەکاندا کە دێن بۆ ئەوەی بکرێن بە عیلەتیش،
لەوانەی کەلەم باسە ناوی نەهێنرا وەك: (بید،حتی، علی، فی، من، با) پیاچونەوەیان
بەسەردا بکرێتەوە .

وانما فصل هذا عما قبله بقوله ومنه لانه لم يذكره الأصوليين واحتمال ان لغير التعليل كأن تكون لمجرد التاكيد كما تكون اذ ومامضى لغير التعليل كما تقدم في مبحث الحروف[1].

{الثالث} من مسالك العلة {الايماء وهو اقتران الوصف الملفوظ قيل أو المستنبط بحكم ولو} كان الحكم {مستبطاً} كما يكون ملفوظا {لو لم يكن للتعليل هو} في الوصف {أو نظيره} لنظير الحكم حيثُ يشار بالوصف والحكم الى نظيرهما اي لو لم يكن ذلك من حيثُ اقترانه بالحكم لتعلي الحكم به {كان} ذلك الاقتران {بعيداً} من الشارع لا يليق بفصاحته واتبانه بالالفاظ في مواضعها[2]. {كحكمه} اي الشارع {بعد سماع وصف} كما في حديث الاعرابي واقعت أهلي في نهار رمضان فقال: أعتق رقبة الخ رواه ابن ماجه [3].

(١) بۆ دانەر (إنّ)ی لەوانی پێشتری جی کردەوە بەوەی ووتی: ومنه (إنّ)؟ چونکە زانایان ئوصولی فیقە باسیان نەکردووە. ئەوەش کە (إنّ) هەڵدەگری بۆ عیلەت نەبێ وەك ئەوەی تەنها بۆ دوپات کردنەوە بێ، وەك چۆن (اذ)و ئەوانی تریش بۆ غەیری عیلەت بون هاتون، وەك لەباسی پیتەکاندا تێپەڕی کرد.

(٢) سێهەم لەو ڕێیانەی بیان گرێتە بەر دەمانبەنە سەر عیلەت ئیمایە، ئەویش بریتیە لە لکاندنی سیفەتێك کە بەڕونی ووترابێ ئەمە عیلەتە، هەندێکیش ووتویانە یاخود ئەو سیفەتە بەڕونی نەووترابێ بەڵکو بە عەقڵ لەدەقەدەر هێنرابێ، جا ئەم سیفەتە لکێنرابێ بە حوکمێکەوە، یا حوکمەکەش عەقڵ دەری هێنابێ، وەك چۆن حوکم لەفزی دەبێ مستنبطیش دەبێ، جا ئەگەر ئەو سیفەتە بۆ ئەوە نەبێ بکرێ بە عیلەت، یاخود نمونەی ئەو سیفەتە مەلفوزەیە، بۆ نمونەی حوکەکە عیلەت نەبێ. لە جێیکدا کە ئاماژە دەکرێ بە سیفەتێك مەبەستت وێنەی ئەوبێ، یا دەڵێت: حوکم مەبەستت نمونەی ئەو حوکمەبێ، واتە ئەگەر لکاندنی سیفەتەکە بە حوکمەکەوە بۆ ئەوە نەبێ بیکەی بە عیلەت بۆ حوکمەکە، ئەو پێوە لکاندنە زۆر دورە لە شارعەوە شایەتی ڕەوانبێژی ئەوو دانانی ووشەو دەستەواژەکان لە جێ خۆیاندا نابێ.

(٣)نمونەش وەك ئەوەیشارع حوکمێ بدات دوای ئەوەیسیفەت وعیلەتێك دەبیسێ وەك لەقسەی گوند نشینەکەدا ووتی: جماعم کردووە لە گەڵ ژنەکەمدا لە ڕۆژی ڕەمەزاندا؟ پێغەمبەریش فەرموی: کەوابو بەندەیێك ئازاد بکە.،ابن ماجە ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەر دوای بیستنی جووتبونی لەگەڵ خێزانەکەیدا،فەرموی: ئازاد بکە وادیارە بەڕوتی ئەم حوکمە عیلەتەکەی ئەو سیفەتەیە، ئەگەر وا نەبێ بێ کەڵکە.

واصله في الصحيحين فأمره بالاعتاق عند ذكر الوقاع يدل على انه علة له والالخلا حؤال عن الجواب وذلك بعيد فيقدر السؤال في الجواب فكانه قال واقعت فاعتق[1]. وكذكره في الحكم وصفا لو لم يكن علة} له {لم يفد} ذكره كقوله ﷺ لا يحكم احد بين ـين وهو غضبان رواه الشيخان فتقييده المنع من الحكم بحالة الغضب المشوش حكر يدل على انه علة له والالخلا ذكره عن الفائدة وذلك بعيد[2]. {وكتفريقه بين حكمين بصفة مع ذكرهما اوذكر احدهما} فقط مثال الاول حديث الصحيحين انه ﷺ عل للفرس سهمين والرجل اي صاحبه سهما فتفريقه بين هذين الحكمين بهاتين صفتين لولم يكن لعلية كل منهما لكان بعيدا [3].

١) ئەسڵی ئەو فەرموده لە بخاری و مسلمدایە، لەبەر ئەوە فەرماندانی پێغەمبەرﷺ ئازادکردنی بەندەیێك لە کاتی باسکردنی ئەوجیماعەدا دەلاڵەت لەسەر ئەوە دەکاتە جیمعاعە عیلەتی ئازاد کردنە کەیە، ئەگەر وانەبێ پرسیارەکە بێ وەڵام دەبوو، ئەوەش لەکەرەمی پێغەمبەرەوە زۆر دورە، بۆیە هەر لە لەوەڵامەکەدا پرسیار دیاری حکرێ، ئەو کاتە سیفەتێکی منزبت و دیار دەلکێ بەحوکمێکی مەلفوزەوە،وەك ئەوە یە پێغەمبەر بفەرموێ: ئەگەر جیماعت کرد بێ دەبێ بەندەیێك ئازاد بکەیت .

(٢) نمونەش وەك ئەوەی پێغەمبەر لەبارەی حوکمێکەوە باسی سیفەتێك بکا ئەگەر ـو سیفەتە عیلەت نەبێ بۆ حوکمەکە ئەو کاتە باس کردنەکەی هیچ سودێکی نە ـبوو، وەك ئەوەی پێغەمبەر دەفەرموێ: کەس دادوەری ناکا لە نێوان دوکەسدا ـەکاتی سەر ڕێژ کردنی نورەییدا، بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە، کەوابو ـستنەوەی قەدەغەبونی دا وەریەکەی بەکاتی تورەبو نێکەوە کەبێ ئارامی بۆ بیری ـروست بکا دەلاڵەت دەکا لەسەر ئەوە کە ئەو تورەبونە عیلەتە بۆ قەدەغەکردنی ـاوەریەکە. ئەگەر وانەبێ باسکردنەکەی بێ سود دەبێ، ئەوەش لە ڕەوانبێژی وەك پێغەمبەرەوە زۆر دوورە.

(٣) یاوەك ئەوەی پێغەمبەر دوو حوکم لەیەك جیادەکاتەوە بەهۆی باس کردنی سیفەتێکەوە ئیتر هەردوو حوکمەکەی لە گەڵدا باس کرابن ، یاخود تەنها یەکێکیان باس کرابێ. نمونەی یەکەم کە هەردو حوکمەکە باس کرابن ئەو فەرمودەیە کە بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە کە: پێغەمبەرﷺ لە دەستکەوتی جەنگ دوو بەشی بۆ ئەسپ دائەنا و یەك بەشیش بۆ خاوەنەکەی ، پێغەمبەر ئەم دوحوکمەی لەیەك جیاکردووەتەوە -واتە دووبەش و یەك بەش-بەهۆی ئەم دوو صیفەتەوە کە ئەسپ و پیاوە، ئەگەر لەبەر بەعیلەتبونی هەر یەك لەو دوانەدا نەبوایە

ومثال الثاني حديث الترمذي القاتل لايرث اي بخلاف غيره المعلوم اراثه فاتفريع بين عدم الارث المذكور وبين الارث المعلوم بصفة القتل المذكور مع عدم الارث لو لم يكن لعليته له لكان بعيداً[1]. {او} تفريقه بين حكمين {بشرط او غاية او استثناء او استدراك} مثال الشرط حديث مسلم الذهب بالذهب والفظة والبر بالبر والشعير بالشعير والتمر بالتمر والملح بالملح مثلاً بمثل سواء بسواء يدا بيد فاذا اختلفت هذه الاجناس فبيعوا كيف شئتم اذا كان يدابيد فالتفريق بين منع البيع في هذه الاشياء متفاضلا وبين جوازه عند اختلاف الجنس لو لم يكن لعلية الاختلاف للجواز لكان بعيدا[2].

---

ئەوە باسکردنیان زۆر دور بوو لە ڕەوانبێژی پێغەمبەرەوە .

(١) نمونە بۆ دووەمیش کە یەکێکیان باس بکرێ و ئەوی تریان عەقڵ بیزانی ئەم فەرمودەیە کە تیرمزی ڕیوایەتی کردووەو دەفەرموێ: بکوژ میرات نابا، واتە جیاوازە بۆ کەسێ کە بکوژ نەبێ کە میراتکەی دیارە، لەبەر ئەوە جیاوازی دروست کردن لە نێوان نەبونی میراتگردا کەباس کراوە وە نێوان میراتێك کە دیارەو باسنەکراوە بەهۆی سیفەتێکەوە کە کوشتنەکەیەو باس کراوە لەگەڵ نەبونی میراتەکەدا، ئەگەر ئەم کوشتنە عیلەت نەبووایە بۆ نەبونی میراتەکە زۆر دوربوو لەڕەوانبێژی پێغەبەرەوە کە باسی بکردایە.

(٢) یاخود وەك ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان دوحوکمەوە بەهۆی مەرجێکەوە یاخود بەهۆی غایەو کۆتا مەبەستێکەوە،یاخود بەهۆی استثنا و پێش و پاش لەیەك جیا کردنەوە، یاخود بەهۆی فریا کەوتنەوە بۆ ئەوەی گوێگر بەهەڵەدا نەچێ نمونە بۆ مەرجەکە وەك ئەو فەرمودەیە کە موسلم ڕیوایەتی دەکاو ئەفەرموێ: ئاڵوگۆڕکردنی ئاڵتون بەئاڵتون و زیو بەزیو و گەنم بەگەنم و جۆ بەجۆ خورما بەخورماو خوێ بەخوێ، وە دروستە بەم سێ مەرجە: نمونەی یەك بن، یەکسان بن لەگەڵ یەکدا، دەست بەدەست بن و هەر دو ئامادە بن، کەوابو ئەگەر ڕەگەزی ئەمانە لەیەك جیابوو، وەك گەنم بە جۆ بێ، ئەوە چۆنتان ئارەزولێ بێ بیفرۆشن و ئاڵوگۆڕی پێوە بکەن ئەگەر هەردو ئامادە بن و دەست بەدوست بن، کەوابو فەرق و جیاوازی کردن لە نێوان قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنی ئەمانە ئەگەر یەکێکیان زیاد بێ، و لەنێوان دروست کڕین و فرۆشتنیە کەیاندا کاتێ ڕەگەزەکەیان جیاواز بێ، ئەگەر عیلەتەکە جیاوازی نەبوایە بۆ دروستی ئاڵ و گۆڕەکە، ئەوە زۆر دوربو جیاوازی بخاتە نێوانیانەوە.

ومثال الغاية قوله تعالى ولا تقر بوهن حتى يطهرن اي فاذا طهرن فلا منع من قر
ـنهن كما صرح به في قوله عقبه فاذا تطهرن فاتوهن فتفريقه بين المنع من قربانهن في
حيض وبين جوازه في الطهر لو لم يكن لعلية الطهر للجواز لكان بعيداً[1].

ومثال الإستثناء قوله تعالى فنصف مافرضتم إلاّ ان يعفون اي الزوجات عن ذلك
ـنصف فلا شيء لهن فتفريقه بين ثبوت النصف لهن وبين انتفائه عند عفوهن عنه لو
ـن يكن لعلية العفو للانتفاء لكان بعيداً[2] ومثال الإستدراك قوله تعالى: ﴿ لايؤاخذكم
ـه باللغو في ايمانكم ولكن يؤاخذكم بما عقدتم الايمان ﴾ فتفريقه بين عدم المؤاخذة
ـلايمان وبين المؤاخذة بها عند تعقيدها لو لم يكن لعلية التعقيد للمؤاخذة
ـكان بعيداً[3].

١) نمونەی ئەوەش دو حوکمە کە جیایان بکاتەوە فەرمودەی خوایە دەفەرموێ:
ـێك ژنان نەکەونەوە هەتا پاك دەبنەوە، واتە ئەگەر پاك بونەوە ئەوەهیچ جۆرە
ـدەغەبونێك نیە لە نزیك بونەوەیان، وەك ئایەتی پاش ئەوە بەڕونی فەرمویەتی: جا
ـاتێ پاك بونەوە بچنە لایان، ئەمەی کە خوای گەورە فەرقو جیاوازی دەخاتە نێوان
ـدەغە کردن لە نزیك بونەوەیان لە حەیزدا و لە نێوان دروستی نزیك بونەوە لێیان
ـەپاکی دا، ئەگەر پاکیەتی عیلەتی نەبوایە بۆ دروستیەکەی ئەوە زۆر دور دەبو لە
ـڕەوانبێژی قورئانەوە.

(٢) نمونە بۆاستثناش ئەو ئایەتە بەخوا دەفەرموێ: ئەوە نیوەی ئەو ماریە بدەن
ـڕیارتان لەسەر بڕیوەتەوە مەگەر ئەو ژنانە چاو پۆشی بکەن لەو نیوەشی، جا کە
چاو پۆشیشیان کرد لە نیوەکەی تریش ئەوە هیچ شتێکیشان بۆ نیە، کەوابو خوای
گەورە کەفەرق و جیاوازی دەخاتە نێوانی بوونی نیوەی مارەی بۆ ئەو ژنانەو لەنێوان
ـەبونی ئەو نیوەیەش لە کاتی چاوپۆشیاندا لەو نیوەیەش، ئەگەر چاوپۆیەکە عیلەت
ـەبوایە بۆ نەمانی نیوەکە ەئەوە زۆر دور دەبو لە ڕەوانبێژی قورئانەوە.

(٣) نمونە بۆ استدراك و فریای ڕاست کردنەوەی حالّی بونی گوێگر، خوای گەورە
ـەفەرموێ: خوای گەورە بەهۆی سوێنی بێ نیاز نانەوە ناتان گرێ و تۆڵەتان
ـێ ناسێنێ، بەلاّم دەتان گرێ و تۆڵەتان لێ دەستێنێ بەهۆی سوێنێکتانە کە نیازتان
کردووە لەبەر ئەوە جیاوازی دروست کردن لە نێوان نەبونی تۆڵە بەهۆی سوێنەوە
و نێوان تۆڵە دران بەهەر هۆی سوێنەوە لە کاتی نیازکردنیدا، ئەگەر نیاز بەستنی
نیازەکە بەعیلەت نەبوایە بۆ تۆڵە وەرگرتنی لەسەری، ئەوە زۆر دورە لە ڕەوانبێژی
قورئان .

{وكترتيب الحكم على الوصف} نحو اكرم العلماء فترتيب الإكرام على العلم لو لم لكن لعلة العلم له لكان بعيداً[1]. {وكمنعه} اي الشارع {مما قد يفوت المطلوب} نحو قوله تعالى فاسعوا الى ذكر الله وذروا البيع فامنع من البيع وقت نداء الجمعة الذي قد يفوتها لو لم يكن لمظنة تفويتهنا لكان بعيداً[2]. وهذه امثلة لما اتفق على انه يماء وهو أن يكون الوصف والحكم ملفوظين وان كان في بعضها تقدير وعكس هذا القسم ليس بايماء قطعا وفي الوصف الملفوظ والحكم المستنبط وعكسه وفيه اكثر العلماء خلاف مختلف الترجيح كما افادته عبارة المصنّف قيل انهما ايماء تنزيلا للمستنبط منزلة الملفوظ فيقدمان عند التعارض على المستنبط بلا ايماء [3].

(١) یاخود وەك راست و دروست كردنی حوكمێك لەسەر سیفەتێك، وەك رێز لە زانایان بگرە، ڕاست دروت كردن وبەشوێنا هێنانن ڕێز گرتنی لەسەر عیلم و زانست ئەگەر عیلم وزانست عیلەتی ئەوڕێزگرتنە نەبوایە ئەوە زۆر دوردەبو لەڕەوانبێژیەوە.

(٢) یەكێكیتر لە ایماو ئامارژە پێ كردن وەك ئەوەی شارع شتێ قەدەغە بكا چونكە لەوانەیە مەبەست و داخواز بنەوتێنێ، وەك خوای گەورە فەرمویەتی:دەئێوەش بچن بۆ نوێژو یادی خوا كڕین و فرۆشتن واز لێ بهێنین، ڕێ گرتن و قەدەغەكردنی كڕین و فرۆشتن لەكاتی بانگی جومعەوە كە لەوانەیە كەمجاران بێ بێتە هۆی فەوتانی جومعەكە، ئەگەر كڕین و فرۆشتنی جێ گومانی فەوتانی نوێژی جمعە نەبێ و نەبوایە زۆر دور بو لە میهرەبانی خواوە كە دەستی خەڵك بگرێ لە ئاڵو گۆڕ كردن.

(٣) ئەم نمونانە هەر هەمویان نمونەن بۆ ئەوی كە بەڕای هەموان ایماو ئامارژە كردنیان تێدایە، ئەوەش كە بەڕای هەموان ایمابێ ئەوەیە كە سیفەتو حوكمەكە هەردوكیان لەفزی بن، هەرچەند لە هەندێ نمونەكاندا تەقدیرو شاراوەی تێدا بوو. پێچەوانەی ئەم بەشە بێ گومان كە ئامارژە كردن وایمای تێدانیە، وا تە ئەگەر سیفەتو حوكمەكە هەر دوكیان لەدەقەدەرهێنرابن، بەڵام ئەگەر سیفەتەكە دەقی لەسەر بو حوكمەكە دەرهێنرابو یاخود پێچەوانەكەی، واتە حوكمەكە دەقی لەسەر بو سیفەتەكە لەدەق دەرهێنرابو، زۆربەی عیلەتەكان لەوعەكس وپێچەوانەدایە، چونكە شەرع زۆربەی كات هەرحوكمەكان باس دەكا بێعیلەتەكانیان، مجتهدعیلەتەكان دەدۆزێتەوە ئا لەم جۆرەیاندا زانایان ڕایان جیاوازەو جۆر جۆرە، پەسەندیدەی هەریەكێكیان لەویتریان جیاوازە، دەستەواژەكەی دانەریش ئەو جیاوازیەی دەگەیاند، چونكە ئەگەر حوكمەكە لەفظی بێ و سیفەتەكە مستنبط بێ قیلی بۆ بەكار هێنا، وە ئەگەر حوكمەكە مستنبط بێ و صیفەتەكە لەفظی بێ وشەی (لو) ی بۆ بەكارهێنا نەك قبله .

وَقِيلَ ليس ايماء والأَصَحُّ ان الولا ايماء لاستلزام الوصف للحكم بخلاف لثاني لجواز كون الوصف اعم[1].

مثال الاول قوله تعالى واحل الله البيع فحله مستلزم الصحته والثاني كتعليل لربويات بالطعم أو غيره ومثال النظير حديث الصحيحين ان امرأة قالت يارسول الله: ن أمي ماتت وعليها صوم نذر افأصوم عنها؟ فقال: ارايت لو كان على أمك دين قضيته اكان يؤدي ذلك عنها؟ قالت: نعم قال فصومي عن امك اي فإنَّهُ يؤدي عنها سألته عن دين الله على الميت وجواز قضائه عنه فذكر لها دين الآدمى عليه وقررها عى جواز قضائه عنه وهما نظير ان فلو لم يكن جواز القضاء فيهما لعلية الدين ه لكان بعيداً[2].

---

ھەندێك وتویانە: ئەو دو وانە هەردوكیان ایماو ئامارژە كردنیان تێدایە چونكە ستنبطە لە جیێ ملفوظەكە دا دەنرێ، بۆیە لە كاتی بەگژیەكدا چوندا هەردویكان ێش دەخرێن بەسەر مستنبطیكی ڕوتی بێ إیمادا چونكە زۆر بەی كات حوكم لە ەلامی شارعدا بێ عیلەت باسی دەكرێ و پێشەوایان عیلەتەكەی دەدۆزنەوە.

(١) هەندێكیش ووتویانە: هەردووكیان ایماو ئامارژە كردنیان تێدا نیە، قەولی صەح و لە هەموان دروست تر ئەوەیە كەیەكەمیان ایماو ئامارژەكردنی تێدایە چونكە سیفەتێك كە لە دەقەكە دابێ بێ حوكم نابێ، بەلام دووهەمەكەیان وانیە كە سیفەتەكە مستنبط بێ و حوكمەكە مەلفوظ بێ، چونكە ئەگونجێ سیفەتەكە گشتگیر ر بێ لە حوكمەكە، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ بەڕێ یابونی شتێ بە هۆی كێشانەوە، كێشانەش لە گەچدا هەیە لەگەڵ ئەوەش مادەیێكی ڕێبەوی نیە.

(٢) نمونەی یەكەم ئەوەیە خوای گەورە ئەفەرموێ: خوا كڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ كردووە، حەڵاڵی كڕین و فرۆشتن، كە سیفەتێكی ملفووزە، پێویست دەكا بۆ دروستی ـ صحەتەكەی، كە حوكمی مستنبطە، نمونە بۆ دووهەمیش كە بریتیە لەوەی سیفەتكە مستنبط بێ و حوكمەكەی ملفوظ بێ، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ هەمو ئەو مادانەی كە ڕیبایان تێدایە بوترێ: لەبەر ئەوە كە پێخۆرە یاخود غەیری ئەوە حوكمەكە ملفوظە و عیلەتەكەی مستنبطە ، نمونە بۆ فیاو هاووینە ئەو فەرمودەیە هەردو صەحیحدا هاتووە و دەفەرموێ: ژنێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا دایكم ئەمرێ خوای كردو ڕۆژوی نەذری بەسەرەوە بو ئایامن لەباتی بیگێڕمەوە؟ پێغەمبەریش فەرموی پێم بڵێ گریمان قەرزێك بەسەر دایكتەوە بووایێ دەتدایەوە، ئایا ئەو دانەوەی تۆ لەباتی ئەو حسێب دەكرا؟ ژنەكە وتی: بڵێ، پێغەمبەر فەرموی:

{ولا يشترط} في الايماء {مناسبة} الوصف {المومى اليه} للحكم {عند الاكثر} بناء على أن العلة بمعنى المعرف وَ قِيلَ يشترط بناء على أنها بمعنى الباعث[1].

{الرابع} من مسائلك العلة {السبر والتقسيم وهو حضر الاوصاف} الموجودة {في الاصل} المقيس عليه {وابطال مالا يصلح} منها للعلية {فيتعين الباقي} لها كأن يحضر أوصاف البر في قياس الذرة مثلاً عليه في الظعم وغيره ويبطل ماعدا الطعم بطريقه فيتعين الطعم للعلية والسبر لغة الاختبار فالتسمة بمجموع الاسمين واضحة وقد يقتصر على السبر[2].

دەی کەوابو تۆیش لە باتی دایکت ڕۆژوەکە بگرەوە. واتە ئەو ڕۆژوەوە لە باتی ئەو ئەدرێتەوە . ژنەکە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر لەبارەی قەرزی خوا بەسەر مردووەوە و دروستە لە باتی ئەو دانەوەی، پێغەمبەریش باسی قەرزی ئادەمیزادێکی کرد بەسەر یەکێکیترەوە و بۆی سەلماند کە دروستە لەباتی ئەو ئادەمیزادە بۆی جێ بەجێ بکاتەوە، ئەو دوقەرزە: قەرزی خواو قەرزی ئادەمیزاد هاو وێنەیەتی یەکن.. ئەگەر دانەوەی قەرز لەو دوو هاووینەدا دروست نەبووایە لەبەر بەعیلەتبونی قەرزەکە بۆی ئەوە زۆر دور دەبو لە ڕەوانبێژی پێغەمبەرەوە.

(١) بەمەرج نەگیراوە لە ئیماو ئامازەی پێ کردندا مناسبەو خزمایەتی لە نێوان ئەو سیفەتەی ئامازەی بۆ لای کراوە حوکمەکە، واتە مەرج نیە سیفەتەکە خزمایەتی هەبێ بۆ حوکمەکە، بەلای زۆربەی زانایانەوە، چونکە سەیری ئەوەیان کردووە کە عیلەت بەمانا معرف و نیشانەیە، هەندێکیش ووتویانە: بەمەرج گیراوە، چونکە سەیری ئەویان کردووە کە عیلەت بەمانا هاندەرو شەوق پەیدا کەری خەڵکە بۆ کردنی کارەکە چونکە مصلەحەت و بەرژەوەندێکی تێدایە.

(٢) چوارەم لەو ڕێگایانەی ئەگەر بیانگرینە بەر ئەمان گەێنن بە عیلەتەکە بریتیە لەسیبرو تەقسیم و تەجربەو دابەش کردن، ئەویش ئەوەیە هەمو ئەو سیفەتانەی کە لە ئەسڵە قیاسی لەسەر کراوەکەدا هەیە دەست نیشان دەکرێن، ئەمجا ئەوەیان کە شیاو نیە بۆ بەعیلەت بون پوچەڵ دەکرێتەوە ولا دەبرێ، ئەمجا سەر ئەنجام ئەوەیان دەمێنێتەوە بۆ بەعیلەتبون دیاری دەکرێت، وەك ئەوەی هەرچی سیفەتی گەنم هەیە حەصر دەکرێت لە قیاسی گەنجە شامیدا بۆ سەر گەنم لە پێخۆرو غەیری ئەویشدا. ئەمجا جگە لە سیفەتی پێنخۆریەکە هەموویان پوچەڵ دەکرێنەوە،بەگوێرەی شێوازی پوچەڵ کردنەوە، ئەمجا پێخۆریەتەکە دیاری دەکرێ بۆ بەعیلەتبونەکە. سیبر لە زاراوەی عەرەبیدا بەمانا تاقی کردنەوە و تەجرەبەیە ، بۆیە ناو نانەکە بەهۆی

{ويكفي قول الستدل} في المناظرة في حصر الأوصاف التي يذكرها {بحثت هم اجد} غيرها {والاصل عدم ماسواها} لعدالته مع اهلية النظر فيندفع عنه بذلك سنع لاحصر[1].

{والمجتهد} اي الناظر لنفسه {يرجع} في حصر الاوصاف {الى ظنه} فياخذ به ،: يكابر نفسه {فان كان الحصر والإبطال} اي كل منهما {قطعيا فقطعي} اي فهذا لمسلك قطعي {والا} بأن كان كل منهما ظنيا او احدهما قطيعا والآخر ظنيا {فظني ،هو} اي الظني {حجة للناظر} لنفسه {والمناظر} غيره {عند الأكثر} لوجوب العمل ـظن وَ قيلَ ليس بحجة مطلقاً لجواز بطلان الباقي[2]

ەردووشتەکەوە ڕون دەبێـەوە دەبێ بووترێ: سیبر و تەقسیم، بەڵام کەم جارانیش ەر دەووترێ سیبر، هەر چەند لە (اصول الفقه)دا هەر سیبر و تقسیم دەوترێ و ـو دەبرێ.

(١) کەسێ بەڵگەبە دەست لە سیمنیارەکەدا کە حەسری هەموسیفەتەکان ـکاو باسیان دەکا دەڵێ: توێژینەوەم کردو گەڕام جگە لەو سیفەتانەم دەست ـکەوت، ئەم قسەیە بەسە بۆ ئەوەی بزانین سیفەتەکان هەر ئەوەن، ئەسڵیش ئەوەیە غەیری ئەو سیفەتانە نەبن، چونکە بەڵگە بەدەست عادڵە لەگەڵ ئەوەش خاوەنی بیروڕای تایبەتە، بەوە، ئەووترا حەصر نابێ مندفع دەبێ لە بەڵگە بە دەستەکە.

(٢) مجتهدیش کە هەرخۆی گوفتو و حیوار لەگەڵ خۆیدا دەکا لە حەسری سیفەتەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ لای گومانی خۆی، ئیتر بەو گومانی خۆیە کار دەکاو ـوت بەرزی لەگەڵ خۆیدا ناکا جا ئەگەر لەحەصرو پوچەڵ کردنەوەکە هەردوکیان بێ گومان بوو لە بەر ئەوەی بەڵگەکەی بێ گومان بوو ئەوە ئەم ڕێگرتنەبەرە بێگومان ئەبێ بۆ دۆزینەوەی عیلەتەکە. وە ئەگەر وانەبوو بەم شێوە هەردوکیان گوماناوی بون یاخود یەکێکیان بێگومان بێ و ئەویتریان گوماناوی بێ، ئەوە ئەم ڕێگرتنە بەرە بۆ دۆزینەوەی عیلەتەکە گوماناوی دەبێ، ئەو ڕێبازە گوماناویەش حوججەو بەڵگەیە بۆ مجتهدەکە و ئەوەش کە دیفاع لە پەیرەوی پێشەواکەی دەکا، بەلای زۆربەی زانایانەوە وایە، چونکە واجبە کار کردن بە گومان، هەندێکیش ووتویانە: نەبۆ مجتهدەوە نە بۆ غەیری ئەو بەڵگەو حوججە نیە، چونکە دەست ئەدا ئەوەش کە هێشتونیەتەوە هەر پوچەڵ کرێنەوە.

{وثالثها} حجة لهما {ان اجمع على تعليل ذلك الحكم} في الأصل {وعليه امام الحرمين} حذرا من اداء بطلان الباقي الى خطأ المجمعين[1]. {ورابعها} حجة {للناظر لنفسه {دون المناظر} غيره لان ظنه لا يقوم حجة على خصمه[2]{فان ابدى المعترض على حصر المستدل الظني {وصفا زائدا} على اوصافه {لم يكلف بيان صلاحيته للتعليل} لأن بطلان الحصر بابدائه كاف في الاعتراض فعلى المستدل دفعه بابطال التعليل به[3] {ولا ينقطع المستدل} بابدائه {حتى يعجز عن ابطاله} فان غاية ابدائه منع لمقدمة منالدليل والمستدل لا ينقطع بالمنع ولكن يلزمه دفعه ليتم دليله فيلزمه ابطال الوصف المبدا عن ان يكون علة فان عجز عن ابطاله انقطع[4].

(١) قەولی سێهەم دەڵێ: صەحیحەو بەڵگەیە بۆ هەر دوکیان بەمەرجێ زێ هەموان خڕ بکرێتەوە کە ئەو حوکمی ئەسڵە کە عیلەتی بۆ هێنراوەتەوە تعبدی نیە امام الحرمینیش لەسەر ئەم بۆچونەیە، چونکە لە ترسی ئەوەی دەووترێ حوججەی ئەوەش کە ماوە هەر پوچەڵ کرێتەوە سەر ئەکێشێ بۆ ئەوەی بەغەڵەت بزانرێ ئەو اجماعەی زانایان بەستویانە.

(٢) قەولی چوارەم دەڵێ: بەڵگەیە تەنها بۆ مجتهدەکە نەك بۆ ئەوەی دیفاع لەغەیری خۆی بکا، چونکە گومانی ئەوەی غەیری خۆی دەپارێزی نابێتە بەڵگە بەسەر نەیارەکەیەوە.

(٣) جا ئەگەر ڕەخنە گرەکە لەسەر حەسری بەگومانی بەڵگە بەدەست سیفەتێکی تری ئاشکرا کرد زیاد لەوانی ئەو، ئەوە ئەو ڕەخنەگرە تەکلیفی ئەوەی لێ ناکرێ بەیانی ئەوە بکا کە ئایا ئەو سیفەتە ئەشێ بۆ ئەوەی بکرێ بە عیلەت،چونکە پوچەڵ کردنەوەی حەسرەکە بەهۆی دەرخستنی ئەو صیفەتە بەسە لەڕەخنەکەدا، بەڵگە بەدەستیش دەبێبیاتە دواوە بەهۆی پوچەڵ کردنەوەی عیلەتی پێ هێنانەوەی.

(٤) هەر بەوەی ڕەخنە گر سیفەتێکی دەر خست بەڵگە بەدەست ناپچڕێ و پەکی ناکەوێ هەتا ئەو کاتەی دەسەوەسان دەبێ لە پۆچەڵ کردنەوەی چونکە ئەو پەڕی کار کردنی ئەو دەرخستنە ئەوەیە کە پێشە کیێك لە پێشە کیەکانی بەڵگەی قەدەغە کردووە، بەڵگە بەدەستەکەش هەر بەو قەدەغەیە پەکی ناکەوێ، بەڵام هەر دەبێ ئەو ڕەخنەیە بەرێتە دوواوە بۆ ئەوەی بەڵگەکەی تەواو تۆکمە بێ، لە بەر ئەوەی ئەو سیفەتەی ئاشکرا کراوە هەر دەبێ پوچەڵ بکرێتەوە لەوەی کەدەشێ بکرێتە عیلەت، جا ئەگەر نەیتوانی پوچەڵی کاتەوە ئەو کاتە بەڵگە بەدستەکە دەپیچڕێ و لە کار دەکەوێ.

{وقد يتفقان} اي المتاظران {على ابطال ماعدا وصفين} من اوصاف الأصل يختلفان في ايهما العلة {فيكفى المستدل الترديد بينهما} من غير إحتياج الى ضم ماعد هما اليهما في الترديد لاتفاقهما على ابطاله فيقول العلة اما هذا او ذالك لا جائز ان تكون ذاك لكذا فيتعين ان تكون هذا[1]. {ومن طرق الابطال} لعلية الوصف {بيان ان الوصف طرد} اي من جنس ماعلم من الشارع الغاؤه {ولو في ذلك لحكم} كما يكون في جميع الاحكام {كالذكورة والانوثة في العتق} فانهما لم يعتبرا فيه فلا يعلل بهما شيء من احكامه وان اعبرا في الشهادة والقضاء والارث وولاية النكاح والطرد في جميع الاحكام كالطول والقصر فانهما لم يعتبرا في القصاص ولا الكافارة ولا الارث ولاالتعتق ولا غيرها فلا يعلل بهما حكم اصلا[2].

(١) کەم جارێك بەڵگە بەدەست و ڕەخنەگر هەردوکیان یەك قسە دەبن لەسەر پوچەڵ کردنەوەی هەمو سیفەتەکان جگە لەدووانیان نەبێ، بەڵام ڕایان جیاواز دەبێ لەوەدا ئایا ئەم دوانەکامیان عیلەتەکەیە. ئەو کاتە بەڵگە بەدەستە کە هەر ئەوەی بەسەدو دڵی بخاتە نێوانیانەوە، بێ ئەوەی پێویستی هەبێ بەوەی لەدودڵی دروست کردنەکەدا سیفەتێکی تریان پێوە بلکێنێ، چونکە هەردوکیان یەك قسە بون لەسەر پوچەڵ کردنەوەی هەمو سیفەتەکان جگە لەو دوانە، بەم شێوەیە بۆ دو دڵی دروست کردنەکە بڵێ: عیلەتەکە یا ئەمەیانە یاخود ئەوەیانە، دروستیش نیە ئەوەیان بێ لەبەر ئەوە، بۆیە دەبێ عیلەتەکە ئەمەیان بێ.

(٢) یەکێك لە ڕێبازی پوچەڵ کردنەوەی بە عیلەتبونی سیفەتێك ئەوەیە کە بەیان بکرێ ئەو سیفەتە مطرودە، واتە لە ڕەگەزی ئەوانەیە کە لەشارعەوە زانراوە پوچەڵ بوونەوەی ، باتەنها هەر لەو حوکمەدا پوچەڵ بوبێتەوە، وەك چۆن دەبێ و نەشگونجێ لە هەمو حوکمێکدا پوچەڵ بکرێنەوە، وەك سیفەتی نێرایەتی و منگایەتی لەباسی ئازاد بوندا، ئەو دوو سیفەتە لە باسیئازادبوندا ئیعتباریان پێناکرێ، لەبەر ئەوە هیچ شتێك لەئەحکامی ئازادی عیلەتی بۆ ناهێنرێتەوە بەو دوسیفەتە، هەرچەند ئەو دوسیفەتە لە بابەتی گەواهیدان و دواوەری و میرات و فەرمان بەدەست گرێ بەندی هاوسەر گری دا اعباریان پێ دەکرێ، ئەوەش کە لە هەمو حوکمێدا پوچەڵ کرابێەوە وەك باڵابەرزی و کورتە باڵا بێ لەبابەتی کوشتنەوە و کە قارەتومیرات و ئازادیدا اعتبارایین پێ ناکرێ، لەبەر ئەوە هیچ حوکمێك بەو دووانە عیلەتی پێ ناهێنرێتەوە .

{ومنـها} اي مـن طـرق الإبطـال {أن لا تظـهر مناسـبة} الوصـف {المحـذوف} عـن الاعتبار للحكم بعد البحث عنها لانتفاء مثبت العلة بخلافه في الايماء[1]. {ويكفى} في عدم ظهور مناسبته {قو لامستدل بحثت فلم اجد} فيه {مؤهم مناسبة} اي ما يوقع في الوهم اي الذهن مناسبة لعدالته مع اهلية النظر[2].

{فان ادّعى المعـترض انّ} الوصـف{المسـتبقي كذلك} اي لم تظهر مناسـبته{فليس للمستدل بيان مناسبته لان انتقال} من طريـق السبر الى طريـق المناسـبة والانتقال يـؤدي الى الانتشـار المحـذور {ولكـن يرجـح سـبره} علـى سـبر المعـترض النـافي لعلية المستبقي كغيره {بموافقة التعدية} حيثُ يكـون المستبقي متعديا فـان تعديـة الحكم محله افيد من قوصره عليه[3].

---

(١) یـەکێکی‌تر لـە و ڕێبازانـەی پوچـەڵ کردنـەوە ئەوەیـە مناسـبەو خزمایـەتی ئـەو سـیفەتەی کـە لایـداوە لـە اعتبـار پـێ کـردن بـۆ حوکمەکـە دەر نەکـەوێ دوای باسوتونێژنەوە لەبارەی ئـەو خزمایەتیـەوە، چونکـە ئـەوەی دەی سـەلمێنێ دەبێت عیلەت نەماوەو نیە، بەڵام لە ایما و ئاماژە پێ کردندا جیاوازە .

(٢) لـە دەرنەکـەوتنی مناسـبەو خزمایـەتی ئـەو سـیفەتەدا قـەولی بەڵگـە بەدەست بەسـەکە دەڵـێ: زۆر توێژینـەوەم کـرد ئـەوەی بـێ بـەبیری ئـادەمی‌دا کـە مناسـبەو خزمایـەتی هـەبێ ئـەم دۆزیـەوەو دەستم نەکـەوت، بۆیـە ئـەو قسـەش پەسـەندە چونکە عادڵە لەگەڵ ئەوەش خاوەنی ڕاو بۆچون و بیری سەر بەخۆیە.

(٣) بەڵام ئەگەر ڕەخنە گرەکە هەراێیکی کرد وتی: ئەو سیفەتەش کـەتۆ هێشتەوە ئەویش هەروەها مناسبەو خزمایەتیەکەی بۆ حوکمەکە دەر نەکـەوتووە، ئـەو کاتـە بۆ بەڵگە بەدەسەکە نیە بەیانی مناسبەو خزمایەتی سیفەتەکە بکا بۆ حوکمەکە، چونکە ئەو بەیانە انتقال و گواستنەوەیە لە ڕێبازی سیبرو تەقسیمەوە بۆ ڕێبازی مناسبەو خزمایەتی، گواستنەوەش سەر ئەکێشێ بۆ ئەو پشتگو بڵاویەی لە حیوارو گوفتوگۆدا حـەزرەی لێ دەکـرێ، بـەڵام سـیبرەکەی خـۆی تـەرجیح ئـەدا بەسـەر سـیبری ڕەخنەکەرەکـەدا کەنـەفی بەعیلـەت بوونـی ئـەو صیفەتـە دەکـا کەماوەتـەوە، وەك صیفەتـەکانی‌تر، تەرجیحەکـەش بـەهۆی موافقـەی گواسـتنەوەی حوکمەکـەی، لـەو جێیـەدا ئـەو سـیفەتەی ماوەتـەوە حوکمەکـەی هـێزی گواسـتنەوەی هـەبێ، چونکـە حوکمێك لە جێ خۆی بگوێزێتـەوە بۆلاێیکـی تـر بەکـەڵکترە لـەوەی کەهـەر تایبەت بێ بەیەك جێوە .

{الخامس} من مسالك العلة {المناسبة والاخالة} سميت مناسبة الوصف ـلاخالة لأن بها يخال اي يظن ان الوصف علة {ويسمى استخراجها} بأن يستخرج لوصف المناسب {تخريج المناط} لأن ابداءما نيط به الحكم {وهو} اي تخريج لمناط {تعيين العلة بابداء مناسبة} بين المعين والحكم {مع الاقتران} ـينهما {والسلامة} للمعين {عن القوادح} في العلية [1]. {كالاسكار} في حديث مسلم كل مسكر حرام فهو لازالته العقل المطلوب حفظه ماسب للحرمة وقد اقترن بها ـوسلم عن القوادح وباعتبار المناسبة في هذا ينفصل عن الترتيب من الايماء ثمَّ السلامة عن القوادح كانها قيد في التسمية بحسب الواقع والاّ فكل مسلك ـلايتم بدونها[2].

---

(١) پێنجەم لەو ڕێبازانەی دەستمان دەگرن و دەمانبەنە سەر عیلەت مناسبە و ئیخالەیە، واتە خزمایەتی و گومان تێبردنە، بۆیە مناسبەو خزمایەتی ئەو سیفەتو عیلەتە ناونراوە بە ئیخالە، چونکە بەهۆی ئەو مناسبەوە گومان دەبرێ کە سیفەتەکە عیلەتە، دەرهێنانی مناسبەی ئەو سیفەتە ناو دەبرێ بە (تخريج المناط)، واتە ـەرهێنانی ئەوەی حوکمەکی پێوە بەسراوە، چونکە ئەوە ئاشکرا کردن و دەرخستنی ئەو شتەیە کە حوکەکەی پێوە بەسراوە. (تخريج المناط) بریتیە لە: دیاری کردنی عیلەتەکە بەهۆی دەرخستنی مناسبەو خزمایەتی نێوان سفەتەکەو حوکمەکە لەگەڵ ئەوەش نزیك و هامڕای یەك بن، وەك سیفەتی سەر خۆش کردن لەگەڵ حەرامدا، مناسبی یەکن و یار یەکترن، لەگەڵ ئەوەش ئەو سیفەتە ڕزگاری بوبێ لەوانەی تەعن ـەدەن لە بەعیلەتبونی شتێکدا،

(٢) وەك دەرهێنانی بەعیلەتبون ئیسکارو سەرخۆش کردن لە دەقەکەدا کە دەلالەت دەکا لەسەر حەرام کردنی عەرەق، لەو فەرمودە دەدا کە مسلم ڕیوایەتی کردووە و ئەفەرموێ: هەرچی سەر خۆشکەر هەیە حەرامە، لەبەر ئەوەی ئیسکار عەقڵ لادەباو داخوازیش ئەوەیە بپارێزرێ مناسبەو خزمایەتی هەیە بۆ حەرامبون، وە دەقەکەش لە پاڵیەك و نزیك یەکەوە باسی کردون و سەلامتیشە لەهەمو تەعنەێك ئەم اقتران و هەمڕابونی سیفەتو حوکمە لە تەرتیبی ایماو ئامارژە پێ کردنکەی پێشو جیا دەبێـەوە بەهۆی ئەوە لێرە مناسبە دەبێ هەبێ بەلام لەوێ پێویست ناکا، پاشان سەلامەت و ڕزگار بونی سیفەتەکە لە هەمو تەعنێك تەنها قەیدێکە بۆ ناونانە کە، چونکە لە هەرجێیکدا عیلەت هەبێ دەبێ لەهەمو تعنێك سەلامەت بێ، بەلام لێرە ئەگەر نەبێ ناویش و بەعیلەتبونەکەشی دەفەوتێ .

وهي والاقتران مزيدان على ابن الحاجب في الحد لكنه حدبة المناسبة وسماه تخريج المناط وماصنعه المصنّف اقعد[1] {ويتحقق الإستقلال} اي استقلال الوصف المناسب في العلية {بعدم ماسواه بالسبر} لا بقول المستدل بحث فلم احد غيره والاصل عدمه كما تقدَّمَ في السبر لان المقصود هنا الاثبات وهناك النفي[2].

{والمناسب} المأخوذ من المناسبة المتقدمة {الملائم لافعال العقلاء} عادة كما يقال هذه اللؤلؤة مناسبة لهذه اللؤلؤ بمعنى ان جمعها معها في سلك موافق لعادة العقلاء في فعلِ مثلِه فمناسبةُ الوصف للحكم المترتّب عليه موافقه لعادة العقلاء في ضميهم الشيء الى ما يلائمه[3]. {وَ قِيلَ } هو {مايجلب} للانسان {نفعا او يدفع} عنه {ضرراً} قال في المحصول وهذا قول من يعلل احكام الله بالمصالح والاول قول من يأباه والنفع اللذة والضرر الالم[4].

---

(١) لەپێناسەکەدا دوو قەیدی زیادکرد بەسەر پێناسەکەی (ابن الحاجب - کەسەلامەت لەهەمو تەعنێك و اقترانبونیانە، بەڵام (ابن الحاجب) بەپێناسەکەی دانەر پێناسەی مناسبەی کردووەو ناوی ناوە بە (تخريج المناط) بۆ ئەوەی ئەو دوقەیدی پێوە بێ ئەوەی دانەر کردی چاکترە، چونکە (تخريج المناط) فعله،مناسبەش سیفەتە پێناسە بە سیفەتی خەڵك گونجاو نیە.

(٢) سەر بەخۆی ئەو سیفەتەی کە مناسبە لەبە عیلەتبوندا بەنەبونی غەیری ئەو دوای تەفتیش و تەجربە دێنەدی، نەك بەقسە بەڵگە بەدستە بڵێ: گەڕام و غەیری ئەوەم دەست نەکەوت، ئەسڵیش ئەوەیە غەیری‌ئەوسیفەتە نەبێ، وەك لەباسی سیبر-رابورد،چونکە لێرەدا مەبەست ئیسبات کردنەو لەوێ مەبەست نەفی‌کردنە، سەلماندن پێویستی بە بەڵگەی زۆر هەیە، بەڵام نەفی هەر شتێکی ئاسان هەبێ نەفی دەکرێ.

(٣) ئەو مناسبەی کە لە مناسبەی پێشو وەرگیراوە بریتیە لە: کارێك کە موافق و ساز گار بێ بۆ کاری ژیران لە ڕوی عادەتەوە، وەك دەووترێ: ئەم لوئلوئە مناسبە بو ئەم لوئلوئە، واتە ئەگەر پێکەوە لە یەك زنجیر دا کۆ بکرێتەوە موافقە بۆ اعادەتی ژیران کە ئەوان کاری وادەکەن، گەورە لەپاڵ گەورەدا دادەنێن و بچوك لەپاڵ بچوکدا، بۆ یە مناسبە سیفەتی حوکمیش کە بەهۆی ئەو سیفەتەوە هاتووە ئەبون موافقە بۆ عادەتی ژیران کەشت لە پاڵ شتی گونجاەدا کۆ دەکەنەوەو دادەنێن.

(٤) هەندێك ووتویانە: مناسیب بریتیە لە: ئەوەیە سودێك بۆ ئادەمیزاد بهێنێ یاخود زیانێکی لێ دوربخاتەوە. دانەر لە کتێبی: (المحصول) دا وتویەتی: ئەم فێلە قسەی ئەوانەیە کە ئەحکامی خوایان بەستووە بە بەرژەوەندی مرۆڤەوە، پێناسەی

{وقال ابو زيد} الدبوسي من الحنفية هو {مالو عرض على العقول لتلقته بالقبول} من حيث التعليل به وهذا مع الاول متقارب بان وقل الحصم فيما هو كذلك لايتلقاه عقلي بالقبول غير قادح[1].

{وَ قيلَ } هو {وصف ظاهر منظبط يحصل عقلا من ترتيب الحكم عليه ما يصلح كونه مقصود اللشارع} في شرعيتة ذلك الحكم {من حصول مصلحة او دفع مفسدة فان كان} الوصف {خفياً او غير منضبط اعتبر ملازمه} الذي هو ظاهر منظبط وهو المظنة} له فيكون هو العلة كالسفر مظنة للمشقة المترتب عليها الترخص في الاصل لكنها لما لم تنظبط لاختلافها بحسب الاشخاص والاحوال والازمان نيط الترخص بمظنتها[2].

یەکەمین قسەی کەسێکە عیلەت بۆ ئەحکامی خوا بەبەرژەوەندی خەڵك ناهێنێتەوە و تەدەغەی دەکا، نەفع بە مانا لە زەتەو زەرەریش بە مانا ئازارە، واتە مناسیب ئەوەیە لەزەت بۆ مرۆڤ بهێنێ یاخود ئێش و ئازاری لێوە دور بخاتەوە .

(١) ئەبو زەیدی دەبۆسی کە یەکێکە لە زانایانی پەیڕەوی ئەبو حەنیفە وتویەتی: مناسیبت بریتیە لە: ئەوەیە ئەگەر بخرێتە بەر دەم هەموو عەقڵی بەقەبوڵ وەری دەگریٚ کە ئەو سیفەتە عیلەتی ئەو حوکمە بیٚ، ئەم پێناسەیە لە گەڵ یەکەمدا زۆر تریکن لە یەکەوە. نەیاریش کە دەڵیٚ لەبارەی شتێکەوە کە هەمو عەقڵەکان قەبوڵیانە : عەقڵ من قەبوڵی نیە وەری ناگریٚ ، ئەم قسە بە هیچ تەعنێك لەو پێناسەیە نادا.

(٢) مناسیب ئەوەیە سیفەتێکی ئاشکراو زبت کراو بیٚ ئەوەی دەست ئەدا کەمبەستی شارع بیٚ کە ئەو حوکمەی کردووە بە ڕێباز لە ڕوی عەقڵەوە پەیدا بیٚ حوکمە کەی بەشوێندا بیٚ کەمەبەستەکەش یا پەیدابونی بەرژەوەندێکە یاخود لابردنی خراپەیێکە .جا ئەگەر هاتو سیفەتەکە ئاشکراو زبت کراو نەبو ئەوکاتە لازمە ئەو سیفەتە تێبینی دەکریٚ، چونکە لازمەکەی ئاشکرا و زبت کراوە، ئەو لازمەش جێی گومانی سیفەتەکەیە کەوابو لازمەکەی عیلەتەکەیە،'وەك سەفەر جیٚ گومانی سەختی و مەینەتیە کەیارمەتی و بارسوکی کردن کە دەکریٚ لەسەر ئەو زەحمەتە یە لە ئەسڵدا، بەڵام کاتیٚ کە زەحمەت و بارگران زبت ناکریٚ، چونکە دەگۆڕیٚ بەگوێرەی تاکەکان و حاڵیان و کاتەکانەوە، گەنجم وپیر، هاوینی و بەهار، ئەویارمەتی و بار سوکیە بەسراوە بەجێی گومانی ئەو زەحمەتەوە .

{وقد يحصل المقصود من شرع الحكم يقيناً او ظنا كالبيع} يحصل المقصود من شرعه وهو الملك يقيناً {والقصاص} يحصل المقصود من شرعه وهو الانزجار عن القتل ظنافان الممتنعين عنه اكثر من المقدمين عليه[1].

{وقد يكون} حصول المقصود من شرع الحكم {محتملا} كاحتمال انتفائه {سواء كحدا الحمر} فان حصول المقصود من شرعه وهو الانزجار عن شربها وانتفاؤه متساؤيان بتساوي المتنعين عن شربها والمقدمين عليه فيما يظهر[2]. {او} يكون {نفيه} اي انتفاء المقصود من نفي الشيء بالبناء للفاعل اي انتفي {ارجح} من حصوله {كنكاح الآيسة للتوالد} الذي هو المقصود من النكاح فان انتفاءه في نكاحها ارجح من حصوله[3]. {والأصَحُّ جواز التعليل بالثالث والرابع} اي بالمقصودالمتساوي الحصول والانتفاء والمقصود المرجوح الحصول نظرا الى حصولهما في الجملة[4].

---

(١) جاری وا هەیە مەبەست لە بە ڕێباز کردنی حوکمەکە بێ گومان دێتە دی یاخود گومان هەیە کە بێتە دی، وەك کڕین و فرۆشتن، ئەوە مەبەستی حەڵاڵبونەکەی بێ گومان دێتە دی کە بەخاوەن بونی ماڵە فرۆ شراوەکەیە یاخود وەك کوشتنەوە لەوانەیە ئەو مەبەستەی ئەوێ بۆ حەلاڵی کراوە بێتەدی ، کەترسانە لەکوشتن گومان دەبرێ ئەمە بێتەدی، چونکە ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە کوشتن زۆر ترن لەوانەی کە دەی کەن.

(٢) جاری واش هەیە مەبەستی بە ڕێباز کردنی ئەو حوکمە هەڵدە گرێ بێتە دی یانە یێتە دی، چون یەکو یەکسانی، وەك حەدوو تۆڵەی عەرەق خواردنەوە، چونکە مبەست لە بەڕێباز کردنی ئەو تۆڵەیە واز هێنانە لە خواردنەوەی بێتە دی، هاتنە دی و نەهاتنە دی ئەو مەبەستە یەکسانن، چونکە ئەوانەی نای خۆنەوەو ئەوانەی دەخۆنەوە بەئەندازەی یەکن وەك شتێ کە دیار بێ.

(٣) یاخود نەبونی بەدی هاتنی مەبەستەکە پەسند تر بێ لەوە دەست کەوتنی (نفي الشيء اي انتفي) وەك مارە کردنی ئافرەتێکی بێ ئومێد لەسك کردن بەهۆی تەمەنی زۆرەوە، بۆ ئەوەی مارە بکات کەسك وزا بکا واتە ئەوە مەبەست بێ لەمارە بڕینەکەی، ئەمە مەبەستەکەی تێدا بفەوتێ پەسەند ترو زۆرترە تا بەدیهاتنی ئەو مەبەستە.

(٤) قەولیاسح ئەوەی لەدروستە عیلەتهێنانەوە بەقەول سێهەم کەئەوەیە مەبەستە یەکسانە هاتنە دی و فەوتانی، وە بەقەولی چوارەمیش کە ئەوەیە مەبەستەکە هاتنە بونەکەی مەرجوحە چونکە سەیری ئەوە دەکرێ جار جارێك ئەم دووانەش دەبن .

{كجواز القصر لمترفه} في سفره المنتفى فيه المشقة التي هي حكمة الترخص نظراً الى حصولها في الجملة وَ قيلَ لا يَجوزُ التعليل بهما لان الثالث مشكوك الحصول والرابع مرجوحه أما الاول والثاني فيَجوزُ التعليل بهما قطعاً[1].

{فان كان} المقصود من شرع الحكم {فائتا قطعا} في بعض الصور التعليل بهما قطعا {فان كان} المقصود من شرع الحكم {فائتا قطعا} في بعض الصور {فقالت الحنفية يعتبر} المقصود فيه حتى يثبت فيه الحكم وما يترتب عليه كما سيظهر {والأصَحُّ لا يعتبر} للقطع بانتفائه[2]. {سواء} في الاعتبار وعدمه {ما} اي الحكم الذي {لا تعبد فيه كلحوق نسب المشرقي بالمغربية} عند الحنفية فانهم قالوا من تزوج بالمشرق امراة بالمغرب فأتت بولد يلحقه فالمقصود من التزوج وهو حصول النطفة في الرحم ليحصل العلوق فليحق النسب فائت قطعا في هذه الصورة للقطع عادة بعدم تلاقي الزوجين[3].

---

(١) وەك ئەوەی دروستە دەوڵەمەند نوێژ كورت بكاتەوە لەسەفرێكدا كە هیچ جۆرە سەختی و نارەحەتێكی تێدا نەبێنن، كە هەر زەحمەتیشە عیلەتی ڕوخسەتو بار سوك كردنی مسافر، چونكە سەیری ئەوە دەكرێ كەمجاریش ئەو زەحمەتە هەر دەبێ. هەندێك ووتویانە دروست نیە عیلەت هێنانەوە بەو دوقەولە، چونكە قەولی سێهەم پەیدا بونەكەی گومانی تێدایە، چوارمەیش پەیدا بونەكەی مەرجوحە، بەلاّم قەولی یەكەم و دوەهەم بێ گومان دروستە بكرێنە عیلەتو هۆكاری حوكمەكە.

(٢) جا ئەگەر ئەو مەبەستەی كە شەرع لەبەر ئەو حوكمی دیاری كردووە بێ گومان فەوتابوو لە هەندێ نمنەو دیمەندا، ئەوە زانایانی پەیڕەوی حەنەفی ووتویانە: ئەو مەبەستەی تێدا هەر إعبتار دەكرێ بۆ ئەوەی حوكمەكەی تێدا سابت ببێ و لەسەری دروست ببێ، وەك لەمەو دووا دەردەكەوێ، قەولی أسح ئەوەیە اعتبار بەو مەبەستە ناكرێ چونكە بێ گومان ئەو مەبەستە فەوتاوە.

(٣) ئەو حوكمەی كە تعبدی تێدا نیە واتە لەوانەیە عیلەتی بزانی یانەزانی هەر دەبێ بیكەی یەكسانە لە اعتبار پێ كردنی بەلای حەنەفیەكانەوە، وە اعتبار پێ نەكردنی بەلای غەیری حەنەفیەكانەوە، وەك لكاندنی نەسەب و ڕەچەڵەكی منداڵێك بەپیاوێك كە لە ڕۆژهەڵات نیشتە جێ بێ و ژنەكەی لەڕۆژئاوا دابێ بەلای زانایانی پەیڕەوی حەفنەفیەوە، ئەوان ووتویانە: كەسێك خۆی لە ڕۆژهەڵات بێ ژنێك لە ڕۆژ ئاوابێ مارەی بكات و منداڵێكی هەبێ ئەو منداڵە هی ئەو پیاوەیە،چونكە مەبەست لە ژن مارە كردن نوتف خستنە ناو منداڵدانی ژنەوەیە بۆ ئەوەی منداڵ پەیدا ببێ

وقد اعتبره الحنفية فيها لوجود مظنته وهي للتزوج حتى يثبت اللحوق وغيرهم - يعتبره وقال لا عبرة بمظنته مع القطع بانتفائه فلا لحوق[1].

{وما} اي والحكم الذي {فيه تعبد كاستبراء جارية اشتراها بائعها} لرجل منه {في المجلس} اي مجلس البيع فالمقوصد من استبراء الجارية المشتراة من رجل وهو معرفة براءة رحمهامنه المسبوقة بالجهل بها فائت قطعا في هذه الصورة لانتفاء الجهل فيها قطعا وقد اعبر الحنفية فيها تقديرا حتى يثبت فيها الاستبراء وغيرهم - يعتبره وقال بالاستبراء فيها تعبداً كما في المشتراة في امراة لان الاستبراء فيه نوع تعبد كما علم في محله بخلاف لحوق النسب[2].

---

ئەمجا ئەسەبورە چەڵەکی ئەو منداڵە دەدرێتە پاڵ خاوەنی نوتفەکە، بێ گومان ئەم مەبەستە لەم نمونەدا فەوتاوە، چونکە بێ گومان بە گوێرەی عادەت ئەم ژن و مێرد بەیەك ناگەن، چونکە هەر یەك لەمسەرو لەو سەری دونیاوەیە.

(١) بەڵام زانایانی پەیڕەوی حەنەفی لەم نمونەدا اعتباریان پێ کردووە. چونکە جێ گومانی مەبەستە کە هەیە، کە بریتە لەمارە بڕینەکە، لەبەر ئەوە پاشکۆ بونی منداڵەکە سابت دەبێ چونکە نکاح بەلایانەوە بریتیە لە عەقدوگرێ بەستەکە، نەك لە گواستنەوە وطأکە جاکە لەزانایانی حەنەفی کەسی اعتباری پێ نەکردووە، غەیری ئەوان ووتویانە: هیچ جۆرە اعتبارێك بەجێ گومانی بونی مەبەستەکەنیە، کە مارە بڕینەکەیە، لەگەڵ ئەوەش بێ گومان مەبەستەکە فەوتاوە، کەبەیەك گەیشتنە کە، لە بەر ئەوە ئەو منداڵە نابێتە پاشۆی ئەو پیاوە، بەڵکو بە منداڵی زینا حسێب دەکرێ.

(٢) قەولی اسح هەر ئەوەیە اعبتار بەو منەبەستە فەوتاوە ناکرێ لە حوکمێکیشدا کە تعبدی تێدا بێ، وەك خواستنی پاکی منداڵدانی کە نیزکێك بەهۆی عیدەوە کە فرۆشەرەکەی هەر لە خودی کۆڕی فرشتنیدا بیکرێتەوە بۆ یەکێکی تر، مەبەست لە داخوازی پاکی منداڵدانی ئەو کەنیزەکە کراوە لە پیاوێك بریتیە لەوەی بزانێ منداڵدانی پاك و خاڵیە لە بێچو و کە نەزانی سەبقەت کراوە بەو بەرائەتە، ئائەم مەبەستە بێ گومان فەوتاوە لەم نمونەدا، چونکە نەزانین لەم نمونەدا بێ گومان فەوتاوە، چونکە هەر لە کۆڕەکەدا فرۆشراوەتەوە، زانایانی حەنەفی ئەو مەبەستەیان اعتبار کردووە لەم نمونەدا بەتەقدیری هەتا سابت دەبێ منداڵدانی خاڵیە، جگە لەزانایانی حەنەفی اعتباریان بەو مەبەستە نەکردووە، ووتویانە: لەبەر تعبدی داوای عیدە گرتنی دەکرێن، وەك چۆن ئەگەر هەر لەئافرەتێك کرابێ هەر دەبێ عیدە بگرێ.

{والمناسب} من حيثُ شرع الحكم له اقسام {ضروري فحاجي فتحسيني} عطفهما بافاء ليفيد ان كلا منهما دون ما قبله في الرتبة[1].

{والضروري} وهو ماتصل الحاجة إليه الى حد الضرورة {كحفظ الدين} المشروع له قتل الكفار وعقوبة الداعين الى البدع {فالنفس} اي حفظها المشروع له القصاص {فالعقل} اي حفظه المشروع له حد السكر {فالنسب} اي حفظه المشروع له حد الزنا {فالمال} اي حفظه المشروع له حد السرقة وحد قطع الطريق {والعرض} اي حفظه المشروع له حد القذف وهذا زاده المصنِّف كالطوفي وعطفه بالواو اشارة الى انه في رتبة المال وعطف كلا من الأربعة قبله بافاء لافادة انه دون ماقبله في الرتبة[2].

---

چونکە داخوازی خاڵیبوونی منداڵدانی جۆرە بەندایەتی و تعبدێکە، وەك لە جێی خۆیدا زانراوە، بەڵام منداڵ دانە پاڵ باوك وانیە تعبدی نیە.

(١) مناسب لەو ڕووە کە حوکمی لێوە دروست دەبێ چەند بەشێکی هەیە لانەك ئەڕوی خۆدی مناسبەوە، یەکەم ضروریْ، ئەمجا دوهەم حاجی، سێهەم ئەمجا تحسینی، دانەر ئەم دووانەی بە ڤ عەتف کردووە، بۆ ئەوەی ئەوە بگەڕێنێ هەریەکێ لەو دووانە پلەی لە پێشی خۆی نزمترە.

(٢) ضروری ئەوەیە پێویست پێی بگاتە سنوری ضروور و هەموو کەس پێموحتاج بێ، وەك پاراستنی ئاین، کە دروستە لەبەر پاراستنی ئاین جەنگ لە گەڵ بێ باوەڕاندا و تۆڵەی ئەوانەش بدرێ بانگەوازی خەڵك ئەکەن بۆ بیسرعەو ئەوەی دژ بە قورئان و فەرمودەو ڕێبازی گشتی ئیسلام حوکمەکە جەنگە لەگەڵ کافران، عیلەت بێ باوەریە و بانگەوازە بۆی، حیکمەت پاراستنی ئایینە ئەمجا دوای ئاین پاراستنی گیان و سەری ئادەمیزادە کە بۆ پاراستنی ڕێبازی کوشتنەوە دانراوە، ئەمجا دوای کراوە ئەمجا پاراستنی عەقڵ و ژیریی کە بۆ پاراستنی تۆڵەیەکی سنور بۆدانراوی بۆ دیاریکراوە ئەمجا پاراستنی ڕەچەڵەك و خزمایەتی کە بۆ پاراستنی تۆڵەێکی سنور بۆ دانراوی بۆ دیاری کراوە ئەمجا پاراستنی ماڵ و سامانە کە تۆڵەی سنورداری بۆ دیاری کراوە بۆ دزو بۆ ڕێگر پاراستنی ناموسیش کە تۆڵەی سنور داری قەزف بۆ دیاری کراوە کە بوختانە دانەر وەك زانای بەناو بانگی طوفی ئەم پاراستنی ناموسەی زیاد کردووە بەواویش عەتفی کردووە ئەمازەیە بۆ ئەوە ناموسی پاراستنی لە پلەی پاراستنی ساماندایە ئەو چوارەکەی تری پێش بەڤ عەتف کردووەتەوە، بۆ ئەوەی ئەوە بگەێنێ ئەوەیە لەدوای فێکەوە نزمترە لەوەی پێش لەپلەی پاراستندا.

{ويلحق بـه} اي بالضروري فيكون في رتبته {مكمله كـقليل المسكر} فـإن قليله يدعو الى كثيره المفوت لحفظ العقل فبولغ في حفظه بالمنع من القليل والحد عليه كالكثير[1].

{والحاجي} وهو مايحتاج إليه ولا يصل الى حد الضرورة {كالبيع فالاجارة} المشروعين للملك المحتاج إليه ولا يفوت بفواته لو لم يشرعا شيء من الضروريات السابقة وعطف الاجارة بالفاء لان الحاجة اليها دون الحاجة الى البيع[2] {وقد يكون الحاجي في الاصل {ضرورياً} في بعض الصور {كالاجارة لتربية الطفل} فـإن ملك المنفعة فيها وهي تربيته يفوت بفواته لو لم تشرع الاجارة حفظ نفس الطفل {ومكمله} اي الحاجي {كخيار البيع} المشروع للتروي كمُل به البيع ليسلمعن الغبن[4]

(١) دەكرێتە پاشكۆی ضروری ئەوەی کە تەواو کەری ضروریە، ئەمجا ئەمیش لە پلەی ئەودا دەبێ، وەك تۆڵەی کەمێك لەمادەی سەرخۆشکەر بۆیە تۆڵە ئەدرێ لەسەر کەمێك چونکە سەر دەکێشێ بۆ زۆر بونی کە هۆی فەوتاندنی پاراستنی عەقڵە، لەبەر ئەوە ئەو پەڕی هەوڵدراوە بۆ پاراستنی بەهۆی ڕێگرتنی لە کەمێکی و تۆڵە دانان لەسەری وەك بۆ زۆرە کەی دیاری کراوە.

(٢) مناسبی حاجیش ئەوەیە پێویستی هەبێ پێ بەلاّم پێویستیەکەی نەگاتە پلەی مەجبوری، وەك کڕین و فرۆشتن ئەمجا بەکرێ دان، کە هەر دوکیان دانراون بەرێبان بۆ ئەوەی خەڵك خاوەنی شت بێ، پێویستی پێ هەیە، ئەگەر ئەم دوانەش نەبوایە یەکێك لە پێنج ضروریەکەی پێشەوە نەدەفەوتان بە هۆی نەبونی و فەوتانانی ئالو گۆڕو کرێدانەوە. دانەر عەتفی اجارەی بەفێ کردەوە بۆ سەر بەبیع چونکە پێویستیمان کەمترە بۆ بەکرێدان تابە کڕین و فرۆشتن.

(٣) جاری واهەیە مناسبی حاجی واهەیە لە ئەسڵدا حاجیە بەلاّم هەندێ جار دەبێـە خروی لە هەندێ نمونەدا، وەك بەکرێگرتنێك بۆ پەروەردە کردنی منداڵێك. ئەمە کە تۆ دەبێتە خاوەنی قازانجی ئەو بەکرێ گیراوە کە بریتیە لە پەروەردەکردنی منداڵ کە پاراستنی گیانی ئەو منداڵە دەفەوتا ئەگەر تۆنە بیتە خاوەنی ئەو مەنفەعەتە، ئەوەش بەوە بو بەکرێدان نەکرایە ڕێبازو حەلاڵ نەبوایە

(٤) تەواوکەری‌حاجیش وەك:دیاری کردنی ماوەی هەبونی پەشیمانی لەسەر کرێ بەستی کڕین و فرۆشتن، بۆیە دانراوە تا باش بیری لێ بکاتەوە، بەهۆی بونی ماوەی پەشیمانیەوە کڕین و فرۆشتنە کەتەواو شەرعی‌دەبێ و بەدڵی هەردولا دەبێ. دوردەبێ لەزیان .

{والتحسيني} وهو ما استحسن عادة من غير إحتياج إليهِ قسمان {غير معارض لقواعد كسلب العبد اهلية الشهادة} فإنَّهُ غير محتاج إليهِ اذ لو اثبتت له الأهلية ماضر لكنه مستحسن في العادة لنقص الرقيق عن هذا المنصب الشريف الملزم بخلاف الرواية[1]. {والمعارض كالكتابة} فانها غير محتاج اليها اذ لو منعت ماضر لكنها مستحسنة في العادة للتوسل بها الى فك الرقبة من الرق وهي حارمة لقاعدة امتناع بيع الشخص بعض ماله ببعض آخر ادما يحصله المكاتب في قوة ملك السيد له بأن يعجز نفسه[2]. {ثُمَّ المناسب} من حيثُ اعتباره اقسام لانه {ان اعتبر بنص او اجماع عين الوصف في عن الحكم فالمؤثر} لظهور تاثيره بما اعتبر به[3].

---

(١) مناسبی تەحسینیش ئەوەیە بەگوێرەی عادەت بەجوان حسێب بكرێ لەگەڵ ئەوەش خەڵك پێویستی پێ نەبێ، ئەمە دوبەشە: ١-ئەوەیە دژ و پێچەوانەی بنچینە بنەڕەتیەكانی شەرع نەبێ، وە سەندنەوەی ئەركی گەواهیدان لە بەندە، ئەو ێ سەندنەوە خەڵك پێویستی پێ نیە، چونكە ئەگەر ئیسپاتی بەئەهل بوونی گەواهیدانی بۆ بكرێ هیچ زیانێكی نەدەبوو، بەلام بەگوێرەی عادەت واجوانە گەواهی نەدات، چونكە ئەم پلە بەرزە بەندەی پێناگا، چونكە شت لەسەر خەڵك واجب دەكا، بەلام ڕیوایەت كردن وانیە، شت واجب ناكات.

(٢) ٢- ئەوەیە دژ و پێچەوانەی بنەماكانی شەرع بێ، وەك كیتابەت لەگەڵ بەندەكەیدا، ئەو كیتابەتە خەڵك پێویستی پێنیە، چونكە ئەگەر قەدەغە بكرێ هیچ زیانێك بەخەڵك ناگەیەنێ، بەلام بە گوێرەی عادەت كیتابەت جوانە، لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی كردنەوەی پەتی بەندایەتی لەملی بەندەكاندا، بەلام ئەو كیتابەتە دەبێتە پوچەڵ كەرەوەی یاسا و ڕێسای ئەوەی یەك كەی خۆی نابێ هەندێ لە سامانەكەی بفرۆشێ و ئاڵ و گۆڕی پێبكا بەهەندێكیتر لەسامانی، چونكە ئەوەی كیتابەت لەگەڵ كراوەكە پەیدای دەكا لە حوكمی سامانی ئاغەكە یدایە ئەگەر خۆی ووتی: تووانای دانی ئەم قیستانەم نیە، ئەو بەشانەی لەمەو پێش داونی هەموویان دەبنەوە ماڵی ئاغاكە وەك خۆی دەبێتەوە موڵكی.

(٣) پاشان سیفەتێكی كە مناسب بێ و بكرێتە عیلەت لە ڕۆی اعتبار یەوە چەند بەشێكە، نەك لە ڕوی حوكمیەوە كەڕابورد بەڵكو لەڕوی ئەرزشو بەهای خودی خۆیەوە، چونكە ئەگەر خودی سیفەتەكە لە جۆری حوكمەكەدایە بەهۆی دەقەوە یاخود اجماعەوە اعتباری پێ بكرێ ئەوە ئەو سیفەتە مناسبە ناو دەبرێ بە مؤثر، چونكە جێ دەست و شوێنەواری لە حوكمەكەدا دیارە و ئاشكرایە، ئەو دەركەوتنەش

**مثال الاعتبار بالنص تعليل نقض الوضوء بمس الذكر فإنَّهُ مستفاد من حديث الترمذي وغيره من مس ذكره فليتوضأ ومثال الاعتبار بالاجماع تعليل ولاية المال على الصغير بالصغر فإنَّهُ مجمع عليه[1].**

**{وان لم يعتبر} عين الوصف في عين الحكم {بهما} اي بالنصص والاجماع {بل اعتبر {بترتيب الحكم على وقفه} اي الوصف حيثُ ثبت الحكم معه {ولو} كان الاعتبار بالترتيب {باعتبار جنسه في جنسه} اي جنس الوصف في جنس الحكم بنص او اجماع كما يكون باعتبار عينه في جنسه او العكس كذلك الاولى من الذمذكور كما اشار إليهِ بلو {فالملائم} لملاءمته للحكم فاقسامه ثلاثة[2].**

---

بەهۆی ئەوەوە دەبیٚ کە إعتباری پیٚ کردووە، کە دەقەکەیە یاخود اجماعەکەیە.

(١) نمونەی اعتبارو ئەرزشێك بەهۆی دەقەوە بیٚ، وەك عیلەت هێنانەوە بۆ شکاندنی دەست نوێژ بەبەری دەستدان بەعەورەتەوە، ئەم عیلەت هێنانەوە وەرگیراوە لەو فەرمودەیە ترمزی و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە و دەفەرمویٚ: کەسیٚ بەری دەستی بدا بەعەورەتیەوە ئەوە دەبیٚ دەست نوێژ بگرێتەوە، حوکمەکە (فليتوضأ) زا، سیفەتە مناسبەکە من مس ذکرە، نمونەی ئەوەش اجماعی ئەرزش واعتباری پیٚ دابیٚ عیلەتهێنانەوەیە بۆ دەست گرتن بەسەر ماڵی منداڵدا بەهۆی بوکیەوە، چونکە ئەو عیلەتە شتێکە ڕای هەموانی لەسەر کۆبوەتەوە.

(٢) ئەگەر عەینی سیفەتەکە لە عەینی حوکمەکەدا بەهۆی دەق و اجماعەوە اعتبار و ئەرز شیان پیٚ نەدرابو، بەڵکو عەینی سیفەتەکە هۆی پەیدابونی حوکمەکە لەسەر تبقی سیفەتەکە اعتبارو ئەرزش پیٚ درابو، واتە لە هەر جیٚ سیفەتەکە پەید بوو حوکمەکەش اتفاقا لەگەڵ ئەودا پەیدا دەبیٚ، ئەوە ئەو سیفەتە مناسب پیٚ دەوترێ: ملائم، چونکە گونجاوە بۆ حوکمەکە، هەرچەند ئەو ئەرزشەی بەهۆی تەرتیبی حوکمەکە لەسەر وفقی سیفەتەکە بۆ وە بەهۆی اعتبارو بەهای ڕەگەزی سیفەتەکە لەناو ڕەگەزی حوکمەکەدابیٚ، ئەو اعتبارو ئەرزش بە بەهۆی : ١-دەقەوەیا خود اجماعەوە. ٢-وەك چۆن دەبیٚ بەهۆی ئەرزش عەینی سیفەتەکەوە لەڕەگەزی حوکمەکەدا. ٣-یاخود بە پێچەوانەوە، واتە ڕەگەزی سیفەتەکە لە عەینی حوکمەکەدا ئەم دوانەیان باشتر و نزیکترن لەویەکەمەیان کە لەمەتنەکەدا باس کراوە، وەك چۆن دانەر بەوشەی: (لو) ئامارژەی پیٚ کرد، بە کورتی دەبێتە سیٚ بەشەوە.

مثال الأول أي اعتبار العين في العين بالترتيب وقد اعتبر العين في الجنس تعليل ولاية النكاح بالصغر حيثُ تثبت معه وان اختلف في انها له او لبكارة او لهما وقد اعتبر في جنس الولاية حيثُ اعتبر في ولاية الملل بالاجماع كما تقدَّمَ[1].

ومثال الثاني اي اعتبار العين في العين وقد اعتبر الجنس في العين تعليل جواز الجمع في الحضر حالة المطر على القول به بالحرج وقد اعتبر جنسه في الجواز في السفر بالاجماع[2]. ومثال الثالث أي اعتبار العين في العين وقد اعتر الجنس في الجنس تعليل القصاص في القتل بمثقل بالقتل العمد العدوان حيثُ ثبت معه وقد اعتبر جنسه في جنس القصاص حيثُ اعتبر في القتل بمحدد بالاجماع[3].

(١) نمونە بۆ یەکەم واتە اعتباری عەینی سیفەتەکە لە عەینی حوکمەکە دا بە تەرتیب، اعتباری عەینی سیفەتەکە لە ڕەگەزەکدا بێ، وەك عیلە تهێنانەوە بۆ دەسەلاتی باوك بۆ انکاح کردنی منداڵ ئەمە عەینی حوکمەکەیە بەهۆی بچوکی منداڵەکەوە، چونکە لە هەردجێ منداڵێ هەبێ دەسەلاتی باوك هەیە، هەر چەند جیاوازی هەیە لەناوازانیاندا کە هۆی ئەو دەسەلاتە چیە؟ هەندێ دەڵێن: لەبەر بچوکی، یاخود لەبەر کچیەتیە، یاخود لە بەر هەردوکیانە، ئەو بچوکیشیە لە ڕەگەزی دەسەلاتدا اعتباری پێ کراوە، چونکە بە اجماع لەدەسەلاتی بەسەر ماڵی منداڵد اعتبار کراوە، وەك لە پێشەوە ڕابورد .

(٢) نمونە بۆ دووەمیش واتە اعتباری عەین سیفەتەکە لە عەینی حوکمەکەدا وە بەدەق یابە اجماع اعتباری ڕەگەزی سیفەتتەکە لە عەینی حوکمەکەدا کرابێ، وەك عیلەتهێنانەوە بۆ ئەوەی ڕەگەزی سیفەتەکە لە عەینی حوکمەکەدا کرابێ، وەك عیلەتهێنانەوە بۆ ئەوەی دروستە نوێژەکان کۆ بکرێنەوە لەکاتی نیشتە جێبوندا لە حاڵی باو بۆراندا لەسەر قەولی ئەوانەی ئەمەیان بەڕەوا زانیوە، عیلەت و سیفەتەکە بریتیە لەحەرەج و تەنگەتاوی، جینسو ڕەگەزی ئەو حەرەج و گرانیە اعتبارو ئەرزشی هەیە بۆ دروستی کۆکردنەوەی نوێژەکان لەسەفەردا، بە ڕای هەموان و اجماعی پێشەوایان.

(٣) نمونە بۆ سێهەمیش: واتە إعتباری عەینی سیفەتەکە لەعەینی حوکمەکەدا، چونکە إعتباری ڕەگەزی صیفەتەکە لەرشەگەزی حوکمەکەدا إعتبارکراوە بەهۆی دەقەوە یا بەهۆی اجماعەوە، وەك عیلەتهێنانەوە بۆ کوشتنەوەی کەسێ بە تێلا یەکێکی کوشتبێ چونکە کوشتنەو نیازیش کراوەو دەستدرێژیشە، چونکە لە هەر جێیك کوشتنەوە بێ دەبێ کوشتن و نیازو دەست درێژی لەگەڵدا بێ، چونکە ڕەگەزی

{وان لم يعتبر} اي المناسب {فان دل الدليل على الغائه فلا يعلل به} كما في مواقعه الملك فان حاله يناسب التكفير ابتداء بالصوم ليرندع به دون الاعتاق اذ يسهل عليه بذل المال في شهوة الفرج وقد افتى يحيى بن يحيى المغربي ملكا جامع في نهار رمضان بصوم شهرين متتابعين نظرا الى ذلك لكن الشارع الغاه بايجابه الاعتاق ابتداء من غير تفرقة بين ملك وغيره ويسمى هذا القسم باغريب لبعده عن الاعتبار[1]. {والا} اي وان لم يدل الدليل على الغائه كما لم يدل على اعتباره {فهو المرسل} لارساله اي اطلاقه عما يدل على اعتباره أو الغائه ويعبر عنه بالمصالح المسرلة وبالاستصلاح[2].

---

کوشتنی لە ڕەگەزی کوشتنەوە دا اعتبار کراوە، چونکە اعتباری ڕەگەزی کوشتن کراوە لە کوشتنەوەی کەسێکدا کە کەسێکی بەخەنجەر کوشتبێ، ئەمەش بە اجماع اعتبار کراوە.

(١) ئەگەر سیفەتە مناسبە کە ئەرزش و اعتبارێکی نەبون بەدەق و اجماع وەنەبە تەرتیبی حوکمەکە، جا ئەگەر بەڵگەیێک دەلالەت ی کرد لەسەر پوچەڵ بوونەوەی ئەو صیفەتە مناسبە ئەوە ئیتر ناکرێتە عیلەت، چونکە شارع پوچەڵو وەلای مستووە. وەك لە جیماع کردنی پاشاییکدا لەگەڵ خێزانەکەیدا لە ڕۆژی ڕەمەزاندا دەر ئەکەوێ چونکە حاڵێ پاشا مناسب و گونجاوی ئەوە سەرەتا کە فارەتەکەی بەڕۆژو دەست پێ بکا بۆ ئەوەی بەو ڕۆژوە بگەڕێتەوە جارێکیتر نەیکا، نەك بەبەندە ئازادکردن دەست پێبکا، چونکە ئاسانە لەسەر پاشا خەرجکردنی ماڵ و سامان لەپێناو ئارەزواتی جوتبوندا، (ابن يحي المغربي) فتوای دابوو بۆ پاشایێك کە لە ڕۆژی ڕەمەزاندا جیماعی کردبوو دوومانگی یەك لەدوای یەك ڕۆژوو بگرێ، بۆیە بەم شێوەیە ئەم فتوایەی دابوو چونکە سەیری ئەم حاڵەی پاشای کردبو، بەلام شارع ئەو حاڵە مناسبەیە پوچەڵ کردوەوە و سەرەتا ئازاد کردنی بەندەی واجب کرد بێ ئەوەی جیاوازی بخرێتە نێوان پاشا و غەیری پاشا ئەم بەشەیە ناو دەبرێ بە مناسبی غەریب، چونکە زۆر دورە إعتباری پێ بکرێ.

(٢) بەلام ئەگەر بەڵگە یێك دەلالەت نەئەکرد لە سەر پوچەڵ بونەوەی سیفەتە مناسبەکە وەك چۆن بەڵگەش نیە دەلالەتی کردبێ لەسەر ئەرزش و اعتبار پێ کردنی. ئا ئەو سیفەتە مناسبە پێ دەووترێ مرسل و بەرەلاو ئازاد کراو، ڕون کراوەتەوە لەوەی دەلالەت لەسەر اعتباری یاخود پوچەڵ بونەوەی بکات، ئەم سیفەتە مرسلە ناویش دەبرێ و پێش دەووترێ المسالح المرسله، بەرژەوەندە بەرەلاو بێ کۆتەکان. یاخو بە: الإستصلاح، چاکساز خواز

{وقد قبله} الامام {مالك مطلقا} رعاية للمصلحة حتى جوز ضربَ المتهم بالسرقة ـقر وعورض بانه قد يكون بريئا وترك الضرب لمذنب اهون من ضرب تريء {وكاد مام الحرمين يوافقه مع مناداته عليه بالنكير} اي قرب من موافقه ولم يوافقه[1]. ورده الأكثر} من العلماء {مطلقا} لعدم مايدل على اعتباره {و} رده {وقع في لعبادات} لانه لا نظر فيها للمصلحة بخلاف غيرها كالبيع والحد[2].

{وليس منه مصلحة ضرورية كلية قطعية} لانها مما دل الدليل على اعتبارها فهي حق قطعا {واشتراطها الغزالي للقطع بالقول به لا لاصل لاقول به} فجعلها منه مع لقطع بقولها[3].

---

(١) پێشەوا مالك ئەو سیفەتە مناسبەی پێی دەوترێ!(المصالح المرسلة) ئەبولْ کردووە چ لە عیبادەتدا بێ یاخود لە غەیری عیبادەتدا بێ، چونکە تێبینی ـەرژەوەندی خەڵکی کردووە، هەر لەبەر ئەوە بووە بەرەوای زانیوە لێدانی کەسێ. کاری خراپ درابێتە پاڵێ وەك دزی بۆ ئەوەی دانی پێدا بنێ، بەڵام ڕەخنەی ڵ گیراوە کە جاری وا دەبێ ئەو کەسە پاکەو بێ ئاگایە لەو خراپەیە، ێنەدانی گوناهبارێك گوناهەکەی سوکترە لەوەی کەسێکی پاك لێ بدرێ، زۆر نزیکیش بوو (امام الحرمین) هەماهەنگی رای پێشەوا مالك بێ لەگەڵ ئەوەی زۆر ەنگی نارەزایی دژ بە پێشەوا مالك بەرز کردووەتەوە، سەر ئەنجام هەر هام ەنگی‌نەبووە.

(٢) زۆر بەی زۆری زانایان مسالحی مرسلەیان بەرپەرچ داوتەوە چونکە هیچ بەڵگەیێك نیە دەلالەت بکا لەسە ر ئەرزش و اعتباری، بەلاك گەلێکی تر تەنها لەعبادات دا قەبۆیان نەکردوەو بەرپارچیان داوەتەوە، چونکە عیبادەت و بەندایەتی سەیری بەرژەوەندی تێد ناکرێ، هەرچاو لە پێغەمبەر کردنە، بەلام غەیری عیبادەت وانیە، وەك کرین وفرۆشتن و دیاری کردنی ستوری تۆڵە.

(٣) سیفەتە مناسبێك کە بەرژەوەندێیکی زەروری بێ کلیێکی قەطعی و بێ گومانیش بێ ئەوە سەر بە بەشی مرسل نیە، چونکە ئەمە بەڵگەیێك دەلالەت لەسەر ئەرزش و اعتباری کردووە، کەوابێ ئەو بەرژەوەندیە حەقەو بێ گومان ڕاستە غەزالی بەمەرجێ گرتووە بۆ ئەوەی بێ گومان بووترێ ئەمە سەر بەبەشی مرسلە، نەك هەر بۆ ئەوەی بووترێ مرسلە، لەبەر ئەوە غەزالی ئەم بەرژەوەندیە زروریەی کردووتە بەشێك لە مرسل لەگەڵ ئەوەش بێ گومان بەرژەوەندی زروری قبولْ بووە.

{قال والظن القريب من القطع كالقطع} فيها مثالها رمي الكفار المترسح بأسرى المسلمين في الحرب المؤدي الى قتل الترس معهم اذا قطع او ظن ظنا قريبا مـ القطع بانهم ان لم يرموا استأصلوا المسلمين بالقتل الترس وغيره وبأنهم ان رمو سلم غير الترس فيَجوزُ رميهم لحفظ باقي الامة[1]، بخلاف رمي اهل قلعة تترسو بمسلمين فان فتحها ليس ضروريا ورمي بعض المسلمين من السفينة في البحر لنجة الباقين فان نجاتهم ليس كليا اي متعلقا بكل امة ورمي المترسين في الحرب د لم يقطع أو لم يظن ظنا قريبا من القطع باستئصالهم السلمين فلا يجوز الرمي في هـ الصور الثلاث[2]، وان اقرع في الثانية لان القرعة لا أصل لها في الشرع في ذلك[3].

(١) غەزالی ووتویەتی: گومانێك زۆر نزدێك بێ لە بێ گومانیە وە، لە قەبوڵ کردن کار پێ کردندا وەك بەرژەوەندی زروری بێ گومان وایە، نمونەی بەرژەوەندی زرور وەك: بێ باوەڕان لە جەنگدا کۆمەڵەی دیلێکی موسوڵمانیان کردووە قەڵغانی خۆیـ تەقەی لە موسڵمانان لێ یان، سەر ئەنجام دەبێتە هۆی کوشتنی ئەو موسڵمان لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا، کاتێ کە بێ گومان یاخود گومان ببڕێ بەگومانێك نزیك بێ بێ گومانیەوە کە: ئەو بێ باوەڕانە ئەگەر تەقەیان لێ نەکرێ موسڵمانان بن بڕدەکەن هەمویان دەکوژن ئەوانەش کراون بە قەڵغان و غەیری ئەوانیش، وە ئەگەر تەقەی لێبکرێ تەقە لە و موسڵمانانەی کراون بە قەڵغان ئەوانی کەهەموو یان ڕزگاریان دەبی ئەوە دروستە تەقەیان لێ بکرێ، چونکە بەقای ئومەت دەپارێزرێ .

(٢) بەلام ئەم سێ نمونە وانیە ، دروست نیە تەقە کردن لەدانیشتوانی قەلایـ موسڵمانیان کردووەتە قەڵغانی خۆیان، چونکە گرتنی ئەو قەلایە زەروری نیـە توڕدانی هەندێ موسڵمان بەسەر پاپۆڕێکەوە بۆ ناو دەریا لەبەر ڕزگار بونـ سەرنشینەکانیتر، چونکە ڕزگار بونی ئەو دەستە موسڵمانە پەیوەند نیە بە هەمو ئۆمەتەوە، تەقە کردن لەو کافرانەی بە موسڵمانان قەڵغانیان دروست کردووە لـ جەنگدا، کاتێ دروست نیە ڕای گومان برنەبێ، یا خود گومانێکی وانەبرێ نزیك بێ بێ گومانیەوە کە ئەو نەکافرانە موسڵمانان بن بڕ دەکەن، تەقە کردن و توڕدان لەم سێ نمونەدا دروست نیە.

(٣) با بۆ نمونەی دوهەمیش قورعە و پشك بخرێ، چونکە قورعە کردن لەم جۆرەکارانەدا لەشەرعدا ئەصڵی نیە، قورعە هنها بۆ دابەش کردنی ماف و سامانە نەك بۆ کوشتنی هەندێ و هێشتوەی هەندێکی تر.

{مسئلة المناسبة تنخرم} اي تبطل {بمفسدة تلزم} الحكم {راجحة} علة مصلحته أو مساوية} لها {خلافاً للامام} الرَّازي في قوله ببقائها مع موافقته على انتفاء الحكم فهو عنده لوجود المانع وعلى الاول لانتفاء المقتضي[1].

{السادس} من مسالك العلة ما يسمى بالشبه كالوصف فيه المعرف بقوله {الشبه منزلة بين المناسب والطرد} اي ذومنزلة بين منزلتيهما فإنَّهُ يشه الطرد من حيثُ انه غير مناسب بالذات ويشبه المناسب بالذات من حيثُ التفات الشرع إليهِ في الجملة كالذكورة والانوثة في القضاء والشهادة قال المصنِّف وقد تكاثر التشاجر في تعريف هذه المنزلة ولم أحد لأحد تعريفا صحيحا فيها[2]. {وقال القاضي} ابو بكر الباقلاني {هو المناسب بالتبع}[3].

---

(١) صیفەتێکی مناسب عیلەتبێ بۆ حوکمێك کەبەرژەوەندی تێدا بێ بەتاڵ و بوچەڵ دەبێتەوە بەهۆی بونی مەفسەدێکە مەفسەدەێکە وەکەلازمی حوکمەکەیە، ئیتر ئەو مەفسەدەیە بەهێز تربێ لە بەرەژەوەندیەکە یاخود یەکسان بێ لەگەڵیا، هەر بەتاڵ دەبێەوە، پێشەوا ڕازی ڕای وانیە چونکە دەڵێ: ئەو سیفەتە مناسبە هەر دەمێنێـەوە لەگەڵ ئەوەش دەنگی هاو دەنگی زانایانی ترە کە حوکمەکەی نەماوە و فەوتاوە، چونکە بەلای ئەمەوە حوکمەکە فوتاوە لەبەر مانعێك بووە، بەلام قەولی یەکەم دەڵێ: داخوازیحوکمەکە نەماوە.

(٢) شەشەم لەو ڕێگایانەی دەمان گەێننن بەعیلەت ئەوەیە ناو دەبرێ بە شەبەه، شەبەهە وەك ناوە بۆ خودی ڕێگەکە ناویشە بۆ ئەو سیفەتی عیلەتی تێدا لە جا ئەو سیفەتەی بە ماماسە بەهیپێناسە کراوە بەوە کە دەوترێك شەبەهە پلەێکە لە نێوان دوپلەی مناسب و تردا، واتە خاوەنی ئەو پلەیە کە کەوتووەتە نێوان ئەو دوپلەوە، چونکە لەتەرد ئەکالەم ڕووە وە کەوادەکراوە هیچ مناسبەتێکی نەماوە، لەمناسبیش دەکا لەورووەوە کەمجارانێك شەرع ئاوڕی بۆ ئە داتەوە[1]، وەك سیفەتی نێرینە بون یاخود مێینە بون لە باسی داوەری و گەواهیدانە دا دانەر دەڵێ: دەمەقاڵێ زۆر بووە لە بارەی پێناسەی ئەم پلەوە، من پێناسەێکی دروستم لەبارەیەوە دەست نەکەوتووە.

(٣) باقلانی ووتویەتی: شەبەه بریتیە لەو سیفەتە مناسبەیەکە بەهۆی خودی خۆیەوە نازانرێ بەڵکو بە هۆی شتی ترەوە دەزانرێ .

---

١- (مناسب بالذات) واتە: مناسبەکە لەخودی صیفەتەکەوە عەقڵ دەرکی پێناکا، بەلام وەصفی مناسب لەخودی صیفەتەوە عەقڵ دەیزانێ

كالطهارة لاشتراط النبية فانها انما تناسبه بواسطة انها عبادة بخلاف المناسب بالذات كلاسكار لحرمة الخمر {ولا يصار اليه} بان يصار الى قياسه {مع امكان قياس العلة} المشتمل على المناسب بالذات {اجماعا[١]} فان تعذرت} اي العلة بتعذر المناسب بالذات بان لم يوجد غير قياس الشبه {فقال الشافعي} ﷺ هو {حجة} نظر لشبه بالمناسب[٢] {وقال} ابوبكر {الصَّيرفي و} ابو اسحق {الشيرازي مردود} نظر لشبهه بالطرد[٣]. {واعلاه} على القول بحجته {قياس غلبة الاشباه في الحكم والصفة} وهو الحاق فرع مردد بين اصلين باخذهما الغالب شبهه به في الحكم والصفة على شبهه بالآخر فيهما مثاله الحاق العبد بالمال في ايجاب القيمة بقتله بالغة ما بلغت لار شبهه بالمل في الحكم والصفة اكثر من شبهه بالحر فيهما[٤].

(١) وەك سیفەتی پاك و خاوێنی و تەهارەت مناسبە بۆ ئەوەی مەرجی نیەتی تێدا هەبێ، پاك و خاوێنی مناسبی ئەو مەرجەیە بەهۆی ئەوەوە كە عبادەتە، بۆ ئەوەی لە عادەت جیا بێتەوە، بەڵام (مناسب بالذات) وانیە، چونكە ئەم هەر بەخودی خۆی دەزانرێ، وەك سەر نۆش كردن بۆ حەرامی عارەف، نابێ و ناگونجێ بڕۆی قیاسی شەبەهـ بكەی لەگەڵ ئەوەش بگونجێ و دەست بدا قیاسی عیلەێی بكرێ كە (مناسب بالذات)ی تێدا هەبێ، چونكە كە مناسبە بالزات هەبێ بالتبع هیچ حسێبێكی بۆ ناكرێ، ئەمەش بەڕای هەموانە.

(٢) جا ئەگەر قیاسی عیلەكە نەدەكرا بەهۆی نەبونی سیفەتی مناسبی بەزاتەوە كە بە خودی خۆی عەقڵ بیزانێ، واتە جگە لە قیاسی شەبەهە شتێكی تر دەست نەكەوێ، ئەوە شافعی ووتویەتی: ئەو قیاسی شەبەهە حوجەو بەڵگەیە، چونكە سەیری ئەوە كراوە كە ئەویش وەك سیفەتی مناسب وایە.

(٣) سەیرەفی و شیرازی ووتویانە: ئەو قیاسی شەبەهە قەبوڵ ناكرێ و بەرپەرچ دەدرێتەوە، چونكە سەیری ئەوە كراوە كە ئەو قیاسی شەبەهە وەك شتێكی مطرد دورخراوەوایە.

(٤) ئەگەر ووترا قیاسی شەبەهـ بەڵگەو حوجەیە ئەوە ئەویش چەند پلەێیكە. بەرزترین پلەیان قیاسی ئەوەیان كە لەزۆرشتاندا لەحوكمو سیفەتەكەدا وەك یەك وان. ئەوەش بریتیە لە: شتێك لە دروشت بكا وەك هەردوكیان وابێ بەلام بە یەكێكیان نەوەزیاتر بشوبهێنیرێ لە حوكمو سیفەتدا هەنا بە ئەویتریانەوە لە حوكم و سیفەتدا، وەك ئەوە بەندێیك ئەگەر بكوژرێ، ئەشوبهێنرێ بەدوشتەوە، یەك بەماڵەوە، دو بەئازادەوە، ئەگەر بە ماڵەوە بێ لە بژاردنی بەهاكەیدا ئیتر هەرچەند

{ثم} القياس {الصوري} كقياس الخيل على البغال والحمير في عدم وجوب الزكاة ـشبه الصوري بينهما[1].

{وقال الامام} الرّازي {المعتبر} في قياس الشبه ليكون صحيحا {حصول المشابهة} ـين الشيئين {لعلة الحكم او مستلزمها} وعبارةته فما يظن كونه علة الحكم او مستلزما لها سواء كان ذلك في الصورة أم في الحكم[2] {السابع} من مسالك لعلة {الدوران وهو ان يوجد الحكم عند وجود وصف وينعدم عند عدمه قيل ؛ يفيد} العلية أصلا لجواز أن يكون الوصف ملازما للعلة لانفسها كراحه المسكر لمخصوصة فانها دائرة معه وجوداً وعدما بأن يصير خلا وليس علة[3].

---

ـەگــاو دەكــا، دووسـەد ووشـتر ياپـەنجا، چونكـە شـيبهە بـەندە بەماڵەوە لـە حوكـم و سيفەتدا زۆترە لەو شبيهەی هەیەتی بەئازادەوە لە حوكم و سیفەتدا .

(١) پاش ئەو بەرزترين قياسە قياس صوريە، واتـە قياسی شـەبەهەكە لە ديمـەندا وەك قياسی ئەسپ بكرێتە سەرئيسترو گوێ درێژ لەنەبونی زەكاتدا، لەبەر ئەوشەبەهـ صوريەی والە نێوانياندا.

(٢) ڕازی ووتويـەتی: ئـەوەی كـە اعتبـار كـراوە لـە قياسـی شـەبەهدا بـۆ ئـەوەی قياسێكی دروست بێ ئەوەيە كە مشابهە لە نێوان ئەو دوشتەدا هەبێ بـۆ عيلـەتی حوكمەكە[1] ياخو بۆ ئەوەی كە لازمی عيلەتی حوكمەكە يە ئيتر لە ديمـەندا وەك يـەك وابن ياخود لە حوكمدا.

(٣) حەوتـەم لـە و ڕێگايانـەی ئـەمان گـەێنن بـە عيلـەت و دۆزينـەوەی دەوەرانـە ئەويش بريتيە لەوەی لە كاتی بونـی سيفەتەكە حوكمەكە هـەبێ و لـەكاتی نـەبونيدا حوكمەكەش نـەبێ، واتـە حوكمەكە بسوڕێتەوە بـە دەوەری سـيفەتەكەدا هـەندێكيش ووتويانـە: دەوەران بەعيلـەتبون ناگەيـەنێن چ بـێ گومـانبێ وە چ گومانـاو بـێ، چونكـە ئەگونجێ سيفەتەكە لازمی عيلەتەكە بێ نەك خودی عيلەتەكە، وەك ئـەو بـۆن و بەرامـە تايبەتيەی مادەی سەرخۆشكەر كە هەڵدەسوڕی لەگەڵيا ئەگەر هەبێ بۆنەكەشـی هەيـە وەئەگـەر نـەبو ئـەويش نيـە، بـەم شـێوە بـبێ بەسـركە، كـاتێ بونەكـە نـەمێنێ، لەگـەڵ ئەوەش ئەو بۆنو بەرامەيە عيلەت نيە.

---

(١) بۆ وێنە ئەگەر ماسيەكمان بينی لەسەر ديمەنی مرۆڤ بو، ئەگەر لە ئاو دەرچێ و نەژێ ئەوە دروستە بخورێ لەبەر عيلەتی حوكمەكەی كە بەحرییە و لەوشكانيدا ناژی، سەيری ديمەنەكەی ناكەين.

{وَ قِيلَ } هـو {قطعي} في افادة العلية وكان قائل ذلك قاله عند مناسبة الوصف كالاسكار لحرمة الخمر[١] .

{والمختار وفاقا للاكثر} انه {ظني} لا قطعي لقيام الاحتمال السابق[٢] {ولا يلزم المستدل} به {بيان نفي} اي انتفاء {ما هو اولى منه} بأفادة العلية بل يصح الاستدلال به مع امكان الاستدلال بما هو اولى منه بخلاف ماتقدم في الشبه[٣].{فان ابدى المعترض وصفا آخر} اي غير المدار {ترجح جانب المستدل بالتعدية} لوصفه على جانب المعترض حيثُ يكون وصفه قاصرا[٤]. {وان كان} وصف المعترض {متعدي الى الفرع} المتنازع فيه {ضر} ابداؤه {عند مانع العلتين} دون مجوزهما {اولى فرع آخر طلب الترجيح} من خارج لتعادل الوصفين حينَئذٍ[٥].

---

(١) هەندێك وتويانە: دەوەران بێ گومان بە عيلەتبونی دەگەيێنی، وای بۆ دەچێ خاوەنی ئەم قيلە كاتێ ئەمە دەڵێ: سيفەتەكە مناسبی حوكەكە بێ، وەك سەر خۆشی كردن مناسبە بۆ حەرامی عەرەق، چونكە گەورە ترين نيعمەت كە عەقڵە دەفەوتێنی بۆيە پڕ بەپێسيەتی حەرامە.

(٢) قەولی هەڵبژاردەو زۆربەی زانايان هامدەنگی بن ئەوەيە كە دەوەران بەگومانەوە بە عيلەتبونەكەی دەگەيێنێ، نەك بە بێ گومان، چونكە شيمانەكەی پێشو هەر هەڵدە گرێ، كەووتمان ئەگونجێ ئەو سيفەتە لازمی عيلەتەكە بێ نەك خودی عيلەتەكە بێ.

(٣) ئەوەی دەوەران دەكا بە بەڵگە پێويست ناكا ئەوە ڕون بكاتەوە كە باشتر لە دەوەرانم دەست نەكەوتووە عيلەت بگەيێنێ، نەك هەر ئەوەش بەڵكو دروستە دەوەران بكا بەبەڵگە لەگەڵ ئەوەش لەو چاكترو نزيك تر دەست بدات، بەڵام قياسی شەبەهی پێشو وانيە، هەتا قياسی عيلەتبێ قياسی شەبەهە دروست نيە.

(٤) جا ئەگەر ڕەخنـە گـر سـيفەتێكی تـری ئاشـكرا كـرد جگـە لـەوەی حوكمەكـە بەدەوريدا دەسوڕێتەوە ئەوە لای بەڵگە بەدەستەكە پەسەند دەكرێ بەهۆی ئەوەوە كە سيفەتەكەی ئەم ئەگوێزرێتەوە بۆلای ڕەخنەگرەكـەش، ئەمـەش كـاتێ وا دەبـێ ئـەو سيفەتەی ڕەخنە گر نەگوێزرێتەوە.

(٥) بەڵام ئەگەر سيفەتێك ڕەخنەگرەكە هێناويەتی حوكمەكەی ئەگوێزرايەوە بۆئەو فەرعەی دەمەقاڵەيان لەسەريەتی، ئەوە ئەو ئاشكرا كردنە زيانی ئەبەهشێ، بەلايب كەسانێكەوە كە قـەبوڵ ناكـەن يـەك حوكـم دو عيلـەتی هـەبێ، نـەك بـەلای ئەوانـەوە كەبەڕەوای دەزانـێ، ياخود حوكمن ئەو سيفی ڕەخنە گرە ئەگوێزرايـەوە بـۆ فـەرعو شتێكی تر، ئەوە ئەو كاتە داوای شتێك دەكرێ پەسەند بكات لەدەرەوەی بەڵگەكەی،

{الثامن} من مسالك العلة {الطرد وهو مقارنه الحكم للوصف} من غير مناسبة كقول بعضهم في الخل مائع لا تبني القنطرة على جنسه فلا تزال به النجاسة كالدهن ي بخلاف الماء فتبني القنطرة على جنسه فتزال به النجاسة فبناء القنطرة وعدمه :مناسبة فيه للحكم أصلا وان كان مطردا لانقض عليه[1].

{والاكثر} من العلماء {على رده} لانتفاء المناسبة عنه {قال علماؤنا قياس المعنى مناسب} لاشماله على الوصف المناسب {و} قياس {الشبه تقريب و} قياس {الطرد تحكم} فلا يفيد[2]. {وَ قِيلَ ان قارنه} اي قارن الحكم الوصف {فيما عدا صورة النزاع افاد} العلية فيفيد الحكم في صورة النزاع {وعليه الامام} الرَّازي {وكثير} من العلماء[3].

---

چونکە هەر دو سیفەتەکە هاوتای یەك وەستاون لەوکاتەدا، بێ بەڵگەیێکی دەرەکی یەکێکیان پەسەند ناکرێ و ئەویتریان وەلائەخرێ.

(١) هەشتەم لەو رێگاو رێبازانە عیلەتیان پێ دەدۆزرێتەوە تەرەدە، تەردیش ئەوەیە حوکمەکە لە پاڵ سیفەتەکەدا باس کرابێ بێ ئەوەی مناسبەو خزمایەتیان هەبێن وەك وتویانە لە بارەی سرکەوە: سرکە شلەمەنییێکە وەك رۆن وایە پیسایی پێ لا نابرێ، چونکە پرد دروست ناکرێ بەسەر رەگەزەکەیدا، ئەبیسراوە دەریای سرکە هەبێ پردی بەسەردا دروست کرابێ، کەوا بو دروست کردنی پردو دروست نەکردنی هیچ جۆرە خزمایەتی و مناسبەیێکی تێدا نیە بۆ حوکمەکە بێ گومان، هەرچەند ئەو دروست بون و دروست نەبونە متردیش بێ، واتە لەهەرجێ (لاتبنی) بو (لا تزال به النجاسة) هەیە وەلە هەرجێیەك (تبنی) بو (تزال به النجاسة) هەبی، هەر مناسبە نیە.

(٢) زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە رەدی ئەوەیان کردووەتەوە کە عیلەت بە طەرد بهنرێتەوە، چونکە مناسبەو خزمایەتی تێدا فەوتاوە. زانایانی ئێمەیش ووتویانە: قیاسی ماناو مەبەستێك بکرێ پێی دەوترێ مناسب، چونکە سیفەتێکی مناسبی تێدایە، قیاسی شەبەهیش پێی دەوترێ تقریب و نزیك خستنەوە لە راستی، قیاسی تەردیشیان ناوناوە تحکم، چونکە قسەیێکی بێ بەڵگەیە، شتی بێمناسبە حسێب ناکرێ، لەبەر ئەوە سودێك ناگەیەنێ.

(٣) هەندێك ووتویانە: ئەگەر حوکمەکە لەگەڵ صیفەتەکەدا پێکەوە باسکرا بون جگە لەم نمونەی کە کێشەی تێدایەو کێشەی لەسەرە ئەوە ئەوە ئەگەیێنێ کە عیلەتە، کە وابوو لەم نمونەیشدا کە کێشەی لەسەرە حوکمەکە ئەگەیێنێ ، رازی و زۆربەی زانایانیش لەسەر ئەم بۆ چونەن.

{وَ قِيلَ تكفي المقارنه في صورة} واحدة لافادة العلية [١] {وقال الكرخي يفيد الطرد {المناظر دون الناظر} لنفسه لان الاول في مقام الدفع والثاني في مقام الاثبات[٢]

{التاسع} من مسالك العلة {تنقيح المناط وهو ان يدل} نص {ظاهر على التعليل بوصف فيحذف خصوصه عن الاعتبار بالاجتهاد ويناط} الحكم {بالاعم او تكون اوصاف} في محل الحكم {فيحذف بعضها} عن الاعتبار بالاجتهاد {ويناط}الحكم {بالاعم او تكون اوضاف} في محل الحكم {فيحذف بعضها} عن الاعتبار بالاجتهاد {ويناط} الحكم {الباقي}[٣] .

وحاصله انه الاجتهاد في الحذف والتعين ويمثل لذلك بحديث الصحيحين في المواقعة في نهار رمضان فان اباحنيفة ومالكا حذفا خصوصها عن الاعتبار واناط الكفارة بمطلق الافطار كما حذف الشافعي غيرها من اوصاف المحل ككون الوطيء اعترابيا وكون الموطوؤة زوجة وكون الطء في القبل عن الاعتبار واناط الكفارة بها[٤].

(١) هەندێکیش ووتویانە لەیەك دیمەندا پێکەوە باسکرابن بەسە بۆ ئەوەی بەعیلەتبونەکەی بگەیێنێ.

(٢) کەرخی ووتویەتی: تەرد بۆ کەسێ کە پارێز گاری لە بۆچونی سەرەت پەیرەوەکە بکا ئەگونجێ بیکا بەعیلەت، چونکە شوێنەکە شوێنی خۆ پاراستنە، بەلاّم بۆ کەسێ کە خۆی خاوەنی بۆچونەکە بێ دەست نادا، چونکە ئەم خەریکی إسبات کردنە طردیش دەست نادات بۆ اثبات کردن

(٣) نۆهەم لەو رێگایانەی عیلەتیان پێ دە دۆزرێتەوە پالّفتە کردنی عیلەتەکەیە کەبریتیە لەوەی دەقێك رەوالّەتەکەی ئەوە بگەرێنێ ئەو سیفەتە عیلەتی حوکمەکە یە ئەمجا وورده وورده بەهاێیك بۆ تایبەتیەکانی ئەسو سفەتە نەهێلّێتەوە، بەهۆی اجتهادەوە، ئەمجا حوکمەکە ببەسرێ بە شتێکی گشت گیرترەوە، یاخود لەجی حوکەکەدا چەند سیفەتێك دەست کەون هەندێکیان لە اعتبارو بەهای خۆیان بخرێن بەهۆی اجتهادەوە، ئەمجا حوکمەکە ببەسرێ بەهەندەکەی تریانەوە.

(٤) پالّفتەی ئەو قسەیە ئەوەیە کە: اجتهادو کۆششو دەکرێ بۆ لابردنی هەندێ سیفەت و اعتبارو دیاری کردنی هەندێکی تر، بۆ ئەوەش نمونە هێنراوەتەوە بەفەرمودەێیك کە بخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە لەبارەی شکاندن ی رۆژو لە رۆژی رەمەزاندا، بەهۆی جیماعەوە ابو حەنیفەو مالك هەرچی تایبەتمەندی جیماع هەیە لەبەهاو اعتباریان خستون و لایان بردون، کە فارەتەکەیان تەنها بەستووە بە شکاندن رۆژەوە، وەك شافعی هەرچی سیفەتی شوێنی جیماعەکە هەیە هەمووی

{اما تحقيق المناط فاثبات العلة في احاد صورها كتحقيق أن النبـاش} وهـو مـن ينبش القبور ويأخذ الأكفان {سارق} بأنه وجد منه اخذ المال خفية وهو السرقة فيقطع خلافاً للحنفية(١) {وتخريجه} اي تخريج المناط {مر} في مبحث المناسبة وقرن عن الثلاثة كعادة الجدلين(٢).

{العاشر} من مسالك العلة {الغاء الفارق} بأن يبين عدم تاثيره فيثبت الحكم لما اشتركا فيه {كالحاق الامة بالعبد في السراية} الثابته بحديث الصحيحين من اعتق شركا له في عبد فكان له مال يبلغ ثمن العبد و قوم عليه قيمة عدل فأعطي شركاءه حصصهم وعتق عليه العبد والا فقد عتق عليه ما عتق فالفارق بين الامة والعبد الانوثة ولا تأثر لها في منع السراية فتثبت السراية فيها لماشركت فيه العبد(٣).

---

بردووه و له اعتبارو بەها بۆدانانی خستوون جگه لەجماع نەبێ وەك ئەوەی: ئەوە جیماعەکەی کردووە دەبێ لادێیی بێ، وە ئەوەی لەگەڵیدا جوتبووە ژنی بێ، جوتبونەکەش لە پێشەوە بوبێ، شافعی کەفارەتەکەی بەستووە بەجیماعەکەوەو بەس.

(١) بەڵام (تحقيق المناط) ئەوەیە: اسبات کردن و سەلماندنی عیلەتەکە یە ەتاك تاکی نمونەکاندا، وەك بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەوەی کە: کە سێ گۆڕ هەڵبداتەوەو کەفەنەکان ببا دزە، بەم شێوە بڵێت: چونکە ئەو ماڵەی بەپەنهانی بردویەتی ڕگیراوە، هەرماڵێکیش بەپەنهانی دزرا حوکمی دزی هەیە، کەوابو گۆڕ هەڵدەدرە وە دەست دەبڕرێ، بەڵام زانایانی پەیڕەوی ابو حەنیفە ڕایان جیاوازە و بەلای تەوانەوە بەدز حسێب نیە.

(٢) (تخريج المناط) چیە؟ ئەوە لەجێ باسی مناسبەدا تێپەڕی کرد. ووتمان: ئەوەیە: دەرهێنانی سیفەتە مناسبەکەیە لە دەقەکە، جا بۆ لێرە ووتیەوە؟ چونکە خووی جەدەلیەکان وایە هەرسیانیان باس دەکەن، بۆیە دانەریش لێرە دا هەرسیانیان لە پاڵیەکدا باسکردووە.

(٣) دەهەم لەو ڕێگایانەی دەمانگەێنە سەر دۆزینەوەی عیلەت (الغاء الفارقة) واتە: پوچەڵ کردنەوەی ئەو شتەی بووەتە هۆی جیا کردنەوەلی ئەو دوشتە، بەم شێوە نەبونی تاسیرو جێ دەستی ئەو شتە دیار و ڕون بکاتەوە، ئەمجا حوکمەکە سابت بکا، لە بەر ئەوەی هەر دوکیان لەیەك شتدا شەریکی یەکن، وەك بە پاشکۆ کردنی کەنیزەك بۆ بەندە لەتازاد بوندا، کە بۆ بەندە دەقی لەسەرە، کە نیزەکیش جێ ئەو دەگرێتەوە، ئەو دەقەش فەرمودەێکە بخاری و مسلم ڕیوایەتی دەکەن و دەفەرموێ: کەسێك بەشی هەبو لەبەندێیکدا بەشە کەی خۆی ئازاد کرد، جا ئەوەهاتو پارەی

{وهو} اي الغاء الفارق {والدوران والطرد} على القول به {ترجع} ثلاثتها {الى ضرب شبه اذ تحصل الظن في الجملة} لا مطلقاً {ولا تعين جهة المصلحة} المقصودة من شرع الحكم لانها لا تدرك بواحد منها بخلاف المناسبة[1].

{خاتمة: في نفي مسلكين ضعيفين ليس تأتي القياس بعلية وصف ولا العجز عن افساده دليل عليته على اصح فيهما} وَ قِيلَ نعم فيهما اما الاول فلا القياس مأمور به بقوله تعالى فاعتبروا عليته على الأصَحّ فيهما} وَ قِيلَ نعم فيهما اما الاول فلا القياس مأمور به بقوله تعالى فاعتبروا وعلى تقدير عليَّه الوصف يخرج بقياسه عن عهدة الأمر فيكون اللوصف علة[2].

هەبوو بەهای بەندەکەی پێ تەواو بکا ئەوە دەخەملێنرێ قیمەتێکی عادلانەی بۆ دادەنرێ ئەمجا پارەی بەشی شەریکەکانی دەداو بەندەکە لەسەر ئەم دەبێ بەماڵ و ئازاد دەبێ، وە ئەگەر ماڵی نەبو بەشەکەی ئەوان بداتەوە ئەوە تەنها بەشەکەی خۆی ئازاد دەبێ. فەرق لە نێوان بەندەو کەنیزەك هەر مێینەیە نیە و مێنەیش هیچ ڕێیت ناگرێ لەگواستنەوەی حوکمی ئەو بەندەیە بۆ ئەم، چونکە ئەم کەنیزەکە شەریکی ئەم بەندەیە لە بەندایەتی و موڵکایەتیدا.

(١) (الغاء الفارق) و دەوەران و تەرد ئەگەر سێب بکرێ ئەمانە هەرسیانیان دەگەڕێنەوە بۆ جۆری شەبەهە، چونکە ئەمانە لەهەندێ نمونەدا گومان پەیدا دەکەن نەك لەهەموو نمونەیێکدا وە ئەمانە ڕوی ئەو بەرژەوەندیەن کەمەبەستە لەدانانی ئەم حوکمەکە دادیاری ناکەن، چونکە ئەو بەرژەوەندیە بەیەکێك لەم سیانە نازانرێ، بەلاَم مناسبە وانیەو پێی دەزانرێ.

(٢) ئەمە کۆتاهێنانە بەم باسی ڕێگایانەی عیلەتیان پێ دە دۆزیرێتەوە، بەلاَم ئەمجارەیان باسی قەبوڵ نەکردنی دوڕێگەی لاواز دەکەین کە ناداوانن بمانبەنە سەر عیلەت، یەکەمیان کەیاز دەهەمینی زنجیرەی مسالیکی عیلەیە ئەوە یەکە: دەستدانە قیاس کردنی بەهۆی بە عیلەت کردنی سیفەتێك، ئەوە نابێتە بەڵگەی بە عیلەتبونی ئەو سیفەتە، دوهەمیان کە دواز دەهەمینی زنجیرەی مسالك ئەوەیە کە: نەتەوانایی و دەستەوەستان لەبەردەم پوچەڵ کردنەوەی سیفەتێکدا بەڵگەی بەعیلەتبونی ئەو سیفەتە نیە، لەسەر قەولی اسح لە هەردوکیاندا. هەندێك ووتویانە: بەڵێ هەردوکیان بەڵگەن لەسەر بەعیلەتبونی سیفەتەکە، یەکەمیان لەبەرئەوەیە: کەقیاسی لە قورئاندا فەرمانی پێ کراوە: کەدەفەرموێ: پەند وەرگرتن، بەدیاری کردنی سیفەتێك و بەعیلەت کردنی ئەو کەسە بەقیاسی کردنی ئەو سیفەتە لەزەمانەتی فەرمانەکە

و أجيبَ بأنه انما تتعين عليَّته ان لو لم يخرج عن عهدة الامر الابقياسه وليس كذلك واما الثاني فكما في المعجزة فانها انما دلت على صدق الرَّسُول للعجز عن معارضتها و أجيبَ بالفرق فان العجز هناك من الخلق وهنا من الخصم[1].

{القوادح} اي هذا مبحثها وهي ما يقدح في الدليل من حيثُ العلة او غيرها {منها تخلف الحكم عن العلة} بأن وجدت في صورة مثلاً بدون الحكم {وفاقا للشافعي} ﷺ في نه قادح في العلة {وسماه النقص[2] وقالت الحنفية لايقدح} فيها {وسموه تخصيص لعلة وَ قيلَ لا} يقدح {في} العلة {المستنبطة} لان دليلها اقتران الحكم بها ولا وجود ه في صورة التخلف فلا يدل على العلية فيها [3].

---

ـەردەچێ، کەوابو سیفەتەکە عیلەتە.

(١) وەڵامی ئەم هۆکاری قیلە دراوەتەوە کە کاتێ بەتەنها ئەو سیفەتە دیاری دەکرێ ـە عیلەت کە لە زەمانەتیی ئەو فەرمانە بەو نەبێ‌و بە قیاس کردنی ئەو سیفەتە نەبێ ـەرنەچێ و ڕێ دەرچونی نەبێ، لەگەڵ ئەوەش وانیە، چونکە چەندەها سیفەتی‌تر ـەیە. بەڵگەی قیلەکە بۆ دو هەمیان دەڵێ: ئەمیش وەکو معجزەوایە، بۆیە معجزەیە چونکە هەمو خەڵك دەستەوەستان کردووە لەبەردەم خۆیا، بۆیە دەلالەت دەکا لە سەر ڕاستی پێغەمبەر چونکە کەس ناتوانی بەرهەڵستی بکاو ڕەخنەی لێ بگرێ. وەڵام ـراوەتەوە: ئەم دووانە فەرمان زۆرە، چونکە نەتوانین بەرانبەر معجزە بۆ هەمو خەڵکە، بەڵام نەتوانینی ڕێگەی دوازدەهەم تنها بۆ نەیارە

(٢) ئەمە جێ‌باسی ئەوانەیە بەڵگە عەیبدار دەکەن، قادح ئەوەیە بەڵگە عەیبدار بکات لە ڕوی بەعیلەتبونیەوە، یاخود لەڕوێیکی‌ترەوە یەکێك لەو عەیبدار کەرانە ئەوەیە: حوکمەکە بەجێ بمێنێ و لە عیلەتەکە دواکەوێ، بەم شێوە کە عیلەتەکە لە نمونەێکدا هەبێ و بەڵام حوکمەکە دیار نەبێ، شافعی خوای لێ ڕازی بێ هامدەنگە بۆ ئەوم ڕایە، لەوە دا کەنەبونی حوکمەکە زیان بەخش و عەیبدار کەری عیلەتەکەیە، بەڵام شافعی ناوە ناوە: هەڵوەشاندنەوەی عیلەتەکە.

(٣) زانایانی پەیڕەوی ابو حەنیفە ووتویانە: دواکەوتنی حوکەکە لەعیلەتەکە زیان بە عیلەتەکە ناگەێنێ و عەیبداری ناکا، ناونیشیان ناوە بەتایبەت کردنی عیلەتەکە واتە کە دەڵێن لە هەمو جێگەێك دەبێ عیلەت بێ نەخێر لەم جێیە دا عیلەت نیە، هەندێك ووتویانە: دواکەوتنی حوکمەکە لە عیلەتێکدا بەعەقڵ دۆزرابێتەوەو لەدەقەکە دەرهێنرا بێ عەیبداری ناکاو زیانی لێ نادا، چنکە دەلیلی عیلەت ئەوەیە لەگەڵ حوکمەکەدا بەجوتە لەگەڵ عیلەتەکەدا باسی کرابێ، لە نمونەی عیلەتی بێ حوکمدا

بخلاف المنصوصة فان دليلها النص الشامل لصورة التخلف وانتفاء الحكم في يبطله بأن يوقفه عن العمل به والحنفية تقول يُخَصّصه ويجاب عن دليل المستنبطة باقتران الحكم فيها يبطله بأن يوقفه عن العمل به والحنفية تقول يُخصّص ويجاب عن دليل المستنبطة بأن اقتران الحكم بالوصف يدل عل عليته في جميع صوره كدليل المنصوصة[1].

{وَ قِيلَ عكسه} اي لا يقدح في المنصوصة ويقدح في المستنبطة لان الشارع له يطلق العامّ ويريد بعضه مؤخرا بيانه الى وقت الحاجة بخلاف غيره اذا علل بشي ونقض عليه ليس له ان يقول اردت غير ذلك لسدة باب ابطال العلة[2]. {وَقِيلَ يقدح فيهما {الا ان يكون} التخلف {لمانع او فقد شرط} للحكم فلا يقدح {وعليه كث فقهائنا[3].

---

ئەو باس کردنە نیە، بۆیە ئەو باس کردنە دەلالەت لە سەر بەعیلەتبونەکەی دەکا لەو جۆرە نمونانەدا.

(١) بەلام عیلەتێك دەقی لەسەر بیّ وانیە، چونکە بەلگەکە دەقێکە ئەو نمونەش دەگرێتەوە کە عیلەتی بیّ حوکمەی تێدایە، لەگەلّ ئەوەش نەبونی حوکمەکە لە جۆرە نمونانەدا دەقەکە پوچەلّ دەکاتەوە، پوچەلّ کردنەوەی بەمانا وەستاندنی لەکار پیّ کردن، زانایانی حەنەفی دەلێن: ئەو نەبونی حوکمە دەقەکە تایبەت دەکا وەلام دەدرێتەوە: باسکردنی حوکمەکە لەگەلّ سیفەتەکەیدا دەلالەت دەکا لەسەر بەعیلەتبونی ئەو سیفەتە لە هەمو نمونەکانیدا، وەك بەلگەی عیلەتێك کە دەقی لەسەر بیّ.

(٢) هەندێك ووتویانە لە عیلەتێکدا دەقی لەسەر بیّ عەیبداری ناکا، بەلام لەوەی لەدەق دەر هێنراوە عەیبداری دەکا، واتە پێچەوانەی ئەوەی پێشەوە، چونکە شارع بۆی هەیە لەفزێکی گشت گیر بلّی و بلّی لەو گشتە هەندێکم مەبەستە، ڕونکردنەوەی ئەو لەفزە گشت گیرەو ڕاڤە کردنی دوابخا بۆ کاتیّ خەلّك پێویستی پیّ هەیە، بەلام غەیری شارع ئەوەی بۆنیە،کاتیّعیلەتی هێنایەوە بۆشتیّوهەلوەشێنرایەوە ڕەخنەی لەسەر گرت، بۆی نیە بلّیّ! ئەوەم مەبەست نە بووە، چونکە ئەوە دەرگای پوچەل کردنەوەی عیلەت دا دەخاو کەس بۆی نیە ئیتر بەرانبەر عیلەتی کەسی بوەستیّ.

(٣) هەندێکی تر ووتویانە: لەهەردوکیاندا تخلفەکە عەیبداریان دەکا مەگەر دواکەوتنەکەی لەبەربونی ڕێگرێك بیّ، یاخود نەبونی یەکێك لە مەرجی حوکم نەبیّ ئەو کاتە عەیبداری ناکا، زۆربەی شەرع زانانی ئێمە ڕایان لەسەر ئەم قیلەیە.

وَ قِيلَ يقدح إلاّ ان يرد على جميع المذاهب كالعرايا} وهو بيع الرطب والعنب قبل القطع بتمر او زبيب فان جوازه وارد على كل قول في علة حرمة الربا من الطعم والقوت والكي والمال فلا يقدح {وعله الامام} الرّازي ونقل الاجماع على ان حرمة الربا لا تعللُ الاباحد هذه الامور الاربعة[1] .

{وَ قِيلَ يقدح في} العلة {الحاظرة} دون المبيحة لان الحظر على خلاف الأصل فتقدح فيه الاباحة بخلاف العكس[2] {وَ قِيلَ } يقدح {في المنصوصة الا} اذا اثبت {بظاهر عام} لقبوله للتخصيص بخلاف القاطع[3]. {و} يقدح في {المتنبطة} ايضا {الا} ان يكون التخلف {لمانع او فقد شرط} للحكم فلا يقدح فيها[4].

(١) هەندێکی ترو ووتویانە: ئەو تخلفە عیلەتەکە عەیبدار دەکا مەگەر بەخراپە بێتە سەر هەموو مەزهەب و پەیڕەوێك، وەك عەرایا، بریتیە لە فروشتن و کڕینی خورما و ترێ پێش کەندنەوەی بەخورمای ووشك و مێوژ، ئەو کرین و فرۆشتنە بەرەخنە دێتە سەر هەمو قەولێك کە هەر یەکێکیان عیلەتێك دەهێنێتەوە بۆ حەرامبونی ڕیباو سوە، یەکێ تەعم، یەکێ قوت، یەکێ پێوانە، یەکێ مالْ، ئەمە عیلەتەکە هەیە و حوکمەکە نیە ئەم تخلفو نەبونی حوکمە عیلەتەکە عەیبدار ناکا. پێشەوا ڕازیش لەسەر ئەم قیلەیە، نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەوەش نەقڵی کردووە کە اجماع لەسەر ئەوەیە کە حەرامی ڕیباو سووعیلەتی بۆ ناهێنرێتەوە بەیەکێ لەم چوار هۆیە نەبێ.

(٢) هەندێك ووتویانە: دواکەوتنی حوکمەکە لە عیلەتێکدا کە بۆ قەدەغەکردن و حەرامبون بێ تەعنی لێ ئەدا و عەیبداری دەکات، نەك لەوەدا بۆ حەلاڵ کردنی بێ، چونکە قەدەغەکردن پێچەوانەی ئەسڵە، ئەسڵ ئەوەیە حەلاڵ بێ، بۆیە حەلاڵ کردنی حەرام تەعنداروعەیبداری دەکا، پێچەوانەکەی وانیە، وەك بووترێ: لە سێودا ڕیبا حەلاڵە چونکە وەزن دەکرێ، هەڵدەوەشێتەوە بەخورما، نەبونی حوکمەکە لە خورمادا عیلەتەکە عەیبدار ناکا، چونکە ئەسڵ لە هەموشتێکدا ئەوەیە کە حەلاڵ بێ.

(٣) هەندێکی تر ووتیوانە تخلف حوکمەکە کە عیلەتەکە تەعنی دار و عەیبدار دەکات ئەگەر دەقی لەسەر بێ مەگەر ئەو عیلەتە سابت بێ بە دەقێك کە ظاهر و عام بێ، چونکە ئەمە قەبولی ئەوە دەکا تایبەت بکرێ، بەڵام ئەگەر دەقەکە گومان بڕبێ وانیە، چونکە تخلفەکە عەیبداری دەکا.

(٤) هەروەها دەڵێ: تخلفەکە زیان لە عیلەتێك نادا لە دەقەکە هەڵگۆزراو بێ، مەگەر ئەو نەبونی حوکمە لەبەر بوونی مانع و ڕێگربێ، یاخود لەبەر فەوتانی مەرجێکی

{وقال الآمدي إن كان التخلف لمانع او فقد شرط أو في معرض الاستث- منصوصة كانت أو مستنبطة {أو كانت منصوصة بمالا يقبل التأويل لم يقـ- وإلاّ قدح إلاّ في المنصوصة بما يقبل التأويل فيؤول للجمع بين الدليلين وقول الصـ- عنه في المنصوصة بما لا يقبل التأويل لم يقدح هو لازم قوله فيها ان كان التخـ- لدليل ظني فالظني لا يعارض القطي أو قطعي فتعارض قطعين محال قال المصـ- إلاّ أن يكون احدهما ناسخا[1]. {والخلاف} في القدح {معنوي لا لفظي خلافاً لا- الحاجب} في قوله انه لفظي مبني على تفسير العلة ان فسرت بما يستلزم و جو- وجود الحكم وهو معنى المؤثر فالتخلف قادح أو بالباعث وكذا بالمعرف فلا[2].

حوکمە بێ، ئەوە زیان بەو جۆرە عیلەتانە نادات، چونکە عیلەتەکە حوکمەکە دەهێـ- بەڵام شتێر ناهێڵێ.

(١) ئامێدی ووتویەتی: ئەگەر تخلفەکە لەبەر بوونی ڕێگرێك، یاخود، فەوتـ- مەرجێك،یاخود لە جێیکدا بێ استسنای تێدا بێ، ئەم سیانە هەرسیانیان دەقیـ- لەسەر بێ یاخود لە دەق وەرگرا بن، یاخود ئەو عیلەتە دەقێکی وای لەسەر بێ کـ- قەبوڵی تەئویل نەکات، نەبونی حوکمەکە لەم سیانەدا عیلەتەکە تەعندار و عەیبـ- ناکا، ئەگەر وانەبێ عەیبداری دەکا، مەگەر عیلەتێك بێ کە دەقی لەسەر بێ، دەقێکی وا کە قبوڵی تەئویل بکا، وەك ظاهرێکی عام، ئەوەکاتە تەئویل دەکرێ، چونکە ئەم دەقە بەڵگەی عیلەتەکەو بەڵگە نەبونی حوکمەکەی کۆکردووەتەوە یاخود ئەوەی کـ- قەبوڵی تەئویل دەکا دەگەڕێتەوە بۆ جەمعی بەینە دەڵین دانەر لەبارەی ئامێدیەوە ئەوەی نەقڵی کرد وتی: عیلەتێك دەقی لەسەر بێ، دەقێکی وا قەبوڵی تەئویل نەکـ- ئەوە تەعندار و عەیبداری ناکا، ئەم قسەیە دەقی قسەکەی ئامێدی نیە بەڵکوو لازمی قسەکەیەتی، دەقی قسەکەی ئەمەیە لەبارەی عیلەتێکەوە کە دەقی لەسەر بێ ئەڵی ئەگەر تخلفەکە لەبەر بەڵگەیێکی گوماناوی بێ ئەوە ئەو جۆرە بەڵگانە ناتوانن بچن بـ- کـژ بەڵگەی بێ گوماندا، یاخود ئەگەر لەبەر بەڵگەی بێگومان بێ ئەوەش بەگژداچوونی دوو بەڵگەی بێگومان مەحاڵە و هەرگیز نابێ دا نەرو وتویەتی: مەگەر یەکێکیان سڕێنەرەوەی ئەوی تریان بێ.

(٢) ئەو جیاوازیەی زانایان لەبارەی بوون و نەبونی زیانی دواکەوتن و فەوتانی حوکەکە لە عیلەتەکە جیاواز یێکی ناوەڕۆکیە نەك سەرزارەکی،بەڵام ابن الحاجب ڕای جیاوازە کە دەڵێ: ئەو جیاوازیە سەرزارەکیە، واتە لەسەر تەفسیرو لێکدانەوەی عیلەتەکەوە پەیدا بووە، کە: ئەگەر لێکدرایەوە بەوەی عیلەت شتێکە هەرکاتێك بوو

{ومن فروعه} اي فروع ان الخلاف معنوى {التعليل بعلتين} فيمتنع ان قدح التخلف وا فلا وهذا التفريع نشأ عن سهو فإنَّهُ انما يتأتي في تخلف العلة عن الحكم والكلام في عكس ذلك[1] {والانقطاع} للمستدل فيحصل ان قدح التخلف و إلاّ فلا ويسمع قوله ردت العلية في غير ماحصل فيه التخلف[2] {وانخرام المناسبة بمفسدة} فيحصل ان قدح التخلف و إلاّ فلا ولكن ينتفي الحكم لوجود المانع[3].

ـەبێ حوکمەکەش هەبێ، ئەوەش مانای مؤثرە ، کەوابوو عیلەت هەبێ و حوکمەکەی ـەبێ، ئەوە زیان بەخشەو عیلەتەکە عەیبدار دەکا لەو کاتا، بەلاّم لەو دوکاتا تخلفەکە ـیان ناداو عیلەتەکە تەعندراو عەیبدار ناکا.

(١) یەکێکیتریش لەو لقانەی کە لە جیاوازی زانایان ناوەڕۆکیە نەك زارەکی، پەیدا دەبێ ئەوەیە کە عیلەت بهێنرێتەوە بۆ حوکم بەدوو عیلەت، جائەگەر وترا نابێ یەك حوکم دوو عیلەتی هەبێ ئەوە تخلف و عیلەتی بێ حوکم دروستە نیە نابێ، وە ئەگەر ووترا دەبێ، ئەوە تخلف و عیلەتی بێ حوکم زیان بە عیلەتەکە ناد ـەم لق و پەل لێ کردنەوەیە لەسەهوێکەوە دروست بووە، ئەویش ئەوەیە: کاتێ ئەو تەفریع و لق و پۆ بۆ دروست کردنەوە دەبێ کە حوکم هەبێ و عیلەت نەبێ، ئێستە گوفتوگۆی ئێمەیش لە پێچەوانەیئەوەدایە ، ئێمە باسی ئەوە دەکەین عیلەت هەبێوحوکمەکەی نەبێ.

(٢) یەکێکیتر لەو لقانەی کە لەو جیاوازیە ناوەڕۆکیەی زانایانە وە پەیدا دەبێ ئەوەیە ئەگەر ئەو تخلفە عەیبدار کەر بو بەڵگەی بەڵگەبەدەستەکە دەپچڕی و دەپسێ، واتە ئەو پسان و پچڕانە پەیدا دەبێ ئەگەر تخلفە کە تەعندارو عەیبدارکەر بوو، ئەگەر وانەبو بەڵگەی دەستی ناپسێ و ناکەوێ ئەو قسەیە دەبیسرێ و ئەگونجێ بڵێ: من ئەوەم مەبەست بو ئەوە دەبێتە عیلەت نەك لەو جێیەدا کە تخلفی تێدا پەیدا بووە.

(٣) یەکێکیتر لەو لقانەی کەلەو جیاواز بە ناوەڕۆکیەی زانایینەوە پەیدا دەبێ ئەوەی کەمناسبە پوچەڵ دەبێـەوە بەهۆی مەفسەدەو کرمۆڵ بونێکەوە، ئەگەر تخلفەکە عەیبدار دەبوو ئەوە پوچەڵ بونەوەی مناسبە کە پەیدا دەبێ، وە ئەگەر عەیبدار نە دەبوو ئەو پوچەڵ بونەوەیەش پەیدا نابێ، بەلاّم حوکمەکە کە دەفەوتێ لەبوونی ڕێگرێکە نەك لەبەر عەیبداری عیلەتەکەیە نمونە گرتنە بەری ڕێگەیێکی دوور بۆ ئەوەی نوێژەکە بەکورت کراوی بکا نەك شتیتر، سیفەتە مناسبەکە سەفەری درێژە، حوکمی نوێژە، کورت حوکمی نوێژی کورت سوننەتە، مەفسەدەکە نیازەکەیەتی، بۆیە کورت کردنەوە نابێ، جا ئەگەر ووتمان: تخلفەکە عەیبدارکەرە

{وغيرها} بالرفع اي يرـ المذكورات كتخصيص العلة فيمتنع ان قدح التخلف ...: فلا[1] {وجوابه} اي التخلف على القول بانه قادح {منع وجود العلة} فيما اعتبرـ ... {او منع انتفاء الحكم} عن ذلك {ان لم يكن انتفاؤه مذهب المستدل} و إلاّ فلا يتـ... الجواب بمنعه[2] {وعند من يرى الموانع} اي يعتبرها بالنفي في قدح التخلف حتى ... وجدت او احد منها لا يقدح عنده {بينها} فيحصل الجواب على رايه بيانها او ... واحد منها[3].

---

ئەوە نەبونی حوكمەكە لەبەر نەبونی سیفەتی مناسبە، وە ئەگر ووتمان، عەیبدار ... نیە ئەوە نەبونی حوكمەكە لەبەر بونی ڕێگرێكە، كە مەفسەدەكە لەگەڵ ئەو... مناسبەكە هەرماوەتەوە.

(١) وەیەكێكی‌تر لەو لقانەی كەلە و جیاوازیە ناوەڕۆكیەی زانایانەوە پەیدا ... ئەوەیە غەیری ئەوانەی باس كران وەك ئەوەی عیلەت تایبەتبكرێ ئەگەر تخلفە... عەیبدار كەربێ ئەوە نابێ تایبەت بكرێ، وەئەگەر تخلفەكە زیان بەخش نەبوو ... ئەو تایبەت كردنی عیلەتە قەدەغە نیە.

(٢) جەواب و وەڵامی ئەوەی كە دەڵێ: عیلەت هەیە و حوكم نیە، ئەو... نەبونی حوكمە عیلەتەكە عەیبدار دەكا، وەڵامەكە: ئەوەی تۆ بەرەخنە هێناتەو... عیلەتی ئەو حوكەی تێدا نیە بۆ نمونە عیلەتی ڕیبا لەگەنمدا پێوانەیە هەڵدەوەشێەوە بەگەچ پێوانە دەكرێ و مادەی ڕێبەوی نیە، بەڵگە بەدەست وەڵامی دەدتەوە كە: گەچ پێوانە ناكرێ، بەڵكو كێشانە دەكرێ یاخود ئەوەی تۆ بەرەخنە هێناوەتە ئەو حوكمەی تێدا نیە، ئەگەر نەبونی حوكمەكە ... بۆچوونی بەڵگە بەدەست بێ، ئەگەر ڕای وانەبێ وەڵام نادرێتەوە بەوە بووتری ئەو حوكمەی تێدا نیە. بۆ نمونە: ڕەخنەگر بڵێ: ئەوەی تۆ كردوتە بە عیلەتی حەرامی و هۆی ڕیبا لە خورمادا كێشانە، هەڵدەوەشێەوە بەسێو، سێو بە كێشانە... دەفرۆشرێ و مادەیێكی ڕیبەویش نیە، بەڵگە بەدەست ئەگەرای وابوو كە سێو ڕیبەویە دەڵێ: سێو مادەی ڕێبەویە، بەلام ئەگەر ڕای وانەبێ نابێ وەهـ... وەڵامی بداتەوە.

(٣) بەلام كەسانێك كەڕایان وایە ڕێگر یاخود چەند ڕێگرێك زیان لە عەیبد... كردنی بونی عیلەتی بێ حوكم نادەن، ئەوە دەبێ ئەو مانع و ڕێگرانە باس بكـ... ڕونیان بكاتەوە، ئیتر یەك دانەیە، یاخود چەند دانەیێكە.

{وليس للمعترض} بالتخلف {الاستدلال على وجود العلة} فيما اعترض به {عند الاكثر} من النظار ولو بعد منع المستدل وجودها { للانتقال } من الاعتراض الى الاستدلال المؤدي الى الانتشار وَ قِيلَ: له ذلك ليتم مطلوبه من ابطاله العلة[1].

{وقال الامدى} له ذلك {ما لم يكن دليل اولى} من التخلف {بالقدح} فان كان فلا ولو صرح المصنِّف بلفظة له لسلم من ايهام نفيها اي ايقاعه في الوهم اي الذهن وما حكاه ابن الحاجب من انه يمكن مالم يكن حكما شرعيا اي بأن كان عقليا قال المصنِّف لم يوجد لغيره قال ووجهه أن التخلف في القطعي قادخ بخلاف الشرعي لجواز انى يكون فيه لوجود مانع او فوات شرط[2].

---

(١) کەسێ ڕەخنە گربێ بەبونی عیلەت لە شتێکدا و حوکمەکەی نەبێ بۆی نیە بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر بونی عیلەتەکە لەوەیدا کە بەڕەخنە هێناویەتەوە بەلای زۆربەی زۆری بیریارانەوە، بالەدوای ئەوەشەوە بێ بەڵگەبەدەست مەنعی عیلەتەکەی کردبێ، چونکە بابەتەکە دەگۆڕێو دەگوێزرێتەوە لەڕەخنەگرتنەوە بۆ بەڵگە هێنانەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی درێژەپێدان و کێشمەکێشی بێئەنجام. هەندێك وتوویانە: ڕەخنەگر ئەوەی بۆ هەیە بەڵگە بهێنێتەوە، بۆ ئەوە داخوازیەکەی خۆی ئەنجام بدات، کە بریتیە لە پوچەڵ کردنەوەی ئەو عیلەتەی بەڵگە بە دەست هێناویەتەوە .

(٢) ئامێدی وتویەتی: ڕەخنەگر ئەوەی بۆ هەیە ئەگەر بەڵگەیێکیتری نەبێ باشتر لە عیلەتی بێ حوکم بۆ تەعندان و عەیبدار کردنی بەڵگەی بەڵگەبە دەستەکە، خۆ ئەگەر لەو باشتر هەبێ نابێ ئەمەیان بگا، ئەگەر دانەر لەفزی: (لَهُ) ی لەمەتنەکە زیادبکردایە وەك من زیادم کردووە، ئەو کاتە ڕزگاری دەبوو لەوەی وابخاتە زیهنی گوێ گرەوە کە ئەمە بەسراوە بە: ليس للمعترض الخ، پێشەوە، ئەوەش کە (ابن الحاجب) گێڕاویەتەوە و دەڵێ: ڕەخنە گر بۆی هەیە بەڵگە بهێنێتەوەئەگەر ئەو حوکمەی کێشەی لەسەرە حوکمێکی شەرعی نەبێ، واتە حوکمێکی عەقلی بێ‌ن دانەر دەڵێ: بۆیە باسم نەکردووە: ئەم ڕایە جگە لە ابن الحاجب کە سیتر نەیووتوە، هەردانەر دەڵێ: بەڵگەی ابن الحاجب ئەوەیە کە: چونکە عیلەتی بێ حوکم لە بەڵگەی عەقلی بێ گوماندا عەیبدار کەرە، بەلام شەرعی وانیە، چونکە دەگونجێ ئەو عیلەتە بێ حوکمە لە بەر بوونی ڕێگرێك بێ یاخود لەبەر فەوتانی مەرجێك بێ.

{ولو دل} المستدل {على وجودها} فما علله بها {بموجود في محل النقض ثم مع وجودها} في ذلك المحل {فقال} الة المعترض {ينتقض دليلك} على العلة حيث وجد في محل النقض دونها لي مقتضى منعك وجود هنافيه {فالصواب انه لا يسمع قول المعترض {لانتقاله من نقض العلة الى نقض دليلها} والانتقال ممتنع وذهب بالصواب الى دفع قول ابن الحاجب وفيه اي في عدم السماع نظراً اي لأنّ القدح في الدليل قدح في المدلول فلا يكون الانتقال إليهِ ممتنعا[1]. {وليس لـه} اي للمعترض {الاستدلال على تخلف الحكم} فيما اعتبرض به ولو بعد منع المستدل تخلفه لما تقدم من الانتقال من الاعتراض الى الاستدلال المؤدي الى الانتشار وَ قِيلَ: لـه ذلك ليتم مطلوبه من ابطال العلة[2].

---

(١) ئەگەر بەڵگە بەدەست بەڵگەی هێنایەوە لەسەر بونی عیلەتەکە لەوەیدا کە عیلەتی بۆ هێناوەتەوە بەو عیلەتە بەبەڵگەیێک کە هەیە لەشوێنی هەڵوەشاندنەوەکەی خۆیدا پاشان بوونی عیلەتەکە لەو شوێنەدا قەدەغە کراوە إدعا بکرێ سەر خۆشی کردن لەنەرکینە داهەیە و حەرامیش نیە، وەك سەرخۆشی کردن لە عەرەقدا هەیە ئەمجا بڵێ نایسەلمێنم نەرگینە سەرخۆشی کردنی تێدایە ئەمجا ڕەخنە گرەکەش بڵێ بەڵکگەی تۆ لە سەر عیلەتەکە هەڵدەوەشێتەوە، چونکە بەڵگە کە لە نەر گینەکە دەست کەوت، کە پێ خۆشیەکەیە، بەڵام عیلەتەکە نیە، لەسەر ئەو خواستەی تۆ کەووتت ئەگینە عیلەتەکەی تێا نیە، ئەوە ڕاستیە کەی ئەوەیە قسەی ڕەخنە گرەکە نابیسرێ، چونکە شتەکە دەگۆڕێ و بابەتەکە دەگوێزرێتەوە لە هەڵوەشاندنەوەی عیلەتەکەوە حەڕوا بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەی عیلەتەکە، ئەم گواستنەوەش قەدەغەیەو نابێ، کاری خۆیی نەکردووە، دانەر بەووشەی: فالصواب، ئاماژەی کرد بۆ بەرپەرچودانەی قسەکەی ابن الحاجب کە دەڵێ: لە نەبیستنی قسەی ئەم ڕەخنە گرەدا ڕەخنەی هەیە، چونکە عەیبدار کردنی بەڵگە عەیبدار کردنی بەڵگە بۆ هێ،ڕاوەکەیە لەبەر ئەوە گواستنەوەی کار لە پوچەڵ کردنەوەی عیلەتەوە بۆ پوچەڵ کردنەوەی بەڵگەی عیلەت قەدەغە نیە.

(٢) بۆ ڕەخنەگر نیە بەڵگە هێنانەوە لەسەر تخلفی حوکمەکە لەوەیدا کە ڕەخنەی پێ گرتووە، با لە دوای ئەوەش بێ کەمستدلەکە منعی تخلفی حوکمەکەی کردووە چونکە لە پێشەوە ڕابورد کە: گواستنەوە دەبێ لە ڕەخنە گرتنەوە بۆ ەڵگە هێنانەوە کە ئەوکار گواستنەوەش سەر ئەکێشێ بۆ ئەوەی کێشمەنکێشە کە بڵاوە بکا،هەندێك ووتویانە:بۆی هەیە بۆئەوەی مەبەستەکە بێتەجێ،کەپوچەڵ کردنەوەی عیلەتەکەیە.

{وثالثها} له ذلك {ان لم يكن دليل اولى} من التخلف بالقدح فإنْ كان فلا[١]. {ويجب الاحتراز منه} اي من التخلف بان يد كرفي الدليل ما يخرج محله ليسلم عن الاعتراض {على المناظر مطلقاً وعلى الناظر} لنفسه {الا فيما اشتهر من المستثنيات} كالعرايا {فصار كالمذكور} فلا حاجة الى الاحتراز عنه[٢].

{وَ قِيلَ يجب} عليه الاحتراز منه {مطلقا} وليس غير المذكور كالمذكور[٣] {وَ قِيلَ} يجب عليه الاحتراز منه {الافي المستثنيات مطلقا} اي مشهورة كانت او غير مشهورة فلا يجب الاحتراز عنها للعلم بانها غير مرادة[٤]. {دعوي سورة معينة او مبهمة} بالاثبات اي اثباتها {او نفيها ينتقص بالاثبات او النفي العامين} بدا بالاثبات الراجع الى النفي لتقدمه عليه طبعا[٥].

(١) قەولی سێهەم ئەوەیە کە: ڕەخنەگر ئەوەی بۆ هەیە، ئەگەر لە تخلف چاکتر بەڵگەی دەست نەکەوێ بۆ تەعن و عەیبدار کردن، ئەگەر دەستی کەوت بۆی نیە.

(٢) پێویستە بەڵگە بەدەست هەر لەئەوەڵەوە خۆی بپارێزێ لە تخلف، بەم شێوە لەبەڵگەکەدا شتێ باس بکا کە جێ تخلفەکە بباتە دەرێ، بۆ ئەوەی لە ڕەخنە لێ گرتن ڕزگاری ببێ، ئەو خۆپاراستنە پێویستە لەسەر کەسێ کە پەیڕەوی امامەکەی بپارێزی چ مستسنیات بن یانە، وە واجبیشە لەسەر کەسێ کەخۆی بیریارەو خاوەنی پەیڕەوەکەیە، مەگەر لەشتێکدا نەبێ کە بەناوبانگن لەحوکمدا جیاوازن، وەك عەرایا، ئەو موستەسنایانەی بەناوبانگن وەك ئەوە وان کە باسکرابن، لەبەر ئەوە پێویستی بەوەنیە خۆی لێ بپارێزرێ.

(٣) هەندێك ووتویانە: پێویستە بەڵگە بەدەست هەردەبێ خۆی بپارێزێ لە تخلف چ پەیڕەوەی پێشەواکەی بپارێزێ‌ێ وە چ ڕاو بۆچونی خۆی بپارێزێ، چونکە ناتوانێ بڵێت ئەوەی باس نەکراوە وەك ئەوەوایە کەباس کراوە.

(٤) هەندێك ووتویانە: واجبە لەسەری خۆی بپارێزێ لەتخلف چنەوانە نەبێ کە استسنا کراون چ بەناوبانگ بن یاخود بەناو بانگ نەبن، لەبەر ئەوە ئەوان پێویست نیە خۆی بپارێزی لێیان، چونکە دەزانرێ کە ئەوانە مەبەست ئین.

(٥) لەبەر ئەوەی باسی نقض وهەڵوەشاندنەوەی کرد ویستی قاعدەیێك لەبارەیەوە باس بکا، کە نقیضی موجبەی جزئیە، سالبەی کلیەیە، وە نقیضی سالبەی جزئیە، موجبەی کلیەیە ئەگەر بەڵگە بەدەست ادعای نمونەیێکی دیاری کراوی کرد واتە شخصیە یاخود ادعای نمونەیێکی نادیاری کرد واتە جزئیە، واتە: بیەوێ إسباتی نمونەیێکی شخصی بکا یاخود جزئی بکا، یاخود بیەوێ نەفی یەکی لەو دووانە بکا

{وبالعكس} اي الاثبات العامّ او النفي العامّ فينتقض بصورة معينة او مبهمة نحو زيد كاتب او انسان ما كاتب يناقضه لاشيء من الانسان بكاتب ونحو زيد ليس بكاتب او انسان ماليس بكاتب يناقضه كل انسان كاتب[1].

{ومنها} اي من القودح {الكسر} هو {قادح على الصحيح لانه نقض المعنى} ... العلل به بالغاء بعضه كما قال {وهو اسقاط وصف من العلة} اي بان يبين انه مع ... بوجود الحكم عند انتفائه ومقابل الصحيح بقول ان ذلك غير قادح وصرح بقد... ليتعلق به الجار والمجرور[2].

---

ئەوە ئەو دەعوایە هەڵدەوەشێتەوە بەاسباتی عامە، یاخود بە نەفی عامە، واتە ئەگەر موجبەی جزئیە بوو دەکە سالبەی کلیەیە، وە ئەگەر سالبەی جزئیەبو، دژەکەی موجبەی کلیەیە، دانەر سەرەتا باسی نەقیضی إسباتی نەفی کرد کە إسباتە، لەبەر نەشری پێچەوانەیە، چونکە لەروی سروشتەوە اسبات لەپێش نەفیەوەیە، تا شت نەبێ چۆن نەفی دەکرێ.

(١) وە پێچەوانەکەشی هەروایە، واتە داوای اسباتی عام و گشتی کرد، یاخود داوای نەفی گشتی کرد، ئەوە هەڵدەوەشێەوە بەشەخسیکی مسبت یا مەنفی، یاخود بەجوزئێکی مسبت یامەنفی، بۆ نمونە دەڵێ: زەید نوسەرە، یاخود ئادەمیزادێکی نوسەرە، دژەکەی بریتیە لە: هیچ ئادەمیزادێك نوسەر نیە، یاوەك: زەید هیچ نوسەرێك نیە، یاخود: ئادەمیزادێك نیە نوسەر بێ، دژەکەی بریتیە لە: هەرچی ئادەمیزاد هەیە نوسەرە.

(٢) دوهەم لەتەعنەدەرەکانی عیلەت بریتیە لە کەسرو شکاندنێك کە بەلای قەوڵی دروست و سەحیحەوە تەعنەدراو عەیبدارکەری عیلەتەکەیە، چونکە ئەو شکاندنە هەڵوەشاندنەوەی مبەستەکە، واتە هەڵوەشاندنەوەی ئەو سیفەتەی کراوە بە عیلەت ئەویش بەپوچەڵ کردنەوەی هەندێکی نەك هەموی، وەك دانەر دەڵێ: شکاندن بریتیە لەلا بردنی بەشێکی سیفەتەکە لە عیلەتەکە، واتە بەم شێوەیە بەیان وڕونی بکاتەوە کە ئەو سیفەتە پوچەڵ کراوەتەوە، چونکە حوکمەکەش هەیە و سیفەتەکەش فەوتاوە، بەم شێوە کە ئەو سیفەتە هیچ تاسیرێکی لە حوکمەکە دانیە. قەوڵی بەرانبەر قەوڵی سەحیح دەڵێ: پوچەڵ کردنەوەی بەشێك لە سیفەتەکە هەمو سیفەتەکە عەیبدار ناکا، دانەر وشەی: قادحی ووتەوە بۆ ئەوەی جارو مەجروری لەفزی علی السحیح تعلقی پێوە بەسێ.

وقوله {اما مع ابد اله} اي الاتيان بدل الوصف بغيره او لا المعلوم من ذكر مقابله بيان الصورتي الكسر {كما يقال في} اثبات صلاة {الخوف} هي {صلاة يجب قصاؤها} لو لم تفعل {فيجب اداؤها كالامن}فان الصلاة فيه كما يجب قضاؤها لوْ لم تفعل يجب اداؤها {فيعترض بان خصوص الصلاة ملغي} ويبين بان الحج واجب الاداء كالقضاء {فليبدل} خصوص الصلاة {بالعبادة} ليندفع الاعتراض و كأنه قيل عبادة الخ[١] {ثمَّ ينقص} هذا المقول {بصوم الحائض} فإنَّهُ عبادة يجب قضاؤها ولا يجب اداؤها بل يحرم[٢]. {او لا يبدل} خصوص الصلاة {فلا يبقي} علة للمستدل {الا} قوله {يجب قضاؤها} فيقال عليه {وليس كل مايجب قضاؤه يؤدي دليله الحائض} فانها يجب عليها قضاء الصوم دون ادائه كما تقدَّمَ[٣].

---

(١) جا دانەر کە دەڵێ: جا یا کەسیفەتەکە لادەبەی لەباتی ئەو شتێکیتر لەجێی دادەنرێ، یاخود لە جێیدا هیچ دانانرێ، کە لەباسکردنی مقابلەکەیەوە دەزانرێ، جا ئەم وتەی دانەرە بەیانی هەردو جۆرو دیمەنەکەی کە سەرو شکاندنە. وەك دەووترێ لەبارەی سەلماندنی نوێژی ترسەوە: نوێژی ترس نوێژێکە پێویستە قەزایکرێتەوە ئەگەر نەکرابێ، لەبەر ئەوە واجبە ئەدا بکرێ و لەکاتی خۆیدا بکرێ، وەك نوێژی کاتی ئارامی و نەبونی جەنگ، چونکە نوێژ لەم کاتەدا وەك پێویستە بەقەزا بکرێتەوە ئەگەر نەکرا بێ واجبیشە ئەدا بکرێ و لەکاتی خۆیدا بکرێ عیلەتەکە لەهەردوکیاندا هەیە جا ڕەخنە گرە ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: لەفزی تایبەتی نوێژ لەناو عیلەتەکەدا پوچەڵ کراوەتەوە،چونکە حەجیش وەك واجبە قەزابکرێتەوە پێویستیشە ئەدا بکرێن کەوابو بەشێ: لەعیلەتەکە شکێنزوا پوچەڵ کرایەوە، جا لەباتی نوێژەکە شتێك دادەنرێ یاخود نە، جالە بەرەنەوە بەتایبەت لەفزی نوێژ دەبێ بگۆڕرێ بەلەفزی عبادەت، بۆ ئەوەی ڕەخنەی لێ نەگیرێ بە حەج وڕۆژوشتەکانیتر،سەر ئەنجام وای لێدێتەوە وەك ووترابێ نوێژی ترس عبادەتێکە واجبە قەزا بکرێتەوە...هتد

(٢) پاشان ڕەخنە گر دەڵێك ئەم قسەش هەڵدەوەشێتەوە بەڕۆژو، ئافەرتی حەیزدار، کە عبادەتێکەواجبە قەزا بکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش واجب نیە ئە دا بکرێ، نەك هەر ئەوەش بەڵکو حەرامە ئەدا بکرێ.

(٣) یاخود نوێژەکە لا دەبرێت و هیچ شتێك لە جێیدا دانانرێ، ئەو کاتە عیلەتێك بەدەست بەڵگەدارەوە نامێنێتەوە جگە ئەوەی نەبێ کە دەڵێ: پێویستە قەزاکردنەوەی ئەو نوێژە، جا ئەگەر هەر ئەوەندەش ووت بەرەخنە لەسەر دێت و دەووترێ: جا خۆ هەرچی واجب بێ قەزای واجب نیە ئە دا بکرێ، بەڵگەش ئافرەتی حەیزدارە، واجبە

وقد عرف البيضاوي كالامام الرَّازي الكسر بعدم تاثير احد جزاي العلة ونقض الآخر وهو منطبق على ما تقدَّمَ بصورتيه[1] وعبر عنه ابن الحاجب كالآمدي بالنقض المكسور وعرفا الكسر بوجود حكمة العلة بدون العلة والحكم ويعبر عنه بنقض المعنى اي الحكمة والراجح انه لا يقدح لانه لم يرد على العلة وَ قيلَ يقدح لاعتراضه المقصود[2] مثاله ان يقول الحنفي في العاصي بسفرة مسافر فيترخص كغير العاصي لحكمة المشقة فيعترض عليه بذي الحرفة الشاقة في الحضر كمن يحمل الاثقال ويضرب بالمعاول فإنَّهُ لا يترخص له[3] {ومنها} اي من القوادح {العكس} اي تخلفه كما سياتي {وهو} اي العكس {انتفاء الحكم لانتفاء العلة[4]}.

---

لەسەری قەزای ڕۆژو نەك ئەدای، وەك لەپێشەوە ڕابورد.

(١) بەيضاوی وەك ڕازی پێناسەی كە سروشكاندنی كردووە كە بريتيە لەوەی يەكێك لە دوبەشەی عيلەت تەئسيرو جێدەستێكی نەبێ و بەشەكەی تریش هەڵوەشێنرێتەوە، ئەم پێناسەيە پڕاو پڕی ئەو كەسرەی پێشەوەيە بەهەردوو بەشەكەيەوە.

(٢) ابن الحاجب وەك ئامیدیٚ بەو كەسرەی پێشەوە دەڵێ: (النقض المكسور) هەڵوەشێنراوێكی داشكاو، هەردوكيان بەم شێوەيە پێناسەی كەسريان كردووە دەڵێن: ئەوە یەحیكمەتەكە وەك مەشەقەت هەبێ، ئەوەی عيلەت و حوكمی هەبێ وەك سەفەر و دروستی نوێژ كورت كردنەوە، ئەم كەسرەش ناو دەبرێ بە هەڵوەشاندنەوەی حيكمەت، قەوڵی پەسەند ئەوەيە ئەم كەسرە عيلەتەكە عەیبدار ناكا، چونكە بەرەخنەو خراپە بۆسەر عيلەتەكە نەهاتووە، بۆسەر حيكمەتەكە حيكمەتی عيلەتەكەيە.

(٣) نمونە بۆ كەسرو شكاندنەوە، وەك ئەوەی حەنەفی بەكەسێك كە بەهۆی سەفەرەكەيە گوناهبار بێ دەڵێ: موسافيرە، لەبەر ئەوەی مسافرە بارسوكی پێ دەدرێ كە كورت كردنەوەی نوێژە، وەك كەسێ كە گوناهبار نەبێ، لەبەر حيكمەتی مەشەقەت و گرانی سەرفەر، ئەمجا ڕەخنەی لێ دەگيرێ ئەی چی ئەكەی لەكەسێك كە خاوەنی پيشەی سەخت و گرانە لەشارداو لەماڵدا، وەك كەسێك پيشەی حەماڵیكردن بێ یاخود پێكوەشاندن بێ، ئەمانە ڕوخسەتيان نادرێ و بارسوكيان بۆ ناكرێ، لەگەڵ ئەوەش مەشەقەتيان هەيە.

(٤) سێهەم لە عەيبدار كەرانی عيلەت تخلفی عەكسە، وەك لەمەوو دوای دێ. خودی عەكسی بريتيە لەوەی: لەبەر نەبونی عيلەت حوكم نەبێ...

..فان ثبت مقابله} وهو ثبوت الحكم لثبوت العلة ابدا المسمى باطرد {فابلغ} في العكسية مما لم يثبت مقابله بان ثبت الحكم مع انتفاء العلة في تبعض الصور لانه في الاول عكس جميع الصور وفي الثاني لبعضها[1] {وشاهده} اي العكس في صحة الاستدلال به اي بانتفاء العلة على انتفاء الحكم {قوله ﷺ} لبعض اصحابه {ارايتم لو وضعها في حرام كان عليه وزر} فكأنهم قالوا نعم فقال {فكذلك اذا وضعها في الحلال كان له اجر في جواب} قولهم {اياتي احدنا شهوته وله فيها اجر} اي الداعي إليه قوله في تعديد وجوه البرو في بضع احدكم صدقة الحديث رواه مسلم استنتج من ثبوت الحكم اي الوزر في الوطء الحرام انتفاؤه في الوطء الحلال الصادق بحصول الأجر حيثُ عدل بوضع الشهوة عن الحرام الى الحلال وهذا الاستنتاج يسمى قياس العكس الاتي في الكتاب الخامس وبادر المصنِّف بافادته هنا مع العكس وان كان المبحث في القدح بتخلفه كما قال[2] .

---

(١) جا ئەگەر مقابلی عەکسەکە سابت بوو، کە ئەویش لەبەر سابت بونی عیلەتەکە حوکمەکە سابت بوو بیٚ، هەمیشەوایە، کە ناویش دەبریٚ بەتەرد، ئەو جۆرە عەکسە لەعکسیەتدا بەهێز ترە لەعەکسێك کە مقابلەکەی سابت نەببو بیٚ و نەبیٚ، بەم شێوە حوکمەکە هەبیٚ لگەلّی ئەوەش عیلەتی نەبیٚ، لە هەندیٚ نمونەدا، چونکە لەیەکەمدا عەکس و پێچەوانەیە هەموو نمونەێیك، بەلاّم لە دوهەمدا عەکسە بۆ هەندێکیان.

(٢) بەلّگە لەسەر ئەوەی کە دروستە بەلّگە هێنانەوە بە تخلفیَ عەکسی واتە نەبوونی عیلەتەکە بکرێتە بەلّگە لەسەر نەبوونی حوکمەکە، ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە بەهەندیٚ لە هاورێیانی فەرموو: پێم بلّێن: ئایا ئەگەر ئەو شەهوەتەی کەلە جیٚ حەرامدادا بنیٚ دەبێتە گوناه لەسەری، وەك ئەوانیش ووتیان: بەلّیٚ، ئەویش فەرموی: ئەمیش وەك ئەوایە، واتە وەك گوناهی هەیە ئەگەر لەحەرامدا دای بنیٚ پاداشتیشی هەیە ئەگەر لەجیٚ حەلاّلدا دای بنیٚ، پێغەمبەر ئەم فەرمودەیە لەوەلاّمی ئەوانەدا فەرموی کە ووتیان: یەکیٚ لە ئێمە ئارەزوبازی خۆی جیٚبەجیٚ بکا چۆن هەر پاداشتی هەیە؟ هۆی کردنی ئەم قسەیانە کە کردیان، ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە بو لە بارەی ژماردن و هەلّدانی ریٚ زۆری چاکە کردن بوو، کە فەرمووی: یەکێکتان لەزەت وەرگریٚ بەلای ژنەکەیەوە صەدەقە و چاکە کردنە. ئەم فەرمودەیە موسلم ریوایەتی کردووە. پێغەمبەر سەرئەنجامی بوونی حوکمەکەی کە: بوونی گوناهە لە جیماعی حەرامدایە، وەرگرت، کەنەبونی ئەو گوناهەیە لە جیماعی حەلاّلدا، ئەویش بە هۆی دەست کەوتنی پاداشتە وە پەیدا دەبیٚ، چونکە بەهۆی دانانی شەهـوەتەکەیەوە

{وتخلفه} اي العكس بان يوجد الحكم بدون العلة {قادحٌ}فيها {عندَ مانع علتي بخلافِ مجوِّزهما لجواز ان يكون وجود الحكم للعلة الأخرى[1] {ونعني بانتفائه اي انتفاء الحكم في قولنا المتقدم انتفاء الحكم لانتفاء العلة {انتفاء العلم او الظن به لانتفاءه في نفسه {اذ لا يلزم من عدم الدليل } الذي من جملته العلة {عدم المدلول} للقطع بان الله تعالى لولم يخلق العالم الدال على وجوده لم ينتف وجوده وانما ينتقي العلم به[2] .

{ومنها} اي من القوادح {عدم التأثير اي ان الوصف لا مناسبة فيه} للحكم {ومن ثم} اي من هنا وهو نفي المناسبة فيه اي من اجل ذلك {اختص بقياس المعنى لاشتماله على المناسب بخلاف غيره كالشبه فلا يتأتي فيه {وبالمستنبطة المختلف فيها} فلا يتأتي في المنصوصة والمستنبطة المجمع عليها[3] .

---

لایداوە لەحەرامەوە بۆحەلاڵ، ئەم جۆرە ئەنجام وەرگرتنانە کە نەبونیحوکمەکەی بەهۆی نەبونی عیلەتەکەوەیە، ناودەبرێ بەقیاسی العکس، کە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا دێ، بۆیە دانەر لێرەدا باسی کرد، چونکە پەلەی کرد بۆ ئەوەی سود بە فێرخوازیگەیەنێ ئەم قیاسە لەگەڵ عەکسەکەیدا مەبەستەکە دەگەیەنێ،هەرچەند ئەم جۆباسە هیطەعنەدان وعەیبداربونی عیلەتەبەهۆی تخلفیعەکسەوە،وەك دانەر دەڵێ

(١) (تخلفی عەکسی) واتە حوکمی بێ عیلەت هەبێ عەیبدار کەری عیلەتە، بەلای ئەو کەسەوە قەبوڵی نەبێ یەك شت دوو عیلەتی هەبێ ، بەڵام کەسێ بەڕەوای بزانێ وانییە ، چونکە ئەگونجێ بوونی ئەو حوکمە لەبەر عیلەتێکی بێ .

(٢) لەپێشەوە کە ووتمان حوکمەکە دەفەوتێ لەبەر فەوتانی عیلەتەکە مەبەستمان بەو فەوتانیحوکمە نەبونی عیلمان یاخود گومانمان بەو حوکمە،نەك مەبەست ئەوەبێ خودی حوکمە کە لەواقیدا فەوتابێ، چونکە پێویستٌ ناکا کە دەلیل نەبو مەدلولیش نەبێ، چونکە پێویست ناکا کەدەلیل نەبوو مەدلولیش نەبێ، کە عیلەتە بەشێکە لە دەلیل، چونکە بێگومان خوای گەورە ئەگەر ئەم جیهانەی دروست نەکردایێ کە بەڵگەی بوونی یەتی بوونی خوا نەدەفەوتا تەنها عیلم بە بوونی خوا. دەفەوتا.

(٣) چوارەم :یەکێکی تر لەوانەی عیلەت عەیبدار دەکەن ئەوەیە صیفەتەکە تەئسیر و جێدەستی نەبێ، واتە صیفەتەکە هیچ جۆرە مناسەو خزمایەتییێکی بەحوکمەکەوە نەبێ کە کراوە بە عیلەتی، لێرەدا لە بەر ئەوەی کە مناسبەو خزمایەتیان لە نێوانیا نیە تایبەت کراوە ئەم جۆری چوارەمەیان بە قیاسی المعنیوە،ئەو قیاسەیە بەعیلەتبونی صیفەتەکەی تێدا سابت بووبێ کەمشترەکە لە نێوان ئەصلێ وفەرعەکەدا

{وهو اربعة} القسم الاول عدم التأثير {في الوصف بكونه طرديا} كقول الحنفية في الصبح صلاة لا تقصر فلا يقدم اذانها كالمغرب فعدَم القصر في تقديم الأذانِ طرديٌّ لامُناسبَةَ فيه ولاشبهَةَ و عدمُ التقديم موجودٌ فيما يُقصرُ وحاصل هذا القسم طلبُ الدليل على عليه الوصف[1] {و} الثاني عدم التاثير في الاصل بإبداء علّةٍ لحكمه {مثل} ان يقالَ في بيع الغائبِ {مبيعٌ غيرُ مرئيّ فلا يصحُّ كالطيرِ في الهواءِ فيقول} المعترضُ {لااثر لكونهِ غيرَ مرئيّ} في الأصلِ {فإنَّ العجزَ عن التسليم} فيهِ {كافٍ} في عدمِ الصّحَةِ و عدمها موجودٌ مع الرؤية {وحاصلهُ معارضةٌ في الأصلِ} بإبداءِ غيرِ ما علّل به بناءً على جواز التعليل بعلتين[2].

---

لەبەر موناسەبە و خزمایەتی بۆیە تایبەت کراوە پێیەوە چونکە صیفەتی مناسبی تێدایە، بەڵام غەیری (قیاس المعنى) وانیە وەك قیاس الشبە، ئەم جۆرە طەعنەی تێدا نابێ، وە تایبەتیشە بە عیلەتێکەوە کە هەڵگۆزراوی ناو دەقەکان بێ وجیاوازی تێدا هەبێ ، لەبەر ئەوە ئەم طەعنی چوارەمە لە عیلەتێدا کە بەڕوتی لە دەقدا باسکرابێ، وە لە هەڵگۆزاویکیشدا کە ڕای هەموی لەسەربێ، چونکە لەم دووانەدا هەر دەبێ مناسبە هەبێ .

(١) نەبونی تەئسیر چوار بەشە: *بەشی یەکەم:* نەبونی تەئسیر و جێ دەستی صیفەتەکە لە حوکمی هەر یەك لە ئەصڵ و فەرعەکەدا،واتە مناسبە لەبەینیاندا نەبێ لەبەر ئەوەی ئەو صیفەتە زیادەیە هیچ جۆرە سودێکی تێدا نیە، وەك زانایانی پەیڕەوی حەنەفی دەڵێن لە بارەی نوێژی بەیانیەوە: نوێژێکە کورت ناکرێتەوە، لەبەر ئەوە بانگەکەی پێش ناخرێ بەسرکاتەکەیدا، وەك نوێژی مەغریب، عیلەتی پێش نەکەوتنی بانگ کورت نەکردنەوەی نوێژەکەیە، ئەمە عیلەتێکی طەردیە چونکە هیچ جۆرە مناسبەتێکی تێدا نیەو هیچ گومانێك نیە کە عیلەتێکی طەردیە، چونکە پێش نەکەوتنی بانگ لەوەشدا هەیە کەکورت دەکرێتەوە، وەك نیوەڕۆ. کورتەی دەست کەوتی ئەم بەشەیە ئەوەیە کە: داوای بەڵگە دەکرێ لەسەر بەعیلەتبونی ئەو صیفەتە

(٢) *دووەم بەش:* ئەوەیە ئەو صیفەتە تەئسیر و جێ دەستی نەبێ لە حوکمی ئەصڵەکەدا، واتە:موناسبە کە لەحوکمی ئەصڵەکەدا نەبێ، بەڵکو عیلەتێکیتر بهێنێ و دەری بخا بۆ حوکمی ئەصڵەکە، وەك ئەوەی لە بارەی کڕین و فرۆشتنی شتێ لە بەرچاو نەبێ و نەبینراو بێ بوو ترێ: ئەمە فرۆشراوێکە نەبینراوە، لەبەر ئەوە دروست نیە و دانامەزرێ، وەك فرۆشتنی باڵندەیێك وایە بەئاسمانەوە بێ، ئەمجارە ڕەخنەگریش دەڵێ: لە حوکمی ئەصڵەکەدا هیچ هێزو ناوو نیشانێك نیە بۆ ئەو

{و} الثالثُ عدمَ التاثير {في الحكم و هو اضربٌ} ثلاثةٌ {لانّه إما ان يكون لذكره} في الوصف الذي اشتملت عليه العلّة {فائدةٌ كقولهم} اي الخصوم الحنفية {في المرتدين المتلفين مالنا في دار الحرب حيثُ استدلُوا على نفي الضّمان عنهم في ذلك {مشركو اتلفوا مالاً في دار الحرب فلا ضمانَ} عليهم {كالحربيّ} المتلفِ مالنا {ودار الحرب عندَهم} اي الخصوم {طرديٌ فلا فائدة من ذكره إذ من اوجب الضّمان} من العلماء في إتلافَ المرتد مال المسلم كالشافعيّة {اوجبهُ وان لم يكن} اي الإتلاف {في دار الحرب و كذا من نفاهُ} منهم في ذلك كالحنفيّة نفاهُ وان لم يكن الإتلافُ في دار الحرب اي سوء أكان في دار الحرب ام في دار الإسلام في الشقين[1] .

بەڵگەیە بووتریٚ: لەبەر ئەودی ئەو باڵندەیە نەبینراوە، چونکە هەر ئەوەی توانای ئەوەی نیە بیداتە دەست بکرەکە ئەوەبەسە بۆ نادروستی ئەو مامەڵەیە، لەگەڵ ئەوەش عەیبدار کردنێکی تری تێدایە کە (تخلف العكس)ە ، واتە باڵندەکەش ببینی هەر دروست نیە. کورتە و پاڵفتەی بەشی دووەم ئەوەیە قەبوڵی ئەوە نەکریٚ ئەو صیفەتە لە تئەصڵەکەدا هەیە، بەڵکو عیلەتێکی تر بهێنیٚ و بیکابە عیلەت، ئەم قبوڵ کردنە لەسەر ئەوە دروست دەبیٚ کە دروستە یەك حوکم دو عیلەتی هەبیٚ

(١) *سیٚ هەم بەش:* ئەوەیە ئەو صیفەتە هیچ تەئسیر و جیٚ دەست و نیشانەیکی نەبیٚ نە لەحوکمی ئەصڵیدا وە نە لەفەرعیدا، چونکە مناسبەنیە، ئەمەش دەبیٚ بەسێ بەشەوە چونکە : یا باسکردنی ئەو صیفەتەی کە (دار الحرب) کە عیلەتەکە دەیگرێتەوە هیچ سودێکی نیە، وەك زانایانی نەیار لە پێڕەوانی حەنەفی دەڵێن: لە بارەی ئەوانەی پاشگەزبونەتەوە لە ئیسلام و لە (دار الحرب) ماڵوسامانی ئێمە یان فەوتانووە، کە بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر ئەوە ئەوانە ضامنی ئەو ماڵ و سامانە نین: ئەو موشریکانەی لە (دار الحرب)دا سامانی موسڵمانانیان فەوتاندووە زەمانەتیان نەکرد، وەك جەنگاوەرێکی کافرەوان کە ماڵی ئێمەی فەوتاندبیٚ، ووشەی (دار الحرب) بە لای نەیارانەوە کەحەنەفین، شتێکی طردیە هیچ سودێك نیە لە باسکردنەکەیدا، چونکە ئەو زانایانەی وەك شافعیەکان کەزەمانەتیان واجب کردوە لەسەر پاشگەزبووە لە ئیسلام کاتیٚ کە ماڵی موسڵمان بفەوتێنیٚ چ لە (دار الحرب)دا بیٚ، یاخود لە غەیری (دار الحرب)دا بیٚ، با لە (دار الحرب)یشدا نەبیٚ هەر زامنی دەبیٚ، هەروەها ئەو زانایانەش لە پەیڕەوانی حەنەفی کە دەڵێن: زامن نابیٚ، با ئەو لەناودانی ماڵ و سامانەش لە (دار الحرب)دا نەبیٚ، واتە چ لە(دار الحرب)دا بیٚ یا لە(دار الحرب) نەبیٚ .

و المناسب لقوله عندهم شقُّ النفي كما اقتصر عليه غيرهُ وزاد هو شقَّ الإثبات تقويةً للإعتراضِ وبدا به لتقدُّمهِ على النَّفي[١] . {ويرجعُ} الإعتراضُ في ذلك {الى} القسم {الأوّل} لأنَّهُ اي المعترض {يطالِبُ} المستدلَّ {بتاثيرِ كونه} اي الإتلاف {في دار الحربِ لو يكونَ لهُ} اي لذكر الوصفِ المشتمل عليهِ العلَّةُ {فائدةٌ ضروريَّةٌ كقول معتبر العددِ في الإستجمارِ بلأحجارِ عبادةٌ متعلّقةٌ بلأحجارِ لم يتقدَّمها معصيَّةٌ فاعتبرَ فيها العدد كالجمارِ فقوله لم يتقدَّمها معصيَّة عديم التاثير في الأصلِ و الفرع لكنه مضطر الى ذكره لئلا ينقض} ما علل به لو لم يذكر فيه {بالرجم} للمحصن فإنَّهُ عبادة متعلقة بالاحجار ولم يعتبر فيها العدد[٢] .

---

یاخود لە دار الحربدا نەبێ، بۆ هەردولا، چ بۆ ئەوانەی دەڵێن: زامن دەبێ، وەچ بۆ ئەوانەی دەڵێن: زامنی نابێ.

(١) مناسب و گونجاو لە گەڵ ئەوەی دانەردا ووتی: (عندهم) واتە بەلای زانایانی نەیارەوە، لقی نەفیەکەیە، وەك چۆن غەیری ئەوان تەنها لقی نەفیەکەیان باس کردووە، بۆیە دانەر لقی اثباتە کەشی زیاد کردووە بۆ ئەوەی ڕەخنە گرتنەکە بەهێز بکا، واتە ووشەی (دار الحرب)بەلای ئەوانەوە نەفی زەمانەت ئەکەن ئەرزشی هەیە، وە نە بەلای ئەوانەوە ئیسباتی ئەکەن . بۆیە سەرەتا باسی اسباتەکەی کرد، چونکە لەڕوی سروشتەوە موسبەت لەپێش مەنفیەوەیە، تاشت نەبێ چۆن نەفی دەکرێ .

(٢) ئەو ڕەخنە گرتنە لەبەشی یەکەم دا دەگەڕێتەوە بۆ بەشی سەرەکی یەکەم، چونکە ڕەخنەگرەکە لە بەڵگەبەدەستەکە داوا دەکا ئەو ماڵ و سامان لەناو بردنە لە (دار الحرب) دا دەبێ تاثیرو جێ دەست هەبێ، یاخود باسکردنی ئەو صیفەتەی کە عیلەتەکە دەیگرێتەوەو بەشێکە لەعیلەتەکە سوودو قازانجێکی بەڵگەنەویستی هەبێ وەك ئەو کەسەی بەبەرد تارەت دەگرێ و ژمارەی تاکی بەردەکانی لا گرنگە وئەرزشی هەیە دەڵێ: ئەم تارەتە عبادەتێکە پەیوەندە بە بەردەوە بەشوێن گوناهدا نەهاتووە، لەبەر ئەوە تاکی ژمارەی تێیدا ئیعتبار کراوە، وەك بەردی شەیتان ڕەجم کردن، جا کە دەڵێ: بە شوێن گوناهدا نەهاتووە نە لەحوکمی ئەصڵەکەدا وە نە لە فەرعەکەدا تەئسیرو جێیدەست و نیشانەیکی نیە، بەلام لەگەڵ ئەوە ناچارە هەردەبێ باسیشی بکا، لەبەر ئەوەی ئەوەی کراوە بەعیلەت ئەوەی تێدا باس نەکرێ هەڵدەوەشێتەوە بەڕەجم کردنی کەس کە جیماعی حەڵاڵی کردبێ، چونکە ئەم ڕەجمە عبادەتێکە پەیوەندە بە بەردیشەوە ، لەگەڵ ئەوەش ژمارە تێدا ئەرزش و بەهایێکی نیە.

{او غير ضرورية فان لم تغتفر الضرورية} بأن سح الاعتراض بمحلها {لم تغتفر هذه بطريق الاولى {والاتفرد} اي وان اغتفرت الضرورية فقيل يغتفر غيرها ايضـ وَ قِيلَ لا[1] . {مثاله الجمعة صلاة مفروضة فلم تفتقر} في اقامتها {الى اذن الامـم الاعظم {كالظهر فان مفروضة حشو اذ لو حذف} مما علل به {لم ينتقض} اي الباقي منه {بشيء لكنه ذكر لتقريب الفرع من الاصل بتقوية الشبه بينهما الذا الفرض بالفرض اشبه} به من غيره[2] .

{الرابع} عدم التاثير {في الفرع} مثل ان يقال في تزويج المراة نفسها {زوجت نفسها بغير كفء فلا يصح كما لو زوجت} بالبناء للمفعول اي زوجها الولي بغير كفء {وهو اي الرابع {كالثاني اذ لا اثر} في مثاله {للتقيد بغير الكفء} فان المدعي ان تزويجها نفسها لا يصح مطلقاً كما لا اثر للتقييد في مثال الثاني بكونه غير مرئي وان كان نفي الاثر هنا بالنسبة الى الفرع وهناك بالنسبة الى الاصل[3] .

---

(١) یاخود سودی هەیە بەڵام پێویست نیە، جا ئەگەر ئەو پێویستیە چاو پۆشی و نەدەکرا بەم شێوە کە دورست بو ڕەخنە بگیرێ لەسەر شوێنەکەی ئەوە ئەم باشتر چو پۆشی لێ ناکرێ، وە ئەگەر ئەو زەروریە چاوپۆشی لێ دەکرا ئەوە هەندێ ووتویانە چاو پۆشیی لە غەیری ئەو حزوریەش دەکرێ، دوبارە، هەندێکی تر ووتویانە چاوپۆشی لێناکرێ .

(٢) نمونەکەشی وەك بووترێ! نوێژی هەینی بێگومان پێویست کراوە، لەبەر ئەوە پێویست ناکا بۆ جێ بەجێ کردنی و بەرپاکردنی مۆڵەتی پێشەوای هەرە گەورە،چونکە وەکو نیوەڕۆ وایە، ئێستە ووشەی: بێگومان پێویست کراوە زیادەیە ئەگەر لابرێ لەوڕەستەی عیلەتی پێ هێنراوەتەوە هیچ شتێکی ئەوی تری هەڵنەدەوەشایەوە، بەڵام بۆیە ووتراوە بۆ زیادتر نزیك خستنەوەی فەرعەکە لە ئەصلە بەهۆی بەهێزکردنی شوبهەکە لە نێوانیاندا، چونکە فەرز بشوبهێنی بە فەرزەوە بەهێزترە لەوەی فەرز بشوهێنی بەغەیری فەرزەوە .

(٣) *چوارەم بەش:* ئەوەیە جێ دەست و ناو ونیشانەی نەبێ لەفەرعەکەدا، بۆ وێنە وەك ئەوەی بوترێ لە بارەی ژنێکەوە خۆی مارەبڕی لە پیاوێك: خۆی مارە بڕیبێ لە پیاوێك هاوشانی خۆی نەبێ دورست نیە، وەك چۆن دروست نیە ئەگەر خاوەنەکەی مارەی ببڕێ لە پیاوێك کە هاوشانی نەبێ ، ئەم چوارەمە وەك دوهەمەکە وایە، چونکە هەر لە یەکلادا نیە، لێرە لەفەرعدا و لەوێ لە ئەصڵدا، چونکە ئەو غەیری هاوشان نەبونە هیچ جێ دەست و نیشانەیێکی نیە ، چونکە ئەوەی ئارەزوو مەبەستە ئەوەیە :

{ويرجع} هـذا {الى المناقشـة في الفـرض وهـو} اي الرفـرض {تخصيـص بعـض صـور النزاع بالحجاج} كما فعل في المثال المذكور اذالمدعي فيه منع تزويج المرأة نفسها مطلقاً والاستدلال على منعه بغير كفء {والأصَحّ جوازه} اي الفرض مطلقاً وَ قِيلَ لا[1] . {وثالثها} يَجوزُ {بشرط البناء اي بناء غير محل الفرض عليه} كأن يقا س عليه بجامع او يقال ثبت الحكم في بعض الصور فليثبت في باقيها اذلا قائل بالفرق وقد قال به الحنفة في المثال المذكور حيثُ جوازوا تزيجها نفسها من كفء[2] .

---

كە خـۆ مـارەبڕینی بـەهیچ جۆرێـك دروسـت نیـە، هاوشـانی بـێ یانـا، وەك لەبەشـی دوهـەمدا لكاندی ووشـەی: نەبینراو هیـچ جـۆرە جـێ دەسـت و نیشـانەیێکی نـەبوو، هەرچەند ئەوەندە جیاوازی هەیە لێرەدا لە حوکمی فەر عەكەدا نیە لەویش لە حوکمـی ئەصڵە کەدا نیە.

(١) ئـەم بەشـی چوارەمـە دەگەڕێتـەوە بـۆ موناقەشـەی فـەرز کەبریتیـە لـەوەی: هـەندێ یابەشێ لـە دیمـەنی ئـەوەی دەمـەقاڵێ لەسـەرە تایبـەت بکـرێ بـە بەڵگـەوەو بەڵگەی بۆ بهێنرێتـەوە ئـەویتری واز لێ بـهێنرێ، وەك لـەو نمونـەی باسـکرا، چونکـە مەبەستەکە تێدا: قەدەغە کردنی ژنە لەوەی خۆی مارەببڕێ چ هاوشـانی بـێ یاهـاو شـانی نـەبێ، لەگـەڵ ئـەوەش بەڵگـە هـەر لەسـەر ئـەوە دەهێنرێتـەوە کـە نـابێ خۆی مارەبکا لـە کەسێ هاوشانی نەبێ، قەولی اصح ئەوەیە کـە فـەرز دروسـتە بـێ ئەوەی مەرجی بۆ دانرێ، چونکە مەبەستێکی دروست دێتـەدی، کە بریتیـە لـەوەی لـە هـەندێ دیمـەندا ڕەخنە لادەبـرێ. هـەندێك ووتویانـە: مـەرج بێتـە دی یـا نەیێتـە دی هەر دروست نیە.

(٢) قـەولی سـێیەم ئەوەیـە کـە دروسـتە بـەڵام بـەو مەرجـەی بینـای غـەیری نمونەی فەرزكە دروست بکرێ لەسـەر نمونـەی فەرزەکە، بەم شێوە بەهۆی عیلەتێکە کە هـەردوکیان کۆدەکاتـەوە قیاسـی بکرێتـە سـەرفەرزەکە، یـاخود بـە شـێوەیێکیتر بووتـرێ، حوکمەکـە لـە هـەندێ ڕووەوە سـابت بـووە کـە دروسـت نەبونـە لـە غـەیرە کوفئـدا بابۆ ئەوانی تریش سابت بێ، چونکە هیـچ کـەسێ نـەی ووتـووە ئـەم دوانـە فـەرقیان هەیە، چونکە بۆ هاوشـانی خـۆی نـەبێ هەردروسـت نیـە، بـەڵام لەنمونـەی پێشـەوەدا زانایانی پـەیڕەوی حەنـەفی فـەرقیان خسـتون چونکـە ووتویانـە: دروسـت خۆی مارە ببڕێ لـە هاوشـانی خـۆی، وە ووتویانـە: دروسـت نیـە خـۆی مـارە بـبڕێ لە کەسێ هاوشانی خۆی نەبێ.

{ومنها} اي من القوادح {القلب وهو دعوى} المعترض {ان ما استدل به} المستـ {في المسئلة} المتنازع فيها {على ذلك الواجه} في كيفية الاستدلال {عليه} اي عـ المستدل {لا له ان صح} ذلك المستدل به[1] {ومن ثم} اي من هنا وهو قولنا ان صح اي من اجل ذلك {امكن معه} اي مع القلب {تسليم صحته} اي صحة ما استدل به و {قيلَ هو} اي القلب {تسليم الصحة مطلقا} اي صحة ما ساتدل به سواء كان صحيحـ ام لا {وَ قيلَ } هو {افساد} له {مطلقا} لان القالب من حيثُ جعله على المستدل مسـ لصحته وان لم يكن صحيحا ومن حث لم يجعله له مفسد له وان كان صحيحا وعلى كلا القولين لا يذكر في الحد قوله ان صح[2] . {وعلى المختار} من امكان التسليم مع القـ {فهو مقبول معارضة عند التسليم قادح عند عدمه}[3] .

---

(١) پێنجەم: یەکێکی تر لەوانەی عەیبدارکەری عیلەتە ناوی: قلبە، جێ گورکێیـ وانە هەربە بەڵگەکەی خۆی بەرانبەر دەم کوت کـەی، قـەلب بریتیـە لـەوەی: ڕەخـ گرەکە بڵێ: ئەوەی کە تۆ لـەم بابەتـەیدا کەدەمەقاڵـەمان لەسەریەتی کردو نەبەبەڵگە ئەگەربەو شێوەبێ کە تۆدەیڵێت ئەوە دژ بە تۆیە، نەك لەبەرژەوەندی تۆیـە، ئەمـ کاتێ وایە ئەوەی کراوە بە بەڵگە دروست بێ.

(٢) لێرەوە بۆمـان دەردەکـەوێ، ئـەوەی کـەووتمان: ئەگـەر ئـەو بەڵگـە ڕاسـت بـ قسەکەت دەفەوتێنێ دەگونجێ بۆ ڕەخنەگر لەگەڵ ئەوەش قەلبی تێدایە بڕوای هـ بەدروستی ئەوبەڵگەیە بەڵگە بەدەستەکە هێناویەتەوە. هەندێك وتویانە:خودی قـ بڕوابوونە بەدروستی بەڵگەی بەڵگە بەدەست ئیتر کەیفی خۆیەتی لەواقیعدا بەڵگەکە دروست بێ یاخود دروست نەبێ، چونکە ئەگـەر دروسـت نـەبێ چۆن ئـەم دیکەیتـەوە بەگژی ئەودا. هـەندێکیتر ووتویانـە: قـەلب کرمـۆڵ کـەرو خرابکـەری بەڵگـەی بەڵگـ بەدەستـە چ بەڕاستی بزانـێ وەچ بەڕاسـتی نـەزانی، چونکە ئـەوەی قەلبەکە دەکا لـە ڕووەوە دەیکاتەوە بەڵگەو دەیکاتەوە بەگژ خاوەن بەڵگەکەدا ئەوە بڕوای بەدروستی بەڵگەکەی هەیە، هەرچەند لەواقیعدا دروستیش نەبێ، لەو ڕووەشەوە نـەی کردووە تـ بەڵگە بۆ گرمۆڵ کەرو خرابکەری قەلبەکەیە، هەرچەند لـەواقعدا ئەو قەلبـە دروسـتیش بێ، لەسەر ئەم دوو قەولە لە پێناسەی قەلبدا نابێ باسی ووشەی إن صح بکرێ.

(٣) لەسـەر قـەولی هـەڵبژێراو کەدەسـتدانە بـۆ بـڕوا بـون بـە بەڵگـەکـەش و قـەلب کردنیشە، قەلب لە کاتی بڕوابون بە بەڵگەی بەرانبەر قەبۆڵ کراوە، چونکە بە بەڵگەی حسێب کردووە، بەگژا چونەوەشە، چونکە نـەیاری کردووە بەڵام کاتێ بڕوای نـەبێ بەدروستی بەڵگەکەی قەلب هەڵوەشێنەرەوە و عەیبدارکەری عیلەت و بەڵگەیە.

وَ قِيلَ هو {شاهد زور} يشهد {لك وعليك} ايها القالب حيثُ سلمت فيه الدليل واستدلت به على خلاف دعوى المستدل فلا يقبل[1] {وهو قسمان الاول لتصحيح مذهب المعترض في المسئلة اما مع ابطال مذهب المستدل} فيها {صريحا كماً} يقال من جانتب المستدل كالشافعي {في بيع الفضولي عقد} في حق الغير بلا ولاية عليه {فلا يصح كالشراء} اي كشراء الفضولي فلا يصح لمن سماه {فيقال} من جانب المعترض كالحنفي {عبد فيصح كالشراء} اي كشراء الفضولي فيصح له وتلغو تسميته لغيره وهو احد وجهين عندنا[2] {اولا} مع الإبطال صريحا {مثل} ان يقول الحنفي المشترط للصوم في الاعتكاف {لبث فلا يكون بنفسه قربة كوقوف عرفة} فإنَّهُ قربة بضميمة الاحرام فكذلك الاعتكاف يكون قربة بضمية عبادة إليه وهي الصوم اذ هو المتنازع فيه[3] .

---

(١) هەندێکیش ووتویانە، قەلب گەواهی وشاهیدی بە درۆ دانە، واتە ئەی ئەو کەسەی قەلب دەکەی قەلب دەمێ شاهیدیت بۆ دەدان وە دەمێ شاهیدیت لەسەر دەدات، چونکە جارێ بڕوا دەکەی بەو بەڵگەی لە قەلبەکەدایە، جارێکی تریش دەیکەیتە بەڵگە لەسەر پێچەوانەی مەبەستی بەڵگە بەدەست، مادەم قەلب شاهیدێکی دوڕویە قەبوڵ ناکرێ.

(٢) قەلب دوبەشە بەشی یەکەم بۆ ڕاست کردنەوەو بەڕاست زانینی بۆچونی ڕەخنە گرەکەیە لەوبابەتەدا، جایا پوچەڵ کردنەوەی بۆچونی بەڵگە بەدەستەکەشی بەڕونی لەگەڵدایە، وەك لەلایەن بەڵگە بەدەستەوە کە شافعیە بارەی فرۆشتنی فزولیە وە دەووترێ: ئەوە گرێ بەستێکە لە حەقی غەیردا کراوە بێ ئەوەی دەسەلاتی شەرعی هەبێ بەسەریەوە، لەبەر ئەوە دروست نیە، وەك کرینی فزولی دروست نیە و دانامەزرێ بۆ ئەوەی ناوی بردووە. ئەمجالە لایەن ڕەخنە گریشەوە دەووترێ: ئەوە گرێ بەندێکە دروستە وە کرینی فزولی دروستە. بۆ خۆی مامەڵە کە دادەمەزرێ و ناوبردنەکەی بۆ غەیری خۆی پوچەڵ دەبێتەوە، ئەمەش یەکێك لەو دو بۆچونەی لای ئێمەی شافعی مەزهەبە.

(٣) یاخود لەگەڵ پوچەڵ کردنەوەی بۆچونی بەرانبەرەکە بەڕونی نەبێ، وەك ئەوەی حەنەفی کەبەمەر جی گرتووە بۆ اعتکاف و مانەوە لە مزگەوتدا ڕۆژو بوونیش، دەڵێ: اعتکاف مانەوە پێکە لە مزگەوتدا خودی خۆی نابێتە هۆی نزیك بوونەوە لە خودا، وەك وەستان بە عەرەفەوە وایە، ئەویش هۆی نزیك بونەوەویە لە خواوە بەلام دەبێ احرام پۆشیشی لەگەڵدا بێ، اعتکاف کردنیش وەهایە کاتێ دەبێتە هۆی نزیك

{فيقال} من جانب المعترض كالشافعي الإعتكاف لبث {فلا يشترط فيه الصوم كعرفة} لا يشترط الصوم في وقوفها ففي هذا ابطال لمذهب الخصم الذي لم يصرح به في الدليل وهو اشتراط الصوم[1]

{الثاني} من قسمي القلب القلب {بطال مذهب المستدل بالصراحة} كان يقول الحنفي في مسح الراس {عضو وضوء فلا يكفي} في مسحه {اقل ما ينطلق عليه الاسم كالوجه} لا يكفي في غسله ذلك {فيقال} من جانب المعترض كالشافعي عضو وضوء {فلا يتقدر غسله بالربع كالوجه}لايتقدر غسله بالربع[2]{او بالالتزام}كأن يقول الحنفي في بيع الغائب {عقد معاوضة فيصح مع الجهل بالموّض كالنكاح} يصح مع الجهل بالزوجة اي عدم رؤيتها..[3] .

---

بونەوە لەخوا، وەك وەستا بەعەرەفەوەو وايە، ئەویش هۆی نزیك بونەوەیە لە خواوە بەلاّم دەبیّ احرام پۆشیشی لەگەلّدا بیّ، اعتكاف كردنیش وەهایە كاتیّ بیّتە هۆی نزیك بونەوە پەرسشێكی تری لەگەلّدابیّ كەڕۆژوە، بۆیە دەلّێم ڕۆژوە، چونكە دەمەقالّێكە لەسەر ڕۆژوە، چونكە پەرسش لە فزێكی گشت گیرە .

(١) جا لەلایەن ڕەخنە گرەوەكە شافعیە دەووترێت: اعتكافمانەوەێكە لەمزگەوت بەمەرج نەگیراوە ڕۆژی تێدا بیّ، وەك عەرەفە بەمەرج نەگیراوە ڕۆژبون لەڕۆژی وەستان لە عەرەفەدا، لەمەدا پوچەلّ كردنەوەی بۆچوونی نەیارەكە لەبەلّگەكەیدا بەڕوونی بۆچوونەكەی خۆی نەووتوە، بەلّكو لێوەی لازم دێ . لەمە داپۆچەلّ كردنەوەی بۆ چونی نەیارەكە لە بەلّگەكەیدا بەڕونی بۆ چونكەی خۆی نەووتووە.

(٢) دووهەم لەدو بەشی قەلب ئەو قەلبەیە كە بەڕونی بۆچون و ڕای بەلّگە بەدەست پوچەلّ دەكاتەوە، وەك ئەوەی حەنەفی بلّیّ: مەسحیسەر ئەندامێكی دەست نوێژە كە وابوو بەس نیە بۆ مەسحی سەر كەمترینی ئەندازەی سەرمەسح بكریّ كەناوی سەری بەسەردا دەبریّ، وەكو دەموچاو وایە، چۆن ئەم ئەندازێك بشۆری بەس نیە هەرچەندە بەدەم و چاو ناودەبریّ، ئەمجا لەلایەن ڕەخنەگرەكەوە كەشافعیە دەوتریّ سەر ئەندامێكی دەست نوێژە لەبەر ئەوە ئەندازەی شۆردنەكەی بەچارەكێك دیاری ناكریّ، وەك دەموچاو وایە، چۆن ئەم شوردنەكەی دیاری ناكریّ بە چارەكێك سەریش هەروایە .

(٣) یاخود پو چەلّ كردنەوەی بۆ چونی بەرانبەری لێوە پەیدا بیّ، وەك ئەوەی حەنەفی لەبارەی شتێكەوە لە بەردەمدانەبیّ و بیفرۆشیّ بلّیّ: ئەو گریّ بەندێكە ئەم شتیّنەداو ئەویش لەباتی شتیّ وەردەگریّ، ئەمە لەگەلّ ئەوەشی ئەوەی وەری دەگریّ

{فيقال} من جانب المعترض كالشافعي {فلا يشترط} فيه {خيار الرؤية كالنكاح} ونفي الاشتراط يلزمه نفي الصحة اذ القائل بها يقول بالاشتراط[1] .{ومنه} اي من القلب فيقبل {خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني في رده {قلب المساواة مثل} قول الحنفي في الوضوء والغسل {طهارة بالمائع فلا تجب فيها النية كالنجاسة} لا تجب في الطهارة عنها النية بخلاف التيمم تجب فيه النية[2] . {فنقول} نحن معترضين {فيستوى جامد ها ومائعها} اي الطهارة {كالنجاسة} يستوى جامدها ومائعها في جكمها السابق وغيره وقد وجبت النبية في التيمم فتجب في الوضوء والغسل ووجه التسمية بالمساواة واضح من المثال والقاضي يقول في رده وجه استدلال القالب فيه غير وجه استدلال المستدل[3] .

---

نازانێ کامیه هەر گرێ بەندەکە دروستەو دادەمەزرێ، وەك مارەبڕینی وایە هەرچەند ژنەکەشی نەناسێ هەر دادەمەزرێ، واتە: نەی بینیوە،

(١) ئەمجا لەلایەن ڕەخنە گرەوە کە شافعیە دەووترێ: بۆ فرۆشتنی شتێ لە بەردەمدا نەبێ بەمەرج نەگیراوە دامەزراندنەکەی بخرێتە کاتی بینینی ئیتر ئارەزوی دەکا ئەوە دادەمەزرێ وە ئەگەر ئارەزوشی نەبێ پۆچەڵ دەبێتەوە، چونکە وەك مارەبڕین وایە، ئەمەی کە دەڵێ ئەو بە مەرج گرتنە مەرج نیە لێوەی لازم دێ کە دروستیش نیە، چونکە ئەوەی کەدەڵێ دروستە ئەوە دەڵێ: بەمەرج گیراوە.

(٢) بە شێکە لەقەلب (قلب المساواة)ە، کە ئەوەیە لە ئەصڵەکەدا دووحوکم هەبێ، یەکێکیان بەڕای هەموان لە فەرعەکەدا نەبێ، ئەویتریشیان ڕای جیاوازی تێدابێ ئەو جۆرە قەلبە قەبوڵ دەکرێ، بە پێچەوانەی باقلانیەوە کە بەرپەرچی دەداتەوەو قەبوڵی نیە. وەك حەنەفی لەبارەی دەست نوێژ و خۆشۆردنەوە دەڵێ: تارەت بە شلەمەنیەوە بیگرێ واجب نیە نیەتی بۆ بینی، چونکە وەك پیسی وایە واجب نیە کاتی پیسی دەشۆرێ نیەتی پاك کردنەوە بهێنرێ، بەلأم تەیەموم وانیە ئەو واجبە نیەتی تێداهەبێ.

(٣) ئێمەیش کە ڕەخنەگرین و شافعی مەزهەبین دەڵێین: خۆ پاك کردنەوە بۆ پەرستش چ بەووشك بێ یا بەتەڕ بێ چون یەکن، وەك پاك کردنەوەی پیسی وایە تەڕوو وشك یەکسانە، واتە تەیموم و خۆ شوردن چون یەکن لە نیەتدا، خۆنیەت لە تەیەمومدا واجب بوو، بەڕای ئێوەش، کە وابوو واجبیشە لە دەست نوێژو خۆشوردنیشدا بۆیە ناویش نراوە بەموساوات، چونکە هەر لە نمونەکە بەڵگەکە وەردەگیری، چونکە تەڕو ووشکی تەهارەتەکە یەکسانن . باقلانیش لە بارەی

{ومنها} اي من القوادح {القول بالموجب وشاهد} قوله تعالى {﴿ ولله العزة ولرسوله ﴾ في جواب:﴿ ليخرجنّ الأعزُّ منها الاذلّ ﴾}المحكي عن المنافقين اي صحيح ذلك لكن هم الاذل والله ورسوله الاعز وقد اخرجاهم {وهو تسلم الدليل مع بقاء النزاع بان يظهر عدم استلزام الدليل لحل النزاع[1] {كما يقال في} القصاص بقتل {المثقل من جانب المستدل كالشافعي {قتل بما يقتل غالبا فلا ينافي القصاص كالاحراق بالنار لا ينافي القصاص [2]. {فيقال} من جانب المعترض كالحنفي {سلمنا عدم المنافاة} بين القتل بالمثقل وبين القصاص {ولكن لم قلت} ان القتل بالمثقل {يقتضيه} اي القصاص وذلك محل النزاع ولم يستلزمه الدليل[3].

---

قەبوڵ نەکردنی قەلبی موساواتەوە دەڵێ: چونکە بەڵگەی قەلب کەرو بەڵگە بە دەستەکە عیلەتی هەردولا تەهارەتە بە شلەمەنی، دەئەمە جیاوازە لە گەڵ بەڵگەی ڕەخنە گر، کە بریتیە لە تەهارەت ئیتر بە شلەمەنی بێ یا بە شتیتر بێ، لەبەر ئەوە یەکسان نین.

(١) *شەشەم:* یەکێك لەوانەی عیلەت تەعن ئەکەن و عەیبداری دەکەن قەول کردن بەدان نانە بەوەی بەڵگەکە داخوازی دەکا، گەواهی لەسەر ئەوەی ئەم جۆرە عەیبدارکردنە ئەرزشی هەیە، ئەم ئایەتەیە خوای گەورە دەفەرموێ: هەر بۆ خوایە دەسەڵات و گەورەیی و بوڵندی وە بۆ پێغەمبەرەکەشیەتی...، لە وەڵامی ئەوەی دوو ڕووەکان بەموسڵمانەکانیان ووت: سوێندبێ گەورە دەستەڵات دار دەبێ لەمەدینەدا ڕسواو بێ دەسەڵات دەربکا. واتە ئەمە ڕاست و دروستە، بەڵام ڕیسوا ئەوانن و گەورەو دەسەڵاتدار خواو پێغەمبەرن، بێگومانیش دوڕووەکانیش وەدەرنان داخوازی بەڵکەش ئەوەیە کە: بڕوات هەبێ بەڵگەکە ڕاستە لەگەڵ ئەوەش کێشەکە هەر بەردەوام بێ، بەم شێوە دەرکەوێ کە: دەلیلەکەی لازمی جێ کێشەکە نیە .

(٢) وەك شافعی لەبارەی کوشتنەوەنێك بەهۆی تێلاوە بوبی دەڵێ، ئەوە کوشتنێکە بە شتێك کە زۆربەی کات ئامێری کوشتنە، لە بەر ئەوە لەگەڵ کوشتنەوەدا دژی یەك نین،وەك چۆن کوشتنی بەهۆی سوتاندنەوە لەگەڵ کوشتنەوەدا دژایەتیان نیە .

(٣) ئەمجا لە لایەن ڕەخنە گرەوە دەووترێ: ئێمە بڕوامان هەیە کە دژایەتی لەنێوان کوشتنی بە تێلاوە نیە لە گەڵ کوشتنە وەدا، بەلام بۆ دەڵێت: کوشتن بە تێلاوە کوشتنەوە دەخوازێ؟ ئەمەش جێ کێشەکەیە و لەبەڵگەکەوە وەر ناگیرێ.

{وكما يقال} في القصاص بالقتل بالمثقل ايضا {التفاوت في الوسيلة} من آلات القتل وغيره {لا يمنع القصاص كالمتوسل اليـه} من قتل وقطع وغيرها لا يمنع تفاوته القصاص[1] . {فيقال} من جانب المعترض {مسلم} ان التفاوت في الوسيلة لا يمنع القصاص فليس بمانع منه {و} لكن {لا يلزم من ابطال مانع انتفاء الموانع و وجود الشرائط والمقتضى} وثبوت القصاص متوقف على جميع ذلك[2] .

{والمختار تصديق المعترض في قوله} للمستدل {ليس هذا} اي الذي نفيته باستدلالك تعريضا بي من منافاة القتل بالمثقل بالقصاص {ماخذي} في نفي القصاص به لان عدالته تمنعه من الكذب في ذلك[3] وَ قِيلَ لا يصدق إلاّ ببيان ماخذ آخر لانه قد يعاند بما قاله[4] .

---

(١) نمونەيەكى‌تر وەك ئەوەی لەبارەی كوشتنەوەيێكەوە بەهۆی تێلاوە بوبی دوبارە بووترێ: جياوازی لە هۆكارەكەدا وەك: ئامێرەكانی كوشتن و غەيری كوشتن ڕێ لە كوشتنەوە ناگرێ، وەك: سەر ئەنجامی بەكارهێنانی ئامێرەكە كە كوشتن و پەل پەل كردن و غەيری ئەمانەيە ، ئەم جياوازيانە ڕێ لە كوشتنەوە ناگرن.

(٢) ئەمجا لە لايەن ڕەخنە گرەوە دەووترێ: شتێكی سەلمێنراوە كە جياوازی لە هۆكاردا ڕێ كوشتنەوە ناگرێ، لەبەر ئەوە ئەوجياوازيە بەڕێ گر حسێب ناكرێ، بەلام پێويست ناكاكە يەك ڕێگرت پۆچەڵ كردەوە هەرچی ڕێگر هەيە نەماوە و فەوتاوە و هەمو مەرجو داخوازێيك هەيە هەمويان هەن، چونكە كوشتنەوە كاتی سابت دەبێ ئەمانە هەموو هەبن و بەسراوە ووەستاوە لەسەر ئەمانە، واتە دەبێ هەرجی ڕێگری كوشتنەوە هەيە نەبێ و هەموو مەرجەكانی كوشتنەوە هەبن و داخوازيكەری كوشتنەوەكەش هەبێ.

(٣) قەولی‌هەڵبژاردە ئەوەيە بڕوا بكرێ بە ڕەخنە گركە دەڵێ بە بەڵگە بەدەسەت ئەمەی كە تۆ نەفيت كردووە لە بەڵگە هێنانەوەكەتدا چونكە قسەی تونێكلْ دارم پان بەپان پێ دەڵێت كە گوايە كوشتن بە تێلا دژايەتی هەيە لەگەڵ كوشتنەوەدا، ئەمە بەڵگەی من نيە، لە نەفی كردنی كوشتنە وە دا بە هۆی تێلاوە، چونكە عەدالەتی ئەو ڕەخنە گرە ڕێ لێدەگرێ درۆبكا لەو قسە يەدا.

(٤) هەندێكی تروتويانە: بڕوای پێ ناكرێ هەتا بەڵگەكەی تری بە يان دەكا، چونكە جاری وا هەيە ئەوەی كە دەيڵێ هەر بۆ سەركەشی و كێشمەنكێشيە.

{وربما سكت المستدل عن مقدمة غير مشهوره محافة المنع} لها لوصرح بها {فيرد بسكوته عنها {القول بالموجب} كما يقال في اشتراط النية في الوضوء والغسل ... قربة يشترط فيه النيّة كالصلاة و يسكت عن الصغرى وهي الوضوء و الغسل قربة[1] . فيقول المعترضُ مسلّم ان ما هو قربة يشترط فيه النية ولا يلزم اشتراطها في الوضوء والغسل فان صرح المستدل بأنهما قربة ورد عليه منع ذلك وخرج عن الاول بالموجب واحترز بقوله غير مشهورة عن المشهوره فهي كالمذكورة فلا يتأتي فيه القول بالموجب[2] .

{ومنها}اي من القوادح {القدح في المناسبة}اي مناسبة الوصف العلل به ... صلاحية افضاء الحكم الى المقصود}من شرعه{وفي الإنضباط} للوصف المعلل ... {والظهور} له بان ينفي كلا من الاربعة[3] .

---

(١) جاری واش هەیە بەڵگە بە دەستەکە بێ دەنگ دەبێ لەپێشەکیەك کە بەناوبانگ نیە لەترسی ئەوەی ئەگەر بیڵێ ڕێی لێدەگرن ، جا بەهۆی ئەو بێدەنگیە لەو پێشەکیە قەول کردن بەداخوازی بەڵگەکەی بەرخنە دێتە سەر وەك لە بارەی بەمەرج گرتنی نیەت لە دەست نوێژو خۆ شۆردندا دەووترێ، ئەوەی هۆی نزیك بوونەوە بێ نیەتی تێدا بەمەرج گیراوە: وەك نوێژ، ئیتر بێ دەنگ دەبێ لە پێشەکی بچوکەکە کە بریتیە لە: دەست نوێژو خۆشۆردن هۆی نزیك بونەوە لەخوا.

(٢) جارەخنەی گریش دەڵێ: دەیسەلمێنم ئەوەی هۆی نزیك بونەوەبێ لە خودا نیەتی تێدا بەمەرج گیراوە بەڵام واجیب نیە لە دەست نوێژو خۆشۆردندا بەمەرج گیرابێ، جا ئەگەر بەڵگە بەدەست بەئا شکراووتی: دەست نوێژو خۆشۆردن هۆی نزیك بونەوەن، ئەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێ و ڕێ ئەو قسەی نادرێ، چونکە ئەگونجێ بووترێ: ئەمانە بۆ پاکی و خاوێنین نەك بۆ نزیك بونەوەن، وە ئەو کاتە لەوەش دەردەچێ کە قەول کردن بێ بەداخوازی بەڵگە، دانەر بەووشەی: غیر مشهورة،خۆی پاراست لە پێشەکێك کە بەناو بانگ بێ، چونکە ئەمە هەروەك باسکرابێ وایە، لەبەر ئەوە قەول کردن بەداخوازی بەڵگەکەی تێدا نایێتە دی.

(٣) حەوتەم: یەکێك لەوانەی عیلەت عەیبدار دەکەن تەعدانە لەمناسبە و خزمایەتی ئەو سیفەتەی کراوە بە عیلەت بۆ حوکمەکە، بووترێ مناسبەیان نیە ورتەعنەدان و عەیبدارکردنی شیاوی تەوانایی حوکمە کە بۆهێنانە بوونی مەبەست وحوکمەکەیە، واتە بۆیە ئەو حوکمە دانراوە ئەو مەبەستە بێتە دی، تەعنەی لێبدرێ بڵێت: ئەوە ناتوانێ، و تەعنە بدرێ لە (ضبط)بونی ئەو سیفەتەی کراوە بە

..{وجوابها} اي جـواب القدح فيها {بالبيـان} لها[١] مثال الصلاحية المحتاجة الى البيان ان يقال تحريم المحرم بالمصاهرة مؤبدا صـالح لان يفضي الى عدم الفجور بها المقصود من شرع التحريم فيعترض بانه ليس صالحا لذك بل للافضاء الى الفجور فانَّ النفس مائلة الى الممنوع فيجاب بان تحريمها المؤبّد يسد باب الطمـع فيـها بحيـث تصير غير مشتهاة كالام[٢].

{ومنها} اي مـن القـوادح {الفـرق} بين الاصل والفرع {وهـو راجـع الى المعارضـة في الاصل او الفرع وَ قِيلَ اليهما} اي الى المعارضتين فيب الاصل والفرع {معا} لانه علـى الول ابداء خصوصيـة في الاصل تجعـل شـرطا للحكـم بـأن تجعـل مـن علتـه او ابـداء خصوصية في الفرع تجعل مانعا م الحكم وعلى الثاني ابداء الخصوصيتين[٣].

---

عیلەت، بووترێ مەشەقەت صنەبت ناکرێ بۆیە نابێتە عیلەتی دروستی نوێژ کورت کردنەوە. وەتەعنە بدرێ لە دیارو لەبەرچاو بوونی ئەو سیفەتەی دەکرێتە عیلـەت، بووترێ: ڕەزامەندی شتێکی نادیارە نابێتە هۆی دامەزراندنی گرێ بەندی، کڕین و فرۆشتن، واتە ئەوەی ئەم عەیبداریانە نەداتە پاڵ عیلەت ئەم چوار شتە لە عیلەتـە کەدانەفی دەکا.

(١) وەڵامی ئەوتەعن وعەیبداریە لەهەر چواریاندا بەڕونکردنەوە دەبێ بۆهەرچوار.

(٢) نموونە بۆ ئەوەی ئەو صیفەتە شیاوی کە عیلـەتیبێ بەڵام پێویستی هەیە بە ڕون کردنەوە وەك ئەوەی بووترێ: حەرامبونی خەسوهە ناهەنایە شیاوە بۆ ئـەوەی کە زینای لەگەڵدانەکا کەمەبەست لە حەرام کردنەکەشی هەر ئەوەیە. جا ڕەخنـەگر دەڵێ ئەوە شیاوی ئەوە نیە لەوە بیپارێزێ، بەڵکو شیاوی ئەوەیە بەرەو زیناکردن لەگەڵیدا بیبا بەهۆی تێکەڵیوە، چونکە نەفس هەموکات حەزی لەشتێکە لێ قەدەغـە کرابێ، جا وەڵام دەدرێتەوە حەرامبونی خەسو هەتا هەتایە دەرگای ئومێدو ئارەزوی لێدانەخا بە شێوەێیك وای لێ دێ ئارەزوو حەزی لێنەکا وەك دایکی.

(٣) هەشتەم: یەکێکیتر لەوانەی عیلـەت عـەیبدار دەکـەن و تـەعنی لێ دەدەن فـەرقو جیاوازی دروستکردنە لەنێوان ئەسلْ وفەرعدا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەخنـەگرتنی نـەیار لـەبونی عیلەتەکـە لـە ئەسڵە کـەدا، یـاخود لـە فەرعـە کـە دا، هـەندێك دڵێـن دەگەڕێتـەوە بۆ ڕەخنـەی نـەیار لە هـەردوکیاندا لـە ئـەصلْ و فـەرعدا پێکـەوە، چونکـە لەسەر قەولی یەکەم کەڕای پەسەندە لـە ئەصڵە کەدا تایبـەتێك ئاشکرا دەکرێ کەلـە فەرعەکـەدا نیـە دەشکرێ بەمـەرجی حوکمەکـە، واتـە دەکـرێ بەعیلـەتی حوکمەکـە، یاخود تایبەتێك لەفەرعەکەدا دەردەنرێ کە لەئەصڵەکەدا نیە لەگەڵ ئەوەش ڕێگربێ

مثاله على الاول بشقيه ان يقول الشافعي النية في الوضوء واجبة كالتيمم بجمع الطهارة عن دث فيعترض الحنفي بأن العلة في الاصل الطهارة بالتراب وأن يقول الحنفي يقاد المسلم بالذمي كغير المسلم بجامع القتل العمد العدوان[1] . فيعترض الشافعي بأن الاسلام في الفرع مانع من القود وقد ذكر الآمدي الذاكر لرجوع الفرق الى ماتقدم أن مسمى المعارضة في الاصل ابداء قيد في العلة مسمى المعارضة في الفرع ابداء مانع من الحكم ولم يذكر ذلك المصنّف فأحال معنى الفرق على مالم يذكر بخلاف الآمدي[2] .

---

لەحوكمەكە ، لەسەر قەولی دوهەمیش ئەصڵ وفەرعەكە هەردووكیان پێكەوە تایبەتیان دەردەخرێ.

(١) نمونەی فەرقەكە لەسەر یەكەمیان بە هەردو لقەكەیە وە، وەك ئەوەی شافعی بڵێ: نیەت لە دەست نوێژدا واجبە وەك لەتەیمومدا واجبە، بە هۆی عیلەتێكەو كە هەردوكیان كۆدەكاتەوە، ئەویش بریتیە لە بێدەست نوێژی لابردن و لابردنی حوكمی بێ دەست نوێژی، ئەمجا حەنەفیش ڕەخنە دەگرێ دەڵێ: عیلەت لە ئەصڵەكەمە ئەوەیە حوكمی بێ دەست نوێژیەكە بەگڵ لابرێ، كەوابو عیلەتی ئەصڵ و فەرع كەیەكێك نیە، خودی گڵەكە دەكرێتە مەرجی حوكمەكە، كە واجب بونی نیەتەكەیە گڵ لاوازە بەنیەت بەهێز دەكرێ. ئەمە بۆ نەیاری لە ئەصڵەكەدا، كە تەیەمومە بەلاە نمونە بۆ ئەوەی نەیاری لە فەرعەكە دا بكرێ، وەك ئەوەی حەنەفی بڵێ: موسوڵمان بە هۆی كوشتنی خاوەن پەیمانەوە دەكوژرێتەوە، وەك چۆن ناموسڵمان بێ كوژتن دەكوژرێتەوە بەهۆی عیلەتێكەوە كە لەهەردوكیاندا هەیە كە كوشتنی بەعەمدی و دەست درێژیە .

(٢) جا شافیعش ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: اسلام لە فەرعەكەدا ڕێگرە لەوەی بكوژرێتەوە، ئامیدی كە باسی گەڕانەوەی فەرقەكە دەكا بۆ نەیاری لە ئەصڵەكەمە یاخود لە فەرعەكەدا، دەڵێ: بێ گومان ئەوەی ناو دەبرێ بەنەیاری لە ئەصڵەكە بریتیە لە ئاشكرا كردنی قەیدێك لە عیلەتەكەدا، وەك ئەوەش ناو دەبرێ بە نەیاری لە فەرعەكەدا بریتیە لەوەی ڕێگرێك لە حوكمەكە ئاشكرا بكرێ، دانەر ئا ئەمەی باسی نەكردووە، لەبەر ئەوە مانای فەرقەكەی حەواڵە كردووە بۆ سەر شتێ كەباسی نەكردووە، بەڵام ئامیدی وانیە، لە پێشدا مانای فەرقی بەو شێوەی پێشەوە كردووە ئەنجا پێناسە و لق و پۆی بەیان كردووە.

{والصحيح انه} اي الفرق {قادح وان قيل انه سؤالان} بناء على القول الثاني فيه لانه يؤثر في جمع المستدل [1] وَ قِيلَ لا يؤثر فيه وَ قِيلَ لا يؤثر على القول بانه سؤالان لان جمع الاسئلة المختلفة غير مقبول وسكت المصنف عن جواب الفرق ومما يجاب به منع كون المبدى في الاصل جزءا من العلة وفي الفرع مانعا من الحكم[2] .

ومهد المصنف لمسئلة تتعلق بالفرق {و} الصحيح {انه يمتنع تعدد الاصول} بفرع واحد بان يقاس على كل منها {للانتشار} اي انتشار البحث في ذلك {وان جوز علتان} لمعلول واحد[3] .

---

(١) قەولی دروست ئەوەیە کە فەرق عەیبدارکەری ئەو صیفەتەیە کە دەکرێتە عیلەت هەرچەند ووتراویشە کە فەرق بریتیە لە دو ڕەخنەی نەیار، ئەم ووتنە لەسەرقەولی دووەم دورست کراوە کە لە فەرقەکەدا بوو، چونکە ئەو فەرقە تأسیر دەکالەوەی کە بەڵگە بەدەست ئەصڵ و فەرعی لەیەك شتدا کۆکردوەتەوە، ئەوە بووتمان عیلەتی ئەصڵە کە جیایە لە عیلەتی فەرعەکە، لە دوهەمیشدا ووتمان ڕێگر هەیە لە کوشتنەوەی.

(٢) هەندێکیش ووتویانە ئەو فەرقە هیچ تأسیرێك لەو کۆکردنەوەی ئەصڵ و فەرعە لەیەك عیلەتدا ناکا، با دوعیلەت هەبێ، هەندێکی تروتویانە: هیچ تأسیرێك نیە لە سەر ئەو قەولەی کە دەڵێ: فەرق بریتیە لە دو ڕەخنەی نەیار، چونکە کۆ کردنەوەی چەند بابەتێکی جیا جیا قەبوڵ نیە و وەرناگیرێ. دانەربێ دەنگ بولە وەڵامدا ئەوەی فەرقەکە،بەڵام ئەگونجێ وەڵامی ئەو فەرقە بدرێتەوە، ئەوەیە کە: ئەوەی دەردەخرێ لە ئەصڵەکە دەکرێ بە بەشێکی عیلەتە کە نابێ و ناکرێ، کەووترا گڵەکە بەشێك بێ لەعیلەتەکە. وە لە فەرعەکەشدا ووترا ڕێگرێك هەیە لە حوکمەکە ئەوەش قەبوڵ ناکرێ،کە ووتمان اسلامبونی بکوژ کە ڕێگرە لەوەی بکوژرێتەوە ئەمەش ناسەلمێنرێ.

(٣) دانەر پێشەکیێکی ئامادە کرد بۆ مەسئەلەیێك کە پێوەندی هەیە بە فەرقەوە، ئەویش ئەوە یەکە دەڵێ: قەولی صەحیح و دروست ئەویە نابێ یەك فەرع چەند ئەصڵێکی هەبێ، بەم شێوە کە قیاس بکرێتە سەر هەریەك لە و ئەصڵانە، بووترێ لەگەڵ هەر یەکێکیان پەیوەندێك هەیە کە لەویتردا نیە، بۆیە نابێ چونکە سەر ئەکێشێ بۆ ئەوەن باسەکە درێژە بکێشێ، هەرچەند یەك شت دوعیلەتی هەبێ دروستە بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەصڵەکە یان یەك بێ .

وَ قِيلَ يجوز التعدد مطلقاً وقد لا يحصل انتشار {قال المجيزون} للتعدد {ثم} عى تقدير وجوه {لوفرق بين الفرع واصل منها كفى} في القدح فيها لانه يبطل جمعه المقصود وَ قِيلَ لا يكفى لا ستقلال كل منها[1] . {وثالثها} يكفي {ان قصد الالحاق بمجموعها} لانه يبطله بخلاف ماذاقصد بكل منها {ثُمَّ في اقتصار المستدل عى جواب اصل واحد} منه حيثُ فرق المعترض بين جميعها {قولان} قيل يكفى لحصول المقصود بالدفع عن واحد منها وَ قِيلَ لا يكفى لانه التزم الجميع فلزمه لادفع عنه[2]

{ومنها} اي من القوادح {فساد الوضع بان لا يكون الدليل على الهيئة الانحـ لاعتباره في ترتيب الحكم} عليه كان يكون صالحا لضد ذلك الحكم او نقيضه {كتلقي التخفيف من التغليظ والتوسيع من التضييق والاثبات من النفي} وعكسه[3] .

---

(١) هەندێك ووتويانە دروستە چەند ئەصلێك هەبێ بۆ يەك فەرع، سەر بكێشێ ـ درێژە پێدان بە باسەكەيانە، وە جارى واش هەيە سەرناكێشێ بۆ درێژ بوونەوە ئەوانەى دەڵێن: دروستە چند ئەصلێك هەبێ ووتويانە: گريمان ئەگەر ئەوە هەر جياوازى بخرێتە نێوان فەرعەكەو يەكێك لە ئەصلەكان ئەو فەرقە بەسە بۆ عەيب كردنى ئەصلەكان، چونكە ئەو فەرقە هەردوكيان پۆچەڵ دەكاتەوە بە فەرعە كەشەوە كەمەبەستيش هەرخرِبونەوە كەيان بو، هەندێك ووتويانە: ئەوە بەس نيە بۆ لەكەـ كردنيان، چونكە ئەو ئەصلانە هەمويان سەربەخۆن بۆخۆيان.

(٢) قەولى سێهەم دەڵێ: ئەگەر مەبەست ئەوەبێ فەرعەكە بكرێتە پاشكۆى كۆى ئەصلەكان نەك تاك تاكيان ئەوە ئەو فەرقە بەسە بۆ عەيدار كردنى، چونكە فەرقەكە پاشكۆيە كە پۆچەڵ دەكاتەوە، بەلأم ئەگەر مەبەستى ئەوە بێ بكرێتە پاشكۆى هەريەكێكيان ئەوە بەس نيە بۆ عەيبدار كردنى و پۆچەڵى ناكاتەوە. پاشان ئەگەر بەڵگە بەدەست تەنها وەلأمى رەخنەيێكى دايەو كە گێراوە لەسەر ئەصلێكيا چونكە رەخنەگر فەرقى خستوەتە نێوان هەمويانەوە، ئەمە دوقەولى تێدايە، هەندێ ووتويانە: ئەوتاكە وەلأمەبەسە چونكە مەبەستى پێ دێتە دى،چونكە هەموو ئەصلێ سەر بەخۆى خۆيەتى، يەكێيان بپارێزى وەك ئەوە وايە هەمويانى پاراستبێ هەندێكى تروتويانە تاكە يەك وەلأم بەسى نيە و رەخنەى ئەوانى تربهێنێتەوە چونكە بەڵگە بەدەست هەمويانى كردووە بەبەڵگە دەبێ هەموشيان بپارێزێ.

(٣) نۆيەم: يەكێكى تر لەوانەى عيلەت عەيبدار دەكەن (فساد الوضع) و خراپ دانان و دارِشتنى بەڵگەكەيە، بەم شێوەيە بەڵگەكە لەسەر شێوازەيێكى وانەبێ شياوى ئەوەبێ ئەو ئەرزشەى پێ بدرێ كە تەرتيبى حوكمەكەى لەسەر بكرێ، بەڵكو شياوى

الاول {مثل} قول الحنفية {القتل} عمدا {جناية عظيمة فلا يكفر} اي لا تجب له كفارة {كالردة} فعلظم الجنابية يناسب تغليظ الحكم لاتخفيفه بعدم وجوب الكفارة[1] .

والثاني مثل قولهم الزكاة وجبت على وجه الارتفاق لدفع الحاجة فكانت على التراخي كالدية على العاقلة فالتراخي الموسع لا يناسب دفع الحاجة المضيق[2] .

والرابع كأن يقال في المعاطاة في المحقر لم يوجد فيها سوى الرضا فلا ينعقد بها بيع كما في غيرالمحقر فالرضا الذي هو مناط البيع يناسب الانعقاد لا عدمه[3] . {ومنه} اي من فساد الوضع {كون الجامع} في قياس المستدل {ثبت اعتباره بنض او اجماع في نقيض الحكم} في ذلك القياس[4] .

---

ئەوەبێ دژی ئەو حوکمە یاپێچەوانەی ئەو حوکمە بدابەدەستەوە، وەك: ١) بارسوكی وەرگرتن لە قورس كردنەوە. ٢)فراوانی وەر گرتن لە تەنگ لە سەركردنەوە. ٣)اثبات وەرگرتن لە نەفیەوە . ٤) یاپێچەوانەكەی، واتە نەفی وەرگرتن لە اپباتەوە.

(١) نمونە بۆ یەكەمیان وەك زانایانی پەیرەوی حەنەفی دەڵێن: كوشتنی بەعەمدتاوانێكی زۆر گەورەیە لە بەر ئەوە واجب نیە كە فارەتی بۆبدرێ، وەك گوناهی پاش گەز بوونەوەوە وایە. دەخۆ گوناه ئەگەر گەورە بێ دەبێ حوكمەكەی قورس بكرێ ئەوە مناسبیەتی، نەك سوك كردنی حوكمەكەی، بڵێت كە فارەتی لە سەر واجب نیە.

(٢) نمونە بۆدوهەمیان هەر وەك حەنەفیەكان دەڵێن:زەكات واجب بووە لەسەرخاوەن مال بۆ ئەوەی پێویستی هەژارانی پێلابرێ، كار بۆ ئاسانیومیهرەبانێ لەخاوەنەكەی وەردەگرێ، لەبەر ئەوە بۆ جێبەجێ كردنی پێویستی هەژاران ماوەی دەركرنەكەشی درێژ كراەتەوە، وەك ئەو خوێنە وایە كە لەسەر بنەماڵەی بكوژەكەیە، بەسێ قۆناغ دەدرێ، دەخۆماوە درێژ كردنەوەێیكی فراوان دانرێ بۆ زەكات دان مناسب نیە لەگەڵ عیلەتی زەكاتدا كە لابردنی تەنگایی هەژاری و بێ دەسی و پێویستیە .

(٣) نمونەی چوارەمیان: وەك ئەوەی لە بارەی مامەڵەی دەساو دەستدا بۆ شتی بێ ئەرز بووترێ: ئەم مامەڵەیە جگە لە ڕەزامەندی نەبێ هیچیتری تێدا نەبووە، كە وابوو بەم شێوە مامەڵەیە دانامەزرێ، وەك چۆن لەشتی ئەرزشداردا دانامەزرێ، كەوابوو ڕەزامەندیێك كە عیلەتی كرین دەفرۆشتتەكە بەمناسبەكەی دامەزراندنیەتی نەك دانەمەزراندنی . (٤) جۆرێكی تر لە فساد الوضع ئەوەیە ئەو عیلەتەی بەڵگە بەدەست هەیەتی بۆ قیاسی كردنەكەی ئەو عیلەتە بەدەق یاخود بە إجماع سابت بووبێ بۆ دژی ئەو حوكمەی ئەو لە وقیاسەدا.

كاستصحاب حياة المفقود قبل الحكم بموته فإِنَّهُ دافع للارث منه وليس برافع لعدم لرثه من غيره للشك في حياته فلا يثبت استصحابها له ملكا جديدا اذ الاصل عدمه[١] .

{وَ قيلَ } حجة {بشرط ان لا يعارضه ظاهر مطلقاً وَ قِيلَ ظاهر غالب قيل مطلقاً وَ قيلَ ذو سبب} فان عارضه ظاهر مطلقاً او بشرط على الخلاف قدم الظاهر عليه وهو المرجوح من قولي الشافعي في تعارض الاصل والظاهر[٢] . والتقييد بذي السبب {ليخرج بول وقع في ماء كثير فوجد متغيرا واحتمل كون التغير به} وكونه بغيره مما لايضر كطول المكث فان استصحاب طهارته الاصل عارضه نجاسته الظاهرة الغالبة ذات السبب فقدمت على على الطهارة على قول اعتبار الظاهر كما تقدَّم الطهارة على قول اعتبار الاصل[٣] .

---

(١) وەك هاورِێ خوازی ژیانی کەسێکی ونبوو، پێش ئەوەی قازی شەرع داوەری بکا بە مردنی، ئەم استصحاب و هاورِێ خوازیە نایەڵێ میراتی لێبگرن، چونکە مردنی تەواو نەزانراوە، بەلاّم رافعی نیە واتە: میرات لە غەیری خۆی ببات چونکە گومان لە ژیانیدا هەیە، لە بەر ئەوە هاورِێ خوازی ژیان بۆ ئەو کابرا ونبووە موڵکی تازەی بۆ ناسەلمێنێ، چونکە ئەصلْ نەبوینەتی.

(٢) هەندێك ووتویانە: استصاب و هاورِێ خوازی حوجبەو بەڵگەیە بەمەرجێ ظاهرێك نەیاری و بەرەورِوی نەبێتەو چ غالب یاغالب نەبێ. هەندێکی تر ووتویانە: بەمەرجێ هەر ظاهرێکی غالب بەرەو روی نەبێتەوە، هەندێکی تر ووتویانە: چ ئەو ظاهرە غالبە هۆی هەبێ یانەیبێ. هەندێکی تر ووتویانە: هەرخاوەن هۆبی کەوابو ئەگەر ظاهرێك رِوبەرِوی ئەو هاورِی خوازیە بوویەوە چ غالب یا غالب نەبێ، یاخود بەمەرجێك چ غالب بێ یاخاوەن هۆ بێ لەسەر ئەو جیاوازیەی پێشەوە، لەم کاتەدا زاهرەکە پێشی استصاب و هاورِێ خواریەکە دەخرێت. ئەصلْ و ظاهر ئەگەر بەگژ یەکدا چون شافعی دو قەولی تێدا هەیە پەسەندو پەسەندتر ، جا ئەم پێشخستنی ظاهرە بەسەر استصاب و هاورِێ خوازیدا قەولی پەسەندی شافعیە.

(٣) بۆیە وشەی: خاوەنی هۆ، لکا بەغالبەوە؟ بۆ ئەوەی میزێك کەو تبێتە نێو ئاوێکی زۆرەوە دوایی دەبینن ئاوە کە گۆڕاوە، لەگەڵ ئەوەش هەڵدەگرێ بەو میزە گۆڕابێ، وەهەڵیش دەگرێ بە شتێك بووبێ کەزیان بەخش نەبێ وك ماناوەی زۆر، چونکە استصاب و هاورِێ خوازی ئەصڵە کەی پاکیە، پیسێکی ظاهرو دیارو غالب وخاوەن هۆکە میزەکەیە رِوبەرِوی بووەتەوە، لەبەر ئەوە ئەو پیسیە پێش خرا بەسەر پاکیە کەیدا، لەسەر ئەو قەولەی کە اعتباری رِەواڵەتی کردبێ، وەك چۆن پاکیەتی

{والحق} التفصيل اي {سقوط الاصل ان قرب العهد} بعدم تغيره{واعتماده ان بعـ العهد بعدم تغيره[1] {ولا يحتج باستصحاب حال الاجماع في محل الخلاف} اي اذا اجمع على حكم في حال واختلف فيه في حال اخرى فلا يحتج باستصحاب تلك الحال في هـ {خلافاً للمزني والصَّيرفي وابن سريج والامدى} في قولهم يحتـج بذلـك مثالـه الخـارج النجس من غير السبيلين لا ينقض الوضوء عندنا استصحابا لما قبل الخروج مـ بقائه المجمع عليه[2] {فعرف} مما ذكر {ان الاستصحاب} الـذي قُلْنا به دون الحنفية وينصرف الاسم إليهِ {ثبوت امر في} الزمن {الاثني لثبوته في الاول لفقد ان ما يصلح للتغير} من الاول الى الثاني[3] .

---

پێش دەخرێ لەسەر قەولی ئەوەی اعباری ئەصڵ دەکاو دەیکابە حوجبە.

(١) لەو نمونەدا کـە مـیز بکرێتـە ئـاوەوە قسـەی حـەق و ڕاسـت ئەوەیـە درێـژەی بدرێتێ، واتە ڕوخانی ئەصڵەکە ئیعتبار ئەکەم ئەگەر تازە زانرابێ‌کە ئاوەکە نەگۆڕاوە بـەڵام ئێسـتە بـەهۆی میزەکـەوە گـۆڕاوە، ئـەوە ئەصڵەکـە نـەماوە کـە پاکیـە نیـە. و ئیعتباری ئەصڵە کەشی دەکرێ ئەگەر چەند ڕۆژێ لەمەو پێش زانرابـێ کە نـەگۆڕاوە بەڵام ئێستە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

(٢) استصحاب و هاوڕێ خوازی بۆ حاڵـەتێك کە ئیجماعی لەسـەرە ناکرێتـە بەڵگە بۆ حاڵەتێك کە جێ کێشەی زانایانە، واتە: کاتێ زانانیان خڕبون وەیەك ڕابون لەسـەر حوکمێك لە حاڵەتێکدا، بەڵام جیاواز یـان تێاپـەیدا بو لـە حوکمـە کـەیدا لـە حاڵـەتێکی تردا، ئەوە بەاستصاب و هاوڕێ خوازی ئەو حاڵـە تـە بۆ ئەم حاڵەتە ناکرێتە بەڵگە. بەپێچەوانـەی مـەزەنی و صـەیرەفی و ابـن سـوریج و ئامێدیـەوە کـە دەڵێـن: ئەکرێتـە بەڵگە.نمونەکەش: پیسایی میزو گو لە شوێنی عادەتی خویـەوە نـەبێ و بێتـە دەر بـەلای ئێمـە وە دەسـت نوێـژ ناشـکێنێ، چونکـە اسـتصاب و هـاوڕێ خـوازی پێـش هاتنە دەرەوەیەتی، واتە مانەوەی لە ئاوسکدا بەرای هـەموان دەسـت نوێـژ ناشـکێنێ. ئێستەش کە هاتووەتە دەرەوە هەر حوکمی ئەوەی هەیە بەلای ئێمەوە.

(٣) کە وابو لەوەو وە کە باسکرا زانراکە: ئەو استصحاب و هـاوڕێ خوازیـەی ئێمـە ئەی کـەین بە بەڵگەو زانایانی حەنـەفی حسیبی ناکـەن و هـەر کـاتێکیش نـاوی بـرا ئـەبڕێ بەسـەر اسـتصحابدا، بریتیـە لـە سـابت کردنـی حوکمێـك لـەکاتی دوهـەمیدا چونکە ئەو حوکمـە سابت کراوە لـە کاتی یەکـەمیدا، لە کاتێکدایە ئـەوەی دەشـێ بۆ گۆڕانکاری تێدا نیە تا حومی یەکەم لە دوهەم جیا بکاتەوە .

فلا زكاة عندنا فما حال عليه الحول من عشرين دينارا ناقصة تزوج زواج الكاملة بالاستصحاب[1] {اما ثبوته} اي الامر {في الاول لثبوته في الثاني فمقلوب} اي فاستصحاب مقلوب كأن يقال في المكيال الموجود الآن كان على عهده ﷺ باستصحاب الحال في الماضي[2]. {وقد يقال فيه} اي في الاستصحاب المقلوب ليظهر الاستدلال به {لو لم يكن الثابت اليوم ثابتا امس لكان غير ثابت} امس اذ لا واسطة بين الثبوت وعدمه {فيقتضي استصحاب امس} الخالي عن الثبوت فيه {بانه الآن غير ثابت وليس كذلك} لانه مفروض الثبوت الآن {فدل} ذلك {على انه ثابت} امس ايضا ويوجد في بعض النسخ بعد انه الان وهو مفسد وليس في نسخة المصنِّف[3].

---

(١) لەبەر ئەوە بەلای ئێمەوە ماڵێك بەوەزن بیست مسیقاڵ ئاڵتون بێ بەلام بەهاكەی لەبیست كەمتری بێ ئەگەر ساڵی بەسەر داهاتەوە واجب نیە زەكات تێدا هەرچەند ڕەواجی بیست میسقاڵی تەواوی هەبێ لە كۆتایی ساڵیدا، ئەمەش بەهۆی استصحاب و هاوڕێ خوازی پێش خوێەوە لە پێشەوە زەكاتی تێدا نە بو ئێستەش زەكاتی تێدا نیە.

(٢) بەلام عیلەتی سابت كردنی ئەوە حوكمە لەكاتی یەكەم و ڕابوردودا ئەوەیە كە ئێستە هەیە و لەكاتی دوهەمدا، ئەوە پێ دەوترێ استصحاب و هاوڕێ خوازی ئاوەژووجێ گۆركێ پێ كراو، وەك ئەوەی بووترێ: ئەم ئامێرەی ئێستە هەیە و شتی پێكێشانە دەكرێ هەر ئەو ئامێرەیە كە لەسەر دەمی پێغەمبەردا بووە، بەڵگەش استصحاب و هاوڕێ خوازی حاڵی ئێستەیە بۆ زەمانی ڕابوردو.

(٣) كەم جارێ لە هاوڕێ خوازێیكیدا، كە ئاوە ژوكراوە بۆ ئەوەی ڕاست بكرێتەوە ودەركەوێ كە دەكرێتە بەڵگە دەووترێ: ئەگەر ئەوەی ئەمڕۆ هەیە دوێنێش نەبوایە دەبێ دوێنێش نەبووبێ، چونكە شتێكی تر نیە بكەوێتە نێوان بوون و نەبونەوە،شت یا بوونە یا نەبونە لەبە رئەوە استصحاب و هاورێ خوازی دەوێ كەخاڵیە لەسابت بونی ئەو شتە تیایدا بڕیارو فەرمان دەدا ئەو سا بتە ئێستە سابت نیەو بوونی نیە، بێ گومان ئەوەش وانیە، چونكە بێ گومان ئێستە ئەو شتە هەیە، لەبەر ئەوە دەلاڵەت دەكا لەسەر ئەوەی ئێستە سابتە ئەوە دەوێنێش هەر بووە و سابت بووە دوبارە. لەهەندێ فوتوكۆپی ئەم كتێبەدا نوسراوە: (بعد انه الان...) دوای ئەوە كە ئێستە هەیە و سابتە، ئەوەش مەبەستە كە خراب دەكا، چونكە بەڵگە بۆ هەبوونیئەوەی ئەمڕۆیە، ئێمەیش مەبەستمان ئەوەیە بەمەی ئەمڕۆ ئەوەی دوێنێ بسەلمێنین، ئەوەش لەنوسراوە ئەصڵەكەی دانەردا نیە.

{مسئلة لايطالب النافي} للشيء {بالدليل} على انتفائه {ان ادعي علما ضرور
بانتفائه لانه لعدالته صادق في دعواه والضروري لايشتبه حتى يطلب الدليل عب
لينظر فيه {والا} اي وان لم يدع علما ضروريا بان ادعي علما نظريا أو ظنا بانتف
{فيطالب به} اي بدليل انتفائه {على الأصَحّ} لان المعلوم بانظر او المظنون قد يشت
فيطلب دليله لينظر فيه[1] {ويجب الاخذ باقل المقول وقد مر} في الاجماع حيث قي
فيه وان التمسُك باقل ماقيل حق[2] {وهل يجب} الاخذ {بالاخف} في شيء لقوله تع
يريد الله بكم اليسر {او الاثقل} فيه لانه اكثر ثوابا واحوط {او لا يجب شيء} منه
بل يَجوزُ كل منهما لان الاصل عدم الوجوب هذه {اقوال} اقربها الثالث[3].

(١) ئەمەش بابەتێکە، کەسێ کەنەفی شتێ بکا داوای ئەوەی لێ ناکرێ بەڵگ بهێنێتەوە لەسەر نەفی کردنەکەی، ئەگەر ادعای ئەو بکا کەنەفی کردنەکەی شتێکی بەڵگە نەویستە، لەبەر ئەوەی کە عادڵە ڕاست گۆیە لە داواکەیدا، شتی بەڵگ نەویستیش لەگەڵ شتیردا تێکەڵ نابێ، هەتا داوای بەڵگەی لەسەر بکرێ بۆ ئەوەی سەرنج لەو بەڵگەیە بدرێ. بەڵام ئەگەر لە نەفی کرنەکەیدا ادعای بەڵگە نەویستی نەکردەکرد، بەم شێوە دەیووت ئەمە شتێکی بەڵگەویستە یاخود شتێکی گومانا کە نەفی دەکرێ، ئەوکاتە داوای لێ دەکرێ بەڵگەبهێنێتەوە لەسەر نەفی کردنەکەی لەسەر بڕیاری ڕاسترین قەول، چونکە شتێ بەبەڵگەوە بزانرێ یاخود گومانی پێ ببری جاری وایە لەیەك دەچن و تێکەڵی یەك دەبن لە یەك جیا ناکرێنەوە، لەبەر ئەوە داوای بەڵگەی لێ دەکرێ بۆ ئەوەی سەرنجی بەڵگەکەی بدرێ.

(٢) پێویستە وەرگرتن و قەبوڵ کردنی کەمترین ووتراوە، یەکێ دەڵێ صەدو، یەکی دەڵێ پەنجاو، یەکێ دەڵێ دە، واجبە قەبوڵ کردنی دەکە، چونکە لە هەموویان دەهەیە، لەباسی اجماعدا تێپەڕی کرد کە لەوێ ووترا: دەست گرتن بە کەمترینی ئەوەی ووتراوە حەقەو ڕاستە

(٣) ئایا شتێ بەدو شێوە ئەنجام بدرێ شێوەێکیان ئاسانەو ئەویشیان گرانە بە کامیان ئێمە جێ بەجێ بکەین؟ ئایا واجبە بەشێوە ئاسانە کە وەریگرین وجێبەجێ بکەین، لەبەر ئەوەی کە خوا فەرمویەتی: خوا ئاسان کاری بۆ ئێوە دەوێ، یاخود واجبە بەشێوە گرانەکەیان وەری گرین، چونکە پاداشی زۆرترە و باشتر ئیحتیاط تێدا دەکرێ، یاخود هیچکامیان پێویست نین، بەڵکو هەرکامیان ئەنجام بدرێن هەر دروستە،چونکە ئەصڵ و ڕێبازی سەرەکی ئەوەیە واجب نەبێ، ئەمە سێ قەولن. لەهەموویان زیاتر و نزیکتر بە ڕاستیە وەقەولی سێهەمیانە .

{مسئلة اختلفوا} اي العلماء {هل كان المصطفى ﷺ متعبدا} بفتح الباء كما ضبطه المصنِّف اي مكلفا {قبل النبوة بشرع} فمنهم من نفي ذلك ومنهم من اثبته {واختلف المثبت} في تعيين ذلك الشرع بتعيين من نسب إليه {فقيل} هو {نوح و} قيل {ابراهيم و} قيل {موسى و} قيل {عيسى و} قيل {ما ثبت انه شرع} من غير تعيين لنبي هذه {اقوال} مرجعها التاريخ[1] .

{والمختار} كما قاله كثير {الوقف تأصيلا} عن النفي والاثبات {وتفريعا} على الاثبات عن تعيين قول من اقواله كثير {الوقف تأصيلا {عن النفي والاثبات {وتفريعا} على الاثبات عن تعيين قول من اقواله[2] {و} المختار {بعد النبوة المنع} من تعبده بشرع من قبله لان له شرعاً يخصه وَ قِيلَ تعبد بما لم ينسخ من شرع من قبله استصحابا لتعبده به قبل النبوة[3] .

(١) ئەمەش بابەتێکە زانایان کێشەیان هەیە لە وەلامی ئەم پرسیارەدا کە دەڵێ: ئایا پێغەمبەری هەڵبژاردەی خوا حەزرەتیمحمد درودی خوای لەسەر بێمکلف بووە لەسەر ڕێبازێك بڕوا پێش پێغەمبەرایەتیەکەی؟ جا هەندێکیان نەفیان کردووە ، وەهەندیچکیان سەلماندویانەو سابتیان کردووە، ئەوانیش کە ووتویانە مکلف بووە لەناوخۆیاندا جیاوازیان هەیە لە دیاری کردنی ئەوشەرعەدا، ئایا هی کێ بووە ئەو شەرعە؟ جا هەندێك ووتویانە: ئەوەڕێبازو شەرعی نوح بووە، هەندێکی تر دەڵێن:ئیبراهیم بووەو هەندێکی تر موسابووە، هەندێکی تر ووتویانە: عیسا بووە، هەندێکی تر ووتویانە: ئەوەی سابت بوبێ کە شەرعە ئەو مکلف بووە پێ بێ ئەوەی دیار بکرێ هی چ پێغەمبەرێکە. ئەمانە چەند قەوڵێکن، ئەو قەولە کێیە و ئەمەیان کێیە؟ ئەوە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ مێژو، چونکە ئەوە جێگەکەی مێژووە.

(٢) قەوڵێ هەڵبژاردە وەك زۆرینەی زانایان ووتویانە: وەستان و هەڵوێستە کردنە، چ لەڕۆی ئەصڵی بابەتەکەوە بێ کەنەمن بکرێ یاراسیات بکرێ، وە چ لەڕوی ئەمریمی مەستەلەکە بێ لەسەر اسبات کردنی بۆ دیاری کردنی قەولێك لە وقەولانەی کە اسباتی تکلیفی پێغەمبەر دەکەن.

(٣) قەولی هەڵبژاردە ئەوەیە دوای بە پێغەمبەر بونی قەدەغەبووە تەکلیف بکرێ بەشەرعی پێغەمبەرێك پێش خۆی، چونکە خۆی شەرعێکی تایبەتی هەیە. هەندێ: ووتویانە: پێغەمبەر تەکلیف کراوە بەشتێك لەشەرعی پێغەمبەرانی پێشووە کەنەسڕابێتەوە، چونکە استصحاب و هاوڕێ خوازی بووە بۆ ئەو تەکلیفەی کە لێ کراوە پێش بە پێغەمبەر بوونی.

{مسئلة حكم المنا فع والمضار قبل الشرع} اي البعثة {مر} في اوائل الكتاب حيث قيل ولا حكم قبل الشرع بل الأمر موقوف الى وروده {وبعده الصحيح أن اصل المضـ التحريم والمنافع الحل} قال تعالى خلق لكم مافي الارض جميعا ذكره في معرض الامتنان ولا يمتن إلاّ بالجائز وقال ﷺ فيما رواه ابن ماجه وغيره لا ضرر ولا ضرار في ديننا اي لا يَجوزُ ذلك[1] .

{قال الشيخ الامام} والد المصنِّف {الا اموالنا} فانها من المنافع والظاهر أن الاصل فيها التحريم {لقوله ﷺ ان دماءكم واموالكم} واعراضكم {عليكم حرام} رواه الشيخ فيخص به عموم الآية السابقة وغير ساكت عن هذا الإستثناء ومقابل الصحيح اطلاق بعضهم ان الاصل في لاشياء التحريم وبعضهم ان الاصل فيها الحل[2] .

---

(١) ئەمەش بابەتێکە. حوکمی ئەوشتانەی کەسود بەخشن یاخود زیان بەخشن پێش دابەزینی ڕێبازی ئیسلام و ناردنی پێغەمبەر لەسەرەتای ئەم کتێبەوە ڕابورد کە وترا: پێش دابەزینی شەرع هیچ حوکمێك نیە بەرانبەر بە هیچ کردارو گوفتارێ بەڵکو حوکم لەبارەیەوە دەوەستێنرێ هەتا دابەزینی شەرع. دوایدابەزینی شەرعیش ئەصلْ و ڕێبازیش ئەوەیە کە: هەرچی زیان بەخش بێ حوکمەکەی حەرام کردنە وەهەرچی سودبەخشە حوکمە کە حەڵاڵبونیەتی. خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوەی وا لەزەویدا هەموی بۆ قازانجی ئێوە خوا دروستی کردووە، خوایگەورە ئەم ئایەتەی لەپێشانگای منەتناندا باسی کردووە، خۆشتێکی بێ گومانە شت ئەگەر دروست نەبێ منەتی پێ ناکرێ و نانرێ، کە وابو ئەوەی قازانج بێ حەڵاڵە پێغەمبەریش فەرمویەتی، کە ابن ماجەو غەیری ئەویش ڕایوایەتی دەکەن. هیچ جۆرە زیانێك بۆ حودی خۆمان و هیچ جۆرە زیانیکیش بۆ غەیری خۆمان لە ئاینی ئێمەدا دروست نیە.

(٢) پیری پێشەوا باوکی دانەرو وتویەتی: جگە لەماڵ و سامانمان نەبێ، ئەمەش لە سوود بەخشەکانە، شتێکیش دیارو ڕون بێ ئەوەیە کە ئەصلْ لەماڵ و سامانی خەڵکدا ئەوەیە کە حەرام کرابێ، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ: خوێنی ماڵ وناموسی یەکترتان لەسەر حەرام کراوە. بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە. لەفزی ئایەتەکەی پێشوو گشت گیربوو بەم فەرمودەیە تایبەت کرا. جگە لە باوکی دانەر هەموو زانایانیتر بێدەنگن لەم استشنایە، قەولێك بەرانبەر قەولە صەحیحەکە بێ ئەوەیە هەندێ: وتویانە: ئەصلْ لە حوکمی هەمو شتێکدا حەرام کردنە، هەندێکی تریان وتویانە: اصل لە هەموو شتێکدا ئەوەیە کە حەڵاڵ کراو بێ.

{مسئلة الاستحسان قال به ابو حنيفة وانكره الباقون} من العلماء منهم الحنابلة خلاف قول ابن الحاجب قال بـه الحنفيـة والحنابلـة {وفسـر بدليـل ينقـدح في نفـس المجتهد تقصر عنه عبارته وردبانه} اي الدليل المذكور {ان تحقق} عند المجتهد {فمعتبر} ولا يضرقصور عبارته عنه قطعا وان لم يتحقق عنده فمردود قطعا[1] {و} فسر ايضا {بعدول عن قياس الى} قياس {اقوى} منه {ولا خلاف فيه} بهذا المعنى فان اقوى القياسين مقدم على الآخر قطعا[2]. {او} بعدول {عن الدليل الى العادة} للمصلحة وكذا شرب الماء من الففاء من غير تعيين قدره {ورد بانه ان ثبت انها} اي العادة {حق} لجريانها في زمنه عليه الصلاة والسلام او بعده من غير انكار منه ولامن غيره {فقد قام دليلها} من السُنَة والاجماع فيعمل بها قطعا[3].

(١) ئەمەش بابەتێكە. استحسان و بەجوان زانین ئەبوحنیفە بە بەڵگەی داناوەو و دانی پێدا ناوە، بەڵام زانایانی تر بەڵگەیان حسێب كردووە، كە هەندێكیان زانایانی پەیرەوی حەنبەلین، بەپێچەوانەی گوتەی ابن الحاجب كە ووتویەتی: زانایانی پەیرەوی ئەبو حەنیفەو ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بەبەڵگەیان داناوە ئیستحسان و بە جوان زانین راڤە كراوە و لێك دراوتەوە بە: بەڵگەیێك لە ناخوو هەناوی مجتهدەوە هەڵئەقوڵێ و سەراو دەكا بە\تەواوی ناتوانێ بەلەفز لێكی بداتەوە و ڕستەی بۆ دارێژێ، ئەم راڤەو لێك دانەوە بەربەرچ دراوەتەوە كە: ئەو بەڵگەیە ئەگەر بەلای مجتهدەكەوە بوو بە یەقین ئەو ئیتر ئەرزشی هەیەو واجبە كاری پێ بكرێ، بەڵام ئەگەر بەلایەوە نەبوو بەیەقین ئەوە بێگومان وەرناگیرێ و قەبوڵ ناكرێ.

(٢) استحسان لێك دراوەتەوە بە: لادان و واز هێنانە لە قیاسێك بەرەو قیاسێكی بەهێز ترو چاكتر، ئەگەر واپێناسە بكرێ هیچ جۆرە جیاوازێك لە ناوزانایینی تێدا نیە، چونكە بێگومان كام قیاس بەهێزتربێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوی تردا.

(٣) یاخود لێك بدرێتەوە بە: لادان و واز هێنانە لە بەڵگەو ڕونانە بەرەو كاركردن بەخووعادەت لەبەر بەرژەوەندی، وەك چونە حەمام و گەرماو بێ ئەوەوەی ئەندازەی مانەوەو ئاو صەرف كردن دیاری بكرێ لەگەڵ كرێكەیاندا، ئەمە خووی پێوە گیراوە وپێچەوانەی بەڵگەی شەرعیشە لەبەر بەرژەوەندی گشتی، هەروەها ئاوخواردنەوە لەمەركانەدا بێ ئەوەی ئەندازەكەی دیاری بكرێ، ئەم جۆرە لێك دانەوەی استحسانە قەبوڵ نەكراوە، چونكە ئەگەر سابت بێ ئەو عادەتە حەق و ڕاستە، لەبەر ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەر بووە، یاخود لە دوای سەردەمی پێغەمبەریشە وە هەر بووە بێ ئەوەی پێغەمبەر یاغەیری پێغەمبەر ئینكاری بكەن، ئەوە بێگومان بەڵگەی لە

{والا} اي وان لم تثبت حقيتها {ردت} قطعا فلم يتحقق معنى للاستحسان مما يصلح محلا للنزاع[1] {فان تحقق استحسان مختلف فيه فمن قال به فقد شرع} بتشديد الراء كما قال الشافعي ﷺ من استحسن فقد شرع اي وضع شرعا من قبل نفسه وليس له ذلك[2].

{اما استحسان الشافعي التحليف على المصحف والحط في الكتابة} لبعض من عوضها {ونحوهما} كاستحسان في المتعة ثلاثين درهما {فليس منه اي ليس من الاستحسان المختلف فيه ان تحقيق وانما قال ذلك لمآخذ فقهية مبينة في محالها[3].

{مسئلة قول الصحابي} المجتهد {على صحابي غير حجة وفاقا وكذا على غيره} كالتابعي لان قول المجتهد ليس حجة في نفسه[4].

---

فەرمودەو ئیجماعەوە بۆ بەرپابووە، لەبەر ئەوە بێگومان دەبێ کاری پێ بکرێ،

(١) ئەگەر ڕاستی و حەقیەتی سابت نەبێ ئەوەی گومان قەبوڵ ناکرێ. کەوابو ئەم سێ جۆرە پێناسەی استحسانە مانایەك بەیەقینی نەزانرا بۆی کە بشێ جێکێشە بێ لەگەڵ ئەوەش استحسان بەڵگەیێکە جێکێشەیە لەنێوان ابو حەنیفەو زانایانی تر، لەبەر ئەوە ئەوە نابێ بەیەکێ لەو سێ پێناسەیە لێك بدرێتەوە، ئەبێ بەجۆری لێك بدرێتە جێ کێشەی زانایان بێ.

(٢) جا ئەگەر استحسان و بە جوان زانینێك کە جیاوازی تێدا هەیە یەقین پەیدابوو ئەوەی دانی پێدا بنێ ئەوە بێگومان لەلایەن خۆیەوە شەرعی داناوە، کەسیش بۆی نیە شەرعی دابنێ جگە لە خوا نەبێ، ئەمەش شافیعی فەرموویەتی .

(٣) بەڵام استحسانێك کە شافعی ناوی ناوە استحسان وەك سوێندان لەسەر قورئانەکە یاخود داشکاندنی هەندێ: لەبەشە قەرزەکانی بەندەی بە پارە ئازادکراو. وەغەیری ئەم دووانەش، وەك لە متعەدا استحسان وایە سی درهەم بێ، ئەم استحسانە لەو استحسانە نیە کە جێ کێشەی زانایانە ئەگەر تحقیق لە بارەیە بکرێ بۆیە ئەوەی ووت: لەبەر ئەوچەند جێگەیە کە فقهیان لێوەردەگیرێ کە لەجێی‌خۆیدا باسدەکرێ.

(٤) ئەمەش بابەتێکی ترە. قسەو بۆچونی هاوڕێکی پێغەمبەر نابێتە بەڵگە بەسەر هاوڕێکی ترەوە، واتە بەڵگەیێك نیە کە لەشەرعەوە وەر گیراوە، هەروەها بەڵگەش نیە بەسەر غەیری ئەوەوە، وەك تابعی و شوێنکەوتەی سەحابە، چونکە ڕاو بۆچونی محتهد لە خودی خۆیدا بەڵگەو حوجە نیە.

{قال الشيخ الامام} والد المصنف كالامام الرازي في باب الاخبار م المحصول {الاقي} الحكم {التعبدي} فقوله فيه حجة لظهور ان مستنده فيه التوقيف من النبيٍ صلى الله لعيه وسلم كما قال الشافعي ﵁ روى عن علي ﵁ انه صلى في ليلة ست ركعتان في كل ركعة ست سجدات ولو ثبت ذلك عن علي لقلت به لانه لامجال للقياس فيه فالظاهر انه فعله توقيفا[1] {وفي تقليده} اي الصحابي اي تقليد غيره له بناء على عدم حجية قوله {قولان} المحتققون كما قال امام الحرمين على المنع {لارتفاع الثقة بمذهبه اذ لم يدون} بخلاف مذهب كل من الائمة الأربعة لا لنقص اجتهاده عن اجتهادهم[2] {وَ قِيلَ } قوله {حجة فوق القياس} حتى يقدم عليه عند التعارض وعلى هذا {فان اختلف صحابيان} في مسئلة {فكدليلين} قولاهما فيرجح احدهما بمرجح[3] .

(١) پیری پێشەوا باوکی دانەر وەك پێشەوا ڕازی لەباسی إخبارو هەواڵداندا لە کتێبی: (المحصول) دا ووتویەتی: ڕاو بۆچونی تایبەتە حوججە و بەڵگە ئەگەر لە حوکمی تعبدیدا بێ، ئەوە قسەی هاوڕێ تێدا حوججەو بەڵگەیە، چونکە وادیارە موستەندی ئەو حوکمەتە و قیفە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ص) وەك شافعی فەرمویەتی: ڕیوایەت کراوە لە عەلیەوە خوای لێ ڕازی بێ کە لە شەوێکدا شەش ڕەکعەت نوێژی کردووە لە هەموو ڕکاتێکدا شەش سەجدەی تێدا بوو، ئەگەر ئەوە سابت بێ لە عەلیەوە ئەوە منیش دەیکەمە بەڵگەو فوتوای پێ دەدەم، چونکە تەجەکومی ئەوەی تێدا نیە وڕێ ئەوە نیە کە قیاسی تێدا بکرێ، لەبە ئەوە وادیارە کە عەلی ئەوەی کردووە لە بەر تەرقیف بووە و جێ بەڵگی و بەڵگەسازی عەقڵ نەبووە.

(٢) بەڵام تەقلیدو شوێن کەوتنی غەیری سەحابی بۆ سەحابیەك دوقەولی تێدایە، بیناله سەرئەوو قەولەی کەدەڵێ: قەولی سەحابە حوججەو بەڵگە نیە، ئەو زانایانەی کاریان تحقیق وبۆچونە وەك پێشەوای حەرەمەین وتویەتی: نابێ تەقلیدیبکەی،چونکە متمانەو دڵنیانین کەئەوە مەزهەب وپەیرەوی صەحابەبێ،چونکە نەنوسراوەتەوەو کۆنوس نەکراوە، پەیرەوی هەرچوار پێشەوا کە وانیە، نوسراودتەو کۆکراوەتەوە،نەك لەبەر ئەوەی اجتهادی صەحابە لە ئەجتهادی ئەمانە کەمترەو لاوازترە.

(٣) هەندێ: ووتویانە: قسەی صەحابی حوججەو بەڵگە یێکە لەزۆر قیاسەوەیە، هەتا لەکاتی بەگژیەکدا چونیان دا قسەی صەحابە پێش دەخرێ بەسەر قیاسدا، بینا لەسەر ئەم قیلە، ئەگەر لە یەك بابەتداو هاوڕێ بۆچونیان جیاوازبو ئەوە بەڵگەکانیان وەك دوقەول وان، کەوابو یەکێکیان پەسەند بکرێ دەبێ بەهۆی شتێکەوە بێ کە پەسەندی دەکاو گرانبەها تری دەکا.

{وَ قِيلَ } قوله حجة {دونه} اي دون القياس فيقدم الياس عليه عند التعارض {وعِ تخصيصه العموم} على هذا {قولان} الجواز كغيره من الحجج والمنع لان الصحابة كانوا يتركون اقوالهم اذا سمعوا العموم[1] {وَ قِيلَ } قوله حجة {ان انتشر} من غير ظهور مخالف له[2] {وَ قِيلَ } قوله حجة {ان خالف القياس} لانه لايخالفه إلاّ لدليل غيره بخلاف ما اذا وافقه لاحتمال أن يكون عنه فهو الحجة لا القول[3] .{وَ قِيلَ } قوله حجة {ان انضم إليه قياس تقريب} كقول عثمان ﷺ في البيع بشرط البراءة من كل عيب ان البائع يبرا به مما لم يعلمه في الحيوان دون غيره قال الشافعي لانه يغتذي بالصحة والسقم أي في حالتيهما وتحول طباعة [4].

---

(١) هەندێك ووتویانە: قسەی صەحابە حوججەو بەڵگەیێکە لەخوار قیاسەوەیە لەبەر ئەوە لەکاتێکدا ئەگەر بچن بەگژیەکدا قیاسی پێش دەخرێ. لەسەر ئەو قەولەی کەقسەی صەحابە حوججەی و بەڵگەیە لە تایبەتکردنی بۆ لەفزی گشتگیر دوو قەول هەیە، یەکێکیان دەڵێ: دروستە لەفظی گشتگیر تایبەت بکا وەك بەڵگەکانیتر چۆن تایبەتی دەکەن ئەمیش وەك غەیری خۆی، یەکێکیتر یان دەڵێ ناکرێ لەفزی گشت گیر تایبەت بکا، چونکە صەحابە هەرکات لەفزیی گشت گیریان ببیستایە وازیان لەڕاوبۆچونی خۆیانیان دەهێنا.

(٢) هەندێکیتر دەڵێن: قەولی صەحابە حوججەو بەڵگەیە بەمەرجێ بڵاو ببێتەوەو هیچ ڕایێکی تری پێچەوانەی ئەو دەرنەکەوێ و دیار نەبێ.

(٣) هەندێکی تر ووتویانە: قەولی صەحابە حوججە وبەڵگەیە ئەگەر پێچەوانەی قیاس بێ ، چونکە کە پێچەوانەیی دەکا بێگومان لەبەر بەڵگەییێکیترە جگە لەقیاس. بەڵام قەولی صەحابە یێك لەگەڵ قیاسدا هەماهەنگ بن وانیە، چونکە هەڵدەگرێ ئەم قەولی صەحابەیە لەو قیاسەوە دروست بووبێ، لەبەر ئەوە قیاسیش حوججە و بەڵگەیە نەك قەول.

(٤) هەندێکی تروووتویانە: قەولی صەحابە حوججەو بەڵگەیە ئەگەر قیاسێك نزیکی بکاتەوە لەحەق بلکێ پێیەوە، وەك گوتەی عسمان خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: ئەگەر شتێ بفرۆشێ بەمەرجی ئەوەی بەر پرس نەبێ لەهیچ عەیبێکی، ئەوە بەرپرسی نابێ لەو عەیبەی پێ نەزانیوە نەك ئەوەی پێ زانیوە. لێرەدا عەیبە شاراوەکان قیاسی دەکرێنە سەر عەیبە دیارەکان و ئەوانەی پێ زانیون، شافعی ووتویەتی: چونکە ئەو ئاژەڵە لە هەردو حاڵ نەخۆشی و تەندروستیدا ئالکی دەدرێتی و سروشتی دەگۆڕێ .

وقلما يخلو عن عيب ظاهر او خفي بخلاف غيره فيبرا البائع فيه من خفي لا يعلمه بشرط البراءة المحتاج هو إليه ليثق باستقرار العقد[1] فهذا قياس تقريب قرب قول عثمان المخالف لقياس التحقيق والمعنى من انه لايبرا من شيء للجهل بالمبرا منه[2] .

{وَ قِيلَ قول الشيخين} ابي بكر وعمر {فقط} اي قول كل منهما حجة بخلاف غيرهما لحديث اقتدوا باللذين من بعدي ابي بكر و عمر حسنة الترمذي[3] {وَ قِيلَ } قول {الخلفاء الأربعة} ابي بكر وعمر وعثمان وعلي اي قول كل منهم حجة بخلاف غيرهم لحديث عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين الخ صححه الترمذي وهم الأربعة كما تقدَّمَ في الاجماع بيانه[4] .

---

(١) کەم دەبێ ئەو ئاژەڵە عەیبێکی دیاری پێوە نەبێ و هەمو کەس بیزانێ، بەڵام عەیبی نادیار ئەویش وەك خەڵك نایزانێ، کەوابو فرۆشیار بەر پرسی نابێ لە عەیبی نادیارێك کە نایزانێ بەمەرجێ ئەوەی لەکاتی گرێ بەستەکەیدا ووتوێتی بەرپرس نیم لێ، کە ئەم مەرجەش فرۆشیار بەرپرسی نابێ لەعەیبی نادیارێ: کە نایزانێ بمەرجێ ئەوەی لەکاتی گرێ بەستەکەیدا ووتوێتی بەر پرسی نیم لێ، کە ئەم مەرجەش فرۆشیار زۆر پێویستی پێیەتی، بۆ ئەوەیە متمانەی هەبێ بەدامەزراندنی گرێ بەندەکەی.

(٢) ئەمەش قیاسی نزیککردنەوەی پێ دەووترێ، چونکە قەولەکەی عوسمان کە پێچەوانە قیاسی حەقیقی و خاوەن عیلەتە نزیك خستوەتەوە ، قیاسی حەقیقیش ئەوەیە فرۆشیار بەری نابێ لەعەیبی دیار ، کەوابوو قیاسی عەیبی نادیاریش دەکرێتە سەری، ئەم قیاسی شافعیە قەولەکەی عوسمانی لەڕاستی نیزکتر کردەوە.

(٣) هەندێك ووتویانە: تەنها قەولی ئەبو بکرو عمر حوججە و بەڵگەیە، غەیری ئەوان بەڵگە نیە، لەبەر ئەو فەرمودەی دەفەرموێ: شوێنی ئەو دوانەبکەن لەدوای منەوە ئەبوبەکر عومەر. ئەم فەرمودەیە ترمزی بەفەمرودەی پلە حەسەنی داناوە.

(٤) هەندێ: دەڵێن: قەولی هەریەك لە چوار خەلیفە و جێنیشینەکان حوججەو بەڵگەیە، نەك غەیری ئەوان، لەبەر ئەم فەرمودەیە کە دەفەرموێ: پێویستە لەسەرتان دەست بگرن بەڕەوشتی منەوە وڕەوشتی ئەو جێنیشینانەی ڕێ بەریتان دەکەن بۆ بەرژەوەیندی دونیاو قیامەت..هـ..د.. ترمزی ئەم فەرمودەیە بە پلە صحیح داناوە، ئەوانەش هەرچەوار خەلیفەکەن وەك لەباسی اجماعدا تێپەڕی کرد.

{وعن الشافعي إلاّ عليا} قال القفال وغيره لا لنقص اجتهاده عن اجتهاده عن اجتهاد الثلاثة بل لانه لما آل الأمر إليه خرج الى الكوفةومات كثير من الصحابة الذين كانوا يستشيرهم الثلاثة كما فعل ابو بكر في مسئلة الجدة وعمر في مسئلة الطاعون فكان قول كل منهم قول كثير من الصحابة بخلاف قول علي[1] .

وقضية الجدة انها جاءت الى ابي بكر تسأله مراثها فقال لها مالك في كتاب الله شيء وما علمت لك في سنة رسول الله ﷺ شيئا فارجعي حتى أسأل النّاس فاخبره المغيرة بن شعبة ثُمَّ محمد بن مسلمة أن النبيَّ ﷺ اعطاها السدس فانفذه ابو بكر لها رواه ابوداود وغيره[2] . وقضية الطاعون أن عمر ﷺ خرج الى الشام فبلغه ان به وباء أي طاعون فاستشار من دعاهم من الصحابه في الرجوع فاختلفوا ثُمَّ دعا غيرهم من مشيخة قريش فجزموا بالرجوع فعزم عليه عمر ﷺ ثُمَّ جاء عبدالرحمن بن عوف فقال سمعت رسول الله ﷺ يقول: اذا سمعتُم به بأرضٍ فلاتقدموا عليه وإذا وقعَ بأرضٍ و انتم به فلاتخرجوا فراراً منه فحمد الله عمرُ ثُمّ انصرف رواه الشيخان[3] .

---

(١) ڕێوایەت کراوە لە شافعیەوە کە ووتویەتی: ئەو خەلیفانە قەولیان حوججەو بەڵگەیە جگە قەولی عەلی نەبێ قەفال و غەیری قەفالیش ووتویانە: قسەی عەلی بەحوججەو بەڵگە قبولٚ نیە لەبەر ئەوە نیە اجتهادی ئەم لە اجتهادی سێ‌خەلیفەکەی تر کەمترە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کاتێ کە کاروبارو فەرمانڕەوایی هەمووی بەزەو ڕوی ئەو بویەوە بەرەو کوفە ڕۆی‌یی و زۆربەی ئەو صەحابانەی سێ خەلیفەکەی‌تر ڕاوێژیان پێ‌دەکرن مردن، وەك ئەبوبەکر لە مەسەلەی عێراق ئەنکدا کردی و عمر لە مەسەلەی تاعوتدا کردی، لەبەر ئەوە قسەی هەریەك لەوانە قسەی زۆربەی صەحابەیە. بەلآم قەولی عەلی واینە.

(٢) کێشەودۆزی ئەنکەکە ئەوەبو هات بۆلای ابوبکر داوای میراتی خۆی کرد. ابوبکریش پێ ووت: لە قورئاندا هیچ شتێکت نیە، لەڕەویەی پێغەمبەریشدا هیچ حەقێك لەبارەی تۆوە نازانم، لەبەر ئەوە بڕۆڕەوە هەتا ڕاوێژ بکەم بەخەڵك، ئەمجا عومەیری کوڕی شوعبە و پاشان عەدی کوڕێ مسلمە هەواڵیان دایەکە: پێغەمبەر (ص) شەش یەکی پێداوە، ئیتر ئەبو بکریش شەش یەکەکەی پێ دا. ابو داود و غەیری ابوداودیش ڕێوایەتیان کردووە.

(٣) کێشەی تاعونەکەش ئەوەبو عومەر چوبەرەو شام، ئەمجا هەواڵی پێگەیی کە تاعونی تێدایە، عومەریش کۆمەڵێ صەحابەی بانگ کردو ڕاویژی لەگەڵ کردن. ئەوانیش هەر یەك ڕاییکیان هەبو، پاشان کۆمەڵێکی‌تری لە ڕیش سپیانی قورەیشی

{أمّا وفاق الشافعي زيداً في الفرائض} حتّى تردّد حيثُ ترددت الروايةُ عن زيد {فلدليلٍ لا تقليدٌ} بأن وافق اجتهادهُ اجتهادَهُ و قد قال ﷺ اعلم أمّتي بالفرائض زيد ابن ثابت صحّحهُ الترمذي و كذا الحاكم على شرط الشيخين[1] .

{مسئلةٌ الإلهامُ إيقاعٌ في القلب يثلُج} بضمّ اللام وحكى فتحُها أي يطمئنُّ {له الصّدر يخصُّ به الله تعالى بعض أصفيائه و ليس بحجّةٍ لعدم ثقةٍ من ليس معصوماً بخواطره} لأنّهُ لا نأمن دسيسةَ الشيطانِ فيها {خلافاً لبعضِ الصوفيةِ} في قولهم إنّه حجّةٌ في حقّه أمّا المعصومُ كالنّبيﷺ فهوَ حجّةٌ في حقّه و حقِّ غيرِه إذا تعلّقَ بهم الوحي[2] .

---

بانگ کردو ئەوانیش هەمویان ڕای گەڕانەبوەیان بوو، ئیتر عومەر نیازی تەواوی گەڕانەوەی هێنا، پاشان عبد الرحمن کوڕیٚ عەوف هات و ووتی: من کە لەپێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: کاتیٚ بیستتان تاعون لە شوێنێك هەیە نەچن بۆ ئەو شوێنە، وەکاتێکیش لە جێیکدایە بەرپابوو ئێوەش لە ویٚ بوون ئەوە لەوشوێنە دەرنەچن لەبەر ئەوەی ڕابکەن، بەهۆی ئەم هەواڵەوە عومەر دەستی کرد بەسوپاس کردنی خوا، پاشان گەڕایەوە. ئەم فەر مودەیە هەر دو شێخ ڕیوایەتیان کردووە.

(١) بەلاٚم هاودەنگی شافعی بۆ زەید لەباسی میراتدا، هەتا ترددی کردوو. لە هەرجێیکدا کە ڕیوایەتی تردد کرابیٚ لە زەیدەوە، لەبەر بەڵگەیێك بووە نەك لەبەر تەقلیدو شوێن کەوتنی و بیٚ ئەوەی بەڵگەی بزانیٚ، بەم شێوە اجتهادی شافعی هاوچەشنی اجتهادی زەیدن بووە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: زاناترین کەس لەئومەتی مندا لە میراتدا زەیدی کوڕی سابتە، ترمزی ئەم فەرمودەیە بەپلە صەحیح داناوە، هەر وەها حاکمیش لەپلەی لەسەر مەرجی هەردوو پیر ناوە.

(٢) ئەمەش بابەتێکە. ئیلهام واتە شتیٚ: بکەوێتە ناو دڵەوە و ئەو دڵە ئارام بکاتتەوەو لە دڵە ڕاوکیٚ بخا، ئەوالهامە کە خوای گەروە تایبەتی دەکا بەهەندیٚ لە دڵپاکانی خۆیەوە بەڵگەو حوجە نیە، چونکە کەسیٚ دڵ و کارەکانی دڵی لەلایەن خواوە پارێزراو نەبیٚ جیٚ متمانە نیە، چونکە ئەو کەسە ئەمین نیە لە فێڵی شەیتان لەو شتانەی دەکەونە دڵیەوە، بەپێچەوانەی هەندیٚ لە زانایانی صۆفی کە دەڵێن: ئەو ئیلهامە حوجە و بەڵگەیە تەنها لەحەقی خۆیدا، بەلاٚم کەسیٚ کە پارێزراو بیٚ لە لایەن خواوە، وەك پێغەمبەر (ص) ئەوە ئەو الیهامە حووجە و بەڵگەیە چ بۆ خۆی وە چ بۆ غەیری خۆی، کاتیٚ کە پەیوەندی هەبیٚ بە غەیری خۆیەوە، هەر حوججەیە وەك وەحی و نیگا وایە.

{خاتمةٌ* قال القاضي حسين: مبنى الفقه على} لربعةِ امور{انّ اليقينَ لايرفعُ} اي مـ حيثُ استصحابهِ {بالشكِّ} ومن مسـائله مـن تيقّـنَ الطـهارةَ وشـكَّ في الحـدثِ يـاخـ بالطّهارةِ{و} انّ {الضـرر يُزالُ} ومـن مسائلهِ وجوبُ ردِّ المغصـوبِ و ضمانـه بـالتـف {و}انّ {المشقّةَ تجلبُ التيسيرَ}ومـن مسـائله جوازُ القصـرِ و الجمعِ و الفطـرِ في السـفـ بشرطهِ {و}انّ {العادةَ محكمةٌ} بفتح الكاف المشددة ومن مسائله اقلّ الحيض ولكثـره {قيل} زيـادة علـى الاربعة {و} ان {الامـور بمقاصدها} ومـن مسـائله وجـوب النيـة فـ الطهارة ورجعه المصنّف الى الاول فإنَّ الشيء اذا لم يقصد اليقين عدم حصوله[1]

{الكتاب السادس}

{في التعادل والتراجيح}بين الادلة عندتعارضها{يمتنع تعادل القاطعين}اي تقابلهما بـ يدل كل منهما على مناف مايدل عليه الآخر اذ لـو جاز ذلك لثبت مدلولاهما فيجتمع المتنافيان فلاوجود لقاطعين متنافيين كدال على حدوث العالم ودال علىقدمه[2] .

---

(١) ئەمە كۆتایی ئەم بابەتەیە، قازی حسین ووتویەتی: فیقھ و شەرع لەسەر چوار بنەڕەت دروست کراوە: ١) یەقین بەھۆی گومانەوە لاناچێ، واتە لەڕوی استصحاب و ھاوڕێ خوازی یەقینەوە، واتە: حوکمی یەقینی ھەیە نەك خودی یەقین،یەکێك لە نمونەکانی:کەسێ بێگومان دەست نوێژی گرتبێ و لە بێ دەست نوێـژی بکەوێتە گومانەوە، ئەوە ئێستە کار بەوە دەکا کە دەست نوێژی ھەیە. ٢) زیان دەبێ لابرێ و بژاردنـەوەی بـۆ بکـرێ، یـەکێك لەنمونـەکانی: شـتێ داگـیر کـراو بـێ دەبـێ بگەڕێنرێـتەوەونەوەی لەدەسـت چـووە بـۆی ببژێرێتـەوە. ٣)زەحمـەت و گرانکـاری ئاسانکاری دەوێ، یەکێك لە نمونەکانی دروستە نوێژ کورت بکرێتەوەو کۆ بکرێتەوە. وەڕۆژو دروستە شکاندنی لە سەفەردا، ھەر یەکێ بەمەرجی خۆی. ٤)عـادەت خـوا کردویەتی بەحەکەم و داوەر، یەکێ: لـە نمونـەکانی کـەمتر و زۆر تریـن کـاتی حـەیز عادەت دیاری دەکات. ھەندێك پێنجەمیان بۆ ئەو چوارە زیاد کردووە. ٥) ھەرچی گوفتارو ڕەفتار ھەیە پەیوەندن بەمەبەستەکانیانەوە، بەیەکێك لە نمونەکانی واجبە لەدەست نوێژدا نیەت ھێنان. دانەر ئەم پێنج ھەمینەی گەڕاندووەتەوە بۆ ڕێبازی یەکەم، چونکە ھەر شتێك کاتێ نیەتی بۆ نەھێنرێ بێگومان حاصڵ نابێ.

{بەشی شەشەم لەبارەی دوشت بەرانبەر یەك بکرێن }

(٢) ئەمەش بەشی شەشەمە لەبارەی دوشت بەرانبەر یەك بکرێن وە لەبارەی ھەموو ئەوانەی مەزیەت ئەدرێن لەنێوان بەڵگەکاندا لەکاتی بەگژیەکدا چونیاندا. نابێ و قەدەغەیە دو بەڵگەی بێگومان ھاوتای یەك بن و بەرابنەر بەیەك بووەستن، بەم شێوە ھەریەکێکیان دەلالەت بکا لە سەرشتێ کە دژی ئەوەیە ئەویتریان دەلالەت لەسەری

وعدل عن قول ابن الحاجب تقابل الدليلين العقليين مال الى ماقاله ليناسب قوله تعادل الترجمة وليشمل قوله القاطعين العقليين والنقليين كما صرح بهما ي شرح المنهاج والعقلي والنقلي ايضا والكلام في النقليين حيثُ لا نسخ بيهما ولباحث أن يقول لا بعد في أن يجري فيهما الخلاف الاتي في الامارتين لمجيء توجيهه الآتي فيهما[1]

{وكذا} يمتنع تعادل {الامارتين} اي تقابلهما من غير مرجح لاحداهما {في نفس الامر على الصحيح} حذرا من التعارض في كلام الشارع والمجوز وهو الاكثر يقول لا محذور في ذلك وينبني عليه ماسياتي اما تعادلهما في ذهن المجتهد فواقع قطعا وهو منشأ تردده كتردد الشافعي الآتي[2].

---

دەکا، چونکە ئەگەر ئەوە دروست بێ دەبێ ماناو مەدلول و دەلالەت لەسەر کراوی هەردوکیان سابت بێ، ئەوکاتە دوشتی دژ بەیەك کۆدەبنەوە،، خۆشتێکی بێ گومانیشە دوبەڵگەی بێ گومانی دژ بەیەك هیچ جۆرە بونیکیان نیە و نابن، وەك شتێ دەلالەت بکا لەسەر دروستکراوی جیهان و شتێکی تریش دەلالەت بکا لەسەر هەربونیو قەدیمی جیهان.

(١) دانەر لەپێناسەکەی ابن الحاجب لای دا کە دەڵێ: دو بەڵگەی عەقلی دژ بەیەك بن شتێکی مەحاڵە، بۆ ئەو پێناسەی خۆی کەووتی و کردی، بۆ ئەوەی قسەی دانەر کەووتی: تعادل، مناسب بێ بۆ تەرجەمەو عینوانی بابەتەکە،وە بۆ ئەوەی قسەکەی دانەر کەووتی: القاطعين، گشت گیری بۆ دوبەڵگەی عەقلی و دو بەڵگەی نەقلی، وەك چۆن لەکتێبی (شرح المنهاج) دا بەڕوونی ئەو بەڵگانەشی ووتوەوە بەڵگەی بێگومانی پێکهاتە لەعەقڵیو نەقلیش بکرێتەوە، ئێمە قسەمان لەدوبەڵگەی نەقلین کە نەسخ و سڕینەوەن با لە نێوانیاندا نەبێ ڕەوایە بۆ کەسێکی توێژینەرەوەکە بڵێ: دورنیە ئەو خلاف و جیاوازیەی کە لەباسی دوو نیشانەدا دێن وە دروستە لەنێوان ئەم دوو بەڵگە بێگومانەشدا دروست بێ چونکە ئەو بەڵگەی دروستیە لەوێ هێنراوەتەوە بۆیان بۆ ئەمانیش هەر بهێنرێتەوە بەلام ئەکرێ وەلام بدرێتەوە کە دروستە و ئەگونجێ لەگەڵ واقیعدا تامەان و ڕێسمانە!

(٢) هەروەها نابێ و ناکرێ دونیشانە و بەڵگەی گوماناوی معادەلە و بەرانبەرییەك بکەن بێ ئەوەی لەواقعێکدا شتێك هەبێ ترجیحی یەکێتکیمان بداو مەزیەتی پێ بدا، بەسەر قەولی صەحیح، بۆیە ئەوە نابێ لە بەر ئەوەی خۆی بپارێزی لەوەی لەکەلامی شارعدا دوشت هەبێ و بچن بەگژیەکدا و نەیاری یەك بن، ئەو کۆمەڵەش کە دەڵێن دروستە، ئەمانە زۆر ترن، دەڵێن: هیچ ترسێ لەوەنیە، ئەو یاسایەی لەمەو دوای دێ:

{فان توهم التعادل} اي وقع في وهم المجتهد اي ذهنه تعادل الامارتين في نفس الامر بناء على جوازه حيثُ عجز عن مرجح لاحداهما {فالتخيير} بينهما في العمر {اوالتساقط} فهما فيرجع الى غيرهما {اوالوقف} عن العمل بواحد منهما {او التخيير بينهما {في الواجبات} لانه قد يخير فيها كما في خصال كفارة المين {والتساقط في غيرها اقوال} اقربها التساقط مطلقاً كما في تعارض البينتين[1] . وسكت المصنّف هنا عن تقابل القطعي والظني لظهور أن لا مساواة بينهما لتقدم القطعي كما قاله في شرح المنهاج وهذا في النقليين[2] .

(فإن توَهم التعادل) لە سەر ئەم قەولەی کە دەڵێ دروستە دو دەلیلی ظنّي بەرانبەر یەك بووستن. بەڵام ئەودو بەڵگە بەرابنەر یەك بوەستن لە زیهنی مجتهددا ئەوەبێگومان بووە و دەبێ هەر ئەوەشە سەرچاوەی دروستبونی گومانی مجتهد، وەك ئەو نەم تەدرِدیدەی کە بۆ شافعی دروستبووەو لە مەدوای دێ،

(١) ئەگەر وا کەوتە زیهنی مجتهدەکەوە کە لە واقعدا ئەو دوبەڵگەیە معادل و بەرانبەر بەیەکن، ئەم قسەش لەسەر ئەو قەولە دروست دەبێ کەووتی دروستە ئەم دوانە هەبن، وە مجتهدەکە توانای ئەوەی نیە یەکێکیان مەزیەت بدا بەسەر ئەوی تر ئەوە ئەم چەند شتەی لەبەردەمدایە: ١)سەرپشك دەکرێ لەنێوانیاندا کار بەکامیان دەکا ئارەزوی خۆیەتی. ٢)یاخود یەکتر دەخەن و هیچکامیان کاریان پێ ناکرێ، ئیتر دەڕوا کار بەیەکێکی تر دەکا. ٣)یاخود دەوەستێ کار بەهیچکامیان ناکات. ٤)یاخود سەرپشك دەکرێ لەنێوانیاندا کار بەکامیان بکا، ئەگەر لەبارەی واجباتەوە بن، چونکە جاری واهەیە لەواجباتدا سەرپشك دەکرێ، وەك لەکەفارەتی سوێندا وایە، لەغەیری واجباتیشدا هەر دوکیان دەکەون و کاریان پێ ناکرێ، ئائەمانە چوار قەوڵ، نزیکترینیان ئەوەیە کە هەر دوکیان بکەون و یەکتر بخەن چ لە واجباتدا بن یاخود لە غەیری واجباتدا بن، ئەمەش بەقیاسی لەسەر، بەگژ دا چونی دوشاهد وەك چۆن ئەمان هەردوکیان دەکەون ئەمانیش هەروەها.

(٢) دانەر بێ دەنگ بو لێرەدا لەبارەی بەرانبەری وەستانی بەڵگەیێکی بێگومان لەگەڵ بەڵگەیێکی گومانادیدا، ئەوە لەبەر ئەوەبووە کە شتێکی دیارە ئەو دو بەڵگە یەکسانی نیە لە نێوانیاندا، چونکە بەڵگەی بێگومان لە پێشدایە، وەکك لە کتێبی (شرح المنهاج)دا وتویەتی. ئەمەش واتە نەبونی یەکسانی نێوانیان بۆ دوو بەڵگە دەبێ کە نەقڵی بن.

واما قول ابن الحاجب لا تعارض بين قطعي وظني لانتفاء الظن أي عند القطع بالنقيض كما تممه المصنف وغيره فهو في غير النقليين كما اذا ظن ان زيدا في الدار لكون مركبه وخدمه ببابها ثُمَّ شوهد خارجها فلا دلالة للعلامة المذكورة على كونه في الدار حال مشاهدته خارجها فلا تعارض بينهما بخلاف النقليين فان الظني منهما باق على دلالته حال دلالة القطعي وانما قدم عليه لقوته[1] .

{وان نقل عن مجتهد قولان متعاقبان فالمتاخر} منهما {قوله} اي المستمر والمتقدم مرجوع عنه {والا} اي وان لم يتعاقبان بان قالهما معاً {فما} اي قوله منها المستمرما {ذكر فيه المشعر بترجيحه} على الآخر كقوله هذا اشبه وكتفريعه عليه {والا} اي وان لم يذكر ذلك {فهو متردد} بينهما[2] .

---

(١) بەڵام ئەو قسەی ابن الحاجب کە دەڵێ: دژایەتی نیە لە نێوان بەڵگەیێکی بێگومان و بەڵگەیێکی گوماناوی دا لە بەر فەوتان و بێ ئەرزشی بەڵگەی گوماناوی واتە: لەکاتی بێگومان بون لە دژەکەی، وەك دانەروغەیری دانەریش بۆیان تەواو کردووە، ئەوە ئەم قسە بۆ دوبەڵگەی عەقڵی دەبێ وەك کاتێ گومان بەرێ زەید لەماڵدایە بە ناونیشانی ماشێن و پاسەوانی لەبەر دەرگادان، پاشان لەدەرەوەی ماڵەکەدا دەبینرێ، کەوابو بەڵگە پێشینەکە هیچ دەلالەتێکی نامێنێ لە سەر ئەوەی کە لەماڵەوەدایە لەکاتی بینینی لە درەوەی ماڵەکەدا، لەبەر ئەوە ئیتر هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوانیاندا، بەڵام دوبەڵگەی نەقلی وانین، چونکە گومانا و یەکەیان هەر دەمێنێتەوە لەسەر دەلالەتی خۆی لە کاتی دەلالەت کردنی بەڵگە بێ گومانەکەشدا، بۆ یە پێش خراوە بەسەریدا کە لەبەر هێز و توانای.

(٢) ئەگەر لە مجتهدێکەوە دو قەولی یەك لەدوایەکی لێوە نەقڵ کرا ئەوە کامەیان لەدوای وەهاتووەوە ئەوەیان قەولی بەردەوامیەتی و کاری پێ دەکرێ، پێشنیك کەیان لێ گەڕاوەتەوە و کاری پێ ناکرێ، وەئەگەر هەر دوکیانی لەیەك کاتا ونبوون و پێکەوە بلاوی کردونەتەوە، ئەوەیان قەولی بەردەوامیەتی و کاری پێی دەکرێ کە شتێکی تێدایە نیشانەی مەزیەتیەتی بەسەر ئەویاندا، وەك ئەوەی بڵێ: ئەمەیان بەحەقەوە زیاتر ئەشوبهێ، یاخود لە یەکێکیان لق و پۆی زۆر لێ بکاتەوە، وە ئەگەر ئەمەی تێدا نەبوو، ئەوە ئەو مجتهدە مترددە لە نێوانیاندا، هەر جارێ بەیەکێکیانەوە دەنیشێتەوە.

{ووقع} هذا التردد {للشافعي} ﷺ {في بضعة عشر مكانا} ستة عشر او سبعة عشر كما ترددفيه القاضي ابو حامد المروزي {وهو دليل على علوشانه علما ودينا} ـه علما فلان التردد من غير ترجيح ينشأ عن امعان النظر الدقيق حتى لا يقف على حالة وأما دينا فإنَّهُ لم يبال بذكره مايتردد فيه وان كان قد يعاب في ذلك عادة يقصور نظره كما عابه به بعضهم[1].

{ثُمَّ قال الشيخ ابوحامد} الاسفرايني {مخالف ابي حنيفة فيهما لرجح من مواقفه فان الشافعي انما خالفه لدليل {وعكس القفال} فقال موافقه ارجح وصحيحه النووي لقوته بعدد قائله واعترض بان القوة انما تنشا من الدليل فلذلك قال المصنف {والأصَحُّ الترجيح بالنظر} فما اقتضى ترجيحه منهما كان هو الراجح {فان وقف}عن الترجيح {فالوقف} عن الحكم ترجحان واحد منهما[2].

(١) ئەم تەردیدو هەرجاریٚ شتیٚ مەزیەت بدریٚ لەلایەن شافعیەوە خوای لیٚ ڕازیٚ بیٚ لەدەو ئەوە ندەجێسدا ڕویداوە، شازدە یاخود حەفدە شوێنە، وەك لەو ئەوەندە جێگەدا قازی (ابوحامدی مروزی) تیادا متردد بووە هەرجاری لایێکاینی مەزیەت داوە، ئەوە تەردیدەش نیشانەی بەرزی پلەی شافیعیە لەڕوی عیلم و دینەوە، جا لە ڕیٚ علم و زانستەوە چونکە تردود و نەنیشتنەوەو بە لایێکەوە بیٚ ئەوەی مەزیەتی یەکێکیان بدات ئەوە لە قوڵی بیری ووردەوە دروست دەبیٚ، هەرجاریٚ لە لایێکەوە ڕۆ دەچیٚ هەتاوای لیٚ دیٚ لەسەر یەك حاڵەت ناوەستیٚ، بەڵام لە ڕۆی ئاییندارییەو شافعی گویٚ نەداوە بەوەی کە باسی ئەوەدا کە تەرەدودی تێدایە، هەرچەند لە ڕوی عادەتەوە نەك عیلمەوە لەوەدا عەیبدار دەکریٚ بەوەی دەڵێن بیرکورتی، وەك چۆن هەندێك بە بیرکورتی شافعیان عەیبدار کردووە.

(٢) ئەگەر شافعی دوو قەولی هەبوو کامیان لە پێشە؟ پاشان اسفراینی دەڵیٚ: ئەو قەولەیان کە پێچەوانەی ابو حەنیفە بیٚ لە پێشەترە لە وەیان هاودەنگیەتی، چونکە بیٚ گومان کە شافعی پێچەوانەی ابو حەنیفەی فەرمووە لەبەر بەڵگەیێك بووە، بەڵام قەفال قسەکەی اسفراینی پێچەوانە کردووەتەوە، وتویەتی: ئەو قەولەیان هاودەنگی ابوحەنیفە بیٚ ئەوەیان لە پێشترە و بەهێزترە، ئەوەویش ئەم قسەی قەفالی بە ڕاست زانیوە، چونکە قسە کە بەهێز دەبیٚ بەهۆی زۆری خاوەنە کانیەوە، ڕەخنە لەم وەڵامە گیراوە کە هێزو قووە لە بەڵگەوە دروست دەبیٚ نەك لە زۆری خەڵکەوە، جا لەبەرئەوە دانەر دەڵیٚ: قەولی ئەصەح ئەوەیە مەزیەتی یەکێکیان ئەدریٚ بەهۆی بەڵگەو بیرەوە دەبیٚ، جا ئەوەی بەڵگەوبیر داوای تەرجیح و مەزیەتی دەکا لەو دوو قەولەدا ئەوان

**{وان لم يعرف للمجتهد قول في مسئلة لكن} يعرف له قول في {نظيرها فهو} اي قوله في نظيرها {قوله المخَرج فيها على الأصحّ} اي خرّجهُ الأصحاب فيها إلحاقاً لها بنظيرها وقيل ليس قولاً لهُ فيهما لاحتمال ان يذكر فرقا بين المسئلتين لو رجع في ذلك[1] .**

**{والأصَحُّ} على الاول {لاينسب} القول فيها {اليه مطلقاً بل} ينسب إليهِ {مقيدا} بانه مخرج حتى لا يلتبس بالمنصوص وَ قيلَ لاحاجة الى تقييده لانه قد جعل قوله[2] {ومن معارضة نص آخر للنظير} بان ينص فيما يشبه على خلاف مانص عليه فيه اي من النصين المتخالفين في مسئلتين متشابهتين {تنشا الطرق وهي اختلاف الاصحاب في نقل المذهب في المسئلتين فمنهم من يقرر النصين فيهما ويفرق بينهما} [3] .**

---

راجح و پەسەندترە. جا ئەگەر بەڵگە و بیرەکە نەیتوانی ووەستا لە تەرجیح و مەزیتدان ئەوە لە حوکمەکەش دەوەستێن کە تەرجیمومە زیەتی یەکێکیان بدرێ.

(١) ئەگەر لە بابەتێکدا مجتهد قەولی تێدا نەبێ بەڵام لە هاووێنەی ئەو بابەتەدا قەولی هەیە، جا ئەو قەولەی لەو هاووێنە یەدا قەولێکی دەرهێنراوی ئەو مجتهدەیە لەو بابەتە دا لە سەرقەولی ئەصح، واتە هاوەڵانی شافعی دەریان هێناوە لە و بابەتەدا چونکە کردویانە تەپاشکۆی ئەو هاوێنەیە، هەندێکی زوو توویانە: ئەو قەولی ئەو مجتهدە نیە لەو باتە دا، چونکە هەڵدە گرێ ئەو مجتهد و جیاوازێك باس بکا لە نێوان ئەو دوبابەتەدا ئەگەر پێداچونەوەێکی تێدا بکرایە.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە لەسەر یەکەمەکە ئەو قەولە لەو بابەتەدا نادرێتە پاڵ ئەو مجتهدە بەڕوتی، بووترێ ئەمە قەولی شافعیە، بەڵکو ئەدرێتە پاڵی بەلکاندنی ووشەی: قەولی دەهێنراوی شافعی، بۆیە دەووترێ دەرهێنراو بۆ ئەوەی نەئاڵێ بە بەقولێیکیەوەکە دەقی لەسەر بێ، هەندێك وتویانە: پێویست ناکا ئەوو ووشەی پێوە بلکێنرێ، چونکە بێ گومان کراوەتە قەولی ئەو مجتهدە.

(٣) ئەگەر دەقێکی مجتهد چوبە گژ دەقێکی هاوێنە کەیدا، بەم شێوە لە شتێکدا دەق نرا بێ. بەهاو وێنەکەیدا کە بشوبهێ پێیەوە لە سەر پێچەوانەی ئەوەی دەقی بەسەرا نراوە لە هاو وێنەکەدا، واتە لە دو دەقی پێچەوانەی یەکەوە لەدوو بابەتی هاووێنەدا چوار ڕێگە دروست دەبێ. طرق چیە؟ بریتیە لە جیاوازی هاوڕێیانی ئەو مجتهدە لە نەقل کردنی بۆ چونیدا لە دوبابەتدا، هەندێکیان ددان دەنێن بەهەردو دەقەکەدا لەهەردوو بابەتەکەدا و فەرقی ئەو درو بابەتەش دەکەن .

ومنهم من يخرج نص كل منهما في الاخرى فيحكي في كل قولين منصصا ومخرجـ وعلى هذا فتارة يرجح في كل نصها ويفرق بينهما وتارة يرجِّح في احدهما نصها وفي الاخرى المخرج ويذكر مايرجحه على نصها[1]{والترجيح تقوية احد الطريقين}بوجه مما سيأتي فيكون راجحاً {والعمل بالراجح واجب} بالنسبة الى المرجوح فالعمل بـ ممتنع سواء كان الرجحان قطعيا ام ظنيا[2].

{وقال القاضي} ابو بكر الباقلاني {الا مارجح ظنا} فلا يجب العمل به {اذ لاترجيح بظن عنده} فلا يعمل بواحد منهما لفقد المرجح[3]. {وقال} ابو عبدالله {البصري ـ رجح احدهما بالنظن فالتخيير} بينهما في العمل وانما يجب المعل عنده وعند القاضي بما رجح قطعا[4].

---

(١) هەندێکی‌تریان دەقی هەریەك لەو دووانە لەویتردا دەردەهێنێ، لەبەر ئەوە لە هەموو یەکێکیاندا دوو قەولی دەق بەسەرا نرا ، و حیکایەت دەکا لە گە قەولێکی دەرهێنراودا، لەسەر ئەمەی دو هەم جاری وا هەیە لە هەرەکێکیانـ مەزیەتی دەقەکەی دەدرێ و جیاوازی دەخرێتە نێوانیانەوە، وەجارێ واش هەیە لە یەکێکیاندا مەزیەت دەدرێ، لەویتردا قەولە دەهێنراوەکە، ئەوەش کەمەزیەتی ئە بەسەر دەقەکە دا باس دەکا.

(٢) تەرجیح بریتیە لە بەهێزکردنی یەکێك لە و دوو ڕێ و بەڵگە گومانیە بە یەکێ لەو شتانەی مەزیەتیان پێ بدرێ،جا ئەمانەیان دەبێ بەراجح و پەسەندتر، کار کردنیش بەو راجحە واجبە بە نیسبەت مەرجوحەکەوە لەبەر ئەوە کارکردن بەمەرجوحەکە قەدەغەیە، ئیتر هۆی ڕەجەحان و پەسەندیە دەکەی بێگومانبێ یاخود گوماناوی بێ.

(٣) باقلانی ووتویەتی: واجبە کارکردن بەراجع مەگەر ئەوە نەبێ بەهۆیێکی گۆماناویە تەرجیح و پەسەند کرابێ، لەو کاتەدا واجب نیە کارکردن پێی، چونکە بەلای باقلانیەوە تەرجیح بەزەن و گومان نادرێ، لەبەر ئەوە کار بەهیچکامیان ناکرێ. چونکە شتێك نیە مرجح بێ.

(٤) بەصری ووتویەتی: ئەگەر بەهۆی بەڵگەی گوماناویەوە یەکێکیان تەرجیح درا ئەوە خەڵك سەرپشك ئەکرێ لە نێوانیاندا بەکامیان کاردەکەن ئارەزوی خۆیانە. ئەوەی کە قازی و بصری دەڵێن: واجبە کاری پێ بکرێ کاتێ لەبەر بەڵگەیێکی بێ گومان تەرجیح درابێ.

{ولا ترجيح في القطعيات لعدم التعارض} بينها اذ لو تعارضت لا جتمع المتنافيان كما تقدَّم[1] {والمتاخر} من النصين المتعارضين {ناسخ} للمتقدم منهما آيتين كانا اوخبرين او آية و خبرا يشرط النسخ[2] {وان نقل المتاخر بالآحاد عمل به لان دوامه} بأن لا يعارض {مظنون} ولبعضهم احتمال بالمنع لان الجواز يؤردي الى استقاط المتواتر بالآحاد في بعض الصور[3].

{والأصَحُّ الترجيح بكثره الادلة والرواة} فاذا كثر احد المتعارضين بموافق له أو كثرت رواته رجح على الآخر لان الكثرة تفيد القوة وَ قيلَ لا كالبينتين[4] {و} الأصَحّ {أن العمل بالمتعارضين ولو من وجه اولي من الغاء احدهما} بترجيح الآخر عليه[5].

(١) تەرجی لە نێوان بەڵگە بێ گومانە کاندانیە، چونکە دژایەتیان لە نێواندا نیە، چونکە ئەگەر بەگژیەکدا بچن ئەوە دروست ئەبو دو دژ کۆبکرێنەوە، وەك لە پێشەوە ڕابوورد .

(٢) ئەگەر (ا) دوو دەق بەگژیەکدا بچن کامەیان لە دواوە هاتووە سڕینەرەوەی پێشینەکەیانە، هەردوکیان چ ئایەت بن، یاخود هەردوکیان فەرمودەبن یاخود یەکێکیان ئایەت بێ وئەوی تریان فەرمودەبێ، بەڵام بەمەرجێ مەرجی سڕینەوە هاتبێتەدی.

(٣) ئەگەر ئەوەیان کەلە دواوەوە هاتووە لە ڕێ تاکە فەرمودەوە نەقلْ کرابێ کاری پێ دەکرێ، چونکە مانەوەی پێشینەکە هەر لە پێشەوە بێ و نەیارێکی نەبێ جێ گومانە و شتێکی بێ گومان ینە، هەندێکان وتویانە: نابێ دەقی دوواوە بە ئاحاد نەقل کرابێ، چونکە ئەگەر دروستبێ، سەر ئەکیشێ بۆ ئەوە کە دروستە متراتر بەئاحاد وەلابنرێ لە هەندی نمونەدا، ئەو نمونەش ئەوەیە هەردوکیان متواتربن بەڵام یەکێکیان بەئاحاد نەقلْ کرابێ.

(٤) (٢)قەولی ئەصەح ئەوەیە هۆی مەزیەتدانی یەکێکیان بەسەر ئەویتردا بەڵگەی زۆرو ڕوایەتکەری زۆرە، کەوابو هەرکات یەکێك لە وانەی بەگژ یەکدا دەچن بە هۆی ئوەوە موافقی هەن زۆرو بەهێز بوو یاخود ڕیوایەتکەرەکانی زر بوون ئەوە تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەویتردا، چونکە زۆری هێز دەگەیەنێ. هەندێك وتویانە: نەخیر هێزو توانا ناگەێنێ، چونکە وەك ئەوە وایە من دوشا هدم هەبن و تۆیش صەد شاهد هەرهێزیان وەك یەك وایە بەگژیەکدا دەچن.

(٥) قەولی ئەصەح ئەوەیە دو بەڵگە بەگژ یەدا بچن باش وایە هەردوکیان کاریان پێ بکرێ چاکترە لەوەی یەکێکیان بەتاڵ پۆچەڵ کەینەوە، با ئەو کارپێ کردنەش

وَ قِيلَ: لا فيصار الى الترجيح مثاله حديث الترمذي وغيره انما اهلب دبغ فقد طهر مع حديث ابي داود والترمذي وغيرهما لا تنفعوا من الميتة باهاب ولا عصب الشامر للاهاب المدبوغ وغيره فحملناه على غيره جمعا بين الدليلين وروى مسلم الاول بلفظ اذا دبغ الاهاب فقد طهر[1] {ولو} كان احد المتعارضين {سنة قابلها كتاب} فان العمر بهما من وجه اولى {ولا يقدم} في ذلك {الكتاب على السُنَة ولا السُنَة عليه خلاف لزاعميهما} فزاعم تقديم الكتاب استند الى حديث معاذ المشتمل على انه يقتضي بكتاب الله فان لم يجد فبسنة رسول الله ﷺ و رضا رسول الله بذلك رواه ابو داودوغيره وزاعم تقديم السُنَة استند الى قوله تعالى:﴿ لتبين للناس مانزل اليهم ﴾[2].

---

لەیەك ڕووەوە بێ، بەتاڵ کردنەوەکەشی بەهۆی تەرجیحی یەکێکیان بەسەرتەوی تردابێ.

(١) هەندێك ووتویانە: کار بەهەردووکیان ناکەین، چونکە ڕو ئەکرێتە تەرجیح مانای وایە ئەوبتریان بەتاڵ بوەتەوە. نمونەش وەك ئەوفەرمودەیە تیرمیزی و غەیری تیرمیزی ڕیوایەتی دەکەن و دەفەرموێ: هەرچی پێستەهەیە ئەگەر دەبغ کرا ئەوەبی گومان پاك دەبێتەوە، لەگەڵ ئەو فەرموودەدا کە ابوداودو تیرمیزی و غەیری ئەوان ڕیوایەتی دەکەن و دەفەرموێ: سود لە مردارەوەبو وەر نەگرن چ بە پێستەکەی بێ یابە ڕەگی بێ، ئەمە یان پێستەی دەبغ کراو دەبغ نەکراویش دەگرێتەوە، بەڵام ئێمە دەیبڕین بەسەر دەبغ نەکراودا بۆ ئەوەی هەردوبەڵگە کە کۆبکرێنەوەو کاریان پێبکرێ وهیچ کامیان بەتاڵ نەکەینەوە. موسلیم یەکەمیانی بەم شێوە ڕیوایەت کردووە: کاتێ پێستە دبغ کرا ئەوە بێ گومان پاك دەبێتەوە.

(٢) هەرچەند یەکێك لەو دوانەی بەگژیەکدا چون فەرمودەبێ و بەرانبەرکەی ئایەتبێ،هەر کارکردن بە هەردوکیان باشترە لەوەی پوچەڵی کەینەوە، لەڕوێکەوە. لەو بەگژدا چونی فەرمودە و ئایەتەدا قورئان پێش فەرمودە ناخرێ و فەرمودەش پێش ئەو ناخرێ، بە پێچەوانەی ئەوانەی وا دەڵێن، جا ئەوەی کەدەڵی وادەزانێ کەقورئان پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەدا پشت دەبەستێ بەو فەرمودەی بەمەعاذ ووترا، کە ئەوەی تیایە یەکەمجار حوکم و داوەری بە قورئان بکا، جا ئەگەر لە قورئاندا دەستی نەکەوت ئەمجا بە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ کار بکا، پێغەمبەریش بەوە ڕازی بووە ابوداود و غەیری ابوداود ڕیوایەتیان کردووە ئەوەش وادەزانیفەرمودە پێش دەخرێ بەسەر قورئاندا پشتی بەستووە بەم ئایەتەوە کە ئەفەرموێ: قوئانمان ناردووە بۆ ئەوەی ڕونی بکەیتەوە بۆ خەڵك.

مثاله قوله ﷺ في البحر هو الطهور ماؤه الحل ميتته رواه ابو داود وغيره مع قوله تعالى﴿ قل لا اجد فيما اوحي الى محرما ﴾ الى قوله او لحم خنزير فكل منهما يتناول خنزير البحر وحملنا لآية على خنزير البر المتبادر الى الاذهان جمعا بين الدليلين[١] .

{فان تعذر} العمل بالمتعارضين اصلا {وعلم المتاخر} منهما في الواقع {فناسخ} للمتقدم منهما {والا} اي وان لم يعلم المتاخر منهما في الواقع {رجع الى غيرهما} لتعذر العمل بواحد منهما[٢] {وان تقارنا} اي المتعارضان في الورود من الشارع {فالتخيير} بينهما في العلم بواحد منهما {ان تعذ الجمع} بينهما {و} تـذر {الترجيح} بان تساويا من كل وجه فان امكن الجمع والترجيح فالجمع اولى منه على الأصحّ كما تقدَّم[٣] .

(١) نمونه بۆ ئەوەی قورئان و فەرموده نەیاری یەکبن و کار بەهەر دوکیان بکرێ: پێغەمبەر لەباری بەحرو ئاوی سوێرەوە دەفەرموێ:ئاوەکەی پاکەوەکەرەو مردارەوە بوی حەلاڵە ابوداود غەیری ئەویش ڕیوایەتی دەکەن لەگەڵ ئەو ئایەتەی ئەفەرموێ: تۆ بڵێ لەوەدا بەوەی بۆم هاتووە هیچ حەرامێ: نابینم جگە لە.. گۆشتی بەراز. هەریەك لەم ئایەت و فەرمودەیە بەراز دەریا دەگرێتەوە، لە بەر ئەوە ئایەتەکامان بری بەسەر بەرازی ووشکانیدا کەعادەت وایە هەر ووترا بە راز بیری گوێگر یەکسەر بۆ بەرازی ووشکانی دەڕوا. بۆیە وا دەکەین هەردو بەڵگە کە کۆدەکەینەوە و هیچ کامیان بەتاڵ ناکەینەوە.

(٢) ئەگەر ڕێگرێك هەبو کاربکرێ بەهەردو نەیارەکە بەبێ گومان دەشزانرا کامیان لە دواوە هاتووە لەواقعدا، ئەوە سڕینەرەوەی پێشینەکەیانە، وە ئەگەر نە ئەزانرا کامیان لەدواوە هاتووە لە واقیعدا، ئەوە لە هەردووکیان دەست هەڵدەگرین و دەگەڕێنەوە بۆ بەڵگەییکی تر، چونکە ڕێگرەیە کار بەهیچ یەکێ لەو دووانە بکەین.

(٣) بەڵام ئەگەر هەردو نەیارەکە لەیەك کاتدا لەلایەن،شارعەوە هاتبن، ئەوە خەڵك دەکرێتە سەر پشك لە بنۆانیاندا کاربە کامیان دەکەن ئارەزوی خۆیانە، بەڵام بە مەرجێ ڕێگر هەبێ نەیەڵێ هەر دوو کۆبکرێنەوە ، یا خود تەرجیحی یەکێکیان بدرێ، بەم شێوە لە هەموو ڕوێیکەوە وەك یەك وابن ئەگەر دەستی ئەدا جمعیش و ترجیحیش ئەوە جەمعەکەیان باشترە، لەسەر قەولی اصح، وەك رابوورد.

{وان جهل التاريخ} بين المتعارضين اي لم يعلم بينهما تأخر ولا تقارن {وامكن النسخ} بينهما بأن يقلاه {رجع الى غيرهما} لتعذر العمل بواحد منهما {والا} اي وان لم يمكن النسخ بينهما {بخير} الناظر بينهما في العلم {ان تعذر الجمع} بينهما {والترجيح} كما تقدَّمَ في المتقارنين هذا كله فيما اذا تساو يا في العمومي ولاخصوص {فان كان احدهما اعم} من الآخر مطلقاً او من وجه {فكما سبق} في مسئلة آخر مبحث التخصيص فليراجع[1] .

{مسئلة يرجع بعلو الاسناد} اي قلته الوسائط بين الراوي للمجتهد وبين النبيْ ﷺ {وفقه الراوي ولغته ونحو} لقلة احتمال الخطأ مع واحد من الابعة بالنسبة الى مقابلاتها {وورعه وضبطه وفطنته ولو روى} الخبر {المرجوح باللفظ} والراجح بواحد مما ذكر بالمعنى[2] .

(١) ئەگەری ئەو دوو ئەيارە نەزانرا، واتە كامەيان لە دواە هاتووە ياخود پێكەوە هاتوون يانە، وە ئەگونجا سڕینەوە لە نێوانیاندابێ، بەم شێوەیە هەردوکیان قەبوڵی سڕینەوەیان دەکرد، ئەوە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ بەڵگەیێکی تر، چونکە ڕێگر هەیە بۆ ئەوەی کار بەیەکێکیان بکرێ، وە ئەگەر سڕینەوە نە ئەگونجا ئەوە خاون بیر سەرپشك ئەکرێ لە نێوانیاندا کاربەکامیان دەکا ئارەزوی خۆیەتی، ئەگەر ڕێگر هەبوو نەیلێ کۆبکرێتەوە یا تەرجیح مەزیەتی یەکێکیان بدرێ بەسەر، ئەویتردا، وەك لەپێشەوە رابورد لە باسی ئەوەدا ئەگەر هەردوکیان لەیەك کاتدا هاتبن.ئەمەی کەووترا هەموی کاتێ دەبێ لە عموم وخصوصدا وەك یەك وابن، بەڵام ئەگەر هاتویەکێکیان لەویتربان گشت گیر تربوو لە هەمو ڕوێیکەوە، یاخود تەنها لەیك ڕووەوە ئەوە وەکو ئەو بابەتە وایە کە لە کۆتا باسیتخصیص و تایبەت کردنەوە باس کرا، باقوتابی بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ بەسەریدا بڕواتەوە.

(٢) ئەمەش بابەتێکە، بەچی تەرجیح ئەدرێ؟ تەرجیح و مەزیەتی یەکێکیان بەسەر ئەویتردا ئەدرێ: ١) بە بەرزی اسنادو زووتر بگاتەوە پێغەمبەر ﷺ واتە واستەو ئەوانەی ئەکەونە نێوان ئەو کەسەی ڕیوایەتی دەکا بۆ مجتهد و نێوان پێغەمبەر ﷺ ٢) بەوورد بینی و شەرع زانی ڕیوایەت کەر ٣)بەلۆغەت و زاراوەزانی ڕیوایەت کەر ٤)بەنەحو زانینی، چونکە دەستدانی ڕیوایەتە کە بۆ غەڵەت کەمتر دەبێتەوە لەگەڵ یەکێك لەم چوارەدا، بەگوێرەی دژەکانی ئەم چوارە ٥)بەهۆیوەرعیەوە ٦)بەهۆیزەبت ولەبەرکردنیەوە ٧)بەزیرەکیەوە. هەرچەند فەرمودە مەرجوحەکە بەلەفزەکەی ڕیوایەت کرابێ، وراجیحەکەش بەهۆی یەکێك لەم حەوتەوبەماناکەیەوە ڕیوایەت کرابێ.

{ويقظته وعدم بدعته} بإن يكون حسن الاعتقاد {وشهرة عدالته} لشدة الوثوق به مع واحد من الستة بالنسبة إلى مقابلانها[1] {وكونه مزكى بالأخبار} من المجهد فيرجع على المزكى عنده بالاخبار لان المعانية اقوى من الخبر {أو اكثر مزكين و معروف النسب قيل ومشهوره} لشدة الوثوق به والشهرة زيادة في المعرفة والأصَحُّ لا ترجيح بها[2] {وصريح التزكية على الحكم بشهادته والعمل بروايته} فيقدم خبر من صرح بتزكيته على خبر من حكم بشهادته وخبر من عمل بروايته في الجملة لان الحكم والعمل قد يبينان على الظاهر من غير تزكية[3]. {وحفظ المروى} فيقدم مروى الحافظ له على مروى من لم يحفظه لاعتناء الاول بمرويه {وذكر السبب} فيقدم الخبر المشتمل على السبب مالم يشتمل عليه لا هتمام راوي الاول به[4].

---

(١) ٨) بەهۆی هۆشیاریەوە ٩)بەهۆی نەبونی بیدعەتیەوە، بەم شێوە اعتقادو باوڕی جوان بێ ١٠) بەهۆی بەناو بانگی عەدالەتیەوە، لەبەر ئەوەی متمانە بەوڕیوایەتکەرە تۆندو تۆڵ تردەبێ لەگەڵ یەکێك لەم شەشەدا بەنیسبەت دژەکانیانەوە.

(٢) ١١)بەهۆی ئەوەی کە ڕیوایەت کەرەکە لە تاقیکردنوەی خودی مجتهدەکەوە تەزکیە کرابێ، ئەمە تەرجیح ئەدرێ بەسەر کەسێکدا کە ووترابێ ئەمە تەزکیەکراوە، چونکە بینین لە بیستن بەهێزترە ١٢)بەهۆی ئەوەوە کە تەزکیە کەرەکانی زۆر ترو زیاترن ١٣)بەهۆی ئەوەو نەسەبی ناسراوە، تەرجیح ئەدرێ بەسەر کەسێکدا نەسەبی نەناسراو بێ، ١٤) هەندێك ووتویانە: بەهۆی ئەوەوەکە نەسەبی بەناو بانگە چونکەزیاتر دڵت متانەی پێ دەبێ، مشهورو معروف فەرقیان هەیە، شوهرەت یانی زیاتر بناسرێ و ناسراو تربێ، قەولی اصح ئەوەیە تەرجیح بەهۆی شوهرەتەوە ناکرێ.

(٣) کەسێ بەڕونی تەزکیە کرابێ لەلایەن مجتهدەوە پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتی کەسێکدا کە حوکم کرابێ بە گەواهیدانەکەی یا حوکم کرا بێ بە کارکردن بە ڕیوایەتەکەی، چونکە حوکم و کارکردن جارێ واهەیە لەسەر ڕەواڵەت دروست دەبن بێ تەزکیە.

(٤)(١٥) بەهۆی لەبەر کردنی فەرمودەکەوە، لەبەر ئەوە فەرمودەێك کە ڕیوایەتی بکا لەبەری بێ‌پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتی کەسێکدا کەلەبەری نەبێ، چونکە یەکەمەکە گرنگی داوە بەڕیوایەتکراوەکەی ١٦) بەهۆی باس کردنی هۆی فەرمودوکە، لەبەرئەوە فەرمودەپێێك کەعیلەت وهۆکەی لەگەڵدا بێ پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتێکدا کەهۆوعیلەتەکەی لەگەڵدا نەبێ،لەبەر ئەوەی کەیەکەم گرنگی زۆری پێ‌داوە.

{والتعويل على الحفظ دون الكتابة} فيقدم خبر المعوّل على الحفظ فيما يرويه على خبر المعول على الكتاب لاحتمال ان يزاد في كتابه او ينقص منه و احتمال النسيان و الاشتباه في الحافظ كالعدم[1] {وظهور طريق روايته} كالسماع بالنسبة الى الاجازة فيقدم المسموع على المجاز وقد تقدَّمَ ذكر طرق الرواية و مراتبها آخر الكتاب الثاني[2].

{وسماعه من غير حجاب} فيقدم المسموع من غير حجاب على المسموع من وراء حجاب لالأمن الاول من تطرق الخلل في الثاني[3] {وكونه من اكابر الصحابة} فيقدم خبر احدهم على خبر غيره لشدة دينتهم وقد كان علي ﷺ يخلف الرواة ويقبل رواية الصديق من غير تحليف[4].

---

(١) لە ڕیوایەتی فەرمودەدا گرنگی بە لەبەرکردن دەدرێ نەك بەنوسینی، لەبەر ئەوە فەرمودەێیك اعتمادی لەسەر لەبەر کردبنێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێیك اعتمادی لەسەر نوسین بێ، چونکە هەڵدەگرێ لە نوسینەکەدا زیادو کەمی بۆ کرابێ بەڵام ئەگەر لەبیر چونەوەو لێ تێکچون بەلای کەسێکەوە کە اعتمادی لەسەر لەبەر کردبنێ هەروەکو نەبووایە.

(٢) ١٧) بەهۆی زۆر دیار بوونی ڕێ ڕیوایەتی فەرمودەکە، وەك بیستنی چاکتر دیارە بەنیسبەتی مۆڵەت پێدانیەوە کە ماموستاکەی ووتویتی ئەم فەرمودە ڕیوایەت بکەن چونکە فەرمودەی بیسراو پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێیکدا مۆڵەتی ڕوایات کردن درابێ، لە پێشەوە باسی جۆرەکانی ڕێ ڕیوایەت کردن و پلەکانیان باس کرا لەکۆتا باسی بەشی دوهەمی ئەم کتێبەدا.

(٣) ١٨) بەهۆی بیستنی فەرمودەکە لە ماموستاکەیەوە بێ پەردە، لەبەر ئەوە فەرمودەێیك بێ پەردە بیسرابێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێیك کەلە پیشت پەردەوە بیسرابێ، چونکە یەکەمیان بێ گومان دڵ ئەمینی لەوەی نوقصانی تێکەڵ بێ لەدوهەمیان ئەمین ترە.

(٤) ١٩) بە هۆی ئەوە وە کە ڕیوایەتەکە یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە ڕیوایەتی یەکێکیان پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتی ئەوانی تردا، چونکە ئایینیان توندو تۆڵ گرتووە، پێشەوا عەلی یەکێك ڕیوایەتی فەرمودەێیکی بۆ بکردایە سوینی ئەدا، بەڵام ئەگەر ڕیوایەتەکە هی ابوبکر بووایە بێسوێندان قەبوڵی دەکرد.

{و} كونه {ذكرا} فيقدم خبر الذكر على خبر الانثي لانه اضبط منها في الجملة ب خلافاً للاستاذ} ابي اسحق الاسفرايني قال واضبطية جنسي الذكر انما تراعي حيث ظهرت في الآحاد وليس كذلك فان كثيرا من النساء اضبط من كثير من الرجال {وثالثها} يرجح الذكر {في غير احكام النساء} بخلاف احكامهن لانهن اضبط فيها[1]

{و} كونه {حرا} فيقدم خبره على خبر العبد لانه لشرف منصبه يحترز عما لايحترز عنه الرقيق[2] {و} كونه {متاخر الاسلام} فجره مقدم على خبر متقدم الاسلام لظهور تاخر خبره {وَ قِيلَ متقدمه} عكس ماقبله لان متقدم الاسلام لاصالته فيه اشد تحرزا من متاخره وابن الحاجب جزم بهذا في الترجيح بحسب الراوي وبما قبله في الترجيح بحسب الخارج ملاحظا للجهتين لا انه تناقض في كلامه كما قيل[3] .

---

(١) ٢٠) بەهۆی ئەوەوەكە ڕیوایەتكەرەكە نێرینەیە، لەبەر ئەوە فەرمودەێك نێرینەیێك ڕیوایەتی بكا پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتێكدا كە مێینە ڕیوایەتی بكا، چونكە بەزۆری نێرینە زەبت و لەبەركردنی بەهێزترە، بە پێچەوانەی مامۆستا اسفراینی ووتویەتی: بەهێزی لەبەر كردنی ڕەگەزی نێرینە كاتێ دەر دەكەوێ كەسەیری تاكە كانیان بكرێ، خۆ بێ گومان لە تاكەكاندا وانیە، چونكە زۆربەی ژنان هێزی لەبەر كردنیان بەهێزترە لە زۆربەی پیاوان . قەولی سێهەم دەڵێ: نێرینە مەزیەت ئەدرێ بەڵام كاتێ كە لەبارەی شتێكەوە نەبێ كە پەیوەندی بە ژنانەوەی‌بێ، چونكە ئەگەر پەیوەندی بەوانەوە بێ ئەوە ئەوان زەبت و لەبەر كردنیان چاكترە .

(٢) ٢١) هەروها تەرجیح ئەدرێ كاتێ ڕیوایەتكەرە كە ئازادبێ، لەبەر ئەوە فەرمودەێك ئازادێك ڕیوایەتی بكا پێش دەخرێ بە سەر فەرمودەێكدا كەبەندە ڕیوایەتی بكان چونكە ئازاد پلەی بەرزی هەیە خۆی دەپارێزی لەوەی كە بەندەی خۆی لێ ناپارێزێ.

(٣) ٢٢) بەهۆی ئەوەوە كە ڕیوایەتكەرەكە موسڵمانبونەكەی لەدوای ئەوی تریانە وە بوبێ، لەبەر ئەوە ڕیوایەتی ئەم پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتی كەسێكەوە كە پێشتر موسڵمانبوبێ، چونكە ئەگونجێ نەسخ و سڕینەری بووبێ. هەندێك ووتویانە: نەخێر بە پێچەوانەوە، ئەوەی زوتر موسڵمانبوبێ ڕیوایەتی پێش دەخرێ، چونكە ئەصالەتی هەیە لەئیسلامدا و خەڵك شوێنی ئەم كەوتووە لەدینداریدا، توندوتۆڵتر خۆی دەپارێزێ لەوانەی بەدوای ئەو داهاتبن. بەڵام ابن الحاجب تێبینی هەردو دیوەكەی كردووە، ئەگەر سەیری‌خودی ڕاویەكەدەكەی ئەوە لە پێشەوەیە، وە ئەگەر سەیری ڕیوایەتكراوەكە دەكەی ئەوەی واله دواوه قەبوڵ دەركرێ، چونكە هەڵدەگرێ

{و} كونه {متحملا بعد التكليف} لانه اضبط من المتحمل قبل التكليف[١]. {وغير مدلس} لان الوثوق به اقوى من الوثوق بالمدلسن المقبول وقد تقدَّمَ بيانه في الكتاب الثاني[٢] {وغير ذي اسمين} لان صاحبهما يتطرق إليهِ الخلل بان يشاركه ضعيف في احدهما[٣] {ومباشرا} لمروية {وصاحب الواقعة} المروية فان كلامنهما اعرف بالحال من غيره مثال الاول حديث الترمذي عن ابي رافع انه ﷺ تزوج ميمونة حلالا وبني بها حلالا قال وكنت الرَّسُول بينهما مع حديث الصحيحين عن ابن عباس انه ﷺ تزويج ميمونة وهو محرم وفي رواية البحاري عنه تزويج ميمونة وهو محرم وبني بها وهو حلال وماتت بسرف[٤].

---

سرێنەرەوەی پێشوبێ، ابن الحاجیب بەم شێویە سەرنجی بابەتەکەی داوە نەك وەك هەندێك لێ حاڵی نەبون وایان زانیوە ابن الحاجیب حاڵی نەبووە قسەکانی دژ بەیەکن نەخێر هیچ جۆرە دژایەتێك لە قسەکەیدانیە.

(١) ٢٣)هەم تەرجیح ئەدرێ بەهۆی ئەوەوە کە ڕیوایەتکەرەکە دوای بالغ بون فەرمودەکەی هەڵگرتبێ پێش دەخری بەسەرکەسێکدا پێش بالغ بون هەڵیگرتبێ چونکە ئەو چاکتر دەی پارێزی و زەبتی دەکا

(٢) ٢٤) بەهۆی ئەوەوەکە ڕیوایەتکەرەکە ڕوپۆشکراو نیە، چونك متمانە بەم بەهێزترە لەمتانەیێك کە بەڕوپۆشێکی قەبوڵ کراو دەبێت، نەك ڕۆپۆشی فێل ئەمە هەرقەبوڵ نیە، ئەمەمان لە بەرگی دوهەمی ئەم کتێبەداڕابورد.

(٣) ٢٥) بەهۆی ئەوەوە کە ڕیواتکەرەکە یەك ناوی هەیە تەرجیح ئەدرێ بەسەر کەسێکدا کە دوناوی هەیە، چونکە کەسێ خاوەنی دوناوبێ نوقسانی ڕوی تێدەکا، بەم شێوە کەڕیواتکەرێکی لاوازو خاسف هاو ئناوی دەبێ ڕیوایەتێك دەکا وادەزانێ ئەوە.

(٤) ٢٦) ئەگەر ڕیوایەتکەرەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەبێ بە ڕیویەتکراوەکەوە ٢٧)ئەگەر ڕیویەتکەرکە خۆی خاوەنی ڕوداوەکە بێ کەڕیوایەت دەکرێ پێش دەخرێ بەسەر کەسێکی تردا. چونکە ئەم دووانە لە حاڵەکە چاکتر شارەزاترن لە خەڵکی‌تر نمونەی یەکەمیان ئەو فەرمودەیە تیرمیزی ڕیوایەتی دەکا لە ابو رافعەوە کە: پێغەمبەرﷺ مەیمونەی مارە بڕی لە حاڵێکدا کە لە ئیحرامدا نەبون، وە هەروەها کاتێکیشی گواستیەوە، ابو رافع دەڵێ: من پەیام بەری نێوانیان بووم. ئەم فەرمودە لەگەڵ ئەو فەرمودەی بوخاری و مسلم ڕیوایەتی دەکەن لە ابن عباسەوە کە: پێغەمبەرﷺ مەیمونەی مارە بڕی لە کاتێکدا کە ئیحرامی پۆشی‌بوو، لە

ومثال الثاني حديث ابي داود عن ميمونة تزوجني رسول الله ﷺ ونحن حلالان بسرف ورواه مسلم عن يزيد بن الاصم عنها انه ﷺ تزويجها وهو حلال مع خبرا ابن عباس المذكور وروى أبوداود عن سعيد بن المسيب قال وهم ابن عباس في تزويج ميمونه وهو محرم[1] {ورواويا باللفظ} لسلامة المروى باللفظ عن تطرق الخلل في المروى بالمعنى[2] .

{و} كون الخبر {لم ينكره راوي الاصل} كذا في المنهاج كالمحصول وهو من اضافة الاعم الى الاخص كمسجد الجامع وهي نادرة فلا يتبادر الذهن اليها[3] .

---

ڕیوایەتەکەی بوخاریدا: مەیمونەی مارە کرد لە کاتێکدا ئیحرام پۆشبو، لە کاتێکدا گواستیەوە احرام پۆش نەبوو، وە مەیمونە لە سەریف دا مرد، لێرەدا ڕیوایەتەکەی ابو رافع پێش دەخرێ بەسەر ڕیوایەتەکەی ابن عباس دا، چونکە ئەو خۆی لە کارەکەدایە .

(١) نمونە بۆ دوومیش ئەو فەرمودەیە ابوداود لە مەیمونەوە ڕیوایەت دەکا کە: پێغەمبەرﷺ مارەی بریم لەهەردوکیاندا ئیحرام پۆش نەبوین و لەسەریفیش بووین. موسلم لەیەزیدی کوڕی ئەصمەوە لە مەیمونەوە ڕیوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ مارەی بری لە کاتێکدا کە احرام پۆش نەبوو. ئەم ڕیوایەتە لەگەڵ ڕیوایەتەکەی ابن عباس، لەبەر ئەوەی مەیمونە خۆی خاوەنی ڕوداوەکەیە ئەو پێش دەخرێ. أبوداود ڕیوایەت دەکا لەسەعدی کوڕی موسەییبەوە دەڵێ:ابن عباس لەبارەی شوکردنی مەیمونەوە لێی تێکچووە و لەسەر خەیاڵ نەبووە، چۆن دبەبێ مارەی بکا لە کاتێکدا کە احرامی پۆشیبێ، کەبێ گومان گرێ بەندی تێدا دانامەزرێ.

(٢) ٢٨)مەزیەت ئەدرێ بەهۆی ڕیوایەتکردنی فەرمودەکە بە خودی خۆی واتە لەفزەکە بەسەر ڕیواتکردنیدا بە مانا، چونکە ڕیوایەتێك کە خودی لەفزەکەی بووترێ سەلامەترە لە پەیدابونی نوقسانی و نوقسانی تێکچونی لە ڕیوایەتێك کە هەرماناکەی ڕیوایەت بکرێ.

(٣) ٢٩) فەرمودەێیك کە ڕیواتکەرە ئەصڵەکەی بەدرۆی نەخاتەوە پێش دەخرێ بەسەر ئەوە دا بەدرۆی بخاتەوە، لە کتێبی المنهاج دا هەروەك لەکتێبی: (المحصول) دا وەها نوسراوە، ئەوە ئیضافە کردنی لەفزێکی گشت گیرە -ڕاوی- بۆ لەفزێکی تایبەت - اصح - وەك: (مسندالجامع) وایە، ئەم جۆرە ئیضافانە زۆر کەم و بەدەگمەنن، چونکە زۆر ناچنە مێشکی گوێکرەوە.

ولو زاد أل في راوى او حذفه كان اصوب كما قاله في شرح المنهاج والمعنى ان الخبر الذي لم ينكره الراوي الاصل لراويه وهو شيخه مقدم على ما انكره شيخ راويه بان قال ماروبته لان الظن الحاصل من الاول اقوى[1]

{وكونه في الصحيحين} لانه اقوى من الصحيح في غيرهما وان كان على شرطهما لتلقي الامة لهما بالقبول[2] {والقول فالفعل فالتقرير} فيقدم الخبر الناقل لقول النبيﷺ على الناقل لفعله والناقل لفعله على الناقل لتقريره لان القول اقوى في الدلالة على التشريع من الفعل وهو اقوى من التقرير[3] {والفصيح} على غيره لتطرق الخلل الى غيره باحمال ان يكون مرويا بالمعنى {لازائد الفصاحة} فلا يقدم على الفصيح {على الأصَحّ}[4].

(١) ئەگەر دانەر ئەلێکی بلکاندایی بەوشەی راویەوە - الراوی - یاخود هەر لای بردایە باشتربوو، وەك لە کتێبی (شرح المنهاج) دا ووتویەتی، ماناکەی بەم شێوەی لێ دێ: ئەو فەرمودەی کە ڕیوایەتکەرە ئەصڵەکەی ئینکاری ناکا کە مامۆستای ئەم ڕیوایەتەکەرەیە پێش دەخرێ بسەر فەرمودەیێکدا مامۆستای ڕیواتکەرەکە انکاری‌بکا، بەم شێوە بڵێ: من ڕیواتم نەکردووە، چونکە ئەو گومانەی کەلە یەکەمەوە پەیدا دەبێ بەهێز ترە

(٢) ٣٠)بەهۆی ئەوەوە کە فەرمودەکە لە بخاری و مسلمدایە پێش دەخرێ بە سەر فەرمودەێیکدا لە ناو ئەوانەا نەبێ، چونکە بەهێزترە لە صەحیحێك لەغەیری ئەواندابێ، هەرەچند ئەومەرجانەی بوخاری و موسلیمیشی تێدابێ، چونکە هەمو ئۆمەتی ئیسلام بە قبول وەریان گرتووە.

(٣) ٣١) فەرموودەی بەشی گوفتار لە پێشترە. ٣٢) ئەمجا بەشی کرداری پێغەمبەرﷺ. ٣٣) ئەمجا بەشی هەڵویستی پێغەمبەرﷺ، چونکە فەرمودەێیك قسەی پێغەمبەر نەقڵ بکا پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێیك کرداری پێغەمبەر نەقڵ بکا ئەوەش کرداری نەقڵ بکا پێش دەخرێ بەسەر هەڵویستی پێغەمبەردا، چونکە گوتار بەهێزترە لە دەلاڵەت کردندا لەسەر مشروعیەت هەتا کردار، کرداریش بەهێزترە لە هەڵویست و بێ دەنگی‌و بینینی شتێ وقەسە نەکا

(٤) ٣٤) فەرمودەی ڕووان و فصیح پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێکدا ڕوون نەبێ. چونکە هەڵدەگرێ نوقسانی بێتە سەر ئەوەی ڕووان نەبێ، لەبەر ئەوە هەڵدەگرێ ئەوناروانە تەنها واتاکەی ڕیوایەت کرابێ، نەك ئەوەی زیادە ڕەوانبێژێکی تێدابێ پێش ناخرێ بەسەر فەرمودەی ڕوواندا، لەسەر قەولی اصح .

وَ قِيلَ يقدم عليه لانه ﷺ افصح العرب فيعبد نطقه بغير الافصح فيكون مرويا بالمعنى فيتطرق إليهِ الخلل ورد بانه لا بعد في نطقه بغير الافصح لاسيما اذا خاطب به من لا يعرف غيره وقد كان يخاطب العرب بلغاتهم[1] {والمشتمل على زيادة} فيقدم علىغيره لما فيه من زيادة العلم كخبر التكبير في العيد سبعاً مع خبر التكبير فيه اربعاً رواهما ابوداود و اخذ بالثاني الحنفيَةُ تقديماً للأقل و الأولى منه للإفتتاح[2] {الواردُ بلغة قريش} لان الوارد بغير لغتهم يحتمل ان يكون مرويا بالمعنى فيتطرق إليهِ الخلل[3] {والمدني} على المكي لتأخره عنهُ و المدنيُّ ماورد بعدَ الهجرَةِ و المكيُّ قبلَها[4] {و المشعرُ بعلَو شأن النبيِّﷺ} لتأخُره عما لم يشعر بذلك[5].

(١) هەندێك ووتويانە: پێش دەخرێ بەسەريدا، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕەوانبێژترين كەسیعەرەبە لەبەرئەوە زۆر دورە بیٚگوتاری ڕوانتر قسەی كردبێ،كەوابوو ڕوانەكەيان بەمانا ڕيوايەت كراوە، لەبەر ئەوە نوقسانی هاتووتە سەر ئەم قيلە وەڵامی ئەم قيلە دراوەتەوەكە: هيچ دورنيە كەقسەيێكی كردبێ ڕووانترين گوتار نەبوبێ، بە تايبەت كاتێ گوفتوگۆی كردبێ لەگەڵ كەسێكدا جگەلە و ڕووانەی نەزانيبێ، جاروبارێكيش پێغەمبەرﷺ گفتوگۆی دەكرد لەگەڵ عەرەبەكاندا بەلەهجەو زاراوەی خۆيان .

(٢) ٣٥)فەرمودەێك زۆرتربێ پێش دخرێ بەسەر فەرمودەێيكدا كەمتربێ، چونكە ئەوەيان عيلمی زياتريان تێدايە، وەك ئەو فەرمودەی كە دەفەرموی لەنوێژی جەژندا حەوت الله اكبر تێدايە، لەگەڵ فەرمودەێكی تردا دەفەرموی: چوَاری تێدايە، هەردوكيان ابوداود ڕيوايەتی كردون، زانيايىنی حەنەفی بەفەرمودەی دووەم كاردەكەن و لايان قەبوڵە، چونكە ئەوان كامەيان كەم بێ ئەوە پێش دەخەن لەو چوارەش يەكەميان بۆ (الله اكبر)ی كردنەوەی نوێژەكەيە .

(٣) ٣٦)فەرمودەێيك بەزاراوەی قوريش هاتبێ پێش دەخرێ بەسەر فەرموودەيێك بەزاراوەيێكیتر هاتبێ، چونكە ئەوەی بەزاراوەی ئەوان نەهاتبێ هەڵدەگرێ تەنها ماناكەی ڕيوايەت كرابێ، ئيتر لەو ڕووەوە نوقسانی خۆی بۆ دەكشێ و دەچێتە سەری

(٤) ٣٧)فەرمودەێيك مەدەنیبێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێيكی مەكيدا،چونكە ئەم لە دواوە هاتووە، مەدەنيش بەوە دەڵێن دوای كۆچ هاتبێ مەكيش ئەوەيە پێش كۆچ هاتبێ .

(٥) ٣٨)فەرمودەێك بوڵوندی پلەی پێغەمبەر بگەيێنی پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێكدتا ئەوە نەگەێنێ، چونكە ئەمە لە دواوە هاتووە و پلەی پێغەمبەريش ڕۆژ بەڕۆژ لە بوڵوندی دا بووە .

{والذكور فيه الحكم مع العلة} على مافيه الحكم فقط لان الاول أقوى في الاهتمـ بالحكم من الثاني مثاله حديث البخاري من بدل دينه فاقتلوه مع حديث الصحيحـ انه ﷺ نهي عن قتل النساء والصبيان نيط الحكم في الاول بوصف الردة المناسب و: وصف في الثاني فحملنا النساء فيه على الحربيات[1]{والمتقدم فيه ذكر العلة علـ الحكم} فيقدم على عكسه لانه أدل على ارتباط الحكم بالعلة من عكسه قاله الامام في المحصول {وعكس النقشواني} ذلك معترضا على الامام قائلا ان الحكم اذا تقـ تطلب نفس السامع العلة فاذا سمعتها ركنت اليها ولم تطلب غيرها والوصف اذا تقـ تطلب النفس الحكم فاذا سمعته قد تكتفي في علته بالوصف المتقدم اذا كان شديـ المناسبة كما في والسارق الآية وقد لا تكتفي به بل تطلب علة غيره كما في اذا قمتم ـ الصلاة فاغسلوا الآية فيقال تعظيما للمعبود[2].

---

(١) ٣٩) ئەو فەرمودەی کەحوکمی تێدایە لەگەڵ عیلەتەکەیدا پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەیێکدا کە تەنها حوکمی تێدا بێ، چونکە یەکەمیان بەهێز ترە لەگرنگی دانی ریوایەتتگەرەکە بەحوکمە کە لەدوهرمەکەیان. بەهێزترە لەگرنگیدانی ریوایەتگەرەکە بەحوکمەکە لەدوهەمەکەیان، نمونەکەش ئەو فەرمودەیە کە بخاری ریوایەتی ئەکاو ئەفەرموێ: کەسێ ئاینی خۆی گۆڕی بیکوژن، لەگەڵ ئەو فەرمودا بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەکەن و ئەفـەرموێ: پێغەمبەر (ص)، کوشتنی ژنان و منداڵانی قەدەغە کردووە. لەیەکەمدا حوکمەکە بەسراوە بە صیفەتێکەوە مناسبەو خزمایەتی لەگەڵ کوشتندا هەیە، بەڵام لەدو هەمەکە دا صیفەتی تێدا نیە، لەبەر ئەوە ژنان لە دوهەمەکەدا بڕیومان بە سەر ژنانی جەنگاوەردا

(٢) ٤٠) فەرمودەیێك باسی عیلەتی حوکمەکەی تێدا لە پێشدا باسکرابێ ئەوە پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەیێکدا کە حوکمەکە لە پێشدا باسکرابێ، چونکە ئەمەیان چاکتر دەلالەت دەکا لەسەر پەیوەند بونی حوکمەکە بەعتیلەتەکەوە تا پێچەوانەکەی، لە کتێبی: المحصول، دا امام ووتویەتی. بەڵام نەقشەوانی ئەمەی پێچەوانەکردوەتەوە. بەوەرەخنەی لە ئیمام گرتووە و دەڵێ: حوکم کاتێ پێش کەوت نەفسی گوێ گر عیلەتەکەی دەخوازێ، ئەمجا کەبیستی مەیلی بەلاوە دەنێ وشتێ ترداوا ناکات، بەڵام عیلەت کاتێ پێش خرا نەفسی گوێر گر داوای حوکمەکەی دەکا، جا کاتێ بیستی جاری وا هەیە تێر ئاو دەبێ بەو عیلەتە پێشنە بەتایبەت کاتێ کەزۆر مناسبە دەخزمایە تیان توندو تۆڵ بێ، وەك لە ئایەتی: پیاوی دزو ژنی دز... تا کۆتایی ئایەتەکە. وەجارێ وایش هەیە نەفسی گوێ گر بەو عیلەتەی پێشو تێر ناخواتەوە

{وما كان فيه تهديد او تأكيد} على الخالي عن ذلك مثال الثاني حديث ابي داود وصحه ابن حبان والحاكم على شرط الشيخين أيما امراة نكحت نفسها بغير اذن وليها فنكاحها باطل فنكاحها باطل فنكاحها باطل معحديث مسلم الايم أحق بنفسها من وليها[1]. {وما كان عموما مطلقاً على} العموم {ذي السبب الاقي السبب} لان الثاني باحتمال ارادة قصره على السبب كما قيل بذلك دون المطلق في قوة الاوفي صورة السبب فهو فيها اقوى لانها قطعية الدخول عند الاكثر كما تقدم[2].

{والعام الشرطي} كمن وما الشرطيتين {على النكرة المنفية على الأصَحّ} لا فادته للتعليل دونها وَ قيلَ العكس لبعد التخصيص فيها بقوة عمومها دونه[3].

---

وبێدەنگ نابێ، بەڵكو داوای عیلەتێكی تردەكا، وە لە ئایەتی: ئەگەر كاتێ نیازی هەستانەوەتان كرد بۆ نوێژ ئەوە بشۆرن.. هەمو ئایەتەكە. ئەوە دەووترێ عیلەتەكەی بەگەورە زانینی ئەو خوا گەورەیە كە دەپەرسترێ.

(١) ٤١) ئەو فەرمودەی هەرەشەو دوپات بوونەوەی تێدایە پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێكدا ئەوەی تێدا نەبێ. نمونە بۆ دووەمەكەیان كە دوپات بوونەوەیە ئەو فەرموودەیە لە ابوداود ڕیوایەتی دەكاو بەپلەی صحیحیش دانیاوە ابن حیان و حاكمیش لەسەر ئەو مەرجانەی بخالاری و مسلم دایان ناوە و ئەفەرموێ: هەر ژنێك خۆی مارە ببڕێ بێ مۆڵەتی فەرماندارەكەی ئەوە مارە بڕینەكەی بەتاڵە بە تاڵ بەتاڵە، لەگەڵ ئەو فەرمودەی مسلمدا كە دەفەرموێ: بێوە ژن خۆی شایستە ترە بە شوودانی خۆی هەتا فەرماندارەكەی

(٢) ٤٢) فەرمودەێك گشت گیری ڕوت پێ لە هۆكار پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێكدا كە گشت گیری خاوەن هۆبێ، بەلام تەنها لە نمونەی ئەوەدا نەبێ هۆكەی تێدایە، چونكە دوومەكە هەڵەگرێ تەنها بڕێ بەسەر نمونەی هۆكارەكە دا وەك هەندێك ئەوەیان ووتووە، لەهێزیشدا لەمتلقەكە كەمترە، تەنها لە نمونەی هۆكارەكەدا نەبێ ئەوە لەم نمونەدا بەهێز ترە، چونكە بەلای زۆربەی زانایانەوە بێگومان دەیگرێتەوە، وەك لە پێشەوە ڕابورد

(٣) ٤٣) فەرمودەێك كە گشت گیرێكی شەرتی بێ وەك (متى و ما) شەرتی پێش دەخرێ بەسەر گشت گیرێكدا كەلە نەكیرەی مەنفیەوە وەرگیرابێ لەسەر قەولی ئەصح، چونكە بۆ بەعیلە ت بونیش دەست ئەدا، بەلام ئەویان وانیە، هەندێكیتر ووتویانە: بە پێچەوانەوە، چونكە نەكیرەی مەنفی زۆر دورە تایبەت بكرێ لەبەر بەهێزی گشت گیریەكەی، بەلام عامی شەرتی وانیە.

{وهي} تقدَّمَ {على الباقي} من صيغ العموم كالمعرف باللام او الاضافة لانها اقوى منه في العموم اذ يدل عليه بالوضع في الأصَحّ كما تقدَّمَ وهوانما يدل عليه بالقرينه اتفاقاً[1]. {والجمع المعرف} باللام او الاضافة {على ماو من} غير الشرطيتيَ كالاستفهاميتين لانه اقوى منهما في العموم لامتناع ان يخص الى الواحد دونهما على الراجح في كل كما تقدَّمَ[2].

{والكل} اي الجمع المعرف وما ومن{على الجنس المعرف} باللام اوالاضافة {لاحتمال العهد} فيه بخلاف ماومن فلا يحتملانه والجمع المعرف فيبعد احتماله له[3]. {قالوا وما لم يخص} على ما خصَّ لضعف الثاني بالخلاف في حجته بخلاف الاول قال المصنِّف كالهندي {وعندي عكسه} لان ما خصَّ من العامّ الغالب والغالب اولى من غيره[4].

---

(١) ٤٤) نەكیرەی مەنفی پێش دەخرێ بەسەر لەفزە گشت گیرەكانی تر، وەك معرف بەلام یا بەئیضافە، چونكە لەوانە بەهێز تره لەگشت گیریەكەیدا، چونكە ئەم بەهۆی وەصفەكەیەوە دەلاڵەتی لەسەر دەكا بەلام ئەوانیتر بەهۆی قەرینە وە دەلاڵەتی لەسەر دەكا، ئەمەش بەڕای هەموان وایە

(٢) ٤٥) جەمعێك معرف بێ بەلام بە ازافە پێش دەخرێ بەسەر (ما و من)یَدا كە بۆ شەرت نەبن، وەك ئەوەی بۆ استفهام و پرسیار بن، چونكە لەگشت گریەكەیدا لە هەردووكیان بەهێزترە، چونكە جەمعی معرف ناكرێ هەمو تاكەكانی لێ بكەینتەوە تا بگەیتە یەك چونكە جەمع لە سێ كەمتر نابێ، بەلام ئەم دووانە ئەتوانێ تایبەت بكەی بەكەمتر لەسێوە، ئەمەش لەسەر قەولی پەسەند لەهەمویاندا، وەك لەپێشەوە ڕابورد.

(٣) ٤٦) هەمویان واتە جەمعی مەعروف و ماومەن پێش دەخرێن بەسەر اسمی جنسی معرفدا چ بەلام بێ یاخود بە ئیضافە بێ، بۆیە لاوازە چونكە هەڵدە گرێ بۆ عەهدو زانراو بێ، بەلام ماومەن بۆ ئەوە دەست نادەن، جەمعی معرفیش هەروایە بەلام دەستدانەكەی ئەم هەر زۆر دورە .

(٤) زانایان ووتویانە: ئەو گشت گیرەی تایبەت نەكرابێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەدا كە تایبەت كراوە، چونكە دوهەمەكە لاوازە، لەبەر ئەوە كێشە هەیە ئایا دەبێتە حوجە و بەڵگە یا نە؟ بەلام یەكەم وانیە، دانەر وەك هندی وتویەتی: بەلای منەوە ئەوە پێچەوانەیە، چونكە ئەوەی لە گشت گیرەكە تایبەت كابێ زاڵ وزۆرە، زۆریش باشترە لەكەم .

{والاقل تخصيصا} على الاكثر تخصيصا لان الضعف في الاقل دونه في الاكثر[١].
{والاقتضاء على الاشارة والايماء} لانه المدلول عله بالاول مقصود يتوقف عليه الصدق او الصحة و بالثالث مقصود لا يتوقف عليه ذلك وبالثاني غير مقصود كما علم ذلك في محله فيكون الاول اقوى[٢]

{ويرجحان} اي الاشارة والايماء {على امفهومين} اي الموافقة والمخالفة لان دلالة الاولين في محل النطق بخلاف المفهومين[٣]. {والموافقة على المخالفة} لضعف الثاني بالخلاف في حجيته بخلاف الاول {وَ قِيلَ عكسه} لان المخالفة تفيد تأسيسا بخلاف الموافقة[٤]. {والناقل عن الاصل} اي البراءة الاصلية على المقرر له {عند الجمهور} لان الاول فيه زيادة على الاصل بخلاف الثاني[٥].

---

(١) ٤٧) ئەوەی کەمێکی لێ دابڕابێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەدا کە زۆری لێدابڕاوە ولێ کنراوەتەوە، چونکە ئەو لاوازیەی لەکەمدایە لە خوار ئەو لاوازیەوەیە لەزۆر دایە.

(٢) ٤٨) ئەو دەلآلەت لەسەر کراوەی بەهۆی ئیقتضاو داخوازی ڕەستەوەبێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەی بەهۆی اشارەو ایماوە دەلآلەتی لەسەر دەکرێ، چونکە ئەوەی یەکەم دەلآلەتی لەسەر دەکا مەبەستە و ڕاستی یاخود دروستی ڕەستە کە لەسەر ئەوە دەوەستێ و پەیوەندە پێیەوە، ئەمەش سێهەم دەلآلەتی لەسەر دەکا هەر مەبەستە بەلآم ڕاستیو دروستی ڕەستەکەی لەسەر نەوەستاوە، ئەوەش دوهەم دەلآلەتی لەسەر دەکا هەر مەبەستە نیە، وەك لە جێ خۆی زانراوە، کەوا بویەکەم بەهێز تره لەوان

(٣) ٤٩) ئەوەی اشارە وئیما دەلآلەتی لەسەر دەکەن تەرجیح ئەدرێن بەسەر هەردوو مەفهومی موافق و مخالف دا، چونکە شتێ اشارەو ایما دەلآلەتی لەسەر بکا هەر وەك ئەوە وایە بە لەفز ووترابێ، بەلآم دومە فهومەکەوانین بەشێکی دەرەکی دەلآلەت دەکەن.

(٤) ٥٠) مفهومی موافق پێش دەخرێ بەسەر مفهومی مخالفدا، چونکە دوهەمەکە لاوازە بەهۆی ئەوە وەکە جیاوازی هەیە لە بەحوجە و بەڵگە بونیدا، هەندێك ووتویانە: پێچەوانەکەی ڕاستە، چونکە مخالف و پێچەوانە تأسیس و دامەزراندنی دەگەێنێ بەلآم موافق و هەماهەنگ بون وانیە

(٥) ٥١) ئەوەی کە حوکمەکە دەگوێزێتەوە لە ئەصلەکەیەوە کە ئیباحەوە پێش دەخرێ بەسەر ئەو فەرمودەدا کە هەر وەکو خۆی ددی هێڵێتەوە، بەلای جەماوەری زانایانەوە، چونکە یەکەمەکە زیادە بونی تیدایە بە سەر ئەصلەکەدا بەلآم دووەمەکە وانی‌یە .

وقيل عكسهُ بأن يقدّر تأخير المقر للأصل ليفيد تأسيساً كما افاده الناقل فيكون ناسخاً لهُ مثالُ ذلك حديث من مس ذكره فليتوضا صححه الترمذي وغيره مع حديث الترمذي وغيره انه ﷺ سأله رجل مس ذكره أعليه وضوء قال لا وانما هو بضعة منك

{والمثبت على النافي}لاشتماله على زيادة علم وَ قِيلَ عكسه لاعتضاد النفي بالاصل {وثالثُها سواء} لتساوي مرجّحيهما {ورابعُها} يرَجُحُ المثبتُ[2] {الا في الطَلاقِ و العتاقِ} فيرجُحُ النَافي لهما على المثبتِ لهما لأنّ الأصلَ عدمهما وحكى ابن الحاجب مع هذا عكسه اي يرجُح المثبتُ لهما على النَافي لهما[3]{و النهي على الأمر} لأنّ الأوّل لدفع المفسدَةِ و الثاني لجلبِ المصلَحَةِ و الإعتناءُ بدفع المفسدَة اشدُّ[4].

---

(١) هەندێ ووتویانە: پێچەوانەکەی دەکرێ، بەم شێوە وادادەنرێ مقرری ئەصلەکە دوای کەوتووە بۆ ئەوی تأسیس و دانان بگەیێنێ، وەك چۆن ئەوەی لەئەصڵەکەوە دەیگوێزێتەوە تأسیس و دانانی گەیاندووە، کەوابوو ئەو مقررە سڕینەرەوەی ناقلەکە یە، نمونەشی ئەو فەرمودەیە: کە سێ بەری دەست دایە عەورەتیەوە بادەست نوێژەکەی بگرێتەوە، تیرمذی و غەیری تیرمذی تیدا ئەم فەرمودەیان بە پلەی صحیح داناوە، لەگەڵ ئەو فەرمودەی تیرمذی و غەیری تیرمذی ڕیوایەتی دەکەن کە پێغەمبەرﷺ پیاوێك پرسیاری لێ کرد دەسی داوە بەعەورەتیە ئایا گرتنەوەی دەست نوێژی لەسەرە؟ فەرموی: نا، ئەوە پارچەیێکە لەخۆت

(٢) ٥٢) فەرمودەێك شتێك سابت بکا پێش دەخرێ بەسەر فەرودەێکدا کە نەفی بکا، چونکە سابت کەرەکە زیادە عیلەتێکی تێدایە، هەندێك ووتویانە: پێچەوانەکەی ڕاستە چونکە ئەوەیان کەنەفی دەکا ئەصڵیش پشتگیری دەکا، کە ئیباحەیە، قەوڵی سێ هەم دەڵێ: هەردوکیان یەکسانن، چونکە مرجحەکانیان یەکسانن، قەوڵی چوارەم دەڵێ: ئەوەیان کە سابتی دەکاتە رجیح ئەدرێ و پەسەند ئەکرێ .

(٣) ٥٣) جگە لەتەلاق و ئازادکردنی بەندەدا نەبێ، لەماندا کامیان نەتەلاق کەوتنی وە ئازادکردن بکا تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەوەیاندا کە سابتی دەکا و دەیخاو ئازادی دەکا، چونکە ئەصڵ ئەوەیە کە نەکەو تێبی و ئازاد نەبوبێ، ابن الحاجب لەگەڵ ئەمەشدا پێچەوانەکەشی گێڕاوەتەکە: ئەوەیان کە سابتی دەکا تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەوەیاندا کە نەفیان دەکا.

(٤) ٥٤) نەهی پێش دەخرێ بەسەر ئەمردا، چونکە بۆ لابردنی خراپەیەو دووەم بۆ بەرژەوەندی وەدەست خستنە، گرنگی دان بەلابردنی خراپە توندو تۆڵترە.

{والأمر على الإباحَةِ} للإحتياطِ بالطَّلبِ[1] {والخبرُ} المتضمِّنُ للتكليفِ {على الأمرِ و النَّهي} لأنَّ الطَّلبَ به لتحقُّقِ وقوعِهِ اقوى منهما[2] .

{و} خبر {الحظرِ على} خبرِ {الإباحَةِ} للإحتياطِ وقيلَ عكسُهُ لإعتضادِ الإباحَةِ بالأصلِ من نفي الحرجِ {وثالثُها سواءٌ} لتساوي مرجِّحيهما[3] {والوجوب والكراهة على الندب} للإحتياط في الاول ولدفع اللوم في الثاني[4] {والندب غعلى المباح في الأصَحِّ} للإحتياط بالطلب وَ قِيلَ عكسه لموافة المباح للاصل من عدم الطلب وليس في هذا مع قوله قبل والامر على الاباحة تكرار لان المراد بالامر فيه الايجاب لا الطلب وهما خلاف في حقيقته تقدَّمَ في مسئلة جائز الترك[5] {ونافي الحد} على الموجب له لما في الاول من اليسر وعدم الطرد[6].

---

(١) ٥٥) ئەمر چ بۆ ایجاب بێ یا نەدب بێ پێش دەخرێ بەسەر ئیباحەدا، چونکە احتیات کردن باشترە بەهۆی داوا و تەلەبەکەوە.

(٢) ٥٦) خەبەرو هەواڵێك كە بەمانا ئەمر بێ پێش دەخرێ بەسەر سیغەی ئەمرو نەهیدا، چونکە داخوازێك بەخەبەری بەمانا ئەمر بکرێ بەهێز ترە لە هردوکیان، چونکە بێگومان ئەویانی هاتووە ئەدێ و هەواڵت پێ دەم.

(٣) ٥٧) فەرمودەێك قەدەغە بگەێنێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێكدا كەاباما بگەێنێ، لەبەر ئیحتیات، هەندێك ووتویانە: بەپێچەوانەوە، چونکە إباحەکە ئەصل پشت گیری دەکا کە نەبونی گنواهەو قەدەغەیە، سێهەمیان دەڵێ: هەردوکیان یەکسانن، چونکە مرجحی هەردوکیان چون یەکی لەهێزدا.

(٤) ٥٨) فەرمودەێك واجب یا كەراهەت بگەێنێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەێك نەدب بگەێنێ، چونکە لەیەکەمدا لەبەر احتیات، بۆ ئەوەی تۆڵەی لەسەر نەخوا، لە دوهەمیشدا بۆ ئەوەی گلەیی و لۆمە نەکرێ.

(٥) ٥٩) نەدب پێش دەخرێ بەسەر مەباحدا لەقەولی ئەصەحدا، لەبەر احتیاتکردن بەهۆی طەلەب و داخوازیەکەیەوە، هەندێك ووتویانە: بە پێچەوانەکەیەوە، چونکە مەباحەکە هەماهەنگە بۆ حوکمی ئەصڵی لە شتەکاندا کە نەبونی داوا وتەڵەبە. ئەم قسەیە لەگەڵ قسەی پێشەوەدا دوبارە بونەوەی تێدا نیە چونکە مەبەست بە ئەمر لە دووەمدا ایجاب نەك تلب، لە نێوانیاندا کێشەیە ئایا ئەمر حەقیقەتە لەئیجابدا یا لەتەڵەبدا، ئەوە لە بابەتی (جائز الترك) دا ڕابوورد.

(٦) ٦٠) ئەوەی نەفی تۆڵە و عقوبە ئەکا پێش دەخرێ بەسەر ئەوەی ئەی سەلمێنێ، چونکە یەکەم ئاسان کاری لەبەر چاو دەگرێ و لابردنی گرانی .

الموافق لقوله تعالى ﴿ يريد الله بكم اليسر ﴾ ﴿ وما جعل عليكم في الدين من حرج ﴾ {خلافاً لقوم} وهم المتكلمون في ترجيحهم الموجب لافادته التأسيس بخلاف النافي[1].

{والمعقول معناه} على مالم يعقل معناه لان الاول ادعي الى الانقياد وافيد بالقياس عليه[2] {والوضعي على التكليفي في الأصَحّ} لان الاول لا يتوفق على الفهم والتمكن من الفعل بخلاف الثاني وَ قِيلَ عكسه لترتب الثواب على التكليف دون الوضعي[3] {والموافق دليلا آخر} على مالم يوافقه لان الظن في الموافق اقوى وهذا داخل قوله فما تقدَّمَ والأصَحُّ الترجيح بكثرة الأدلة[4] وذكر توطئة لما بعده {وكذا} الموافق {مرسلا او صحابيا او اهل المدينة او الاكثر} من العلماء على ما لم يوافق واحد مما ذكر {في الأصَحّ} لقوة الظن في الموافق وَ قِيلَ لا يرجح بواحد مما ذكر لانه ليس بحجة[5].

---

(١) کە هەماهەنگە بۆ ئەو ئایەتەی ئەفەرموێ: خواکاری ئاسانی بۆ ئێوە دەوێ. ئەفەرموێ: خوا لەم ئاینە دا باری گرانی لەسەر ئێوەدا نەناوە، گەلێك پێچەوانەی ئەمەن، کەزانایانی زانستی کەلامن، ئەوان ئەوەیان کە تۆڵەکە ئەسەپێنێ پەسەند دەکەن، چونکە بیناسازی سەرەت و دانان دەگەیێنێ، بەلاّم ئەوەیان کە نەفی دەکا وانیە.

(٢) ٦١) ئەوەی کە عیلەت و حیکمەتی بزانرێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەیاندا کە نازانرێ، چونکە یەکەمەکەیان باشتر هانی خەڵك ئەدا بۆ گوێ رایەڵێ و شوێنکەوتنی و باشتر سود دەگەیێنێ کە قیاسی شتێ تری لەسەر بکرێ، ئەگەر عیلەت نەزانرێ قیاس ناکرێ .

(٣) ٦٢) حوکمی (خطاب الوضع)ە پێش دەخرێ بەسەر (خطاب التكليف) لەقەولی اصحدا، چونکە یەکەمەکەیان ناوەستێ لەسەر لێحاڵیبون و توواناى کردن، بەلاّم دووەمەکەیان وانیە هەتا ئەم دوانە نەبن ناکرێ، هەندێك ووتویانە: بەپێچەوانەوە. چونکە پاداش لەسەر تەکلیفی وەر دەگیرێ نەك لەسەر وضعن .

(٤) ٦٣) فەرمودەیێك کە موافقی بەڵگەیێکیتربێ پێش دەخرێ بەسەر فەرمودەیێکدا کە موافق هیچ بەڵگەیێك نەبێ، چونکە گومان موافقدا بەهێزترە، ئەم جۆرەیان دەچێتە ناوقسەی پێشووە کەوتی: قەولی اصح ئەوەیە بەهۆی بەڵگەی زۆرەوە تەرجیح ئەدرێ

(٥) ٦٤) جا لە پێشەوە ووتراوە بۆ لێرە دوبارەی کردەوە لەبەر ئەوە پێشەکیەك بێ بۆ ئەوەی دوای کە: هەروەها پێش دەخرێ ئەوەیان کە موافق بێ بۆفەرمودەیێکی مرسل، یاخود بۆ صەحابەیێك، یاخود بۆ دانیشتوانی مەدینە، یاخود بۆ زۆربەی

{وثالثُها في موافق الصحابي ان كان} اي الصحابي {حيث ميزه النص} اي فيما ميزه فيه من ابواب الفقه {كزيد في الفرائض} ميزفيها بحديث افرضكم زيد وقد تقدَّمَ {ورابعها ان كان} اي الصحابي {احد الشيخين} ابي بكر وعمر {مطلقا وَ قِيلَ إلاّ ان يخالفهما معاذ في الحلال والحرام أو زيد في الفرائض ونحوهما} اي نحو معاذ وزيد كعلي في القضاء فلا يرجح الموافق لاحد الشيخين لان المخالف لهما ميزه النص فيما ذكر وهو حديث افرضكم زيد وأعلمكم بالحلال والحرام معاذ واقضاكم علي {قال الشافعي} ﷺ {و} يرجح {موافق زيد في الفرائض فمعاذ} فيها {فعلي} فيها {ومعاذ في احكام غير الفرائض فعلي} في تلك الاحكام يعني أن الخبرين المتعارضين في مسئلة في الفرائض يرجح منهما الموافق لزيد فان لم يكن له فيها قول فالموافق لمعاذ فان لم يكن له فيها قول فالموافق لعلي [1].

---

زانایان، بەسەر فەرمودەیێکد کە موافقی یەکیّ لە مانە نەبیّ،، لە قەولی اسح دا، چونکە گومانەکە بەهیّز دەبیّ لە موافقەکەدا، هەندیّ ووتویانە: بەیەکیّك لەوانەی ووتران تەرجیح نادریّ و پەسەند ناکریّ، چونکە ئەوانە حوججە و بەڵگە نین،

(١) قەولی سیّهەم دەڵیّ ئەوەیان موافقی صەحابە بیّ، بەلاّم بەمەرجیّ ئەو سەحابە لەو بابەتەدا دەق لەهاوڕیّکانی تری جیای کردبیّتەوە، لەبابەتیّك لەبابەتەکانی فقە، وەك زید لە باسی میراتدا جیاکراوەتەوە، فەمودەیێك لە باسی میراتدا جیای کردووەتەوە: لەهەموتان زیاتر زەید میرات دەزانیّ. لە پیّشەوە رابورد، قەولی چوارەم دەڵیّ: ئەگەر سەحابەکە یەکیّ لەدوو دیّن سپیەکەبیّ ابو بکر یا عمر، ئیتر دەق هەبیّ یانەبیّ، هەندیّکی تر ووتویانە: مەگەر ئەو دووانەش لە باسی حەرام و حەلاّڵدا معاذ پیّچەوانەیان بیّ، یاخود زەید لە میراتدا پیّچەوانەیان بیّ، هەروەها جگە لە معاذ و زەیدیش، وەك عەلی لە بابەتی قەزادا پیّچەوانەیان نەبیّ، لەم کاتەدا ئەوەی موافقی یەکیّ لەو دوورِدیّن سپیەبیّ تەرجیح نادریّ، چونکە مخالفەکەیان لەو بابەتانەدا کە باسکران دەق جیای کردونەتەوە، دەقەکەش فەرمودەی: لە هەموتان زاناتر لە میراتدا زەیدە، لەهەموتان زاناتر بەحەلاّڵ و حەرام معازە، لە هەموتان زاناتر لە قەزاوەتدا عەلیە، شافعی ووتویەتی: ئەوەی موافقی زەیدبیّ لە میراتدا پیّش دەکەویّ،، وە ئەوری موافق معاذ بیّ لەهەر حوکمیّکدا بیّ جگە لە میراتدا نەبیّ پیّش دەخریّ،ئەمجا ئەوەی موافەفقی عەلی بیّ هەر لەو ئەحکامانەدا واتە دوفەمودەی نەیار بەیەك لەیەك مەسئەلەی میراتدا بەگژ بەکدا چون ئەوەیان کەموافقی زەیدە پیّش دەخریّ، ئەگەر ئەو مەسەلە زەید قسەی نەبو تیّیدا ئەوەیان کەموافق معاذ بیّ پیّش دەخریّ، ئەگەر

والمتعارضين في مسئلة في غير الفرائض يرجح منهما الموافق لمعاذ فان لم يكن له فيها قول فالموافق لعلي وذكر الموافق للثلاثة على هذا الترتيب لترتيبهم كذلك المأخوذ من الحديث السابق[1]. فقول الصادق ﷺ فيه افرضكم زيد على عمومه وقوله واعلمكم بالحلال والحرام معاذ يعني في غير الفرائض وكذا قوله واقضاكم على يعني في غيرالفرئض وكذا قوله واقضاكم على يعني في غير الفرائض واللفظ في معاذ اصرح منه في على فقدم عليه في الفرائض وغيرها[2] {والاجماع على النص} لانه يؤمن فيه النسخ بخلاف النص[3] {واجماع الصحابه على} اجماع {غيرهم} كالتابعين لانهم اشرف من غيرهم[4] {واجماع الكل} الشامل للعوام {على ماخلف فيه العوام} لضعف الثاني بالخلاف في حجته على ماحكاه الآمدي وان لم يسلمه المصف كما تقدم[5].

---

ئەویش قسەی نەبو تێیدا ئەوەیان کە موافقی علی بێ پێش دەخرێ .

(١) وە ئەگەر دو فەرمودەی نەیار بەیەك لەیەك بابەتدا بەگژیەکدا چون جگە لەبابەتی میرات کامەیان موافقی معاذ بێ ئەوەیان تەرجیح ئەدرێ، ئەگەر ئەویش قسەی نەبو تێیدا کامەیان موافقی علی بێ ئەوەیان پێش دەخرێ، ئەم سێ موافقە بەم تەرتیبە هێنات یەکەم زەیدو دووەم معازو سێهەم عەلی لەکوێوە هێناوتە؟ هەر لە فەرمودە پێشینە کەوە وەرگیراوە،

(٢) چونکە کە حەزرەتی ڕاستگۆ ﷺ، کە فەرموی: لەهەموتان زیاتر زیەید میرات دەزانی، هەر لە سەر گشتیەکەیەتی. و فەرموی: زاناتر تان بە حەلاڵ و حەرام معازە. واتە لەغەیری میراتدا، هەروەها دەفەرموێ: لێزانترتان لە قەزاوەتدا عەلیە، واتە لەغەیری میراتدا، ئەو لەفزەی لەبارەی معاذدودیە ڕونترە لەوەی لەبارەی عەلیەوە، بۆ یە معاز پێش خراوە بەسەر علەیدا لەمیرات و غەیری میراتدا.

(٣) (٦٥) اجماع پێش دەخرێ بەسەر نص و دەقدا، چونکە لە اجماعدا ئەمینی لەسڕینەوەی، بەلاَم نص وانیە هەڵدەگرێ سڕینەوەی

(٤) (٦٦) خڕبونەوەی صەحابە پێش دەخرێ بەسەر خڕبونەوەی غەیری ئەوان. وەك شوێنکەوتوانی صەحابە، چونکە صەحابە لەغەیری خۆیان بەشەرەف ترن

(٥) (٦٧) خڕ بونەوەی هەمو زانایان و گشت گیریش بێ بۆ عەوامەکان پێش دەخرێ بەسەر اجماع و خڕبونەوە یێك عەوامەکان پێچەوانەی بن، چونکە دووهەم لاوازەبە هۆی ئەوەوە کێشە هەیە لە بەحوجچە و بەڵگەبونیدا، لەسەر ئەو بنەڕەتەی ئامێدی گیراویەتەوە، هەرچەند دانەر نەی سەلماندوە، وەك لە پێشەوە ڕابوورد .

{و} الاجماع {المنقرض عصره وما} اي والاجماع الذي {لم يسبق بخلاف على غيرهاما} اي مقابلهما لضعفه بالخلاف في حجته {وَ قِيلَ المسبوق} بخلاف {اقوى} من مقابله {وَ قِيلَ } هما {سواء[1]}.

والأصَحُ تساوي المتواترين من كتاب وسنة} وَ قِيلَ يقدم الكتاب عليها لانه اشرف منها {وثالثُها تقدَّمَ النسة لقوله} تعالى {لتبيّن للناس مانزل اليهم} اما المتواتران من السُنَة فمتساويان قطعا كالآتيتين[2] {ويرجح القياس بقوة دليل حكم الاصل} كأن يدل في أحد القياسين بالمنطوق و في الآخر بالمفهوم لقوة الظن بقوة الدليل[3] {وكونه} اي القياس {على سننن القياس اي فرعه من جنس اصله} فهو مقدم على قياس ليس كذلك لان الجنس بالجنس اشبه فقياسنا مادون لرش المواضحة على ارشها حتى تتحمله العاقلة مقدم على قياس الحنفية له على غرامات الاموال حتى لاتتحمله[4].

---

(١) ٦٨و٦٩ اجماع و خڕبونەوەيێك سەر دەمەكەی بەسەر چوبێ و ئەو اجماع و خڕبونەوەيش كێشە پێشی نەكەوتبێ هەر دوكيان پێ شدەخرێنی بەسەر غەيری خۆياندا، واتە بەرانبەری هەر وكياندا، چونكە ئەوبەرانبەرە لاوازە لەبە حوججەو بەڵگە بونياندا بەهۆی ئەوەوە كە كێشە هەيە لەبەحوججەبوونيدا. هەندێك ووتويانە: ئەو اجماع و خڕبونەی خلافی بە سەردا پێش كەوتووە بەهێز ترە لە مقابل و بەرابنەرەكەی. هەندێكی تر ووتويانەك هەردوكيان يەكسانن

(٢) ٧٠) قەولی اصح ئەوەيە كە دومتواتر يەكێكيان لەقورئان وَ ئەويتريان لە فەرمودە دابێ يەكسانن و هيچكاميان پێش ناخرێ، هەندێك ووتويانە: قورئانەكە پێش دەخرێ بەسەر فەمروده متواترەكە دا، بەلأم ئەگەر هەر دومتواترە كە لەفەرمودە دابن ئەوەبێگومان هەردوكيان يەكسانن وەكو دوئايەت وان.

(٣) ٧١) قياسێك بەهۆی هێزی بەڵگەی حوكمی ئەصڵی كەيەوە تەرجيح ئەدرێ بەسەرقياسێكدا وابەهێز نەبێ، وەك ئەوەی لەيەكێكياندا دەليلەكە دەلأڵەت بكا بەهۆی منتوق و تلفزەوە، لەويزياندا بەهۆی مفهومەوە، چونكە گومانەكە بەهۆی هێزی بەڵگەكەوە ئەويش بەهێز دەبێ .

(٤) ٧٢)قياسێك لەسەر ڕێبازی قياسێك كرابێ، واتە فەرع و لقەكەی لە ڕەگەزی ئەصڵەكەی بێ، ئەوە پێش دەخرێ بەسەر قياسێكدا كەوانەی بێ، چونكە ڕەگەزی چاتر لەڕەگەزەكەی خۆی دەكا، بۆ نمونە: ئێمە قياسی ئەو برينەی لەخوار برينی موضحەوە بێ-واتە ئێسكی سەر كەوتبێتەدەر-ئەكەينە سەر برينیموضحە وەك ئەم خزمان خوێنەكەی هەڵدەگرن ئەويش هەروەها، ئەم قياسە پێش دەخرێ بەسەر

{والقطع بالعلة والظن الاغلب} بها اي بوجودها[1] {وكون مسلكها اقوى ـما في مراتب النص لان الظن في القياس المشتمل على واحد مما ذكر اقوى مـ ـلظن في مقابله[2] .

{و} ترجيح علة {ذات اصلين على ذات اصل وَ قيلَ لا} كالخلاف في الترجيح بكثرة لادلة[3]. {وذاتية على حكمية} لان الذاتية الزم {وعكس السمعاني لأن الحكـ الحكم اشبه} والذاتية كالطعم والاسكار والحكمية كالحرمة والنجاسة[4] {وكونا اقـ ـوصافا} لان القلية اسلم {وَ قيلَ عكسه} لان الكثرة اشبه اي اكثر شبها[5].

---

ـياسی زانایانی حەنەفی کە قیاسی دەکەنە سەر غەرامەی ماڵی، وەك چۆن خزمانی ـەرامەی ماڵی بۆ نادەنەوە هەروەها بڕینی خوار موزەحەش هەڵناگرن.

(١) ٧٣) قیاسێك گومان بڕبێ بە عیلەتەکەی پێش دەخرێ بەسەر قیاسێـ ـانەبێ، یاخود گومانی فرە زاڵت هەبێ بەعیلەتەکەی پێش دەخرێ بەسەـ ـیاسێکدا وا نەبێ.

(٢) ٧٤) قیاسێك ڕێ دۆزینەوەی عیلەتەکەی بەهێز تربێ لە قیاسێکی تر پێشـ ـەخرێ، وەك لە پلەکانی دەقدا (لعلة كذا لسبب كذا من اجل كذا) فەرقیان هەیە چونکە گومان لە قیاسێکدا کەیەکێك لەوانەی ئێدا بەهێزترە لەوگومانەی ئەوانەی ـێدابێ نەبێز

(٣) ٧٥) عیلەتێ: لەدو حوکمی دەق بەسەر نراو دا هەبێ ترەجیح ئەدرێ بەسەـ ـیلەتەیێکدا کەلەیەك دەق دا دەرهێنرابێ هەندێ ووتویانە: تەرجیح نادرێ، وەك ئەو ـیاسەی بەڵگەی زۆر تربێ چۆن کێشەی تێدا یە لە تەرجیح دانیدا بەسەر ئەو قیاسەی ـەك بەڵگەی هەبێ.

(٤) ٧٦) قیاسێك کە علەتەکەی ذاتی بێ و لەخودی خۆیدا هەبێ تەرجیح ئەدرێ ـەسەر قیاسێکدا کە عیلەتەکەی حوکمی بێ و بۆی پەیدا بوبێ، چونکە عیلەتی ذاتی چاکتر و باشتر پێ وەدەلکێ، سەمعانی پێچەوانەی کردووەتەوە، چونکە حوکمێ بە حوکمێکی تر زیاتر لەیەك دەکەن، عیلەتێ:ی زاتی وەك تەعم و سەرخۆشکردن. ـیلەتی حوکمیش وەك حورمەت و پیسی .

(٥) ٧٦)قیاسێك عیلەتەکەی صیفەتی کە متربێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەیدا زۆری ـەبێ، چونکە ئەوەی صیفەتی کەمتر بێ سەلامەترە، هەندێك ووتویانە:پێچەوانەکەی ـاستە، چونکە ئەوەی صیفەتی زۆر تربێ شتی زیاتر لێ دەچێ .

{والمقتضية إحتياطاً في الفرض} لانها انسب به مما لاتقتضيه وذكر الفرض لانه محمل الإحتياط إذ لاحتياط في الندب وان احتيط به كما تقدَّمَ[1].

{وعامة الاصل} بأن توجد في جميع جزئياته لانها اكثر فائدة مما لاتعم كالطعم العلة عندنا في باب الربا فإنَّهُ موجود في البر مثلاً قليله وكثره بخلاف القوت العلة عند الحنفية فلا يوجد في قليله فجوزا بيع الحفنة منه بالحفنتين[2] {والمتفق على تعليل اصلها} المأخوذة منه لضعف مقابلها بالخلاف فيه[3].

{والموافقة الاصول على موافقة اصل واحد} لان الاولى اقوى لكثرة مايشهد لها {قيل والموافقة علة آخرى ان جوز علتان} لشيء واحد وَ قِيلَ:لا كالخلاف في الترجيح بكثرة الادلة[4].

---

(١) ٧٧) عیلەتێك كەداوای احتیات بكا لە فەرزدا،چونكە ئەم جۆرە عیلەتە مناسبە و خزمایەتی زیاترە بەفەرزەوە لەوەی كەداوای ئەو احتیاتە ناكا، بۆیە وشەی فەرزی هێناوە چونكە فەرز جێ ئەوەیە احتیاتی بۆ بكرێ، چونكە لە نەدبدا احتیاط نیە، هەرچەند ئەویش بۆ ئەوەی لۆمە نەكرێ احتیاتی بۆ دەكرێ، وەك لەپێشەوە رابورد .

(٢) ٧٨) عیلەتێك كە گشت گیربێ بۆ ئەصڵەكە، واتە لە هەمو جورێكی ئەصڵەكەدا دەست كەوێ، ئەمە پێش دەكەوێ، چونكە سودی زیاترە لەوەی عیلەتەكە هەموو جوزئەكانی نەگرێتەوە، وەك طەعم بەلای ئێمەوە لەباسی رێبازو سووا عیلەتە، چونكە لەگەنمدا بۆنموونە لەكەم و زۆریدا ئەو عیلەتە هەیە، بەڵام عیلەتی حەنەفیەكان وانیە كەقوتە، چونكە لە كەمێكیدا دەست ناكەوێ، كەمێكی بەقوت حسێبە، نیە، لەبەر ئەوەی مۆڵەتیكان داوە مشتێ گەنم بەدومشت بفرۆشرێ

(٣) ٧٩) قیاسێك كە اتفاق هەبێ ئەصڵەكەی عیلەتی بۆ هێنراوەتەوە، كە عیلەتەكە لەو ئەصڵەوە وەرگیراوە پێش دەخرێ بەسەر ئەوەیدا وانەبێ، چونكە ئەوەی وانەبێ بەهۆی ئەوەوە كە خلاف هەیە تێدا لاواز دەبێ

(٤) ٨٠) قیاسێك كە عیلەتەكەی موافق بێ بۆچەند قاعدەیێك تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەوەیدا كە عیلەتەكەی موافقی یەك قاعرەبێ، چونكە یكەمەكە زۆربە هێز ترە بەهۆی ئەوەشتی زۆر گەواهی بۆ ئەدا. هەندێك ووتویانە: ئەو قیاسەی عیلەتەكەی موافقی بۆ عیلەتەكەی تر پێشدەخرێ ئەگەر یەك شت دروستبێ دو علەتی هەبێ. هەندێ: ووتویانە: پێش ناخرێ، وەك ئەوەی ئەو خیلافەی تێدایە تەرجیح بدرێ بەهۆی زۆری بەڵگەوە .

{وما} اي والقياس الذي {ثبتت علته بالاجماع فالنص القطعيين فالظنين} ثم بالاجماع القطعي فالنص القطعي فالاجماع الظني فانص الظني {فالايماء فالسـ فالمناسبة فالشبه فالدوران[1] وَ قِيلَ النص فالاجماع} الى آخر ماتقدم {وَ قِيلَ الدو فالمناسبة وما قبلها وما بعدها} كما تقدَّمَ فكل من المعطوفات دون ما قبله فالنص يقبل النسخ بخلاف الاجماع ومن عكس قال النص اصل للاجماع لان حجته تثبت به ورجحان الايماء على السبر والمناسبة على الشبه واضح من تعاريفه السابقة ورجحان السبر على المناسبة بما فيه ابطال ما لايصلح للعلية والشبه عن الدوران يقربه من المناسبة ومن رجح الدوران عليها قال لانه يفيد اطراد العلة وانعكاسها بخلاف المناسبة ورجحان الدوران أو الشبه على مابقي من المسـ واضح من تعاريفها[2].

(١) ٨١) ئەو قیاسەی عیلەتەکەی بە اجماع سابت بوبێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەی بەدەق بوبێ، واتە: اجماعی بێگومان پێش دەخرێ بەسەر دەقی بێ گومان ئەمجارا اجماعی گوماناوی ٨٣) پێش دەخرێ بەسەر دەقی گوماناویدا، ٨٤ ئەمجا ئەمیش پێش دەخرێ بسەر ئیمادا. ٨٥) ئەمیش بەسەرسیبردا، ٨٦) بەسەر مناسبە ٨٧)ئەمیش بەسەر شبەھ دا، ٨٨)ئەمجا ئەمیش بەسەر دەوراندا.

(٢) هەندێك ووتویانە ئەوەی بەدەق سابت بوبێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەی بە اجماع سابت بوبێ هەتا كۆتایی، هەندێك ووتویانە: دەوەران پێش دەخرێ ئەمجا مناسبەو ئەمجا ئەوەی لەپێشیەوەیە كە سیبرو ایمایە، ئەمجا ئەوەی وابە دوایەوە كەشبیهە، وەك لە پێشەوە ڕابورد، ئەوەی عەتف كراوەتەوە پلەی كەمترە لەوەی پێش خۆی، چونكە دەق قەبوڵێ سڕینەوە دەكا، بەڵام اجماع وانیە، ئەوەش دەڵێ دەق لەپێش اجماعەوەیە دەڵێ چونكەئەصڵی اجماع دەقە، چونكە بەبەڵگەبونی اجماع كە سابت بووە بە دەق سابت بووە، پێش خستن و تەرجیح دانی ئیما بەسەر سیبرد. ومناسبە بەسەر شبەدا هۆكەیان ڕونە، چونكە ایما لەشەرع وەر دەگرێ و ئەوانی تر لەبۆچونی مجتهدەوە، بەڵگەكەیان ڕونە وەر دەگیرێ لە پێناسە پێشووەكانیانەوە. تەرجیح سیر ئەدرێ بەسەر مناسبەدا بەهۆی ئەوەیە كە پوچەڵ كردنەوەی ئەوەیان كە ناشێ بۆیە عیلەتبون، شبهیش پێش دەخرێ بەسەر دەوراندا بەهۆی نزیكی شبە وە زیاتر لە مناسبە، ئەو كەسەش تەرجیحی دەوەران دەدا بەسەر مناسبەدا ووتویەتی: چونكە دەوەران طردو عەكس ئەگەیێنێ لەهەرچی عیلەتەكە بو حوكمەكە هەیە وە لە هەركوێ عیلەتەكە فەوتا حوكمەكەش دەفەوتێ، بەڵام مناسەبە وانییە

{و} يرجح {قياس المعنى على} قياس {الدلالة} لما علم فيهما في مبحث الطرد وفي خاتمة القياس من اشتمال الاول على المعنى المناسب والثاني على لازمه مثلاً[1].

{وغير المركب عليه ان قبل} أي المركب لضعفه بالخلاف في قبوله المذكور في مبحث حكم الأصل {وعكس الأستاذ} ابو اسحق الاسفرايني فرجح المركب وقد قال به على غيره لقوته باتفاق الخصمين على حكم الاصل فيه[2].

{والوصف الحقيقي فالعرفي فالشرعي} لان الحقيقي لا يتوقف على شيء بخلاف العرفي والعرفي متفق عليه بخلاف الشرعي كما تقدَّمَ وان عبر هناك بالحكم الشرعي لانه وصف للفعل القائم هو به {الوجودي} مماذكر {فالعدمي البسيط} منه {فالمركب} لضعف العدمي والمركب بالخلاف فيهما [3].

---

تەرجيحی دەوران و شبە بەسەر ئەوانیتردا لە ڕێگەکانیتری دۆزینەوەی عیلەت هەمویان لە پێناسەکەیانەوە ڕونە

(١) ٨٩)قیاسی المعنی پێش دەخرێ بەسەر قیاسی الدلالە دا، چونکە لەباسی طەردو کۆتایی باسی قیاسدا زانرا کە یەکەم مانای مناسبی تێدایەو دوهەم مانای لازمی مناسبی تێدایە، واتە ئیسکار پێش دەخرێ بەسەر بۆندا.

(٢) ٩٠) قیاسی (غیر المرکب) پێش دەخرێ بەسەر قیاسی المرکبدا ئەگەر مرکبەکە قبولْ بکرێ، چونکە بەهۆی ئەو کێشەیەوە کە هەیە لە بارەی قبولْ کردنیەوە لاواز بووە، لە جێ باسی حوکمی ئەصڵدا باسکرا، مامۆستا إسفەراینی پێچەوانەی کردووەتەوە، ئیتر ترجیحی قیاسی مرکبی داوە، بەسەر غەیری مرکبدا، بۆیە مامۆستا ئەوەی وتووە، چونکە قیاسی مرکب بەهێزە بەهۆی ئەوەی هەردونەیارەکە یەك دەنگن لەسەر حوکمی ئەصڵەکە لەو مرکبەدا

(٣) ٩١) صیفەتی حەقیقی پێش دەکەوێ بەسەر صیفەتی عرفیدا ئەمیش پێش دەکەوێ بەسەر صیفەتی شەریعدا، چونکە صیفەتی حەقیقی انسان لێ حاڵی دەبێ بێ ئەوەی پێویستی بە عورفی و شەرعی هەبێ، بەلاّم عورفی وانیە، دەبێ عورف بزانرێ، عورفیش هەمویان یەك ڕان لەسەر ئەوەی کە دروستە بەعیلەت بهێنرێتەوە، بەلاّم شەرعی وانیە، وەك لە پێشەوە ڕابورد، هەرچەن لەوێ بەحوکمی شەرعی ناوبرا، چونکە حوکمی شەرعی صیفەتی ئەو فیعلەیە کە حوکم و شەرعیەکە بەهۆی ئەوە بەرپابوو. ٩٢) صفەتی و جودی ئەم سیانە لەپێش صیفەتی عەدەمی بە سیتەوە، ئەمیش لە پێش مرکبەوەیە، چونکە عەدەمیو مرکب بەهۆی کێشەی بە عیلەتبونیان لاوازن، چۆن دەبێ حەقیقیش بێ و عەدەمیش بێ...

...ولا منافاة بين الحقيقي والعدمي لانه من العدم المضاف كما تقدّم[1] {والباعث على الامارة} لظهور مناسبة الباعثة[2] {والمطردة المنعكسة} على المطردة فقط لضعف الثانية بالخلاف فيها[3] {ثمّ المطردة فقط على المنعكسة فقط} لان ضعف الثانية بعدم الاطراد اشد من ضعف الاولى بعدم الانعكاس[4] {وفي المتعدية والقاصرة اقوال} احدها ترجيح المتعدية لانها افيد بالالحاق بها والثاني القاصرة لان الخطأ فيها اقلّ {ثالثها} هما {سواء} لتساويهما فيما ينفردان به من الالحاق في المتعدية وعدمه في القاصرة[5].

(١) ..هيچ جۆرە دژایەتێك نیە لە نێوان حەقیقی و عەدەمیدا، چونكە عەدەمی بەشێكە لە عەدەمێك كە ازافە كراوبێ، عەدەمی متلق مەبەست نیە، لەبەر ئەوە وجودیش دەگرێتەوە، وەك لەپێشەوە ڕابوورد .

(٢) ٩٤) عیلەتێك كە هانی خەڵك بدا وشەو قیان هەڵسێنێ بۆ ئەوەی كە بەحوكمەكەی بكەن پێش دەخرێ بەسەر ئەمارەت و نیشانەوە، چونكە مناسبەی ئەوەیان هاندەرە دیارە.

(٣) ٩٥) عیلەتێك كە مطردو منعكسیش بێ پێش دەخرێ بەسەر ئەوەدا هەر تەنها مطردەیە، چونكە دووەمە كە لاوازە بەهۆی ئەوە كێشرەیە لەبە عیلەتبونەكەیدا.

(٤) ٩٦) پاشانیش عیلەتێك تەنها مترده بێ پێش دەخرێ بەسەر عیلەتی منعكسەی ڕوتدا، چونكە لاوازی دووەمەكە بەهۆی نەبونی اطرادەوە توندترێكە لە لاوازی یەكەمەكە بەهۆی نەبونی لاوازی دووەمەكە بەهۆی نەبونی إطرادەوە نوسترێكە لەلاوازی یەكەمەكە بەهۆی نەبونی انعكاسەوە، چونكە بوون لە نەبوون دیار ترە.

(٥) ٩٧) لە عیلەتێكدا كەلە چەندە ها فەرعدا هەبێ لەگەڵ عیلەتێكی كە تەنها لەیەك جێدا هەبێ كامیان تەرجیح ئەدرێ چەند قەولێكی تێدایە، یەكەیمان دەڵێ تەرجیحی ئەوەیان ئەدرێ كەباڵ ئەهاوێ بۆ چەندەها فەرعی تر، چونكە بەكەڵكترە بەهۆی ئەوەی چەندەها فەرعی تری پێوە ئەلكێ. دووەمیان دەڵێ: ئەوەیان كە هەر ئایبەتەو باڵ ناهاوێ تەرجیح ئەدرێ، چونكە غەڵەت لەمەیاندا كەمترە. سێهەم دەڵێ هەردوكیان یەكسانن چونكە لەوەدا هەریەك شتێكی هەیە لەویتر دانیە یەكسانن. وەك الحاق وشوێنی خستن لەمتعدیەدا هەیە، وە لە قاصرەدا الحاق وشوێن خستنی تێدا نیە. (وفي الاكسر قوعا.. لاتنفاء علته) .

{وفي الاكثر فروعا} من المتعديتين {قولان} كقولي المتعدية و القاصرة ولا يأتي التساوي هنا لانتفاء علته[1]. {و} يرجح { الاعرف من الحدود السمعية } ايالشرعية كحدود الاحكام {على الاخفى} منها لان الاول افضي الى مقصود التعريف من الثاني اما الحدود العقلية كحدود الماهيات وان كانت كذلك فلا يتعلقبها الغرض هنا[2].

{والذاتي على العرضي} لان التعريف بالاول يفيد كنه الحقيقة بخلاف الثاني[3] {والصريح} من اللفظ على غيره تجوز او اشتراك لتطرق الخلل الى التعريف بالثاني[4]. {والاعم} على الاخص منه لان التعريف بالاعم افيد لكثره المسمى فيه وَ قِيلَ يرجح الاخص اخذا بالمحقق في الحدود[5].

---

(١) ٩٨) لەدوقیاسدا عیلەتی هەردوکیان متعدیە بەئەوەیان کە فەرعی زۆرترە ئایا تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەوەیاندا کە کەمترە؟ دو قەولی تێدایە، وەك ئەو دو قەولەی متعدیەو قاصرە، ئەی بۆ سێهەمیان نابێ یەکسانەکە لێرەدا نابێ چونکە عیلەتەکە لێرەدا نیە، کە هەر یەك شتێکی هەبێ لەویتر دا نەبێ.

(٢) ٩٩) ئەو پێناسەی بۆ سنورە شەرعیەکان دەکرێ کامیان زیاتر ڕون و ئاشناتر بێ بەهەستی گوێگرەوە ئەوەیان تەرجیح ئەدرێ بەسەر ئەوەیاندا کەمتر ڕونە، وەك پێناسەی پێنج حوکمەکە: واجب حرام... چونکە یەکەمەکەیان زیاتر سەر ئەکێشێ بۆ مەبەستی پێناسەکە تا دوهەمەکەیان، بەلاّم پێناسەی سنورە عەقلّیەکان وەك پێناسەی ماهیەتەکان هەرچەندە ئەویش هەر وایە کامیان ڕونتر بێ پێش دەخرێ، بەلاّم مەبەستی ئێمە لێرەدا پەیوەند نیە پێیانەوە.

(٣) ١٠٠) پێناسەیێك بە زاتی بکرێ واتە: هەموو جوزئەکانی زاتی بن پێش دەخرێ بەسەر پێناسەێکدا کە عرەزی بێ واتە جوزئەکانی یاهەندێکیان عەرەزی بن، چونکە پێناسە کردن بە یەکەمیان حەقیقەتی پێناسە کراوەکە ئەگەێنێ، بەلاّم دووەم وانیە.

(٤) ١٠١) پێناسەیێك بە لەفزی صریح و ڕەوان بکرێ پێش دەخرێ بەسەر پێناسەێدکدا بەغەیرە صەیح بکرێ، کە غەیرەی صەریح بێ بەهۆی ئەوەوە کە مەجاز بێ یا مشترەك بێ، چونکە خەلەل و نوقسانی بەرەو پێناسەی دووەم دەڕوا.

(٥) ١٠٢) پێناسەێك بە لەفزی گشت گیر بکرێ پێش دەخرێ بەسەر لەفزی تایبەتدا، چونکە گشت گیر بە کەلّکترە لەبەر زۆری ئەفرادەکانی، هەندێ: ووتویانە: ئایەتەکە تەرجیح ئەدرێ چونکە بێگومان هەمو فەرمودەکانی وەبەر ئەکەوێ، بەلاّم ئەویان فەردی هی تریش بەردەکەوێ.

{وموافقة نقل السمع واللغة} لان التعريف بما يخالفهما انما يكون لنقل عنهماوالأصلُ عدمهُ[1]{ورجحان طريقِ اكتسابه}اي الحدّ علىالآخر لأنّ الظنَّ بصحته اقوى من الآخر[2] .{والمرجحات لا تنحصر} لكثرتها جدا{ومثاها غلبة الظن}اي قوته {وسبق كثير} منها {فلم نعده} حذرا من التكرار منه تقديم بعض مفاهيم المخالفةعلى بعض وبعض ما يخل بالفهم على بعض كالمجاز على الاشتراك وتقديم المعنى الشرعي على العرفي والعرفي على اللغوى في خطاب الشارع وتقديم بعض صورالنص من مسالك العلة على بعض وتقديم بعض صور المناسب على بعض وغير ذلك[3].

{الكتاب السابع في الاجتهاد}

{الاجتهاد} المراد عند الاطلاق وهو الاجتهاد في الفروع {استفراغ الفقيه الوسع} بأن يبذل تمام طاقته في النظر في الادلة {لتحصيل ظن بحكم} من حيثُ انه فقيه[4].

---

(١) ١٠٣) پێناسەیێك موافق بێ بۆ بیسراوو لۆغە تەرجیح ئەدرێ چونكە پێناسە بەوەی پێچەوانەیان بێ ئەوەتەنها كاتێ دەبێ لەوانەوە نەقڵ كرابێ،اصڵیش ئەوەیە نەقڵ نەبوو بێ.

(٢) ١٠٤) ئەو پێناسەی رێگای دەست كەوتنەكەی راجح تربێ پێش دەخرێ بە سەر ئەویتردا، چونكە گومان بەصحت و دروستیەتەكەی بەهێزترە، لەویتر.

(٣) مرجحات و ئەوانەی ئەرزشی لایێك سەنگێن دەكەن بەسەر كەسێكی تردا لە ژماردن نایێن لەبەر زۆریان، جێ شەوەران و بەرپابونی مرجحات هێزی گومانە. هەندێ مرجحات لە پێشەوە تێپەریان كرد، ئیتر ئێمە دوبارە نەمان ووتنەوە، بۆ ئەوەی خۆمان لەو دووبارەكردنە بپارێزین، یەكێكیان پێش خستنی هەندێ مفهومی مخالفە بەسەر هەندێكی تریاندا. ١٠٦ )هەندێ لەوانەی خەلەل بەحاڵیبون دەگەیێنێ بەسەر هەندێكی تریاندا، وەك مەجاز بو سەر اشتراكدا، یا پێش خستن.

١٠٧) مانای شەرعی بەسەر عورفیدا. ١٠٨)عورفی بەسەر لۆرغەویدا لەگوفتوگۆی شەرعیدا. ١٠٩) پێش خستنی هەندێ نمونەی دەق لەوشێوازانەی كە عیلەتیان بپێ ئەدۆزێتەوە بەسەر هەندێكی تریاندا. ١١٠) پێش خستنی هەندێ دیمەنی مناسب بەسەر هەندێكی تریا وەچەندە های تر جگە لەوانە

بەشی حەوتەم لەبارەی ئیجتهاددوەیە

(٤) سێ جۆر اجتهاد هەیە ، اجتهادی مطلق، اجتهادی مذهب، اجتهادی فتوا، مەبەست لە اجتهاد لەكاتی وتنیدا ئەوەیە اجتهاد لەلقەكانی أصولدا بكرێ ئەوەیە: شەرعزان تەواوی توانای خۆی خاڵی بكاتەوەو خەرج بكا لەسەرنج دان

**فلا حاجة الى قول ابن الحاجب شرعي فخرج استفراغ غير الفقيه واستفراغ الفقيه لتحصيل قطع بحكم عقلي والظن المحصل هو الفقه المعرف في اوائل الكتاب بالعلم بالاحكام الخ فلو عبر هنا بالظن بالاحكام كان احسن(١). والفقيه في التعريف بمعنى المتهيء للفقه مجازا شائعا ويكون بما يحصله فقيها حقيقة ولذا قال المصنّف {والمجتهد الفقيه} كما قال فما تقدَّمَ نقله عنه في اوائل الكتاب والفقيه المجتهد لان كلامنهما يصدق علي ما يصدق عليه الآخر(٢).**

و بیرکردنەوە لەهەر پێنج بەڵگەو دەلیلەکاندا ، بۆ ئەوەی ظن و گومانێك بە حوكمێك لەو پێنج حوکمە پەیدا بکرێ، لەو ڕووەوە کە ئەوزانایە فقیه بێ،

(١) لەبەر ئەوە ئیتر هیچ پێویستیەکی نیە بۆ ئەوەی (ابن الحاجب) وتویەتی: وشەی شرعی، لەپێناسەکەدا زیادکردوە چونکە شەرعی واتە لەشەرع وەرگیرابێ، دەی کەوتت فقیە لەو پێنج سەرچاوەوە وەریگرتووە، ئیتر شەرعیّ زیادەیەو نایەوەێ، لەبەر ئەوە دوو شت بەم پێناسەیە چوەدەر ، یەکەمیان کەسێ فقیە نەبێ و توانای خۆی خەرج بکا، دووەم فقیە بێ و هەموو توانای خۆی خەرج بکا بۆ ئەوەی بێگومانی بەحوکمێکی عەقڵی پەیدا بکا، چونکە گومان بڕی بەحوکمی عەقڵی بەهۆی شتی بەڵگەنەویستەوە پەیدا دەبێ، ئەوە لەڕووی فقهەوە پەیدا نابێ بەڵکوو لەڕووی حەکیمیەوە پەیدا دەبێ، ئەو ظن و گومانەی کەپەیدا دەبێ ئەوە ئەوفیقهەیە کەلەسەرەتای جمع الجوامعدا پێناسەکرا، بەم شێوەیە وتی: فقه واتە عیلم بە ئەحکامی شەرعی...، خۆ ئەگەر لێرەش بیوتایە فقه واتە: ظن وگومانە بەهەموو ئەحکامەکان، واتە: لەوێ ئەحکامی ووتووە لێرەش حوکمی وتوە بەمفرد، ئەگەر وەك یەك بوایەن جوانتر دەبوو.

(٢) فقیە لەپێناسەکەدا بەمانا ئەو کەسەیە کە ئامادەیە بۆ حاڵی بوون، و وەرگرتنی حوکم و دەرهێنانی، چونکە هیچ کەسێ نیە هەرچی ئەحکام هەیە هەمویان بزانێ چونکە زۆرشت هەیە هێشتا نەهاتووە، لەبەر ئەوە فقیە مەجازێکی بڵاوە لەشتی واقعدا ، ئەو کەسە ئامادەیە بەهۆی ئەوەی کە پەیدای دەکا دەبێتە فقیهی حەقیقی ، لەبەر ئەوە مەبەست بە فقیە ئەو کەسەیە کە ئامادەبێ لەبەر ئەوە دانەر ووتی: مجتهد بەو کەسە دەڵێن کە فقیە بێت ، وەك لە پێشەوە لەسەرەتای ئەم کتێبەوە ڕابوورد و دانەر ووتی: فقیە بەکەسی مجتهد دەوترێ چونکە ماصدقی هەریەکێکیان دەبڕێ بەسەر ئەوی تردا.

ولتحققه شروط ذكرها بقوله {وهو} اي المجتهد او الفقيه من حيثُ ما يتحقق ب {البالغ} لان غيره لم يكمل عقله حتّى يعتبر قولهُ{العاقل}لأنّ غيره لاتميّز لهُ يهتدي به لما يقول حتى يعتبر {اي ذو ملكة} هي الهيئة الراسخة في النفس{يدرك بها المعلوم} اي مامن شانه ان يعلم وهذه الملكة العقل {وَ قِيلَ العقل نفس العلم} اي الادرك ضروريا كان اونظريا {وَ قِيلَ ضروريه} فقط وصدق العاقل على ذي العلم النظري على هذا للعلم الضروري الذي لاينفك عن الإنسان كعلمه بوجود نفسه كما يصدق لذلك على من لايتاتي منه النظر كالأبله {فقيه النفس} اي شديد الفهم بالطبع لمقاصد الكلام لان غيره لا يتاتي له الاستنباط المقصود بالاجتهاد {وان انكر القياس} فلا يخرج بانكاره عن فقاهة النفس[1].

(١) فقيه و اجتهاد بەواتای ئامادەباشی بێ مەرجی ناوێ، بەڵام بۆ دەستەبەرکردن و هێنانەوەی چەند مەرجێکی ئەوێ دانەر باسیان دەکاو دەڵێ: مجتهد و فقیه لەم ڕووەوە کە صیفەتی مجتهدی و فقیهی پەیدا ببێ، نەك لەخودی خۆیانەوە، بەکەسی دەڵێن: ١-باڵغ بێ چونکە کەسێ باڵغ نەبێ عەقڵی تەواو پێنەگەیشتووە، هەتا قسەی ئەرزشی هەبێ، ٢-وەدەبێ عاقڵیش بێ چونکە عاقڵ نەبێ واتە: ئامێری جیاکردنەوەی شتەکانی‌نیە تا بەوە ڕێنمایی بکرێ بۆ ئەو قسانەی دەیان کاو بەهاو ئەرزشی لای خەڵك هەبێ، واتە خاوەنی مەلەکە بێ کە بریتیە لە دەزگایەکی مەعنەوی جێگرتوو لەهەستی ئادەمیزاد دا ئەوەی لەباری‌دا هەبێ بزانرێ بەو دەزگایە دەرك بکرێ، ئەم مەلەکەش عەقڵە هەندێك وتویانە:عەقڵ هەر بریتیە لەخودی عیلمەکە نەك هەیئەتەکە ، ئیتر ئەوەی دەرك دەکرێ بەڵگە نەویست بێ یاخود بەڵگەویست و جێ‌سەرنج بێ . هەندێکیش وتویانە: تەنها ئەبڕێ بەسەر ئەو عیلمەدا بەڵگەنەویست بێ. جا لەسەر ئەم قیلە دابڕینی وشەی عاقڵ بەسەر کەسێکدا هەر خاوەنی عیلمی نظری بێ ئەوەڕای وایە عیلمی بەڵگە نەویست لەهیچ ئادەمیزادێك نابێتەوە و هەموو کەس هەیەتی، وەك ئەوەی بەلای کەمەوە عیلمی بەبوونی خۆی، وەك چۆن وشەی عاقڵ دەبڕێ بەسەر کەسێکدا کەئەصڵەن سەرنج و رامانی لەشتەکان هەر نیە وەك ئەبلەه . ٣-وەدەبێ بەزگماك و سروشتی خۆی زۆر زیرەك بێ لەمەبەستی کەلام و گفتوگۆ حاڵی ببێ چونکە کەسێ وانەبێ توانای ئەوەی نابێ حوکم لەدەریای دەقەکاندا هەڵگۆزێ، کەهەر ئەوەش مەبەستە لەاجتهاد،بابڕوایشی بەقیاس نەبێ‌لەبەر ئەوەی بەبڕوا نەبوونی بەقیاس لەپلەی زیرەکی و شت حاڵیبوون ناکەوێ ، هەندێك وتویانە: لەپلەی زیرەکی سروشتی دەردەچێ لەبەرئەوە قسەی بەهاوئەرزشی نیە.

وَ قِيلَ يخرج فلا يعتبر قوله {وثالثُها إلاّ الجلـي} فيخـرج بانكـاره لظـهور جمـوده {العارف بالدليل العقلي} اي البراءة الاصليه {والتكليف به} في الحجية كما تقدَّمَ ان استصحاب العدم الاصلي حجة فيتمسك به الىان يصرف عنه دليل شرعي [١].

{ذو الدرجة الوسطي لغة وعربية} من نحو وتصريف {واصولا وبلاغة} من معان وبيان {ومتعلق الاحكام} بفتح اللام اي ماتتعلق هي به للالته عليها {من كتاب وسنة وان لم يحفظ المتون} اي المتوسط في هـذه العلـوم ليتـأتي لـه الاستنباط المقصـود بالاجتـهاد امـا علمـه بآيـات الاحكـام واحاديثـها اي مواقعـها وان لم يحفظـها فلانها المستنبط منه. واما علمه بأصول الفقه فلانه يعرف به كيفية الاستنباط وغيرها مما يحتاج إليهِ واما علمه بالباقي فلانه لايفهم المراد من المستنبط منه الاية لانه عربي بليغ [٢].

---

(١) قەولی سێهەم دەڵێ: لەپلەی زیرەکی ناکەوێ مەگەر بڕوای بەقیاسی جەلی و روون نەبێ، کە ئینکاری ئەمەشی کرد ئەوە لەپلەی زیرەکی دەردەچێ چونکە ئەوە بیری بەستەڵەکی دەردەکەوێ .٤-دەبێ زانا بێ بەبەڵگەی عەقڵی واتە: ئەصڵ لەهەموو شتێکدا ئەوەیە هیچ حوکمێکی تێدا نەبێ واتە: حەلاڵ بێ، وەدەبێ بزانێ ئێمە ئەو بەڵگەیە بەبەڵگە حسێب دەکەین و کاری پێ دەکەین هەتا بەڵگەیەك لەقورئانەوە یا لەفەرموودەوە یا لەئیجماعەوە دێ دەڵێ نابێ حوکم و کار بکرێ بەو بەرائەتە ئەصڵێ، وەك چۆن لەپێشەوە رابوورد کە استصحاب و هاودڵخوازی عەدەمی ئەصڵی حوججەو بەڵگەیە .

(٢) ٥-دەبێ پلەی مامناوەندێ هەبێ لە لوغە و ئەوەش ئامێرە بۆ زاراوەی عەرەب ، وەك نەحوو صرف، وەهەم دەبێ لەزانستی ئوصولو زانستی بەلاغەو رەوانبێژیدا کەمەعان و بەیانە ئەو پلەی هەبێ. ٦-وەهەم دەبێ ئەوەی کە حوکمەکان پەیوەندن پێیەوە کە قورئان و فەرموودەیە مامناوەندی بێ تیایاندا، هەرچەندە مەتنەکەیانی لەبەر نەکردبێ، واتە لەم زانستانەدا پلەی مامناوەندی هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانێ حوکمیان لێدەربهێنێ و هەڵگۆزێ، کەهەر ئەوەش مەبەستە لە اجتهاد، جاعیلم بوونی بەو ئایەتانەی ئەحکام و فەرموودەکانی واتە ئەوانەی جێی حوکمەکانن بالەبەریشی نەکردبن، چونکە ئەو ئایەت و فەرموودانە جێی دەرهێنان و هەڵگۆزینی حوکمەکانن، بۆیە دەبێ عیلمیش هەبێ بەزانستی (اصول الفقه) چونکە تەنها بەو دەزانرێ

{وقال الشيخ الامام} والدا المصنّف {هو} اي المجتهد {من هذه العلوم ملكة له واحاط بمعظم قواعد الشرع ومارسها بحيث اكتسب قوة يفهم بها مقصود الشارع فلم يكتف بالتوصط في تلك العلوم وضم اليها ماذكر {ويعتبر قال الشيخ الامام} والد المصنّف {لايقاع الاجتهاد} لا لكونه صفة فيه كونه خبيرا بمواقع الاجماع كي لايخرقه} فإنَّهُ اذا لم يكن خبيرا بمواقعه قد يخرقه بمخالفته وخرقه حرام كما تقدم لا اعتبار به[1]. {والناسخ والمنسوخ} ليقدم الاول على الثاني فإنَّهُ اذا لم يكن خبير بهما قد يعكس[2]. {واسباب النزول} فان الخبرة بها ترشد الى فهم المراد [3].

---

حوكمەکان چۆن دەردەهێنرێ، چەندەها شتیتر کەلەکاتی دەرهێنانی حوکمە پێویست دەبێ، بۆیە دەبێ عیلمش هەبێ بەوانیتریش چونکە ئادەمیزاد حالّی نابی لەوەی حوکەکانی لیهەڵدەگۆزێ کەقوران و فەرموودەیە بەباقیەکەیتریش نەبێ چونکە ئەو حوکمەکانی لێدەردەهینرێ عەرەبیەکی بەلیغ ە پاراوە، کەسێ بەلیغ نەبی ناتوانێ حوکمی لێ دەربهێنێ.

(٢) پیری پێشەوا باوکی دانەر وتویەتی: مجتهد کەسێکە کە ئەم عیلمانەی بوبی بەمەلەکەو ئەم سەرو ئەوسەری زۆربەی قاعیدەو رێبازی شەرع بزانێ و تەمرینی زۆری لەسەرکردبن، بەشێوەیەك هێزی مەلەکەی بۆ پەیدابێ ، ئیتر بەوەمەلەکەیە مەبەستی شارع تێبگا ، باوکی دانەر رازی نەبوو بەوەی پلەی مامناوەندی هەبێ لەو زانستانەدا لەبەر ئەوە ئەوەی باسکرا پێوەی لکاندا، هەم باوکی دنەر وتویەتی: ئەم مەرجانە بۆ ئەوەیە بالفعل اجتهاد بکا، نەك بۆ ئەوەی صیفەتی اجتهادی تێدابێ

٧-دەبێ شارەزاو ئاگاداربێ لەو جێگانەی اجماعیان تێدایە، بۆ ئەوەی ئەو اجماعە کون نەکاو نەیشکێنێ، چونکە ئەگەر شارەزا نەبێ بەو اجماعانە کونیان دەکا، و دەیان شکێنێ، بەهۆی ئەوەوە کە پێچەوانەیان کار دەکا، شتێکی بێگومانیشە شکاندنی اجماع حەرامە، وەك لەپێشەوە رابوورد ، شتێك شکاندنی اجماع بێ هیچ بەهاو ئەرزشێکی‌نیە، وەك نەبوو وایە.

(٢) ٨-دەبێ بزانێ کامەیە سڕێنەرو کامەیە سڕاوە بۆ ئەوەی یەکەم پێش بخا بەسەر دووەمدا چونکە ئەگەر شارەزای ئەم دووانە نەبێ جاری وادەبێ پێچەوانەیان دەکاتەوە.

(٣) ٩-دەبێ شارەزابێ بەهۆکای دابەزینی دەقەکان، چونکە شارەزابوون بەوانە رێنمایی دەکا بۆ حالّی بوونی مەبەست .

{وشرط المتواتر والآحاد} الحقق لهما المذكور في الكتاب الثاني ليقدم الاول على الثاني فإنَّهُ اذا لم يكن خبيرا به قد يعكس[1]. {والصحيح والضعيف} من الحديث ليقدم الاول على الثاني فإنَّهُ اذا لم يكن خبيرا بهما قد يعكس[2] {وحال الرواة} في القول والرد ليقدم المقبول على المردود فإنَّهُ اذا لم يكن خبيرا بذلك قد يعكس وفي نسخة وسير الصحابة ولا حاجة إليهِ على قول الاكثر بعد التهم كما تقدَّمَ {ويكفي} في الخبرة بحال الرواة {في زماننا الرجوع الى ائمة ذلك} من المحدثين كالامام احمد والبخاري ومسلم و غيرهم فيعتمد عليهم في التعديل والتجريح لتعذرهما في زماننا الابواسطة وهم اولى من غيرهم فالخبرة بهذه الامور اعتبروها في المجتهد لما تقدَّمَ وبين والد المصنف انها شرط في الاجتهاد لاصفة فيه وهو ظاهر[3].

---

(١) ١٠-دەبێ شارەزابێ بەمەرجی متواتر و ئاحاد، مەرجێك كەبیان هێنێتەدی ، كەلەبەشی دووهەمی ئەم كتێبەدا باسكران، چونكە ئەگەر شارەزانەبێ بەمەرجی ئەم دووانە جاری واهەیە ئاحاد دەكا بەمتواتر و متواتر دەكا بەئاحاد .

(٢) ١١-دەبێ شارەزابێ بەفەرموودەی پلە صەحیح و پلەضەعیف بۆ ئەوەی یەكەم پێشی دووهەم بخا، چونكە ئەگەر ئەم شارەزاییەی نەبێ جاری واهەیە صەحیح بەضەعیف دادەنێ و پێچەوانەكەشی .

(٣) ١٢-دەبێ شارەزابێ بەحاڵی ریوایەتكەرەكان، كامیان قسەی قەبوڵەو كامیان قسەی قەبوڵ نیە، چونكە ئەگەر ئەمە نەزانێ جاری وادەبێ بەپێچەوانەوە كار دەكا، لەنوسینەوەیەكی ئەم كتێبەدا نوسرابوو، دەبێ شارەزابێ بەژیاننامەی هاوەڵانیش بەلام پێویست نیە لەسەر قەولی زۆرینەی زانایان، چونكە ئەوانە عەدالەتیان هەیە وەك لەپێشەوە رابوورد ئیتر بۆچی ژیاننامەیان بزانین -وای چەند خەتەرە لەعنەت لە هاورێیانیعادلی پێغەمبەر بكرێ--بۆشارەزابوو لەحاڵیریوایەتكەرەكان لەم سەردەمەی ئێمەدا هەرئەوەندە بەسە بگەرێینەوە بۆ لای پێشەوایانی زانایانی فەرموودە وەك پێشەوا احمدو بوخاری و مسلم و ئەوانیتر، ئیتر پشت بەوان دەبەسترێ هەركەسیان بەعادل ناساند ئێمەیش بەعادلی دەزانین عەدالەتی هەر كەسێكیان بریندارکرد ئێمەیش وایدەزانین، چونكە لەم سەرددەمەی ئێمەدا بەهۆی كەسێكەوە نەبێ ناتوانین كەس بەعادل یاعەدالەتی بریندار بكەین، باشترین كەسیش واسیتەی نێوان ئێمە و ئەوان بێ زانایانی فەرموودەن ، شارەزابوون بەم خاڵانەی كەوتران لەمجتهددا لەبەر ئەوەیە كە رابوورد لەپێشەوە ، باوكی دانەر بەڕوونی ووتی:ئەوانە مەرجن بۆ ئەوەی كار بە اجتهاد بكرێ نەك تەنها بۆ صیفەتی اجتهاد بێ ئەوەش رون ودیارە.

{ولا يشترط} في الجتهد {علم الكلام} لامكان الاستنباط لمن يجزم بعقيدة الاسلام تقليدا[1]. {و} لا {تفاريع الفقه} لانها انما تمكن بعد الاجتهاد فيكف تشترط فيه {و} لا {الذكورة ولاحرية} لجواز ان يكون لبعض النساء قوة الاجتهاد وان كن ناقصات عقل عن الرجال وكذا لبعض العبيد بان ينظر حال التفرغ عن خدمة السيد {وكذا العدالة} لا تشترط فيه {على الأصَحّ} لجواز ان يكون للفاسق قوة الاجتهاد وَ قيل تشترط ليعتمد على قوله[2].

{وليبحث عن المعارض} كالمخصِّص والقيد ولاناسخ {و} عن {اللفظ هل معه قرينة} تصرفه عن ظاهره اي عن القرينة الصارفة ليسلم مايستنبطه عن اتطرق الخدش إليهِ لو لم يبحث وهذا الوى لا واجب ليوافق ماتقدَّمَ من انه يتمسك بالعام قبل البحث عن المخصوص على الأصَحّ. ومن حكاية هذا الخلاف في البحث عن صارف صيغة افعل عن الوجوب الى غيره وحكاه بعضهم في كل معارض[3].

---

(١)بەمەرج نەگیراوە مجتهد زانستی کەلامی هەبیٚ چونکە ئەگونجیٚ ئەحکام دەرهێنان و هەڵگۆزین بۆ کەسیٚ بێگومان بیٚ بەباوەڕی ئیسلام بالەڕووی تەقلیدیشەوە بیٚ

(٢) هەم بەمەرج نەگیراوە لق و پۆپەکانی فقه بزانیٚ، چونکە ئەوانە کاتیٚ ئەگونجیٚ بزانریٚ دوای اجتهاد بیٚ ئیتر چۆن زانینی ئەوانە بەمەرج دەگیریٚ لە اجتهاد دا، هەروەها بەمەرج نەگیراوە مجتهد نێربیٚ یاخود ئازادبیٚ، چونکە ئەبیٚ هەندیٚ لەژنان هێزی اجتهادیان هەبیٚ هەرچەندە ژیریان نەگاتە کۆی ژیری پیاوان، هەروەها بۆ هەندیٚ بەندەش دەبیٚ اجتهاد بکا، بەم شێوە لەکاتی تەواوکردنی کارگوزاری ئاغاکەیدا خەریك بیرو سەرنج دان بیٚ. هەروەها عەدالەت بەمەرج نەگیراوە لەسەر قەولی ئەصەح چونکە ئەگونجیٚ فاسقێك هێزی اجتهادی هەبیٚ، هەندێك وتوویانە: بەمەرج گیراوە بۆ ئەوەی متمانەت هەبیٚ بەقسەی

(٣) دەبیٚ مجتهد توێژینەوە بکا و بگەڕیٚ بزانیٚ ئایا نەیارو دژی هەیە؟ وەك عامێك بزانیٚ تایبەت کەری هەیەو یان مطلقێك بزانیٚ مقیدی هەیە، یاخود ئایا سڕێنەرەوەی هەیە؟ وەهەم دەبیٚ بگەڕیٚ و بزانیٚ ئایا ئەو لەفظە قەرینەیەکی لەگەڵدا هەیە لەمانا ظاهیرو دیارەکەی لایدا؟ واتە بگەڕیٚ بزانیٚ قەرینە هەیە لای بدا لەم مانایە،بۆ ئەوەی کە هەڵیگۆزیوە رزگاری بیٚ لەوەی کە شتیٚ لیٚبدا و بیروشێنیٚ، ئەم مەرجە باش وایە هەبیٚ واجب نیە، بۆیە وادەڵێم بۆ ئەوەی لەگەڵ ەوەی پێشەوەدا هەماهەنگی یەك بن، چونکە لەپێشەوە وتمان کار بەعام دەکریٚ پێش گەڕان بەشوێن تایبەت کەردا لەسەر قەولی ئەصەح، هەروەها لەپێشەوە رابوورد کە کێشەو جیاوازی هەیە ئایا صیغەی

{ودونه} اي دون المجتهد المتقدم وهو المجتهد المطلق {مجتهد المذهب وهو المتكن من تخريج الوجوه} التي يبديها {على نصوص امامه} في المسائل[1]. {ودونه} اي دون مجتهد المذهب {مجتهد الفتيان وهو المتبحر} في مذهب امامه {المتمكن من ترجيح قول} له {على آخر} اطلقهما[2].

{والصحيح جواز تجزيء الاجتهاد} بأن تحصل لبعض الناس قوة الاجتهاد في بعض الابواب كالفرائض بأن يعلم ادلته باستقراء منه او من مجتهد كامل وينظر فيها وقول المانع يحتمل أن يكون فيما لم يعلمه من الادلة معارض لما علمه بخلاف من احاط بالكل ونظر فيه بعيد جدا[3] {و} الصحيح {جواز الاجتهاد للنبي ﷺ ووقوعه} لقوله تعالى ﴿ ما كان لنبي أن تكون له أسرى حتى يثخن في الارض عفا الله عنك لما اذنت لهم ﴾ عوتب على استبقاء اسرى بدر بالفداء[4].

---

فەرمان (إفعل) دەبێ توێژینەوە بکری بزانرێ ئایا قەرینە هەیە کە بۆ واجب نیە و بۆ غەیری واجبە ، ئەم کێشەیە هەندێ حکیایەتیان کردووە لەگەڵ هەموو نەیارو دژێکدا.

(١) لەومجتهدەیپێشو کەمجتهدی مطلق بو کەمترویلەییێك لەونزمتر مجتهدی مەزهەبە ئەو مەرجانەی پێشووی ناوێ، ئەمیش بەو دەڵێن کەتوانای دەرهێنان وهەڵگۆزینی چەندەها دیوی هەبێ کەلەدەقەکانی پێشەواکەی دەریان دەهێنێ لەبابەتەکاندا .

(٢) لەمیش نزمتر واتە ئەوەی کە لەپلەی مجتدی مەزهەب نزمترە مجتهدی فتوایە ئەمیش بەکەسێك دەڵێن: کەمەلەوانی دەریای پەیڕەوی پێشەواکەی َبێ ودتوانای ئەوەی هەبێ کەئیمامەکەی دوو قەولی مطلق هەبێ یەکێکیان تەرجیح بدا بەسەر ئەویتردا .

(٣) قەولی صەحیح ئەوەیە دروستە اجتهاد دابەش بکرێ .بەم شێوە کەدروستە هەندێ کەس لەهەندێ بابەتدا هێزی اجتهادی بۆ پەیدا ببێ ؛ بۆ وێنە وەك میرات: بەم شێوە بەڵگەکانی بزانێ بەخوێندنەوەی خۆی یان بەخوێندنەوەی مجتهدی تەواو مجتهد سەربەخۆ رامانیان تێدا بکا . ئەو قەولەش کەدەڵێ: اجتهاد بەشی بەش ناکرێ زۆر دوورە چونکە دەڵێ: هەڵدەگرێ لەناو ئەو بەڵگانەیدا کەنەیزانیوە نەیارو دژوارێك هەبێ بۆ ئەوەی کە زانیویەتی ، بەڵام کەسێ زاڵبونی بێبەسەر هەموو بەڵگەکانداو تێڕامانی تێدا کردبێ وانیە.

(٤) قەولی صەحیح ئەوەیە کەدروستە اجتهاد کردن بۆ پێغەمبەرﷺ ، وەکراویشەو رویداوە، چونکە خوایگەورە فەرمویەتی: بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە گیراوی جەنگی هەبێ-بەرەڵایان بکات- هەتا دەسەڵات و قورسایی خۆی لەو زەویەدا دەچەسپێنێ و

وعلى الاذن لمن ظهر نفاقهم في التخلف عن غزوة تبوك ولا يكون العتاب فيما صدر عن وحي فيكون عن اجتهاد وَ قِيلَ يمنع له لقدرته على اليقين بالتتلقي من الحوحي بأن ينظره والقادر على اليقين في الحكم لا يَجوزُ له الاجتهاد جزما ورد بأن انزال الوحي ليس في قدرته {وثالثها} الجواز والوقوع {في الآراء والحروب فقط} اي والمنع في غيرها جمعا بين الادلة السابقة {ولاصواب ان اجتهاده ﷺ لا يخطيء} تنزيها لمنصب النبوة عن الخطأ في الاجتهاد وَ قِيلَ قد يخطيء ولكن ينبه عليه سريعا لما تقدَّمَ في الآيتين ولبشاعة هذا القول عبر المصنِّف بالصواب[1]. {والأصَحُ أن الاجتهاد جائز في عصره} ﷺ وَ قِيلَ لا للقدرة على اليقين في الحكم بتلقيه منه[2].

---

کۆتایی بەشەڕ دێ. وەلەئایەتێکیتردا دەفەرموێ: خوا لێت بووراوە بۆچی مۆڵەتت پێدان، پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشت کراوە لەسەر هێشتنەوەی گیراوانی جەنگ بەهۆی وەرگرتنی قوربانیەوە،

(١) وەسەرزەنشتی کراوە لەسەر ئەوەی کە مۆڵەتی داوە بەکەسانێك کە دوڕوییەکەیان دیارە هۆی دواکەوتنەکەیان بووە لەغەزای تەبوك دا، گلەیش لەشتێ ناکرێ سەرچاوەی وەحی بێ کەوابوو سەرچاوەی ئەو سەرزەنشت لەسەرکراوە هەر دەبێ اجتهاد بێ، هەندێك وتوویانە: قەدەغەی لێکراوە اجتهاد بکا چونکە اجتهاد کردن گومانەوەئەم توانای ئەشکێ بەسەر بێگوماندا بەهۆی وەرگرتنی لەوەحیەوە، . واتە چاوەڕونی بکا خۆ کەسێ توانی هەبێ بەسەر یەقین دا لەبارەی حوکمەوە بێگومان بۆی نیە اجتهاد بکا، ئەم قیلە براوەتە دواوە کە دابەزینی وەحی لەتوانای پێغەمبەردا نیە، قەولی سێهەم دەڵێ: دروستەو رووی‌داوە بەڵام تەنها لەبارەی بابەتی جەنگ و ئەوانەی جێی راوو بۆچون و باسن، واتە لە غەیری ئەمانەدا بۆی نەبووە اجتهاد بکا، بەم شێوەیە بەڵگە پێشوەکانی هەردوولا کۆدەکرێنەوە بەکڕیەکتردا ناچن، قسەی راست ئەوەیە کە اجتهادی پێغەمبەر ﷺ بەغەڵەتا ناچێ، لەبەر ئەوەی پلەی پێغەمبرایەتی پاك رابگیرێ لەغەڵەت لە اجتهادیشدا، هەندێك وتویانە: کەم جارانێك غەڵەت دەکا، بەڵام زوو بەزویی ئاگادار دەکرێتەوە لەسەری، لەبەر ئەو دوو ئایەتەی پێشوو لەبەر ناشیرینی ئەم قیلە دانەر وتی: قسەی راست مانای وایە بەرامبەرەکەی درۆیە.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە اجتهاد لەسەردەمی پێغەمبەردا دروست بووە، هەندێك دەڵێن: دروست نەبووە، چونکە توانیویانە بە یەقین حوکمیان دەست دەکەوێ بەهۆی وەرگرتنی لە پێغەمبەرەوە،

واعترض بأنه لو كان عنده وحي في ذلك لبلغه للناس {وثالثها} جائز{باذنه صريحا قيل اوغير صريح} بأن سكت عمن سأل عنه اووقع منه فان لم يأذن فلا {ورابعها} جائز {للبعيد} عنه دون القريب لسهولة مراجعته[1].

{وخامسها} جائز {للولاة} حفظا لمنصبهم عن استنقاص الرعية لهم لو لم يجز لهم بأن يراجعوا النبيّ ﷺ فيما يقع لهم بخلاف غيرهم[2].

{و} الأصَحّ على الجواز {انه وقع} وَ قِيلَ لا {وثالثُها لم يقع للحاضر} في قطره ﷺ بخلاف غيره {ورابعها الوقف} عن القول بالوقوع وعدمه واستدل على الوقوع بأنه ﷺ حكم سعد بن معاذ في بني قريظة فقال تقتل مقاتلتهم وتسبى ذريتهم فقال ﷺ لقد حكمت فيهم بحكم الله رواه الشيخان وهو ظاهر في أن حكمه عن اجتهاد[3].

---

(١) ڕەخنە لەم قیلە گیراوە بەوەی کە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وەحی لە لابوایە بە خەڵکی ئەگەیاند،قەولی سێهەم دەڵێ: ئەگەر بەڕوونی مۆڵەت درابێ ئەوە دروستە، هەندێك ووتوویانە : یا خود بەمۆڵەتی ناڕاستەوخۆ بەم جۆرەیە کە یەکێك پرسیاری لێ کرد بێ وە پێغەمبەر بێدەنگ بووبێت لێی یاخود کردبێتی و بێدەنگ بوو بێت لێی ، بەڵام ئەگەر مۆڵەت نەدرابێ ئەوە دروست ینە، قەولی چوارەم دەڵێ: بۆ کەسێ دوور بێ دروستە نەك بۆ نزیك چونکە ئاسانبوە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ .

(٢) قەولی پێنجەم دەڵێ: بۆ سەرۆك وڵاتان دروست بووە، لەبەر پاراستنی پلەیان لەوەی کە خەڵك بەکەم سەیریان بکەن ئەگەر بۆیان دروست نەبێ،بەم شێوە بۆ هەموو شتێ دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەوەی کەڕوو دەدا، بەڵام غەیری سەرۆك وڵاتان وانیە.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە کەدروستە و رویشیداوە، هەندێك وتویانە: روی نەداوە، قەولی سێهەم دەڵێ: بۆ خەڵکی نزیك رووینەداوە لەدەوروبەری پێغەمبەردا بەڵام غەیری ئەوان وانیە، قەولی چوارەم: هەڵوێستەی دەکا نەئەڵێ: رویداوە نەئەڵێ: روینەداوە بەڵگەی هێناوەتە لەسەر رودانەکەی بەوەی پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی مەعاذی کرد بەحەکەم وداوەر لەهۆزی بەنی قورەیظەدا ، سەعدیش وتی: جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و وەچەکانیان بکرێنە دیل، پێغەمبەریش فەرمووی: سوێند بەخوا بێگومان بەحوکی خوا داوەریت کرد لەبارەیانەوە، بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە ، ئەوەش دیارە کە ئەو حوکمی سەعدە لەاجتهادەوە بووە لەپاڵ پێغەمبەریشدا بووە.

{مسئلة المصيب} من المختلفين {في العقليات واحد} وهو من صادف الحق فيه لتعينه في الواقع كحدوث العالم وثبوت الباري وصفاته وبعثة الرسل {ونافي الاسلام كله او بعضه كنا في بعثه محمد ﷺ {مخطيء آثمٌ كافر} لانه لم يصادف الحق {وقال الجاحظ والعنبري لا يأثمُ المجتهد} في العقليات المخطيء فيها للاجتهاد {قيل مطلقاً وقيلَ ان كان مسلما} فهو عندها مخطيء غير آثمٍ[1]. {وَ قِيلَ زاد العنبري على نفي الاثمَ {كل} من المجتهدين فيها {مصيب} وقد حكي الاجماع على خلاف قولهما قبل ظهورهما[2].

{اما المسئلة التي لا قاطع فيها} من مسائل الفه {فقال الشيخ} ابو الحسن الاشعري {والقاضي} ابو بكر الباقلاني {وابو يوسف ومحمد} صاحبا ابي حنفية {وابن سريج كل مجتهد} فيها {مصيب}[3].

---

(١) ئەمەشە بابەتێکە چەند کەسێك جیاوازیو کێشەیان هەبێت لەبارەی شتێکەوە کە کاروباری عەقڵی بێ ئەوە تەنها یەك کەسیان لەهەدەفی داوە، ئەوەیش ئەوەیانە کە حەقی پێکابێ، چونکە لەواقعدا حەق تاکەو دیارە، وەك دروستبوونی ئەم جیهانە ثابت بوونیخوا، ناردنی پێغەمبەران، ئەوەی کەنەفی ئیسلام دەکا هەمو یاخود هەندێکی ، وەك ئەو کەسەی نەفی بەپێغەمبەر ناردنی موحەممەدﷺ بکا، ئەوە غەڵەتی کردوە و گوناهباریشەو کافریشە، چونکە حەقی نەپێکاوە، جاحظ وعەنبەری وتوویانە: مجتهدێك لەکاروباری عەقڵیدا غەڵەتیا تێدا دەکا ئەوە گوناهبار نابێ لەبەر اجتهادەکەی ، هەندێك وتویانە ئیتر موسوڵمان بێ یان کافر هەندێکیتر وتویانە: کاتێ گوناهبار نابێ ئەگەر موسوڵمان بێ، بەلای ئەم دوو قیەوە غەڵەتی کردووە بەڵام گوناهبار نیە.

(٢) هەندێك وتوویانە: عەنبەری زیاد لەوەی وتویەتی: گوناهبار نین وتوشیەتی: هەریەکێ لەو مجتهدانە لەبولری عەقڵیدا حەق و هەدەفی پێکاوە-بەگوێرەی باوەڕی خۆی- پێش ئەوەی ئەم قەولەی حاحظ و عەنبەریە دەرکەوێ اجماع لەسەر پێچەوانەی ئەمان بووە -چونکە لەهەر سەردەمێکدا لەگەڵ کافراندا شەڕکراوە ئیتر مجتهد بوبێ یان نە-

(٣) بەڵام بابەتێك لەبابەتەکانی فقه کەبەڵگەی گومانبڕی تێدانەبێ، ئەوە ئەشعەری و باقلانی و ئەبویوسف و موحەممەد ئەم داونە هاوڕێو قوتابی ئەبوحەنیفە بوون ابن سریج وتویانە: هەموو مجتهدێك لەو بابەتەدا حەق و راستی پێکاوە.

ثُمَّ قال إلاَّ ولان حكم الله} فيها {تابع لظن المجتهد} فما ظنه فيها من الحكم فهو حكم الله في حقه وحق مقلده {وقال الثلاثة} الباقية {هناك ما} اي فيها شيء {لوحكم الله فيها {لكان به} اي بذلك الشيء[1]. {ومن ثم} اي من هنا وهو قولهم المذكور اي من اجل ذلك {قالوا} ايضا فيمن لم يصادف ذلك الشيء {أصاب اجتهاد الاحكما وابتداء لا انتهاء} فهو محطيء حكما وانتها {والصحيح وفاقا للجمهور ان المصيب} فيها {واحد ولله تعالى} فيها {حكم قبل الاجتهاد [2] قيل لا دليل عليه} بل هو كدفين يصادفه من شاء الله {والصحيح ان عليه امارة وانه} اي المجتهد {مكلف باصابته}اي الحكم لا مكانها وَ قِيلَ لا لغموضه {وان مخطئه لا يأثَمُ بل يؤجر} لبذله وسعه في طلبه وَ قِيلَ يأثَمُ لعدم اصابته المكلف بها[3].

(١) پاشان دوەمەكانی پێشەوە ئەشعەری وباقلانی وتویانە: حوكمی خوا لەو بابەتەدا شوێن كەوتوی گومانی ئەو مجتهدەیە ، ئەوەی لەوبابەتەدا وادەزانێ ئەوە حوكمەكەیەتی حوكمی خوایش لەبارەی ئەو مجتهدەو شوێنكەوتوانی هەر ئەو حوكمەیە، سیانەكانیتر وتویانە: لەوبابەتەدا حوكمێكی بێگومان هەیە بەلای خواوە ئەگەر خوا حوكی پیٚبكردایە لەو بابەتەدا حوكمەكە بەو حوكمە دیارەی لای خۆی دەبوو ، بەلاّم حوكمەكەی كردوەتە شوێن كەوتەی گومانی مجتهدەكەیە .

(٢) لەبەر ئەوە دوبارە ئەم سیانە لەبارەی ئەوەیانەوە كە حوكەكەی لای خوا نەپێكاوە وتویانە: لەڕووی اجتهادەوە پێكاویەتی بەلاّم لەڕووێ حوكمەكەوە نەیپێكاوە، وەلەڕووی سەرەتاییەوە پێكاویەتی بەلاّم لەڕوی كۆتاییەوە نەیپێكاوە، كەواوبوو ئەم مجتهدە لەڕووی حوكم و انتهائەوە غەڵەتە ، قەولی صەحیح و هەماهەنگ لەگەڵ رای جەماوەری زانایاندا ئەوەیە كە: ئەوەی لەو بابەتەدا كە حەق و راستی پێكاوە یەك كەسە و خوا خۆی حوكمی هەیە بۆ ئەو بابەتە پێش ئەوەی اجتهاد بكرێ ، ئەوەی اجتهادەكەی ئەو حوكمەی خوای پێكابێ ئەوە لەهەدەفی داوە.

(٣) هەندێك وتویانە: خوا وەك خۆی حوكمەكەی دیاریكردووە نیشانەشی لەسەر دانەناوە خەڵك بەو نیشانەیە بیدۆزنەوە ، بەڵكو وەكرو خەزێنەیەكی شاراوە وایە ئەوەی كەخوا بیەوێ دەیدۆزێتەوە، قەولیصەحیح ئەوەیە ئەوحوكمەی خوا نیشانەی لەسەر دانراوە ، مجتهد مكلفە بەدۆزینەوەی ئەو حوكمە چونكە ئەگونجێ بیدۆزێتەوە .هەندێك وتویانە: ناگونجێ بیدۆزێتەوە، چونكە تەم و مژاویە ئەوەش راستی ناپێكێ گوناهبار نابێ نەك گوناهبار نابێ بەڵكو پاداشتی دەدرێتەوە چونكە بەشوێن دۆزینەوەیدا هەموو توانای خۆی خەرج كردووە هەندێك ووتویانە: گوناهبار دەبێ،

{أما الجزئية التي فيها قاطع} من نص اوجماع واختلف فيها العدم الوقوف عليه {فالمصيب فيها واحد وفاقا} وهو من وافق ذلك القاطع [١] {وَ قِيلَ على الخلاف} فيما لا قاطع فيها وهو بعيد {ولا يأثَمُ المخطيء} فيها بناء على أن المصيب واحد {على الأصَحّ} لما تقدَّمَ ولقوة المقابل هنا عبر بالأصَحّ {ومتى قصر مجتهد} في اجتهاده {اثمَ وفاقا} لتركه الواجب عليه من بذله وسعه فيه[٢].

{مسئلة لا ينقض الحكم في الاجتهاديات} لا من الحاكم به ولا من غيره بان اختلف الاجتهاد {وفاقا} اذ لو جاز نقضه لجاز نقض النقض وهلم فتفوت مصلحة نصب الحاكم من فصل الخصومات[٣].

---

چونکه ئەوەی تەکلیف کراوە پێی و نەیپێکاوەو و نەیدۆزیوەتەوە .

(١) بەڵام شتێك کە بەڵگەی گومان بڕی تێدابێ ، ئیتر دەق بێ یاخود اجماع. بەڵام جیاوازی لەحوکمی ئەو شتەدا پەیدا بوو لەبەر ئەوەی بەڵگە بێگومانەکەیان نەدۆزیەوە، ئەوە کامەیان حەق و راستی پێکاوە هەر ئەو تاکەیان راستە بەڕای هەمووان، ئەویش ئەوەیانە کە لەگەڵ بەڵگە بێگومانەکەدا یەکی گرتۆتەوە.

(٢) هەندێك وتوویانە: لەسەر جیاوازی لەبابەتێکدا کەبەڵگەی بێگومانی تێدا نەبێ چۆن بوو ئەمیش وایە، ئەوەش زۆر لەڕاستیەوە دوورە ئەوەشیان غەڵەتی کردوە تیایدا گوناهبار نابێ، ئەم قسەش لەسەر ئەوە دروست ئەبێ کە ئەوەی حەق ئەپێکێ هەر یەکێکیانە ، لەسەرە قەولی ئەصەح لەبەر ئەوەی لەپێشەوە رابوورد، وەلەبەر ئەوەی قەولی بەرامبەر بەهێزە دانەر وتی: قەولی ئەصەح، مانای وایە بەرامبەرەکەی صەحیحە ، کاتێ مجتهد کورتگیری و شل گیری کرد لە اجتهادەکەیادا گوناهبار دەبێ بەڕای هەمووان، چونکە ئەو واجبەی کەبەخەرجدانی هەموو توانایەتی بەجێی نەهێناوە و وازی لێهێناوە .

(٣) ئەمەش بابەتێکە حوکمێك بە اجتهاد درابێ بەهیچ شێوەیەك ئەو حوکمە هەڵناوەشێنرێتەوە ، نەلەلایەن ئەو کەسەوە کەخۆی حوکمی پێکردوە نەلەلایەن غەیری ئەوەوە، هەڵوەشانەوەی حوکم بەوە دەبێ کە اجتهادەکەی ئێستای گۆڕابێ ، ئەمەش بەڕای هەموان وایە کەهەڵناوەشێتەوە، چونکە ئەگەر دروست بێت هەڵوەشاندنەوەی ئەوە دروستیش هەڵوەشاندنەوەی هەڵوەشاندنەکەیش وەهەروەها بڕۆ، ئەمەیش دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو بەرژەوەندیەی کەحاکم و دادوەری بۆ دانراوە ، کەبریتیە لەچارەسەرکردنی کێشەکان.

{فان خالف} الحكم {نصا او ظاهرا جليا ولوقياسا} وهو القياس الجلي نقض لمخالفته للدليل المذكور {او حكم} حاكم {بخلاف اجتهاده} بان قلد غيره نقض حكمه لمخالفته لاجتهاده وامتناع تقليده فيما اجتهاد فيه {او حكم} حاكم {بخلاف نص امامه غير مقلد غيره} من الائمة {حيث يجوز} لمقلد امام تقليد غيره بان لم يقلد في حكمه احد لاستقلاله فيه برايه[1] .

اوقلد فيه غير امامه حيثُ يمتنع تقليده وسياتي بيان ذلك {نقض} حكمه لمخالفته لنص امامه الذي هو في حقه لالتزامه تقليده كالدليل في حق المجتهد اما اذا قلد في حكمه غير امامه حيثُ يَجوزُ تقليده فلا ينقض حكمه لانه لعدالته انما حكم به لرجحانه عنده {ولو تزوج بغير ولي} باجتهاد منه يصححه {ثُمَّ تغير اجتهاده} الى بطلانه[2].

---

(١) كەوابوو ئەو حوكمەی کە موجتەهيد كردويەتی پێچەوانەی دەقێك ياخود ظاهيرێكی ئاشكرا بوو يا قياسی جەلی و ئاشكراش بێت ئەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە، چونكە پێچەوانەيە بۆ ئەو بەڵگەيەی باسكرا، ياخود ئەگەر حاكم و داوەری حوكمی بەپێچەوانەی اجتهادی خۆی، بەم شێوە رای غەيری خۆی بگرێتە ئەستۆی خۆی ئەوە حوكمەكەی هەڵدەوەشێنرێتەوە، چونكە پێچەوانەی اجتهادی خۆی حوكمی كردوە نابێ تەقليدی غەيری خۆی بكا لەشتێكدا خۆی اجتهادی تێداكردووە، ياخود ئەگەر حاكم و دادوەرێك حوكمێك بريار بدا پێچەوانەی دەقی ئيمامەكەی بێو تەقليدی غەيری ئيمامەكەی خۆيشی نەكردبێ، واتە لەو شوێنانەدابێ كەدروستە بۆكەسێ تەقليدی ئيمامێكیتری كردبێ تەقليدی غەيری ئەو ئيمامەيش بكا، بەم شێوەيە لەو حوكمەدا تەقليدی هيچ كەسێكی نەكردبێ، چونكە لەو حوكمەدا شوێنی رای سەربەخۆی خۆی كەوتووە.

(٢)ياخود تەقليدی غەيریئيمامەكەی خۆی كردوە لەشوێنێكدايە كەنابێتەقليدی بكا، ئەو شوێنانەش لە مەودوا باس دەكرێن، ئەو حوكمە هەڵدەوەشێنرێتەوە،چونكە پێچەوانەيە بۆ دەقی ئەوئيمامەی كە لەحەقی ئەمدا واجبە شوێن كەوتنی وەك مجتهد كە واجبيەتی شوێنیبەڵگەكەی بكەوێو حەقيەتی، بەڵام كاتێتەقليدی غەيری ئيمامەكەی بكا لەو جێيانەدا كە دروستە تەقليد بكرێ ئەوە حوكمەكە هەڵناوەشێنرێتەوە چونكە ئەم موجتەهيدە لەبەر ئەوەی عەدالەتی هەيە بێگومان تەنها لەبەر ئەوە ئەو حوكمەكەی كردووە چونكە بەلای ئەوەوە شتێك هەبووە تەرجيحی ئەمی داوە بەسەر ئەودا . ئەگەر كەسێ كچێكی مارەكرد بێئەوەی خاوەنی

{فالأصَحّ تحريمها عليه} لظنه الآن البطلان وَ قِيلَ لا يحرم اذا حكم بالصحة[1] {وكذا المقلد يتغير اجتهاد امامه} فيما ذكر فحكمه كحكمه[2] {ومن تغير اجتهاده} بعد الافتاء {أعلم المستفتي} بتغيره {ليكف} عن العمل ان لم يكن عمل {ولا ينقض معموله} ان عمل لان الجتهاد لا ينقض بالاجتهاد لما تقدَّمَ {ولا يضمن} المجتهد {المتلف} باتفائه باتلافه {ان تغير} اجتهاده الى عدم اتلافه {لا لقاطع} لانه معذور بخلاف ما اذ تغير لقاطع كالنص فإنَّهُ يضمنه لتقصيره[3].

{مسئلة : يَجوزُ ان يقال} من قبل الله تعالى {لنبي او عالم} على لسان نبي {احكم بما تشاء} في الوقائع من غير دليل {فهو صواب} اي موافق لحكمي بان يلهمه اياه اذ لامانع من جواز هذا القول[4].

---

کچەکە بزانێ، هەر بەهۆی اجتهادی خۆیەوە بەراستی زانیوە پاشان اجتهادەکەی گۆڕانکاری بەسەردادێ و بەبەتاڵی دەزانێ،

(١)ئەوە قەوڵیئەصەح وایە کەئەوژنەی لەسەر حەرام دەبێ،چونکە ئێستە وادەزانێکە بەتاڵە هەندێك وتویانە:حەرام نابێ کاتێك دادوەرێك حوکمیکردبێت بە دروست بوونی

(٢) هەروەها ئەستۆگرێك ئەگەر اجتهادی ئیمامەکەی گۆڕا لەو مارەبڕینە باسکرا ئەوە حوکمەکەی وەکو حوکمی ئەم وایە، و بەحەرامی بزانی ئەبێ ئەمیش بەحەرامی بزانێ.

(٣) کەسێ دوای ئەوەی فوتوایەکی داوە اجتهادەکەی گۆڕا ئەوە دەبێ ئەوەی داوای فتواکەی لێکردووە ئاگاداربکاتەوەکە اجتهادەکەی گۆڕاوە بۆ ئەوەی ئەویش واز لەکارکردن بە اجتهادەکەی بێنێ، ئەگەر کاری پێنەکردبێ، ئەگەر کاریشی پێکرابێ ئەوەی کراوە هەڵناوەشێنرێتەوە چونکە اجتهاد بەهۆی اجتهادەوە هەڵناوەشێنرێتەوە، لەبەر ئەوەی کە رابوورد مجتهدێك ئەگەر بەهۆی فتواکەیەوە شتێ بەزایەدرا ئەوە ئەو نابێتە زامنی، ئەگەر اجتهادەکەی گۆڕا بۆ ئەوەی کەنابێ ئەو شتە بەزایە بدرێ، نەك ئەگەر اجتهادەکەی گۆڕا بەهۆی بەڵگەیێکی بێگومانەوە ، ئەوە دەبێتە زامنی چونکە کورتگیری کردووە تیایدا، بەڵام لەودوا عوزری هەبووە ئەوەندەی زانیوە.

(٤) ئەمەش بابەتێکە لەلایەن خواوە دروستە بەپێغەمبەرێك یاخود زانایەك لەسەر زبانی پێغەمبەرێك بوترێ لەڕوداوەکاندا حوکم بکە بەوەی دەتەوێ بەبێ بەڵگە ئەووتراوە راستە، واتە ئەوە موافق و هەماهەنگە بۆ حوکمی من بەم شێوە خوا ئەوە بخاتە دڵیەوە ، چونکە هیچ رێگرێك نیە لەدروستی ئەم قەولە .

{ويكون} اي هذا القول {مدركا شرعيا ويسمى التفويض} لدلالته عليه {وتردد الشافعي} فيه {قيل في الجواز وَ قِيلَ في الوقوع} ونسب الى الجمهور فحصل من ذلك خلاف في الجواز وفي الوقوع على تقدير الجواز {وقال ابن السمعاني يَجوزُ للنبي دون العالم} لان رتبته لا تبلغ ان يقال له ذلك[١].

{ثُمَّ المختار} بعد جوازه كيف كان انه {لم يقع} وجزم بوقوعه موسى بن عمر ان من المعتزلة واسند الى حديث الصحيحين لو لا ان اشق على امتى لامرتهم بالسواك عند كل صلاة اي لأوجبته عليهم والى حديث مسلم يايها النّاس قد فرض عليكم الحج فحجوا فقال رجل اكل عام يارسول الله؟ فسكت حتى قالها ثلاثا فقال رسول الله ﷺ لو قلت نعم لوجبت ولما استطعتم والرجل هذا هو الاقرع بن حابس كما في رواية ابي داود وغيره. و أُجيبَ بان ذلك لا يدل على المدعي لجوزاِ ان يكون خير فيه اي خير في ايجاب السواك وعدمه وتكرير الحج وعدمه أو يكون ذلك المقول بوحي لا من تلقاء نفسه[٢].

---

(١) ئەم قەولە دەبێتە سەنەدێكی شەرعی ، ناودەبرێ بە تفويض دانەدەست ونكە دەلاڵەت لەسەری دەكا، شافعی تێیدا ڕاڕایە، هەندێ وتویانە: لەشتی وادا ڕاڕابووە، هەندێكیتر وتویانە ڕاڕابوە لەوەدا ئایا شتیوا ڕویداوە؟ ئەم ڕاڕای شافعیە لەڕودانیدا دراوەتە پاڵ جەماوەری زانایان ، لەبەر ئەوە ئەوە كێشەكە لەوەدا دروست بووە ئایا شتیوا دروستە، وەئایا شتیوا ڕویداوە وەئەگەر بڵێین شتی وابووە وادابنێین دروستە ، ابن السمعانی وتویەتی ئەوە بۆ پێغەمبەرﷺ دروستە نەك بۆ مەلا و زانا چونكە پلەی مەلا ناگاتە ئەوەی وەهای پێبوترێ.

(٢) پاشان قەولی هەڵبژاردە دوای ئەوە كە دروستە هەر جۆربێ شتی وا ڕوینەداوە، بەڵام موسای كوڕی عمران بێگومان بووە لەڕودانیدا، -ئەمە یەكێكە لەزانایانی معتزلە- پشت ئەستور بووەبەو فەرموودەی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتی ئەكەن و دەفەرموێ: ئەگەر باری سەخت و گرانم بەسەر ئۆمەتەكەمەوە دانەنایێ فەرمانم پێدەكردن بەسیواك كردن لەكاتی هەموو نوێژێكدا، (امر) لێرەدا بەواتای واجبم دەكرد لەسەریان وەپشتیش ئەبەستێ بەفەرموودەیەك موسلیم ڕیوایەتی دەكا و دەفەرموێ: خەڵكینە بێگومان حەج فەرز كراوە لەسەرتان، لەبەر ئەوە حەج بكەن، پیاوێك وتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەر؟ پێغەمبەریش بێدەنگ بوو ، تاسێ جار ئەم پیاوە ئەم پرسیارەی وتەوە ، پێغەمبەریش فەرموی: ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبووئێوەش نەتان ئەتوانی، ئەو پیاوەیش ئەقرەعی كوڕی حابیسە، وەك لەڕیوایەتی ابوداود و غەیری ئەریشدا هاتووە وەڵامی ئەو زانایە دراوەتەوە كە ئەوە

**{وفي تعليق الامر باختيار المأمور} نحو افعل كذا ان شئت اي فعله {تردد} قيل لا يجوز لما بين طلب الفعل والتخيير فيه من التنافي والظاهر الجواز والتخيير قرينة على أن الطلب غير جازم وقد روى البخاري انه ﷺ قال صلوا قبل المغرب قال في الثالثة لمن شاء اي ركعتين كما مر في رواية ابي داود(١).**

**{مسئلة التقليد اخذ القول} بان يعتقد {من غير معرفة دليله} فخرج اخذ غير القول من الفعل والتقرير عليه فليس بتقليد واخذ القول مع معرفة دليله فهو اجتهاد وافق اجتهاد القائل لان معرفة الدليل انما تكون للمجتهد لتوقفها على معرفة سلامته عن المعارض بناء على وجود البحث عنه وهي متوقفة على استقراء الادلة كلها ولا يقدر على ذلك إلاّ المجتهد(٢).**

---

دەلالەت ناکا لەسەر ئەو داواو مەبەستە، چونکە ئەگونجێ پێغەمبەر ﷺ لەوەدا تەخییر کرابێ، واتە لەواجب کردنی سیواك و واجب نەکردنیدا، وە لە دووبارەکردنەوەی حەج و دووبارە نەکردنەوەیدا، یاخود دەبێ ئەو وتەی پێغەمبەرﷺ بەهۆی وەحیەوە بوبێ نەك لەلایەن خودی خۆیەوە بوبێ.

(١) ئایا جێبەجێ کردنی فەرمانێك دروستە پەیوەند بکرێ بەئارەزوو ویستی فەرمان بەسەرکراوەکەدا، بۆ نموونە بوترێ ئەوە بکە ئەگەر ئارەزووت لێهەبێ واتە لەکردنەکەی، لەوەلامی شتی وەهادا تەرەددو رارایی هەیە هەندێك وتویانە: دروست نیە چونکە لەنێوان داواکردن و ئەنجام دانی کارێکداو سەرپشك کردنی لەکردنیدا دژایەتی هەیە، وادیارە دروستە سەرپشك کردنەکەی قەرینەیە لەسەر ئەوە ئەو داخوازیە بۆ جەزم نیە، بوخاری ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: پێش نوێژی مەغریب نوێژ بکەن تاسێجار ، لەسێهەمدا فەرموی: بۆ کەسێ ئارەزووی لێ هەیە ، واتە دوو رکات نوێژ بکەن، وەك رابوورد لەریوایەتەکەی ابوداود دا.

(٢) ئەمەش بابەتێکە تەقلید بریتیە لەوەی بڕوات هەبێ بەقسەی کەسێ بێئەوەی بەڵگەکەی بزانێ، بڕواکردن بەکرداری کەسێ و هەڵوێستی کەسێ تەقلیدکردنی پێناوترێ، وەبڕوا بونن بەقسەی کەسێ لەگەڵ زانینی بەڵگەی ئەویش چودەر ،چونکە ئەمەاجتهادە اجتهادێکە موافق وهەماهەنگە بۆ اجتهادێکیترچونکە بەڵگە ناسین و زانینی تەنها بۆ مجتهد دەبێ،چونکە ئەو زانینە دەوەستێ هەتادەزانێ کە ئەو بەڵگە رزگاری بووە لەدژوارو نەیارەوە، بۆیە وادەڵێم، چونکە واجب وپێویستە گەڕان وتوێژینەوە بکرێ لەبارەی نەیارەوە، ئەو رزگاربوونەش دەوەستێنرێ لەسەر پشکنین وخوێندنەوەی هەمو بەڵگەکان، خۆ جگە لەمجتهد کەسیتر توانای ئەوەی نیە.

{ويلزم غير المجتهد} عاميا كان او غيره اي يلزمه التقليد للمجتهد لقوله تعالى فاسئلوا اهل الذكر ا كنتم لا تعلمون {وَ قِيلَ بشرط تبين صحة اجتهاده} بأن يتبين مستنده ليسلم من لزوم اتباعه في الخطا الجائز عليه {ومنع الاستاذ} ابو اسحقَ الاسفرايني {التقليد في القواطع} فالعقائد وسياتي الخلاف فيها {وَ قِيلَ لا يقلد عالم وان لم يكن مجتهدا} لان له صلاحية اخذ الحكم من الدليل بخلاف العامي[1].

{اما ظان الحكم باجتهاده فيحرم عليه التقليد} لمخالفته به لوجوب اتباع اجتهاده {وكذا المجتهد} اي من هو بصفات الاجتهاد يحرم عليه التقليد فيما يقع له {عند الاكثر} لتمكنه من الاجتهاد فيه الذي هو اصل للتقليد ولا يَجوزُ العدول عن الاصل المكن الى بدله كما في الوضوء والتيمم وَ قِيلَ يَجوزُ له التقليد فيه لعدم علمه به الآن[2].

(١) تەقلید لەسەر غەیری موجتەهید پێویست دەبێ ئەگەر هەر نەخوێندەوار بێ، یاخود مجتهدی پلە دوو و پلەسێ بێ، واتە: مجتهدی (في المذهب و في الفتیا)، واجبە لەسەر یان تەقلیدی موجتەهیدێ بکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر شتێکتان نەزانی ئەوە لەئەهلی قورئان بپرسن، هەندێوتویانە: کاتێك ئەوە واجب دەبێ بەو مەرجەی کەدروستی اجتهادەکەی روون و نمایان بێ بۆ هەمو کەس بەم شێوەیە موستەنەدی اجتهادی دەرکەوێ و دیاربێ، بۆ ئەوەی رزگاری بێ لەوەی کە واجبە شوێن کەوتنیش لەغەڵەت کردنیشدا،کە دەبێ و ئەگونجێ غەڵەت بکا، مامۆستا أسفرایینی تەقلیدی قەدەغە کردووە لەگومان لێبراوەکاندل وەك عەقیدەو باوەڕ لەمەودوا دێ کە ئەوەش کێشەی تێدایە، هەندێك وتویانە: زانا تەقلید ناکا هەرچەند نەگەیشتوەتە پلەی مجتهد چونکە ئەشێ و ئەتوانی ڕاستەوخۆ حوکم لە بەڵگەکەوە وەرگرێ بەڵام عەوام وانیە.

(٢) بەڵام کەسێ بەاجتهادی خۆی گومان بەحوکمێ بەرێ ئەوە حەرامە لەسری تەقلید بکا، چونکە بەو تەقلیدەی کارێ دەکا پێچەوانەی ئەوەیە کەواجبە لەسەری کە بریتیە لەوەی دەبێ شوێن کەوتەی اجتهادی خۆیبێ،هەروەها مجتهدیش حەرامە لەسەری تەقلید، واتە کەسێ کەصیفەی مجتهدی تێدایە حەرامە لەسەری تەقلید بکات لەو شتانەیدا کەلێی ڕوو دەدەن ، بەلای زۆرترین ژمارەی زانایانەوەی چونکە توانای اجتهادی هەیە کە ئەصلێ و بنەڕەتە بۆ تەقلید، خۆ بێگومان دروست نیە لەئەصلێك کەتوانات هەبێ بەسەریدا لابدەی بۆ جێگرەکەی وەك لەدەستنوێژو تەیەمومدا وایە ، هەتا ئاو هەبێ دروست نیە پەنا بەریتە بەر تەیەمموم. هەندێکیش وتویانە:دروستە لەوئیشەیدا تەقلید بکا چونکە ئێستە عیلمی نیە بەحوکمی ئەوشتە.

{وثالثُها يَجوزُ للقاضي} لحاجته الى فصل الخصومة لمطلوب تجازه بخلاف غيره {ورابعها يَجوزُ تقليد الأعلم} منه لرجحانه عليه بخلاف المساوي والادني {وخامسها} يَجوزُ {عند ضيق الوقت} لما يسال عنه كالصلاة المؤقتة بخلاف ماذا لم يضق {وسادسها} يَجوزُ له {فيم يخصه} دون ما يفتي به غيره[1].

{مسئلة: اذا تكررت الواقعة} للمجتهد {وتجدد} له {ما يقتضي الرجوع} عما ظنه فيها اولا {ولم يكن ذا كر اللدليل الاول وجب} عليه {تجديد النظر} فيها {قطعا وكذا} يجب تجديده {ان لم يتجدد} ما يقتضي الرجوع ولم يكن ذاكرا للدليل {لان ان كان ذاكرا} له اذلو اخذ بالاول من غير نظر حيثُ لم يذكر الدليل كان آخذا بشيء من غير دليل يدل عليه والدليل الاول لعدم نذكره لاثقة ببقاء الظن منه بخلاف ماذا كان ذاكر اللدليل فلا يجب تجديد النظر في واحد من الصورتين اذ لاحاجة إليه[2] {وكذا العامي يستفتي} العالم في حادثة {ولو} كان العالم {مقلد ميت}[3]...

(١) قەولی سێهەم دەڵێ: دروستە تەقلیدی غەیری خۆی بکا، چونکە پێویستی بەچارەسەرکردنی کێشەکان هەیە و لێی داوادەکرێ زۆر جێبەجێیان بکا، بەڵام کەسێ وانەبێ بۆی دروست نیە، قەولی چوارەم دەڵێ: دروستە تەقلیدی لەخۆی زاناتر بکا، چونکە لەو پەسەندترە ، نەك هی کەسێ یەکسانی خۆی بێ یا لەخۆی‌نزمتر بێ. قەولی پێنجەم: دەڵێ: دروستە بۆی تەقلیدی غەیری خۆی بکا لەشتێکدا کەتایبەتە بەخۆیەوە نەك لەوەیدا فتوا بۆ غەیری خۆی بدا.

(٢) ئەمەش بابەتێکە کاتێ یەك روداو دووبارە بوویەوە بۆ موجتەهیدێك وئەوەشی بۆ پەیدابوویەوە گەڕانەوەی‌بخوازێ لەوەی بۆ جاری یەکەم گومانی پێی بردووە. وەبیری بەڵگەی یەکەمیشی نەبێ ئەوە بێگومان پێویستە سەرنج و رامانی تازەی تێدا بکاتەوە بائەوەشی بۆ تازە نەبو بێتەوە کە داخوازی گەڕانەوە بکا و بیری بەڵگەی یەکەمیشی نەبێ، بەڵام ئەگەر بیری بەڵگەی یەکەمی هەبێ ئەوە پێویست نیە رامانی تازە ، چونکە ئەگەر حوکم هەر بە یەکەمەکە بکا بێ سەرنج و تێرامان لەگەڵ ئەوەش وبیری بەڵگەی یەکەمیشی نەبێ ئەوە حوکم بەشتێ ئەکا کە هیچ بەڵگەیێکی نیە، دەلالەت بکا لەسەری ، بەڵگەی یەکەمیش لەبەر ئەوەی لەیادی نیە هیچ متمانەیەك نیە بەمانەوەی بێگومان لەبەڵگەی یەکەم، بەڵام ئەگەر بەڵگەی یەکەمی لەبیر بێ ئەوە جیایەو ئیتر واجب نیە سەرنج و تێرامان لەهیچ یەکێ لەو دوو نمونەیە، چونکە پێویستی پێی نیە. (٣) هەروەها عەوامیش ئەگەر داوای فتوای کرد لەزانایەك لەبارەی روداوێکەوە، با ئەو زانایەش لەئەستۆگرتەی قەولی مجتهدێکی مردوش بێ ..

بناء على جواز تقليد الميت وافتاء المقلد كما سيأتي {ثُمَّ تقع} له {تلك الحادثة هل يعيد السؤال} لمن افتاه اي حكمه حكم المجتهد في اعادة السؤال اذلو اخذ بجواب الاول من غير اعادة لكان آخذا بشيء من غير دليل وهو في حقه قول المفتي وقوله الاول لاثقة ببقائه عليه لاحتمال مخالفته له باطلاعه على ما يخالفه من دليل ان كان مجتهدا او نص لامامه ان كان مقلدا[1].

{مسئلة: يَجوزُ تقليد المفضول} من المجتهدين فيه {اقوال} احدها ورجحه ابن الحاجب يَجوزُ لوقوعه في زمن الصحابة وغيرهم مشتهرا متكررا من غير انكار[2] ثانيها لايَجوزُ لان اقوال المجتهدين في حق المقلد كالادلة في حق المجتهد فكما يجب الاخذ بالراجح من الادلة يجب الاخذ بالراجح من الاقوال والراجح منها قول الفاضل ويعرفه العامي بالتسامع وغيره[3].

---

(١) ئەم قسە گشتيە لەسەر ئەوە دروست بووە كە دروستە تەقليدى موجتەهديكى مردوو بكرێ و دروستيشە مقلد فتوا بدا، وەك لەمەودوا دێ پاشان ئەگەر خودى ئەم رووداوەى بۆ دوبارە بويەوە ئايا خودى پرسيارەكە دووبارە بكاتەوە بۆ ئەو زانايەى جارى يەكەم فتواى بۆ داوە، واتە حوكمى ئەمەش وەكوو حوكمى موجتەهيدەكە وايە لەدووبارەكردنەو تێرامانەكەى لەبەر ئەوە پێويستە پرسيارەكەى دوبارە بكاتەوە، چونكە ئەگەر حوكم هەر بەوەڵامى يەكەم بكا بێ‌ئەوەى پرسيارەكە دووبارە بكاتەوە ئەوە لەخۆيەوە حوكمى بەشتێك كردووە بێ‌بەڵگە ، بەڵگەى عەواميش قسەى موفتيەكەيە، قسەى يەكەميشى متمانە نيە ئەو زانايەى لەسەر مابێتەوە ، چونكە هەڵدەگرێ ئێستە راى وانەبێ، چونكە بەڵگەيێكى‌ترى دەست كەوتووە كە پێچەوانەى بۆچوونى يەكەميەتى ، ئەگەر مجتهدبێ ياخود دەقێكى‌ترى ئيمامەكەى دۆزيبێتەوە وەك فتواى يەكەم نەبێ، ئەگەر مقلد و شوێن كەوتووبێ.

(٢) ئەمەش بابەتێكە ئايا دروستە لەناو چەند مجتهدێكدا تەقليدى چەند مجتهدێكى بچوك بكرێ؟ ئەوە چەند قەولێكى تێدايە. يەكەميان كە ابن الحاجب تەرجيحى‌داوە دەڵێ: دروستە، چونكە لەسەردەمى صەحابەدا رووى‌داوە لەغەيرى ئەوانيشدا، بەناوبانگيش بووە چەند جارێكيش دووبارە بوەتەوە بێ ئەوەى كەس نارەزايى دەربرێ.

(٣) قەولى دووەم دەڵێ: دروست نيە چونكە قەولى مجتهەدكان بۆ مقلدەكان وەك بەڵگە وان بۆ مجتهدەكان، چۆن واجبە بۆ مجتهد دەست بەبەڵگەى راجحەوە بگرێ واجبيشە دەست بگرين بەقەولى راجحەوە، راجحيش قەولى مجتهدى گەورەيە، عەوام

{ثالثُها المختار يَجوزُ لمعتقده فاضلا} غيره {او مساويا} له بخلاف من اعتقده مفضولا كالواقع جمعا بين الدليلين المذكورين بهذا التفصيل[1]{ومن ثم}اي من هنا وهو هذا التفصيل المختار اي من اجل ذلك نقول {لم يجب البحث عن الارجح} من المجتهدين لعدم تعينه بخلاف من منع مطلقاً[2] {من اعتقد} اي العامي {رجحان واحد منهم تعين} لان يقلده وان كان مرجحا في الوقع عملا باعتقاده المبني عليه {والراجح علماً فوق الراجح ورعا في الأصَحّ ي} لان لزيادة العلم تأثيرا في الاجتهاد بخلاف زيادة الورع وَ قيلَ بالعكس لان لزيادة الورع تأثيرا في التثبت في الاجتهاد وغيره بخلاف زيادة العلم ويحتمل التساوي لان لِكُلّ مرجحا وهذه المسئلة مبنية على وجوب البحث عن الارجح المبني على امتناع تقليد المفضول[3].

گەورەیی مجتهدی بهۆی لەیەك بیستنیەوە دەبێ، لەیەكتری فلاَنەكەس گەورەی مجتهدەكانەو شتری تریش ،

(١) قەولی سێهەم كەهەڵبژاردەیە دەڵێ: دروستە تقلیدی مجتهدی بچوك بكا ئەگەر بڕوای خۆی وابزانێ ئەمە لە هەرهەموویا گەورەترە ، یاخود یەكسانن ، بەلاَم كەسێ وابزانێ ئەمە بچوكەو هەر تقلیدی دەكا ئەوە نابێ، هەروەك واقع بیر دەكاتەوە بۆیە ئەم قەولەیان هەڵبژاردەیە، چونكە بەم شێوە درێژەپێدانە هەردوو بەڵگەی ناوبراومان كۆكردۆتەوەو رێكخستووە،

(٢) لەبەرە ئەوەی ئەو كەسە بەبڕوای خۆی وادەزانێ گەورەیە ئێمە دەڵێین: پێویست نیە پشكنین و توێژینەوە بۆ ئەوەی قەولی ئەرجەح بدۆزینەوە لەناو مجتەهیدەكاندا، واجب نەكراوە هەر دەبێ تەقلیدی ئەرجەح بكرێ، بەلاَم كەسێ وابزانێ تەقلیدی ئەرجەح واجبە ئەوە دەبێ بگەڕێ تا بزانێ كامەیان گەورەیەو یەكسانن.

(٣) جا ئەگەر عەوامێك بڕوای وابێ قەولی یەكێك لەو مجتهدانە راجح ترە ، ئەوە دیاری دەكرێ بۆ ئەوەی تەقلیدی بكاو شوێنی بكەوێ، هەرچەنتد لەواقع دا مەرجوح بێ، چەنكە كار بەو باوەڕەی دەكرێ كە كردار رەنگدانەوەی ئەوە ، كەسێ كە عیلمی‌بالاَ دەست بێ لە زۆور كەسێكەوە حسێب دەكرێ كە لەوەرعدا بالاَدەست بێ لەقەلی ئەصەحدا ، چونكە عیلمی زۆر لە اجتهاد دا رۆڵ دەبینێ ، بەلاَم وەرعی زۆر وانیە ، هەندێك بەپێچەوانەوە وتویانە: چونكە كەسێك زیادە وەرعی هەبێ بۆ اجتهادو غەیری اجتهادیش زیاتر هەولی كارمەحكەمی دەدا،بەلاَم زیادە عیلم وانیە هەڵیش دەگرێ هەردوكیان یەكسان بن ، هیچ كامیان تەرجیح نەدرێ بەسەر ئەویتردا، چونكە

{ويَجوزُ تقليد الميت} لبقاء قوله كما قال الشافعي المذاهب لا تموت بموت اربابها {خلافاً للامام} الرَّازي في منعه قال لانه لا بقاء لقول الميت بدليل انعقاد الاجماع بعد موت المخالف قال وتصنيف الكتب في المذاهب مع موت اربابها لاستفادة طريق الاجتهاد من تصرفهم في الحوادث وكيفة بناء بعضها على بعض ولمعرفة المتفق عليه وم امختلف فيه وعورض بحجة الاجماع بعد موتت المجمعين {وثالثها} يَجوزُ {ان فقد الحي} لحاجة بخلاف ما اذا لم يفقد[1]{ورابعها قال} الصفي {الهندي} يَجوزُ تقليده فيما نقل عنه {ان تقله عنه مجتهد في مذهبه} لانه لمعرفته مداركه يميز بين ما استمر عليه وما لم يستمر عليه فلا ينقل لمن يقلده إلاّ ما استمر عليه بخلاف غيره[2].

---

هەریەك مرجحێكی هەیە، ئەم مەسەلە لەسەر واجب بوونی گەڕانی بەشوێن ئەرجەحدا دروست بووە، كە ئەویش لەسەر ئەوەی كە نابێ تەقلیدی بچوك بكرێ هەتا مجتهدی فاضل و گەورە دەست بدا.

(١) دروستە شوێن كەوتن و تەقلیدی مجتهدێكی مردوو، چونكە كە خۆی مردووە قسەكانی ماون، وەك شافعی وتویوتی مەزهەب و بۆچونەكانی نامرن بەهۆی مردنی خاوەنەكانیانەوە بەلاّم پێشەوا رازی بەپێچەوانەوەیەتی و دەڵێ: نابێ تەقلیدی مردوو ، رازی وتویەتی : چونكە حوكمی مانەوەی نیە قسەی مردوو بەبەڵگەی دامەزراندنی ئیجماع دوای مردنی ئەو مجتهدەی كەبەرامبەری هەموان وەستا بوو، هەم دەڵێ: دانانی ئەم هەموو كتێبە لەهەموو مەزهەبەكاندا لەگەڵ ئەوەش خاوەنەكانیان مردون بۆ ئەوەیە سودیان لێوەربگیرێ و شارەزایی رێی ئیجتیهاد بكرێ كەلە روداوەكاندا چۆن كاریان كردوەو چۆن هەندێ قاعیدە لەسەر هەندێكیتر دروست بووە، وەبۆ ئەوەیە ئەو شتانە بزانرێن كەڕای هەموانی لەسەرە جیابكرێنەوە لەوانەی كە كێشەیان تێدایە ، بەلاّم رازی رەخنەی لێگیراوە نەیاری كراوە بەوەی كە: اجماع دوای ئەوەش كە ئەوانەی كردویانە هەر بەحوججەو بەڵگە دەمێنێتەوە ، سیهەمیان دەڵێ: دروستە تەقلیدی مردوو بكرێ ئەگەر مجتهدی زیندو دەست نەكەوێ چونكە خەڵك پێویستی پێی هەیە، بەلاّم ئەگەر زیندو دەست كەوێ دروست نیە تەقلیدی مردوو .

(٢) چوارەمیان : صەفی هیندی وتویەتی: دروستە تەقلیدی مجتهدی مردوو بكرێلەوەدا كەلێی نەقڵ دەكرێ بەو مەرجەی ئەوەی لێی نەقڵ دەكا مجتهدی مەزهەبەكەی بێ چونكە ئەمە عیللەتی بۆچونەكانی ئیمامەكەی دەزانێ وئەوەی لەسەری بەردەوام بووە و ئەوەی لەسەری بەردەوام نەبووە جیادەكاتەوەو دەیانناسێ لەبەر ئەوە جگە لەوەی ئیمامەكە بەردەوام بووە لەسەری ئەم نەقڵی شتیتر ناكا بۆ

{ويَجوزُ استفتاء من عرف بالاهلية} للافتاء {او ظن} اهلا له {باشتهاره بالعلم والعدالة} هذا راجع الى الاول {وانتصابه ولاناس مستفتون} له هذا راجع الى الثاني {ولو} كان من ذكر {قاضيا} فإنَّهُ يَجوزُ افتاؤه كغيره[1].

{وَ قِيلَ لا يفتي قاض في المعاملات} للاستناء بقضائه فيها عن الاتفاء وعن القاضي شريح انا اقضي ولا افتى {لا المجهول} علما او عدالة فلا يَجوزُ استفتاؤه لان الاصل عدمهما {والأصَحُّ وجوب البحث عن علمه} بان يسأل النّاس عنه وَ قِيلَ يكفى استفاضته بينهم {والإكتفاء بظاهر العدالة} وَ قِيلَ لا بد من البحث عنها {و}الإكتفاء {بخبر الواحد} عن علمه وعدالته بناء على البحث عنهما وَ قِيلَ لا بد من اثنين[2]

{وللعامي سؤاله} اي العالم {عن ماخذه} فيما افتاه به[3].

---

شوێن کەواتوانی ئیمامەکەی ، بەڵام ئەگەر مجتهدی مەزهەبی ئیمامەکە نەبێ لەوانەیە هەموو شتێ نەقڵ بکا.

(١) دروستە داوای فوتوا بکرێ لەکەسێ کە ناسراو بێ بەوەی کە ئەهلی فوتوایە. یاخود گومان برابێ کە ئەهلی فتوایە، ناسراو بەهۆی بەناوبانگیەوە بەوەی کە ئەمە پیاوێکی زاناو دادپەروەرە ئەمە بۆ یەکەمیان دەگەڕێتەوە، گومانەکەش بەهۆی دانانی بوبێ بەهۆی دانانی بۆ کاروباری فوتوا وەخەڵکیش داوای فوتوای لێبکەن، ئەمەش بۆ گومانەکە واتە دوەمەکە دەگەڕێتەوە، بائەوەی کەباس دەکرێ قازیش بێ چونکە قازیش وەك غەیری خۆی بۆی رەوایە فوتوا بدات.

(٢) هەندێ وتویانە قازی لەمامەڵەو کاروباری رۆژانەی خەڵکدا نابێ فوتوا بدا، چونکە بەهۆی داوەریەکەوە پێویست بەفوتوا دان ناکات، لە قازی شورەیحەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: من داوەری دەکەم و فوتواش دەدەم، بەلام لەڕووی عبلم و عەدالەوەتەوە نەناسرابێ دروست نیە داوای فوتوای لێبکرێ، چونکە ئەهلی ئەوەیە ئەو دوو صیفەتە نەبن، قەولی ئەصەح ئەوەیە واجبە توێژینەوە بکرێ لەبارەی عیلمیەوە ، بەم شێوە پرسیار لەخەڵك بکا ، ئەم پیاوە زانایە یان نە، هەندێك وتویانە: هەرئەوەندە لەناو خەڵکدا بەناوبانگ بێ کە پیاوێکی زانایە و عادڵە بێ بەسە، هەندێك وتوویانە: پێویستە توێژینەوە بکرێ لەبارەی عەدالەتیەوە یەك کەس بەسە بڵێ: ئەمە زانایەو عادڵە بەسە، ئەمەیش کاتێ بوترێ پشکنینی لەبارەی عەدالەتیەوە واجبە، هەندێك وتویانە: دەبێ دوو کەس گەواهی بدەن.

(٣) عەوام بۆی هەیە پرسیار لەزانا بکا لەکوێ و لەچی فوتواکەی وەرگرتووە؟ وسەرچاوەکەی چیە؟

{استرشادا} اي طلبا لارشاد نفسه بأن تذعن لقبول ببيان المأخذ لاتعنتا {ثُمَّ عليه} اي العالم {بيانه} اي المأخذ لسائله المذكور تحصيلا لارشاده {ان لم يكن خفيا} عليه فان كان بحيث يقصر فهمه عنه فلا يبينه له صونا لنفسه عن التعب فيما لا يفيد ويعتذر له بخفاء المدرك عليه[1].

{مسئلة: يَجوزُ للقادر على التفريع والترجيح وان لم يكن مجتهدا} اي والحال انه غير متصف بصفات المجتهد {الاتفاء بمذهب مجتهد اطلع على مأخذه واعتقده} وهذا كما صرح به الآمدي مجتهد المذهب لانطباق تعريفه لاسابق عليه فيَجوزُ له الافتاء بمذهب امامه مطلقاً لوقوع ذلك في الاعصار تكررا شائعا غير انكار بخلاف غيره فقد انكر عليه وَ قيلَ لا يَجوزُ له لانتفاء وصف الاجتهاد عنه وانما {يَجوزُ الافتاء للمجتهد ولا نسلم وقوعه من غيره في الاعصار المتقدمة[2].

---

(١) ئەمەش بۆ ئەوەیە رێنمایی نەفسی بکرێ فوتواکە بەراست بزانێ و باوەڕی پـێی هەبێ بەهۆی باوەڕکردنی بەسەرچاوەکەی و جێوەرگرتنەکەی نەك پرسیارەکەی لەبەر کەللەشەقی ئەم و ئەزیەت دانی ئەو بێ، پاشان پێویستە لەسەر زانا کەدەرخستنی ئەو جێیە کە ئەم فوتوایەی لێوەرگرتووە ، بۆ پرسیارکەرەکەی روون بکاتەوە ، بۆ ئەوەی رێنمایی پەیداکردنێك بێ بۆی ، ئەمەش کاتێ واجبە کە ئەو جێیە زۆر شاراوەنەبێ لەسەر پرسیارکەرەکە، بەڵام ئەگەر شاراوەبێ و نتوانێ لێی حاڵی بێ ئەوە بۆی بەیان ئەکا، یەکەم بۆ ئەوەی لەشتی بێسوددا خۆی ماندو نەکات دووەم عوزری بۆ بهێنێتەوە، کە بەئاسان زیهنی پێی ناگاو سەرچاوەی زۆر شاراوەیە لەسەری.

(٢) ئەمەش بابەتێکە: دروستە بۆکەسێك توانایلق و پۆ لەقەولێك بکاتەوەو نیوانی تەرجیحی یەکێك لەدوو قەولی امامێك بدا بامجتهدیش نەبێ ، واتە: واتە صیفەتەکانی مجتهدی تێدانەبێ ئەمە بۆی دروستە بەمەزهەبێك فوتوا بدات بەمەرجێك زاڵبوبێت و روانیبێتی بەسەر سەرچاوەو جێوەرگرتنی ئەو فوتوا و باوەڕیشی پێی هەبێ ئەمە وەك ئامێدی بەڕوونیوتویەتی: مجتهدی نێو مەزهەبە چونکە ئەو پێناسەی پێشەوە دەبڕێ بەسەریدا، کەوابوو دروستە بۆی فوتوا دان بەمەزهەبی ئیمامەکەی ئیتر بڕوای بەسەرچاوەکەی هەبێ یان نە، چونکە ئەوە لەهەمو سەردەمەکاندا هەبووەو چەندەها جار و شتێکی بڵاویش بووە، بێ ئەوەی خەڵك روبەڕووی بوبنەوە، بەڵام کەسێ ئەو توانایەی نەبووبێ خەڵك روبەڕووی بونەتەوە، هەندێك وتویانە: بۆ دروست نیە فوتوا بدات چونکە صیفەتتی ئیجتهادی تێدا فەوتاوە، چونکە فوتوادان تەنها بۆ مجتهد

{وثالثها} يَجوزُ له {عندعدم المجتهد} للحاجة إليه بخلاف ما اذا وجد المجتهد {ورابعها} يَجوزُ للمقلد الافتاء {وان لم يكن قادرا} على التفريع والترجيح {لانه ناقل} لما يفتي به عن امامه وان لم يصرح بنقله عنه وهذا الواقع في الاعصار المتأخرة[1].

{ويَجوزُ خلو الزمان عن مجتهد} اي لا يبقى فيه مجتهد {خلافاً للحنابلة} في منعهم الخلوعنه {مطلقا ولا بن دقيق العيد} في منعه الخلو عنه {مالم يتداع الزمان بزلزل القواعد} فان تداعي بأن اتت اشراط الساعة الكبرى كطلوع الشمس من مغربها وغير ذلك جاز الخلو عنه[2]. {والمختار} بعد جوازه انه {لم يثبت وقوعه} وَ قيلَ يقع دليل عدم الوقوع حديث الصحيحين بطرق لاتزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق حتى يأتي امر الله اي الساعة كما صرح بها في بعض الطرق قال البخاري وهم اهل العلم اي لا بتداء الحديث في بعض الطرق بقوله من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين[3].

---

دروستە و نایشیسەلمێنین کە لەهەموو سەردەمە پێشوەکاندا شتیوا رویداوە،

(١) قەولی سێهەم دەڵێ: دروستە بۆی فوتوا بدات لەکاتی نەبوونی مجتهددا، چونکە خەڵ پێویستی پیی هەیە، بەڵام ئەگەر مجتهد هەبێ رەوا نیە بۆی ، قەولی چوارەم دەڵێ: مقلد دروستە بۆی فوتوا بدات هەرچەند توانای لق و پۆ تەرجیحدانی نەبێ. چونکە ئەم بەم فوتوا دانەی نەقڵی قسەی ئیمامەکەی دەکا هەرچەندە بەڕوونی ناڵێ ئەمە هی ئەوە ، ئەمەشە هەیە لەم سەردەمە دواییانەدا.

(٢) دروستە و دەگونجێ زەمانیك هەبێ مجتهدی تێدانەبێ، بەڵام زانایانی پەیڕەوی حەنبەلی دەڵێن: نابێ زەمانێك هەبێ مجتهدی تێدانەبێ، چ سەردەم هەمو خراپ بووبێ یان نە، بەڵام ابن دقیق العید دەڵێ: نابێسەردەم خاڵی بێ لەمجتهد هەتا وردە وردە خەڵك واز لەشەرعی خوا دەهێنن و رێساکانی شەرع و بوونەوەر لەرزە دەیانگرێ و لەیەك جیادەبنەوە ، جا کاتێ رێساکانی شەرع و بوونەوە، لەیەك کرانەوە، بەم شێوەیە مەرجەکانی کاتە گەورەکە هاتن، وەك هەڵهاتنی رۆژ لەرۆژئاواوەو چەندەها شتیتر ئا لەو کاتەدا ئەگونجێ مجتهد نەبێ.

(٣) قەولی هەڵبژاردە دوای ئەوەی وتمان دروستە سەردەمێك هەبێ و مجتهدی تێدا نەبێنەوەیە کە سابت نەبووە سەرەدەمی وابوبێ کە مجتهدی تێدا نەبووبێ، هەندێك وتویانە رووی داوە بەڵگەی رودانەکەشی ئەو فەرموودەیە کە بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەکەن و دەفەرموێ: کۆمەڵێك لە ئومەتی من هەر دیارن و لەسەر هەق دەکەنەوە هەتا فەرمانی خوا دێ لەسەر هەڵسانی قیامەت، چونکە هەندێ ریوایەت هەر قیامەتیان وتووە، بوخاری فەرمویەتی: ئەو کۆمەڵە خاوەنی عیلمە شەرعیەکانن،

ويدل للوقوع حديث الصحيحين ايضا ان الله لا يقبض العلم انزاعا ينترعه من العباد ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى اذا لم يبق عالما اتخذ الناس رؤساء جهالا فسئلوا فأتوا بغير علم فضلوا وأضلوا هذا لفظ البخاري وفي مسلم حديث ان بين يدي الساعة اياما يرفع فيها العلم ويترك فيها الجهل ونجوه حديث البخاري ان من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل والمراد برفع العلم قبض أهله ولمعارضة هذه الاحاديث للاول قال المصنف لم يثبت وقوعه دون لا يقع ويمكن رد الاول اليها بان يراد بالساعة ماقرب منها[1]. {واذا عمل العامي بقول مجتهد} في حادثة {فليس له الرجوع عنه} الى غيره في مثلها لانه قد التزم ذلك القول بالعمل به بخلاف ماذا لم يعمل به[2].

---

واتە بۆیە وادەڵێم لەهەندێ ریوایەتدا سەرەتای فەرموودەکە بەم شێوەیە دەفەرموێ: کەسێ خوا ویستی چاکەی پێهەبێ ئەوە ووردبین و شەرع زانی دەکا،

(١) ئەوەش کە دەلالەت دەکا لەسەر ئەوەی کەسەردەمێك بووە مجتهدی تێدا نەبووبێ ئەو فەرموودەیە کەبوخاریو موسلیم ریوایەتی دەکەن دووبارەو دەفەرموێ: خوای گەروە کە عیلم وەردەگرێتەوە بەو شێوە نیە کە لەبەندە زاناکانی دارنێ بەلام بەگیانکێشانی زاناکان عیلم وەردەگرێتەوە، تا وای لێدێ یەك زانا ناهێلێتەوە، کاتێ کەوابوو ئیتر خەڵك سەرۆکی نەفام دیاری دەکەن بۆ خۆیان ، ئەمجار پرسیاریان لێدەکرێ ئەوانیش بێئەوەی عیلمیان هەبێ فوتوا دەدەن خۆیان گومرا دەبن و خەڵکیش گومرا دەکەن . بەم شێوەیە لەفظەکەی بوخاری، لەموسلیمدا فەرموودەیەك هەیە دەفەرموێ: لەنێوان هەردوو دەستی بەرپابوونی قیامەت دا چەند رۆژانێك هەن عیلمیان تێدا وەردەگیرێ و جەهل و نەزانییان تێدا بەردەکرێ، فەرموودەکەی بوخاریش وەك ئەمە دەفەرموێ: یەکێك لەمەرجەکانی بەرپابوونی قیامەت ئەوەیە کە عیلم وەردەگرینۆ جەهل و نەزانین جێگیر دەبێ، مەبەست بەوەرگرتنەوەی عیلم مردنی زاناکانە، لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودانە دژایەتی فەرموودەی یەکەم دەکەن دانەر وتی: روداوی سەردەمی وەها نەسەلمێنراوە نەك رووینەداوە ، ئەشگونجێ فەرموودەی یەکەم بگەرێنینەوە بۆلای ئەمان و بەم شێوەی مانای بکەین و بلێین: مەبەست بەووشەی (الساعة) ئەو سەردەمەیە کە نزیکە لەبەرپابوونی قیامەتەوە .

(٢) کاتێك عەوامێك کاری کرد بەقەولی مجتهدێك لەروداوێکدا، ئەوە ئیتر بۆی نیە لەوە پەشیمان بێتەوەو بروا بۆلای مجتهدێکیتر لەنموونەی ئەو رووداوە چونکە ئەو قەولەی لەئەستۆی خۆی گرتوە کاری پێبکا،بەلام ئەگەر کاری پێنەکردبێ بۆیهەیە.

{وَ قِيلَ يلزمه العمل} به {بمجرد الافتاء} فليس له الرجوع الى غيره فيه {وَ قِيلَ } يلزمه العمل به {بالشروع في العمل} به بخلاف ماذا لم يشرع[1]. {وَ قِيلَ } يلزمه العمل به {ان التزمه} بخلاف ماذا لم يلتزمه {وقال السمعاني} يلزمه لاعلم به {ان وقع في نفسه صحته} والافلا {وقال ابن الصلاح} يلزمه العمل به {ان لم يوجد مفت آخر فان وجد تخير بينهما والأصَحُّ جوازه} اي جواز الرجوع الى غيره {فيحكم آخر} وَ قِيلَ لا يَجوزُ لانه بسؤال المجتهد والعمل بقوله المزم مذهبه[2].

{و} الأصَحّ {انه يجب} على العامي وغيره ممن لم يبلغ رتبة الاجتهاد {التزام مذهب معين} من مذاهب المجتهدين {يعتقده ارجح} من غيره {او مساويا} له وان كان في نفس الامر مرجوحا علىالمختار المتقدم{ثم} في المساوي {ينبغي السعي في اعتقادد ارجح} ليتجه اختياره علىغيره[3].

(١) هەندێك وتويانە: واجبە لەسەری كاری پێبكا هەربەوەی فوتوای بۆ دەدرێ ئیتر بۆی نیە بگەڕێتەوە بۆ لای مجتهدێكیتر لەو ڕووداوەدا، هەندێك وتويانە: واجبە كاری پێبكا ئەگەر دەستیكرد بەجێبەجێ كردنی ئەو فوتوايە بەڵام ئەگەر دەستی پێنەكردبێ واجب نیە لەسەری.

(٢) هەندێك وتويانە: واجبە لەسەری كاری پێبكا ئەگەر لەئەستۆی خۆی گرتبێ بەڵام ئەگەر لەئەستۆی خۆی نەگتبێ واجب نیە لەسەری ، سەمعانی وتويەتی: واجبە كاری پێبكا ئەگەر دروستی ئەو فوتوايە لەدڵیدا چەقیبێ، ئەگەر لەناخی دڵیەوە بەڕاستی نەزانێ واجب نیە لەسەری ، ابن الصلاح وتويەتی: واجبە لەسەری كاری پێ بكا ئەگەر موفتیەكیتری دەست نەكەوێ، ئەگەر دەستی كەوت سەرپشك دەكرێ لەنێوان هەردوكياندا. قەولی ئەصەح ئەوەیە دروستە بگەڕێتەوە بەرەوە مجتهدێكیتر بڕوا لەحوكمی یەكێكیتردا - ژنی یەكەمی لەسەر قەولی شافعی مارەبڕی دووەمی لەسەر حەنەفی- هەندێك وتويانە دروست نیە ، چونكە مادام پرسیاری لەو مجتهدە كردووە و كاری بەقەولی كردووە ئیتر واجب بووە دەست بگرێ بەمەزهەبیەوە .

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە كە واجبە لەسەر عەوام و غەیری عەوام لەوانەی بەپلەی ئیجتهاد نەگەیشتبێ دەبێ لەئەستۆی خۆی بگرێ مەزهەب و پەیڕەوێكی دیاریكراو لەمەزهەبی موجتەهیدەكان، ئیتر بڕوای وابێ لەوان راجیح ترە یاخود یەكسانە بۆیان هەرچەندە لەواقعیشدا مەرجوحیش بێ لەسەر قەولە هەڵبژاردەكەی پێشەوە،پاشان ئەگەر بەیەكسانی بزانێ بۆ ئەوانیتر دەبێ كۆشش بكا لەبڕوای خۆیدا بۆ راجیحەكەیان ، بۆ ئەوەی ئەوەی هەڵیبژاردوە بەڵگەدارو قەبوڵ بێ.

{ثُمَّ في خروجه عنه} اقوال احدها لا يَجوزُ لانه التزمه وان لم يجب التزامه ثانيها يَجوزُ والتزام ما لا يلزم غيرملزم {ثالثُها لايَجوزُ في بعض المسائل} ويجوز في بعض توسطا بين القولين[1] والجواز في غير ما عمل به اخذا مما تقدَّمَ في عمل غير الملتزم فإنَّهُ اذا لم يجزله لارجوع قال ابن الحاجب كالآمدى اتفاقاً فالملتزم اولى بذلك وقد حكَيَاة فيه الجواز فيقيد بما قُلناه وَ قيلَ الايجب عليه التزام مذهب معين فله ان يأخذ فيما يَقع له بهذا المذهب تارة وبغيره اخرى وهكذا[2].

{و} الأصَحّ {انه يمتنع تتبع الرخص} في المذاهب بان ياخذ من كل منها ماهو الأهون فيما يقع من المسائل {وخالف ابو اسحق المروزي} فجوز ذلك[3].

---

(١) پاشان لەبارەی دەرچونیەوە لەمەزهەبێکەوە بۆ مەزهەبێکی‌تر چەند قەولێکی تێدایە:

-دەڵێ: دروست نیە دەرچوون چونکە خۆی لەسەر خۆی واجب کردووە، هەرچەندە واجب نەبوو.

-دەڵێ: دروستە دەرچوون لەئەستۆگرتنی شتێ کەواجب نەبووبێ نابێ بەواجب.

-لەهەندێ بابەتدا دروست نیە و لەهەندێکی‌تردا دروستە، بەم شێوەیە مامناوەندی هەردوو قەولمان گرتووە.

(٢) ئەوەش کە دەڵێن: دروستە لەشتێکدا هێشتا کاری پێنەکردبێ، ئەم قسەمان لەوەی پێشوو وەرگرتووە لە بارەی کارێکەوە لە ئەستۆی نەگرتبێ، ئەمە کاتێ گەڕانەوی بۆ دروست نەبێ، ئەوە (ابن الحاجب) وەك ئامیدی وتوویەتی: ئەمە بەڕای هەموانە، کەوابوو کەسێ لەئەستۆی گرتبێ لەو باشتر بۆی نیە لابدا بۆ لای یەکێکی‌تر، بەڵام ئەم دوو زانایە حیکایەتی ئەوەشیان کردووە کە دروستە لادان، بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ ئەوەی پێوە بلکێنێ بوترێ: لەهەندێکدا دروستە و لەهەندێکی‌تردا دروست نیە،، هەندێك وتویانە واجب نیە لەسەری لەئەستۆگرتنی مەزهەبێکی دیاریکراو، کەوابوو بۆی هەیە لەو شتەی کەبۆی بەڕیا دەبێ حوکم دەمێ بەمەزهەبەکە بکا و لەشتێکی‌تردا بەمەزهەبێکی‌تر لەشتێکی‌تردا، هەروەها ..

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە کەنابێ گەڕان بەدوای روخصەتەکاندا لەناو هەموو مەزهەبەکاندا، بەم شێوەیە لەهەر بابەتێکدا چەند قەولێکی تێدا هەیە، ئەم ئاسانترین قەولیان هەڵدەبژێرێ لەناو هەموو مەزهەبەکاندا، بەڵام مروزی واناڵێ: دەڵێ: دروستە ئاسانترین قەول هەڵبژێرێ لەهەر بابەتێکدا.

**والظاهر ان هذا النقل عنه سهو لما في الروضة واصلها عن حكاية الحناطي وغيره عن ابي اسحق انه يفسق بذلك وعن ابي هريرة انه لا يفسق به والثاني وقد تفقه على الاول ان اراد بعدم النفسق الجواز فهو مبنيعلى انه لايجب التزام مذهب معين وامتناع التتبع شامل للملتزم وغيره يؤخذ منه تقييد الجواز السابق فيهما بما لم يؤد الى تتبع الرخص[1].**

**{مسئلة: اختلف في التقليد في اصول الدين } اي مسائل الاعتقاد كحدوث العالم ووجود الباري وما يجب له ويمتنع عليه من الصفات وغير ذلك مما سيأتي[2] فقال كثير منهم ورجحه الامام الرَّازي والآمدى لايَجوزُ بل يجب النظر لان المطلوب فيه اليقين[3].**

---

(١) بەڵام وادیارە ئەم شێوە نەقڵ کردنە لەمروزی‌یەوە سەهوی تێدایەچونکە لە (الروضة) دا و لەئەصڵەکەشدا کە حەناطی‌و غەیری ئەویش دەیگێڕنەوە لە(ابن اسحاق) ەوە کە وتویەتی: هەرکەس ئەوە بکا پێی فاسق ئەبێ لە ئیبن ئەبی هورەیرەوە ریوایەتکراوە کە پێی فاسق نابێ، ئەم دووەمە ابن أبی هورەیرە قوتابی ابن اسحاق بووە، -چۆن دەبێ قوتابی پێچەوانەی مامۆستاکەی بێ-ئەگەر مەبەستی بەوەی کە دەڵێ: فاسق نابێ دروستی دۆزینەوی قەولی ئاسان بێ ئەوە لەسەر ئەو قاعیدە دروست بوە کە دەڵێ واجب نیە لەئەستۆگرتنی مەزهەبێکی دیاریکراو ، دروست نەبوونی گەڕان بەشوێن قەولی ئاساندا گشتگیرە بۆ کەسێ مەزهەبێکی دیاریکراوی لەئەستۆگرتبێ یا نەی گرتبێ، لەم گشتگیریە ئەوە فێردەبین کە لەپێشەوە وتمان دروستە وازهێنان لە مەزهەبێك و چوون بۆ مەزهەبێکیتر چ بۆ ئەوەی لەئەستۆی گرتبێ مەزهەبێك یا نەیگرتبێ، دەی ئەمەی پێوە بلکێ بڵێین: بەمەرجێ سەر لەوەوە هەڵنەدا کە گەڕان بێ بەشوێن قەولی ئاساندا.

(٢) ئەمەش بابەتێکە کە زانایان کێشەیان هەیە لەوەدا کە ئایا دروستە تەقلید لەو بابەتانەدا کە لەباوەڕو عەقیدە دەدوێ نەك کردار وەك دروستبوونی ئەم جیهانە و بوونی خوا وەئەوەی واجبە بۆ خوا هەبێ و ئەوەش کەنابێ هەبێ، واتە کام صیفەت دەبێ هەیبێ و کامە دەبێ نەیبێ لەوانەی لەمەودوا باسەکەیان دێ.

(٣) لەبەر ئەوەی زۆربەی زانایان وتویانە و پێشەوا رازی‌و ئامێدیش تەرجیحیان داوە دەڵێن: تەقلید لەباوەڕدا دروست نیە، بەڵکو دەبێ بیرو تێڕامانی تێدا بکا -نەك نظری منطقی- چونکە ئەوەی لەئوصولی دین دا داوای دەکرێ هەر یەقین و بێگومانیە .

..قال الله تعالى لنبيه:﴿ فاعلم انه لا اله إلاّ الله ﴾ وقد علم ذلك وقال تعالى للناس ﴿ واتبعوه لعلكم تهتدون ﴾ ويقاس غير الواحدانية عليها[1] وقال العنبري وغيره: يَجوزُ التقليد فيه ولا يجب النظر إكتفاء بالعقد الجازم لانه ﷺ كان يكتفي في الايمان من الاعراب وليسوا اهلا للنظر بالتلفظ بكلمتي الشهادة المنبي عن العقد الجازم ويقاس غير الايمان عليه[2].

وَ قيلَ النظر فيه حرام لانه مظنة الوقوع في الشبه والضلال لاختلاف الأذهان والانظار بخلاف التقليد فيجب بأن يجزم المكلف عقده بما يأتي به الشرع من العقائد[3] ودفع الاولون دليل الثاني بأنا لا نسلم ان الاعراب ليسوا اهلا للنظر فان المعتبر النظر على طريق العامة[4].

(١)..ئەوەیە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: تۆبزانە ئیلاهی بەحەق نیە جگە لە (الله) نەبێ، بێگومان پێغەمبەریش ئەوەی زانیوە –واتە زانین مەبەستە نەك گومان– ئەی ئەمە هەر بۆ پێغەمبەر مەبەست نیە؟ نەخێر ئەوەنیە خوای گەورە دەفەرموێ: بەخەڵك شوێن پێغەمبەر کەون بۆ ئەوەی ڕێنمایی بکرێن ئەو فەرمانە تەنها بۆ یەکتاپەرستی نیە، قیاسی غەیری ئەویش دەکرێتە سەر ئەو ،

(٢) عەنبەری و غەیری ئەویش وتویانە: تەقلید لە باوەڕو ئوصولی دین دا دروستەو بیرو تێڕامان واجب نیە هەرە ئەوەندە گرێ بەندی بێگومانی هەبێ بەسیەتی ، چونکە پێغەمبەر لەبارەی باوەڕی گوندنشینەکانەوە هەر ئەوەندەی بەبەس زانیوە کەوشەی گەواهیدان بڵێن چونکە خاوەنی تێڕامان نەبوون ، وتنی ئەو دوو وشەش گرێبەندی بێگومانی دەگەیەنێ لەباوەڕهێناندا ئەوەندە بەس بووە غەیری باوەڕهێنانیش قیاس دەکرێتە سەر ئەم .

(٣) هەندێك وتویانە بیرو تێڕامان لەباوەڕو ئوصولیدا حەرامە، چونکە ئەوە جێگومانە کە موسوڵمان بکەوێتە ناو گومڕایی و ناحەقیەوە، چونکە هەریەکەیهن وبیرکردنەوەیەکی هەیە ، بەڵام تەقلید وانیە ، لەبەر ئەوە واجبە مکلف گرێ بەندی خۆی بێگومان بکا بەوەی کەشەرع هێناویەتی لەبارەی باوەڕەوە.

(٤) گروپی یەکەم بەڵگەی گروپی دووەم بەرپەرچ دەدەنەوەو دەبەنە دواوە بەوەی کە دەڵێن:ئێمە نایسەلمێنین کە گوندنشین و سارانشینەکان خاوەنی بیرو تێڕامان نەبوون، چونکە مەبەست بەبیرو تێڕامان ئەوەیە لەسەر شێوازی بیرکردنەوەی گشتی بێت، نەك نظری منطقی.

كما أجاب الاعرابي الاصمعي عن سؤاله بم عرفت ربك فقال البعرة تدل على البعير واثر الاقدام تدل على المسير فسماء ذات ابراج وارض ذات فجاج إلاّ تدل على اللطيف الخبير، وما يذعن احد من الاعراب او غيرهم للايمان فياتي بكلمتيه إلاّ بعد ان ينظر فيهتدى لذلك[1].

أما النظر على طريق المتكلمين من تحرير الادلة وتدقيقها ودفع الشكوك والشبه ههنا ففرض كفاية في حق المتأهلين له يكفي قيام بعضهم به وأما غيرهم ممن يخشى عليه من الخوض فيه الوقوع في الشبه والضلال فليس له الخوض فيه وهذا محمل نهي الشافعي وغيره من السلف رضي اللهعنهم عن الاشتغال بعلم الكلام وهو العلم بالعقائد الدينية عن الادلة اليقينية وعلى كل من الاوقال الثلاثة تصح عقائدالمقلد وان كان آثما يترك النظر علي الاول[2].

(١) وەك گوندنشینێكی عەرەب وەلآمی ئەصمەعی دایەوە لەو پرسیارەی كەوتی: بەهۆی چیەوە خوات ناسی؟ ئەو یش وتی: بەهۆی ئەم پشقلەوە بەڵگەیە لەسەر وشترێك وجێگەپێكان بەڵگەن لەسەر ئەوە كەسێك بەوێدا تێپەڕی كردووە، ئەی ئاپائاسمانێك چەندەها بورجی هەیوو زەویەك چەندەها گەنداوو شیوو دۆڵ ی هەیە نیشانەنین لەسەر خوایەكی وردبین و بەئاگاو شارەزا، هیچ كەسێك نیە گوندنشینی عەرەب بێ یان نەباوەڕی دامەزراو بێ و ئەمجار زۆر بەسنگی فراوانیەوە دوو شێوەی گەواهیدان بڵێ مەگەر دەبێ ئەوە دوای بیرو تێڕامان بووبێ ئەمجار خوا ڕێنمایی دڵی كردبێ بۆ ئەو ئیمان و باوەڕە .

(٢)بەلآم بیروتێڕامان بەپێی زانایانی عیلمیكەلام كەبریتیە لەپاڵفتەكردنی بەڵگەكان و وردبینی تیایانداو وەلانانی هەمو گومانێك و شوبهەیێك ئەوە فەرزی كیفایەیە بۆ ئەو كەسانەی سوواری ئەو بوارەن و هەنێكیان پێی هەستن بەسە. بەلآم غەیری ئەوان لەوانەی ترسی ئەوەیان لێدەكرێ بكەونە ناو گومڕایی و ناهەقیەوە، ئەوە بۆیان نیە بچنە ناو ئەو بوارە پڕ مەترسییەوە، ئەوەی كە شافیعی و غەیری شافیعی لەزانایانی پێشوو قەدەغەیان كردووە كە خەڵك مەشغوڵی عیلمیكەلام بێدەبڕێ بەسەرئەمانەدا كەبەسەلامەتی رزگاریان نابێ، عیلمی كەلام بریتیە لەوەی عەقییدە دینیەكان لەخودی بەڵگەو دەلیلەكان دەربهێنێ . ئەمە سێ قەول لەبارەی عەقیدەی تەقلیدەوە ، یەكێ وتی: دروست نیە، دووەم وتی: دروستە، سێهەم ووتی: حەرامە، لەسەر ئەم سێقەولە عەقیدەو باوەڕی كەسێكی مقلد بەدروست حسیبێ دەكرێ هەرچەندە لەسەر قولی یەكەم گوناهبار دەبێ بەهۆی ئەوەوە كە وازی هێناوە لەبیرو تێڕامان .

{وعن الاشعري} انه {لا يصح ايمان المقلد} وشنع اقوام عليه بأنه يلزمه تكفير العوا وهم غالب المؤمنين {وقال} الاستاذ ابو القاسم {القشيري} في دفع التشنيع هذا {مكذوب عليه} قال المصنّف {والتحقيق} في المسئلة الدافع للتشنيع انه {ان كان} التقليد {اخذا لقول الغير بغير حجة مع احتمال شك او وهم} بأن لايجزم به {فلا يكفى} ايمان المقلد قطعا لانه لا ايمان مع أدنى تردد فيه[1] .

{ وان كان} التقليد اخذ لقول الغير بغير حجة لكن {جزما} وهذا هو المعتمد {فيكفى} ايمان المقلد عنه الاشعري وغيره {خلافاً لابي هاشم} في قوله لا يكفى بل لابد لصحة الايمان من النظر[2] وعلى الاكتفاء بالتقليد الجازم في الايمان وغيره قال المصنّف {فليجزم} اي الملكف {عقده بأن العالم} وهو ما سوى الله تعالى[3].

---

(١) ريوايەت كراوە لەئەشعەريەوە كەووتويەتی: ئیمان و باوەڕی کەسێ بەتەقلید بێ دروست نیە و دانامەزرێ، خەڵکانێکی زۆر لەسەر ئەم قسەیە ئەشعەرییان عەیبداركردووە و خراپەیان ووتوە، لەبەر ئەوە لەم قسەوە لازم دێ هەرچی عەوام هەیە بەكافر دابنرێ ، ئەوانیش زۆربەی موسوڵمانانن، بۆ بەر پەرچدانەوەی ئەم عەیبدار كردنەی ئەشعەریە قشەیری ووتویەتی: ئەمە هەر درۆیە بەدەم ئەشعەریەوە كراوە، دانەریش ووتویەتی: قسەی ڕاست كەلابەری ئەم عەیبداركردنەش بێ ئەوەیە:ئەگەر تەقلید شوێنكەوتنی قسەی خەڵك بێ بەكوێرانەو بێئەوەی بەڵگەی بزانێ لەگەڵ ئەوەشدا گومان یاخود وەهمی ڕووەكەی تریشی هەبێ، واتە جەزم بێ گومان نەبێ، لەم ڕوەوەیە ئەوە بێگومان ئیمان و باوەڕی ئەم مقلدە بەس نیە و ڕزگار كەری نیە، چونكە هیچ جۆرە ئیمان و باوەڕێك لەگەڵ نزمترین پلەی گوماندا نیە.

(٢) بەڵام ئەگەر تەقلید شوێنكەوتنی قسەی غەیری خۆی بێ بەڵگە بەڵام بێگومان بێ لەڕاستیەكەی -ئەم پێناسەیەش معتمدە- ئەوە ئیمان و باوەڕی ئەو مقلدە بەلای ئەشعەری و غەیری ئەویشەوە بەسەڕزگار كەری دەبێ، بەڵام ابو هاشمی معتزلە بەپێچەوانەوە دەڵێ: ئەو ئیمان و باوەڕە ڕزگار كەری نیە و بەس نیە ، بەڵكو دەبێ بۆ ئەوەی ئیمان دروست بێ بیرو تێرامان هەبێ.

(٣) لەسەر ئەو پێناسەی كەتەقلید بێگومانیە لەباوەڕو و غەیری باوەڕیشدا بەسە و ڕزگار كەر دەبێ بۆ خاوەنەكەی دانەر ووتی: بامكلف گرێ بەندی باوەڕی خۆی بێگومان بكا و بزانێ كە: ئەم عالەم و جیهانە -كەجگە لەخوا هەموو دروستكراوێك دەگرێتەوە .

ولا حاجة لقول بعضهم وصفاته فانها ليست غيره كما انها ليست عينه {محدث} اي موجد عن العدم لانه متغير اي يعرض له التغير كما يشاهد وكل متغير محدث لانه وجد بعد ان لم يكن[1] {وله صانع} ضرورة ان المحدث لا بدله من محدث {وهو الله الواحد} اذ لو جاز كونه اثنين لجاز ان يريد احدهما شيئا والآخر ضده الذي لا ضد له غيره كحركة زيد وسكونه فيمتنع وقوع المرادين وعدم وقوعهما لامتناع ارتفاع الضدين المذكورين واجتماعهما فيتعين وقوع أحدهما فيكون مريده هو الاله دون الآخر لعجزه فلا يكون إلاّ له إلاّ واحد واطلا المتكلمين اسم الصانع عليه تعالى مأخوذ من قوله تعالى صنع الله الذي اتقن كل شيء[2] {والواحد الشيء الذي لا ينقسم} بوجه {ولا يشبه} بفتح الباء المشددة اي به ولا بغيره اي لا يكون بينه وبين غيره شبه {بوجه[4]}.

(١) پێویست بەوە ناك هەندێك ووتویانە: جگە لە خواو صیفەتەكانی خوایە ، چونكە صیفەتەكانی خوا غەیری زاتی خوا نین وەك خودی زاتی خواش نین واتە زات و صیفەت مانایان لەیەك جیایە ، وتەصەوری زاتیش بێ صیفەت مەحاڵە مەگەر بەخەیاڵ نەبێ- دروستكراوە واتە: لە نەبووەوە هاتوەتە بوونەوە، ، چونكە ئەم جیهانە گۆڕانكاری بەسەردادێ وەك دەیبینین هەموو شتێكە گۆڕانكاری بەسەردا بێ دروستكراوە، چونكە هاتوەتە بوونەوە دوای ئەوەی كەنەبووە،

(٢) ئەو دروستكراوەش دروستكەرێكی هەیە، چونكە بەڵگەنەویستە دروستكراو هەر دەبێ دروستكەرێكی هەبێ، ئەو دروستكەرەش (الله)یەكە تاك وتەنهایە، چونكە ئەگەر بگونجایە دووان بوایێن ئەوە دەشگونجا یەكێكیان شتێكی بوێ ئەویتریان دژەكەی بوێ، ئەو دژەی كەغەیری ئەو نیە، وەك جوڵەی زەیدو ئارامگرتنی، ناگونجێ هەردوو ویستەكە بێنەدی و ناشگونجێ هەردووكیان نەیەنەدی چونكە نابێ دوو دژ هەر نەبن، وە ناشبێ هەردوكیان پێكەوە هەبن ، لەبەر ئەوە دەبێ یەكێكیان بێتەدی ئەویان كەویستەكەی هاتۆتەدی ئەوە خوایە، نەك ئەویتریان چونكە نەتەوانایە ، كەوابوو خوا هەر دەبێ یەكێك بێ. ناوی صانع ودروستكەر چۆن دەبێ ببردرێ بەسەر خوادا كەچی ناوی خوا هەردەبێ اەقورئان فەرموودەدا بێ، ئیتر زانایانی عیلمی كەلام بێ'بەڵگە چۆن ئەم ناوەیان هێناوە؟ ئەمیش دەڵێ: ئەوە لەم ئایەتەو وەرگیراوە كە دەفەرموێ: دروستكردنی خواییێكە كەهەموو شتێكی بەرێك وپێكی دروستكردووە.

(٣) كاتێ كەدەوترێ خوا تاك و تەنهایە تاك و یەك ئەو شتەیە كە قەبووڵی دابەش بوون نەكاڵەهیچ رویەكەوە هیچ شتێك ناشوبهێ بەخواوە، خوایش ناشوبهێ بەهیچ شتێكەوە ، واتە لەنێوانی خواو غەیری خوادا شوبهەیێك نیە، لەهیچ رویەكەوە .

والله تعالى قديم} اي {لا ابتداء لوجوده} ولا انتهاء اذ لو كان حادثا لاحتاج الى محدث تعالى عن ذلك[١] {حقيقته} تعالى {مخالفة لسائر الحقائق قال المحققون ليست معلمة الآن} اي في الدنيا للناس وقال كثير انها معلومة لهم الآن لانهم مكلفون بالعلم بوحدانيته وهو متوقف على العلم بحقيقته[٢]. و أُجيبَ بمنع الوقف على العلم به الحقيقة وانما يتوقف على العلم به بوجه وهو تعالى يعلم بصفاته كما اجاب بها موسى عليه الصلاة والسلام فرعون السّائل عنه تعالى كما قص علينا ذلك بقوله تعالى قال فرعون وما رب العالمين الخ {واختلفوا} اي المحقوق {هل يمكن علمها في الآخرة} فقال بعضهم نعم لحصول الرؤية فيها كما سيأتي وبعضهم لا والرؤية لا تفيدالحقيقة[٣] {ليس بجسم ولا جوهر ولا عرض} لانه تعالى منزه عن الحدوث[٤]...

---

(١) وەخوای گەورە هەر هەبووە، ، واتە: سەرەتا بۆ بوونەکەی نیە وەهەروەها کۆتایی بۆبوونی نیە، چونکە ئەگەر دروستکراو بوایە پێویستی بەدروستکەرێ هەبوو، خوایش لەوەبوڵندترە کە پێوستی بەغەیری خۆی هەبێ.

(٢) کونهو حەقیقەتی خوا جیاوازە بۆ هەموو کونهو حەقیقەتەکانیتر ، زانایانی محقق وتویانە: حەقیقەتی خوا لەم دونیادا بۆ هیچ کەسێ نەزانراوە، زۆرێکیش وتویانە حەقیقەتی خوا ئێستە بۆ خەڵك زانراوە، چونکە خەڵك زانراوە، چونکە خەڵك موکەللەفن بەوەی عیلمیان هەبێ بەتاك و تەنهایی خوا،ئەوەشی دەوەستێ هەتا عیلمییان هەبێ بەحەقیقەتی خوا.

(٣) وەڵامی ئەمانە دراوەتەوە عیلم بەتاك و تەنهایی خوا، نەوەستاوە لەسەر عیلم بەحەقیقەتی خواوە، بەڵکوو دەوەستێ لەسەر عیلم بەکونهی خواوە لە ڕوویێکەوە، کەئەویش ئەوە خوا لەڕووی صیفەتەکانیەوە دەزانرێ و دەناسرێ، وەك موسا پێغەمبەر وەڵامی فیرعەونی دایەوە کاتێ پرسیاری حەقیقەت و کونهی خوای لێکرد ئەویش بەصیفەتەکانی وەڵامی دایەوەهەر بەو شێوەیە خوا سەر گوزەشتەکەی گەڕاندۆتەوە بۆمان و دەفەرموێ : خاوەن و پەروەردگاری جیهانیان کونهەکەی چیە؟ زانایانی تحقیق جیاوازیان هەیە ئایادەگونجێ عیلم بەحەقیقەتی خوا لەڕۆژی قیامەتدا؟ لەبەر ئەوە هەندێك وتویانە: بەڵێ دەگونجێ چونکە لەوێ بۆ ئادەمیزاد دەگونجێ بینینی خوا، وەك لەمەودوا دێ باسەکەی، هەندێکیتر وتوویانە: ناگونجێ زانینی کونهی لەوێیش بینینی حەقیقەتی زانینی ناگەیەنێ.

(٤) خوای گەورە نەجیسمەو نەجەوهەرەو نەعەرەضە، چونکە خوای گەورە پاك و دوورە لەشتێك کەدروستکراو بێت..

..وهذه حادثة لانها اقسام العالم اذ هو إما قائم بنفسه او بغيره والثاني العرض والاول يسمى بالعين وهو محل الثاني المقوم له امامركب وهو الجسم او غير مركب وهو الجوهر وقد يقيد بالفرد[1] {لم يزل وحده ولا كان ولازمان ولا قطر ولا اوان} هذا من عطف الخاص على العامّ اذا القطر مكان مخصوص كالبلد والاوان زمان مخصوص كزمان الزرع والداعي الى العطف الخطابة في التربية اي هو موجود وحده قبل المكان والزمان فهو منزه عنهما[2] {ثُمَّ احدث هذا العالم} المشاهد من السموات والارض بما فيهما {من غير إحتياج} إليهِ {ولو شاء اما اخترعه} فهو فاعل بالاختيالا لابالذات {لم يحدث بابتداعه في ذاته حادث} فليس كغيره محلا للحوادث فهو كما قال في كتابه العزيز {فعال لما يريد ليس كمثله شيء} وهو السميع البصير[3].

(١) ئەمانەش دروستکراون چونکە ئەمانە چەند بەشێکی ئەم جیهانەن، ئەم جیهانەش بەشێکی پابەندە بەخودی خۆیەوە، بەشەکەی تریشی بەندە بەغەیری خۆیەوە ، دووهەمەکەیان عەرەضی پێدەوترێ یەکەمەکەیان ناودەبرێ بەعەینی و بەچاو بینراو ، ئەمەش جێ نیشتنەوەی دووەمە کەبوونەکەی بەندە بەبوونی یەکەمەوە، جا یا مرکبە ئەوە جیسمە یامرکب نیە ئەوە جەوهەرە، پێی دەوترێ جەوهەری فەرد.

(٢) خوای گەورە هەر لەسەرەتاوە هەر تەنها بووەو وبێشوێن بووەو بێکات بووەو بێجێگەی تایبەت و کاتی تایبەت بووە، ئەم دوانەی دواەوە عەطفی خاصن لەسەر عام ، چونکە (قطر) بریتیە لەجێگەی تایبەت وەك ئەم شارە (اوان)یش بریتیە لەکاتی تایبەت وەك کاتی کشتوکاڵ هۆی ئەم عەطفەش هونەری رەوانبێژییە لەپاك و خاوێن راگرتنی خودادا، واتە خوا هەر بووەو تاك و تەنها بووەو پێش دروستبوونی شوێن و کاتەوە ، لەبەر ئەوە خوا پاکەو دوورە لەوەی پێویستی بەکات و شوێن هەبێ.

(٣) پاشان خوای گەورە ئەم جیهانەی دروست کردووە بەتایبەت ئەوەی کەلێی دەبینرێ لەئاسمانەکان و زەوی بەوەشی کەتیایاندا هەیە، کەدروستیشی کردوون بێئەوە پێویستی بەم جیهانە هەبێ، گریمان ئەگەر ئارەزووی بوایە دروستی‌نەئەکرد چونکە خوا فاعیل و بکەرە بەئارەزوی خۆی نەك بکەری بەذات ، واتە قورمیش کراوو بێئیرادە بێ، کاتێ خوا ئەم جیهانەی دروست کرد بەدروستکردنەکەی زاتی خوا صیفەتێکی تازەی بۆ دروست نەبووە، واتە صیفەتەکانی خوا هەرچەند بەوەزن ئیسمی فاعیلن بەلاّم لەراستیدا صیفەتی مشبهەن، واتە هەر بوون و هەر دەبن، واتە خوا وەك غەیری خوا نیە جێ نیشتنەوەی دروستکراوەکان بێ پێیەوە ، چونکە خوا

**{القد ر} وهو ما يقع من العبد المقدر من الازل {خيره وشره} كائن {منه} تعالى بخلقه واردته {علمه شامل لكلّ معلوم} اي مامن شانه ان يعلم ممكنا كان او ممتنعًا {جزئيات وكليات وقدرته} شاملة {لكل مقدور} اي مامن شانه ان يقدر عليه وهو المكن بخلاف الممتنع {ماعلم انه يكون} اي يوجد {اراده} اي اراد وجوده {ومالا} اي وماعلم انه لا يوجد {فلا} يريد وجوده فالارادة تابعة للعلم[1]{بقاؤه} تعالى {غير مستفتح ولا متناه} اي لا اول له ولا آخر[2] {لم يزل} سبحانه موجودا باسمائه} اي بمعانيها وهي مادل على الذات باعتبار صفة كالعالم والخالق {وصفات ذاته} وهي {مادل عليها فعله} لتوقفه عليها {من قدرة} وهي صفة تؤثر في الشيء عند تعلقها به {وعلم} وهو صفة ينكشف بها الشيء عند تعليقها به[3].**

وەك خۆی لەقورئاندا دەفەرموێ: زۆر كارایە بۆ ئەوەی كەدەیەوێ، وە دەفەرموێ: نموونە بۆ خوانیە ، هەر ئەویشە تەواو بیسەرو بینەرە.

(١) قەدەرو نەخشە ئەوەیە كە لەلایەن بەندەوە بكرێ و كە هەر لەئەزەلەوە نەخشەی بۆ كێشراوە، چاكی و خراپی لەلایەن خواوە بووە بەدروستكردن و ویستی خوا بووە، عیلمی خوا داگیرەندەیە بۆ هەموو شتێ كەلەباریا هەبێ بزانێ چ گونجاو بێ یاخود نەگونجاو بێ، چ جوزئی بێ یاخود كوللی بێ، قودرەت و توانای خوا داگیرەندەیە بۆ هەموو شتێ كە لەباریابێ توانای بەسەریدا بێ، ئەوەش تەنها گونجاوە بەلام نەگونجاو وانیە، خوا كۆكردنەوەی دوو دژ ناكا لەبەر ئەوەی لەتوانایادا نیە كۆبكرێنەوە، وات لەتوانای دروستكراوەكەدا نیە نەك لەتوانای خوادا نیە، ئەوەی خوا دەزانێ دەبێ ویستی بوونەكەی دەكا، ئەوەش كەدەزانێ نابێ ئیرادەی بوونەكەی ناكا، چونكە ویستی خوا شوێن كەوتەی عیلمەكەیەتی عیلمیش شوینكەوتەی زانراوەكەیە .

(٢) مانەوەی خوا نەسەرەتای هەیە نە كۆتایی .

(٣) خوای گەورە لەئەوەڵەوە كە بووە بەهەموو ناوەكانیەوە بووە ، واتە مانای هەموو ناوەجوانەكانی ، كە بریتین لەوەی دەلالەت بكەن لەسەر زات بەئیعتباری صیفەت، وەك دەلالەت بكا لەسەر زانایی بەئیعتباری زانایی یان دروستكەری، هەروەها خوای گەورە لەئەوەڵەوە كە بووە بەهەموو صیفەتە زاتیەكانەوە، كەبریتین لەوەی فیعل و كاری خوا دەلالەت بكا لەسەریان، چونكە كارو كرداری خوا پەیوەندن بەو صیفەتانەوە كە: ١- قودرەت و توانایی‌یە صیفەتێكە تەئثیر لەشتێك دەكا كاتێك تعلقی پێوە ببەستێ، ٢-عیلم و زانین صیفەتێكە شتی‌پێ دەردەكەوێ كاتێ ئەو صیفەتە تعلقی پێوە ببەستێ .

{وحياة} وهي صفة تقتضي صحة العلم لموصوفها {وارادة} وهي صفة تخصص احد طرف الشيء من الفعل والترك بالوقوع [1]{او} دل عليها {التنزيه} له تعالى {عن النقص من سمع و بصر} وهما صفتان يزيد الانكشاف بهما على الانكشاف بالعلم {وكلام} وهو صفة عبر عنها بالنظم المعروف السمى بكلام الله ايضا ويسميان بالقرآن ايضا {وبقاء} وهو استمرار الوجود[2] اما صفات الافعال كالخلق والرزق والاحياء والاماتة فليست ازلية خلافاً للحنفية بل هي حادثة اي متجددة لانها اضافات تعرض للقدرة وهي تعلقاتها بوجودات المقدورات لأوقات وجوداتها ولا محذور في اتصاف الباري سبحانه بالاضافات ككونه قبل العالم ومعه وبعده[3] وازلية اسمائه الراجعة الى صفات الافعال كما تقدَّمَ في جملة الاسماء من حيثُ رجوعها الىالقدرة لا الفعل[4].

(١) ٤-ويست و ئيرادەيە ، صيفەتێكە يەكێك لەهەردوو سەرەی شتێك كە كردن و نەكردنە تايبەت دەكا بەڕوودانەوە، واتە: ئيرادەی دەبێ ببێ يا نەبێ ٣-ژيانە صيفەتێكە داخوازی دروستی زانين دەكا بۆ خاوەنەكەی كە خودايە.

(٢) ياخود ئەو صيفەتە زاتيە پاكی و دوور لەعەيبی خوا دەلالەت دەكا لەسەری: ١-بيستن ٢-بينين ، ئەمانە دوو صيفەتن شتيان پێ‌دەردەكەوێ، زياد لەو دەركەوتنەی كە بەعيلم و زانين دەردەكەوێ، ٣-كەلام و گفتوگۆيە كەصيفەتێكە لێك ئەدرێتەوە بەم شێوە رێكخستنی ئێستەيە كە دەيزانين و ناودەبرێ، دووبارە بەكەلامی خوا هەميسان هەردووكيان -صيفەت و لەفظەكە-ناودەبرێن بەقورئان. ٤-بەقاو مانەوە ئەميش صيفەتێكە بريتيە لەبەردەوامی بوونەكەی.

(٣) بەلام ئەو صيفەتانەی كە بەهۆی كارو كردەوەيەوە پەيدا دەبێ وەك دروست كردن و رۆژی دان و زيندووكردنەوەو مراندن ئەمانە ئەزەلی نين، -زانايانی پەيڕەوی حەنەفی وانالێن-بەڵكو ئەوانە جێ متعلقی صيفەتی خوان تازە پەيداوون و هەر بەيناو بەين پەيدا دەبن لەزيهندا نەك لەخارجدا،صيفەتی كارو كردەوی خوا ئيعتباری بونيان لەخارجدا نيە، ئەوانە چەند ئيضافەيەكن بۆ قودرەت و توانا پەيدا دەبن ، ئەوانە تعلق دەبەستن بەبوونی مەقدورەكانەوە بۆ كاتی بونەكانيان، هيچ قەدەغە نيە ئەگەر خوا صيفەتدار بكرێ بەشتێكی ئيضافيەوە، وەك ئەوەی خوا پێش ئەم جيهانە بووە يا لەگەلْ موسوڵمانان دايە يا هەردەمێنێتەوە.

(٤) لەپێشەوە رابوورد وتمان خوا ئەم ناوانەی هەرهەبووە ، ئێستە ئەم ناوە ئەزەليانە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو صيفەتانەی بەهۆی كرداری خواوە پەيدادەبن، چۆن وادەبێ؟ئاخر لەو ڕووەوە دەگەڕێتەوە بۆتوانای خوا،واتە صيفەتی(بالقوة) نەك(بالفعل).

فالخالق مثلاً من شأنه الخلق اي هو الذي بالصفة التي بها يصح من حيثُ رجوعها الى القدرة لا الفعل فالخالق مثلاً من شأنه الخلق اي هو الذي بالصفة التي بها يصح الخلق وهي القدرة كما يقال في الماء في الكوز مرو اي هو بالصفة التي بها يحصلُ الارواء عند مصادفة الباطن وفي السيف في الغمد قاطع اي هو بالصفة التي بها يحصل القطع عند ملاقاة المحل فان اريد بالخالق من صدر منه الخلق فليس صدوره ازلياذ كرذلك الغزالي وبين رجوع الاسماء كلها الى الذات وصفاتها في المقصد الأسنى(١).

{وما صح في الكتاب والسُنَة من الصفات نعتقد ظاهر المعنى} منه {ونـزه عند سماع المشكل} منه كما في قوله تعالى:﴿ الرحمن على العرش استوى﴾﴿ ويبقى وجه ربك ﴾﴿ ولتصنع على عينى ﴾﴿ يد الله فوق ايديهم ﴾ وقولهﷺ ان قلوب بني آدم كلها بين اصبعين من اصابع الرحمن كقلب واحد يصرفه كيف يشاء ان الله يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار ويبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل حتى تطلع الشمس من مغربها رواهما مسلم(٢).

(١) بۆ نمونە خالق واتە ئەوزاتەی کە لەتواناى‌دایە دروستکردن ، بەم مانایە خوا صیفەتێکی هەیە دروستکردن بەو صیفەتە دەبێ، کە ئەویش قودرەت و توانایە وەك دەوترێ: ئاوی ناو کوپەکە تێرئاوکەرە، واتە: صیفەتێکی هەیە کە تێرئاوکردنی پێ‌پەیدا دەبێ کاتێ کە دەگاتە سك، یا دەوترێ شمشێری ناو ئەو کێلانەیە بوڕندەیە، واتە: صیفەتێکی هەیە بڕاندنی پێ‌پەیدا دەبێ کاتێ بگاتە شوێنی خۆی، کەچی هێشتا لەناو کێلانەکەدایە واتە بالقوە نەك بالفعل، بەلآم ئەگەر مەبەست بەخالق ئەوکەسە بێ کەشتی دروستکردبێ ئەوە ئەو صدورە ئەزەلی نیە، غەزالی ئەوەی باسکردووە هەرچی ناوەکانی خوا هەن هەمووی گەڕاندوەتەوە بۆ زات و صیفاتی خوا ، لەکتێبی (المقصد الأسنى)دا.

(٢) ئەوەی کە لەقورئان و فەرموودەدا لەبارەی صیفەتەکانی خواوە هاتووە بڕوا دەکەین بەمانا دیارەکەی و لەکاتی بیستنی مانایەك کەڕوون نەبێ پاکی و بێ‌عەیبی بۆ خوا بڕیار دەدەین، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: خوایێك‌کەزۆر بە بەزەیی‌یە بەسەر عەرشەوە مستوی بووە، ، گونجاو نیە بڵێین: دانیشتووە، یا دەفەرموێ: هەر وەجهی پەروەردگارت دەمێنێتەوە، ناگونجێ دەموچاوی بۆ بڕیار بدەین، یان دەفەرموێ: بۆ ئەوەی لەژێر عەینی خۆمدا دروست بکرێ. نابێ بڵێیت خوا چاوی هەیە، یا دەفەرموێ یەدی خوا لەژووری هەموو دەستیانەوەیە نابێ بووترێ: خوا دەستی هەیە، یاخود پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: دڵانی هەموو ئادەمیزاد لەنێوانی دوو پەنجەدایە لەنێوان

**{ثُمَّ اختلف ائمتنا انؤول} المشكل {ام نفوض} معناه المراد إليهِ تعالى {منزهين} ل عن ظاهره {مع اتفاقهم على ان جهلنا بتفصيله لا يقدح} في اعتقاد نالمراد منه مجملا والتفريض مذهب السلف وهو اسلم والتأويل مذهب الخلف وهو أعلم اي احوج الى مزيد علم[1] فيؤول في الآيات الاستواء بالاستيلاء والوجه بالذات والعين بالبصير واليد بالقدرة والحديثان من باب المثيل المذكور في علم البيان نحو اراك تقدِّمَ رجلا وتؤخر آخرى يقال للمتردد في امر تشبيها له بمن يفعل ذلك لا قدامه واحجامه [2].**

پەنجەکانی خوای زۆر بەبەزەیی ، وەك یەك دڵ وان چۆنی بویَ ئەم دیوو ئەو دیوی دەکا، یان دەفەرمویَ: خوای گەورە بەشەودا دەستی خۆی درێژ دەکا بۆ ئەوەی خراپەکاری رۆژ تەوبە بکا و بگەرێتەوە،وە بەرۆژ دەستی خۆی درێژ دەکا بۆ ئەوەی خراپەکاری شەو تەوبە بکا و بگەرێتەوە، هەتا ئەو رۆژەیرۆژ لەرۆژئاواوە هەڵدێن، ئەم دوو فەرموودەیە موسلیم ریوایەتی کردووە.

(١) پاشان پێشەوایانمان راوبۆچوونی جیاوازیان هەیە، ئایا ئەوەی مشکل و مانای روون نیە، تەئویلی بکەین یاخود مانا مەبەستەکەی بگەرێنینەوە بۆلای خوا بیدەینەوە دەست خۆی لەکاتێکدا ئێمە تەئویلی بکەین یاخود تەفویضیبکەین، خوای گەورە پاك ودوور دەگرین لەواتا ظاهر و دیارەکەی،لەگەڵ ئەوەش زانایان یەك قسەن لەسەر ئەوە کەبەتفصیل مانا نەزانینەکەی زیان بەو بڕوامانە نادات کەبەکورتی بروامان هەیە بەومانای کە خوا خۆی مەبەستیەتی . تەفویض و دانە دەست خودا بۆچوونی زانایانی پێشینە، –سەدەی یەك و دوو سیَ– ئەوەش ریَی رزگاریە، تەئویل و برینی بەسەر مانایەکیتردا بۆچوونی زانایانی سەردەمی دواییبە، دوای سەدەی سێهەم ئەو رێیەش زۆر پێویستی بەزیادە عیلم و زانست هەیە، نەك بەمانا زانایانی سەدەی دوایی لەزانایانی پێش زاناترن.

(٢) بۆیە لە ئایەتەکان بەم شێوەیە تەئویل دەکەن، (استواء) واتە: زاڵبوون، (وجە) واتە: زاتی خوا ، (عین) واتە: هێزی بینین، (ید) واتە: هێز، –ئەی ئەگەر مەبەستی خوا ئەوە نەبیَ– دوو فەرموودە کەشیان بەتەمثیل و بەلاغە لێك داوەتەوە، –تەمثیل واتە: بەکارهێنانی وشەیێك لەمانایەکدا و ئەعبارەش بەکاری دەهێنی لەشێوەی ئەو مانا پێشوەدا نەك لەخودی ئەودا– ، بۆ نموونە دەبینم پێیەکت دەبیتە پێش و یەکێکت دەبیتە دواوە، ئەمە دەوتریَ بەکەسێکی دوو دڵ لەکارێکدا ئەشوبهیَ بەکەسێکەوە کە وەها بکا، چونکە دەمیَ دەچێتە پێش و دەمیَ پەشیمان دەبێتەوە.

فالمراد من الحديث الاول والظرف فيه خبر كالجار والمجرور ان قلوب العباد كلها بالنسبة الى قدرته تعالى شيء يسير يصرفه كيف شاء كما يقلب الواحد من عباده اليسير بين أصبعين من أصابعه[1] والمراد من الثاني انه تعالى يقبل التوبة في الليل والنهار الى طلوع الشمس من مغربها فلا يرد تائبا كما يبسط الواحد من عباده يده للعطاء أي للآخذ فلا يرد معطيا[2].

{القرآن} وهو {كلامه} تعالى القائم بذاته {غير مخلوق} وهو مع ذلك ايضا {على الحقيقة لا المجاز مكتوب في مصاحفنا} باشكال الكتابة وصور الحروف الدالة عليه {محفوظ في صدورنا} بالفاظه لامخيلة {مقروء بألسنتنا} بحروفه الملفوظة المسموعة فقوله على الحقيقة راجع الى كل من مكتوب ومحفوظ ومقروء وقدم للاشارة الى ذلك[3].

(١) مەبەست بە فەرموودەی یەکەم -ظەرفەو تێیدا خەبەرە وەك جارو مجرور وايە- ئەوەیە کەدڵێ بەندەکانی خوا بەنیسبەت توانایی خواوە زۆر کەمە چۆنی بوێ ئەم دیو و ئەو دیوی پێدەکا، وەك یەکێك لەبەندەکانی خوا شتێکی لەنێوان دوو پەنجەدا بێ لەپەنجەکانی چۆن ئەم دیوو ئەو دیوی پێدەکا و ئاسانە بەلایەوە، خوای گەورەش ئەوەندە بەلایەوە ئاسانە.

(٢) مەبەست لە فەرموودەی دوەمیشی ئەوەیە کە خوای گەورە بەشەوو بە رۆژ تەوبەی تۆبەکاران قەبوڵ دەکات هەتا رۆژ لەرۆژئاواوە هەڵدێت، وەك چۆن یەکێك لە بەندەکانی خوا دەست پان دەکاتەوە بۆ سواڵ بۆ ئەوەی شتی بەنێ هەر کەس هەرچی بداتێ هەر وەریدەگریۆ رەتی ناکاتەوە، خوایش هەروەها تەوبەی کەس رەت ناکاتەوە.

(٣)ئەم قورئانە بریتیە لەکەلامی خوا کەقیامی هەیە بەذاتی خواوە مخلوق ودروست کراونیە، چونکە صیفەتی خوایە، قورئان لەگەڵ ئەوەش دووبارە ئەوەی کە نوسراوە لەنامەکانی ئێمەدا، بەهەموو جۆرە نوسینێك لەدیمەنی پیتەکان کە دەلالەت دەکەن لە سەری، لەسینگی ئێمەدا لەبەر کراوە، بەهەموو لەفظەکانیەوە، وەبەزمانی ئێمە دەخوێنرێتەوە، بەو پیتانەی تەلەفظیان پێدەکرێ دەبیسترێن حەقیقەتەن هەر ئەو قورئانەیە کەقیامی هەیە بەذاتی خواوە نەك لەرووی مەجازیەوەیە.دانەر کەوتی: (على الحقيقة) ئەوە روون دەکاتەوە هەریەك لەنوسراوو لەبەرکراو خوێنراوەکە، واتە: ئەوەی نوسراوەو لەبەرکراوەو دەخوێنرێتەوە هەر خودی ئەو قورئانەیە کەصیفەتی خوایە و قیامی بەذاتی خواوە هەیە، بۆیە لەپێشەوە وتی:(على الحقيقة)نەیخستە دوایانەوە واتە دوای(مقروء)بۆ ئەوەیە بگەرێتەوە بۆ هەمووصیفەتەکان (مكتوب،محفوظ، مقروء ).

ونبه بقوله لا المجاز على انه ليس المراد بالحقيقة كنه الشيء كما هو مراد المتكلمين[1] فان القُرآن بهذه الحقيقة ليس في المصاحف ولا في الصدور ولا في الالسُنَة وانما المراد بها مقابل المجاز اي يصح ان يطلق على القُرآن حقيقة انه مكتوب محفوظ مقروء واتصافه بهذه الثلاثة وبأنه غير مخلوق اي موجود او لا و ابدا اتصاف له باعتبار وجودات الموجود الاربعة فان لِكُلّ موجود وجودا في الخارج ووجودا في الذهن ووجودا في العبارة ووجودا في الكتابة فهي تدل على العبارة وهي على مافي الذهن وهو على مافي الخارج[2]. {يثيب} الله تعالى عباده المكلفين {على الطاعة} فضلا{ويعاقبهم} {الا ان يغفر غير الشرك على المعصية} عدلا لاخباره بذلك قال تعالى:﴿ فاما من طغي وآثر الحياة الدنيا فان الجحيم هي المأوى واما من خاف مقام ربه ونهي النفس عن الهوى فان الجنة هي المأوى ﴾[3]..

(١) دانەر بەوەی کەوتی:(لاالمجاز) قوتابی ئاگادار کردەوە کەمەبەست بەحەقیقەت ئەو حەقیقەتە نیە کەزانایانی عیلمی کەلام مەبەستیانە کەبەواتای کونهی شتەکەیە.

(٢) چونکە قورئان بەمانا ئەم حەقیقەتە نەلەنامەو قورئانی ئێمەدایە نە لەسنگ و زوبانی ئێمەدا هەیە، بەڵکو تەنها مەبەست بەو حەقیقەتە حەقیقەتێکە لەبەرامبەر مەجازەوە بێ، واتە دروستە لەڕووی حەقیقەتەوە بوترێ قورئان کەلامی نوسراوو لەبەرکراو خوێنراوەتەوە، قورئان کەوەصف دەکرێ بەم سێ صیفەتەوە، وەدەوترێ قورئان دروست کراونیە ، واتە هەر بووەو هەر دەبێ بێسەرەتاو بێکۆتایی، ئەوە وەصفدار کردنیەتی بەئیعتباری ئەوەی کە هەموو شتێ کە هەبێ چوار جۆر بوونی هەیە: چونکە هەموو شتێ بونێکی دەرەکی هەیە، ، بونێکی ذیهنی هەیە، بونێکی عبارەتی هەیە، بونێکی کتابەتی هەیە، بونی دەرەکی قیامی هەیە بەزاتی خواوە، بوونی ذیهنی ئەوەیە لەئەزەلا نەبووە هەتا ئادەمی پەیدابووە ، ئەمجار پەیدا بووە، بوونی عیبارەتی هەتا نەنوسراوەتەوە نەبووە، بوونی کتابەتی ئەمیش بوونی عیبارەتەکە دەگەیەنێ چونکە تلفظی پێدەکرێ، ئەمیش بوونە ذیهنیەکە دەگەیەنێ، ئەمیش بوونە دەرەکیەکە دەگەیەنێ.

(٣) خوای گەورە بەندە مکلفەکانی پاداش دەداتەوە لەڕووی گوێڕایەڵیان لەڕووی فەزڵەوە، وەتۆڵەشیان دەدات لەسەرە سەر کەشیان مەگەرکەسیکیان نەبێ خوا لێی ببورێ جگە لەکەسێ گوناهی هاوەڵی بڕیار دابێ بۆ خوا، ئەمەش لەڕووی عەدڵ و دادپەروەری خۆیەوە چونکە خوا هەواڵی ئەوەی داوە. دەفەرموێ: بەڵام کەسێ سەرکەشی بکا و لەڕێبازی خوا لابدا و فەزڵی ئەم ژیانە نزمەی ئەم جیهانە بدا بەسەر

..﴿ ان الله لا يغفر ان يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء ﴾ وهذا الأخير مخصص لعمومات العقاب[١] {وله} سبحانه {اثابة العاصي وتعذيب المطيع وايلام الدواب والاطفال} لانهم ملكه يتصرف فيهم كيف يشاء لكن لا يقع منه ذلك لاخباره باثابة المطيع وتعذيب العاصي كما تقدَّمَ ولم يرد ايلام الدواب والاطفال في غير قصاص والاصل عدمه اما في القصاص فقال ﷺ لتؤدن الحقوق الى أهلها يوم القيامة حتى يقاد للشاة الجلحاء من الشاة القرناء رواه مسلم وقال يقتص للخلق بعضهم من بعض حتى الجماء من القرناء وحتى للذرة من الذرة وقال ليختصمن كل شيء يوم القيامة حتى الشاتان فيما انتحطتا رواهما الامام أحمد[٢].

فەرمانی خوادا و نیشانەش هەبێ ئەوە بێگومـان دۆزەخ جێـی ومـاواو سـەرەنجامی دەبێ، بەڵام کەسێ بترسێ لەو رۆژەی لەبەردەم خوادا دەوەستێ -یاخود لەپلەی پڕ لەشکۆداری خوا بترسێ-وە نەفسی خۆی قەدەغە بکا لەهەوا پەرستی و نزمی ئەوا بەهەشت جێو ماواو سەرەنجامیەتی.

(١) یاخود دەفەرموێ: خوا خۆشنابێ لەکەسێ کەهاوەڵی بۆ خوا دروست کردبێ و بڕیار دابێ، لەگوناهی خوا، ئەو گوناهە گەورەوە بێ لێدەبووری بۆ کەسێ بیەوێ، ئەم ئایەتـەی دواوە تایبەتکـەری ئـەو ئایەتانەیـە کـە گشـتگیرن بـۆ تۆڵـە سـەندنەوە لەگوناهباران بەهۆی ئەو گوناهەی کەتۆڵە دێ بەشوێنیدا..

(٢) بۆ خوا هەیە پاداشی گوناهبار بداتەوەو تۆڵەی گوێڕایەڵ بدات وە ئێش و ئازار بچێژێ بەمنداڵ و ئاژەڵەکان، چونکە ئەمانە موڵکی خوان و خوایش بەئارەزووی خۆی چۆنی بوێ ئاوایان هەڵدەسوڕێنێ ، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەوە لەخوا ناوەشێتەوە، چونکە خۆی هەواڵی داوە کە گوێڕایەڵ پاداش دەداتەوە وگوناهبار تۆڵە دەدات، وەك لەپێشـەوە رابـوورد ئـازاری ئـاژەڵ و منـداڵ باسـی نـەهاتووە تەنـها لەباسـی تۆڵەسـەندنەوەدا نـەبێ، ئـەصڵیش ئەوەیـە کەنـەبێ، بـەڵام لـەبارەی حەقسـەندنەوەدا پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی: سوێند بەخوا مافی هـەموو کـەس دەدەنـەوە بەخاوەنەکـەی لەرۆژی قیامەتدا، هەتا لەشەکی شاخدار هەق دەسێندرێتەوە بۆ شەکی بێشاخ و کوڵ ئەم فەرموودە موسلیم ریوایەتی کردووە ، وە دەفەرموێ: هەق دەسێندرێتەوە لەخەڵك هـەندێکی لەهـەندێکی‌تری، هـەتا بێشـاخ هـەقی وەردەگیرێتـەوە لەشـاخدار وەهـەتا مێروله هەقی خۆی لەمێرولەکەی‌تر وەردەگرێتـەوە، وەهـەم دەفـەرموێ: سـوێند بـەخوا هەر شتێ لەرۆژی قیامەتدا دەبنە دوژمنی یەك و داوای هەقی خۆی دەکا تا بگاتە سەر دوو شەك داوای دادوەری دەکەن لـەوەیـدا کـە شـەڕە شاخیـان تێدا کردووە، ئەم دوو

قال المنذري في الاول رواته رواة الصحيح وفي الثاني اسناده حسن وقضية هذه الاحاديث ان لا يتوقف القصاص يوم القيامة على التكليف والتميز فيقتص من الطفل لطفل وغيره[1] {ويستحيل وصفه} سبحانه {بالظلم} لأنه مالك الأمور على الاطلاق يفعل مايشاء فلا ظلم في التعذيب والايلام المذكورين لوفرض وقوعهما[2].

{يراه} سبحانه {المؤمنون يوم القيامة} قبل دخول الجنة وبعده كما ثبت في احاديث الصحيحين الموافقة لقوله تعالى وجوه يومئذ ناضرة الى ربها ناظرة والمخصصة لقوله تعالى لا تدركه الأبصار اي لاتراه. منها حديث ابي هريرة ان الناس قالوا يارسول الله هل نرى ربنا يوم القيامة فقال رسول اله ﷺ هل تضارون في القمر ليلة البدر قالوا لا يارسول الله قال فهل تضارون في الشمس ليس درنها سحاب قالوا لا يارسول الله قال فانكم ترونه كذلك الخ. [3].

---

فەرموودەیە پێشەوا ئەحمەد ریوایەتی کردوون.

(١) المنذري: لەیەکەمیاندا دەڵێ:ریوایەتکەرەکانی ریوایەتکەری فەرموودەی پلە صەحیحن لەبارەی دوەمیشیانەوە دەڵێ: اسنادەکەی پلەی حەسەنی هەیە. ئەم فەرمووردانە ئەوە دەگەیەنن کەلەرۆژی قیامەتدا حەق سەندنەوە ناوەستێ لەسەر ئەوەی کەتەکلیف و تەمییز هەبێ، لەبەر ئەوە حەق لەمنداڵ دەسێندرێتەوە بۆ منداڵ و غەیری منداڵیش.

(٢) مەحاڵە وەصفدارکردنی خوا بەستەمکار چونکە خوا خاوەنی هەموو شتێکە بەگشتی، چونکە ستەم بەوەدەوترێ ماڵی غەیر بەکاربهێنێ، وەئەوەی ستەم دەکا چونکە محتاجە و پێویستی پێی هەیە، لەبەر ئەوە خوا چی بوێ ئەوە دەکا، ئیتر هیچ جۆرە ستەمێك نیە لەتۆڵەسەندنەوەو ئازاردانذا کەباسکران بۆ گوێرایەڵان و منداڵان گریمان ئەگەر شتێ‌وا رووبدا.

(٣) موسوڵمانان لەرۆژی قیامەتدا خوا دەبینن لەدوای چوونە بەهەشتەوە و پێش چوونە بەهەشت، وەك لەچەندەها فەرموودەدا ثابت بووە کە بخاری و موسلیم ریوایەتیان کردون هەماهەنگیش بۆ ئەم ئایەتەکە خوا دەفەرموێ: چەندەها دەم و چاو هەن شادمانن هەمیشە سەیری پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ئەم فەرموودەو ئایەتانە تایبەتکەری ئەم ئایەتن کە دەفەرموێ: چاوەکان خوا ئیدراك ناکەن واتە: نایبینن، - وابزانم ئەمەش دەگەیەنێ کە حەقیقەتی خوا دەرك ناکەن-یەکێکی‌تر لەو فەرموودانە ئەوەیە ئەبوهورەیرە ریوایەتی دەکا دەفەرموێ: خەڵك وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەرۆژی قیامەتدا خوای خۆمان دەبینین؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ئایا لەشەوی

وفيه أن ذلك قبل دخول الجنة وقوله تضارون بضم التاء والراء مشددة من الظرار ومخففة من الضير اي الضرر اي هل يحصل لكم في ذلك مايشوش عليكم الرؤية بحيث تشكون فيها كمايحصل في غير ذلك(١).وحديث صهيب في مسلم ان رسول اللهﷺ قال اذا دخل اهل الجنة الجنة يقول الله تبارك وتعالى تريدون شيئا ازيدكم فيقولون الم تبيض وجوهنا الم تدخلنا الجنة وتنجنا من النار فيكشف الحجاب فما اعطوا شيئا احب اليهم من النظر الى ربهم تعالى وفي رواية ثُمَّ تلا هذه الآية للذين احسنوا الحسنى وزيادة اي فالحسنى الجنة والزيادة النظر إليهِ تعالى ويحصل بان ينكشف انكشافا تاما ننزها عن المقابلة والجهة والمكان اما الكفار فلا يرونه يوم القيامة لقوله تعالى كلا انهم عن ربهم يومئذ لمحدوبون الموافق لقوله تعالى لا تدركه الابصار(٢).

چواردەدا هیچ شتێك ڕێتان لێدەگرێ مانگ ببینن؟ وتیان: نەخێر ، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لەڕۆژدا ئاسمان بێهەوربێ ڕۆژ نابینن؟ بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خودا! ، فەرمووی: دەی بێگومان ئێوە ئاوا خوا دەبینن... هتد

(١) ئەم بینینە پێش چوونە ناو بەهەشتە، وشەی :تضارون، بەضمەی تێو ڕێکە ئەوە سەرچاوەکەی دەبێ بە(ضراء) بەلام ئەگەر بەسوکی بخوێنرێتەوە سەرچاوەکەی (ضیر)دەبێ، هەرکامیان بێ ئەمە ماناکەیەتی، ئایا لەو بینینەدا شتێ بۆ ئێوە پەیدا دەبێ بینینتان بشێوێنێ؟ بەم شێوەیە لەو بینینە گومانتان هەبێ وەك لەغەیری ئەو جۆرە کاتانەدا پەیدا دەبێ.

(٢) ئەو فەرموودەیەش (صهیب) لەموسلیم ڕیوایەتی دەکاو دەفەرموێ: کاتێ دانیشتوانی بەهەشت دەچنە بەهەشت خوا دەفەرموێ: شتیترتان دەوێ بۆتان بکەم؟ ئەوانیش دەڵێن: بۆ دەم و چاومانت سپی نەکردووە؟! نەتخستینە بەهەشتەوە؟! لەئاگر ڕزگارت نەکردین؟! ئا لوم کاتەیەدا ئەو پەردەیەی وا لەنێوان خواو ئادەمیزاددا لادەدرێ، بەهەشتیەکان شتێکیان نەدراوەتێ بەلایانەوە شیرینتر بێ لە بینین و سەیر کردنی پەروەردگاریان لەڕیوایەتێکیتردا دەڵێ:پێغەمبەرﷺئەم ئایەتەیخوێندەوە: ئەوانەی چاکەیان کردووە خوا (الحسنی) وزیادەیان پێدەبەخشێ، (الحسنی) واتە: بەهەشت و زیادەیش واتە: بینینی خوا و سەیرکردنی. ئەم بینینە پەیدا دەبێ بەم شێوەیە بەتەواوەتی دەردەکەوێ، پاك و دوور لەوەی کەڕوبەڕوی خەڵك بێ یاجیهەتی هەبێ یاشوێنی هەبێ، بەلام بێباوەڕان لەڕۆژی قیامەتدا خوا نابینن چونکە خوا دەفەرموێ: بێباوەڕان لەو ڕۆژەدا بەپەردەیەك لەبینینی خوا بێبەش دەبن، ئەمەش هەماهەنگە بۆ ئەم ئایەتە دەفەرموێ:چاوەکان خوا ئیدراك ناکەن.

{واختلف هل تجوز الرؤية} له تعالى {في الدنيا} في اليقظة {وفي المنام} فقيل نعم وَ قيلَ لا اما الجواز في اليقظة فلانَّ موسى عليه السلام طلبها حيثُ قال﴿ رب ارني انظر اليك ﴾ وهو لا يجهل مايَجوزُ ويمتنع على ربه تعالى والمنع لان قومه طلبوها فعقبوا قال تعالى:﴿ فقالوا ارنالله جهرة فاخذتهم الصاعقة بظلمهم ﴾ (١).

واعترض هذا بان عقابهم لعنادهم وتعنتهم في طلبها لالامتناعها وأما المنع في المنام فلانَّ المرئي فيه خيال ومثال وذلك على القيدم محال والمجيز قال لا استحالة لذلك في لامنام وسكت المصنِّف عن الوقوع يدل على عدمه في اليقضه وهو قول الجمهور قوله تعالى لا تدركه الابصار وقوله لموسى لن تراني وقوله ﷺ لن يرى احد منكم ربه حتى يموت رواه مسلم في كتاب الفتن في صفة الدجال(٢).

---

(١) جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا کە ئایا بینینی خوا لەدونیادا بەچاوی سەر یا لەخەودا دروستەو دەگونجیٚ؟ جا هەندێ وتوویانە: بەڵێ دەگونجیٚو هەندێکیش وتویانە: دروست نیە و ناگونجیٚ، ئەوانەی کە ئەهلی سوننەن دەڵێن: بە ئاشکرا دروستە لەبەر ئەوەیە ، چونکە موسا پێغەمبەر داوای بینینی لەخوا کردوو وتی: پەروەردگارم خۆتم پیٚ نیشان بدە، بۆ ئەوەی سەیرت کەم، بێگومان موسا ئەوە نیە نەزانیٚ چی بۆ دروستە بۆ خوا و چیش نابیٚ بۆ خواو قەدەغەیە لەسەری. ئەوانەش کەموعتەزیلەن دەڵێن: بینین بۆ خوا نابیٚ، لەبەر ئەوە چونکە خزمەکانی موسا داوای بینینی خوایان کرد یەکسەر تۆڵەیان لیٚسەندرا، خوای گەورە دەفەرمویٚ: ئەمجار وتیان: ئەی موسا بەئاشکرا خوامان پیٚنیشان بدە، یەکسەر هەورە بزیسکەیەك دایگرتن و سوتاندنی بەهۆی ستەمکاریەکەیانەوە.

(٢) رەخنە گیراوە لەم کۆمەڵە کە تۆڵەیان لیٚگیراوە لەبەر دڵرەقی و کەللەشەقیان بووە،داوای بینینی خوایان کردووە، نەك لەبەر ئەوەی بینینیخوا قەدەغەیە، ئەوانەش کە دەڵێن:بینینی خوا لەخەویشدا نابیچونکە ئەوەی لەخەودا دەبینریٚ حەقیقەت نیە، بەڵکو خەیاڵ ونمونەیە، خۆبێگومان خەیاڵ ونمونە لەسەرزاتێك کەهەبوو بێت مەحاڵە. ئەوەش کە دەڵیٚ: دروستەو بەدروستی دەزانیٚ دەڵیٚ: ئەوە لەخەودا مەحاڵ نیە لەبەر ئەو هۆیە، دانەر بێدەنگ بوو لەو رووداوەی کەرویداوە یانە، ئەوەی دەلالەت دەکا لەسەر رونەدانی بەرونیو لەکاتی بەئاگابووندا-ئەمەش قەولیجەماوەری زانایانی ئەهلی سوننەیە-ئەم ئایەتانە کەخوا دەفەرمویٚ:چاوەکان ئیدراکی ناکەن، یابە موسا دەفەرمویٚ:هەرگیز نامبینی، پێغەمبەریش دەفەرمویٚ: کەسێك لەئێوە خوای خۆی نابینیٚ هەتا دەمریٚ، موسلیم لەباسی(الفتن)دا لەناونیشانی دەجالدا ریوایەتی کردوە .

نعم اختلفت الصحابة وقوعها له ﷺ ليلة المعراج والصحيح نعم واليه استند القائل بالوقوع في الجملة[١] لكن روى مسلم عن ابي ذر سألت رسول الله ﷺ هل رايت ربك قال رايت نورا وفي رواية نور انّى اراه! بتشديد نون انّى وضمير اراه لله اي حجبني النور المغشي للبصر عن رؤيته وقد ذكر وقوعها في المنام الكثير من السلف منهم الامام احمد وعلى ذلك لمعبرون للرؤيا وبالغ ابن الصلاح في انكاره لما تقدَّمَ في المنع[٢].

{السعيد من كتبه} اي الله {في لازل سعيدا} اي لا في غيره {والشقي عكسه} اي من كتبه الله في الازل شقيا لافي غيره {ثُمَّ لا يتبدلان} اي المكتوبان في الازل بخلاف المكتوب في غيره كاللوح المحفوظ قال تعالى ﴿ يمحوالله مايشاء ويثبت وعنده ام الكتاب ﴾ اي اصله لاذي لا يغير منه شيء كما قاله ابن عباس وغيره وفي جامع الترمذي حديث فرغ ربك من العباد فريق في الجنة وفريق في السعير[٣].

---

(١) بەڵێ: هاوەڵان کێشەیان هەیە لەبارەی ئەوەوە ئایا پێغەمبەرﷺ لەشەوی بڵندبوونەوەیدا خوای بینیوە؟ قەولی صەحیح دەڵێ: بەڵێ: بینیویەتی، ئەوەش کە دەڵێ دەگونجێ خوا لەدونیادا ببینرێ بەم بینینی پێغەمبەرە پشت ئەستوور بووە.

(٢) بەلام موسلیم لەئەبی زەڕەوە ریوایەتی کردووە کە دەڵێ پرسیارم کرد لە پێغەمبەرﷺ: ئایا پەروەردگاری خۆت بینی؟ فەرمووی:نورم بینی لەریوایەتێکیتردا دەڵێ: نورە ئیتر چۆن من نور دەبینم؟ واتە: ئەو نورەی بینایی چاو دادەپۆشێ نەی هێشت ببینم زۆرێك لەزانایانی سەردەمی پێشین باسی رودانی شتیوآیان کردووە لە خەودا، یەکێ لەوانە پێشەوا ئەحمەد، هەرلەسەرئەو راوبۆچونەن زۆرێك لە زانایانەیکە خەولێك دەنەوە (ابن الصلاح)زۆر رۆچووە لەباوەڕنەبون وئینکارکردنی بینینی خوادا لەبەر ئەو هۆیانەی رابوورد لەلایەن ئەوانەوە دەڵێن: نابێ و نەگونجاوە خوا ببینرێ .

(٣) بەختەوەر کەسێکە هەر لەئەزەلدا خوا بەبەختەوەری نوسیبێ نەك لەغەیری ئەزەلدا، بەدبەختیش کەسێکە هەر لەئەزەلدا خوا بەبەدبەختی نوسیبێ نەك لەغەیری ئەزەلدا، پاشان ئەو دوو نوسراوەی ئەزەلە گۆڕانکاریان بەسەردا نایێ، بەلام ئەو نوسراوەی لەغەیری ئەزەلدا نوسراوە ئەگونجێ گۆڕانکاری بەسەردا بێ، وەك (لوح المحفوظ) ، خوای گەورە دەفەرموێ: خوا هەر شتێکی بوێ دەیکوژێنێتەوە ئەوەی شی بیەوێ دەیهێڵێتەوە، وەسەرچاوەو ئەصلەکەی کەگۆڕانکاری بەسەردا نایە ئەوە هەر بەلای خۆیەوەیە، وەك (ابن عباس) و غەیری ئەودا وتویانە: لە (جامع الترمذي)دا دەفەرموێ: خوای گەورە لەکاوباری کۆتایی بەندەکانی بوەتەوە گروپێکیان بەهەشتین و گروپێکیان دۆزەخین .

{ومن علم} اي الله {موته مؤمنا فليس بشقى} بل هو سعيد وان تقدَّمَ منه كفرو وقد غفر ومن علم موته كافرا فشقى وان تقدَّمَ منه ايمان وقد حبط وفي قول للاشعرى تبين انه لم يكن ايمانا فالسعادة الموت على الايمان والشقاوة الموت على الكفر ويترتب على الاولى الخلود في الجنة وعلى الثانية الخلود في النار قال تعالى واما الذين سعد وافقي الجنة خالدين فيها وقال فاما الذين شقوا ففي النار لهم فيها زفير وشهيق خالدين فيها[1] {وابو بكر} ﷺ {مازال بعين الرضا} منه تعالى كما قال الاشعري وان لم يتصف بالايمان قبل تصديقه النبيِّ ﷺ لانه لم يثبت عنه حالة كفر كما ثبت عن غيره ممن آمن[2] {والرضا والمحبة من الله غير المشيئة والارادة} منه فان معنى الاولين المترادفين أخص من معنى الثانيين المترادفين اذا الرضا الارادة من غير اعتراض والاخص غير الاعم[3].

(١) کەسیٚ خوای گەورە بزانیٚ کە بەئیمانداری دەمریٚ، ئەوە بەدبەخت نیە ، نەك ئەوەش بەڵکو بەختەوەرە، هەرچەندە پێش مردنەکەی کوفریشی بەسەردا هاتبیٚ ئەوە بێگومان خوا لیٚی خۆشبووە، کەسیٚ خوا بزانیٚ کە بەکافری دەمریٚ ئەوە بەدبەختە و عاقبەت شەڕە، ، هەرچەندە ئیمانیشی بەسەردا تێپەڕ بوبێت ئەوە خوا پوچەڵی کردۆتەوە. بەڵام قسەکەرێکی ئەشعەری هەیە دەڵیٚ: ئێستە دەرکەوتووە کەهەر باوەڕو ئیمانی نەبووە،بەکورتی بەختەوەر ئەوەیە لەسەر ئیمانداری بمریٚ و بەدبەختیش ئەوەیە لەسەر کوفرو بیٚباوەڕی بمریٚ، سەرەنجامی یەکەمیان نەمری و هەتاهەتاییە لەبەهەشتدا، وەسەرەنجامی دووەمیشیان نەمری و هەتاهەتاییە لەدۆزەخدا، خوای گەورە دەفەرمویٚ: بەڵام ئەوانەی کەبەختەوەرن ئەوەلەبەهەشتدا نەمرن، هەتاهەتاین، ئەوانەش کەبەدبەخت و نەگبەتی هەمیشە لەئاگردان ، لەو ئاگرەدا هەناسەدان و دانەوەیان بۆ هەیەو نەمرن و هەتا هەتاین تێیدا.

(٢) ئەبوبەکری صدیق خوای لیٚرازی بێت خوا هەر بەچاوی رەزامەندییەوە سەیری کردووە، وەك ئەشعەری وتوویەتی: هەرچەند ئیمانهێنانی بەپێغەمبەرﷺ بەئیماندار حسێب نەکرابیٚ-چونکە حاڵەتی کوفرو بتپەرستی نەبووە- بەڵام حاڵ'تی نەزانینی بووە، بەڵام جگە لەئەبوبەکر ئەوانیتریان حاڵەتی بتپەرستیان هەبوە و ئەمجار باوەڕیان هێناوە.

(٣)رەزاومەحەببەتی خوا غەیری مەشیئەو ئیرادەیەتی- واتە خۆشەویستیورەزامەندی خوا بۆ شتیٚ مانای وانیە ئارەزویشی لەسەرە-چونکە ماناو واتای دوولەفظە هاوتاکە تایبەت ترە، لەوماناو واتای لەفظی دوهەمە کەهاوتای یەکن، چونکە رەزامەندیویست

{فلا يرضى لعباده الكفر} مع وقوعه من بعضهم بمشيئته {ولو شاء ربك مافعلوه} وقالت المعتزلة الرضا والمحبة نفس المشيئة والارادة[1]{هو الرزاق} كما قال تعالى ان الله هو الرزاق اي فلا رازق غير وقالت المعتزلة من حصل له الرزق بتعب فهو الرازق لنفسه او بغير تعب فالله هو الرازق له [2]{والرزق} بمعنى المرزوق {ما ينتفع به} في التغذي وغيره {ولو} كان {حراما} بغصب او غيره خلافاً للمعتزلة في قولهم لا يكون الاحلالا لاستناده الى الله في الجملة والمستند إليه لانتفاع عباده يقبح أن يكون حراما يعاقبون عليه. قُلْنا لا قبح بالنسبة إليه تعالى يفعل مايشاء وعقابهم على الحرام لسوء مباشرتهم اسبابه [3].

وئیرادەیەکی بێڕەخنەیە، بەڵام محەبەت مەرج نیە مەشیئەتێکی بێ ڕەخنە بێ، بێگومان کەتایبەت و گشتگیریش لەیەك جیان.

(١) لەبەر ئەوە خوا رازی نابێ بەکوفری بەندەکانی لەگەڵ ئەوەشە بەمەشیئەت و ویستی خۆی لەهەندێکیانەوە ڕویداوە، چونکە خوا دەفەرموێ: گریمان ئەگەر پەروەردگار بیویستایە ئەوەیان نەدەکرد، موعتەزیلە دەڵێن: ڕەزاو مەحەببەت هەر خودی ویست و ئیرادەیە، -دەڵێن: بێباوەڕی کافر مادەم بەرەزامەندی خوانیە ئیرادەو ویستی خوایشی لەسەر نیە-.

(٢) هەر خوا ڕۆزی دەبەخشێ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: بێگومان هەر تەنها خوا ڕۆزی بەخشە، واتە جگە لەو ڕۆزی بەخش نیە، موعتەزیلە وتویانە: ڕۆزی دووجۆرە: ١-کەسێ بێئەوەی هیچ جۆرە ماندوبونێکی توش بێ ئەوە خوا ڕۆزی دەریەتی، ٢- ئەوەش بەهۆی ماندوبونی خۆیەوە ڕۆزی پەیدا دەبێ ئەوە خۆی ڕۆزی دەری خۆیەتی.

(٣) رزق بەمانا ڕۆزیە بەخشێنراوەکەیە کە بریتیە لەوەی سودی لێوەربگیرێ چ خواردن بێ یاغەیری خواردن بێ باحەرامیش بێ، بەهۆی داگیر کردنەوە یاسووەو پەیدابوبێ، بەپێچەوانەی موعتەزیلە کە دەڵێن: رزق هەر دەبێ حەلاڵ بێ ئەمجار پێی دەوترێ: رزق، چونکە ئەدرێتە پاڵ خوا، هەندێکی واتە: ئەوەی بێ ماندویەتی خۆی پەیدا دەبێ، شتێکیش بدرێتە پاڵ خوا بۆسودمەندی بەندەکانی بێ ناشیرینە بوترێ حەرامە، تۆڵەی لەسەردەسێنرێ، ئێمەیش دەڵێن: هیچ ناشیرین نیە بدرێتە پاڵ خوا، چونکە خوا ئەوەی بیەوێ دەیکا، کەتۆڵەشیان لێدەستێنێ لەسەر ئەوەیە بەخراپ هۆکاری رزقەکەیان وەگەڕخستووە.

ويلـزم المعتزلـة أن المتغـذي بـالحرام فقـط طـول عمـره لم يرزقـه الله أصــلا وهــو مخالف لقوله تعالى:﴿ ومامن دابة في الارض إلاّ على الله رزقها ﴾ لانه تعالى لايترك ما اخبر بانه عليه[١]. {بيده} تعالى {الهداية والاضلال} وهو الكفر {و} خلق {الاهتداء وهو الايمان} قال تعالى:﴿ ولوشاء الله لجعلكم امة واحد ولكن يضل من يشاء ويهدي من يشاء﴾﴿ من يشأ الله يضله ومن يشأ يجعله على صراط مستقيم ﴾ وزعمت المعتزلة انهما بيد العبد يهدي نفسه ويضلها بناء على قولهم انه يخلق افعاله[٢].

{والتوفيـق خلـق القـدرة والداعيـة الى الطاعـة وقـال امـام الحرمـين خلـق الطاعـة والخذلان ضده} فهو خلق القدرة على المعصيـة والداعيـة اليـها او خلـق المعصيـة {واللطف مايقع عنده صلاح العبد آخرة} بان تقع منه الطاعة دون المعصية [٣].

(١) ئەمەش بەخراپ دێتـە سـەرموعتەزیلە کـە کەسـێ بـەدرێژایی ژیـانی حـەرامی خواردبێ دەبـێ بوتـری ئەصڵـەن خـوا رزقـی ئـەم کەسـەی نـەداوە، لەگـەڵ ئـەوەش پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ئـەوەی لـەزەویدا بجوڵێتـەوە رۆزی لەسـەر خوایە، چونکە خوای گەورە خۆ نابێ واز لەشتێ بهێنێ بڕیارو هەواڵی دابێ لەسەر خۆیەتی و ئێستەش لێی پاشگەزبێتەوە.

(٢) هـەر بەدەسـتی خوایـە رێنمـایی کـردن و گومڕاکـردن ، هـەردوکیان بریتـین لـە دروستکردنی گومڕایـی کـە کوفـرو بێباوەڕیـە، وەدروسـتکردنی رێنمـایی وەرگرتـن کەباوەڕو ئیمانە، خوا دەفەرموێ:ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی دەکردە یەك گەل و یەك ئەهلی باوەڕ، بەڵام خوا کێی بوێ گومڕای دەکاو کێی بوێ رێنمایی دەکا... یاخود دەفەرموێ:خوا بیەوێ کەسێ گومڕا بکا دەیکا و بیەوێ کەسیچ بخاتـە سـەر رێگـای راست دەیخا، موعتەزیلە وایان زانیوە رێنمایی کردن و گومڕایی کردن هـەردوکیان بەدەسـت مـرۆڤ خۆیـەتی مـرۆڤ خـۆی خـۆی گومـڕا دەکـاو رێنمـایی دەکـا، ئـەم بۆچوونەیان لەو یاسایەی خۆیانەوە دروست بووە کەدەڵێ: مرۆڤ خۆی بەدیهێنەری کردارەکانیەتی .

(٣) توفیق بریتیـە لەدروست کردنـی تواناو هـۆی داخـوازی کـەر بـۆ گوێڕایـەڵی و خواپەرستی ، (امام الحرمین) دەڵێ: توفیق هـەر خودی گوێڕایەڵیـە کـە یـە نەدروست کردنی هۆکانی. (خوذلان) دژی توفیقە ، واتە: دروستکردنی توانا لەسەر تاوانکردن دەسـتگرتنی بـۆ لای گوناهــە ، یـا خـود دروسـتکردنی خـودی گوناهەکەیــە ، لطف بریتیە لـەوەی ئادەمیزاد پێی صـەلاح بێ لەکۆتاتەمەنیدا واتـە گوێڕایـەڵی بکا، نەك بێفەرمانی .

{والختم والطبع والأكنة} الواردة في القرآن نحو ختم الله على قلوبهم. طبع الله عليها بكفرهم. جعلنا على قلوبهم اكنة أن يفقهوه عبارات عن معنى واحد وهو {خلق الضلال في القلب} كالاضلال[1] {والماهيات} للممكنات اي حقائقها {مجعولة} بسيطة كانت او مركبة اي كل ماهية بجعل الجاعل وَ قِيلَ لا مطلقاً بل كل ماهية متقررة بذاتها {وثالثها} مجعولة {ان كانت مركبة} بخلاف البسيطة[2]. {ارسل الرب تعالى رسله} مؤيدين منه {بالمعجزات الباهرات} اي الظاهرات {وخص محمدا ﷺ} منهم {انه خاتم النبيين} كما قال في كتابه المبين ولكن رسول الله وخاتم النبيين {المبعوث الى الخلق اجمعين}[3].

---

(١) (ختم و طبع و اكنة) هەرسێکیان لەقورئاندا هاتووە وە بریتین لەیەك مانا دروستکردنی گومڕاییی‌یە لەدڵدا وەك گومڕاکردن ، خوای گەورە دەفەرموێ: خوای گەورە مۆری ناوەبەسەر دڵەکانیاندا، دەفەرموێ:خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا بەهۆی بێ‌باوەڕییانەوە، دەفەرموێ: ئێمە مۆرمان بەسەر دڵەکانیاندا ناوەو دروست کردوە ئیتر ناتوانێ لەدینی خوا حاڵیی ببن.

(٢) هەرچی ماهیەت و حەقیقەتی ممکنات و دروستکراوەکان هەیە دروستکراوە لەلایەن خواوە دوای ئەوەی نەبوونی بەسەردا هاتووە ئەو حەقیقەتە چ بەسیط یاخود مرکب بێت، واتە هەموو حەقیقەتێك بەهۆی کردەوەو دروستکردنی بکەرو دروستکەرێکەوە پەیدا بووە. هەندێك دەڵێن: نەخێر وانیە، چ بەسیطٔ یاخود مرکب بێت، بەڵکوو هەموو ماهیەتێك بەهۆی خودی خۆیەوە هەیە، قەولی سێهەم دەڵێ: هەموو ماهیەتێك دروست بوون ڕووی تێ‌کردووە، ئەگەر مرکب بێت بەڵام ئەگەر بسیط بێت وانیە، ئەم سێ قەولە زۆر جیاوازیان نیە ، چونکە (جعل) بۆ شتێکی دەرەکی دەبێت، دەبێ بوونی هەبێ ڕوو لەنەبوونی ناکا وەك عەنقا، ماهیەتیش کوللیە ، شتێکی دەرەکی نیە، جعل ڕوو لەذاتی ماهیەت ناکا، ئەگەر ڕوی تێ‌بکا بەئیعتباری وجودەکەیە، ئەگەر وترا: ماهیەت مجهولە ، واتە خوا وجود و بوونی بۆ دروست دەکا، وەئەگەر وترا ماهیەت مجهول نیە واتە خودی ماهیەت بەئیعتباری ذاتەکەی‌بوونی دەرەکی نیە، کەوابوو مجهول نیە.

(٣) خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە پشتگیرو بەهێزی کردوون بەم چەندەها موعجیزەو دەستەوسان کەرن ڕوون و دیارن، بەڵام خوای گەورە لەناو پێغەمبەراندا (محمد)ی تایبەتمەند کردووەبەهەندێ صیفەت کەلەواندا نیە: ١-محمدﷺ زنجیرەی پێغەمبەرانی پێ‌کۆتا هێنراوە، وەك خوا دەفەرموێ: بەڵام محمد پێغەمبەری خوایەو

كما في حديث مسلم وارسلت الى الخلق كافّة وفسر بالانس والجن كما فسر بهما من بلغ في قوله تعالى:﴿ واوحى الى هذا القرآن انذركم به ومن بلغ ﴾ اي بلغه القرآن والعالمين في قوله تعالى نـزل الفرقـان علـى عبـده ليكـون للعـالمين نذيـرا وصـرح الحليمـي و البيهقي في الباب الرابع من شعب الايمـان بانـه عليـه الصلاة والسلام لم يرسـل الى الملائكة وفي الباب الخامس عشر بالنفكاكهم من شرعه وفي تفسيري الامـام الـرَّازي والبرهان انسفي حكاية الاجماع في تفسير الآية الثانية على انه لم يكن روسلا اليهم {المفضل على جميع العالمين ي من الانبياء والملائكة وغيرهم فلا يشركه غيره من الانبياء فيما ذكر[1]. {وبعده} في التفضيل {الانبياء ثُمَّ الملائكة عليهم السلام ي فهم افضل من البشر غير الانبياء[2]. {والمعجزة} المؤيد بها الرسل {امر خارق للعادة} بان يظهر على خلافها كاحياء ميت واعدام جبل وانفجار الماء من بين الاصابع(٣).

---

كۆتا هێنەرە بەهەموو پێغەمبەران. ٢-محمد نێرراوە بۆ ئادەمیزاد وجنۆ هەموویان،

(١) وەك لەو فەرموودەیەدا كە موسلیم ریوایەتی دەكاو دەفەرموێ: من نێرروام بۆ دروستكراوەكان هەر هەموویان، ئەمە لێك دراوەتەوە بەئادەمیزادو جنۆ وەك وشەی (من بلغ) لەئایەتەكەدا بە ئادەمیزادو جنۆ لێك دراوەتەوە، دەفەرموێ: من ئەم قورئانەم بەوەحی بۆ نێرراوە بۆ ئەوەی بەهۆی قورئانەوە ئاگادارتان بكەمەوە، ئەوەش كە ئەم قورئانەی پێ'دەگا. یاخود وشەی (العالمین) بەئادەمیزاد وجنۆ لێك دراوەتەوە لەم ئایەتەشدا كە دەفەرموێ: خوای گەورە ئەم قورئانە جیاكەرەوەیەی ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆی بۆ ئەوەی بۆ هەموو عالەم ئاگاداركەرەوە بێ، اعلیمی و بیهقی لەبەشی چوارەمدا لە كتێبی(شعب الإیمان) دا بەڕوونی وتویانە: كە محمد پێغەمبەر بۆ مەلائیكە نەنێرراوە، وەلەبەشی پانزەدا دەڵێ: مەلائیكە لەشەرع و ڕێبازی (محمد) جیاكراونەتەوە. لەهەردوو تەفسیری رازی و نەسەفیدا باس لە ئیجماع دەكەن لەسەر ئایەتە دوهەمینەكە كە محمدﷺ پێغەمبەری مەلائیكە نیە، ٣-محمدﷺ فەزڵی دراوە بەسەر هەموو عالەمیاندا ئیتر پێغەمبەر بن یا مەلائیكە یاغەیری ئەوان، لەبەر ئەوە حەزرەتی محمد هیچ پێغەمبەرێك لەم سێ صیفەتەدا هاوكاری نین .

(٢) لەفەزڵ وگەورەییدا دوای پێغەمبەر پێغەمبەرەكانیتر، پاش ئەوان مەلائیكەكان -درودیخوایان لەسەربێ- ئەمانیش لەبەشەرگەورەترن بێ'پێغەمبەرەكان.

(٣)موعجیزەودەستەوسانكەرێك پێغەمبەرانی پێ'بەهێز بكرێ بریتیە لەكارێك كە سنوری عادەت بشكێنێ بەم شێوە بەپێچەوانەی عادەتەوە دەركەوێ، وەك زیندو كردنەوەی مردو، شاخێك ببرێتە نەبونەوە، یائاو هەڵقوڵاندنی لەنێوان پەنجەكانیەوە.

{مقرون بالتحدى} منهم{مع عدم المعارضة} من المرسل اليهم بان لا يظهر منهم مثل ذلك الخارق {والتحدى الدعوى} للرسالة فخرج غير الخارق كطلوع الشمس كل يوم والخارق من غير تحد وهو كرامة الولى والخارق المتقدم على التحدي والمتأخرُ عنه بما يخرجه عن المقارنة العرفية وخرج السحر الشعبذة من المرسل اليهم اذ لا معارضة بذلك[1].

{والايمان تصديق القلب} اي بما علم مجيء الرَّسُول به من عند الله ضرورة اي الاذعان والقبول له والتكليف بذلك وان كان من الكيفيات النفسانية دون الافعل الاختيارية بالتكليف باسبابه كالقاء الذهن وصرف النظر وتوجيه الحواس ورفع الموانع[2].

(١) وەدەبێ هاوکات و هاوجوتی بەرەنگاری بەگژاچوونیان بێ -ادعای پێغەمبەرایەتی- لەگەڵ ئەوەش ئەوانەی ئەم پێغەمبەرەیان بۆ نێرراوە کەسیان نەتوانێ نەیاری و بەرامبەری بکا، واتە نموونەی ئەم موعجیزەیە لەوەوە دەرنەکەوێ و دیار نەبێ و زاڵ نەبێ، تحدّی واتە: لەگەڵ ئەوەش بانگەوازی پەیامداری بکا، لەبەر ئەوە کارێك کەسنوری عادەت نەشکێنێ لەم پێناسەیە چووەدەر، وەك هەڵهاتنی رۆژ هەموو رۆژێك، وەهەروەها کارێکیش چووەدەر عادەت شکێنبێ بەلام بێئەوەی بانگەوازیی پەیامداری بکا، ئەوەش ئەو کاتە رێزو کەرامەتی خوایە بۆ پشتگیرانی خۆی ، وەهەروەها شتێکی عادەت شکێنیش چوویەدەر کە پێش لەبانگەوازی پەیامداریی بووبێ، هەروەها ئەوەش پاش ئیدعای پەیامداری یوە بەرپا بووبێ واتە: دوای مردنی ئەم پێش و پاش بانگەوازیی پێغەمبەرایەتییە بەوە دەبێ، کە لەهاوکاتی عورفی پێغەمبەرایەتیەکەی دەری بکا، هەروەها سیحرو چاوبەس و شەعوەزەو چوست و چالاکیەك لەلایەن ئەوانەوە پێغەمبەرەکەیان بۆ نێرراوە چویە دەر چونکە بەوانە نەیاری بەرامبەر خەڵك ناکرێ.

(٢) ئیمان وباوەڕ بریتیە لەوەی دڵباوەڕی هەبێوبەڕاستی بزانێ ئەوەی کە زانراوە پێغەمبەری پێهاتووە، لەلایەن خواوە ئەوەی بەڵگە نەویستە هەموو کەس پێغەمبەر هێناویەتی، واتە: تصديق بەمانا ئیزعان و تەرجیح دان، وەقەبوڵ کردنیش بریتیە لەیەکێك لەو دووبەشەی عیلم لە کەیفیەی نەفسانیە، هەرچەندە تەکلیف بەوەکراوە لەکەیفیەتی نەفسانیە نەك کاری ئیختیاری لەبەر ئەوەی چونکە تەکلیف بەاسباب و هۆکاری تصديق کراوە، وەك زیهن پێدان و تێرامان و بیروباوەڕ ئالوگۆڕکردن و رێنمایی هەستەکان و بەگەڕخستنیان و لابردنی ئەوانەی رێگرن لەڕێی باوەڕهێناندا.

{ولا يعتبر} التصديق المذكور في الخروج به عن عهدة التكليف بالايمان {الا مع التلفظ بالشهادتين من القادر} عليه الذي جعله الشارع علامة لنا على التصديق الخفي عنا حتى يكون المنافق مؤمنا فيما بيننا كافرا عندالله قال تعالى:﴿ ان المنافقين في الدرك الاسفل من النار ولن تجدلهم نصيرا ﴾[١]{وهل التلفظ} المذكور {شرط} للايمان {او شطر} منه {فيه تردد} للعلماء {والاسلام اعمال الجوارح} من الطاعات كالتلفظ بالشهادتين والصلاة والزكاة وغير ذلك {ولا تعتبر} الاعمال المذكورة في الخروج بها عن عهدة التكليف بالاسلام {الامع الايمان} اي التصديق المذكور[٢].

{والاحسان ان تعبدالله كأنك تراه فان لم تكن تراه فإنَّهُ يراك ي كذا في حديث الصحيحين المشتمل على بيان الايمان بان تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره [٣].

---

(١) ئەو تصديق و باوەڕەی کەباسکرا هیچ ئەرزشێکی نیە بۆ ئەوەی لەوتەکلیف بەئمانە رزگاری بێ ولێ دەرچێ مەگەر لەگەڵ وتنی هەردوو گەواهیدانەکە نەبێ، لەلایەن کەسێکەوە کەتوانای وتنیان هەبێ، چونکە شارع ئەو وتنەی کردوەتە نیشانە بۆ ئێمە، بۆ ئەوەی ئەو باوەڕو تصدیقەی لەئێمە شاراوەیە بەوە بیزانین بۆ ئەوەی مرۆڤی دورو و لەنێوان خۆماندا مامەڵەی باوەڕداری لەگەڵدا بکەین، هەرچەندە بەلای خواوە کافرو بێباوەڕە ، خوای گەورە دەفەرموێ: بێگومان ئەو منافق و دوڕووانە لەناو پلەی هەرە خواری ناو ئاگری دۆزەخدان و هەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت بێتە یارمەتیدەریان .

(٢) ئایا وتنی دووشەی شایەتومان مەرجی ئیمان و باوەڕە یاخود نیوەیەتی؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا زانایان ڕاڕاو دوو دڵن، -جەماوەری زانایان دەڵێن: مەرجی ئیمانە کەواتە مەرجە بۆ جێبەجێکردنی ئەحکامی موسوڵمانان لەدونیادا، بەلای قەولی دووهەمەوە هەرکەس بەدڵ باوەڕی هەبێ پێش ئەوی شایەتومان بێنی ئەوە بەکافری مردووە- ئیسلام بریتیە لەکرداری ئەندامەکان، ئادەمیزاد لەوانەی پێیان دەگوترێت گوێڕایەڵی وەك وتنی شایەتومان و نوێژو زەکات و شتەکانیتر ، ئەو کردارانەی کەباسکران کاتێك کەتەکلیف پێیان دەردەچێ کە لەگەڵ باوەڕدابن و دڵ بەڕاستیان بزانێ .

(٣) ئیحسان ئەوەیە وا خواپەرستی بکەی وەك ئەوەی کە دەیبینی، چونکە ئەگەر تۆ خوا نەبینی ئەوە بێگومان ئەو تۆ دەبینێ، لەوەی فەرموودەی بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەکەن وەها هاتووە کەداگرەندەشە بەسەر بەیانی باوەڕو ئیماندا دەفەرموێ:

و بيان الاسلام بأن تشهد أن لا اله إلاّ الله وأن محمد رسول الله وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت ان استطعت إليه سبيلا هذا اللفظ رواية مسلم وفيها تقديم الاسلام على الايمان عكس رواية البخاري التي تبعها المصنّف لانها على ترتيب الواقع وتأخير الاحسان عنهما وهو مراقبة الله تعالى في العبادة الشاملة لهما حتى تقع على الكمال من الاخلاص وغيره لانه كمال بالنسبة اليهما[1].

{والفسق} بأن ترتكب الكبيرة {لا ينزل الايمان} خلافاً للمعزلة في زعمهم انه يزيله بمعنى انه واسطة بين الايمان والكفر بناء على زعمهم أن الاعمال جزء من الايمان[2].

{والميت مؤمنا فاسقا} بان لم يتب {تحت المشيئة اما ان يعاقب} بادخاله النار {ثُمَّ يدخل الجنة} لموته علي الايمان[3]...

---

ئەوەیە باوەڕبهێنی بەخواو مەلائیکەکانی خواو پەیامەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی زیندوبوونەوەو قەدەر و نەخشەی خوایی چاك بێ بەنیسبەت تۆوە یا خراپ بێ.

(١)هەروەها باسی ئیسلامی تێدایە دەفەرموێ: ئەوەیە گەواهی بدەی کەجگە لە(الله) کەس پەرستراوی بەهەق نیە، ومحمدیش پەیامبەری خوایە نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر لەڕووی ڕێگە برینەوە توانات هەبێ، بەم لەفظە موسلیم ریوایەتی کردووە لەریوایەتی موسلیمدا بەیانی ئیسلام پێش ایمان خراوە، بەپێچەوانەوە ریوایەتەکەی بوخاری کە دانەر شوێن ئەوکەوتووە،چونکە ریوایەتیبوخاری لەسەر تەرتیبیواقعە، دەبێ بنەڕەت هەبێ ئەمجار دیوار دروست دەکرێ، لەهەردوکیاندا باسیئیحسان دواکەوتوە کەبریتیە لەوەی کە واهەست بکا لەبەردەم هەردوو دەستی خوادا وەستاوە، وەخوا چاوی لێدەکاو لەپەرستشەکەیدا کە هەردوکیان دەگرێتەوە، وەئیسلام و ئیحسانیش بۆ ئەوەی وابەندایەتیەکە بکا کە تەواو ئیخلاص و دڵسۆزیو خۆشەویستی خوای هەیە، بۆیە دواش خراوە چونکە ئیحسان پلەیکەماڵوتەواویە بەگوێرەی ئیمان و ئیسلامەوە

(٢) فیسق کە کردنی گوناهی گەورەیە ئیمان و باوەڕ لانابا و نایسڕێتەوە بەپێچەوانەی موعتەزیلەوە بەگوێرەی بیری خۆیان دەڵێن: گوناهی گەورە ئیمان لادەبا، بەم مانایە ئەوەی گوناهی گەورە دەکا دەکەوێتە نێوان ئیمان و کوفرەوەئەمەش لەسەر ئەو قسەی خۆیانە کەدەڵێ: کردار بەشێکە لەئیمان و باوەڕ.

(٣) کەسێ بمرێ باوەڕداربێ بەڵام فاسیق بێ تەوبەی نەکردبێ ئەوە دەکەوێتە ژێر ویست و ئارەزوی خواوە ، یاتۆڵەی ئەداو ئەیخاتە ناو دۆزەخەوە پاشان دەیخاتە ناو بەهەشتەوە، لەبەر ئەوەی باوەڕدار بووە.

..{واما ان يسامح} بان لا يدخل النار {بمجرد فضل الله او} بفضله {مع الشفاعة} من النبيِّ ﷺ قال القاضي عياض وغيره او ممن يشاء الله وتردد النوي في ذلك قال والد المصنِّف لانه لم يرد تصريح بذلك ولا بنفيه قال وهي في اجازة الصراط بعد وضعه ويلزم منها النجاة من النار وزعمت المعتزلة انه يخلد في النار ولا يَجوزُ العفو عنه ولا الشفاعة فيه[1].

{واول شافع واولاه} يوم القيامة {حبيب الله محمد المصطفى ﷺ} قال ﷺ انا اول شافع واول مشفع رواه الشيخان وهو اكرم عند الله من جميع العالمين وله شفاعات أعظمها في تعجيل الحساب والاراحة من طول الوقوف وهي مختصةبه. الثانية في ادخال قوم الجنة بغير حساب قال النووي وهي مختصة به ايضا وتردد ابن دقيق العيد في ذلك ووافقه والدالمصنف وقال لم يرد فيه شيء. الثالثة فيمن استحق النار كما تقدم[2]..

(١) یاخود چاوپۆشی لێدەکا و نایخاتە ناو ئاگرەوە تەنها لەبەر فەزڵ و گەورەیی خۆی یاخودو بەهۆی فەزڵی خواوە لەگەڵ تکاو لاڵەی پێغەمبەرﷺ ، قاضی عیاض وتویەتی: یاخود تکای کەسێ کەخوا بیەوێ، نەوەوی لەوەدا دوو دڵ بووە، باوکی دانەر وتویەتی: چونکە ئەوە کەس نەی وتوە و کەسیش نەفی نەکردووە. شەفاعەت و تکا کردن بۆ تێپەڕبوونە بەسەر پردی صیراطدا دوای دانانی، هەرکەسێکیش تێپەڕی کرد بەسەریا مانای وایە رزگاری بووە لەئاگری دۆزەخ موعتەزلە وتویانە: مادەم تۆبەی نەکردووە لەدۆزەخدا هەر دەمێنێتەوە، نابێ عەفو بکرێ و ناشبێ شەفاعەت و تکای بۆ بکرێ.

(٢) یەکەم کەس کەتکاو لاڵە بکا و شایەستەترین کەس بەو تکا و لاڵەیە خۆشەویستی خوایە حەزرەتی محمدﷺ ، چونکە دەفەرموێ: من یەکەم کەسم کەتکا کەرم و یەکەم کەسیشم تکام لێقەبوڵ دەکرێ بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، پێغەمبەر ﷺ رێزدارترین کەسە بەلای خواوە لەناو هەموو عالەمدا، پێغەمبەرﷺ چەندەها جۆر تکاو لاڵەی بۆ هەیە،: لەهەموویان گرنگتر ئەوەیە تکا دەکا بۆ ئەوەی حیساب و لێکۆڵینەوە زوو بکرێ و خەڵك رزگاریان بێ لەو کاتە زۆرەی وەستان ئەو تکایەش تەنها تایبەتە بە پێغەمبەرەوە. ٢-بۆ ئەوەیە کۆمەڵێك بخرێتە بەهەشت بێلێپرسینەوە، نەوەوی دەڵێ: ئەمەش هەر تایبەتە بە پێغەمبەرەوە.... ابن دقیق العید عەودالە لەوەدا و باوکی دانەریش هامدەنگیەتی وەدەڵێ: هیچ شتێك لەبارەیەوە نەهاتووە. ٣- بۆ ئەوانەیە شایستەی ئاگرن وەك لەپێشەوە رابوورد .

الرابعة في اخراج من ادخل النار من الموحدين ويشاركه فيها الانبياء والملائكة والمؤمنون الخامسة في زيادة الدرجات في الجنة لأهلها وجوز النووي اختصاصها به[1].

{ولا يموت احد إلاّ بأجله} الوقت وهو الذي كتب الله في الازل انتهاء حياته فيه بقتل أو غيره وزعم كثير من المعتزلة ان القاتل قطع بقتله اجل المقتول وانه لو لم يقتله لعاش اكثر من ذلك {والنفس باقية بعد موت البدن} منعمة او معذبة {وفي فنائها عند القيامة تردد} قيل تفني عند النفخة الاولى كغيرها {قال الشيخ الامام} والد المصنّف {والاظهر} انها {لاتفنى ابدا} لان الاصل في بقائها بعد الموت استمراره[2].

{وفي عجب الذنب} بفتح العين وسكون الجيم هل يبلي {قولان} المشهور منهما انه لا يبلي لحديث الصحيحين ليس من الانسان شيء إلاّ يبلي الاعظما واحد وهو عجب الذنب منه يركب الخلق يوم القيامة وفي رواية لمسلم كل ابن آدم يأكله التراب إلاّ عجب الذنب منه خلق ومنه يركب[3].

---

(١) ٤-بۆ ئەوانەیە خراونەتە دۆزەخ لەیەکتاپەرستان، لەم جۆرەیاندا پێغەمبەران و مەلائیکەو موسوڵمانان هاوکاری پێغەمبەر دەکەن. ٥- بۆ زیادەکردنی پلەی بەهەشتیەکانە ئەوەی بەگونجاوی زوانیوە ئەمەش بو بەپێغەمبەرەوە .

(٢) هیچ کەسێ نامرێ بەکاتی دیاریکراوی خۆی نەبێ، ئەوەش ئەوەیە کە خوا هەر لەئەزەلدا نوسیویەتی ، کۆتایی ژیانی پێنوسیوە بەکوشتن دەبێ یاخود شتیتر، زۆرێك لەموعتەزیلە وادەزانن بکوژەکە کاتی کوژراوەکەی بریوە بەکوشتنیەوە، ئەگەر نەیکوشتایە زیاتر دەژیا -ئێمە دەڵێین: ئێمە ئاگامان لەئارەزوی خوانیە ئایا دەژیا یان نا؟- نەفس لەدوای مردنی هەر دەمێنێتەوە یاخود لەناز و نیعمەتدایە یاخود لەزەحمەت و ئازاردایە، ئایا لەکاتی بەرپابوونی قیامەتدا لەناو دەچێ ئەمە دوو دڵی تێدایە هەندێك دەڵێن: لەکاتی فوی یەکەمدا لەناو دەچێ وەك غەیری خۆی، باوکی دانەر وتویەتی: قەولی ئەظهەرو زۆردیار ئەوەیە نەفس هەرگیز نافەوتێ چونکە ئەصلْ لەمانەوەیدا دوای مردن ئەوەیە کەبەردەوام بێ.

(٣) لەبارەی (عەجب و ذەنەب)ەوە ئایا لەناو دەچێ یان نە؟ دوو قەولی تێدایە: بەناوبانگەکەیان ئەوەیە کە لەناو ناچێ، چونکە فەرموودەیەك هەیە بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەکەن دەفەرموێ: هیچ شتێکی ئادەمیزاد نیە لەناو نەچێ تەنها یەك شتی نەبێ ئەویش (عەجب ذەنەب)ەکەیەتی ، هەر لەویش لەرۆژی قیامەت پێك دێتەوەلەریوایەتەکەی موسلیمدا، دەفەرموێ: هەموو لاشەی ئادەمیزاد گڵ دەیخوا تەنها (عجب دەنەب) نەبێ لەوە دروست بووە و لەوە هەڵدەبەسترێتەوە .

وفي رواية لأحمد وابن حبان قيل وماهو يارسول الله؟ قال: مثل حبة خردل منه تنشؤن وهو في أسفل الصلب عند راس العصص يبه في المحل محل اصل الذنب من ذوات الاربع {قال المزني والصحيح} انه {يبلى} كغيره قال تعالى كل شيء هالك الاوجهه {وتأول الحديث} المذكور بأنه لا يبلى بالتراب بل بلا تراب كما يميت الله ملك الموت بلا ملك الموت[1].

{وحقيقة الروح} وهي النفس {لم يتكلم عليها محمد ﷺ} وقد سئل عنها لعدم نزول الامر بيانها قال تعالى ويسئلونك عن الروح قل الروح من امر ربي {فنمسك} نحن {عنها} ولا نعبر عنها باكثر من موجود كما قال الشيخ الجنيد وغيره والخائضون فيها اختلفوا افقال جمهور المتكلمين انها جسم لطيف مشتبك بالبدن اشتباك الماء بالعود الاخضرو قال كثير منهم انها عروض وهي الحياة التي صار البدن وجودها حياً قال السهوردي ويدل للاول وصفها في الاخبار بالهبوط ولاعروج والتردد في البرزخ[2].

(١) لەریوایەتەکەی ئەحمەدو ئیبن حبان دا وتراوە ئەوەچی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی وەك و دنکە خەرتەلەیەك وایە لەو دروستبوون لەجومگەی خوارووی برپرەی پشتەوەیە، جێگەکەی وەك جێگەی کلکی چوارپێ وایە . مەزەنی وتویەتی قەولی صەحیح ئەوەیە کە ئەویش وەك شتەکانی‌تر لەناودەچێ ، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: هەرچی شت هەیە لەناو دەچێ تەنها زاتی خوا نەبێ، فەرموودە پێشوە دەبێ تەئویل بکرێ بەوەی کە (عەجب ذەنەب) بەگڵ تیا ناچێ، بەڵکو بەشتی‌تر لەناو دەچێ، وەك چۆن خوای گەورە مەلائیکەی گیان کێشان بەبێ مەلائیکەی گیان کێشان دەمرێنێ.

(٢) حەقیقەتی رۆح وگیان، رۆح واتە: نەفس پێغەمبەرﷺ لەبارەی قسەی نەکردووە، ئێمەیش زوبانی خۆمان دەگرین لەبارەیەوە قسە ناکەین لەبارەیەوە زیاتر لەوەی کە ئەڵێن: رۆح هەیە هیچی‌تر ناڵێین، پێغەمبەرﷺ لەبارەی رۆحەوپرسیاری لێ‌کراوە هیچی وەڵام نەداوەتەوە، چونکە هیچ شتێك لەبارەیەوە نازڵ نەبووە بۆ رونکردنەوەی وەك شێخ جونەیدو غەیری‌ئەویش وتویانە: ئەوانەی کەزۆر رۆچوون بۆچونی جیاوازیان هەیە، جەماوەری زانایانی عیلمی کەلام دەڵێن: رۆح بریتیە لە جیسمێکی ورد تێکەڵی هەموو لاشە دەبێ وەك تێکەڵ بوونی ئاو بەداری تەڕ، زۆرێکیشیان وتویانە رۆح عەرەضە ،بریتیە لەو ژیانەی کەبەدەن بەهۆی بونیەوە دەبینە زیندوو ، سەهرەوەردی وتویەتی: لە فەرموودەکاندا رۆح هەندێ وەصف کراوە وادەگەیەنن کەرۆح قیامی بەخودی خۆیەوە هەیە، بۆ وێنەوەك دابەزین وبەرزبوونەوەو هاتوچۆکردن لەبەرزەخدا.

وقال الفلاسفة وكثرير من الصفوية انها ليست بجسم ولا عرض وانما هي جوهر مجرد قائم بنفسه غير متحيّز متعلق بالبدن للتدبير والتحريك غير داخل فيه و لا خارج عنه[١].

{وكرامات الاولياء} وهم العارفون بالله تعالى حسبما يمكن المواظبون على الطاعات المجتنبون للمعاصي المعرضون عن الانهماك في اللذات اوالشهوات {حقٌّ} اي جائزة واقعة كجريان النيل بكتاب عمرو رؤيته وهو على المنبر بالمدينة جيشه بنهاوندحتى قال لأمير الجيش ياسارية الجبل الجبل محذر اله من وراء الجبل لكمن العد هناك وسماع سارية كلا مه مع بعد المسافة. وكشر خالد السم من غير تضرر به وغير ذلك مما وقع للصحابة وغيرهم[٢]{قال القشيري ولا ينتهون الى نحو ولدون والد} وقلب جماد بهيمة قال المصنّف وهذا حق يُخصّص قول غيره ما جاز ان يكون معجزة لنبي جاز ان يكون كرامة لوليّ لافارق بينهما إلاّ التحدي[٣].

---

(١) فەیلەسوفەکان و زۆربەی صۆفیەکان دەڵێن: رۆح ە نەجیسمە و نەعەرەضە ، بەڵکوتەنها جەوهەرێکی روتە قیامی بەخودی خۆیەوە هەیە خاوەنی جیٚو رێ نیە پەیوەندە بەلاشەوە بۆ ئەوەی تەگبیرو هەڵسوکەوتی پێ بکا، نەپێی دەوترێ ها لەبەدەندا و نەپێی دەوترێ لەدەرەوەی لاشەشە، چونکە دەرو ناو بۆ ماددی بەکاردێ رۆحیش لەمجرداتە .

(٢) کەرامەت رێزلێنان لەدۆستانی خوا -کە ئەوانەن خواناسن و چۆن بگونجێ ئاوا بەردەوام بن لەسەر گوێڕایەڵی و لەگوناهەکان خۆیان وەدورنێن و خۆیان بپارێزن لەوەی دڵیان بەتەواوی بچەقێ لەناو لەززەت و ئارەزوبازیدا- حەقەو راستە واتە: رویشی داوە وەك: رۆیشتنی دەریای (نیل) بەهۆی نامەی عومەرەوە یاخود عومەر سوپاکەی لەنەهاوەندەوە بینی لەکاتێکدا خۆی بەسەر دوانگەی مەدینەوە بوو ، هەتا وتی: بەفەرماندەی سوپاکە: ئەی ساریە! شاخەکە شاخەکە، ئاگاداری کردەوە لەوە بترسێ لەپشتی شاخەکە، چونکە دوژمن لەوێ خۆیان بۆ مەڵاس دابوون، یا وەك ئەوەی ساریەش قسەکانی عومەری بیستن لەگەڵ ئەوەش ماوەکە زۆر دوورە، یاوەك ئەوەی خالید زەهری خوارەوە بێئەوەی هیچ زیانێکی پێبگا.وەچەندەهای تری شتی وەها کەبۆ هاوڕێیانی پێغەمبەر روویان داوە وەبۆ غەیری هاوەڕێیانیشی .

(٣) قوشەیری وتویەتی: ناگەنە ئەو پلەیەی منداڵی بێباوك پەیدا بێ یا بەردێك بگۆڕێ بەئاژەڵ دانەر وتویەتی: ئەمە قسەیەکی راستە تایبەتکەریشە بۆ ئەو قسەیەی غەیری قوشەیری کردوویەتی، وە دەڵێ: ئەوەی بگونجێ بکرێتە موعجیزەی پێغەمبەر

**ومنع اكثر المعتزلة الخوارق من الاولياء وكذلك الاستاذ ابو اسحق الاسفرايني قال كل ماجاز تقديره معجزة لنبي لا يَجوزُ ظهور مثله كرامة لولي وانما مبالغ الكرامات اجابة دعوة أو موافاة ماءٍ في بادية من غير توقع المياه او نحو ذلك مما ينحط عن خرق العادات[1].**

**{ولا نكفر احد من اهل القبلة} ببدعته كمنكري صفات الله وخلقه افعال عباده وجواز رؤيته يوم القيامة ومنا من كفرهم اَمما من خرج ببدعته عن أهل القبلة كمنكري حدوث العالم والبعث والحشر للاجسام والعلم بالجزئيات فلا نزاع في كفرهم لانكارهم بعض ماعلم محمد الرسول به ضرورة[2]. {ولا نجوز} نحن {الخروج على السلطان} وجوزت المعتزلة الخروج على الجائر لإنعزاله بالجور عندهم[3].**

---

دەگونجێ بکرێتە کەرامەتی وەلی بێئەوی هیچ جیاوازیەکیان هەبێ ، جگە لەدوای پێغەمبەرایەتی نەبێ.

(١) زۆربەی موعتەزیلە وتویانە لەلایەن وەلیەکانەوە سنووری عادەت ناشکێنرێ هەروەها ئەسفەرایینی وتویەتی: ئەوەی بگونجێ بکرێتە موعجیزە بۆ پێغەمبەرێك دروست نیە وێنەی ئەو بکرێتە کەرامەتی وەلی تەنها ئەوی کە کەرامەتی وەلی پێدەیگا بریتیە لەبەدەمەوە هاتنی خوا بەدوعاییکی یاخود بەگەیشتنی بەئاو لەدەشتێکی کرێنی بێئاودا، بێئەوەی چاوەڕوانی ئاو بکرێ یاخود وێنەی ئەوە لەوانەی کە لەخوار پلەی شکاندنی عادەتەوەیە .

(٢) ئێمە هیچ کەس لەئەهلی قیبلە کافر ناکەین بەهۆی بیدعەتەکەیەوە وەك ئەوانەی ئینکاری صیفاتی خوا دەکەن یاخود ئینکاری ئەوە دەکەن کە خوا دروستکەری کرداری بەندەکانیەتی –ئەمانە دەڵێن خوا عالم و زانایە هەر بەخودی زاتی خۆی نەك بەهۆی صیفەتی عیلمیەوە– یا ئەوانەی بڕوایان ینە بەبینینی خوا لەرۆژی قیامەتدا، هەرچەندە هەندێ لەئێمەش بەکافریان حسێب کردوون، بەڵام کەسێ بەهۆی بیدعەتەکەیەوە لەئەهلی قیبلە دەرچووبێ وەك ئەوانەی بڕوایان نیە ئەم جیهانە دروست کرابێ یاخود بڕوایان نیە بەزیندویونەوەو کۆکردنەوەی لاشەکانمان ، یابڕوایالن ینە بەوەی کەخوا عیلمی هەبێ بەجوزئیاتی ئەم بوونەوەرە ، ئەوە هیچ جۆرە کێشەیەك نیە لەکافر بوونی ئەوانەدا، چونکە ئینکاری هەندێ لەوانەیان کردووە کە زانراوەو بەڵگە نەویستە لەوەی پێغەمبەرﷺ پێی هاتووەو هێناویەتی .

(٣) ئێمە بەڕەوای نازانین دەرچوون و یاخی بوونی چەکداری لەسوڵتان و سەرۆك، موعتەزیلە بەڕەوایان زانیوە ئەم یاخیبونە لەسەرۆکیستەمکار،چونکە بەلای ئەوانەوە

{ونعتقد ان عذاب القبر} وهو للكافر والفاسق المراد تعذيبه بأن ترد الروح الى الجسد او مابقى منه {وسؤال الملكين القبر} وهو للكافر والفاسق المراد تعذيبه بأن ترد الروح الى الجسد او مابقى منه {وسؤال الملكين} منكرو نكير للمقبور بعد رد روحه إليه عن ربه ودينه ونبيه فيجيبهما بما يوافق مامات عليه من ايمان او كفر {والحشر} للخلق بأن يحييهم الله تعالى بعد فنائهم ويجمعهم للعرض والحساب[1].

{والصراط} وهو جسر ممدود على ظهر جهنم ادق من الشعر واحد من السيف يمر عليه جميع الخلق فتجوزه أهل الجنة ونزل به اقدام أهل النار {والميزان} وله لسان وكفتان يعرف به مقادير الاعمال بأن توزن صحفها به {حق}[2] للنصوص الواردة في ذلك قال تعالى:﴿ وحشرناهم فلم نغادر منهم احدا ﴾﴿ ونضع الموازين القسط ليوم القيامة فلا تظلم نفس شيئا ﴾[3].

---

بەهۆی ستەمەکەیەوە لەسەرۆکی دەکەویٚ – چونکە وەکیلە، وەکیل ستەمی کرد لەوەکالەت دەکەویٚ–.

(١) ئیٚمە بڕوامان هەیە کەتۆڵەو ئازاری قەبر و گۆڕ راستە، ئەمە بۆ کافرو گوناهبارێك کە خوا دەیەویٚ ئازاری بدا، بەم شیٚوەیە کە گیانەکەی دەگەڕیٚتەوە بۆ لاشەکەی هەمووی یاخود ئەوبەشەی کە ماوەتەوە لیٚی، وە پرسیاری مەلائیکەی گۆڕ کەناویان (نەکیرو مونکەرە) بۆ ئەو کەسەی لەگۆڕدەنریٚ دوای گەڕانەوەی گیانەکەی بۆی پرسیاری لیٚدەکەن، لەبارەی خواو ئاین و پیٚغەمبەریەوە، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە بەگویرەی ئەو باوەڕەی کە لەکاتی سەرەمەرگدا بویەتی، چ ئیمان بیٚ یاخود کوفر، کۆکردنەوەی خەڵك بەم شیٚوەیە خوا زیندویان دەکاتەوە دوای لەناو چونیان کۆیان دەکاتەوە بۆ ئەوەی کارو کردەوەی خۆیان ببینن و حسیٚبیان لەگەڵدا بکریٚ .

(٢) صیراطیش کەپردیٚکی دریٚژکراوەیە بەسەر پشتی دۆزەخدا لەموو باریٚك ترو لەشیر تیژترە هەموو خەڵکی دەبیٚ بەسەریدا تیٚپەڕبکەن، بەهەشتیەکانی بەسەر تیٚپەڕ دەکەن ودۆزەخیەکانی تیٚدەکەویٚ، بەهۆی ئەوەوە کەپیٚیان تیٚدا هەڵدەخلیسکیٚ، (میزان)یش کە زوبانیٚك و دوو تای هەیە بەهۆیەوە ئەندازەی کردەوەکان دەزانریٚ بەم شیٚوەیە ئەو پەڕانەی کرداریان تیا نوسراوە دەکیٚشریٚن –بۆ هەر شتیٚك میزانی تایبەتی هەیە میزانی برنج لەگەڵ میزانی کارەبا جیایە هی قیامەتیش ئاوا جیایە– ئەمانە هەموو هەق و راستن .

(٣) چونکە چەندەها دەق هەن کەلەو بارەیەوە هاتوون، خوای گەورە دەفەرمویٚ: هەموویان خڕدەکەمەوە هیچ کەسیشیان لیٚبەجیٚ ناهیٚلین، یا دەفەرمویٚ: ئیٚمە تەرازوی

وقال ﷺ عذاب القبر حق، ومر على قبرين فقال انهما ليعذبان وقال ان العبد اذا وضع في قبره وتولى عنه أصحابه أتاه ملكان فيقعد انه فيقولا له ماكنه فيقولان له مانت تقول في هذا لانبي محمد فأما المؤمن فيقول اشهد انه عبدالله ورسوله الى ان قال وأما الكافراوالمنافق فيقول لا أدري الخ رواهما لاشيخان وغيرهما وفي رواية أبي داود و غيره فيقولان له من ربك وما دينك وما هذا الرجل الذي بعث فيكم فيقول المؤمن ربي الله وديني الاسلام والرجل المبعوث رسول الله ﷺ ويقول الكافر في الثلاث لا ادري[1].

وفي رواية للترمذي يقال لأحدهما المنكر وللآخر النكير وفي رواية للبيهقي فيأتيه منكر ونكير وفي لاصحيحين احاديث تحشر النّاس حفاة مشاة عراة غرلا اي غير مختنين واحاديث يضرب الصراط بين ظهري جهنم ومرور المؤمنين عليه متفاوتين وانه منزلة اي نزل به اقدام اهل النار فيها [2]..

---

عەدالەت دادەنێین بۆ ڕۆژی قیامەت هیچ کەس هیچ ستەمێکی لێ ناکرێ.

(١) پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ئازاری گۆڕ هەقە و راستە . وەهەم پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی کرد بەسەر دوو گۆڕداو فەرموی: ئەو دوانە ئازار دەدرێن ، و فەرمووی : مردوو کاتێ دادەنرێ لەگۆڕەکەیداو هاوەڵانی پشتی تێدەکەن و دەڕۆنەوە دوو مەلائیکە دێن و دای دەنیشێنن و ئەمجا پێی دەڵێن تۆ لەبارەی ئەم پێغەمبەرەوە چیت دەوت، جا ئەوە موسوڵمان بێ دەڵێ: گەواهی دەدەم کە بەندەو پێغەمبەری خوایە... تا ئەوەی دەفەرموێ: بەلام ئەوەی کافر بێ یان موونافیق بێ دەڵێ: نازانم ... تاکۆتایی . بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە و غەیری ئەوانیش . لەریوایەتەکەی ئەبو داودو غەیری ئەویشدا هەردووکیان پێی دەڵێن: پەروەردگارو ئایینی تۆ چییە؟ ئەم پیاوەی نێرراوە بۆان چیەو کێیە؟ جا موسوڵمان دەڵێ: (الله) پەروەردگارمە ئایینی من ئیسلامەو ئەو پیاوەش کەڕەوانەکراوە پێغەمبەری خوایە، کافریش لەبارەی هەرسیانەوە دەڵێ: نازانم .

(٢) لەڕیوایەتێکی‌تردا تیرمزی دەفەرموێ: بەیەکێکیان دەوترێ مونکەر و بەوی‌تریشیان دەوترێ نەکیر، لەڕیوایەتێکی بەیهەقی‌دا دەفەرموێ: نەکیرو مونکەری بۆدێن، لەبوخاری و موسلیم دا چەندەها فەرموودە هەیە، کە دەڵێ: خەڵکی کۆدەکرێنەوە بەپێ‌خاوسی و بەپێ‌ڕۆیشتن بەڕووتی بەخەتەنە نەکراوی ، چەندەها فەرموودەی تر هەیە دەفەرموێ: پردی صیراط دەبەسترێ و هەڵدەدرێ لەنێوان ئەم بەرو ئەوبەری دۆزەخدا وڕۆیشتنی موسوڵمان بەسەریدا جیاوازیان هەیە و بەڕاستی ئەو جێگەیە پێی دۆزەخیانی تیا هەڵئەخلیسکێ .

.. وفي مسلم عن ابي سعيد الخدري بلغني انه ادق من الشعرو واحد من السيف وروى البزار والبيهقي حديث يؤتي بابن آدم فيوقف بين كفتى الميزان الخ[1].

{والجنة والنار مخلوقان اليوم} يعني قبل يوم الجزاء للنصوص الدالة على ذلك نحو اعدت للمتقين اعدت للكافرين وقصة آدم وحواء في اسكانهما لاجنة واخراجهما منها بالزلة وزعم اكثر المعتزة انهما انما يخلقان يوم الجزاء[2]{ويجب على النّاس نصب امام} يقوم بمصالحهم كسد الثغور وتجهيز الجيوش وقهر المغلبة والمتلصصة وقطاع الطريق وغير ذلك لاجماع الصحابة بعد وفاة النبيّ ﷺ على نصبه حتى جعلوه اهم الواجبات وقد موه على دفنه ﷺ ولم يزل النّاس في كل عصر ذلك[3] {ولو} كان من ينصب {مفضولا} فان نصبه يكفى في الخروج عن عهدة النصب وَ قِيل: لا بل يتعين نصب الفاضل[4].

---

(١) له ریوایەتی موسلیم دا لەئەبوسەعیدی خودریەوە دەفەرموێ: پێم گەیشتووە لە موو باریك ترەو لە شمشێر تیژترە، بەزارو بەیهەقیش ئەم فەرموودەیە ریوایەت دەکەن ئادەمیزاد دەهێنن لەنێوان هەردوو تای تەرزاوەکەدا دەیوەستێنن .. تا کۆتایی .

(٢) بەهەشت و دۆزەخ ئەمڕۆ ئێستە دروست کراون واتە: پێش رۆژی پاداش، چونکە چەندەها دەق ئەوە دەگەیێنن ، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: بەهەشت ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کەموتتەقین یا دەفەرموێ: دۆزەخ ئامادەکراوە بۆ کافران، یاخود سەرگوزەشتەی جێنشین کردنی ئادەم و حەوا لەبەهەشتداو دەرکردنیان تیایدا بەهۆی گوناهێکەوە، زۆربەی موعتەزیلە وادەزانن بەهەشت و دۆزەخ لەرۆژی پاداشتەوە دروست دەکرێن .

(٣) پێویستە لەسەر خەڵك دانانی پێشەوایەك بۆ ئەوەی هەستێ بەو کارانەی لە بەرژەوەندی خەڵکەکەیە وەك گرتنی ئەو کونانەی دوژمنی دەرەکی لێ‌دێتە ناوەوە و ئامادەکردنی سوپا و شکاندنی ئەوانەی بەزۆر خۆیان زاڵ دەکەن بەسەر خەڵکدا و ئەوانەی خۆیان زاڵ دەکەن بەسەر خەڵکاو ئەوانەی دزی دەکەن و رێگری دەکەن لە خەڵك وچەندەها شتی‌تر، چونکە هاورێیانی پێغەمبەرﷺ ئیجماعیان لەسەرئەوە بوو دوای مردنی پێغەمبەرﷺ پێشەوایێك دابنێن هەتا بەگرنگترین واجبیان زانی وپێشیان خست بەسەرناشتنی پێغەمبەرداﷺ،هەروەها خەڵك لەسەر ئەوشێوازە بون هەتا ئەمڕۆ.

(٤) بائەوەی دادەنرێ لەویش شیاوترو گەورەتریش هەبێ، چونکە بەدانانی ئەم لەلێپرسراوی دانانی پێشەوا دەردەچین، هەندێك وتویانە: نابێ بەڵکوو هەردەبێ کامەزۆر لەو شیاوو گەورەترە دابنرێ.

وذهبت الخوارج الى انه لا يجب نصب امام والامامية الى وجوبه على الله تعالى[١].

{ولا يجب على الرب سبحانه شيء} لانه خالق الخلق فكيف فيجب لهم عليه شيء وقالت المعتزله يجب عليه اشياء يترتب الذم بتكرها منها لاجزاء اي الثواب على الطاعة والعقاب على المعصية ومنها اللطف بأن يفعل بعباده ما يقربهم الى الطاعة ويبعدهم عن المعصية بحيث لا ينتهون الىحد الالحاد ومنها الاصلح لهم في الدنيا من حيثُ الحكمة والتدبير[٢].

{والمعاد الجسماني} اي عود الجسم {بعد الاعدام} باجزائه وعوارضه كما كان {حق} قال تعالى وهو الذي يبدا الخلق ثُمَّ يعيده ﴿ كما بدانا اول خلق نعيده ﴾﴿ كما بداكم تعودون﴾[٣] وانكرت الفلاسفة اعادة الاجسام وقالوا انما تعاد الارواح بمعنى انها بعد موت البدن تعاد الى ما كانت عليه من التجرد متلذذة بالكمال او متألمة بالنقصان وقوله بعد الاعدام هو الصحيح وَ قِيلَ لا يعدم الجسم وانما تفرق اجزاؤه[٤].

(١) خەوارج وای بۆ دەچن کەهەر پێشەوا دانان واجب نیە، ئیمامیە دەڵێن: لەسەر خوا واجبە دای‌بنێ.

(٢) هیچ شتێ لەسەر خوا واجب نیە چونکە خوا بەدیهێنەری دروستکراوەکانە ئیتر چۆن شتێ لەسەر خوا واجب دەبێ بۆ ئەوان، موعتەزلە وتویانە: چەند شتێ لەسەر خوا واجب دەبێ گەر نەیانکا خراپەی دەوترێ و گلەیی لێدەکرێ، یەکێك لەوانە: پاداشت لەسەر خواپەرستی و تۆڵە لەسەر یاخی‌بوون، یەکێکی‌تریان لوتف کردن بەم شێوە شتێ بۆ بەندەکانی بکا نزیکیان بکاتەوە لەخوداپەرستی و دوریان بخاتەوە لەگوناه بەم شێوەیە نەگەنە سنووری زۆرلێ‌کردن، یەکێکی‌تریان ئەوەی شایستەترو قازانج ترە واجبە خوا بۆیان بکا لەڕووی تەکبیرو حیکمەتیانەوە.

(٣) سەر لەنوێ بوونەوی لاشەو گەڕانەوەی بۆ دۆخی خۆی دوای لەناو چوونی بەهەموو ئەجزاو عەوارضیەوە وەك چۆن بووە هەقەو راستە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: خوا ئەوەیە سەرەتا خەڵکی دروست کردوە پاشان دەیگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی جارانی ، یا دەفەرموێ: وەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمان کردوون وەها دەیگەڕێنینەوە، یا دەفەرموێ: وەك سەرەتا ئێوەی هێناوە وەهاش دەگەڕێنەوە.

(٤) فەیلەسوفەکان بڕوایان نیە بەگەڕانەوەی لاشەکان دەڵێن: تەنها گیانەکان دەگەڕێنەوە بەو مانایە دوای مردنی لاشەکان دەگەڕێنەوە بۆ دۆخی جارانیانکە لەسەری بوون لەگەڵ لاشەدا نەبوون، ئیتر بەتەواوی لەززەت دەبەن، یاخود ئازار دەچێژن بەهۆی نوقسانیەوە، وەك ئەویان بەهۆی کەماڵەوەیە ئەوەی کە دانەر ووتی:

ونعتقد لن خير الامة بعد نبيها محمدﷺ ابو بكر خليفته فممر فعثمان فعلى أمراء المؤمنين ﷺ اجمعين} لانطباق السلف على خيرتهم عند اللهعلى هذا الترتيب وقالت الشيعة وكثير من المعتزلة الافضل بعد النبيﷺ على [illegible] الصنف عن مشاركيهم في اسمائهم بما كانوا يدعو به فكان يدعي ابو بكر خليفة رسول اللهﷺ لانه خلفه في امر ارعية مع انه استخلفه للصلاة بالناس في مرض وفاتهﷺ كما رواه لاشيخان ويدعي كل من الثلاثة امير المؤمنين[1].

{و} نعتقد {براءة عائشة} رضي الله عنها {من كل ما قذفت به} لنزول القُرآن ببرائتها قال تعالى:﴿ ان الذين جاؤا بالافك ﴾ الآيات {ونمسك عما جرى بين الصحابة من المنازعات والمحاربات التي قتل بسببها كثير منهم فتلك دماء طهر الله منها ايدينا فلا نلوث بها السنتنا[2] [illegible]

---

دوای لەناو چوونی لاشە ئەو دروست و راستە، هەندێك وتوویانە: لاشە لەناو ناچێ بەڵكوو تەنها جوزنەكانی [illegible] و پشكوبڵاو دەبنەوە.

(١) ئێمە بڕوامان وایە كەباشترین كەسی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرﷺ ئەبوبەكری جێنشینیەتی، ئەمجا عومەر ئەمجا عوسمان ئەمجا عەلی، سەركردەی بڕواداران خوایان لێرازی بێ هەر [illegible] چونكە [illegible] ئەم ئوممەتە هەموویان یەك دەنگن لەسەرچاكی [illegible] لەسەر ئەم پلەسازی و تەرتیبە، شیعەو زۆرێك لەموعتەزیلە دەڵێن: گەورەترین كەس دوای پێغەمبەر عەلیە، دانەر لەهاوەڵناوەكانیان ئەوەی جیاكردەوە بەوەی كەبانگ دەكران پێی، بۆ وێنە ئەبوبەكر بانگ دەكرا خەلیفەو جێنشینی پێغەمبەرﷺ چونكە لەبەڕێوەبردنی كاروباری گەلدا بوو بەجێنشینی لەگەڵ ئەوەش [illegible] كردیە جێنشینی خۆی لەنەخۆشیەكەیدا كە فەوتی تیادا كردﷺ، وەك بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەكەن و هەریەك لەو سیانەش لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا باس دەكران و ناودەبران وە بانگ دەكران بەسەركردەی بڕواداران.

(٢) ئێمە بڕوامان وایەو هەیە كە عائیشەی دایكی موسوڵمانان پاكە لەو هەموو درۆیانەی بۆی [illegible] پاڵی، چونكە قورئان دابەزیوە لەبارەی پاكی ئەو لەو بوهتانانە، خوای گەورە دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی كە گەورەترین درۆیان هێنا ... هەتا كۆتایی . ئێمە زوبانی خۆمان دەگرین لەبارەی ئەوەوە كە گوزەری كرد لەنێوان هاوەڵاندا وەك ئەو هەموو دووبەرەكی و جەنگانەی كە خەڵكێكی زۆر كوژرا

و{نرى الكل ماجورين} في ذلك لانه مبني على الاجتهاد في مسئلة ظنية للمصيب فيها اجران على اجتهاده واصابته وللمخطيء اجر على اجتهاده كما ثبت في حديث الصحيحين ان الحاكم اذا اجتهد فأصاب فله اجر ان واذا اجتهد فاخطأ فله اجر[1].

{و} نرى {ان الشافعي} امامنا {ومالكا} شيخه {وابا حنيفة والسفيانين} الثوري وابن عيينة {واحمد} بن حنبل {والاوزاعي واسحق} بن راهويه {وداود} الظاهري {وسائر المسلمين} اي باقيهم {على هدى من ربهم} في العقائد وغيرها ولا التفات لمن تكلم فيهم بماهم بريئون منه[2] قال المصنّف وقول امام الحرمين ان المحققين لا يقيمون للظاهرية وزنا وان خلافهم لا يعتبر محمله عندي ابن حزم وامثاله وأما داود فمعاذ الله ان يقول امام الحرمين او غيره ان خلافه لايعتبر[3].

---

بەهۆیانەوە، چونکە چونکە ئەوە چەند خوێنێکی رژاوە خوا لوتفی بووە لەگەڵمان دەستمانی لێپاك كردووە ئیتر نابێ زوبانمان پێ پیس بکەین.

(١) ئێمە وادەزانین ئەو هاوەڵانە لەو کێشانەدا پاداشتیان هەیە، چونکە سەرچاوەی ئەو کێشانە ئیجتهادە لەبابەتێکی گوماناوی‌دا، ئەوەی حەقی پێکابێ لەو کێشانەدا دوو پاداشتی هەیە، یەك لەسەر ئیجتهادەکەی و دوەم لەسەر ئەوەی حەقی پێکاوە، ئەوەش حەقی نەپێکاوە یەك پاداشتی ئیجتهادەکەی هەیە، چونکە لەفەرموودەیەکدا بوخاری و موسلیم ریوایەتی دەکەن ثابت بووەو دەفەرموێ: حاکم کاتێ ئیجتهادی کرد و هەقی پێکا ئەوە دوو پاداشتی هەیە .

(٢) ئێمە وادەزانین شافیعی پێشەوامان و مالیکی مامۆستای شافیعی‌وئەبوحەنیفە و سوفیانی سەوری‌و سوفیانی کوڕی عویەینە و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەوزاعی و ئیسحاقی کوڕی راهەوەیهی و داودی ظاهیری و پێشەوایانی‌تری موسوڵمانان هەموویان لەسەر رێی راستی پەروەردگاریان بوون چ لەعەقیدەو باوەڕدا و چ لەغەیری ئەویشدا، ئاوڕنادەینەوە بۆ ئەو قسانەی لەبارەیانەوە کراوە چونکە ئەوان پاك بوون لەو قسانەی بۆیان هەڵبەستراوە.

(٣) دانەر دەڵێ: ئەو قسەی ئیمام الحرمین کەدەڵێ: زانایانی محقق هیچ رێزو وەزنێك بۆ زانایانی ظاهیری دانانێن و رای جیاوازیان هیچ بەها و ئەرزشێکی نیە ، ئەوە بەلای منەوە ئەوە دەبڕێ بەسەر (ابن الحزم) و هاو وێنەکانیدا، بەڵام داودی ظاهیری –ئەوە پەنا دەگرم بەخوا– لەوەی کە ئیمام الحرمین یاخود غەیری ئەو بڵێن: رای جیاوازی ئەو هیچ بەهاو ئەرزشێکی بۆ دانانرێ.

فلقد كان جبلا من جبال العلم والدين له من سداد النظر وسعة العلم ونور البصرة والاحاطة باقوال الصحابة والتابعين والقدرة على الاستنباط مايعظم وقعه وقد دونت كتبه وكثرت اتباعه وذكره الشيخ ابو اسحق الشيرازي في طبقاته من الأئمه المتبوعين في الفروع وقد كان مشهورا في زمن الشيخ وبعده بكثير لاسما في بلاد فارس شيراز وما والاها الى ناحية العراق وفي بلاد المغرب[1].

{و} نرى {أن ابا الحسن} على بن اسمعيل {الاشعري} وهو من ذرية ابي موسى الاشعري الصحابي {امام في السنة} اي الطريقة المعتمدة {مقدم} فيها على غيره كابي منصور الماتريدي ولا التفات لمن تكلم فيه بما هوبريء منه[2]. {و} نرى {ان طريق الشيخ} ابي القاسم {الجنيد} سيد الصوفية علما وعملا {وصحبه طيريق مقوم} فإنَّهُ خال عن البدع دائر على التسليم والتفويض والتبرى من النفس. ومن كلامه الطريق الى الله تعالى مسدود على خلقه إلاّ على المقتفين آثار رسول اللهﷺ [3].

---

(١) چونكه داود شاخێكی بەرز بووە لەشاخەكانی عیلم و دین چەندەها تێڕامانی ڕاست و عیلمی فراوان و بیری ڕوناك و گەماڕۆدانی بووە بەسەر هەموو قەولی هاوەڵان و شوێنكەوتواندا و تواناییەكی زۆری هەبووە بەسەر هەڵگۆزینی ئەحكام لەدەقەكاندا هەبووە، هەر زۆر گەورە و دەگمەنە پەیدا بوونی شتی وەها، نوسراوەكانیش نوسراونەتەوەو قوتابی و شوێنكەوتەی زۆرە، شیرازی لە تەبەقاتەكەیدا باسی دەكاو دەڵێ: یەكێكە لەو پێشەوایانەی كە موسوڵمانان لەفروعدا شوێنكەوتەی بوون، لەسەردەمی شیرازیو دوو ڕای ئەویش بەماوەیەكی زۆر زۆر بەناوبانگ بووە، بەتایبەتی لەوڵاتی فارسدا لەناوچەی شیراز و دەوروبەری بەرەو ناوچەی عێراق و لەوڵاتی ڕۆژاوادا.

(٢) ئێمە وادەزانین و دەبینین كە (ابو الحسن) ئەشعەری كە لەوەچەی ئەبوموسای ئەشعەریەو یەكێكە لەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ وادەزانین پێشەوایە لەبواری عەقیدەو باوەڕدا و پێش خراویشە بەسەر غەیری خۆیدا لەوبوارەدا وەك ماتوریدی و ئەوانیتر ئاوەڕدانەوە ناكرێ بۆ ئەو قسانەی لەبارەیەوە كراوە ، چونكە ئەو پاكە لەو قسانەی لەبارەیەوە هەڵبەستراوە .

(٣) ئێمە وادەزانین و دەبینین كە ئەو ڕێگەیەی جونەید -لەڕووی عیلم و كردەوەوە گەورەی صۆفیەكانە- هاوڕێیانی ڕێگایەكی مەحكەمەو بەپێزە، چونكە هیچ بیدعەتێكی تێدا نیە لارو لوێر نیە، لەسەر گوێڕایەڵی ئەحكامی شەرع و حەقیقەت گەڕانەوە ئەوەی نازانرێ بۆ لای خواو خۆ پاك كردنەوە لەداخوازیە خراپەكانی نەفس دەسوڕێتەوە،

وقال رأيت في المنام أني اتكلم على النّاس فوقف على ملك ما أقرب فقال ماتقرب به المتقربون الى الله سبحانه وتعالى فقلت عمل خفيٌ بميزان وفي قولي وهو يقول كلام موفق والله ولا التفات لمن رماهم في جملة الصوفية بالزندقة عند خليفة السلطان حتى أمر بضرب اعناقهم فامسكوا إلاّ الجنيد فإنَّهُ تستر بالفقه وكان يفتى على مذهب ابي ثور شيخه وسبط لهم النطع فتقدم من آخرهم أبو الحسن النوري للسياف فقال له لم تقدمت فقال أوثر أصحابي بحياة ساعة فبهت وانهي الخبر للخليفة فردهم الى القاضي فسأل النوري عن مسائل فقهية اجابه عنها ثُمَّ قال و بعد فإنَّهُ لله عبادا اذا قاموا قاموا بالله واذا نطقوا نطقوا بالله الى آخر كلامه فبكي القاضي وارسل يقول للخليفة ان كان هؤلاء زنادقة فما علي وجه الارض مسلم فخلي سبيلهم رحمهم الله [1].

لەیەكێك لەقسەكانی‌دا دەفەرموێ: رێگرتنەبەر بۆ لای خوا هەمووی داخراوە لەسەر خەڵك جگە لەسەر ئەوانە نەبێ كە شوێنەواری پێغەمبەرﷺ دەگرنە بەرو دەچننەوە.

(١)وەدەڵێ:لەخەوم دا وام بینی قسە بۆخەڵك دەكەم لەبەرزاییكەوە مەلائیكەیەكیش لەژوور سەرمەوە راوەستابوو هەر زۆر نزیك بوو، ئەمجا ووتی: ئەوە چیە كە خەڵك نزیك دەكاتەوە بەخواوە؟ منیش ووتم: كارێكە لەبەرچاوی خەڵكی ئەنجام نەدرێ بەتەرازیەكی تەواوی شەرعی ئەنجام بدرێ، دەڵێ: مەلائیكەكە پشتی هەڵكردوو رۆیشت هەر لەبەر خۆیەی‌وە دەیووت: سوێند بەخوا ئەمە قسەی كەسێكە خوا تەوفیقی دابێهیچ جۆرە ئاورێك نادرێتەوە بۆ ئەو ناوو ناتۆرانەی بەناوی زەندەقەوە ناویان ناون كە ئەمیش یەكێك بووە لەكۆمەڵی زانایانی صۆفی پی‌تاوانبار كراونلەلای جی‌نشینی سوڵتان تا ئەویش ئەوەندە پڕكراوە فەرمانی لەگەردن دانی هەموویانی دەركردووە، بەهۆی ئەو فەرمانەوە هەموویان گیران جگە لەجونەید نەبێ ئەم بەهۆی مەلایەتی و فیقه زانینەوە خۆی شاردەوە، لەسەر پەیڕەوی مامۆستاكەی (ابو ثور) فەتوای دەدا، ئەو حەسیرەی كە خەڵكیان لەسەر سەر دەبڕی بۆیان راخست یەكسەر ابوالحسن نوری ئەو لەكۆتایی ریزەكەوە بوو هاتەپێشەوە بۆبەردەم قەساب و شمشێر بەدەستەكە، ئەویش ووتی: بۆ هاتیتە پێشی پێشەوە؟ ئەویش ووتی: یەك سەعات ژیانم ماوە دەمەوێ بیدەم بەهاورێكانم . ئەوانم لەخۆم زیاتر خۆش دەوێ، زۆر سەری سوڕما هەواڵەكەی گەیاندە خەلیفە، ئەویش فەرمانی دا بیرێتەوە بۆلای قازی، قازیش چەند بابەتێكی فیقهی لێپرسی، ئەویش هەموویانی وەڵام دایەوە، پاشن ووتی: دوای ئەم قسانە جەنابی قازی ئەوە بێگومان بە خوای گەورە چەندەها بەندی هەن كاتێ هەڵسن بەكارێ بەهۆی فەرمانی خواوە هەڵدەسن وەكاتێ بدوێن هەر بە فەرمانی‌خواوە

ونفعنا بهم ثُمَّ قتل من الصوفية الحسين الحلاج في سنة تسع وثلثمئة من سنى الخليفة المذكور وهو ابو الفضل جعفر المقتدر[١].

{ومما لا يضر جهله} في العقيدة بخلاف ماقبله في الجملة {وتنفع معرفته} فيها مايذكر الى الخاتمة وهو {الأصَحّ} الذي هو قول الاشعري وغيره {ان وجود الشيء} في الخارج واجبا كان وهو الله تعالى او ممكنا وهو الخلق {عينه} اي ليس زائدا عليه {وقال كثير منا} اي من المتكلمين {غيره} اي زائد عليه بان يقوم الوجود بالشيء من حيثُ هو اي من غير اعتبار الوجود والعدم وان لم يخل عنهما واشار بقوله منا الى قول الحكماء انه عيه في الواجب وغيره في الممكن[٢].

---

دەکەونە گۆ... تاکۆتایی قسەکانی یەکسەر قازی دەستی کرد بەگریان ، ئەمجار هەواڵی نارد بۆ خەلیفە ووتی: ئەگەر ئەمانە زەندیق بن ئەوا بەسەر زەوی‌یەوە موسوڵمانێك نیە، هەموویانی بەرەڵلا کردو بەریدان،

(١) خوا رەحم بەهەموویان بکات و بەهۆی ئەوانیشەوە سود بەئێمە بگەیەنێ، پاشان لەزانایانی صۆفی (حسین الحلاج) کوژرا لەساڵی سێ‌صەدو نۆدا ٣٠٩ دا لە ساڵەکانی دەسەلاتی خەلیفەی پێشوو کە (ابو الفضل جعفر المقتدر) بوو.

(٢) ئێستە لەوانە دەدوێین کە نەزانینیان زیان بەخش نیە بۆ عەقیدەو باوەڕ -بەلام ئەوانەی پێشوو ئەگەر زۆربەیان نەزانرێن زیان بەعەقیدە دەداوەك هەشیانە نەیزانی زیانی نادا- بەلام ئەمانەی لەمەودوا زۆربەی زۆریان نەزانرێ زیانی نیە، بەلام زانینەکەیان بۆ عەقیدەو باوەڕ سود بەخشە . هەر لێرەوە تا کۆتایی لەم بابەتەیە، ئەوەش: قەولی ئەصەح کە قەولی ئەشعەری و غەیری ئەویشە ئەوەیە کە: وتت ئەو شتەیە بوونی هەیە لەواقیع و دەرەوەی بیردا چ بوونی واجب بێ کە (الله) یە ، یاخود بوونی مومکین و بوون و نەبوونی یەکسان بێ ئەویش دروستکراوە ، ئەو بوونە خودی زاتی شتەکەیە، واتە: شتێك نیە زیاد کرابێت بەسەر زاتی شتەکەیدا، واتە لەدەرەوەی بیردا لەیەك جیانین و لەیەك جیاناکرێنەوە ، بەلام مفهومیان لەیەك جیایە . زۆرێك لەئێمەیش واتە زانایانی عیلمی کەلام وتویانە:غەیری زاتەکەیە واتە: زیاد کراوە بەسەریدا، بەم شێوەیە کەبون و قیامی هەیە بەشتەکەوەلەو روەوە کە ئیعتبار بۆ بوون و نەبوون نەکرابێ هەرچەندە شت لەو دوانە بەدەر نیە واتە تەنها پێناسەکەی نەك ئیعتباری بونێك بەرامبەر نەبوون بێ، دانەر کەووتی: لەئێمە بەم وشەیە ئاماژەی کرد بۆ ئەو قسەیەی حوکەمایانە کەدەڵێن: بوون خودی شتەکەیە لەواجبدا و غەیری ئەویشە لەدروستکراودا .

{فعلى الأصَحّ المعـدود} الممكـن لاوجـود {ليـس} في الخـارج {بشـيء ولا ذات ولا ثابت} اي لا حقيقـة لـه في الخـارج وانم يتحقـق بوجـوده فيـه {وكـذا علـى الآخـر عند اكثرهم} اي اكثر القائلين به وذهب كثير منهم وهم طائفة من المعتزلة الى انه شيء اي حقيقة متقررة[1].

{و} الأصَحّ {أن الاسم} عين {المسمى} وَ قيلَ غيره كما هو المتبادر فلفظ النار مثلاً غيرها بلا شك والمراد بالاول المنقول عن الاشعري في اسم الله أن مدلوله الذات من حيثُ هي بخلاف غيره كالعالم فمدلوله الذات باعتبار الصفة كما قال لايفهم من اسم الله سواه بخلاف غيره من الصفات فيفهم منها زيادة على الذات من علم وغيره[2].

---

(١)کەوابوولەسەر قەولەئەصەحەکە نەبویەك کەبگونجیٚ بونەکەشی ئەوە لەدەرەوەی زیهندا هیچ نیە، بەلاٚم لەزیهندا شتە چونکە بوونەکەی نیە واتە شتەکەش نیە کەوابوو بوونەکـەی نیـە، وەنـەزاتی هەیـە وەنـە ثـابتی هەیـە ، واتـە لـەدەورەوەی زیـهندا حەقیقەتێکی بۆنیە،چونکە تەنها تەحەققی دەبیٚ بەهۆی بوونەکەیەوە دەبیٚ لەدەرەوەی بیردا. لەسەر قەولەکەیتر کە زیادکرابیٚ بەسەر شتەکەدا ئەوە ئەمانەش دوو بەشن: بـەلای زۆربەیانـەوە واتـە: زۆربـەی زۆریـان دەڵێـن: نـەبوێکی مومکین بـیٚ بونەکـەی نەلـەدەرەوەی بـیردا هەیـە و نەزاتـە و نەثابتـە، زۆربەشـیان وای بـۆ رۆیشـتون، -کەئەمانەش پێرێکن لەموعتەزیلە- کە ئەو نەبووە شتە : واتە حەقیقەتێکی ثابتەی هەیە لەدەرەوەی بیردا ،بەلاٚم صیفەتی بوونی لیٚکراوەتەوە.

(٢) قـەولی ئەصـەح ئەوەیـە کـە ئیسـم و نـاو خـودی نـاوەڕۆك و (مسَـمی)کەیـە، هەندێك وتویانە: غەیری ئەوە لەیەك جیان، چونکە بیری مرۆڤ هەر وای بۆ دەچیٚ بۆ وێنە لەفظی ئاگر جیایە لەخودی ئاگر، بێگومان ئەویان سـوتێنەرە ئـەمیان وانیـە، مەبەست بەیەکەمەکە قەولی ئەصەحەو لەئەشعەریەوە نەقلْ کراوە ئەوە لەبارەی نـاوی خواوەیە، واتە: مەدلول و ناوەڕۆکی زاتی خوا هەر خودی زاتی خوایە، واتـە: مـەدلول و (مسَـمی) هـەردوکیان بـەمانا زاتەکـەن، لـەڕووی زاتەکەیـەوە واتـە هـەر زاتەکـەی مەبەستە، بەلاٚم غـەیری ناوەکە کە صیفەتـەکانن وانین، وەك عالم ، ئەمـە مەدلولەکـەی زاتەکەیە، بـەلاٚم بـەئیعتباری صیفـەتی عیلـم ، چونکـە ئەشـعەری وتویـەتی: لـەناوی خواوە غەیری ذاتی خوا شتێکی تر فـەهم ناکریٚ، بەلاٚم غـەیری نـاوی ئەو وانیـە وەك صیفەتـەکان، کـاتێك کـەوتران وەك زاتیـان لێـوە فـەهم دەکـریٚ بـۆ وێنـە صیفـەتی عیلمیشی لێوە وەردەگیریٚ.

{و} الأصَحّ {ان اسماء الله تعالى توقيفية} اي لا يطلق عليه اسم إلاّ بتوقيف من الشرع وقالت المعتزلة يَجوزُ أن تطلق عليه الاسماء اللأئق معناها به وان لم يرد بها لاشرع ومال الى ذلك القاضي ابو بكر الباقلاني[١].

{و} الأصَحّ {أن المرؤ يقول انا مؤمن ان شاء الله} اي يَجوزُ له ان يقول ذلك المشتمل على التعليق بل يؤثره على الجزم كما روى عن ابن مسعود ﷺ {خوفا من سواء الخاتمة} المجولة وهو الموت على الكفر {والعياذ بالله} تعالى من ذلك المحبط لما قبله من الايمان {لاشكا في الحال} في الايمان فإنَّهُ في الحال متحقق له جازم باستمراره عليه الى الخاتمة التي يرجو حسنها. ومنع ابو حنيفة وغيره ان يقول ذلك لايهامه الشك في الحال في الايمان[٢]. {و} الأصَحّ {ان ملاذ الكافر} اي ما ألذه الله به من متاع الدنيا {استدراج} من الله له حيثُ يلذه مع علمه باصراره على الكفر الى الموت[٣].

(١) قەولی ئەصەح ئەوەیە کەناوەکانی خوا تەوقیفین ، واتە هیچ ناوێك نابڕێتە بەسەر خوادا دەبێ تێدا بوەستی هەتا شەرع پێت دەڵێ و فێرت دەکا موعتەزیلە وتویانە:ناوێك ماناکەی شایستەیخوا بێت دروستە بیبڕی بەسەر خوادا، باشەرعیش پێی نەهاتبێ، قازی باقلانیش مەیلی لەم بۆچوونەیە بووە.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە مرۆڤ بڵێ من باوەڕدارم انشاء الله ، واتە: دروستە ئەو قسەیە بکا کەباوەڕی پەیوەند دەکا بەویستی خواوە، نەك هەر دروستە بەڵکو تفضیل دەدرێ بەسەر رستەی جەزمدا ، چونکە وەها ریوایەت کراوە لە(ابن مسعود) ەوە ئەمەش بۆیە دروستە و وادەڵێ لەترسی خراپی و نەگبەتی ساتی کۆتایی تەمەن کەکەس نازانێ چۆنە، کەئەویش ئەوەیە مرۆڤ لەسەر بێباوەڕی بمرێ، پەنا بەخوا لەو گوناهەی کەهەرچی کرداری چاك هەیە لەباوەڕو خواپەرستی‌یەوە هەموویان دەسڕێتەوە و پوچەڵ دەکاتەوە. ئەوە دەڵێ نەك لەبەر ئەوەی کەئێستە گومانی هەیە لەباوەڕەکەیدا، چونکە ئێستە بڕواییێکی بێگومانی هەیە نیازیشی سورە لەسەر ئەوە کە بەردەوام بێ لەسەری هەتا کۆتایی ژیانی کەهیواداره کۆتایی تەمەنی بەچاکە بێ، ئەبوحەنیفەو غەیری ئەویش قەدەغەیان کردوە موسڵمان ئەوە بڵێ، چونکە وائەخاتە دڵی گوێگرەوە کە ئێستە گومانی هەیە لەباوەڕەکەیدا.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە کەئەوشت وەکانەی خوا خستویەتیە بەردەمی بێباوەڕان لەزەتیان پێدەبەن و رادەبوێرن پێیان ئەوانە نیعمەت نین بەڵکو پلە سازیەکە لەلایەن خواوە بۆ ئەو بێباوەڕە بۆئەوەی هەرڕۆژە پلەییێکی پێدەباتە خوارەوە، چونکە خوا ئەو رابواردنەی بۆ دەسازێنێ لەگەڵ ئەوەش دەزانێ هەربەردەوام دەبێ، لەسەر بێباوەڕی خۆی هەتا مردن .

فهي نقمة عليه يزداد بها عذابه وقالت المعتزلة انها نعمة يترتب عليها الشكر[1].

{و} الأصَحّ {أني المشار إليهِ بأنا الهيكل المخصوص} المشتمل على النفس وقال أكثر المعتزلة وغيرهم هو النفس لانها المدبِّرة[2]{و} الأصَحّ {أن الجوهر الفرد وهو الجزء الذي لا يتجز اثابت} في الخارج وان لم يرعاة الابانضمامه الى غيره ونفي الحكماء ذلك[3].

{و} الأصَحّ {انه لا حال اي لاواسطة بين الموجود والمعدوم خلافاً للقاضي} ابي بكر الباقلاني {واما الحرمين} في قولهما كبعض المعتزلة بثبوت ذلك كالعالمية واللونية للسواد مثلاً وعلى الاول ذلك ونحوه من المعدوم لانه امر اعتباري[4].{و} الأصَحّ {أن النسب والاضافات امور اعتبارية} يعتبر ها العقل {لا وجودية} بالوجود الخارجي وقال الحكماء الاعراض النسبية موجودة في الخارج[5].

---

(١) کەوابوو ئەو رابواردنانە نیعمەت نین بەڵکو تاڵاون بۆی ئازاری پیٚزیاد دەکا، موعتەزیلە وتویانە ئەوانە هەر نیعمەتن دەبیٚ شوکر و سوپاسی خوایان لەسەر بکا، لەسەر بیٚباوەڕیەکەی تۆڵەی دەدریٚ و لەسەر سوپاس نەکردنەش .

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە ئەو کەسەی ئامارژە دەکا بۆ خۆیو دەڵیٚ: من ئەو کارەم کرد مەبەست ئەو هەیکەل و لاشە تایبەتەی خۆیەتی کەنەفسەکەشی دەگریٚتەوە . زۆربەی زۆری موعتەزیلە وتویانە: ئەو ئامارژەپیٚکراوە نەفسەکەیەتی ، چونکە نەفس تەکبیرکەری لاشەکەیەو ریٚنمایی دەکا.

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە (جەوهەری فەرد) کە بریتیە لەو جوزئەی کە ئیتر لەبەر بچوکی قەبوڵی دابەش بوون ناکا لەدەرەوەی ذیهن و بیردا هەیە و ثابتە، هەر چەند عادەتەن نابینریٚ هەتا شتیٚکیتری پیٚوە دەلکیٚنریٚ حوکەماکان دەڵیٚن: جەوهەری فەرد نیە .

(٤) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە حاڵ نیە واتە: پلەی مامناوەندی لەنیٚوان بوون و نەبووندا نیە، بەڵام باقلانی و ئیمام الحرمین وەك هەندیٚ لەموعتەزیلە دەڵیٚن: شتیٚك هەیە لەنیٚوان بوون و نەبوون دا، وەك ئەو مەصدەرانەی لەسەر کیٚشی (ئیسمی فاعل) و (مفعول)ن وەك : عالمیّة و لونیّة بۆ رەشایی، بەڵام لەسەر قەولی یەکەم ئەوانەو ویٚنەی ئەوانە لەبەشی نەبوون چونکە ئەمانە شتیٚکی ئیعتبارین بونیان نیە .

(٥) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە هەموو ئیضافەو خستنەپاڵەکان چەند کاریٚکی ئیعتبارین عەقڵ لەبیردا دروستیان دەکا،هیچ جۆرە بونیٚکی دەرەوەیذیهن وبیریان نیە حوکەماکان وتویانە:عەرەضی نیسبیوخستنەپاڵ لەدەرەوەیذیهندا بونیان هەیە.

وهي سبعة : الاين وهو حصول الجسم في المكان والتي وهو حصول الجسم في الزمان. والوضع وهوهيئة تعرض للجسم باعتبار نسبة أجزائه بعضها الى بعض ونسبتها الى الامور الخارجة عنه كالقيام والانتكاس. والملك وهوهيئة تعرض للجسم باعتبار ما يحيط به ونتقل بانتقاله كالتقمص والتعمم. وان يفعل وهو تاثير الشيء في غيره مادام يؤثرلا. وان ينفعل وهو تاثر الشيء عن غيره مادام يتاثر كحال المسخن مادام يخسن والمتسخن مادام يتسخن. والاضافة وهي نسبة تعرض للشيء بالقياس الى نسبة اخرى {كالابوة والبنوقو}[1]. الأصَحّ {أن العرض لا يقوم بالعرض} وانم يقوم بالجواهر الفرد أو المركب أي الجسم كما تقدَّمَ وجوز الحكماء قيام العرض بالعرض إلاّ انه بالآخرة تنتهي سلسلة الاعراض الى جوهر[2]..

---

(١) ئەوانەش حەوتن: ١-(اين) كوێ؟ كە بريتيە لەوەی كەشتێك لەشوێنێك بێ. ٢-(متى)، كەی؟ ئەوەيە شتێك لەكاتێكدا بێت. ٣-(وضع) جۆرە شێوازێكە بۆ شتێك بۆی پەيدا دەبێ بەهۆی ئيعتباری هەندێكيان بەگوێرەی هەندێكی‌تريان وەبەگوێرەی هەندێ لەجوزئی ئەوشتە بەنيسبەت شتێ لەو لاشەو شتە نەبێ، وەك راوەستان ئەم ديمەنە بۆ ئەم لاشە راوەستاوە پەيدا دەبێ بە ئيعتباری نيسبەتی هەندێ ئەندامی بۆ هەندێكی‌تری ، وەك نيسبەتی سەر بۆ هەردوو پێ، وە بەنيسبەت شتە دەرەكيەكان ، وەك نيسبەتی سەر بۆ لای ژورەوە، يا نيسبەتی پێ بەلای خوارەوە، يا وەك (انتكاس) سەر بۆ خوار و پێ بۆ ژوور . ٤-وەك مولك، بريتيە لەشێوازێك بۆ شتێك پەيدا دەبێ بەئيعتباری ئەوەی كە دای دەگرێتەوە، وەنەقڵ دەكرێ و دەگوێزرێتەوە بەهۆی گوێزرانەوەی ئەوەوە، وەك كراس لەبەر كردن و عەمامە بەستن . ٥-ئەوەی كاربكا كەبريتيە لەوەی شتێك (تاثير) لەغەيری خۆی بكا، مادەم تاثيری هەبێ. ٦-انفعال بريتيە لەوەی شتێ (تاثير)ی لێ بكا لەلايەن غەيری خۆيەوە، لەكاتێكدا قەبوڵی ئەو (تاثير)ە دەكا، وەك حاڵی گەرم كەرێك مادەم خەريكی گەرم كردنەكە بێ، بۆ دوەميش وەك ئەو ئاوەی گەرم دەكرێت لەكاتی گەرم كردنەكەيدا . ٧-اضافەيە، ئەميش بريتيە لەخستنە پاڵێك كەپەيدا دەبێ بۆ شتێك بەقياسی دانە پاڵی شتێكی‌تر لەبووندا، وەك باوكايەتی و كوڕايەتی.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەيە عەرەز قيامی بەعەرەزەوە نابێ، بەڵكو قيامی بەجەوهەری تاكەوە دەبێ، ياخود مركب و پێك هاتەوە دەبێ، واتە بەجيسمەوە وەك لەپێشەوە رابوورد، حوكەما گوتويانە دروستە قيامی بەعەرەزەوە بەڵام لەسەرەنجامدا زنجيرەی عەرەزەكان كۆتايی دێتەوە سەر جەوهەر ..

..اي جوزوا اختصاص العرض بالعرض اختصاص النعت بالمنعوت كالسرعة والبطء للحركة وعلى الاول هما عارضان للجسم اي انه يعرض له لاتخلل الحركة فيه بسكنات او تخللها بذلك[1].

{و} الأصَحّ ان العرض {لا يبقى زمانين} بل ينقضي ويتحدد مثله بارادة الله تعالى في الزمان الثاني وهكذا على التوالي حتى يتوهم اي يقع في الوهم اي الذهن من حيث المشاهدة انه أمر مستمر باق وقال الحكماء انه يبقي إلاّ الحركة والزمان بناء على انه عرض وسيأتي[2] {و} الأصَحّ ان العرض {لا يحتمل محلين} فسواد احد المحلين مثلاً غير سواد الآخر وان تشاركا في الحقيقة وقال قدماء المتكلمين القرب ونحوه مما يتعلق بطرفين يحل محلين وعلى الاول قرب احد الطرفين مخالف لقرب الآخر بالشخص وان تشاركا في الحقيقة وكذا نحو القرب كالجوار[3].

---

(١) واتە: وتویانە: دروستە قیامی عەرەز بەعەرەزێکەوە هەبێ وەك تایبەت کردنی صیفەت بەموصوفەوە، بۆ نموونە چالاك و لەسەرخۆ بکرێنە صیفەت بۆ حەرەکەو بزوتن، بڵێن : ئەم بزوتنە سەریعە یان لەسەر خۆیە، لەسەر قەولی یەکەم ئەم دوانە عەرەزو پەیدا دەبن بۆ جیسم نەك بۆ حەرەکەکە، واتە بۆی پەیدا دەبێ، واتە جاری واهەیە هەڵسوڕانەکان سەکەنە ناکەوێتە نێوانیانەوە ئەوە سەریعە، یاخود جاری واهەیە سەکەنە دەکەوێتە نێوانیانەوە ئەوە بطیئ و لەسەرەخۆیە.

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە عەرەز بۆ دوو چرکە نامێنێتەوە، بەڵکو هەر بەچرکەی یەکەم کۆتایی پێ‌دێ بەویست و ئیرادەی خوا لەچرکەی دوەمدا هەر وەکو چرکەی یەکەم تازە دەبێتەوە، هەروەها ئەم بەشوێن ئەودا دەڕوا هەتاوەکو وادەکەوێتە زیهنی مرۆڤەوە کە دەیبینێ وادەزانێ هەر بەردەوامەو دەمێنێ، حوکەما وتویانە: عەرەز دەمینێتەوە جگە لەحەرەکەو کات نەبێ و دەنگەکان -بەڵام ئێستە سەلمێنراوە کەئەمانەش هەر دەمێننەوە- بۆیە وایان وتوە چونکە ئەمانە عەرەزێکن هەموو چرکەیەك تازەدەبنەوە، لەمەودوا باسێکیان لێوەدەکرێ .

(٣) قەولی ئەصەح ئەوەیە کەعەرەز لەیەك کاتا نانیشێ بەدوو جێوە، چونکە ڕەشایی ئەم شوێنە غەیری ڕەشایی شوێنەکەی‌ترە باحەقیقەتەکەیان یەك بێ، زانایانی کۆنی عیلمی کەلام وتویانە نزیکی و وێنەی ئەو لەو شتانەیە کەپەیوەندی بەهەردوو لاوە لەبەر ئەوە عەرز دەنیشێ بەدوو شوێنەوە، لەسەر قەولی یەکەم وەڵامی ئەمانە ئەدرێتەوە کەنزیکی ئەم لا لەگەڵ نزیکی ئەولادا لەڕووی شەخصەوە لەیەك جیان بالەحەقیقەتدا یەك بن، نەك هەر نزیکی وایە بەڵکو نزیکی وایە دەرهاوسێیەتی.

{و} الأصَحّ {أن} العرضين {المثلين} بان يكونا من نوع {لا يجتمعان} في محل واحد وجوزت المعتزلة اجتماعها محتجين بان الجسم المغموس في الصبغ ليسود يعرض له سواد ثُمَّ آخر وآخر الى أن يبلغ غاية السواد بالمكث. و أُجيبَ بان عروض السودات لهُ ليس على وجه الاجتماع بل البدل فيزول الاول ويخلفه الثاني وهكذا بناء على أن العرض لا يبقى زمانين كما تقدَّمَ {كالضدين} فانهما لايجتمعان كالسواد والبياض {بخلاف الخلافين} وهما اعم من الضدين فانهما يجتمعان من حيثُ الاعمية كالسواد والحلاوة وفي كل من الاقسام يَجوزُ ارتفاع الشيئين {اما النقيضان فلا يجتمعان ولايرتفعان} كالقيام وعدمه[1]. {و} الأصَحّ {ان احد طرفي الممكن} وهما الوجودو العدم {ليس اولى به} من الآخر بل هما بالنظر الى ذاته جوهرا كان أو عرضا على السواء وَ قِيلَ العدم أولى به لانه أسهل وقوعا في الوجود لتحققه بانتفاء شيء من أجزاء العلة التامة للوجود المفتقر في تحققه الى تحقق جميعها[1].

---

(١) قەولی ئەصەح وایە عەرەزی هاوونێنە لەیەك جۆر بن لەیەك جێدا هەردوو كۆنابنەوە، ، موعتەزیلە وتویانە: دروستە كۆبنەوە بەڵگەشیان ئەوەیە قوماشێك بچەقێنە بەناو صوبغێكی رەشدا پاشان جارێكی‌تر ئەمجا جارێكی‌تر هەتا دەگاتە ئەوپەڕی رەشایی بەهۆی مانەوەی رەشایی لەسەر رەشایی، وەڵام دراونەتەوە پەیدابونی ئەم هەموو رەشاییانە یەك لەدوای یەك بۆ ئەو قوماشە لەو رووەوە نیە كۆبوونەتەوە، بەڵكو لەڕوی بەدەلیەتەوەیە ئەو هاتوە ئەمیانی لابردوە، یەكەم لادەچێ و دوەم دێتە شوێنی هەروەها ئەوانی‌تریش، ئەمەش لەسەر ئەو قەولە دروست دەبی كەعەرەز دوو چركە نامێنێتەوە، وەك چۆن لەپێشەوە رابوورد وەك چۆن دوو دژ وەك رەشایەتی و سپیایەتی كۆنابنەوە، بەڵام دووشت خیلاف و جیاواز لەگەڵ یەك كۆدەبنەوە لەڕووی گشتگیریەكەیانەوە، وەك رەشایەتی و شیرینایەتی ئەم دوانە لەدوو دژەكە گشتگیرترن، لەهەر یەك لەم چوار بەشە ئەگونجێ هەردوك لایان نەبن، وەك ئەو شتە رەشیش نەبێ و سپیش نەبێ بەڵكو شین بێ، بەڵام دوشت كە نەقیض و هەڵوەشێنەرەوەی یەك بن ئەوانە نابێ پێكەوە كۆبنەوە ناشبێ هەردولاشیان نەبێ، وەك وەستان و نەبوونی وەستان .

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە كەیەكێك لە دوولایەنەی مومكین كە بوون و نەبوونە شایستەتر نیە پێ لەوی‌تر بەڵكوو هەردوكمیان ئەگەر تەماشای زاتەكەی بكەی چ جەوهەر بێ یاخود عەرەز یەكسانن، هەندێك وتویانە: نەبونەكەی شایستە ترە بێ، چونكە نەبوون ئاسان پەیدا دەبێ چونكە بەفەوتانی شتێك لەبەشەكانی عیلەتی كامل

{وَ قِيلَ الوجود اولى به عند وجود العلة وانتفاء الشرط لانه قد وجدت العلة وانما لم يوجد هو لانتفاء الشرط[1]. {و} الأصَحّ {ان} الممكن {الباقي محتاج} في بقائه {الى السبب} اي المؤثر وَ قِيلَ لا {وينبني} هذا الخلاف {على ان علة إحتياج الاثر} اي الممكن في وجوده {الى المؤثر} {الى المؤثر} اي العلة التي يلاحظها العقل في ذلك {الامكان} اي استواء الطرفين بالنظر الى الذات {اوالحدوث} اي الخروج من العدم الى الوجود {اوهما} على انهما {جزآ علة او الامكان بشرط الحدوث وهي اقوال}[2]. فعلى او لها يحتاج الممكن في بقائه الى المؤثر لان الامكان لاينفك عنه وعلى جميع باقيها لا يحتاج إليهِ لان المؤثر انما يحتاج إليهِ على ذلك في الخروج من العدم الى الوجود لافي البقاء وكانه اشار بذكر هذا البناء الماخوذ من الصحائف مع اطلاق الاقوال وتقديم الامكان منها الى انه ينبغي ترجيح الامكان[3].

---

نەبون پەیدادەبێ،بەڵام بوون بۆ پەیدا بوونەکەی پێویستی بەهەموو جوزئەکان دەبێ.

(١) هەندێك وتویانە: بوون شایستەترە بەو مومکینە کاتێ عیلەتەکەی هەیە بامومکینەکەش نەهاتبێتە دی لەبەر فەوتانی مەرجەکەی .

(٢) قەولی ئەصەح ئەوەیە کە مومکین وەك بۆ پەیدابوونی پێویستی بەعیلەت هەیە بۆ ماناکەشی پێویستی بەهۆکارو عیلەت و مؤثر هەیە، هەندێك وتویانە بۆ پەیدابوونەکەی هەیەتی بەڵام بۆ مانەکەی نیەتی ئەم جیاوازیە لەسەر ئەوەدا دروست دەبێ کەئایا بۆچی ئەو ئەثەرە واتە: ئەوەی بوونەکەی مومکینە پێویستی بەمؤثر هەیە؟ مؤثر واتە: ئەو عیلەتەی کە عەقڵ تێبینی دەکا لەوەدا. هەیە دەڵێ: عیلەتەکەی ئیمکانە، واتە ئیمکانەکەی بەگوێرەی زاتەکەوەیە کە بوون و نەبوونە یەکسانن، هەیە دەڵێ: عیلەتەکەی حدوثە، واتە لەنەبوون دەرچوونە بۆ بوون، هەیە دەڵێ: هەردوکیان ئیمکان و حدوثلەسەر ئەو بنەڕەتەیە، کە ئەم دوانە دوو جوزئی عیلەتەکەن، هەیە دەڵێ: عیلەتەکە ئیمکانە بەمەرجی حدوث، ئەوانە چوار قەولن .

(٣) جا لەسەر قەولی یەکەم مومکینە کە بۆ مانەوەکەی پێویستی بەمؤثر دەبێ، چونکە ئیمکانی لێنابێتەوە، عیلەتیش بوو مەعلولیش دەبێ، لەسەر هەموو قەولەکانی‌تر پێویستی بەمؤثر نابێ، چونکە بۆیە پێویستی پێی بوو بۆ ئەوەی لەنەبوون دەریکا بۆ بوون، ئیتر لەمانەوەیدا پێویستی پێی نیە، واگومان دەبرێ کەدانەر بەباسکردنی ئەم بینا جیاوازیە کەوەرگیراوە لەکتێبی: (الصحائف) لەگەڵ ئەوەش بەمطلقی قەولەکانی وت تەرجیحی هیچ کامی نەکرد و ئیمکانیشی پێش خست بەمە ئاماژەی کرد بۆ ئەوە کە پێویستە تەرجیحی ئیمکان بدرێ .

الذي هو قول الحكماء وبعض المتكلمين وان كان جمهورهم على الحدوث حتى لايخالف التصحيح في المبني التصحيح في المبني عليه لكن دفعت المخالفة بما قالوا من ان شرط بقاء الجوهر العرض والعرض لايبقى زمانين فيحتاج في كل زمان الى المؤثر[1]. {والمكان} الذي لاخفاء في ان الجسم ينتقل عنه واليه ويسكن فيه فيلاقيه ولا بد بالمماسة او النفوذ كما سيأتي اختلف في ماهيته[2].

{قيل} هو {السطح الباطن للحاوي لاماس للسطح الظاهر من المحوي} كالسطح الباطن للكوز الماس للسطح الظاهر من الماء الكائن {فيه وَ قِيلَ } هو {بعد موجود ينفذ فيه الجسم} بنفوذ بعده الائم به في ذلك البعد بحيث ينطبق عليه وخرج بقيد النفوذ فيه بعد الجسم[3] {وَ قِيلَ } وهو {بعد مفروض} اي يفرض فيه ماذكر من نفوذ بعد الجسم فه {وهو} اي البعد المفروض[4].

---

(١) کەئەوەش قەولی حوکەماکانەو هەندێ لەزانایانی عیلمی کەلامە، هەرچەندە جەماوەری زانایانی عیلمی کەلام لەسەر ئەوەن کە عیلەتەکە حدوثە بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەوەنبێ کە بەصەحیح زانراوە و بینای ئەو صەحیحەی لەسەرکراوە، بەڵام دەفعی ئەو جیاوازیە کراوە بەوەی وتراوە مەرجی مانەوەی جەوهەر عەرەضە، عەرەضیش لەدوکات و چرکەدا نامێنێتەوە، لەبەر ئەوە لەهەموو کاتێکدا پێویستی بەمؤثر هەیە.

(٢) مەکان و شوێن کەهیچ شاراوەیی تێدا نیە، ئەوەیە جیسمێك لێوەی بگوێزرێتەوە و یەکێکی‌تری بۆ بێتەوەوەتیایدا جێگیر بێ ئەمجار پێوە بتلێ، جا کەپێوەی بتلێ بەمماسە یاخود بەنفوذ دەبێ، وەك لەمەودوا دێ ئەو مەکانە زانایان رای جیاوازیان هەیە لەبارەی حەقیقەتەکەیەوە، هەندێك وتویانە: حەقیقەتی مەکان بریتیە لە سەطحی ناوەوەی ظەرفەکە کە تلاوە بە سەطحی دەرەوەی مەظروفەکەوە، وەك سەطحی ناوەوەی گۆزەکە کە ئەتلێ بەسەطحی دەرەوەی ئەو ئاوەی کەتیایەتی.

(٣) هەندێك وتویانە: مەکان بریتیە لەو لایەنانەی -درێژی و قوڵی و پانی- یە کەهەن جیسمەکەیان تێیان دەچێ بەهۆی ئەوەی لایەنەکەی ئەم چوونە ناوی کە جیسم بەهۆی ئەوەوە بەندە لەو لایەنەوە پێیەوە، چونکە دەبڕێ بەسەریا بەوەی کەوتی: جیسمەکەی تێبچێ لایەنەکانی جیسمەکە چوونەدەر،

(٤) هەندێك وتویانە: مەکان بریتیە لەو لایەنانەی کەبەخەیاڵ هەن وای بۆ گریمان دەکرێ کە لایەنەکانی جیسمی تێبچێ، جا ئەو لایەنە فەرزکراوانە خەلان ..

{الخلاء والخلاء جائز والمراد منه كون الجسمين لايتمسان ولا} يكون {بينهما ما يماسهما} فهذا الكون الجائز هو الخلاء الذي هو معنى البعد المفروض الذي هو معنى المكان فيكون خالياعن الشاغل هذا قول المتكلمين و القولان للحكماء ومنعوا الخلاء اي خلو المكان بمعناه عندهم عن الشاغلِ إلاّ بعض القائلي الثاني فجوزوه(1).

{والزمان قيل} هو {جوهر ليس بجسم} اي ليس بمركب {ولا جسماني} اي ولا داخل في الجسم فهو قائم بنفسه مجرد عن المادة {وَ قِيلَ فلك معدل النها ر} وهو جسم سميت دائرته اي منطقة الروج منه بمعدل النهار لتعادل الليل والنهار في جميع البقاع عند كون الشمس عليها {وَ قِيلَ عرض فقيل حركة معدل النهار وَ قِيلَ مقدار الحركة} المذكورة ومنهم من عبر بحركة الفلك ومقدارها(2). {والمختار} انه {مقارنة متجدد موهوم لمتجدد معلوم ازالة للابهام} من الاول بمقارنته للثاني كما في آتيك عند طلوع الشمس وهذا قول المتكلمين والاقوال قبله للحكماء(3).

---

(1) خەلایش دروستە ، مەبەست بەخەلایش دوو جیسم هەبن و لەیەکیش نەدەن و هیچ شتێکیش نەبێ لەنێوانیاندا بەیەکیان بگەیەنێ، دروست بوونی شتی وەها بریتیە لەخەلا کەئەویش مانای ئەیو لایەنە فەرزکراوەنەیە کەبەواتای مەکانە، کەوابوو مەکان خالیە لەوەی شاغیلێکی هەبێ، ئەم قیلەی دواوە قسەی زانایانی عیلمی کەلامە، دوانەکەی پێشوش قسەی حوکەمایە، ئەمانە شتی وەها بەراست نازانن کەمەکان ئەوەبێ شتێك نەبێ مەشغول بکا و خالی بێ، تەنها هەندێ لەبۆچوونی لەبۆرژەکانی قیلی دووەم بەرەوایان زانیوە و بەگونجاویان زانیوو.

(2) زەمان و کات جەوهەرە لەجیسم پێك نەهاتووە، وەبەشێکیش ینە لەجیسم کەوابوو زەمان بەخودی خۆیەوە بەندە رووتە لەمادە، هەندێك وتویانە زەمان بریتیە لەو فەلەکەی ئەندازەی شەو و رۆژ یەکسان دەکا، ئەوەش جیسمە بورجی ئەو ناوچەیە ناودەبرێ، بە (معدّ النهار) چونکە شەوو رۆژ یەکسان دەکا لەهەموو ناوچەیەکی زەویدا لەکاتێك دا کە رۆژ دەگاتە سەری ، هەندێك وتویانە: کات و زەمان عەرضن لەبەر ئەوە هەندێك وتویانە: بریتیە لەو جوڵەی فەلەکی(معدّ النهار) ، هەندێکیتریش وتویانە: بریتیە لە ئەندازەی جوڵەی ناوبراو هەندێکیشیان لێکیان داوەتەوە بەجوڵەی فەلەکی (أعظم) وئەندازەی ئەو .

(3) قەولی هەڵبژاردە لەسەر ئەوەیە کە زەمان بریتیە لەوەی متجددێکی نەزانراو مقارەنە بکرێ بەمتجددێکی زانراو بۆ ئەوەی ابهام ونادیارێك لەیەکەمدا هەیە نەیهێڵێ بەهۆی ئەوەی کە مقارەنەی دووەمی کردووە، وەك ئەم نموونەیە: دێم بۆ لای تۆ

{ويمتنع تداخل الاجسام} اي دخول بعضها في بعض على وجه النفوذ فيه والملاقاة له باسره من غير زيادة في الحجم وامتناع ذلك لما فيه من مساواة الكل للجزء في العظم {و} يمتنع {خلوا لجوهر} مفردا كان او مركبا {عن جميع الاعراض} بان لا يقوم به واحدمنها بل يجب أن يقوم به عند وجوده شيء منها لانه لا يوجد بدون التشخص والتشخص انما هو بالاعراض[1].

{والجوهر} المركب وهو الجسم {غير مركب من الاعراض} لانه يقوم بنفسه بخلافها {والابعاد} للجوهر من الطول والعرض والعمق {متناهية} اي لها حدود تنتهي اليها[2] {والمعلول قال الاكثر يقارن علته زمانا} عقلية كانت او وضعية {والمختار وفاقا للشيخ الامام} والد المصنف {يعقبها مطلقاً وثالثها} يعقبها {ان كانت وضعية لا عقلية} فيقارنها {اما الترتب} اي ترتب المعلول على العلة {رتبة فوفاق}[3].

---

-متجددی مەوهوم-کاتیٚ هەڵهاتنی رۆژ -متجددی مەعلوم-ئەم قسەیە هی زانایانی عیلمی کەلامە قسە پێشوەکانیش هی حوکەمان .

(۱) هەندیٚ جیسم بچێتە ناو هەندێکیتر بەو شێوەیە بچێتە ناویەو بتلێبەهەموو بەشێکیشیەوە بیٚ ئەوەی قەبارەی زیاد بکا، ئەمە قەدەغەیە و نابیٚ، بۆیە قەدەغەشە چوونکە (کل) دەبێتە یەکسانی (جزء)لەگەورەیی و قەبارەدا وەنابیٚ جەوهەر تاك بیٚ یاخود پێکهاتەبیٚ خاڵیبیٚ لەهەموو عەرەضێك هیچ عەرەضێکی پێوە نەبیٚ بەڵکو واجبە لەکاتی بوونی جەوهەردا شتێك لەعەرەضی پیٚوەبیٚ ، چونکە جەوهەری بیٚ عەرەض بوونی نیە ، تەشەخص و دیاری کردنی شەخصی هەر شەخصیٚ بیٚ تەنها بەعەرەض دەبیٚ.

(۲) جەوهەری پێکهاتە بریتیە لەجیسمێك لە چەند عەرەزێك پێك نەهاتبیٚ، چونکە جەوهەر پەیوەندە بەخودی خۆیەوە ، بەڵام غەری جەوهەر وانیە ئەبعادو لاکانی جەوهەر کە پانی و درێژی و قوڵاییە سنورێکیان هەیە و بەوە کۆتاییان پیٚدێت بەگەیشتن بەو سنوورە.

(۳) زۆربەی زانایان وتوویانە: مەعلول هاوکاتی عیللەتەکەیەتی چ عەقڵی بیٚ یا وەضعی بیٚ، قەولی هەڵبژاردە ئەوەیە کەباوکی دانەریش هامدەنگیەتی دەڵیٚ: بەدوای عیللەتدا دێت چ عەقڵی بیٚ یا وەضعی بیٚ، قەولی سێهەم دەڵیٚ: ئەگەر وەضعی بیٚ دێت بەشوێنیا، بەڵام ئەگەر عەقڵە بێت هاوکاتیەتی، بەڵام لەڕووی بەشوێندا هاتنی مەعلول لەدوای عیلەتەوە لەڕووی پەیدا بونەوە ئەوە هەموویان یەك رایان هەیە کە مەعلول لەدوای عیلەتەوەیە.

واللذة} الدنيوية وهي بديهية {حصرها الامام} الرَّازي {والشيخ الامام} والد المصنِّف {في العارف} اي ما يعرف اي يدرك قالا وما يتوهم اي يقع في الوهم اي الذهن من لذة حسية كقضاء شهوتي البطن والفرج او خيالية كحب الاستعلاء والرياسة فهو دفع الالم فلذة الأكل والشرب والجماع دفع الم الجوع والعطش ودغدغة المني لأوعيته ولذة الاستعلاء والرياسة دفع الم القهر والغلبة[1] .

{وقال ابن زكريا} الطيب {هي الخلاص من الألم} بدفعه كما تقدَّمَ ورد بانه قد يلتد بشيء من غير سبق الم يضده كمن وقف على مسئلة علم او كنز مال فجأة من غيره خطورهما بالبال والم التشوق اليهما[2]{وقِيلَ } هي {ادراك الملائم} من حيث الملاءمة {والحق ان الادراك ملزومها} لا هي {ويقابلها الألم} فهو على الاخير ادراك غير الملائم[3].

---

(١) لەزەتی دنیا –پێناسەی ناکرێ چونکە دیارە– بەڵام رازیو باوکی دانەر وتویانە: تەنها لەوەدایە کەدەزانرێ و دەرك دەکرێ، جا وتویانە: لەوانەیە لەخەیاڵدا بوترێ : لەزەت بریتیە لە لەزەت بردن بەئەندامە دیارەکان وە جێبەجێکردنی ئارەزواتی سك وعەورەت، یاخود بریتی بێت لە لەزەتە خەیاڵیەکان وەك خۆشەویستی بوڵندی و سەروەری، ئا ئەم دوو جۆرە لابردنی ئێش و ئازارن نەك لەزەتن، چونکە لەزەتی خواردن و خواردنەوە جیماع کردن لابردنی ئازاری برسیەتیو تینویەتیو ئازاردانی مەنیە بۆ ظەرفەکەی ، ولەزەتی پایە بوڵندی و شەروەری لابردنی ئازاری ستەم و زاڵبوونە.

(٢) ابن زکریای پزیشك وتویەتی: لەزەت بریتیە لە رزگاربوون لە ئێش و ئازار بەهۆی لابردنی ئازارەکەوە ، وەك لەپێشەوە رابوورد وەڵام دراوەتەوە کە جاری واهەیە مرۆڤ لەزەت لەشتێك دەبات بێئەوەی ئازاری دژەکەی چەشتبێ، وەك کەسێك کتوپڕ دەکەوێ بەسەر زانینی بابەتێکی عیلمیدا ، یا خود کتوپڕ ئەکەوێ بەسەر خەزنەیەکدا بێ ئەوەی هیچ کامیان هاتبن بەدڵیدا و ئازاری ئارەزومەندی چەشتبێ بۆیان.

(٣) هەندێ وتویانە: لەزەت بریتیە لەئیدراکی شتی گونجاو بۆت لەو روەوە کە گونجاویەتی . قسەی هەق و راست ئەوەیە کە ئیدراك بریتیە لەمەلزومی لەزەت نەك لەخودی لەزەت. لەسەر ئەو سێ قەولە بەرامبەر لەزەت بریتیە لە ئەلەم و ئازار کەوا لەسەر قەولی ئاخریان بریتیە لە ئیدراکی شتی گونجاوی نەبێ و ملائمی نەبێ.

{وما تصوره العقل اما واجب او ممتنع او مكن لان ذاته} اي المتصور {اما ان تقتضي وجوده في الخارج اوعدمه او لا تقتضي شيئا} من وجوده او عدمه والاول الواجب والثاني الممتنع والثالث الممكن[1].

{تصوف}

{خاتمة} فيما يذكر من مبادي التصوف المصفي للقلوب وهو كما قال الغزالي تجريد القلب لله واحتقار ماسواه. قال وحاصله يرجع الى عمل القلب والجوارح ولذلك افتتح المصنّف بأس العمل فقال {اول الواجبات المعرفة} اي معرفة الله تعالى لانها مبني سائرة الواجبات اذ لا يصح بدونها واجب بل ولا مندوب {وقال الاستاذ} ابو اسحق الاسفرايني {النظر المؤدي اليها} لانه مقدمتها {والقاضي} ابو بكر الباقلاني {اول النظر} لتوقف النظر على اول اجزائه[2]. {وابن فورك وامام الحرمين القصد الى النظر} لتوقف النظر على قصده[3].

(١) ئەوەی عەقڵ بیری لێدەکاتەوە یاواجبە یا ممتنعە یا مومکینە ، چونکە خودی ئەوەی بیری لێ دەکرێتەوە یا داوای بوونەکەی دەکا لەدەرەوە زیهن و بیردا ، یاخود داوای‌نەبوونەی دەکا،یاخود داوای‌هیچ کامیان ناکات نەبوونەکەی و نە نەبوونەکەی، یەکەمیان واجبە و دوەمان ممتەنعەو سێ‌هەمیان مومکینە.

{تصوف}

(٢)ئەمەش بابەتێکە کۆتاهێنەرە بەم کتێبە لەبارەی پێشەکیەکانی صۆفیگەری‌یەوە دەدوێ کەپاڵفتەکەری دڵانە، صۆفیگەری وەك غەزالی‌وتویەتی: بریتیە لەروتکردن و سازدانی دڵ تەنها بۆ خودا و جگە لەخوا بەسوك بزانرێ و لەجێیەك و پیرۆزی وەك دڵدا جێگەی نەبێتەوە، هەروەها دەڵێ: کورتە و پاڵفتەی صۆفیگەری دەگەڕێتەوە بۆ دڵ و ئەندامەکان کاربەشەرعی خوا بکەن، هەرلەبەر ئەوە دانەر ئەم بابەتە کە بەبەردی بناغەی کردارەکانی لاشە کردەوە ، وتی: یەکەم شتێ کەواجب و پێویست بێ بریتیە لەناسینی خوا ؛ چونکە واجبەکانی‌تر هەموویان لەسەر ئەوە دروست دەکرێن،چونکە هیچ واجبێك نەك هەر واجب بەڵکو سوننەتیش بەبێ ناسینی خوا دروست نیە. مامۆستا ئەسفەراییینی‌وتویەتی:یەکەم واجب بیرکردنەوەوتێڕامانێکە سەرەنجامەکەی ناسینی‌خوا بێ،چونکە تێڕامان پێشەکی‌ناسینی‌خوایە.باقلانی وتویەتی:یەکەم واجب بیرو تێڕامانە ، چونکە تێڕامان دەوەستێ نایەتە دی هەتا هەموو جوزئەکان یەك بگرن

(٣) ئەم دوانە وتویانە: یەکەم واجب بریتیە لەنیازی بیرکردنەوە وتێڕامان ، چونکە تێڕامان دەوەستێ و ناکرێ هەتا نیازی دەکرێ .

{وذو النفس الأبية} اي التي تـأبى إلاّ العلـو الاخـروي {يـر بابـها} اي يرفعـها بالمجاهدة {عن سفساف الامور} اي دينئها من الاخلاق المذمومة كالكبر والغضب والحقد ولاحسد وسوء الخلق وقلة الاحتمال {ويجنح} بها {الى معاليها} من الاخلاق المحمودة كالتواضع والصبر وسلامة الباطن والزهد وحسن الخلق وكثرة الاحتمال فهو على الهمة وسياتي دينئها وهذا اما خوذ من حديث ان الله يحب معالي الامور ويكره سفسافها رواه البيهقي في شعب الايمان والطبراني في الكبير والاوسط[1].

{ومن عرف ربه} بما يعرف به من صفاته {تصور تبعيده} لعبده باضلاله {وتقريبه} له بهدايته {فخاف} عقابه {ورجا} ثوابه {فاصغي الى الامر والنهي} منه {فارتكب} ماموره {واجتنب} منهيه[2].

(١) كەسیٚ خاوەنی نەفسی شەریفە هیچ شتێکی ناویٚ غەیری بوڵندی قیامەت نەبیٚ ئەوە بەزەحمەت کێشان و ماندوو بوون نەفسی بەرزەکاتەوە لەهەموو شتە سوکەکان وە نایەڵێ بنیشێتەوە پێیانەوە ، وەهەندیٚ لەوانە خورەوشتی پەست و بیٚبەهایە، وەك فشەو خۆبەگەورە دانەقەڵەم و تورەیی و دڵپیسی و حەسودیو رەوشت ناشیرینی و کەم هەڵکردن لەگەڵ خەڵکیدا و زەحمەتی خەڵك قەبوڵ نەکردن ، ئەو نەفسەی دەفرێنیٚو دەیبا هەتا دەنیشێتەوە، و دەگاتە پلەی بوڵندی نەفس کەرەوشتی جوانە و لای هەموان پەسەندکراوە، وەك رازی بوون بەپلەی خوا هەرچەندە بەرزترو ئارام گرتن و ناوەوەی سەلامەت و رزگار بیٚ لەگوناهەوە بەدڵ دونیا نەویستی و رەوشت جوانی و زۆر باری خەڵك هەڵگرتن و لەگەڵ خەڵکیدا هەڵکردن، ئائەوە کەسێکە هیممەتی بوڵندی هەیەو دەیەویٚ صۆفیەتی ئەنجام بدا ، لە مەودوا باسی نەفسی نزم دێت ، ئەم پێناسەیە لەو فەرموودەیەوە وەرگیراوە کە دەفەرمویٚ: بێگومان خوا کاروباری بەرزو بوڵندو جوانی دەویٚ و رقیەتی لەکاروباری نزم وپەست و ناشیرین، بەیهەقی لەکتێبیٚ (شعب الإيمان)دا ریوایەتی کردووە ، طەبەرانیش لەکتێبی (الکبیرو الأوسط)دا ریوایەتی کردووە .

(٢) کەسێك پەروەردگاری خۆی بناسیٚ بەهۆی ئەو شتانەوە کە خوای پیٚدەناسریٚ کەبریتیە لەصیفەتەکانی، واتە کەسیچ صیفەتەکانی خوای ناسی و زانی ئیتر تێدەگا کە خوا بۆی هەیە بەندەیێك لەبەندەکانی خۆی لەخۆی دووربخاتەوە بەهۆی گومراکردنیەوە، وەئەشتوانیٚ نزیکی بخاتەوە بەهۆی رێنمایی کردنیەوە، ئیتر لەبەر ئەوە لەتۆڵەی خوا دەترسن و بەهیوای پاداشتیەتی، کەوابوو گویٚ دەگریٚ

{فاحبه مولاه فكان} مولاه {سمعه وبصره ويده التي يبطش بها واتخذه وليا ان سأله اعطاه وان استعاذ به اعاذه}[1]. هذا مأخوذ من حديث البخاري وما يزال عبدي ينقرب الى بالنوافل حتى أحبته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بها وان سالني اعطيته وان استعاذ بي لأعيذنه والمراد ان الله تعالى يتولي محبوبه في جميع احواله فحركاته وسكناته به تعالى كما ان ابوى الطفل لمحبتهما له التي اسكنها الله في قلوبهما يتوليانجميع احواله فلا يأكل الابيد احدهما ولا يمشي إلاّ برجعله الىغير ذلك وفي الحديث اللهم كلاء ككلاءة الوليد[2].

{ودنيء الهمة} بان لا يرفع نفسه بالمجاهدة عن سفساف الامور {لا يبالي} بماتدعوه نفسه إليهِ من المهلكات {فيجهل فوق جهل الجاهلين ويدخل تحت ربقة المارقين} من الدين اي عروتهم المنقطعة وهي بكسر الراء وسكون الموحدة[3].

---

بۆ ئەمرو نەهی پەروەردگاری ئەمجار فەرمانەکانی جێبەجێ دەکا و ئەوانەی قەدەغەی کردوون لێیان دوور دەکەوێتەوە .

(١) سەرەنجام خوایش ئەوی خۆش دەوێ -هەر کەس خوا خۆشی بوێ دینداری فێردەکاو دینداری پێدەکا ، ئەمجار هەموو ئەندامەکانی بۆ خوا بەکاردەهێنێ- خوا دەبێتە گوێ و چاوی و ئەو دەستەی شتی پێ دەکا خوا دەیکاتە دۆست و پشتگیری خۆی ئەگەر داوای لێبکا پێی دەبەخشێ و ئەگەر پەنای لێداوا بکا پەنای دەدات .

(٢) ئەمە وەرگیراوە لەو فەرموودەی بوخاری‌یە کە ریوایەتی دەکا و دەفەرموێ: بەندەی من بێوەستان بەهۆی سوننەتو زیادە ئەنجام دانەوە لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم بوێت جا کاتێ خۆشم ویست دەبمە ئەو گوێیەی پێیدەبیسێ و ئەو چاوەی پێی دەبینێوە بەو دەستەی کاری پێدەکاو پەلاماری پێدەبا وەبەو قاچەی پێ‌دەڕوا وەئەگەر داوام لێبکا پێی دەبەخشم وەئەگەر پەنام پێبگرێ بێگومان پەنای دەدەم مەبەست ئەوەیە خوا خۆی سەرپەرشتی خۆشەویستەکەی دەکا لەهەموو کاروبارێکدا، ئیتر هەرچی جوڵەو نیشتنەوەی هەبێ بەخواوە بەندە، وەك چۆن باوك و دایکی منالێك لەبەر ئەو خۆشەویستیەی خستویەتیە دڵیانەوە ، خۆیان سەرپەرستی هەموو کاروبارێکی دەکەن هەر بەدەستی باوك و دایکی نان دەخوا و هەر بەباوەشی یەکێکیانەوە دەبێ و هەروەها ، لە فەرمودەیەکدا هاتووە دەفەرموێ: خوایە بمپارێزی و سەرپەرشتیم بکەی وەك سەرپەرشتی منداڵی زۆر بچوك.

(٣) بەلام کەسێ هیمەتی نزم بێ هەوڵ نەدا نەفسی بەرزبکاتەوە لەکاروباری پەست و نزم دوری بخاتەوە ئەوە گوێ نادا بەوەی نەفسی داوای دەکا حەلاڵە یا حەرامە،

{فدونك} ايها المخاطب بعد ان عرفت حال على الهمة ودونئها {صلاحا} منك {اوفسادا ورضا} عنك {او سخطا وقربا} من الله {او بعد اوسعادة} منه {اوشقاوة ونعيما} منه {او جحيما} فافاد بدونك الاغراء بالنسبة الى الصلاح وما يناسبه والتحذير بالنسبة الى الفساد وما يناسبه[1].

{واذا خطر لك امر} اي القي في قلبك {فزنه بالشرع} ولا يخلو حاله بالنسبة اليك من حيثُ الطلب من ان يكون مأمورا به اومنهيا عنه او مشكوكا فيه {فان كان مأمورا} به {فبادر} الى فعله {فانه من الرحمن} رحمك حيثُ اخطره ببالك اي اراد لك الخير {فان خشيت وقوعه لا ايقاعه على صفة منهية} كعجب اورياء {فلا} باس {عليك} في وقوعه عليها من غير قصد لها بخلاف ماذا اوقعته عليها قاصداً لها فعليك اثمً ذلك فتستغفر منه كما سياتي[2].

---

مادەم نەفسی داوای دەكا ئەو دەيكا هەرچەندە ئەو كارەش بێگومان لەناوبەری بێ، ئیتر نەزانینێکی وادەکا دەکەوێتە زۆور پلەی نەفامان و نەزانانەوە و دەڕواتە ژێر پەندو پەیمانی پچڕاوی دەرچووانی دینەوە.

(١) ئەی گوێگر ئەی صۆفی دوای ئەوەی حاڵی هیمەت بەرزان و هیمەت نزمانت زانی، ئەوە ئیترە لەبەردەمتایەو چاکسازیو خراپسازی لەلایەن تۆوەیە وەرەزامەندی خوازی و تورەیی هەڵبژاردن لەلایەن تۆوەیە، لەلایەن خوایشەوە نزیکیو دووری یاخود بەختەوەری و نەگبەتیو ئازونیعمەت و تۆڵەو ئازاریش هەر لەلایەن ئەوەوەیە، چونکە دانەیە وشەی (دونك) هاندانی گوێگر ئەگەیەنێ بۆ چاکسازیو ئەوەش هاوسازیەتی و خزمایەتیان هەیە، ، وەئاگاداری و ترساندنیش ئەگەیەنێ، بەبەرامبەر خراپەسازیو هاوسازەکانی.

(٢) کاتێ کارێ هات بەدڵتا ئیشێ ئەنجام بدەیت، ئەوە ئەو کارە بکێشە بە شەرعدا ، بەنیسبەت تۆوە ئەو کارە خاڵی نیە لەو ڕووەوە کەدڵت داوات لێدەکا، ئەوەی داوات لێکراوە یافەرمانت پێکراوە یا قەدەغەکراوە یا گومان تیاکراوە، جا ئەگەر فەرمان پێدرا بوو لەلایەن شەرعەوە ئەوە هەر زوو پەلاماری کردن و ئەنجامدانی بدە، چونکە ئەوە لەلایەن خوای میهرەبانەوە بووە ڕەحمی پێکردووە، خستویەتیە دڵتەوە واتە چاکەی بۆ تۆ ویستوە . وەئەگەر دەترسایت لەسەر شێوازێکی قەدەغەکراو بێوەك لەخۆبایی بوون و ڕوپامایی -نەك هەر ئەنجامدانەکەی- ئەوە هیچ خراپەیەك لەسەر تۆ نیە ئەگەر لەسەر ئەو شێوازە بکرێ مادەم مەبەستی کردنی نەبێ لەسەر ئەو شێوازە، بەڵام ئەگەر هەر خۆی بەو نیازەوە ئەنجامی دا ئەوە گوناهی

{واحتياج استغفارنا الى استغفار} لنقصه بغفلة قلوبنا معه بخلاف استغفار الخاص و رابعة العدوية رضي الله عنها منهم وقد قالت استغفارنا يحتاج الى استغفار هضما لنفسها {لايوجب ترك الاستغفار} منا المامور به بأن يكون الصمت خيرا منه بلى نأتي به وان احتاج الى استغفار لان اللسان اذا ألف ذكرا يوشك ان يألفه القلب فيوافقه فيه[1] .

{ومن ثم} اي من هنا وهو أن إحتياج الاستغفار الى استغفار لا يوجب تركه اي من اجل ذلك {قال السهرودي} بضم السين صاحب عوارف المعارف لمن سأله انعمل مع خوف العجب اولا نعمل حذرا منه؟{اعمل وان خفت العجب مستغفرا} منه اي اذا وقع قصدا كما تقدَّمَ فان ترك العمل للخوف منه من مكايد الشيطان[2].

---

ئەوەی لەسەرە، ئەمجا دەبێ داوای لێبوردن بکا لەخوا لێی خۆش بێ وەك لەمەودوا دێ .

(١) ئیستغفارو داوای لێخۆشبوونی ئێمە پێویستی بە ئیستغفارو داوای لێخۆشبوونێکیتر دەبێ، چونکە لەکاتی وتنەکەیدا دڵمان بێئاگایە لەماناکەی، بەڵام ئیستغفارو داوای لێخۆشبوون لەیلایەن بەندانی پاکەوە وانییە، رابیعەی عەدەویە یەکێکە لەم پاکە دڵسۆزانە ئەم ئەوەی وتووە: ئیستغفارو داوای لێبوردنەکەمان پێویستی بە (استغفرالله) هەیە بۆیە وای وتوە بۆ شکانی نەفسی خۆی بووە ، ئەم قسەیە وامان لێناکت، واز لەئیستغفارو داوای لێخۆشبوون بێنین، چونکە فەرمانمان پێکراوە بەکردنی ، بەم شێوە بوترێ بێدەنگی باشترە لەداوای لیخۆش بوون کردن، بەڵکو ئێمە هەر دەیکەین هەرچەندە پێویستیش بە (استغفر الله) کردنیتر بێ ، چونکە زوبان کاتێك ئولفەتی گرت بەزیکرو یادێکەوە نزیکیەتی دڵیش ئولفەتی پێوە ببەستێ و دڵیش هاودەنگی زوبان بکات .

(٢) لەبەر ئەم قسەی ئێرە کە وتی: داوای لێبوردنی ئێمە پێویستی بەداوای لێبوردن کردن دەوێ، ئەم قسەیە وامان لێناکا واز لەئیستغفارو داوای لێبوردن بکەین —سوهرەوەردی کەخاوەنی کتێبی (عوارف المعارف)ە لەوەڵامی کەسێکدا پرسی کرد ئایا ئێمە کاربکەین لەگەڵ ترسی لەخۆبایی بون ، یاخود کارنەکەین و لەترسی ئەوە خۆمان بپارێزین؟ وتی: کاربکە ئەگەر ترسی لەخۆبایی بونت بوو داوای لێبوردن دەکەیت واتە کاتێ بەوشێوازە رویدا وەك رابوورد ، چونکە وازهێنان لەکارکردنی چاکە یەکێکە لەکارەکانی شەیتان .

{وان كان} الخاطر {منهيا} عنه {فاياك} ان تفعله {فانه من الشيطان فان ملت} الى فعله {فاستغفر} الله تعالى من هذا الميل[1]. {وحديث النفس} اي ترددها بين فعل الخاطر المذكور وتركه {مالم يتكلم او يعمل} به {والهم} منها يفعله مالم تتكلم او تعمل {مغفوران} قال ﷺ ان الله عزوجل تجاوز لامتي عما حدثت به انفسها مالم تعمل او تتكلم به رواه الشيخان وقال ﷺ ومن هم بسيئة ولم يعملها لم تكتب اي عليه رواه مسلم وفي رواية له كتبها الله عنده حسنة كاملة زاد في اخرى انما تركها من جراى اي من اجلي وهو بفتح الجيم وتشديد الراء وقضية ذلك انه اذا تكلم كالغيبة او عمل كشر المسكر انضم الى المؤاخذة بذلك مؤاخذة حديث النفس والهم به[2]. {وان لم تطعك} النفس {الامارة} بالسوء على اجتناب فعل الخاطر المذكور لحبها بالطبع للمنهي عنه من الشهوات فلا تبدو لها شهوة إلاّ اتبعتها {فجاهدها} وجوبا لتطيعك في الاجتناب[3].

---

(١) وەئەگەر ئەوەی کەوتوەتە دڵتەوە قەدەغەکرابوو لەلایەن شەرعەوە، ئەوە ئاگات لەخۆت بێ لێی دوورکەوەرەوە چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیە ، جا ئەگەر مەیلت کرد بۆ کردنەکەی، ئەوە داوای لێخۆشبوون بکە لەخوا لەم مەیل و ئارەزوو کردنە .

(٢) گفتوگۆی نەفس و دوودڵی بوونی لەنێوان ئەوەی کەهاتووە بەدڵدا و نەکردنی مادەم بەزوبان نەیکردبێ یان کاری پێنەکردبێ ، وەهەموو ویستی نەفس بەکردنی ئەوەی کەوتووەتە دڵ مادەم نەی وتبێ یان کاری پێ‌نەکردبێ، ئەوەهەردوکیان خوا لێیان خۆش دەبێ . پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: خوای گەورە چاوپۆشی کردووە لەئۆمەتم لەوەی نەفس لەدڵی خۆیدا دەیڵێتەوە مادەم کاری پێ‌نەکردبێ یان بەزوبان نەی‌وتبێ، بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: کەسێك بیەوێ خراپەیێك بکا بەڵام ئەنجامی نەدا ئەوە لەسەری نانوسرێ، موسلیم ریوایەتی کردووە ، لەریوایەتێکی‌تریدا دەفەرموێ: خوای گەورە یەك چاکەی تەواوی بۆ دەنوسێ لە ریوایەتێکی‌تردا ئەوەی زیادکردوەو دەفەرموێ: بۆیە نەیکردووە لەبەر خاتری من بووە، قەزیەی ئەمە ئەوەیە کە ئەگەر بەزوبانغەیبەتەکەی کرد یاخود کارەکەی ئەنجام داوەك خواردنەوەی سەرخۆشی‌کەرەکە، ئەوە لەگەڵ ئەوەی کە تۆڵەی غەیبەت کردنەکەو عەرەق خواردنەکەی لێ‌دەسێنرێ، گفتوگۆی نەفسەکەو ڕاڕابوونی لەکردن و نەکردنی ویستی ئەنجام دانیشی هەر لێ‌دەسێنرێ.

(٣) ئەگەر ئەو نەفسە فەرماندەرە بەخراپەو گوێڕایەڵی نەکردنی لەسەر دوورکەوتنە ئەو کارەی هاتووە بەدڵدا، چونکە سروشتی نەفس ئەوەیە حەزی لەوەیە کە لێی قەدەغەکراوە، لەهەمو جۆرێ ئارەزوبازی هیچ ئارەزوویێك نیە دەرکەوێ ئەو هەر دەبێ

كما تجاهد من يقصد اغتيالك بل أعظم لانها تتقصد بك الهلاك الأبدي باستدراجها لك من معصية الى اخرى حتى توقعك فيما يؤدي الى ذلك {فان فعلت} الخاطر المذكور لغلبة الامارة عليك {فتب} على الفور وجوبا ليرتفع عنك اثمُ فعله بالتوبة التي وعد الله بقبولها فضلا منه ومما تتحقق به الاقلاع كما سياتي[1]. {فان لم تقلع} عن فعل الخاطر المذكور {لاستلذاذ} به {او كسل} عن الخروج منه {فتذكر هاذم اللذات وفجاة الفوات} اي تذكر الموت وفجأته المفوتةللتوبة وغيرها من الطاعات فان تذكر ذلك باعث شديد على الاقلاع عما تستلذ به او تكسل عن الخروج منه قال ﷺ اكثر وامن ذكر هذم اللذات رواه الترمذي زاد ابن حبان فإنَّهُ ماذكره احد في ضيق الاوسعه ولا ذكره في سعة الاضيقها عليه. وهاذم بالذال المعجمة اي قاطع[2].

---

شوێنی بکەوێ، جا ئەگەر وابوو ئەوە تەواو واجبە خەبات کەی دژی بۆ ئەوەی گوێرایەڵیت بکا لەدورکەوتنەوەیدا

(١) وەك چۆن خەبات دەکەی دژی کەسێ بیەوێ بتکوژێ، بەڵکو جەنگ و خەبات دەبێ دژی گەورەتر بێ، چونکە ئەم دەیەوێ بەیەکجاری فێڵت لێبکا بەمەی لەم گوناهە دەتبا بۆ ئەو گوناهە هەر لەدەورتە هەتا وات لێدەکا دەتکاتە نێو بەدبەختی یەکجارەکی ، جا ئەگەر ئەوەی هات بەدڵتا کردت لەبەر ئەوەی ئەو نەفسە زاڵە بەسەرتا یەکسەر بگەڕێرەوەو تەوبە بکە هەر دەبێ بیشیکەی بۆ ئەوەی گوناهی ئەو کردنەت لەسەر لاچێ بەهۆی تەوبەوە کە خوا پەیمانی داوە لەڕووی فەزڵی خۆیەوە قەبوڵی دەکایەکێکیش لەوانە تەوبە و فەزڵی خوای پێدێتەدی وازهێنان و دەست هەڵگرتنە لەو گوناهە وەك لەمەودوا دێ.

(٢) جا ئەگەر هەر دەستت هەڵنەگرت لەکردنی ئەو کارەی هاتوە بەدڵتالەبەر ئەوەی لەزەتی لێدەبا یاخود لەبەر تەمەڵی ، ناتوانی لێدەربچی ئەوە بیری ئەو شتە بکەرەوە کە لەزەتەکان دەپچڕێنێ یاخود کتوپڕ هەمووشتەکانن دەفەوتێنێ، واتەبیری لەمەرگ و کتوپڕ هاتنەکەی بکەرەوە، تەوبەو غەیری تەوبەت لەدەست دەدا وەك طاعەت و بەجێهێنانی واجبات ، چەنکە بەراستی بیرکردنەوەی ئەوە هاندەرێکی توندو تۆڵە لەسەر وازهێنان لەگوناه و ئەوەی لەزەتی لێدەبەی یاخود تەمەڵی دەکەی لەلێدەرچوونی. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: زۆر یادی ئەوەبکەنەوە کە لەزەتەکان دەشکێنێ، تیرمزی ریوایەتی کردووە و ابن حەباننەمەی بۆ زیادکردووە چونکە کەس نیە لەکاتی ژیانیتەنگیدا یادی بکاو ژیانی بۆ فراوان نەبێ، وەکەسیش نیە لەکاتی گوشادیدا یادی بکات و ژیانی لەسەر تەنگ نەبێتەوە، هاذم واتە: بوڕندە .

{او} لم تقلع {لقنوط} من رحمة الله تعالى وعفوه عما فعلت لشدته اولا ستحضار عظمة الله تعالى {فخف مقت ربك} اي شدة عقاب مالكك الذي له ان يفعل في عبده ما يشاء حيثُ اضفت الى الذنب اليأس من العفوعنه قود قال تعالى انه لا ييأس من روح الله اي رحمته إلاّ القوم الكافرون[1]. {واذكر سعة رحمته} التي لا يحيط بهال الاهو اي استحضر هالترجع عن قونوطك وكيف تقنط وقد قال تعالى يا عبادي الذين أسروا على انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله يغفر الذنوب جمعا اي غير الشرك لقوله تعالى ان الله لا يغفر انيشرك به وقال ﷺ والذي نفسي بيده لولم تذنبو الذهب الله بكم ولحاء بقوم يذنبون فيستغفرون فيغفر لهم رواه مسلم[2] {وعرض} على نفسك {التوبة ومحاسنها} اي ما تتحقق به من المحاسن حيثُ ذكرت سعة الرحمة لتتوب عما فعلت فتقبل ويعفي عنك فضلا منه تعالى[3].

(١) یاخود کەوازی لێناهێنی لەبەر ئەوەیە کە بێ هیوایە کە خوا ڕەحمی پێبکا و لێی ببورێ لەوەی کردوویەتی لەبەر گەورەیی گوناهەکەیەتی یاخود لەبەر ئەوەیە گەورەیی و دەسەلاتی خوا والێی حاڵەی بووە کە لەم گوناهانەی ئەم خۆشنابێ، ئەوە تۆ بترسە لەتوندی تۆڵەی پەروەردگارت کەچی بوێ دەیکا ، چونکە تۆ گوناهت خستووەتە سەر گوناهەکانیترت کەبێهیوا بوونە لەرەحمی خوا، خوی گەورە فەرمویەتی: جگە لەگەلێکی کافر نەبێ کەس بێهیوا نابێ لەرەحمی خوا .

(٢) وەهەم یادی فراوانی ڕەحمی خوا بکەرەوە کە کەس ناتوانێ ئەم پەڕو ئەوپەڕی ڕەحمی خوا بزانێ، واتە هەموو کاتێ ئەم فراوانی ڕەحمەتی خوایە لەبیرتدا ئامادە بکە بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە لەو بێهیوایی ، چۆنیش بێهیوا دەبی کە خوا فەرمویەتی: ئەی ئەو بەندانەی کەزیادە ڕەویان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان بێ هیوا مەبن لەرەحمی خوا بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکان هەر هەموویان خۆش دەبێ ، واتە: جگە لەشەریك دانان بۆ خودا چونکە خوا فەرمویەتی: بێگومان خوا خۆش نابێ لەوەی شەریکی بۆ قەرار بدرێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: سوێن بێ بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر گوناهتان نەکردبا خوا ئێوەی دەبردەوە و هەندێکیتری دەهێنایە کایەوە گوناهیان بکردایەو داوای لێخۆشبوونیان بکردایە و خوایش لێیان خۆشبوایە

(٣) نیشانی نەفست بدە و بیخەرە بەردەمی تەوبەو سەرەنجامە جوانەکانی، واتە ئەوانەش بەهۆی گەڕانەوە بۆ لای خوا دێنەدی کەبریتیە لەچەندەها سەرەنجامیچاك چونکە هەرکات باسی فراوانی ڕەحمەتی خوا کرا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لەوەی کردووتە ئەوە لێت قەبوڵ دەکرێو خوا لێت دەبورێ لەڕووی فەزڵی خۆیەوە.

{وهي} اي التوبة {الندم} على المعصية من حيثُ انها معصية فالندم على شرب الخمر لاضراره بالبدن ليس بتوبة {وتتحقق بالاقلاع} عن المعصية {وعزم ان لا يعود} اليها {وتدارك ممكن التدارك} من الحق الناشيء عنها كحق القذف فيتداركه بتمكين مستحقه من المقذوف او وارثه ليستوفيه او يبريء منه[1].

فان لم يمكن تدراك الحق كأن لم يكن مستحقه موجود اسقط هذا الشرط كما يسقط في توبة معصية لاينشأ عنها حق لآدمي وكذا يسقط شرط الإقلاع في توبة معصية بعد الفرار منها كشرب الخمر فالمراد تحقق التوبة بهذه الامور انها لا تخرج فيما تتحقق به عنها لا انه لا بد منها في كل توبة وفي نسخة والاستغفار عقب قوله بالاقلاع ولا حاجة إليه مع ماذكر[2] {وتصح} التوبة {ولو بعد نقضها عن ذنب ولو} كان {صغيرا مع الاصرار على} ذنب {آخر ولو} كان {كبيرا عند الجمهور}[3].

---

(١) تویبە و گەڕانەوە بریتیە لە پەشیمانی لەسەر گوناهەکە لەو ڕووەوە کە گوناە و بێفەرمانی خوایە ، کە وابوو پەشیمانی لەسەر خواردنەوەی مەی لەسەر ئەوەی کە زیان بەخشە بەلاشەی ئەوە تەوبە نیە، تەوبە دێتەدی بەوازهێنان و دەست هەڵگرتن لە گوناهەکە، وە هەم بەوەی نیازی ئەوە بکا جارێکیتر نەگەڕێتەوە بۆی ، وەبەسەر کردنەوەی ئەوەی کە دەگونجێ بەسەر بکرێتەوەو بەخاوەنی بدرێتەوە، وەك مافێك کە لەو گوناهەوە پەیدا بووبێ، وەك مافیقەذف و بەدرەوشتی وتن بۆیەکێ، ئەوە دەبێ مافەکەی بداتەوە بەوەی خۆی بداتە دەستی تۆمەت بۆ کراوەکە ، یا خود بۆ میراتگرەکەی بۆ ئەوەی مافی خۆی وەرگرێتەوە یا خود گەردنی ئازاد بکا.

(٢) ئەگەر نەگونجا مافەکە بداتەوە وەك ئەوەی خاوەنەکەی دەست نەکەوێ ئەوە ئەم مەرجی پێویست ناکا، وەك چۆن دەچێ لەتەوبەو گوناهێکدا کە مافی ئادەمیزادی لێوە دروست نەبێ، هەروەها مەرجی وازهێنانیش مەرج نیە کە لەگوناهەکە بووبێتەوەوەك خواردنەوەی مەی ، کەوابوو مەبەست بەوەی دەوترێ تەوبە بەم مەرجانە دێتە دی، یانی تەوبە نیە لەم مەرجانە دەرچێ بێ هەندێ لەمانە بێتە دی، نەك مەبەست ئەوبێ دەبێ هەموو تەوبەیێك ئەم هەموو مەرجانەی تێدا بێ لە نوسینەوەیەکیتری ئەم کتێبەدا هەیە دەڵێ: لەدوای وازهێنان دەبێ داوای لێبوردنیش بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوانەی کەباسکران پێویست بەداوای لێبووردن ناکات .

(٣) تەوبە دروستە لەگوناهێك بکرێت با دوای هەڵوەشاندنەوەشی بێت ، هەر چەندە بچوکیش بێ لەگەڵ ئەوەش بەردەوام بێ لەسەر گوناهێکیتر باگەورەش بێ.

وَ قِيلَ لا تصح بعد نقضها بان عاد الى المتوب عنه وَ قِيلَ لا تصح عن صغير لتكفيره باجتناب الكبير وَ قِيلَ لا تصح عن ذنب مع الاصرار على كبير[1] {وان شككت} في الخاطر {امّا مامور} به {ام منهي} عنه {فامسك} عند حذرا من الوقوع في المنهي[2].

{ومن ثم} اي من هنا وهو الامساك اي من اجل ذلك {قال} الشيخ ابو محمد {الجويني في التوضيء بشك ايغسل} غسلة {ثالثة} فيكون مامورا بها {ام رابعة} فيكون منهيا عنها {لا يغسل} خوف الوقوع في المنهي عنه وغيره قال يغسل لان التثليث مامور به ولم يتحقق قبل هذه الغسلة فياتي بها[3].

{وكل واقع} في الوجود ومن جملته الخاطر وفعله وتركه {بقدرة الله تعالى وارادته هو خالق كسب العبد} اي فعله الذي هو كاسبه لا خالقه كما يبين ذلك بقوله {قدر له قدرة هي استطاعته تصلح للكسب لا للابداع} بخلاف قدرة الله فانها للابداع لا للكسب [4].

(١) ئەمە بەلای جەماوەری زانایانەوە وایە، هەندێك وتوویانە: دروست نیە تەوبە لەگوناهێك بكرێت دوای هەڵوەشاندنەوەی بەم شێوەیە بگەرێتەوە بۆلای ئەوگوناهەی تەوبەی لێكردووە، هەندێك وتوویانە: دروست نیە تەوبە لەگوناهی بچوك چونكە دادەپۆشرێ بەهۆی خۆپاراستن لەگوناهی گەورە ، هەندێك وتوویانە: تەوبە دروست نیە لەگوناهێك بكرێت لەگەڵ ئەوەش بەردەوام بێ لەسەر گوناهی گەورە .

(٢) وەئەگەر كەوتیتە دوو دڵیەوە لەوەی كەوتوەتە ناو دڵتەوە نازانی ئایا لەلایەن شەرعەوە فەرمانی پێكراوە یاخود ئەوە دەستی لێبگرەوە نەوەكوو بكەویتە نێو حەرامەوە.

(٣) لەبەر ئەوەیە جوەینی لەبارەی كەسێكەوە كە دەستنوێژ بگرێ لەگوماندا بێ نەزانێ ئایا ئەوە جاری سێهەمە ئەوكات دەبێ فەرمان پێدراو بێ یاخود جاری چوارەمە و قەدەغەكراوە؟ وتویەتی: نابێ بیشۆرێ لەترسی ئەوەی نەكەوێتە نێو حەرامەوە غەیری جوێنی وتوویەتی: بیشۆرێ چونكە غەیری سێ كردنەكە فەرمانی پێ دراوە، بێگومان تا هاتوەتەدی پێش ئەم جارەی شۆردن نەبێ، كەوابوو ئەنجامی دەدات .

(٤) هەرچی شتێك دێتە بوونەوە كە هەندێك لەوەیە ئەوەی دێت بەدڵدا و كردن و نەكردنی هەمووی بەنەخشەو توانای خوای گەورەیە بەویستی ئەو دێتە بوون ، هەر خوا بەدیهێنەری ئەو كارەیە، كە ئەو دەیكا و بكەریەتی نەك بەدیهێنەریەتی، دانەر خۆی ئەوە روون دەكاتەوە دەڵێ: خوا توانایێكی بۆ مرۆڤ دیاری كردووە كە بریتیە لەتواناكەی دەشێ بۆ ئەوەی كاری پێ بكا نەك شتێ لەبوونەوە بهێنێتە دی، بەلام

{فالله خالق غير مكتسب والعبد مكتسب غير خالق} فيثاب ويعاقب على مكتسبه الذي يخلقه الله عقب قصده له وهذا اي كون فعل العبد مكتسبا له مخلوقالله توسط بين قول المعتزلة ان العبد خالق لفعله لانه يثاب ويعاقب عليه وبين قول الجبرية انه لا فعل للعبد اصلا وهو آلة محضة كالسكين في يد القاطع[1].

{ومن ثم} اي من هنا وهو ان العبد مكتسب لا خالق لكون قدرته للكسب لا للابداع فلا توجد الامع الفعل اي من اجل دلك نقول {الصحيح ان القدرة} من العبد {لا تصلح للضدين} اي للتعلق بهما وانما تصلح للتعلق بأحدهما الذي يقصد[2] وَقِيلَ تصلح للتعلق بهما على سبيل البدل اي تتعلق بهذا بدلا عن تعلقها بالآخر وبالعكس اما على القول بأن العبد خالق لفعله فقدرته كقدرة الله في وجودها قبل الفعل وصلاحيتها للتعلق باضدين على سبيل البدل[3].

---

توانای خوا وانیە چونکە ئەم بۆ ئەوەیە شت لەنەبوونەوە بهێنێتە دی، نەك بۆ کردنەو ئامێر خستنەکار بێ، بەڵکو بۆدروستکردنی ئەسباب و هۆکارەکانیشە،

(١) کەوابوو خوا دروستکەرو بەدیهێنەرە بکەر نیە، کەوابوو مرۆڤ پاداش دەدرێتەوەو تۆڵەو ئازار دەدرێ لەسەر ئەو کارەی کردویەتی کە خوای گەورە دوای ئەوە مرۆڤەکە نیازی ئەنجامدانی کردووە ئەویش دروستی کردووە، ئەمە واتە: کاری بەندە کردەی خۆی بێ و دروستکراوی خوا بێ، بۆچوونێکی مامناوەندیە لەنێوان قەولی موعتەزیلە کە دەڵێن: بەندە خۆی دروستکەری کردەوەکانی خۆیەتی چونکە پاداش و تۆڵەی لەسەر دەدرێتەوە، قەولی جەبریە کەدەڵێن: ئەصڵەن بەندە هیچ کارێکی بۆ نیە ئەو تەنها ئامێرێکی رووتە، وەك چەقۆیەك وایە بەدەستی قەسابەوە و کابرای بڕێنەرەوەیە.

(٢) لەبەر ئەوەی ئێرە کەبەندە کەسابەت دەکات نەك دروستکار چونکە ئەو توانایەی هەیەتی تەنها بۆ کەسب دەبێ نەك بۆ ئەوەی لەنەبوونەوە شت بهێنێتەبوون، کەوابوو ئەو توانایە تەنها لەگەڵ کردنی کارەکەدا هەیە ، واتە لەپێشیەوە نیە، لەبەر ئەوەیە دەڵێین قەولی صەحیح ئەوەیە کەتوانای بەندە پەیوە نەبێ بەدوو دژەوە، تەنها بەیەکێکیانەوە دەبەستێ ئەوەیە کە نیازی دەکا .

(٣) هەندێك وتویانە: لەسەر رێ و شێوازی بەدەلیەت دەگونجێ ودەشێ پەیوەندی ببەستێ بەهەردوکیانەوە واتە پەیوەندی دەبەستێ بەمەیانەوە لەباتی ئەویتریان و پێچەوانەکەش، بەڵام لەسەر قەولی یەکەم کەدەڵێ بەندە دروستکەری کاری خۆیەتی ئەوە تواناکەی وەك توانای خوا وایە لەپێش کردنی کارەکەشدا هەر هەیە

{و} الصحيح ايضا {ان العجز} من العبد {صفة وجودية تقابل القدرة تقابل الضدين لا} تقابل {العدم والملكة} وَ قِيلَ تقابلها تقابل العدم والملكة فيكون هو عدم القدرة عما من شانه القدرة كما ان الأمر كذلك على القول بأن العبد خالق لفعله فعلى الاول في الزمن معنى لايوجد في الممنوع من الفعل مع اشتراكهما في عدم التمكن من الفعل وعلى الثاني لا بل الفرق ان الزمن ليس بقادر والممنوع قادر اذ من شأنه القدرة بطريق جرى العادة[1]

{ورجح قوم التوكل} من العبد على الاكتساب {وآخرون الاكتساب} على التوكل اي الكف عن الاكتساب و الاعراض عن الاسباب اعتماد للقلب على الله تعالى {و ثالث الاختلاف باختلاف النّاس و هو المختار} فمن يكون في توكله لا يتسخط عند ضيق الرزق عليه و لا تستشرف نفسه اي تتطلع السؤال احد من الخلق[2]...

---

وە گونجاویشە پەیوەندی هەبێ بەدوو دژەوە لەسەر ڕێو شێوازی بەدەلیەت .

(١) قەولی صەحیح ئەوەیە: کەعەجزو نەتەوانایی لەلایەن بەندەوە بریتیە لەصیفەتێکی وجودی لەبەرامبەر قودرەت و تواناوە، وەك چۆن دوو دژ بەرامبەر یەك دەبن ، وەك ڕەشی و سپی، نەك وەك: زانین و نەزانین، هەندێك وتویانە بەرامبەر بەیەك وەستانەکەیان وەك نەزانین و زانینەکە وایە، کەوابوو لەم کاتەدا دەبێ بڵێیت: عەجزو نەتەواناییەکە بریتیە لە نەبوونی تەوانایی لەکەسێکەوە لەبارياو توانایی هەبێ، هەروەها عەجز بریتیە لەوە کەوتمان لەسەر قەولی ئەوانە کەدەڵێن: بەندە دروستکەری کاری خۆیەتی، کەوابوو لەسەر قەولی یەکەم لەکەسێکدا کەسەکتە لێدراوبێت مانایێك هەیە کە عەجزی ذاتیە لەو کەسەدا نیە کە دەست و قاچی بەستراوەتەوە و نایەڵێ بجوڵێ -عەجزی عەرەضی هەیە- هەرچەندە هەردوکیان شەریکی یەکن لەنەتەوانایی کارەکەدا، لەسەر قەولە دوەمەکەش فەرقەکەیان ئەوەنیە بەڵکو ئەوەیە کە سەکتە لێدراوەکە تواناداار نیە، بەڵام ئەوەی دەست و قاچی بەستراوەتەوە تواناداره ، چونکە لەباریدا هەیە لەسەر ڕێ و شێوازی ئەوە کە عادەت هەر وا بووە .

(٢) گەلێ زانا تەرجیحی (توکَل)ی بەندەیان داوە بەسەر کەسابەت کردنیدا، چەندەهای تریش تەرجیحی کەسابەت کردنیان داوە بەسەر (توکَل)دا ، تەوەکل واتە: وازهێنان لەکەسابەت کردن و بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕۆزی پەیداکردن لەبەر ئەوە کە دڵ ئیعتمادی لەسەر خوایە، قەولی سێهەم دەڵێ: ئەوە شتێکی جیاوازە بەگوێری جیاوازی خەڵك، ئەوەش قەولی هەڵبژاردەیە، چونکە کەسێ ئەگەر خوار ڕزقی نەداو ژیانی لەسەر تەنگ کاتەوە و توڕەنەبێ لەخوا هەر خۆ بگرێو نەفسی چاوەچاو نەکا

.. فالتوكل في حقه ارجح لمافيه من الصبر والمجاهدة للنفس ومن يكون في توكله بخلاف ماذكر فلاكتساب في حقه ارجح حذرا من التسخط والاستشراف[1] {ومن ثم} اي من هنا وهو الثالث المختار اي من اجل ذلك {قيل} قولا مقبولا {ارادة التجريد} عما يشغل عن الله تعالى {مع داعية الاسباب} من الله في مريد ذلك {شهوة خفية} من المريد {وسلوك الاسباب} الشاغلة عن الله تعالى {مع داعية التجريد} من الله في سالك ذلك {انحطاط} له {عن الذروة العلية} فالاصلح لمن قدر الله فيه داعية الاسباب سلوكها دون التجريد ولمن قدر الله فيه داعية التجريد سلوكه دون الاسباب[2].

{وقد ياتي الشيطان} للانسان {باطراح جانب الله تعالى في صورة الاسباب او بالكسل والتماهن في صورة التوكل}[3].

---

بۆ ئەوە سواڵ بکا، و لەخەڵك داوا بکا..

..(١) ئەوە تەوەکل بۆ ئەو باشترە، چونکە ئەو خۆڕاگرتن و رامهێنانی نەفسی تێدایە، وەکەسێکیش لەتەوەکلدا وانەبێ ئەوە کەسابەت کردن بۆ ئەو باشترو چاکترە لەترسی ئەوەی دڵی لەخوا بترسێ و توڕەبێ، بەتەما بوونی دەستی خەڵك و چاوەڕێ کردنی یارمەتی خەڵك .

(٢) لەبەر ئەوەی ئێرە کە قەولی هەڵبژاردە بوو هەندێك قسەیەکی عەقڵ گیریان کردووە، وتویانە: کەسێ بیەوێ خۆی داڕنێ لەوەی لەخوا بێئاگای دەکا لەگەڵ ئەوەش ئەو کەسە داخوازی هۆکارەکانی کردنی ئەو شتە لەلایەن خواوە لێداوا دەکرێ-ئەگەر کەسابەت نەکا قەرزار دەبێو دەکەوێتە سواڵ- ئەو جۆرە ویستانە شەهوەت و ئارەزووبازییەکی شاراوەی ئەو کەسەیە، وەگرتنەبەری ئەو هۆکارانەی ئادەمی بێئاگا دەکەن لەخوا لەگەڵ ئەوەش داخوازی کەری خۆداڕنین لەو شتانە لەخواوە داواکراوە لەو کەسە -هیچ پێویستی نیە و شتێك دەکا خوای لەبیر دەچێتەوە- ئەوە داڕوخانەو کەوتنە خوارەوەیە لە لوتکەی هەرەبەرزی کەماڵەوە، کەوابوو قازانج و کاری گونجاو بۆ کەسێ کە خوا داخوازی و هۆکارەکانی ژیانی بۆئاسان کردبێ ئەوەیە بیانگرێتە بەر نەك وازیان لێ بهێنێ و خۆیان لێداڕنێ، وەکەسێکیش خوا داخوازی خۆداڕنینی بۆ فەراهەم هێنابێ ئەبێ ئەوە بگرێتەبەر نەك خستنەگەڕی هۆکارەکان کە ئەو پێویستی پێی نیە .

(٣) جاری وا هەیە شەیتان دێتە لای ئادەمیزاد ئەوەی دەخاتە دڵەوە کەواز لە وازهێنان بهێنێو هۆکارەکان بخاتەگەڕ یاخودجاری وامەیەلەڕوی تەمەڵیەوە وسوکی کردن بەگرتنەبەری هۆکارەکانەوە دێتە دڵیەوە بەناوی(توکل)وپشت بەستن بەخواوە.

كأن يقول لسالك التجريد الذي سلوكه له أصلح من تركه له الى متى تترك الاسباب الم تعلم ان تركها يطمع القلوب لما في ايدي النّاس فاسلها لتسلم من ذلك وينتظر غيرك منك ما كنت تنتظره من غيرك ويقول لسالك الاساباب الذي سلوكه لها أصلح من نركه لها لوتركتها وسلكت التجريد فتتوكل على الله لصفا قلبك واشرق لك لانور وآتاك مايكفيك من عند الله فاتركها ليحصل لك ذلك فيجربه تركها الذي هو غير أصلح له الى الطلب من الخلق والاهتمام بالرزق[1]. {والموفق يبحث عن هذين} الأمرين اللذين يأتي بهما الشيطان في صورة غيرهما كيدا منه لعله أن يسلم منهما {ويعلم} مع بحثه عنهما {انه لا يكون الامايريد} الله كونه اي وجوده منهما او من غيرهما {ولا ينفعنا علمنا بذلك} المعلوم الذي ضمناه هذا الكتاب جمع الجوامع {الا ان يريد الله سبحانه وتعالى نفعنا به بأن يوفقنا لأن نأتي به خالصا من العجب وغيره من الآفات[2].

(١) بەم شێوەیە دەڵێ: بەکەسێ کە وازهێنانی لەهۆکارەکانی ژیان بۆ قازانجترە هەتا گرتنەبەریان، هەتا کەی واز لەهۆکاری ژیان دەهێنی؟ ئەی تۆ قازانجی وازهێنانت لەهۆکارەکانی ژیان وات لێدەکا دڵت بەتەمای ئەوەبێ بەدەست خەڵکەوەیە، کەوابوو هۆکارەکانی ژیان بگرەبەر بۆ ئەوەی لەو چاوەڕوانیە رزگارت بێ، خەڵکیتر لە تۆ چاوەڕوانی ئەوەبێ کەتۆ چاوەڕێی دەکەی لەخەڵکەوە .وە بەمەش کەهۆکارەکانی ژیانی گرتۆتەبەرو ئەمەی بۆ قازانجە لەوازهێنانی لێ دەڵێ: ئەگەر واز لەم کارو کەسابەتەت بهێنی و ڕێگەی خۆداڕنین لەژیان بگریتە بەر، ئەمجار خۆت بدەیتە دەست خواو پشت و پەنات ئەو بێ، ئەوکاتە دڵت پاك دەبێتەوە، و روناکی دڵت هەڵدەکرێ و شت دەزانی، وەلەلایەن خواوە هەر ئەوەندەت بۆ دێ کەپێویستی تۆ دەرکا، لەبەر وازهێنان لەهۆکارەکانی ژیان ، بۆ ئەوەی ئەوەت دەستکەوێ ئەمما بەو قسانە رای دەکێشێ بۆ ئەوەی واز لەشتێ بهێنێ کە ئەو وازهێنانە قازانجی نیە و رای دەکێشێ بۆ داواکردن لەخەڵك هەموو کات لەبیر دالغەی رزقو رۆزیدا بێ.

(٢) موفق کەسێکە توێژینەوە دەکا لەبارەی ئەم دوو فەرلەوە کەشەیتان لەدیمەنی غەیری خۆیاندا نیشانیان دەدا بەتەڵەکە بازی، بۆیە دەبێ توێژینەوە بکا بۆ ئەوە لەو دووتەڵەیە رزگاری بێ، وەموفق کاتێ موفقە لەگەڵ زانینی ئەو دوو فێڵە ئەوەش بزانێ هیچ شتێك نابێ ئەوە نەبێ کە خوا دەیەوێ هەبێ، چ ئەو دووانەبێ یاغەیری ئەو دوانەبێ. ئەو عیلم و زانستەی لەم کتێبی (جمع الجوامع)دا هەیە سودمان پێ ناگەیەنێ مەگەر خوای پاك و بێگەردو عەیب بیەوێ سودمان پێبگەیەنێ، بەم شێوە موفقمان بکات بۆ ئەوەی تەنها لەبەر خوا ئەم شەرحە کرابێ و پاك و پاڵفتەی بکا

{وقدتم جمع الجوامع علما} تميز من نسبة التمام اي تم هذا الكتاب من حيث العلم اي المسائل المقصود جمعها فيه وقال الصنف يَجوزُ أن يكون علما معمول الجوامع ولا يحسن أن يكون متعلقا يتم اذا لا فائدة في قولنا تم هذا علما فان تمامه معلوم معروف اهـ ولايخفى مافيه اذلا يلزم من تمامه جمعا تمامه علما ففيه فائدة بالنسبة الى الاول[1]. {المسمع كلامه اذانا صمّاً الآتي من احاسن المحاسن بما ينظره الاعمى} اي انه لعذوبة لفظه القليل وحسن معناه الكثير يشتهرين النّاس حتى يتحققه الاصم فكانه يسمعه والاعمى فكانه ينظره وهذا كما قال المصنّف منتزع من قول ابي الطيب: انا الذي نظر الاعمي الى ادبى واسمعت كلماتي من به صمم

ونبه على أن مخالفته له في ذكر السمع قبل البصر للتاسي بالقرآن وفي ذكره الاسماع للآذان لالصاحبها لانه ابلغ والاسماع لها اسماع لصاحبها[2].

---

لەخۆرازی بوون و بایی بوون و دەردە کوشندەکانیتر .

(١) ئەم کتێبی (جمع الجوامع)ە تەواو بوو لەڕووی عیلم و زانینی ئەو بابەتانەی کەمەبەست بوون تیایدا کۆبکرێنەوە، دانەر وتویەتی: دەگونجێ وشەی علماً کارتێکراوی (الجوامع)بێ واتە ئەم کتێبەی تەواو بوو کۆکەرەوەی قاعیدە عیلمیەکانە، جوانیش نیە پەیوەندبێ بەوشەی (تمّ)ەوە، چونکە هیچ سودێك لەم رستەدا نیە بڵێیت: ئەمە لەڕووی عیلەتەوە تەواوبوو، ئەم هەواڵە چ سودێکی هەیە چونکە تەواو بوونەکەی زانراوە و دیارەو کۆتایی قسەکەی دانەر ، ئەو رەخنە و لاوازیەی لەم قسەیەی دانەردا هەیە شاراوە نیە، لەسەر کەس چونکە شتێ کە هەمووی تەواو بوو بێ مەرج نیە لەڕووی عیلمەوە هەمووی تەواو بێ، لەبەر ئەوە بەگوێرەی یەکەم سودی تێدایە واتە کۆکردنەوەیەکی تەواو لەڕووی عیلمی ئوصولەوە.

(٢)ئەم کتێبەئەوەندە جوانە گوێ کەڕەکانی پێیدەبیسێنێوە لەناوگوتە جوانەکاندا کامیان زۆر جوانە ئەوەیان ئەهێنێ بەهۆی جوانیەکەیەوە کوێر دەیبینێ، واتە لەبەر شیرینی لەفظە جوانەکانی و جوانی مانا زۆرەکانی لەناو خەڵکدا بەناوبانگ دەبێ هەتا لایکەڕیش مەعلوم دەبێ،وەك ئەوەی بیبیسێو کوێربیبینێ،ئەم قسەیەی لەگوتەیەکی (ابي الطيب دارنـي)یەوە وەرگرتووە کە دەڵێ: من ئەوەم کوێر سەریی ئەدەبم دەکا وشەکانم دەبیسێنم بەکەسێ کەڕایەتی لەگوێدا بێ. قوتابیشی ئاگادارکردۆتەوە بۆیە وەك ئەوەی نەکردوە لەپێشدا باسی بیستنی کردوە ئەمجا بینین لەبەر شوێن کەوتنی قورئان،قورئان وایکردوە وەلەوەشدا بیستنیداوەتە پاڵگوێ نەك خاوەنەکەیچونکە زیاتر رەوانبێژترەودەگاتە مەبەست،وەهەم کەگوێبیستی خاوەنەکەی بیستویەتی.

{مجموعا جموعا} اي كثير الجمع وهما حال من ضمير الآتي وكذا قوله {وموضوعا} ذا الفضل {لا مقطوعا فضله ولا ممنوعا} عمن يقصده لسهولته {ومرفوعا عن همم الزمان مدفوعا} عنها فلا يأتي احد من اهل زمانه بمثله(١).

{فعليك} ايها الطالب لما تضمنه {بحفظ عباراته لا سيما ما خالف فيها غيره} كالمختصر والمنهاج {واياك ان تبادر بانكارشيء} منه {قبل التامل والفكرة} فيه {اوان تظن امكان اختصاره ففي كل ذرة} منه بفتح الذال المعجمة اي حرف {ذرة} بضم الدال المهملة اي فائدة نفيسة كالجوهرة(٢) {فربما ذكرنا} فيه {الادلة في بعض الاحايين إما لكونها مقررة في مشاهر الكتب على وجه لا يبين} اي لا يظهر {او لغرابة} لها {اوغير ذلك مما يستخرجه النظر المتين} اي القوى كبيان المدرك الخفي الاول كما في قوله في مبحث الخبر و إلا لم يكن شيء من الخبر كذبا والثاني كما في قوله في عدم التاثير اذ الفرض بالفرض اشبه والثالث كما في قوله في مسئلة قول الصحابي لارتفاع لاثقة بمذهبه اذ لم يدون(٣).

---

(١) حاڵی ئەو لە (جمع الجوامع)دا وایە کە کۆکـراوەی چەندەها کۆکراوەیە ، وە دانراوێکی وایە فەزڵی زۆر براوە نیە وە قەدەغەکراویش نیە، لەهەر کەسێ بیەوێ لەبەر ئەوەی زۆر ئاسانە لەویستی ئەهلی ئەم سەردەمە بوڵندترەو هیچ کەسێك نیە لەئەهلی ئەم سەردەمە نموونەی بێنێ .

(٢) ئەی کەسێ فێرخوازی ئەوەی لەم کتێبەدا کۆکراوەتەوە پێویستە لەسەرت عیبارەتەکانی لەبەر بکەی دوا تایبەت ئەوانەی لەگەڵ دارشتنی کتێبی (المختصرو المنهاج) جیاوازیان هەبێ، خۆت بپارێزە لەوەی پەلە بکەی و ئینکارکردن لەشتێك لەم کتێبە پێش تێرامان و بیرلێکردنەوەی یاخود وابزانی ئەگونجێ لەوەزیاتر کورت بکرێتەوە، چونکە لەهەموو پیتێکی ئەم (جمع الجوامع)ەدا سودێکی زۆر بەکەڵك هەیە وەك گەوهەرێك وایە .

(٣) کەم جارانێك لەهەندێ کاتدا لەم کتێبەدا بەڵگەمان تێدا باس کردوە یالەبەر ئەوەیە لە هەندێ کتێبی بەناو بانگدا هەیە بەشێوەیەك باسکراوە کەرون نیە، یاخود بۆیە باس کراوە چونکە ناوازەو غەریبە یاخود لەبەر شتیترە کە لەوانەیە بیری بەهێز دەری بهێنێ پێی بزانێ وەك بەیان کردنی بەڵگەی شاراوە، جا نموونە بۆ یەکەم: وەك ئەوەی دانەر لەجێ‌باسی خەبەرو هەواڵدا ووتی: گەر وانەبێ هیچ هەواڵێك درۆنابێ بۆ دووهەمەکە وەك ئەوەی دانەر لە باسی نەبوونی ئەئثیردا ووتی: چونکە قەرز باشترە ئەشوبهێ بەفەرزەوە. بۆ سێهەمیش وەك دانەر لەبابەتی قەولی صەحابیدا ووتی: لەبەر

{وربما افصحنا بذكر لرباب الاقوال فحسبه الغبي} بالموحد اي الضعيف الفهم {تطويلا يؤدي الى الملال وما درى انا انَّما فعلنا ذلك لغرض تحرك له الهمم لاعوال[1]. فربما لم يكن القول مشهورا عمن ذكرناه} كما في نقل افضلية فرض الكفاية على فرض العين عن الاستاذ والجويني مع ولده المشهور ذلك عنه فقط {او كان} من ذكرنا عنه قولا {قد عزي إليهِ على الوهم} اي الغلط {سواه} كما في ذكره القاضي الباقلاني من المانعين لثبت اللغة بالقياس وقد ذكره الآمدي من المجوزين {او} كان الغرض {غير ذلك مما يظهره التأمل لمن استعمل قواه} كما في ذكره غير الدقاق معه في مفهوم اللقب تقوية له كما تقدَّمَ كل ذلك[2]. {بحيث انا جازمون بان اختصار هذا الكتاب متعذر وروم النقصان منه متعصر اللهم إلاّ ان ياتي رجل مبذر} اي ينقل شيئا من مكانه الى غيره {مبتر} اي ياتي بالالفاظ بترا اي نواقص كأن يخذف منها اسماء اصحاب الاقوال فإنَّهُ لا يتعسر عليه روم النقصان لكنه اذا فعل ذلك لا يفي بمقصودنا[3].

---

ئەمانی متمانە بەمەزهەبی صەحابە، چونكە نەنوسراوەتەوە.

(١) وەجاری واهەیە ناوی خاوەنی قەولەكەمان بەرونی باس كردوە جا كەسیّ غەبی بیّو حاڵی بونی لاواز بیّ وای حسیّب كردوە ئەوە دریّژپیّدانەو سەرئەكیّشیّ بۆ ماندوبوون، نەیزانیوە ئیّمە بۆیە ئەوەمان كردووە لەبەر مەبەستیّكە كە هەرچی هیمەتی بەرز هەیە دەبزویّ بۆی .

(٢) ئەمجار زۆر جاری واهەیە بۆیە ناومان بردووە ئەو قەولە بەناوبانگ نیە بەناوی ئەوەوە، وەك نەقڵ كراوە كەفەرزی كیفایە باشترو گەورەترە لەفەرزی عەین لە ئوستاذی جوەینیيەوەلەگەڵ كوڕی دانەردا تەنها بەناوی ئەمەوە بەناوبانگ بووە،بەڵام لەراستیدا قەولی ئەوانیشەبەڵام ئەو كەسەی ئیّمە ناومان بردووەبەغەڵت شتیّكی‌تری دراوەتە پاڵ ئیّمەراستمان كردۆتەوە، وەك ئەوەی باقلانی لەریزی ئەوانەدا باس كردوە كە لوغەت بەقیاس ثابت نابیّ،بەڵام ئامیّدی لەریزی ئەوانەدا باس كردوە كە دەڵیّن: دروستە، یاخود مەبەستەكە شتیّكی‌تر بوو جگە لەوانە كەتیّرامان دەری دەخا بۆ كەسیّ كەهیّزی بیری بخاتەكار، وەك چۆن لەگەڵ (الدقاق) دا چەندەها زانای تری باس كردووە، لەباسی مەفهومی لەقەبدا بۆ ئەوەیە (الدقاق) بۆ ئەوەیە (الدقاق) بەهیّزبكات، ئەمانە هەموویان لەپیّشەوە رابوورد.

(٣) بەشیّوەیەك ئیّمە بیّگومانین كەكورتكردنەوەی ئەم كتیّبە دەست نادارناگونجیّ نیازی‌كەم لیّكردنەوەی زۆرگرانە اللهم مەگەر پیاویّك بیّت شتەكان جیّگۆركیّ بكات و لەفظەكان لیّك بپچڕیّنیّت، ولیّ كەم كاتەوە وەك ئەوەی ناوی خاوەن قەولەكان لابا،

{فدونك} ايها الطالب لما تضمنه مختصرنا {مختصرا} لنا {بأنواع المحامد حقيقا واصناف المحاسن خليقا} لأنه مشتمل على ما يقتضي ان يثني عليه بذلك[1].

{جعلنا الله به} لما املناه من كثرة الانتفاع به {مع الذين انعم الله عليهم من النبين والصديقين} اي افاضل اصحاب النبيين لمبالغتهم في الصدق والتصديق {والشهداء} اي القتلى في سبيل الله ب والصالحين} غير من ذكر {وحسن اولئك رفيقا} اي رفقاء في الجنة بأن نستمتع فيها برؤيتهم وزيارتهم والحضور معهم وان كان مقرهم في درجات عالية بالنسبة الى غيرهم[2] ومن فضل الله تعالى على غيرهم كما قاله ابن عطيبة انه قد رزق الرضا بحاله وذهب عنه ان يعتقد انه مفضول انتفاء للحصرة في الجنة التي تختلف المراتب فيها على قدر الاعمال وعلى قدر فضل الله تعالى على من يشاء[3].

---

چونكە ئەوە گران نابێ لەسەر نیازی ئەم كورتكردنەوە ، بەلأم ئەگەر ئەوەی كرد مەبەستی ئێمە ناهێنێتە دی.

(١) ئەی فێرخوازی خۆشەویست كەدەتەوێ فێری ئەوەبیت كە لەم كتێبە كورتەدایە وا كتێبی كورت ئێمە لەنزیك و لەبەردەستدایە كەشایستەی ئەوەیە هەموو جۆرە پیاهەڵدانێكی بۆ بوترێ و شایستەی هەموو جۆرە وەصفێكی وانە، چونكە ئەم كتێبە داگرندەیە بۆ هەموو شتێ كەداخوازی ئەوەبكا سوپاسی لەسەر بكرێ.

(٢) خوایە بەهۆی ئەم كتێبەوە چونكە هیوامان وابوو زۆر بەسوود بێ و خەڵك كەڵكی لێوەرگرێ، ئێمە بگێڕی لەگەڵ ئەوانەدا كەنیعمەتی خۆت رژاندوە بەسەریاندا، ك پێغەمبەران و صدیقین واتەهاوەڵەگەورەكانی پێغەمبەرانن، بۆ صدیقیان پێدەگوتی؟ چونكە زۆر راستگۆ بوون زۆر خواو پێغەمبەریان بەراست زانیووە، شەهیدان ئەوانەن لەرێی خوادا كوژراون و صاڵحان ئەوانەن غەیری ئەو سێ بەشەی پێشەوەن، ئای ئەوانە چەند هاوەڵیان خۆشەو جوانە واتە: خوا بمانكەیتە رەفیق و هاوەڵیان لەبەهەشتدا بەم شێوەیە لەبەهەشتدا بەهۆی بینینیانو زیارەت كردنیان وكۆبوونەوە لەگەڵیان لەزەت بەرین هەرچەندە جێی ئەوان لەچەندەها پلەی بەرزدایە بەنیسبەی‌تی غەیری خۆیانەوە.

(٣) هەندێ لەفەزڵی خوا ئەوەیە بەسەر غەیری پلە بوڵندەكاندا وەك (ابن عطیة) وتویەتی: كەخوا رەزامەندی دەبەخشێ پێیان و رازین بەحاڵی خۆیان وەئەوەیان لێدەڕوا كە ئەم وابزانێ پلەی نزمترە، بۆ ئەوەی دڵگرانی لەبەهەشتدا نەبێ چونكە چەندەها پلەی جۆراو جۆری تێدایە بەگوێرەی كردارەكان لەسەر ئەندازەی فەزڵی خوا بەسەر ئەوانەوە خوا ویستویەتی.

اللهم یاذ الفضل العظیم تفضل علینا بالعفو وبما تشاء من النعیم بفضلك ورحمتك یارب العالمین وصلی الله علی سیدنا محمد وآله وصحبه اجمعین وسلام علی المرسلین والحمدلله رب العالمین[1].

(١) ئەی خوای خاوەن فەزڵ وگەورەیی بەفەزڵی خۆت عەفو دابارێنە هەر نیعمەتێك خۆت ئارزوت لەسەرە بەفەزڵ و رەحمەتی خۆت ئەی خوای خاوەنی جیهانیان. خوایە رەحمەتی خۆت دابارێنە بەسەر گەورەماندا کە محمدە وەبەسەر ئالی محمدو هاوەڵانیدا هەرهەموویان و سەلام و ئاشتی خۆت برژێنی بەسەر هەموو پێغەمبەراندا و الحمد لله ربّ العالمین .

رۆژی ٢٠٠٤/٦/٢٨ بەرامبەر ١٤٢٥/٥/١٠ لەتەرجومەی جمع الجوامع بوومەوە سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی رۆژی دووشەمە، خوایە لێمان قەبوڵ بکەی موسوڵمانان سودی لێوەرگرن و ئەوانیش دوای دەرسەکانیان بێبەشمان نەکەن لەدوعای خێر و صلّی الله علی سیدنا محمد وعلی آل سید نا محمد .

موسی حبیب کریم
ئیمامی مزگەوتی حەمەی حاجی رەشید
لەشەهیدانی ئازادی/سلێمانی

## ناوەڕۆك

# ئەم كتێبە

- كتێبی ( جمع الجوامع ) لەوە بەناوبانگترە كە قسە لەسەر ناساندنی بكرێت، بەتایبەتی لەچوار دیواری حوجرەكانی كوردستانو لەلای -مەلا- باشی ئەم نیشتمانە پێوەرێكی بنەرەتی بوو لەرووی وتنەوەی بەفەقێو خوێندنو لێتێگەیشتنی لەلایەن فەقێوە..

- بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ دەقە شەرعیو یاساییەكان زانستی ئوصوڵ هێندە گرنگە وتراوە ( هەركەس ئاشنای - اصول الفقه - نەبێ متمانە بەزانستەكەی ناكرێت )..

- ئاشكرایە زانستی ئوصوڵ گەورەترین دەروازەیە بۆ داخڵ بوونی عەقڵ بەزانستە ئیسلامییەكانو كرانەوەی لەگەڵیاندا، چونكە عەقڵ تەنها بنەمایەكە كە تەكلیفە خواییەكان دابەزنە سەریو لەوێوە بەرجەستە بكرێن لەژیانی رۆژانەدا..

- كتێبی ( جمع الجوامع ) گەورەترین شاكاری بواری ئوصولە تائەمرۆش، بۆیە بەكوردی كردنی كتێبێكی لەو چەشنە شەونخونیو رەنجو لەگەڵ ماندووبوونی زۆری دەوێت ئەگەر پڕاوپڕ وەك پێویست نەبێت، بەسنگ فراوانییەكی زۆرەوە چاوەڕێی سەرنجو رەخنەو پێشنیاری هەموو خەڵكێكی دڵسۆزو زانست دۆستین..